
گۆردۆن تۆماس
نهێنییەکانی
مۆساد
وەرگێرانی لە هۆڵەندییەوە:
شەفیقی حاجی خدر
گۆردۆن تۆماس
نهێنییەکانی مۆساد
وەرگێرانی: شەفیقی حاجی خدر
سەرەتای سەرهەڵدانی دەزگای مۆساد.. ڕفاندنی فڕۆکەی میگی ٢١ ڕوسی لەعێراق.. ڕفاندنی سەرکردەی نازی ئەدۆلف ئایخمان، تاوانبارێکی هۆلۆکۆست لە ئەرجەنتینەوە..کوشتنی فتحي الشقاقي، هینداوی، ابو جهادو هەوڵی تیرۆرکردنی خالد المشعل و عبداله الزینو زۆری دیکە.. فڕاندنی فڕۆکەیەک لەسەر ئاسمانی لیبیا.. چیرۆکی فەرهاد بازوفتی جاسوس.. چۆنیەتی سەرنانەوەی دایانای شازادەو دۆستە میسرییەکەی.. داستانی رزگاریی ئەنتەبە.. ئێرانگێت و چەک ناردنە تاران.. شەڕی شەش ڕۆژەو شەڕی رزگاریی ئیسڕائیلو شکستی دەوڵەتانی عەڕەب.. تێکشکاندنی تۆپە زەبەللاحەکەی سەددامو لەناوبردنی داهێنەرەکەی.. دۆزینەوەی سکۆدەکانی عیڕاق لەبیاباندا و تێکشکاندنیان.. پەیداکردنو دزینی کەرەستەی ناوەکی بۆ دیمۆنا..مۆنیکا لوینسکی.. عەلی ئاگجای تورکو بریندارکردنی پاپای ڤاتیکان.. کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەی لۆکەربی.. پارەو سێکس لەکاری سیخوڕێتیدا، و چۆنیەتی گرتنی عەبدوڵلا ئۆجالان لە کینیا ...
هەمو ئەو بابەتانەو چەندان بابەتی دیکەی سامناک و ورووژێنەر و تۆقێنەر لە ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد لەم کتێبەدا بخوێنەوە.
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکرنەوی هیڤی . هەولێر

**ناوی کتێب : نهێنییەکانی مۆساد**
**نوسینی: گۆردۆن تۆماس**
**وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە: شەفیقی حاجی خدر**
**دیزاین: ئاگری باڵەکی**
**چاپخانە: چاپخانەی هیڤی – هەولێر**
**چاپ: چاپی یەکەم** – 2008
**ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە** ( 2430)
**ساڵی** 2008**ی پێدراوە.**

# پێڕست

## بەڕێوبەرە گشتییەکانی مۆساد

| | |
|---|---|
| ڕیوڤن شیلۆاه Reuven Shiloah | 1952-1951 |
| ئیسەر هارل Isser Harel | 1963-1952 |
| مایر ئامیت Meir Amit | 1968-1963 |
| زڤی زامیر Zvi Zamir | 1974-1968 |
| ئیسحاق هۆفی Yitzhak Hofi | 1982-1974 |
| ناحوم ئادمۆنی Nahum Admoni | 1990-1982 |
| شاباتی شاڤیت Shabati Shavit | 1996-1990 |
| دانی یاتوم Danny Yatom | 1998-1996 |
| ئەفرام هالڤی Efraim Halvey | -1998 |

## لێکدانەوەی زاراوە و دەستەواژەکان

- ❖ AFR : پەنجە مۆری ئۆتۆماتیکیانە.
- ❖ AL : دەستەیەکی تایبەتی ئیسرائیلیە کەزۆر بەنهێنی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاریی ئابوری، زانستیی و تەکنەلۆژیا چالاکە.
- ❖ AMAN : ئامان دەزگای هەواڵگری سەربازیی ئیسرائیل.
- ❖ ANC : کۆنگرەی نیشتمانیی ئافریکا.
- ❖ ANO : رێخراوی تیرۆریستیانەی ئەبو نیزال.
- ❖ APAM : بەشی ئاسایشی ناوەخۆی مۆسا.
- ❖ ASIS : دەزگای نهێنی و ئاسایشی ناوەخۆی ئوسترالیا.
- ❖ ASU : یەکەی سەربازیی کارای دژەتیرۆر.
- ❖ AWAC: راداری باڵدارو وێستگەی وەرگر.
- ❖ Babler: بابلەر؛ ئامێرێکی ئەلەکترۆنییە بۆ دۆزینەوەو تێکدانی ئامێرە گوێقولاغەکان بەکاردێ.

- ❖ Balder :باڵدەر پەیڤێکی ئیسرائیلییە بۆ تەتەر(چەپەر).
- ❖ Basis : شوێنپێیەکی جێگیر لە وڵاتێکی بێگانەدا.
- ❖ Bat Leveyha: بات لێهەڤیا؛ جاوسسی یاریدەدەر.
- ❖ BFV : دەزگای ئاسایشی ناوەخۆی ئاڵمان.
- ❖ BKA : دەستەی باڵای پۆلیسی ئاڵمان کە سەرپەرشتی پۆلیسی ویلاتەکان دەکا.
- ❖ BND : دەزگای نهێنی کۆماری فیدرالی ئاڵمان؛ دەزگایەکی دژە تیرۆرە لەناوەوە دەرەوەی وڵات.
- ❖ Bodel : تەتەر (چەپەر).
- ❖ Boos : نوسینگەی باشوری ئافریکا بۆ پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت، دەزگای نهێنی سەردەمی ئەپارتاید.
- ❖ Bug : ئامێرێکی گوێقوڵاغ کە لە مایکێک و نێرەرێکو وەرگرێکی تۆمارکەر پێکهاتووە(لە زمانی کۆمپیوتەریش بوگ هەڵەیەکی بەرنامەیە).
- ❖ BW : چەکی بایەلۆژیی.
- ❖ CIA : دەزگای نهێنی ئامریکا(سەرقاڵی کاروباری تیرۆرستییە لە دەرەوەی وڵات).
- ❖ CIO : دەزگایەکی ئامریکایی تایبەتمەندە بە لێکدانەوەی وێنە سەتەلایەتییەکان.
- ❖ Comint: کەرەسەی هەواڵگریی کەلەڕێی بیستنو شتی دیکەوە کۆ کراوەتەوە.
- ❖ CW : چەکی کیمیاوی.

- ❖ Dardasim: داردانسیم؛ زاراوەیەکە بۆ ئاژانێک کەلە چین دەستبەکاربووبێ، بەکاردێ.
- ❖ DEA : دەزگای ئامریکیایی دژە ماددە بێهۆشکەرەکان.
- ❖ DGS : دەزگای نهێنی فەرەنسی.
- ❖ DIA : دەزگای هەواڵگریی سەربازیی ئامریکی.
- ❖ DIGOS: دەزگای دژە تیرۆری ئیتالیایی.
- ❖ DMA : گرنگترین دەزگای هەواڵگریی و پۆلیسی نهێنیی عێراق، کەلەلایەن سەباح تکریتی زڕبرای سەددامەوە بەرێوەدەبردرا-دائرة المخابرات العامة-.
- ❖ ECM : ئەو ئامێرە ئەلەکرتۆنیەیە کە دەزگا ئەلکرتۆنییەکانی دوژمن بێهودە دەکا.
- ❖ EDP : داتاکۆکەرەوە ئەلێکترۆنیکەی ئاڵمان.
- ❖ Elint : هەواڵگریی ئەلەکترۆنی. ئەو پەیامو زانیاریە گرنگانەی دوژمنە کەبەهۆی دەزگای ئەلکترۆنیەوە کۆدەکرێنەوە.
- ❖ ELN : لەشکری رزگاریخوازانەی کۆلۆمبیا.
- ❖ ERD: دەزگای کاروباری دەرەوەی هێزی بەرگری ئیسرائیلیی.
- ❖ Eretz Yisrael: ئیرتس ئیسرائیل؛ نیشتمانی گەلی ئیسرائیل.
- ❖ FAA : ئاژانسی فیدراليی هێزی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا.
- ❖ FACES: دەزگای کۆمپیوتەری کەلەرێی بیچمەوە مرۆڤ دەناسێتەوە.
- ❖ Falach : فالاخ؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ ئەو سیخورەی کەلە لوبناندا کارایە.

- ❖ FBI : ئاژانسی ناوەندی فیدڕالیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بۆ لیکۆڵینەوە.
- ❖ GOS: هاوبەندیی وڵاتە سەربەخۆکان؛ ڕێکخراوی وڵاتەکانی یەکێتی شۆرەوی جاران.
- ❖ Humint: ئەو زانیارییانەی کەدەستبەجێ لە سیخوڕەکانەوە کۆدەکرێنەوە.
- ❖ IDA : داتابانکی زانیاریی.
- ❖ IED : بۆبمی دەستکرد.
- ❖ II : کەسێک لەڕێی پۆرترێتی دەستکردەوە بناسرێتەوە.
- ❖ INFS : بەرەی نیشتمانیی ئیسلامیی سودان.
- ❖ Instituut : ئینستیتوت؛ کورتکراوەی ناوە فەرمییەکەی مۆساد (پەیمانگای زانیاریی‌و ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان) ناوە رەسەنەکەشی' پەیمانگای ڕێکخستن'ە.
- ❖ IRA : ڕێکخراوە سەربازییە قەدەخەکراوەکەی ئیرلەندا کەبۆ سەربەخۆیی ئیرلەندا تێدەکۆشێ.
- ❖ JIL : سەنتەری بەریتانی کۆکەرەوەی زانیارییەکان.
- ❖ Katsa: کاتسا، زاراوەیەکی ئیسڕائلییە بۆ ئاژانێک کە کارێکی دەستنیشانکراو لەدەرەوەی وڵات جێبەجێدەکا.
- ❖ KGB : کۆمیتەی ئاسایشپارێزی دەوڵەت لە یەکێتی شۆرەوی کۆن.
- ❖ Kidon : کیدۆن؛ زاراوەیەکی ئیسڕائیییە بۆ ئەندامی هێزی کۆماندۆی مەرگچێنی مۆساد.
- ❖ Kikker : ئەو سیخوڕەی بۆ هەندەران دەنێردرێ کەلە ماوەیەکی کەمدا ئەرکێک جێبەجێبکا.

- ❖ **LAKAM** : دەزگای هەواڵگریی کەتایبەتمەندە بە کۆکردنەوەی زانیارییە زانستیەکان.
- ❖ **LAP** : دەزگای شەڕی دەرونیی.
- ❖ **Maboeha** : مابوها؛ کەسێکی زانیاریدەر کە جولەکە نەبێ.
- ❖ **Mazelen** : جۆرە کوشتنێک کەوا نیشان بدرێ بە بەشێوەکی سروشتی کۆچی دوایی کردووە.
- ❖ **Megawat** : نازناوی گۆڕینەوەی زانیارییەکانی نێوان هەردووک دەزگای مۆساد و سیا.
- ❖ **Mehabelim**: زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ تیرۆرستان.
- ❖ **Meluckha** : دەزگای تایبەت بە هینانەرێزی ئەندامی تازە بۆ ناو مۆساد.
- ❖ **Memoene** : مێمۆنە؛ ناوی بەڕێوبەری گشتی مۆساد لەناو دەزگاکە.
- ❖ **MI5** : دەزگای ئاسایشپارێزی ناوەخۆی بەریتانیا.
- ❖ **MI6** : دەزگای نهێنیی بەریتانیی.
- ❖ **Mishlashim**: میشلاشهیم؛ ئەو شوێنەیە کە نامە و زانیاریی نهێنی تێدا دەپارێزرێ.
- ❖ **Moekaberat**: موخابەرات؛ دەزگای نهێنیی ئوردن.
- ❖ **Naka** : سیستمی نوسینی پێشکەشکردنی راپۆرتەکان.
- ❖ **Nativ** : ناتیف؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ ئەو جاسوسەی کەلە یەکێتی شۆرەوی جاران دەستبەکاربوو.
- ❖ **Neviot** : نیڤیۆت؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ ئەوکەسەی کە تایبەتمەندە بە شوێنپێهەڵگرتنو ناسینەوەی خەڵک.

- **NHITC** : دەزگایەکی ئامرکاییە بۆ کۆکردنەوە و راڤەکردنی ئەو زانیارییانەی کەدەستبەجێ لە سیخوڕەکانەوە کۆدەکرێنەوە.
- **NIC** : سەنتەری نیشتمانیی ئەمریکیی هەواڵگریی.
- **Nokmin** : نۆمکین؛ رزگاربووانی هۆلۆکۆست؛ ئەو تۆڵەستێنانەی بەدوای تاوانبارانی جەنگ و بەرپرسە نازیەکان دەگەڕان.
- **NSA** : سەنتەری ئامریکایی بۆ ئاسایشپارێزیی.
- **NSC** : ئەنجومەنی ئاسایشپارێزی ئامریکایی.
- **NSTL** : لیستی ئامریکیی ئەو گومانلێکراوانەی کەدەبنە مایەی گەف بۆسەر ئاسایشی نیشتمانیی.
- **Numec** : دامەزراوێکی بەکاربردنی ناوەکی کە دەکەوێتە شاری ئاپۆلۆ، پێنسلڤانیای ئامریکی.
- **OAE** : رێکخراوی یەکەی ئافریکایی.
- **OSS** : دەزگای زانیاریی ئامریکایی پێش سیا.
- **PLFP**: بەرەی گەل بۆ رزگاری فەلەستین.
- **PIF** : بەرەی رزگاریخوازی فەلەستینی.
- **PLO** : رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین.
- **Radint** : زانیارییە کۆکراوەکانی رادار.
- **RAF** : گروپی چەپی تیرۆریست کەلە ساڵەی شەستەکان لە ئاڵمان بە رابەرایەتی ئاندریاس بادەر کارابوون.
- **Safanim** : سافانیم؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلیە بۆ ئەو یەکەیەی کە چالاکیی دژی رێکخراوی رزگاریخوازیی فەلەستینی ئەنجامدەددا.
- **خانوی ئارام** : ئەو باڵەخانە و خانوانەن کەبەنهێنی مۆساد بەکاریاندەهێنێ.

- ❖ **SAS** : دەزگای تایەتیانەی هێزی ئاسمانیی بەریتانی.
- ❖ **Sayan** : سایان-م-؛ یارمەتیدەرە خۆبەخشەکانی جو.
- ❖ **SDECE** : دەزگای زانیاریی دەرەوە و دژەتیرۆری فەڕەنسی.
- ❖ **Shicklut** : دەزگای بەدواداچوون و سایەهەڵگرتنی خەڵک.
- ❖ **Shin Bet** : شین بێت؛ دەزگای ئاسایشپارێزی ناوەخۆی ئیسرائیل.
- ❖ **Slick** : سلیک؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلی بۆ ئەرشیفی دۆکیۆمێنتەکان.
- ❖ **Stofkam**: ستفکام؛ ئاژانێکە بەدوورودرێژی زانیاری لەسەر ئۆپەراسیۆنێکی تایبەت کۆدەکاتەوە.
- ❖ **Teoed** : تێیود؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ دۆکیۆمێنتی ساختە.
- ❖ **Yahalomin**: یاهالۆمین؛ زاراوەیەکی ئیسرائیلییە بۆ یەکەی بەیەکەوەبەستن.
- ❖ **ئاژانە رەشەکان**: زاراوەیەکە بۆ زانیاریدەرە عەرەبەکان بەکاردەهێندرێ.

# 1
## ئەو دیوی ئاوێنە

{ بنیامێن ناتانیاهو و مۆساد.. شەرمەزارییەکانی سارا، هاوسەری ناتانیاهو.. ماوریس‌و میوانخانەی دیتزی پاریسی‌و هێنانەڕیزی شوفێری شازادە دایانا.. کوژرانی شازادە دایانا و دۆستە میسریەکەی دۆدی فاید.. روداوی ئۆتۆمبێل‌و پرسگەلی باوکی دۆدی لەمەڕ پیلانگێڕی.. هنری پاول..}

لـە فلاتێکـی نزیـک سـەنتەری پامپیـدۆ، لـە ناوەڕاسـتی کـەرتی چـواری پـاریس، گلۆپـە سـورە ئاماژەدارەکـەی تەلـەفۆنی ژورەکـە، کـە نیشـانەی دەسـتبەکاربوون و تەلـەفون بۆهـاتن بـوو هەڵـدەبوو و دەکوژایـەوە. گڵۆپەکـە تایبـەت لـە لایـەن پسـپۆڕێکی ئیسـڕائیلییەوە دانرابـوو کـە لـە ئیسـڕائیلەوە هـاتبوو، تـاوەکو نیوەشـەوان زەنگـی تەلـەفۆن دراوسـێکان هەراسـان نـەکات و پرسـیاری گوماناویـان لا نـەوروژێنێ، چونکـە زەنگـی ئـەو تەلەفۆنـە بـە زۆری لـە نیوەشـەوان لێیـدەدا. ئـەو پسـپۆڕێتیەی بەیەکەوەبەسـتنەوە بەشـێک بـوو لـەYahlomin یـاهلۆمین واتـە تیمـی بەیەکبەسـتنەوەی مۆسـاد، کـە پەیوەسـتبوو بـە دامەزرانـدنی هێڵـی بەیەکبەسـتنەوەیەکی دڵنیاکـەرەوە لـەنێوان خـانوە ئارامـەکانی پیـاوانی مۆساد لە دەرەوەی ئیسرائیل.

ئـەو خـانوە ئارامانـەی پـاریس مۆدیلێـک بـوون بـۆ هـەمو خانوەکـانی هاوچەشـنی خۆیـان لـە هەنـدەران. ئـەو خانوانـە دەرگـای قەڵغانـداریان دژی بۆمـب و پەنجـەرەی تایبـەتی گوللـە بەنـدیان هاوشـێوەی پەنجـەرەکانی کۆشـکی سـپی ئامریکایـان هـەبوو، تەنانـەت کـامیرا لـە دیـوی دەرەوەش نەیـدەتوانی بیانسـمێ و وێنـەی ناوەوەیـان بگـرێ. لـە

هەمو شارە گەورەکانی جیهاندا مۆساد ئەو جۆرە خانوانەی کڕیبوون یان بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بە کرێی گرتبوون. زۆرێک لەو خانوانە ماوەیەکی زۆر بوو کەس لێی ئاکنجی نەبووبوو، کارئاسانی وایان بۆ کرابوو تابتوانن بە ئاسانی لەکاتی پێویستدا تەڕدەستانە بۆ چالاکیەکانیان بەکاریانبهێنن.

لە حوزەیرانی 1997ەوە لەو خانوە ئارامەی پاریسەوە سەرقاڵی چالاکییەک بوون. لەو هاوینەدا مسیۆ ماوریس monsieur Mauriceلەوخانوەدا نیشتەجێ بوو. ماوریس فەڕەنسیەکی باشی بە ئەکسەنتێکی ناوەڕاستی ئاوروپا دەزانی. لە ماوەی ئەو ساڵەدا دراوسێکانی زۆر جاران کەسی وەک ئەویان دەدی، زۆربەیان پیاو بوون، بەڵام ژنیشیان دی، ژنەکان لەنێوانیاندا هەفتەیەک یان مانگێک دەمانەوە و دواتر لەپڕێکەوە بزردەبوون. ماوریسیش وەک هەمو ئەوانەی پێشخۆی، هەریەکێک بیویستبا لە ژیانی تایبەتی و تایبەتمەندییەکانی نزیک ببێتەوە، ئەو خۆی لێبەدوردەگرت و خۆی لێدەپاراست. ماوریس کاستایەک (Kasta) ئاژانێکی مۆساد بوو.

ماورێس کەسێک بوو شتێکی وای نەدەکرد سەرنجی خەڵک بە لای خۆی ڕابکێشێ. لە بارەی ئەوەوە دەگوترا کە لە شەقامێکی چۆڵکراو دەژی بێ ئەوەی کەس ئاگای لێبێ. ماورێس لە کاتێکی سەختدا هێنرابووە ڕیزی مۆساد، کە کاری شێوازی زانیاریدەرییەکەی هێشتا نەناسرابوو. توانا و لێوەشاوەیی ماورێس لە خزمەتە سەربازییەکەیدا دەرکەوت. دوای مەشقی سەرەتاییش، ڕاستەوخۆ گوازرایەوە هەواڵگری هێزی ئاسمانی. ئەوەش لەوەوە هات کە زمانزانییەکەی سەرنجی سەروی خۆی ڕاکیشا، چونکە زمانەکانی فەڕەنسی و ئاڵمانی و ئینگلیزی دەزانی، سەرەڕای ئەوەش چەند بەهرەی دیکەشی هەبوو؛ وەک لەیەکدانەوەی شوێنە پچڕاوەکانی ڕاپۆرت و لەیەکجیاکردنەوەی ڕاستییەکان لە هەڵبەستنەکان ، هەروەها

لێکدانــەوەی ســنورەکانی گریمانــەی شتەکانیشــی دەزانــی، ســەرباری ئەمانــەش پیاوێــک بــوو بــە ئاســانی دەیتــوانی خــەڵک لەخشــتە ببــا وەک ئەوەی دەگوترێ بیباتە سەر کانی، بێ ئەوەی ئاوی بدا بیهێنێتەوە.

مــاورێس دوای دەرچــوونی لــە مەشــقەخولی فێرگــەی مۆســاد لــە 1982دا، لــە ئاوروپــا، باشــوری ئافریقــا و ڕۆژهــەڵاتی دور لــە ژێــر پــەردەی بزنســمان و نوســەرو دانــەری ڕابــەری گەشــتوگوزاری و نوێنەرایــەتی کاریــدەکرد، لــەو کارانەشــیدا لــە ژێــر پــەردەناوێک کاریــدەکرد کــە پێشــتر لــەلای مۆســادەوە داهێنرابــوو. ئــەمجارەیان بەناوی ماوریس وەک بزنسمانێک کەوتەگەڕ.

لـە مـاوەی سـاڵانی ئیشـکردنیدا، زۆر جـاران گـوێی لـەو گۆتەیـە دەبـوو کـە پاکسـازی لـە نـاو دەزگـای مۆسـاددا دەکـرێ، بەتایبـەتیش ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە ڕێـز و ڕومـەتیان دابـەزیوە و کارەکانیـان وەک پێویسـت ئەنجامنـەداوە یـان پیاوپیاوانێیـان بـۆ سـەرۆکەکانیان کـردووە، ئیـدی کـە سـەرۆکێکی مۆسـاد دەگـۆڕا ئـەو پرسـانە دەهاتنـە گـۆڕێ، بـەڵام هـەمو ئەو باسانە لە ورەی پیاوانی خزمەتی هەواڵگریان دانەبەزاند.

ئــەو پێواژۆیــە لــە کــاتی دەســتبەکاربوونی بنیــامین نــەتانیاهودا وەک ســەرەک وەزیــران بــە گــوڕتر بــوو، چونکــە ئــەویش خــۆی هەرلــەو دەزگایــەوە هــاتبوو، بۆیــە زۆرێــک لــە لایەنــە وردودرشــتەکانی پرســەکەی دەزانــی، هــەروەها دەیزانــی کــەی گوێــدەگرێ و تــا چەنــدیش دەتــوانێ بڕبکــا، هــەر لــە ســەرەتاوە ئــەفســەرە بۆرەکــانی ( ئەوانــەی تەمــەنێکیان لەگــەڵ مۆســاددا بەســەر بردبــوو ) بــانگکردن و پێیگــوتن کــە ڕەنگبــێ ئــەو خــۆی لەلایەنــە وردودرشــتەکانی هەنــدێ چــالاکی هەڵبقورتێنێ.

لــە ڕاســتیدا ئــەوە وا ڕۆیشــت، وەک ئــەوەی گەســکێکی تونــد بــێ بەیــەکجارڕاییماڵێ و پــاکی بکاتــەوە، پیــاوانی مۆســاد وایانــدەزانی ئیــدی لەمــەودوا هــیچ شــتێک بــە نهێنــی نامینێتــەوە، کــە ســەرۆک وەزیــران پێــی

نـەزانیٚ، بـەڵام کارەکـە لـەوەش خراپتربـوو، چونکـە نـەک هـەر سـەرۆک وەزیـران بـەڵکو سـارای هاوسەریشـی هەوڵیـدەدا لـە شوشـەئاوێنەی مۆسـادەوە تەماشـای دیـوی نـاوەوە بکـات و چالاکیـەکان ببینـیٚ، تەنانـەت ئەفســەرە گــەورەکانی مۆسادیشــی بانگهێشــتی مــاڵی خــۆی دەکــردن، تـاکو بەرسڤی پرسـەکانی بدەنـەوە، بـە گوتـەی خـۆی ئـەو چـاوی لـەخانم هیلاری کلنتۆن دەکرد لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەزگای CIA دا.

لەهــەنــدیٚ ڕێــڕەوی هێمنانــەی بارەگــای ســەرەکی مۆسادیشــدا کــە سـەرقاڵی پستەپسـت بـوون لەسـەر هەنـدیٚ داوا شـەرمەزارییەکانی سـارا ناتانیـاهو، کـە بێشـەرمانە حـەزی لـەوە بـوو لایەنـە پسـیکۆلۆژییەکانی سـەرانی ئـەو وڵاتانـە بزانـیٚ کـە سـەردانی دەکـردن یـان پێشـوازی لێدەکردن، هـەروەک دەیویسـت لـە بـارەی کـردە سێکسـییەکانی سـەرۆک کلنتۆنیشـەوە شـت بزانـیٚ و زانیـاری کۆبکاتـەوە، هـەروەها داوای لیسـتی ڕەفتارنامـەی ئـەو دیپلۆماتـە ئیسرائیلیانەشـی دەکـرد کـاتیٚ سـەفەری دەرەوەیـان دەکـرد و دەمانـەوە، هەنـدیٚ گومانیـان لای باڵوێزخانـەکانیان دروسـتدەکرد، پرسـیاری پاکوخـاوینی سـەرینەکانیانی دەکـرد و پرسـیاری ئەوەشـی دەکـرد کـە چەنـد جـاران پاککراونەتـەوە ! لـە لایـەن خۆشـیانەوە ئەفسـەرە قسـە لـە ڕووەکـانی مۆسـادیش بەشـێوەیەک سـاراخانیان تێگەیانـد، کـە ئـەوجۆرە کارانـە و کۆکردنـەوەی ئەوچەشـنە زانیاریانە لە پیشەی ئەواندا نییە.

هەندیٚ لە کەسـە دێرینـەکانیان (ڤێتەرانـەکانیان) لـە ڕێگـای سـەرانیانەوە ئـەوکارەیان پێکرابـوو، لـە جیـاتی ئـەوە خۆیـان بەچالاکیـەکی زۆر بچـوک خـەریککردبوو، کـە زیـاتر لـە ڕۆژنامەنوسـێکی نـەدەویسـت، هەنـدیٚ زانیـاری لەسـەر کەسـێک بڵاوبکاتـەوە و زۆر کـەمیش بخوێنرێتـەوە. ئـەوان بـەو کارەیـان کارنامـەیان لەخاڵێکدا دەوەسـتا، یـان دەبوایـە واز بهێـنن. لـەو جـۆرە کەسـانە بـە ئیسـرائیلدا بـڵاو ببونـەوە، هەوڵیانـدەدا خۆیـان بەخوێندنـەوە، بەتایبـەتیش بـە کتێبـە مێژوییـەکان خەریکبکـەن، تـا

وای نیشـــانبدەن ئـــەوان لەگـــەڵ ڕاســـتی لەیەکجیابونـــەوە هەڵسـوکەوتدەکەن. ئـەوە ببـووە هـۆی ئـەوەی کـە مـاوریس ماوەیـەکی بـاش لـە تەلئـەبیب دورربکەوێتـەوە و لـەدەرەوە درێـژە بـە خزمـەتی خـۆی بدا.

ئــەو چالاکیــەی ئــەوی بــۆ پــاریس نــارد، وایلێکــرد دەرفــەتێکی نــوێی پێببەخشـێ، تـاکو هـەرهیچ نـەبێ خـۆی بەشـێوەیەک نمـایش بکـا کـە چەنـد لەسـەرخۆ و مشـورخۆر و بێپـەرێز بـێ بـۆ ئـەوەی ئـەو ئەنجامـەی کـە بـۆی رەوانـە کـراوە بەدەسـتبهێنێ، بـەڵام ئـەمجارەیان کارەکـەی زۆر قـورس نـەبوو، چونکـە پێویسـتی بەتونـدوتیژی جەسـتەیی نـەبوو، بـەڵکو تـەنها ترسـی لـەوە هـەبوو کـە لـە لایـەن پۆلیسـی فەڕەنسـیەوە ئاشـکرا ببـێ و ئـەوانیش ڕەوانـەی وڵاتەکـەی بکەنـەوە. بـاڵوێزی ئیسـڕائیل دەیزانـی کـە مـاوریس لـە پاریسـە، بـەڵام هـۆی هـاتنی بـۆ ئـەوێی پێنـەگوترابوو. ئـەوەش بەشـێکی سـتانداردی پیواژۆیەکـە بـوو، چونکـە گـەر هاتبـا و چالاکیەکـە سـەری نـەگرتبا، ئـەوا بـاڵویز بـە هـەمو ڕاستگۆییەکەوە دەیگوت من ئاگام لەهیچ نییە.

فـەرمانێک بـۆ مـاوریس هـات کـە زانیاریـدەرێک بهێنیتـەڕیز، ئـەو کـارەش لـە کـۆدە نهێنییـەکانی مۆسـاد بـە " لێکنزیکبوونەوەیـەکی سـارد" دەنوسـرا. دوای دوو مانگـان و کـارێکی بـە حەوسـەڵە، مـاوریس هاتـە سـەر ئـەوباوەڕەی کـە لـە ئامانجەکـەی نزیـک بۆتـەوە. ئامانجەکـەش هێنـری پـاول Henri Paul ی یاریدەدەری سـەرۆکی ئاسایشـپارێزی هـۆتێلی ریتـز Ritz Hotel بوولـە پاریس. یـەکێک لـە کارەکانی هنری لێخـوڕینی ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بوو کە میوانە بەناوبانگەکانی دەگواستنەوە.

یـەکێک لـەو میوانـە ناودارانـە ژۆناتـان ئـاتکین Jonathan Aitken ی ئەنـدامی حکومـەتی پێشـوی کۆنسـەرڤاتیڤی شانشـینی یـەکگرتو بـوو. ئـاتکینی وەزیـر، بـەرپرس بـوو لـە ڕێکخسـتنی کاروبـاری چەکفرۆشـتن. بـەوجۆرە ڕایـەڵێکی پەیوەنـدی زۆری لەگـەڵ بازرگانـانی چـەک لـە

ڕۆژهـــەڵاتی ناوەڕاســـتدا هـــەبوو، هەرئـــەوەش وایکـــرد بەرنامـــەی تەلـەفزیۆنی World Action لیکۆڵینەوەیـەکی ڕۆژنامـەوانی لەسـەر بکـــا، هـــەروەها ڕۆژنامـــەی Guardian چەنـــدان هـــەواڵی شـەرمەزاریانەی پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ کەسـانێک کـە نـابێ بێنـەڕیزی پەیوەندییـــەکانی کابینـــەی حکومـــەتی شـــاژنی شـــکۆداری بـــەریتانیا، بڵاوکردنـەوە. ئـاتکین سـکاڵای بەتۆمـەتی ناوزڕانـدنی لەسـەر هـەر دوو دەزگـــای ڕاگەیاندنەکـــە بـــەرزکردەوە و بەڵگـــەکانی کێشـــەکەش لەیـــەک خـاڵ چڕدەبوونـەوە، کـە بریتـی بـوو لـەوەی ئایـا کـێ ئـەو پارەیـەی داوە؟ ئایـا ئـاتکین لـە میوانخانـەی ریتـز لـەپاریس بـە یـاوەری پەیوەندییـەکی عـاڕەبی دابـەزیوە؟ ئـاتکین لـە دادگـا سـوێندی خـواردووە کـە ئەوپارانـە لە لایەن هاوسەرەکەیەوە دراون.

لـە ڕێگـای سـێهەمەوە پۆلیسـە پشـکنەرەکانی مۆسـاد کـە بـۆ هـەردوو دەزگـای ڕاگەیاندنەکـە کاریـان دەکـرد، ئـەو زانیاریانـەیان وەرگـرت کـەوا خـــانمی ئـــاتکین نەچۆتـــە پـــاریس، چ جـــای پـــارەدانی میوانخانەکـــە. ســـکاڵایەکە یەکســـەر وەســـتێنرا. مۆســـادیش پێشـــتر ئـــەوەی ڕەچـــاوکردبوو، کـــە جموجـــۆڵی ئـــاتکین هەڕەشـــەیە بـــۆ سەرئیســـڕائیل. دەزگـــای مۆســـاد بەوکردەیـــە تـــەواوی مەســـەلەکەی ســـەلماند و میوانخانـــەی ریتـــزیش بـــووە شـــوێنی بەیەکگەیشـــتنی بازرگانـــانی چـــەک لەنێوان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاوروپا.

مۆســـاد بڕیاریـــدا هـــەر زانیاریـــدەرێک لـــە میوانخانـــەی ڕیتـــز ڕاپـــۆرت لەسـەر جموجۆڵـەکانی ئـاتکین بـدا. بـە دەستخسـتنی زانیارییـەکان لـەڕێی کراککردنـــی سیســـتمی کۆمپۆتـــەر دەســـتپێکرد، بـــەڵام لەدەســـتەی بەڕێوەبردنـەوە زەفـەر بەکـەس نـەبردرا ئـەو کـارە بکـا. لـە دەسـتەی پلـە خـواروتریش کەسـێکی وانـەبوو دەسـتی بـەو زانیاریانـە رابگـا کـە مۆسـاد داوای دەکـــردن. یاریـــدەرەی ســـەرۆکی ئاسایشـــپارێزی میوانخانەکـــە هنـری پـاول بـەرپرس بـوو لـە ئێشـکگرتنی میوانخانەکـە. بـەهۆی کلیلـە

ناسنامەکەی دەیتوانی تەنانەت قاسەی میوانانیش بکاتەوە. کەس ڕێگای پێنەدەگرت، گەر داوای کۆپیەکی حیسابی فلانە میوان یان ئەوی دیکەی کردبا. کەس سەری لەوە سوڕنەدەما ئەو لیستی تەلەفۆنەکانی میوانانی زانیبا، کە تیایاندا بەدرێژی باسی هەمو پەیوەندییەکانی تێدابوو. ئەو جۆرە زانیارییانە هەمو پەیوەندییەکانی تێدا بوون وەک پەیوەندی بازرگانانی چەک، تەنانەت دەزانرا کامە بازرگان چ ژنێکی وەک کەسی سێهەم لەنێوان خۆی و ئاتکین دادەنا. هەروەها هنری وەک شوفێریش گوێی لەهەمو چرپەیەک دەبوو، دەکرا ببێتە شاهید و تێبینییەکان بنوسێتەوە کە چ قسەیەکیان کردووە.

هەنگاوی دوهەم پەیداکردنی زانیاری بوو لەسەر ژیاننامەی هنری پاول. یەکێک لە کاستاکان کە لە پاریس کاریدەکرد، لەماوەی چەند هەفتەیەکدا زانیارییەکی زۆری لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی هنری پەیداکرد. دەرکەوت هنری پەیوەندییەکی جێگیری نییە و سەڵتە. لە فلاتێکی هەرزان دەژی و حەزی لەلێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل و ماتۆڕی تیژڕۆیە، کە نیوە بەشێکی تێدا هەیە. کارمەندانی میوانخانەکەش ئەوەیان بەدەستەوەدا کە هنری زۆر حەزی لە بیرەخواردنەوەیە. سەرەداوی ئەوەش کەوتبوونەدەست جاربەجار لەگەڵ ئەو سۆزانییە گرانبەهایانە ڕادەبوێری کە بۆ میوانەکانی میوانخانەکە دەهێنران.

هەمو ئەو زانیاریانەی لەلایەن پسیکۆلۆژیکی مۆسادەوە لێیانکۆڵرایەوە، پسیکۆلۆژەکەش گەیشتە دەرەنجامێک ،کە بە بێگومانی هنری پاول خاڵی لاوازی هەیە. لەبەر ئەو هۆیانە پسیکۆلۆژەکە ئەوەی بەباش زانی، وردەوردە فشار بخرێتە سەر هنری، فشارەکەش بەشێوەیەک بێ کە هاوکات بێ لەگەڵ بەڵێنی بەرزکردنەوەی ئاستی داراییەکەی تا بتوانێت ژیانێکی ڕێکوپێک لە ناو کۆمەڵگادا بەسەر ببا، کە ئەو پەرۆشی بوو. ئەوەش بەباشترین شێواز دەزانرا تاکو پێی

کارانگــاز ببــێ و بێتــە ژێربــار، بــەڵام ئەمــە پێواژۆیــەکی دوورودرێــژی دەویســت، کــە داخــوازی لێهــاتوی و ئــارامی دەکــرد؛ هــەر لەبــەر ئــەوەش بوو (ماوریس)یان بۆ ئەوکارە لەجیاتی کاتسایەکی دیکە بانگکرد .

هــەروەک چالاکییــەکانی دیکــەی مۆســاد، مــاوریس پابەنــدی ڕێنماییــە تاقیکراوەکــان بــوو. ســەرەتا مــاوریس چەنــد جارێــک ســەردانی میوانخانــەی ریتــزی کــرد تــاکو بــڕوای بــەڕێوبەرایــەتیی کارمەنــدانی میوانخانەکــە بەدەســتبێنێ. لەماوەیــەکی کورتــدا مــاوریس بــۆی دەرکــەوت کــە هنــری پــاول پیــاوێکی بــازوداره و بەهەیبەتانــە دەڕوا تــا وانیشــانبدا کە پێویستی بە پیاهەڵدانی کەس نییە.

مــاوریس بــەوەی زانــی کــە هنــری پەیوەندییــەکی تێبینیهــەڵگری لەگــەڵ ڕۆژنامــەنووســەکاندا هەیــە، بەتایبــەتی ئەوانــەی دەیانویســت وێنــەی ئــەو دەوڵەمەنــد و ناســراوانە بگــرن کــە هاموشــۆی میوانخانەکــەیان دەکــرد و بابەتەکانیشـــیان بـــەهاداربوون. هنـــری زوزو ئـــەو وێنەگرانـــەی دەردەکــردن، بــەڵام بەرامبــەر لێخــوڕینی ماتۆڕەکانیــان بانگیــدەکردنــەوە. جارجارەش دەهاتە دەرەوە و دەمەتەقێی لەگەڵ ئەو وێنەگرانە دەکرد.

مــاوریس بەشــەوان هنــری دەدی کــە لەگــەڵ ئــەو وێنەگرانــە لــە بــاڕێکی نزیــک میوانخانەکــە دەخواتــەوە، ئــەو بــاڕەی کــە کارمەنــدانی میوانخانەکــە بەزۆری بۆی دەچوون.

لەراپۆرتەکانیــدا بــۆ تەلئــەبیب، مــۆریس ئــەوەی ڕاگەیانــد کــە هنــری پــاول کــاتی زۆر بــۆ خواردنــەوە دادەنــێ و کهــولیش زۆر دەخواتــەوە، بــە شــێوەیەک کــە لــە خــورینیش هــەر دەخواتــەوە. ســەرەڕای ئــەوەش مــاوریس ئــەوەی ســەلماند کــە هنــری بــۆ کــاری زانیاریــدان زۆر بەکەڵکــە، چونکــە دەتــوانێ بچێتــە کونوقــوژبنی میوانخانەکــە بــێ هــیچ ریلێگرتنێــک، چونکە بڕواپێکراوی هەموان بوو.

بەتێپــەڕبوونی کــات مــاوریس لــە بەدواداچوونــە بێپەرێزەکــەی بــۆی دەرکــەوت کــە هنــری پــاول ئــەو متمانەیــەی شــەرمەزار دەکــرد. ئــەو

کــارێکی وایــدەکرد وێنــەگرەکان پــارەی بــدەنێ، تــاکو ڕێگــەی وێنەگرتنـەکانیان لێنـەگرێ. بەرامبـەر وێنـەگرتنی ئـەو میوانـە ناسـراوانە، لـەکات و شـوێنی پەسـند دەچوونـە لای هنـری تـاکو وێنـەی تایبەتمەنـدی میوانەکان بگرن.

بـەرتیلی کاشـیش بـۆ ئـەو ڕێگەپێدانـە لـە بـاڕێکی کۆڵانـە تـەسکەکەی Rue cambon دەبـوو، ئـەو شـوێنەی کـە کارمەنـدانی میوانخانەکـەی لێدەژیان .

لــە ئــابی 1997 ئــەو زانیاریانــە دەرکــەوتن کــەوا چاوەڕوانــدەکرێ دایانــا شــازادەی وێلــز و دۆســتە نوێیەکــەی دۆدی ئەلفایــد کــوڕی خـاوەنی میوانخانەکە بگەنـە ئـەوێ ، کـە ئـەو جوتـە لـە بەشـی بـەناوبانگی ئیمپریالی میوانخانەکە دەمێننەوە.

گوشــارێکی زۆر خرایــە ســەر کارمەنــدان کــە نــابێ مانــەوەی جوتــە میــوان رابگەیــەنرێ. هەرکەســێکیش ئاشــکرایان بکــا، توشــی ســزای دەرکــردن و نــانبڕان دەبێتــەوە. هنـری پـاول ســەرەڕای ئــەو ئاگاداریــە گــەفئامێزەی بەڕێوبەرایـەتیی میوانخانەکـە ملـی کارنامەکـەی خـۆی لـە چــەقۆ دەخشــاند، چونکــە دەیوســت ســەردانەکەی دایانــا بــە چەنــد ڕۆژنامەنوسـێک بفرۆشــێ و لــە هەریــەکێکیش لــەوان بـڕە پارەیـەکی باشی وەرگرت.

بێجگـە لـەوە مـاوریس ئـەوەی بـۆ دەرکـەوت کـەوا زۆرتـر دەخواتـەوە و بیستیشـی کـە کارمەنـدان سـکاڵایان لـە دەسـت هنـری پـاولی یاریـدەدەری ســەرۆکی ئاسایشــپارێز هەیــە، چونکــە ئــەو زیــاتر هەڵســوکەتی کۆیلەراگرانــەیان لەگــەڵ دەکـا بــەوەی ماوەیــەک پــێش ئــەوکات کچــە کارمەنــدێکی لەســەر بردنــی پارچــە ســابونێک دەرکــرد. زۆر لــە کارمەنـدان دەیـانگوت پـاول حـەب قوتـدەدا تـابتوانێ لەرینـەوەی دەنگـی جۆراوجـۆر ڕابگـرێ. ئـەوە وایکـردووە کـە زو تـوڕە ببـێ و لەسـەر هـەر

کەموکورتییـــەک هەرچەنـــدە بچـــوکیش بـــێ بکاتـــە هـــەرا. ئیـــدی مـــاوریس بۆی دەرکەوت کە کاتی ئەوە هاتووە کارەکەی خۆی پێبکا.

یەکـەمین بەیەکگەیشـتنیان لـە بـاڕی Harry`s Bar بـوو لـە کۆڵانی Rue Daunou کاتێـک هنـری هاتـە ژورەوە، مـاوریس دانیشــتبوو کـۆکتێلێکی دەخــواردەوە. پیاوەکــەی مۆســاد گفتوگۆیــەکی دۆســتانەی لەگـەڵ هنریـدا کـرد، ئـەویش ڕێگەیـدا بیرەیـەک لـەسـەر حیسـابی مـاوریس بخواتـەوە. لـەو دانیشـتنەدا مـاوریس ئـەوەی بۆ درکانـد کـە برادەرێکـی لـە میوانخانــەی ریتــز دا هەیــە، هــەروەها ئەوەشــی خستەســەر، برادەرەکــەی سەری‌سوڕماوە لەو میوانە عەڕەبە دەوڵەمەندانەی میوانخانەکە.

ئــەو قســـەیە وەک ئـــەوە وابـــوو کـــە تەقەیـــەک لـــە تاریکییـــەوە بکـــەی، مـاوریس ڕاسـتەوخۆ چـاوەڕێی ئـەو دەرەنجامـەی نـەدەکرد. هنـری پـاول یەکسـەر هاتـە وەڵام گـوتی زۆر لەوعەڕەبانـە "بـێ ئـەدەب و فیـزڵ"ن ، وا لــە هنــری چاوەڕواندەکــەن کــە یەکســـەر بەنوکــە پەنجەیــەک بفڕێتــە لایـان. خراپترینیشـیان وەک هنـری گـوتی سـعودیەکانن. مـاوریس گـوتی گوایـە بیسـتویەتی میوانـە جووەکـانیش وەک عەڕەبـەکان وان ناڕحـەتن، بـەڵام هنـری بەتونـدی وەڵامـی دایـەوە کـە وانییـە، جووەکـان میـوانی زۆر بەڕێزن.

لــەو کەشــە پڕئومێـدە بەوشـێوەیە ئـەو ئێوارەیـە لەیەکجیابوونـەوە کـە پـاش یـەک دو ڕۆژی دیکـە بـۆ نـانخواردن لـە یـەکێ لـە چێشـتخانەکانی نزیــک میوانخانەکــە یەکــدی ببیننـــەوە. لەســـەر ژەمـــی نـــانخواردن لەســـەریەک هنـــری پـــاول بەرســـڤی پرســـە گونجاوەکـــانی ماوریســـی دەدایـــەوە. ئیـــدی ئـــەوە لای مـــاوریس چـــەســـپا، کـــە پێشـــتر کاتســـاکان زانیاریـان لەسـەر هنـری کـۆ کردبـووەوە. ئـەو خۆشەویسـتیی خـۆی بـۆ ئۆتۆمـۆبێلی خێـرا ڕاگەیانـد، نەشـی شـاردەوە بەهیوایـە ڕۆژێـک ببێتـە خـــاوەنی ئۆتۆمـــۆبێلێکی ســـپۆرتی وا، مۆڵەتەکەشـــی بەدەســـتبێنێ و

لێیبخـورێ. ئـەو جـۆرە خواسـتانەش بـەپێی ئـەو موچـەی هەیـەتی ئەستەم بوو بەدیبێ.

ئیـدی کـاتی ئـەوەهات، مـاوریس گوشـارەکەی خـۆی بکـات، ئـەویش بـەدەربڕینی ئەوتێبینیـەی کـەوا بـەردەوام بـەدیهێنانی خـەونی ئـەو جۆرە ئارەزوانـە زەحمـەتن، بـەڵام ئەسـتەم نـین. ئـەو تێبینییـەی کاریگـەری بەسەر پەرۆشبوونی هنری پاولەوە دانا.

ئـەوەی بەدوایـدا هـات، ڕەوتـی خـۆی بـڕی؛ مـاوریس داوی خـۆی بـاش ڕاچنیبـوو تـاکو هنـری چڵێسـیش بکەوێتـە نـاوی. لەوکاتـەی هنـری بـەداوی ماوریسـەوە بـوو، ئیـدی کـاتی چنینـەوەی بـەری ڕەنجـی هـات، لەوەیانـدا هـەمو ئـەو کارامەییـەی بـەکارهێنا کـە مۆسـاد بـۆ کارەکـانی فێریکردبوو.

لـە کـاتێکی گونجـاودا مـاوریس پێشـنیازی ئـەوەی خسـتەبەردەم هنـری پـاول، ئـەو لـە شـوێنێک کـە پێویسـتی بەهەنـدێ زانیارییـە لەسـەر چەنـد کەسـانێک ئیشـدەکا ، هـەر کەسـێکیش ئـەو زانیاریانـە بداتـە دەسـت، پارەیـەکی باشـی لـەبەرامبـەردا دەدرێتـێ. ئـەوە باشـترین شـێوازی مۆسـاد بـوو تـاکو وەک سـەرەتایەک یـەکێک بـۆ لای خۆیـان وەک زانیاریـدەر کێشـبکەن. دواتـر هـەنگاوێکی بچـوک مـابوو تـاکو مـاوریس هنـری تێبگەیـەنێ کـەوا هەنـدێ میـوانی ریتـز هـەن، زانیارییـەکان لەسـەر کەسـایەتیی ئـەوان زۆر گرنگـە بـۆ ئەوجێیـەی کـە مـاوریس پێشـتر بـۆی باسکردبوو.

ڕەنگبـێ پـاول هەسـتی بـە گرنگـی ئـەو بادانەوەیـە نـەکردبێ، کـە لەدەمەتەقێکەیـدا کـردی . خـۆ ئەگـەر پـاول پێشـی ناخۆشـبێ و بترسـێ ئـەوا مـاوریس ئـەوەی بۆ ئامـادە کـردووە کـە بڵـێ من لـە ناڕازیبونەکـەت تێدەگـەم، بـەڵام گـەر وابـێ بەڕاسـتی مایـەی سەرسـوڕمانە، خـۆ دیـارە ئـەوە نهێنی گشـتییە ، کـە ئـەو پـارە لـە وێنـەگرەکان لـە بـری بوارپێدانیان بـە وێنـەگرتنی میوانـە ناسـراوەکانی میوانخانەکـە وەردەگـرێ، باشـە گـەر

وابێ تۆ بڵێ ئێستا ئەو ئەوە ڕەتبکاتەوە کە هاوکاری ماوریس بکا بۆ بەدەستهێنانی هەندێ زانیاری، بەتایبەتیش کە بڕە پارەیەکی زۆر چاوەڕوانی دەکا.

بەگوێرەی ئەو بەڵگانەی لەبەر دەست ماوریس دان و پاشخانی بارودۆخی پاول دەزانێ و بە گوێرەی کارامەیی بۆ ئەو جۆرە پێشنیازانە، ماوریس زۆر متمانەدارانە قسەکانی دەکردن. لەگەڵ قسەکانیشیدا وردەوردە گوشاری دەخستە سەر پاول، چونکە دەیزانی ئەو پێشنیازانە بێکاریگەری نابن، بەڵکو جێپەنجە لەسەر بیری پاول بەجێدێڵن. پاولیش بێ زۆر لەخۆکردن و پرسکردن ئەوەی بەواقیعێک دادەنا کە ئەوپیاوەی بەرامبەری لەسەر مێز دانیشتووە، سیخوڕێکە یان دەیەوێ خەڵک کاریان بۆ بکا.

ڕەنگبێ ئەوە رونکردنەوەی وەڵامەکەی بێ. ئیسرائیلییەکی سەر بەدەزگا، کە دەربارەی ئەو بابەتەی دەزانی گوتی" هنری پاول هیچی بەشاراوەیی نەدەبینی و ڕاستەوخۆ پرسی ئایا ئەو پێشنیازە بۆ ئەوەیە سیخوڕی بکا؟ گەر وابێ بەرامبەر چی هەروا ئاسایی و ڕاستەوخۆ بێ پەردە، بێ ڕێگای پێچاوپێچ کاریان بۆ بکا. تەنها پرسی ئەوە بوو ئایا لە پێناو چی و بۆکێ ئەو کارە دەکا؟ لەو کاتەدا دەبوایە ماوریس دەستبەجێ بەرسڤی بداتەوە، بەڵام ئایا دەبوایە بیگوتبا بەڵێ دەبێ بۆ مۆساد ئیش بکەی؟ ئەو جۆرە وەڵامە وەک پێوەرێکی مۆساد لە بەردەست نەبوو، چونکە هەر ئامانجێک بەجۆرێک لەجۆرەکان کاردانەوەی دەبێ، وەلێ هنری پاول باش کەوتبووە داوەکەوە".

هەر چۆنێک بووبێ ماوریس پاولی تێگەیاند کە چی لێچاوەڕوان دەکا تاکو بیکا، زانیاری کۆکردنەوە لەسە میوانەکان، ڕەنگبێ گوێلێڕاگرتن و تۆمارکردنی قسەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵیان لەپەیوەندی دان یان دەیانبینن. دواتر قسە لەسەر پاداشتی زۆر و

پارەدانەکە دەکەن. ماوریس بە پاولی گوت وا باشترە حیسابەبانکێک لە سویسرا بکاتەوە، کەچی پاول وای لا باشتر بوو کە پارەکە کاش وەربگرێ. ماوریس وای لە پاول کرد ئەو جۆرە کارانە پەرێز لەدوای خۆیان جێناهێڵن. تاڕادەیەک وا ڕاشکاوانە بە پاولی گوت بەڵکو ببێتە پیاوێکی مۆساد. بەوشێوە سەرکەوتوانە چالاکی " لێنزیکبوونەوەیەکی سارد "بەڕێوەچوو.

لەوانەیە پاول تاڕادەیەک تورەبووبێ سەبارەت بەوەی کە چی لێداوادەکەن. لای ئەو دڵسۆزیی بۆ میوانخانەی ریتز بەرامبەر کاری سیخوڕی ڕۆڵێکی وا نابینێ، چونکە ئەو وەک هەر کارمەندێکی دیکە بۆ موچەی باش و هەندێ زێدەماف لە میوانخانەکە کاردەکا. ئەوەی لێیتێگەیشتبێ مشورخواردن و دڵەراوکێکە بۆ ئەوەبوو نەوەک ئەو سەرچڵییەی لێئاشکرا ببێ و لەسەر سیخوڕیکردن لەسەر میوانەکان زیندانی بکرێ.

چی دەبێ ئەگەر بێت بە خۆی و سەربردەکەی بچێتە لای پۆلیس، ئایا چی لێدەکەن؟ ڕەنگبێ ئەوان زانیبێتیان کە ئەوجۆرە پێشنیازەیان بۆ کردبێ. چی دەبێ ئەگەر ئەوپێشنیازەکەی ڕەتکردەوە؟ باشە گەر بەڕێوبەرایەتیی میوانخانەکە پێیزانی کەوا ئەو زانیاری گرنگ دەداتە وێنەگرەکان و بەدزی دەرفەتی وێنەگرتنی میوانەکانیان بۆ ڕێکدەخا، دیارە لەسەر ئەو کارە دەردەکرێ و ڕەنگبێ بەدواداچوونیشی لەگەڵدا بکرێ.

هنری پاول لە دواڕۆژەکانی ئابی 1997 بەرپێی خۆی نەدەدی. ئەو لەسەر خواردنەوە، حەب قوتدان و بەنائارامی نوستن و چەوساندنەوەی بەردەستەکانی بەردەوام بوو .

لەهەمانکاتدا ماوریس لە گوشارخستنەسەر پاول بەردەوامبوو. ئەو دەرفەتەکەی خۆی لەو شوێنە دەدی کە پاول دوای کارەکانی لە میوانخانە بۆی دەچوو. تەنها دیتنی ماوریسی کاستا بەس بوو بۆ

پـاولی یاریـدەدەری سـەرۆكی ئاسایشـپارێزی میوانخانەكـە، كـە چـی لێچـاوەڕوان دەكـرێ. مـاوریس لـە میوانخانـە سـەری لـە پـاول دا، كـە لـە كوچەیـەكی بارەكـە بیـرەی دەخـواردەوە، یـان لەچێشـتخانەكـە سـەرگەرمـی نـانخواردن بـوو، یـاخود پاشـنیوەڕۆیان كاتێـك لـە كافتریاكـە قـاوەی دەخـواردەوە. هێنـری پـاول دەبوایـە وا هەسـت بكـا كـە مـاوریس سـێبەریەتی و بەدوایـدا دەخشـێ. بـەو جـۆرە گوشـارەكان لەسـەری زیاتر دەبوون تا هەرچوار لای لێگیرا.

تـا دەهـات گوشـارەكانی سـەری زیـاتر دەبـوون. ئـەوەش هاوكـات بـوو لەگـەڵ هـاتنی شـازادە دایانـا و دۆدی فایـد، دەبوایـە بـۆ سـەلامەتیان بـەردەوام لـە میوانخانەكـە بـێ و ڕۆژنامەنوسـە وێنـەگرەكانیش بـەدور بگـرێ نـەوەك دایانـا و یاوەرەكـەی هەراسـان بكـەن. بـەردەوامیش لـە ڕێگـەی تەلـەفۆنی دەسـتییەوە لـە لایـەن ئـەو ڕۆژنامەنوسـانەوە زەنگـی بـۆ لێـدەدرا، تـاكو دەرفـەتی زانیـاری پێبەخشـینیان بـدرێتێ، لەبەرامبەریشـدا بـەڵێنی پـارەی زۆریـان پێـدەدا. هـەر ئـەو بەڵێنـەش بـوو زیـاتر دڕدۆنگـی بـۆ دروسـتدەكرد. ئیـدی ڕوی لەهـەر لایەك كردبا هەر گوشاری بۆ سەر دەهات.

هەرچەنـدە هنـری پـاول لـەوەدا سـەركەوت كـە مەسـەلەكە بەسـەرخۆیدا نـەهێنێ، بـەڵام لـە بەرامبـەردا حـەبی قوتـدەدا، حـەبی خـەوی دەخـوارد تـا وا لـە خـۆی بكـا بارەكـە ڕابگـرێ، كـەچی ئـەو جـۆرە حەبانـە توانـای ئـەویان بـۆ بڕیـاردان لەسـەر پێشـنیازەكەی مـاورییس زیـاتر سـنوردار كرد.

پێبـوونی گڵـۆپی تەلەفۆنەكـەی ژوری نوسـتنی مـاوریس نیشـانەی زەنگلێـدان بـوو. تەلەفۆنەكـە لـە كـاتژمێر 01.58 لەشـەوی31ی ئـابی 1997دا لێیـدا و ماوریسـی لـە خـەو هەڵسـاند. ئـەو پیـاوەی تەلـەفۆنی كـرد لـە بەشـی پۆلیسـی ڕوداوەكـانی هـاتوچۆی پـاریس ئیشـیدەكرد، پێشـتر كـاری لەگـەڵ كرابـوو و هێنرابـووە ڕیـزی پیـاوانی مۆسـاد. بـە

گـوێرەی کۆمپیوتـەر ئـەو مابوهـا Maboeha واتـە زانیاریـدەرێکی غــەیرە جــو بــوو. بــەپێی پلــەی پەیوەنــدییان ئــەو لــە خــوارەوەی ماوریسەوە بوو.

ئــەو هەواڵــە کــە مــاوریس گــوێی لــێ بــوو، ماوەیــەک گێــژی کــرد. ڕوداوەکە کاتژمێرێکی بەسـەردا تێنەپـەڕیبوو کاتێ لـە کـەرتی ڕۆژئـاوادا مارسیدســێکی ســیدان بەخێراییــەکی زۆر خۆیکێشــا بــە دەیــەمین کۆڵەگـەی پـردی Place de L`Alma ، شـوێنە نائارامـەکـەی شـاری چراخاندا.

کوژراوەکـان بریتـی بـوون لـە دایانـای شـازادەی وێلـزی دایکـی پاشـای داهـاتوی بـەریتانیا ودۆدی فائیـدی کـوڕی محەممـەد ئەلفائیـدی میسـری خـاوەن بازاڕەکـانی هــارۆدسHarrod`s و هنـری پـاول. پاســەوانی تایبەتی ئەو جوتە مردووەش بە سەختی بریندار بوو.

چەنـد کاتژمێرێـک دوای کارەســاتەکە مــاوریس گەڕایــەوە تەلئــەبیب و بەدوایخۆشــیدا شــوێنەواری پرســیارگەلێکی بەجێهێشــتن، کــە هــەرگیز وەڵام نادرێنەوە.

تـۆ بڵێـی ئـەو لـە ڕێگـەی فشارخسـتنە سـەری چ پشـکی لـەو ڕوداوەدا هــەبوو بــێ؟ ئایــا پــاول کــۆنترۆلی بەســەر لێخــوڕینی ئۆتۆمۆبێلەکــە لەدەسـتدا بـەهۆی ئـەوەی دەیزانـی کـە لـە چنگـی مۆسـاد دەربـاز نـابێ؟ ئایـا پەیوەندییـەک لـە نێـوان ئـەو حـەب قوتدانـەی ئـەودا هـەبووە کـە لـە پشـکنینی خوێنیشـیدا دەرکـەوتبوو؟ تـۆ بڵێـی کـاتێ ئـەو لەگـەڵ سـێ نەفەرەکــەدا دەرچــوو سەرئێشــەی فشــارەکانی وای لێنــەکردبێ؟ ئایــا لەســەرێکەوە ئـەو بـەرپرس نـەبوو لـەو ڕوداوە و لەســەرێکی دیکەشــەوە قوربانی بێبەزەییانەی دەزگای هەواڵگری؟

هــەمو ئــەو پرســانە لــە مێشــکی محەممــەد ئەلفائیــدا دەخولێنــەوە. لــە 1998دا ئــەو گومانــەکانی ئاشــکراکردن " ئــەوە روداوێکــی دەســتکرد

بـوو، مـن لـە نـاخی دڵمـەوە بـڕوام پێـی هەیـە، کـە ڕۆژێـک دادێ ڕاستییەکان ئاشکرا دەبن".

پاش پێنج مانگان و لە بەرنامەیەکی دۆکیۆمێنتاری تەلەفزیۆنی ITV بەریتانیـدا بـاس لـەوەکرا کـە هنـری پـاول پەیوەنـدی لەگـەڵ دەزگـای هـەواڵگری فەڕەنسیدا هـەبووە. بەرنامەکـە ئـەو ئەگـەرەی دانـا کـە لـە ڕێـی هــەواڵگرێکی نەناسـراوەوە کاریگـەری بەسـەر قـەومانی ئـەو ڕوداوەوە هـەبووە، چونکـە بەڵگـە هـەن ئـەوە دەردەخـەن، کـە دەزگـا هەواڵگرییـەکان ئـەو کارەیـان کردبێ، لەبەرئـەوەی لایـەنی بـەریتانی دەترسـا لـەو دەنگـۆ سیاسـییەی بـەهۆی حـەزلێکردنی دایانـا و دۆدی لـە یەکـدی، ئـەوەش بەهۆی ئەوەی دۆدی میسری بوو.

تائێسـتا پەیوەنـدی نێـوان هنـری پـاول و مۆسـاد بـەنهێنی ماوەتـەوە هـەر وەک چـۆن مۆسـاد وای داخـواز بـوو. مۆسـاد بـە هانـدانی کـەس لـە دەروەی وڵات ناجوڵێتـــەوە. لـــە دەرەوەی مۆســـادیش کەســـانێکی زۆر کـەم هـەبوون تێبینـی ئـەوەیان هـەبێ مۆسـاد دەسـتی لـە ڕوداوەکـەدا هەبێ و لەوکاتەدا بەناوبانگترین خانمی جیهان لەناوببا.

محەممـەد ئەلفائیـد بەتوڕەییـەوە بەشـێوەیەک بـۆ میـدیای ئینگلیـزی دەدوا، کـە ئـەوکارە دژی خـۆی و کوڕەکـەی بـە دەسـتی دەزگـا هەواڵگرییەکانـەوە کـراوە. لـە تـەمموزی 1998دا لـە لایـەن دو ڕۆژنامەنوسـی گۆڤـاری TIME ەوە کتێبێـک لەسـەر دایانـا دەرچـوو، تیایدا هـاتووە کـە بـەڕاستی هنـری پـاول پەیوەنـدی بـە دەزگـای نهێنـی هـەواڵگری فەڕەنسـییەوە هـەبووە، بـەڵام نـە ئـەوان و نـە محەممـەد ئەلفایـد ئـەو بەڵگـە حاشـا هەڵنەگرانـەیان نـەبووە، بسـەلمێنێ هنـری پـاول جاسـوس بـووە یـان زانیاریـدەر، لـەوەش هـەر گـەڕێ کـە نـەیان گوتـووە مۆساد بەشێوەیەک لە شێوەکان لەو پرسەدا تێوەگلاوە.

لـە تـەمموزی 1998دا محەممـەد ئەلفائیـد پرسـگەلێکی داڕشـتن و بـۆ هـەمو ئەنـدامانی پەرلـەمانی بـەریتانیای نـاردن، بـەو هیوایـەی لـە

ئەنجومەندا قسەی لەسەر بكەن. ئەو دەڵێ" هێزێك لەپشتەوە هەیە كە بەرسڤی پرسەكانی من بەنهێنی بهێڵێتەوە". ئەو ڕەفتارەی ئەلفائید وا لێكدرایەوە كە كاردانەوەی باوكێكی ماتەمگێڕی پرسەدارە. جێی خۆیەتی تیشكێك بخرێتە سەر ئەو پرسانەی فائید، نەوەك لەبەر ئەوەی ڕۆڵی مۆسادی تێدا دەردەكەوێ، بەڵكو لەبەر ئەوەی پەردەی ڕاستی لەسەر كارەساتەكە و ژیانی ئەو جوتە سەرئاو بكەوێ.

ئەلفائید ڕایگەیاند كەوا لەناوچونی كوڕەكەی و دایانا پیلانێك بووە. دواتر كۆمەڵێك پرسی هەمەجۆری خستنەڕوو وەك: بۆچی كاتژمێرێك و 40 خولەكی خایاند تا شازادەیان گەیاندە نەخۆشخانە؟ بۆچی هەندێ لە رۆژنامەنوسە وێنەگرەكان تائێستاش هەندێ لەو وێنانەی گرتویانە ئاشكرایان نەكردوون؟ بۆچی هەمان شەو هەڵكوترایە سەر London hous كە بازرگانی بە وێنەی ڕۆژنامەنوسەكانەوە دەكرد و هەندێ وێنە بزربوون؟ چۆن بوو هیچ كامیرایەك لەو بەشەی پاریس كاری نەدەكرد و وێنەیەكی ئەو ڕوداوەمان بۆ بگرێ؟ بۆچی هیچ كامیرای ڕادارێكی هاتوچۆ وێنەیەكی خێرایی ئۆتۆمبێلەكەی نەگرتووە تا نیشانمانبدا كە بە ڕاستی لێخوڕەكە زۆر خێرا بووە؟ بۆچی شوێنی ڕوداوەكە بۆ ماوەیەكی درێژ دانەخرا، كەچی یەك سعات دوای روداوەكە بۆ هاتوچۆ كرایەوە؟ كێ بوو ئەو كەسەی كە ڕۆژنامەنوسانی تا بەر دەركە گەیاند كاتێ ئەو جوتە دەرچوون؟ ئەو دو كەسە نەناسراوە كێ بوون، كە لە باڕی میوانخانەكەدا لەنێو ئاپۆرەی خەڵكەكەدا بوون؟

مۆساد هیچ بەرژەوەندی لە پەیوەندییەكەی نێوان دایانا و دۆدیدا نەبوو. دەزگا یەك شتی دەویست ئەویش بەگەڕخستنی هنری پاول بوو وەك زانیاریدەرێكی میوانخانەی ڕیتز. دەربارەی هەندێ لەوێنە نهێنییەكان دەكرێ بگوترێ مۆساد هەندێ پیاوی خۆی

وەک ڕۆژنامەنووس بەکارهێنابێ. ڕەنگبێ ڕاست بێ کە ئاژانێکی مۆساد ئێشکگری میوانخانەکە بێ. ڕەنگبێ لە نێوان ئەو دو کەسە نەناسراوەی بارەکە پەیوەندیان بە مۆسادەوە هەبێ. گەر ئەوە وابێ کەواتە دڵنەواییەکە بۆ محەممەد ئەلفائید.

یەک دو هاوڕێی ماوریس بەرەبەرەبەوە بڕوایان زیاتر دەبوو کە ئەو جۆرە چالاکیانە و هەوڵدان بۆ خستنەگەڕی کەسانی وەک هنری پاول، ئەنجامدانی ئەوچالاکییە بێ هەراو هەنگامە نێو دەوڵەتیانە، لەماوەیەکی درێژدا زیان بە ئیسرائیل دەگەیەنن، زیان بە پرۆسەی ئاشتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەگەیەنن، لەکۆتایشدا باش نین بۆ پەیوەندییەکانی خودی ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانی، بۆ نمونەش ولاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا. زۆر لەپیاوانی مۆساد دەیانگوت بارودۆخەکە بەرەو خراپتر ڕۆیشتووە لەوەتەی بنیامێن ناتانیاهۆ لە 1996ەوە بۆتە سەرەک وەزیران.

یەکێک لە پیاوە دێرینەکانی مۆساد گوتی" خەڵک وەک کەسانێکی خراپ تەماشای پیاوانی مۆساد دەکەن نەک وەک کەسانێکی نیشتمانپەروەر. ئەوەش بۆ ئێمە و بۆ ورەشمان زیانبەخشە، کە کاریگەرییەکی نەرێیانە دەخاتە سەر پەیوەندیمان و دەزگاکانی دیکەی راژە".

ئەفسەرێکی دیکەی ئەزموندار ڕاشکاوانەتر پەردەی لەسەر باسەکە هەڵمالی کاتێ گوتی " ناتانیاهۆ وا ڕەفتاردەکا کە مۆساد وەک سوارچاکێک بێ لەسەر مێزی خڕ دانیشتبێ، ئەویش شا ئارسەر Artherبێ، ئینجا هەمو سپێدەیەک دەبێ شتێک ڕوبدا ئەگینا سوارچاکەکان هەراسان دەبن. ئەوەیە هۆی ئەوەی کە ئێستا هەمو شتێک لەگەڵ مۆساددا بەهەڵەدا دەڕوا. پێویستە ئەو ڕەفتارانە رابگیرێن، پێش ئەوەی کاتەکە لەدەستبچێ ".

یەکەمین پەندم کە وەرگرتبێ لەوەتەی چارەکە سەدەیەکە خەریکی نوسینم دەربارەی کاروباری هەواڵگری، نهێنی سەرلێشێواندن و چەواشەکارییە کە زۆر دێتە پێش، هاوشان لەگەڵ کردەکانی گەندەڵی، سەرانەسەندن، هەندێ جاریش کوشت. ئاژانەکان وافێردەکرێن کە بەدڕەفتاری لەگەڵ برادەرایەتی بکەن و بیقۆزنەوە. ئەوان ڕێزپەری ئەو ڕێسایەن کە پیاوی ڕاستەقینە نابێ پۆستی یەکدی بخوێنێتەوە.

یەکەمین جار کە ئاشنایەتیم لەسەر ئەوباسانە پەیداکرد، کاتی لێکۆڵینەوەم بوو لەسەر گەورە شەرمەزارییەکانی جاسوسی لە سەردەمی شەڕی سارددا، خیانەتکردنی Klaus Fuchs لە نهێنییەکانی ئەتۆمی ئامریکا، شێوازی بەدگوماناویM15 وM16ی بەریتانی لەگەڵ Guy Burgess ، Donald Maclean, Kim Philby.هەمو ئەوپیاوانە بە ناپاک و دوسەرەیی ناسران. من تاکە نوسەرێک بووم کتێبێکم لەبارەی مکوڕبوونی سیا CIAلەگەڵ Mind Controlلەسەر لەخشتەبردنی گیانی کەسانی دیکە نوسی. بەکردەوەش سیا 10ساڵ دوای دەرچوونی کتێبەکەم journey into Madness'گەشتێک بۆ شێتیی' زانیارییەکانی ئاشکراکردن. بەئاشکرا داننان بەوەی کردەوە ڕەشەکانی نهێنیی ئێستا بوونەتە هونەرێکی ڕەش.

ئەمە ڕێگرنەبوو کە دواتر ڕاستییەکانم بۆ دەرکەون، ئەویش بەخێری دو بنەوانی هەواڵگری نهێنیی خۆی، Joachim Kranerی کۆچکردووی خەزورم، کە لە دوا ساڵەکانیدا سەرپەرشتی تۆڕێکی جاسوسی سەربەM16 ی لە Dresden دەکرد، لەگەڵ Bill Buckleyفەرماندەی سیا لە بەیروت. لە ڕوی جەستەییەوە ئەو دوانە زۆر شتیان بەیەک دەچوو، هەردوکیان زەلامی درێژی لاوازی بازودار بوون و هەردوکیشیان خاوەنی چەناگەیەکی وابوون، کە گەواهی لەسەر ڕوبەروبوونەوەیان بدات لەکاتە سەختەکاندا. نیگای

ئـەوان کـەمتر دەربڕی دەرونیـان بـوو، بێجگـە لـەوەی کـە تۆ وەک خۆت گـەر بەشێک نـەبی لـە وەڵام ئـەوا دەبیٚ بەشـێک بی لـە کێشـەکان. ئـەوان هــەردوکیان زیــرەک بــوون و ڕەخنــەیان لــە کــاری نهێنیــی هــەواڵگری دەگرت کە پێشتر کردویانە هەندیٚ جار توند و کوشندەش بووە.

ئـەوان ئـەوەیان بـەبیر دەهێنامـەوە کـە دەکریٚ زۆر لەسـەر ئـەوەی کـە Bill بەگاڵتــەوە دەیگــوت ' پفــدانی بەنــدوباوەکان' شــەڕێکی کوشــندە لــە شـوێنیکی نادیـار، پێوەبـوونی هـەموان گـەر یـەکێک یـان تۆڕەکـە ئاشـکرا بـوو، چالاکییـەکی نهێنـی کـە سـەرلەبەری تێکدەچیٚ بـەوەی لـە سـەرەتاوە ڕایــەڵی دیپلۆماســی بــۆ ڕادەچێنــریٚ، زانیــاری ڕۆژانــەی شــتێک وەک پارچــە پوزەلێــک وابــی کــە جێگــەی بدۆزێتــەوە و مەتەڵەکــە هــەڵبێنیٚ. Joachim یـش ئـەوەی خسـتەسـەر " هەنـدیٚ جـار هەنـدیٚ قسـەی بیٚ بایەخ تیشک دەخەنە سەر بابەتێکی نویٚ بۆ تێهەڵچوونەوە".

ئــەو دو پیــاوە دو ئەنــدامی شــانازکەری وەکJoachim زۆر جــاران دەیگـوت " پیشــەی هــەرە دێــرین" بــوون. ئــەوان نــەوەک هــەر بــرادەر بــوون بــەڵکو ئــەوەیان پێســەلماندم کــە کلیلــی زۆر لــە پەیوەندییــە نێودەوڵەتییــەکان و بــارودۆخی سیاســی بــوون لــە ســەر ئاســتی دیپلۆماسـی و تیـرۆر. لـە ڕیگـەی ئـەوان مـن پەیوەنـدیم لەگـەڵ دەزگـا هەواڵگرییــەکانی ســـڤیل و ســـەربازییەکانی وەکBND ی ئاڵمـــانی، DGSی فەڕەنسی و دەزگا نهێنییەکانی بەریتانی و کەنەدی کرد.

Joachim بـە خانەنشـینی کـۆچی دوایـیکـرد، Bil یـش بەدەسـتی ئـسـولییە ئیسـلامییەکان لـە بـەیروت ڕفێنـرا و کـوژرا، ئـەوەبوو قـەیرانی بارمتە ڕۆژئاواییەکانی لە لوبنان لێکەوتەوە.

پاشــان چــاوم بــە هەنــدیٚ لــە کەســانی ســەر بــە دەزگــای هــەواڵگری ئیسـرائیل کـەوت. ئـەوان یارمەتیانـدام بـۆ پەیـداکردنی پاشـخانە زانیـاری لەسـەر محەمـەد عـەلی ئاگجا ( Mehmet Ali Agca)ی توندڕۆی تــورک، کــە لــە نیســانی1981دا لەمەیــدانی ســنت پیتــەر لــە ڕۆمــای

پایەتەختدا، هەوڵی کوشتنی پاپای ڤاتیکانJohannes-Paulus II دا. ئەو پەیوەندیانەم لە ڕێگای Simon Wiesenthal ەوە بوون، ئەو ڕاوچییە زەبەلاحەی نازییەکان کە دەوروبەری چل ساڵ دەبێ بناوانی نهێنی گرانبەهایە بۆ مۆساد لەسەر نازییەکانی دوای شەڕ. بەهۆی ناووناوبانگی زۆری ئەو زۆر دەرگای بەتایبەتیش لە واشنتۆن لەسەر دەکرێنەوە.

من لە 1986 چوومە ئەو شارە، لەوێ مکومیی پەیوەندی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئامریکا و ئیسرائیلم زانی. من لە واشنتۆن لەگەڵ William Casey بەڕێوبەری ئەوکاتی سیا دیدارم بوو، ئەمەش بەمەبەستی سەرقاڵ بوون بە لێکۆڵینەوە لەسەر کتێبەکەم Journey into Madness بەتایبەتیش ئەو بەشەی لەسەر مردنی Bill Buckley دەڕوا.

بەدەر لە قاتە گرانبەهاکەی، کێیسی بچمێکی هەژارانەی هەبوو. دەموچاوە گۆشتنەکەی بزرکابوو، چاوەکانی سور هەڵگەڕابوون، کاتێ من دیدارێکم لە یەکێ لە یانەکانی واشنتۆن لەگەڵیدا سازدا، وەک کەسێک هاتە پێش چاوم دوای پێنج ساڵ بەڕێوبەرێتی لە دەزگای سیا پیلەکەی خەریکە تەواو دەبێ.

لە کاتی دانیشتنەکەماندا کاتێک خەریکی خواردنەوەی ئاوی کانزایی بووین، مەرجەکانی خۆی بۆ دیدارەکە پێڕاگەیاندم، کە بریتی بوون لەوەی هیچ کۆنوسێک و هیچ تۆمارکردنێک لە گۆڕێدا نەبێ. هەمو ئەو زانیاریانەی ئەویش هەڵیدەڕێژی دەبێ تەنها وەک پاشخانە زانیارییەک بەکاربهینرێن. پاشان چەند کاغەزێکی خستنەبەردەستم کە نەخشەی بیۆگرافیای لەسەر دروستکردبوو. ئەو لە13 ی ئازاری 1913 لە نیۆیۆرک لەدایکببوو. لە 1937دا پلەیەکی لە ڕشتەی مافەکان لە زانکۆی St.Johans بەدەستهێنابوو. مانگێک دوای ئەوەی بوو بە ئەفسەری یەدەگ لە مارینز لە 1943دا، گواستراوتەوە

بۆ نوسینگەی خزمەتی ستراتیژی Office of Strategic Service(OSS) کە دواتر بوو بەدەزگای سیا. لە 1944 دا بووە بە بەڕێوبەری هەواڵگری تایبەتیOSS لە ئاوروپا، پاشان لە ساڵانی 1971تا 1973 بووە بە سەرۆکی ئاسایش و کۆمسیۆنی گۆڕان، ئەو کۆمسیۆنەی کۆنتڕۆلی بۆرسەی وۆلستریتی ئامریکای دەکرد. دواتر لە ساڵانی 1973-1974بووەتە جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ئابوری. لە ساڵانی 1974-1976یش سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی Import Bank و لە 1976-1977 ئەندامی دەستەی ڕاویژکارانی سەرۆک بوو بۆ کاروباری هەواڵگری نهێنی و لە 1980شدا سەرۆکی هەڵمەتی ڕۆنالد ڕیگن بوو بۆ هەڵبژاردن کە تیایدا سەرکەوتنی بەدەستهێناو ریگنیش بەسەرۆک هەڵبژێردرا. ساڵێک پاشتر واتە لە 1981دا ڕۆنالد ڕیگن کردییە بەڕێوەبەری گشتیی سیا، کە سێزدەهەمین بەڕیوبەری گشتی ئەو دەزگا دەسەڵاتدارە بوو.

بەرامبەر ئەوتێبینییەی من کە گوتم بۆ هەندێک پلە و پایە دەستێکی پارێزەری لە پشتەوە بووە، کاردانەوەی وابوو کە نابێ شۆڕببینەوە نێو کاروباری تایبەتی کەسایەتی.

ئەو دەستە کاغەزەکەی خستە گیرفانییەوە و چاوەڕێی پرسەکانی من بوو، تۆ بڵێ چیم لەبارەی Bill Buckley ەوە بۆ باسبکا، کە هەینی 16ی ئازاری 1984دا لە بەیروت ڕفێندرا و پاشان سەلمێنرا کە کوژراوە. من دەمویست بزانم ئاخۆ سیا چی بۆ بەردانی بیل کردووە ، ماوەیەک چوومە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئیسرائیل تاکو سەروسۆراخێکی پرسەکە بکەم.

کێیسی قسەی پێبڕیم، گوتی " بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ئادمۆنی Admoni یان پیاوەکانی ئەوت پرسیوە؟"

ناحوم ئادمۆنی Nahum Admoni لە 1982 بوو بە بەڕێوبەری گشتیی مۆساد. بەگوێرەی هەڵسوڕێنەرانی تەلئەبیب ئەو پیاوێکی توند و خۆگربوو. کێیسیش وای پەسنی" ئەو جولەکەیەکە دەیەوێ تەنانەت کێبڕکێی میزکردنیش لە ئێوارەیەکی پایزی پڕباو و بۆران لە Gdanskبباتەوە". ئادمۆنی لە 1929 لە ئۆرشەلیم وەک کوڕی کۆچکردویەکی پۆلۆنی کە ئێستا لە چینی مام ناوەندن، لەدایکبووە. لە Rehavia Gymnasiumئۆرشەلیم گەورە بووە و پەرەی بە کارامەیی زمان زانیین داوە و لە شەڕی سەربەخۆخوازیشدا لە 1948 بۆتە لاوتنانت Luitenant هەواڵگری سەربازی.

کێیسی وا ئادمۆنی پەسنی " ئادمۆنی بە شەش زمانان دەسەڵاتی بەسەر هونەری گوێگرتندا هەیە".

دواتر ئادمۆنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لە زانکۆی Berkely خوێند و زۆرجارانیش دەرسی لە فێرگەی مۆساد لە تەلئەبیب دەگوتەوە. ئەو وەک پۆلیسێکی نهێنی لە ئاسیوپیا و پاریس و واشنتۆن کاریکردبوو، بۆیە ئەوانەی پێش کێیسی وەک Richard Helms و William Colby دەناسی. ئەو هەمو جێیانە وای لێکردبوو، ببێتە پیاوێکی بیرۆکرات لە ناو ڕیزی هەواڵگریدا، پیاوێک بوو دەنگ نەرم، کاتێکیش بوو بە سەرۆکی مۆساد هەروەک کێیسی دەڵێ" توند خۆی بە دیسپلینەوە بەستەوە". ئەو حەزی لە خۆشمەحشەری و هەروەها چاویشی لەسەر ژنی جوانە وەک ئەوەی باشترینیان بێ لە ئیسرائیل. هەروەک کێیسی پێیوایە ئەو بە هۆی کارامەیی دەگەیشتە بالآترین پایە.

ئەوەی بەدوایدا هات بەهەمان دەنگی ڕەخنەئامێز دەگوترا، کە کەس نەیدەتوانی وا دابنێ کە وا دادێ. لەوکاتەی ئادمۆنی نەیدەتوانی هیچ بکا، بیل کوژرابوو. بیر لەوە بکەوە ئاخۆ بارودۆخی ئەوکات چۆن بوو. لە دو کامپی پەنابەران لە بەیروت کوشتارگە دروستبوو ،

کە نزیکەی هەزار فەلەستینی سەریان تێداچوو. کوشتارەکە لەلایەن کریستیانە لوبنانییەکانەوە ئەنجامدرا، جووەکانیش تەماشایاندەکرد، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئینجیل بوو. کێشەکە ئەوە بوو کە ئادمۆنی لەگەڵ ئەو دزە جومەیلGemayel لەژێر یەک پەتۆ دابوو . بەشار جومەیل سەرکردەی کەتائیبی (phalange) کریستیانەکان بوو دواتر بوو بە سەرۆکی لوبنان.

'ئێمە لەگەڵ جومەیلیش قسەمان کرد، بەڵام هەرگیز باوەڕیمان بەو بیژمۆتە نەدەهات. وەلێ ئەوکاتەی بیل ئازار دەدرا، ئادمۆنی کاری لەگەڵ جومەیل دەکرد... ئێمە نەماندەزانی لە بەیروت لە کوێیان حەشار داوە. داوامان لە ئادمۆنی کرد بەدوایدا بگەڕێ، گوتی باشە چاوەڕێ بکەن. ئێمەش چاوەڕێ و هەر چاوەڕێ. باشترین پیاوی خۆمان ناردە لای مۆساد لە تەلئەبیب تاکو کۆمەکیان بکا. گوتمان پارە مەکەن بەکێشەیەک. ئادمۆنی هەر دەیگوت " بەڵی هەموی باش دێتەوە، ئێمە تێگەیشتین".

کێیسی قومە ئاوێکی دیکەی کانزایی خواردەوە، گەڕایەوە جیهانی خۆی. پاشان ئەوەی گوتی زۆر بەزەحمەت وەک ئەوەی سەرۆکی دەستەیJury دادگا بێت و بڕیارەکە بخوێنێتەوە.

'پاشان ئادمۆنی ویستی چیرۆکەکە بە ئێمە بفرۆشێتەوە بەوەی PLOڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لە پشت ڕفاندنەکەوەیە. ئێمە دەمانزانی ئیسرائیلییەکان ئامادەن دەستی چەور بەسەر سەری یاسر عەرەفات بسرن، بەڵام پیاوانی ئێمە ئەوەیان بۆ قوت نەدرا. ئادمۆنی زۆر بەمتمانەوە ئەوەی دەگوت و لەدەنگیشیدا ڕاستگۆیی پێوە دیار بوو. لەوکاتەی کە زانیمان عەرەفات دەستی لەو کارەدا نییە، تازە بۆ بیل کار لەکار ترازابوو. ئەوەی ئێمە نەمان دەزانی، مۆساد کارێکی چەپەڵی کرد، ئەوان چەکیان دەدایە حیزبوڵلا تا

کریسـتیانەکان لەناوببـەن و لەسـەرێکی دیکەشـەوە چـەکێکی زۆرتریشیان دەدایە کریستیانەکان تا فەلەستینییەکانی پێبکوژن ".
کێیسـی بەتـەواوی وێنـەی ڕوداوەکـەی بـۆ نەکێشـام کـە بـۆچی بیـل وای بەسـەرهات و ڕزگارنـەکرا. هـەروەک ڕاسـتەوخۆ سـیا بـڕوای پێکـرد مۆسـاد بـە ئەنقەسـت بیلـی ڕزگارنـەکرد، بـەو هیوایـەی تاوانەکـە بخاتـە گـەردنی عـەڕەفات، چونکـە دەرەنجـامی کوشـندەی لێدەکەوتـەوە و واشـنتۆن تـەواو پشـتی لـە عـەڕەفات دەکـرد. سـەیرە پەیوەنـدی نێـوان دو دەزگای هەواڵگری دۆست بەو جۆرە بێ.
کێیسـی ئـەوەی نیشـاندام کـە پەیوەندییـەکانی نێـوان ئیسـڕائیل و وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئامریکـا ڕوێکـی دیکـەیان هەیـە، لـەپاڵ ئـەو کۆمـەک و پشـتگیرییەی جووەکـانی ئامریکـا لـە ترسـی دوژمنـە عەڕەبـەکانیان، دەوڵەتی جو وا یارمەتی دەدرێ کە ببێتە سوپەردەسەڵاتی ناوچەکە.
پـیش ئـەوەی مـن و کێیسـی یەکـدی بـەجێبێڵین، شـتێکی دیکەشـی لەمێشـک بـوو پێیگـوتم" هـەر گـەلێک دەزگـای هـەواڵگری خـۆی دروسـتدەکا کـە پێویسـتیەتی. ئامریکـا متمانـەی بـە پێشـەنگی تەکنەلۆژیایی هەیـە، چونکـە ئێمـە بـەردەوام لەسـەر پێین لـەبری ئـەوەی لەپشـت پەنجـەرەوە فەرمانبـدەین. کـەچی ئیسـڕائیلییەکان بەشـێوەیەکی دیکـە کاردەکـەن. بەتایبـەتیش مۆسـاد وای دەبینـێ کـە چالاکییـەکانی چارەنوسسازن بۆ مانەوەی نەتەوەکەیان".
ئـەو ڕەفتـارەی ماوەیـەکی دورودرێـژ مۆسـادی لـە لێکۆڵینـەوەی ڕەخنـەدار پاراسـت. لـەماوەی ئـەو دو سـاڵەی کـە پێویسـتم پێیبـوو بـۆ نوسـینی ئـەم کتێبـە، زنجیـرە هەڵەیـەک و تەنانـەت شـەرمەزاریش لـەو دەزگایـە ڕویانـدا کـە بـووە مایـەی ئـەوەی دەزگـای نهێنـی کتـوپڕ ببێتـە جێـی چـەقی بازنـەی سـەرنجی خـەڵکی ئیسـڕائیل. پرسـیار کـران، بـەڵام بەدەگمـەن وەڵامـەکان ئاشـکراکران، تـۆ بڵێـی ئـەو قەڵغانـەی مۆسـاد لەبەرامبەر دنیای دەرەوە هەڵیگرتبوو کونی تێکەوتبێ.

قسەم لەگەڵ سەدان کەسی سەر بەدەزگای نهێنیی ئیسرائیل یان هاوشێوەکانیان لە وڵاتانی دیکە کرد یان بۆ ئەوانەی ناڕاستەوخۆ بۆ ئەوان کاریاندەکرد، زۆریان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە من زیاتر لەسەر سالانی دوایی ڕژد بم، هەرچی ڕابردوی دوریشە وەک پاشخانێک بەکاربهێنم بۆ لێکدانەوەی ڕۆڵی مۆساد وەک بەرەیەکی پێشەوە لەبواری زانیاری و هەواڵگری. هەرچەندە هەندێک کەس لەوانەی قسەم لەگەڵ کردون پێشتر دیداریان لەگەڵدا سازنەدراوە، بەڵام نەگەیشتمە وەڵامێکی ئارامبەخش، کە بۆچی ڕەفتاری خۆیان و ئەوانی دیکە بەوشێوەیە. هەندێکیان هیچیان تیا نەهێشتەوە، بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون ناویان بێت. بۆ ئەوانەی لە خزمەتی مۆساددان شتێکی زۆر گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە، کە قانونی ئیسرائیلی ئەوە قەدەغە دەکا کە هەرکەسێک لەخۆیەوە و بەناوی خۆی قسە بۆ ڕاگەیاندن ئاشکرابکا. هەندێ سەرچاوەی نائیسرائیلیش حەزیان کرد - هەرواشمانکرد - کەناویان نەهێنرێ.

لە هێمای ستراکچەری ڕێکخراوەکان، ئەوانەی ڕۆژنامە و گۆڤاریش دەردەکەن زۆر لە ژێدەرەکانیان بە نەناسراوی دەهێڵنەوە. ئەوان تائێستاش هەر لەسەرهەمان ڕێسا دەڕۆن تەنانەت بۆ ئەو کتێبەش ویستیان هەروا بن یاخود هەندێکیان تەنها ناوی یەکەمیان یان ناوی خوازراویان بڵاوبکرێتەوە. ئەوەش وا دەکا چیدی شایەتمانییەکانیان نەخوا. ئارەزوی کەسایەتیی ئەوان تاکو ئەو بێدەنگییە بەلاوەنێن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، هەیانە بەخۆئاشکراکردن دەیەوێ جێگەیەک لە مێژو بۆ خۆی بگرێ تا ئەو کەسەی دەیەوێ ئەوەی کردویەتی یا نەیکردووە بە کارێکی ڕەوای دابنێ. لەهەندێ باریشدا بەئاسانی یادکرنەوە یان ڕەنگبێ شێوەیەکی سزا پاڵنەریان بێ. بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەویست ناویان ئاشکرابێ هەمان ڕێسایان بەسەردا پەیڕەودەکرێ.

ڕەنگبێ باشترین پاڵنەر کە کتێبێک لێکبکەینەوە، ترسان بێ لەوەی کە ئەوان بەشانازییەوە خزمەتی دەزگایەکیان کردووە، بەڵام لەگەڵ ڕۆژگاردا لەناوەوە توشی داهێزران و هەڵوەشانەوە دێ، ئەوسا یەک ڕێگا چارە هەیە بۆ ڕزگارکردنی، ئەویش ئاشکراکردنی ئەوەی لە ڕابردودا کردویەتی لەگەڵ ئەوەی ئێستا دەیکا. بۆ ئەوەی هەر دو ڕوەکە تێبگەین هەوڵدەدەین سەرەتا بزانین کە مۆساد چۆن و بۆچی هاتە کایەوە .

# 2

## پێش دەستپێک

{بەردبارانی 1929ی نوێژکەران‌و دیواری گرینۆک.. چەکەرەی بیرۆکەی دەزگایەکی هەواڵگری پاشان مۆساد.. میلیشیاکانی هاگانا.. سیخوڕ پەیداکردن لەنیو عەڕەبان.. کۆچی جووەکان لەدوای جەنگی جیهانیی دوهەم.. کۆچی جووەکانی مەراکش.. رفاندنی فڕۆکەی میکی 21 لە عێراق ساڵی 1966.. هاوکاری کوردان لە رفاندنەکەدا.. رفاندنی مادلین..}

لـە  بەرەبەیانـەوە بـڕواداران بـەرەو پیرۆزتـرین شـوێنی دنیـا – دیـواری گرینۆک – دەهاتن، کە تاکە شـوێنەواری بـەجێماو بـوو لـە دوهـەم پەیکـەری پەرستگای دەستکردی  هیرۆدۆتی گەورە لە ئۆرشەلیم. هاتووەکان گەورە و بچوک، قەڵە و ولاواز، بەڕدێن و بێڕدێن هەموویان بەکۆڵانی تەنگەبەری شار ڕروەو شوێنە پیرۆزەکە ملیان نابوو.

کارمەندی فەرمانگاکان و شوانەکان شانبەشانی یەک، لە گردەکانی سەروی ئۆرشەلیمەوە دەهاتنەخوارەوە. گەنجەکان کە خوێندنیان تەواوکردبوو و تازە بـەهاری ژیانیـان بـوو، لـەپاڵ پیاوانێـک دەڕۆیشـتن کـە ئێـوارەی تەمـەنیان داهاتبوو. مامۆستایانی کەنیشتەکان مل بەملی دوکاندارەکان، کە لە دورەوە هاتبوون، ڕێگایان دەبڕی. ئەوانە لە شارەکانی وەک حەیفا و تەلئەبیب یان  لە گوندەکانی دەوروبەری دەریاچەی خەلیلەوە دەهاتن.

هەموویان بێ ڕریزپەڕ پۆشاکی ڕەشیان پۆشیبوو، هەموشیان کتێبی نوێژیان لـەبن  هەنگڵدابوو، تـاکو ڕواوڕو بـەرەو ڕوگـە و بـەرزایی دیـواری گرینـۆک درودەکانیان بخوێننەوە.

لە هەمو سـەدەکانی ڕابـردودا جولەکـەکان لەسـەر ئـەو ریتوێلـە ڕۆیشـتون، بەڵام ئـەو شـەوە(سـابات) ئێـوارەی هـەینی ئـەیلولی 1929 شـتێکی دیکـە لـە گۆڕێدابوو. رابییەکان (پیاوی ئایینی Rabbi ) خەڵکێکی زۆریان بانگکردبوو،

تاکو ئەم جارەیان بەشێوەیەکی بەرچاو و نەترسانە نوێژەکانیان بکەن. ئەوە تەنها بۆنەیەک نەبوو بۆ نوێژکردن و دەربڕینی بیروڕای ئۆلپەرستییان، بەڵکو ئاماژەیەک بوو بۆ دەرکەوتنی زایۆنیزم و هێمایەکیش بو بۆ عارەبان. نیشانەیەک بوو کە جووەکان ئیدی بواری لەمەوپاشی هەراسانکردنیان پێنادەن.

بەر لەو ڕۆژە بەچەندان مانگ، بەندوباو سەبارەت بەو ڕۆژە بڵاوببوونەوە. خەڵکی موسڵمان تادەهات سەبارەت بەو بالۆرەی گوایە هێرشی فراوانخوازی زایۆنیزم بەڕێوەیە، توڕەتردەبوون. مەترسییەکەش زیاتر بەهۆی ئاکارەکانی ڕاگەیاندنەکەی بلفۆر سەریهەڵدا کە پەیمانی دەوڵەتێکی فەرمی لە فەلەستین بە جولەکە دا. ئەوەش بۆ عەرەبە نێشتەجێکانی ئەویٚ، ئەوانەی هەندێکیان ڕەچەڵەکیان بۆ سەر پێغەمبەر دەگەڕاندەوە،لەکەو شەرمەزاری بوو. ئەو خاکەی چەندان سەدە لەسەری نیشتەجێبوون، کەوتە بەر گەف. ئەوان دەترسان زەوییەکانیان و خۆشیان لە لایەن زایۆنییەکان و پشتیوانە بەریتانییەکان کە لەگەڵ جەنگی یەکەمی جیهان هاتبوون و منداتی(راسپاردەیی) فەلەستینیان کەوتە بەردەست، دەستیان بەسەردابگیریٚ. بەریتانییەکان فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیان بەچەشنی فەرمانڕەوایی بەشەکانی دیکەی ئیمپراتۆریەتەکەیان دەکرد. هەوڵیاندەدا هەردولا ڕازیبکەن، هەم لە ناڵ هەم لەبزماریش بدەن. ئەوەش پێشبەرەی کارەساتەکان بوو. گرژی لە نێوان عەرەب و جو پەرەیسەند. شەڕەچەقەی نێوانیان تا دەهات زیاتر دەبوو. کێشەکەش زیاتر لەسەر ئەو شوێنانە بوو، کە جووەکان دەیانویست کەنیشتە و قوتابخانە دینییەکانیان لەسەر ئاوابکەن. جووەکان لەسەر ئەوە ڕژدبوون کە مافی خۆیانە لەبەردەم دیواری گرینۆک لە ئۆرشەلیم نوێژەکانیان بکەن، چونکە ئەوە گەوهەری ڕیتوێلە ئاینییەکەیانە.

لە سعات حەوت کە سعاتی شیما ئیسڕائیلە دەوروبەری هەزار جو لەبەردەم دیوارە بەردە لماوییە زەردەکان خڕبوونەوە و هەریەکەیان پەیڤە

کۆنـەکانی کتێبـە پیرۆزەکـەیان دەگوتـەوە. بـەرزونزمی دەنگیـان ئیقـاعێکی دڵخۆشکەرانەی دەدانێ.

ئـەوکات لـەپڕ و بەلـەز، بەبـەرد، شوشـە، قوتـو و هـەرچی شـتی پیسـە بۆمبـارانکران. بەردبارانەکە لە لایـەن عـەرەبەکانـەوە بـوو، لەبەرزاییـەکانی دەوروبەریان ئاگایان لـە خۆئامـادەکردنی جووەکـان هـەبوو. دەنگـی بـەرد و شێلکە تەققەی تفەنگـە کۆنـەکانی دەسـتی عەرەبـە موسـڵمانەکان ئـەو نـاوەی شـێواند. لێرەولـەوێ جولەکـە دەکـەوتن و لەلایـەن هاوەڵەکانیانـەوە هەڵدەستێنرانەوە و دەیانبردنەوە. لەو هەرایەدا جێی سەرسوڕمان بوو، کەس نەکوژرا، بەڵام لەژمارە بەدەر برینداریان هەبوو.

هـەمان ئێوارە سـەرکردە جووەکـان لـە کۆمەڵگاکـەیان یـوزوف Yisjoef لەفەلەستین کۆبونەوە. ئەوان سەلماندیان کە خۆنیشاندانەکەیان بەرێکوپێکی داڕێژرابوو، وەلێ تەنها لەیەک شتی کەم بوو، ئـەویش نـەبوونی زانیـاریی پێشکات سەبارەت بەهێرشی عەرەبەکان بوو.

یەکێک لە ئامادەبووانی کۆبونەوەکە بیرۆکەی مێشکی هەموویانی بەو چەند وشـانە دەربـڕی " ئێمـە دەبوایـە بیـر لەنوسـراوە پیرۆزەکـان بکەینـەوە. هەرلەسەردەمی شا داودەوە گەلی ئێمە بڕوای بە سیخوڕی باش هەبووە".

بە بەر چێژی خواردنەوەی کۆفی تورکی و شیرینی هـەنگوین ئاسـا، لـەوێ بناغەی شـتێک دانـرا. پاشـان وا گـەورە بـوو، بەسـامترین دەزگـای زانیـاریی دنیـای (مۆسـاد) ی لێکەوتـەوە. کـەچی بـۆ بـە فـەرمی دامەزرانـدنی دەبوایـە چارەکە سـەدەیەکی دیکە بوەسـتن. سـەرانی کۆبونەوەکە بنـەمای دەزگـای زانیاریی بەدەستهێنیان دانا، ئنجا کەوتنەخۆ پارە لە خۆیان و دراوسـێکانیان کۆبکەنەوە. پارەکەش بۆ ئەو عەرەبانە بوو کە دەیانویست هێشتا بە ئاشـتی لەگەڵ جووەکان بژین و زانیـاری لەسـەر هێرشـە چاوەڕوانکراوە تازەکـانی عەرەبان بدەن .

لەگـەڵ ئەوەشـدا جووەکـان دەسـتبەرداری مـافی نوێژکردنیـان لەبـەردەم دیـواری گرینـۆک نـەبوون ، بـەڵام ئـەم جارەیـان نـەوەک بـە پشـتیوانی

بەریتانییەکان، بەڵکو بەپشتیوانی تواناکانیان لە ڕێی میلیشیای هاگانا HAGANAی خۆیانەوە. لە مانگەکانی دیکەی دوای هەراکە، توانیان بەهۆی بەیەکەوە بەستنەوەی دو هۆکاری زانیاری پێشکات و لەسەرپێ بوونی هێزەکانی هاگانا، بەر بە هێرشی عەرەبەکان بگرن. لە ماوەی پێنج ساڵی دوای ڕوداوەکە شێوە ئاشتییەکی لەرزۆک لە نێوان عەرەب و جووەکان پەیدابوو.

لەو ماوەیەدا جووەکان لەژێرەوە هەوڵیاندا تۆڕی سەرچاوە زانیاری بەدەستهێنەکانیان فراوانبکەن. هێشتا هیچ ناوێکیان بۆ دەزگاکە دانەنابوو و "ڕێکخراوە"کەش بێ ڕێبەر بوو. زانیاریدەر(سیخوڕ)ە عەرەبەکانیان: بازرگانە دەستگێڕەکان کە بە ناو گەڕەکە عەرەبەکانی ئۆرشەلیمدا دەگەڕان، پێڵاو بۆیەکەرەکان کە ڕۆژوییان لەسەر بریقەدارکردنی پێڵاوی ئەفسەرە ئینگلیزەکان بوو، خوێندکارە عەرەبەکان، مامۆستاکان و دوکاندارەکان لە شوێنی پێویست دەدۆزیەوە. هەرجولەکەیەک دەیتوانی عەرەبێک وەک زانیاریدەر (جاسوس) بکڕێ بەمەرجێک ئەوانی دیکە ئاگایان لەو زانیارییە هەبێ، کە عەرەبەکە پێیدەفرۆشێ. لە کۆمەڵگەی Yisjoevبەهێواشی، بەڵام بە متمانەداری خەزێنەیەکی زۆری زانیاری، نەوەک هەرلەسەر عەرەبان، بەڵکو لەسەر دەسەڵاتدارانی بەریتانیا و پلانەکانیان کۆکرایەوە .

هاتنەسەرتەختی ئەدۆلف هیتلەر لە 1933 کۆچی جووەکانی بۆ فەلەستین بەلەزتر کرد. هەر لە 1936 دا سێسەد هەزار جو لە ئاوڕوپا ڕوەو فەلەستین کشان. زۆربەیان بە شپرزەیی گەیشتنە وڵاتی پیرۆز. بەهەرشێوەیەک بێ کۆمەڵگای Yisjoev توانی نیشتاک و خۆراک بۆ ژمارەیەکی زۆر دابینبکا. زۆری نەبرد 3/1 دانیشتوانی فەلەستین بوونە جولەکە. عەرەبەکانیش کاردانەوەیان بەهەمان ئاقاری ڕەفتاری پێشویان بوو. لە منارەکانی سەدان مزگەوتیاندا دەنگی مەلاکانیان بەداخوازی فڕێدانی زایۆنییەکان بۆ ناو زێ بەرزبووەوە .

عەرەبەکان لەهەر شوێنیک کۆدەبوونەوە بە قینەوە نارەزاییان دەربارەی بارودۆخە تازەکە دەردەبڕی " ئێمە دەبێ کۆتایی بەو بارە بهێنین،چۆن دەبێ جو ببنە کوێخای وڵاتەکەمان؟. ئێمە دەبێ کارێکی وابکەین چیدیکە بەریتانییەکان چەک نەدەنە جووەکان و فێریان نەکەن ".

بەریتانییەکانیش پێچەوانەی قسەی عەرەبەکانیان دەگوت. ئەوانیش نارەزاییان لەسەر ئەو ڕاستییە دەردەبڕی، کە نابێ هانی عەرەبەکان بدرێ بۆ دەستبەسەرداگرتنەوەی ئەو زەویانەی کە پێشتر بە جووەکانیان فرۆشتووە .

بەریتانییەکان دەیانویست هەردولا ڕازیبکەن، بەڵام بێ هودەبوو. لە 1936 شەرە قسە و دەمەقاڵێیەکان بۆ ڕاپەڕینێکی گشتیی عەرەبان دژی بەریتانییەکان و جووەکان پەرەیسەند. ڕاپەڕینەکە بەتوندی لە لایەن بەریتانیاوە سەرکوتکرا. جووەکان لەوە تێگەیشتن کە پرسی تورەیی عەرەب مەسەلەی کاتە و زو دەتەقێتەوە.

لە هەمولایەک جووەکان پەیوەندییان بە هاگاناوە کرد. ئەوان کرۆکی هێزێکی باسک ئەستوریان پێکهینا. ئەندامانی میلیشیاکە باری فیزیکیان و توندوبەند، ورەبەرز، باش لەچەک زانین، زیرەک و فێلباز وەک ڕێوی بیابانی نەقەب بوون.

تۆڕی زانیاریدەرەکان(سیخوڕەکان)ی عەرەب تا دەهات بەرفراوانتر دەبوو. هاگانا جاری پێکهێنانی باڵێکی سیاسی دا، ئەرکی چاندنی تووی ناکۆکی بە بەبڵاوکردنەوەی دژەزانیاریی کەوتە ئەستۆ. لەسەروبەندی جەنگی دوهەمی جیهانییەوە هاگانا ( وشەیەکی عبرییە بە واتای بەرگری) وا پەرەیسەند، باشترین هێزی جەنگاوەری وڵاتە پیرۆزەکەی لێدەرچوو.

هەواڵەکانی جەنگی جیهانیی دوهەم، ئاشتییە لەرزۆکەکەی فەلەستینی هەژاند. چ عەرەب چ جووەکان هەستیاندەکرد گەر هاتباو نازییەکان شەرەکەیان بردبایەوە، پاشەڕۆژیان تەماوی دەبوو. بەسەرهاتە بەراییەکانی ئۆردوگاکانی مەرگ لە ناوەراستی ئاورووپا گەیشتنە کۆمەڵگای Yisjoevیوسوڤا. دایڤید بنگۆریۆن و ئیسحاق ڕابین لە حەیفا لە1942

گەیشتنە یەک. ئەوان لەو کەسانە بوون، کە دەیانویست ڕزگاربووانی دەستی توندوتیژی نازییەکان بهێننە Eretz Yisrael وڵاتی ئیسرائیل. کەس ژمارەی ڕزگاربووانی نەدەزانی چەندە، بەڵام لەوە بەئاگابوون، کە ژمارەیان ئەوەندە زۆرە، گەر بگەنە فەلەستین، ئەوا کێشە لەگەڵ عەرەبەکان تیژتر دەبێ. هەروەها ئەو جارەیان بەریتانیەکانیش بەئاشکرا دژیان دەوەستنەوە. بەریتانیا هەر بەردەوام بوو لەسەر ڕای خۆی، کە نابێ پاشماوەی ڕزگاربووانی دەستی هیتلەر هەموویان بەیەکجاری بهێنرێنە فەلەستین، چونکە هاوسەنگیی هاوکێشەی دانیشتوانی فەلەستین تێکدەدا.

گوێ بۆ بانگەوازی بن گۆریۆن بۆ چاککردنی دەزگای زانیاری هاگانا هەڵخرا ـ زانیاریدەری دیکەی زیاتر دانران و دەزگایەکیش بۆ دژەسیخوڕی دانرا. ئەو دەزگایە ئەرکی دەمامک لابردن بوو لەسەر ڕوی ئەو جولەکانەی لە پاڵ کۆمۆنیستە جووەکان و لادەرەکان هاوکاری بەریتانییەکانیان دەکرد و ناپاکییاندەکرد. ئەو باڵە دژە جاسوسییە ناوی ڕیگەل هەردی Rigul Herdi لێنرا و لە لایەن ئەندامی پێشوی بەتالیۆنی فرانسە بیانییەکان، لەژێر ناوی بازرگانی گەڕۆکەوە بەڕێوەچوو .

هەر زو ئەویش ئەو ژنە جووانەی ڕێکخستن، کە پەیوەندییان بەئەفسەرە بەریتانییەکانەوە هەبوو. دوکاندارەکانیش کە کاروباریان لەگەڵ بەریتانییەکان هەبوو لە پاڵ خاوەن قاوەخانە و چایەخانەکان کە هاموشۆی بەریتانییەکانیان بەسەرەوە بوو لەگەڵ دەزگاکە هاتنە سەرخەت. دژەجاسوس و ناپاکەکان بە نیوەی شەو ڕادەکێشرانە دادگاکانی هاگانا، ئەوەی تاوانبار بوایە حوکمی کوشتن یان ئازارێکی کوشندەی بەسەردا دەدرا و لە گردەکانی جودا Juda دا بەگوللە لە ملدان دەکوژران. ئەوە پێش سێبەری ئەو مۆسادە بوو کە ئێستا لەگۆڕێدایە.

لەسەروبەندی 1945 هاگانا یەکەیەکی تایبەت بەچەک کڕینی دروستکرد. هەر زو ژمارەیەکی زۆری لەو زرێپۆش و ئۆتۆمۆبێلی چەکداری ئیتالی و ئاڵمانی کە لە دوای شکستی ڕۆمل لە باکوری ئافریقا مابوونەوە، بەرەو

فەلەستین بەقاچاخ ئاودیوکردن. ئەو کارەش ئەو سەربازە جوانە ئەنجامیاندا کە لە ڕیزی هێزی هاوپەیماناندا بوون و بیابانی سینای میسریان تەیکرد. چەکەکان بەدزی و بەسەرپشتی پەست (لۆری دارییین) و وشترەوە گواسترانەوە و لە بیابان لە نێو ئەشکەوت و کونەکان شاردرانەوە، ئەو بیابانەی کە شەیتان ویستی یوسفی تێدا دەستخەڕۆ بکا. یەکێک لەو کۆگا پرچەکانە لە ئەشکەوتێک بوو نزیک ڕێگای دەریای مردوو کە چاوەڕێی دۆزینەوەی دەکرا.

کاتێک شەڕەکە بەتەواوی بەخۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن کۆتاییپێهات، ئەو جوانەی لەگەڵ دەزگای زانیاریی هاوپەیمانان لە فەلەستین کاریاندەکرد، گەڕانەوە. ئەوان بەو زانیاری و ئەزمونەی خۆیان چوونە خزمەتی هاگانا. ئیدی هەمو بارودۆخێک ئامادەبوو کە بنگۆریۆن پێشبینی کردبوو" بەرپابوونی جەنگ بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆییمان".

ئەو پێشکات دەیزانی واتای ئەو شەڕە بریخا Bricha دەگەیەنێ. بریخاش ئەو ناوە عبرییە بوو، کە جووەکان لەو ئۆپەراسیۆنە بێوێنانەیان نا کە پێویستبوو بۆ ڕاکێشانی ئەوانەی لە مەرگ لە ئۆردوگا زۆرەملێکانی ئاوروپای ناوەڕاست رزگاریان ببوو بۆ ئیسرائیل. سەرەتا بەسەدان بوون، پاشان هەزاران دواتر بەدەیان هەزار. زۆربەشیان هێشتا ئەو ژمارە نیشانەیان هەر پێوە بوو کە نازییەکان لەسەر باسکیان هەڵکەندبوون. ئەوانە بەشەمەندەفەر لە ڕێگای وڵاتانی بەڵکانەوە دەربەندی بۆسفۆڕیان بەرەو تورکیا بڕی تا خۆیان بگەیەننە فەلەستین. ڕێکخراوە جووەکان هەرشتێک لەسەر ئاو ڕۆیشتبا وەک پاپۆڕ، پاشماوەکانی شەڕی نۆرماندی، بەلەمی ڕاو و پاپۆڕی بارهەڵگریان دەکڕی یان بەنرخێکی گران بەکرێیاندەگرتن. بەکورتی هەرشتێکیان چنگ کەوتبا تا بیانگەیەنێتە کەناری ئارام. لەدوای هەڵاتن و پاشەکشەی هێزی بەریتانییەکان لە داون کەرکن Duin Kerken لە 1940، هیچ شوێنێکی جیهان هێشتا کۆڕەوێکی وای بەخۆوە نەبینیبوو.

پاشماوە زیندووەکانی هۆلۆکۆست ئەوانەی گەیشتنە کەنارەکانی حەیفا و تەل‌ئەبیب ڕویان بە ڕوی ئەو سەربازە بەریتانییە هەڵاتوانە بووەوە، کە داونکەرکیان بەجێهێشتبوو و قوتاریان ببوو. ئەو سەربازانە فەرمانی سەربازی خۆیان بۆ پاراستنی ئەو کەنارانە لە مل بوو، ئەویش ڕێگرتن لە کۆچی جووەکان بوو. ئەوکات دیمەنی سەیر و دڵتەزێن ڕویدا، وەلێ لە سەرێکی دیکەشەوە ئەو سەربازانە ئەوەیان هاتەوە یاد کە لەمەرگ ڕاکردن چەند سەختە .

بن گۆریۆن لەسەر ئەو ڕایە بوو کە سیاسەتی چاوپۆشین بەتەنها بەس نییە، بەڵکو دەبێ کۆتایی بە ماندێتی بەریتانیا لەسەر فەلەستین بێ. ئەوەش هەر بە زەبروزەنگ دەستدەکەوێ. لە دەوروبەری 1946 بن گۆریۆن لەوە سەرکەوت کە زۆربەی گروپە نهێنییەکانی جووەکان یەکبخا. ئەوەش بە مۆرال وەرگرتن بوو لەو جوانەی یەکەم مۆڵگەیان لە فەلەستین لێداوە و جێگیربوون. بنگۆریۆن بڕۆی ئاماژەداری خۆی بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی پارتیزانی دژی دەسەڵاتی بەریتانی و عەرەبەکان هەڵاویشت.

هەر فەرماندەیەکی جو، ئەو ڕاستییەی دەزانی کە قومارێکی گەورەیە لەیەک کاتدا لە دو بەرەدا بجەنگێ. ئەوە کاریگەرییەکی قورسی بەسەر هێزی شەڕکار و بناوانە کۆمەکیەکانیان دەبێ. هەر دۆڕاندنێک زۆر دژوار دەکەوێتەوە. بنگۆریۆن فەرمانیدا، نابێ هیچ کەسێک و هیچ شتێک هەڵبگیردرێ، بەڵکو دەبێ هەموان بەشداربن. زۆری نەبرد زنجیرەی شەڕو توندوتیژی و پێکدادان درێژەیکێشا. ئەو جووانەی تەنها گومانییان لێدەکرا لە ڕابردودا هەواداری هاگانا بوونە یان بڵاوکراوەی ئەوانیان پەخشکردووە بێ سێودو لە داردەدران. سەربازە بەریتانییەکانیش دەکەوتنە کەمین و سەربازگەکانیان بۆمباراندەکران و دەسوتێنران. گوندە عەرەبنشینەکانیش دەبوونە سوتماک. ئەو شەڕە سەربەخۆییە " دڕندایەتی سەدەکانی ناوەڕاست" بوو .

بۆ هاگاناHagana ڕێكخراوە زانیارییبەخشـەكان(سیخوڕەكان) ڕۆڵێكی چارەنوسسازانەیان گێڕا. بڵاوكردنەوەی دژەزانیاری لە هەمبەر بەریتانی و عەڕەبەكان، بەوەی هێز و توانای جووەكان زۆر لەوە زیاترە كە هەیە، كاری خۆیكرد. بەریتانییەكان كەوتنە ڕاوكردنی دوژمنەكانیان كە بەرچاونـەبوون، چونكە ڕێكخراوە زانیارییبەخشەكان چەكهەڵگرنەبوون تا لە بەرەی جەنگدا دیاربن. ورەی هێزی داگیركاری بەریتانی پێ بە پێی ڕۆژگار، بەهۆی دەزگا زانیارییبەخشنی جووەكان دەشكا و دەبەزی.

بۆ باشكردنی بارودۆخەكە، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئامریكا لە بەهاری 1946 هەوڵیدا وەک ناوبژیوانێک ڕێككەوتنێكیان پێبسەلمێنێ. گوشاریان خستە سەر بەریتانیا تـاكو بەسـەدان هـەزار پاشـماوەی هۆلۆكۆسـت ڕێگـەیان پێبـدرێ و ڕوەو فەلەستین كۆچبكەن، بەڵام ئەو داوایە ڕەتكرایـەوە، بۆیـە كوشـندەترین شــەڕ دەســتیپێكردەوە. دواتــر لــە مــانگی فێبریــوەر (شــوبات)ی 1947 بەریتانییەكان دەنگیان بۆ ئەوەدا، كە فەلەستین پـێش كۆتـایی مـانگی ئایـاری 1948 بەجێبێڵن، ئیدی لەوكاتەوە نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی دەوڵەتی جو بەرپرسیار دەبێ .

لەهەسـتكردن بـەوەی دەبـێ جووەكـان هێشـتا شـەڕێكی چارەنوسسـاز و یەكلاكەرەوەیان لەگەڵ عەڕەبەكان لەپیش ماوە، بیكەن، تاكو بەر لەوە بگرن نەتـەوەیـەک پـێش سـەرهەڵدانی سـەركوت بكـرێ؛ بۆیـە بـن گۆریـۆن و فەرماندەكانی دركیان بە پێویستی هەبوونی دەزگایەكی هەواڵگری جێگیر كرد كە بەردەوام بۆ كارەكان لەسـەر پێ بێ. سیخوڕە جووەكـان لـە قـاهیرە و عـەممان دەرفـەتی ئـەوەیان بۆ ڕەخسـا، كـە نەخشـە و پلانـی هێرشـەكانی سوپای میسر و ئوردن بدزن. كاتێكیش شەڕ هەڵگیرسا، ئەو شـەڕەی دواتـر بەشـەڕی سـەربەخۆیی 1948 ناسـرا، هێزەكـانی ئیسـرائیل سـەركەوتنی بەرچاویان بەدەستهێنا. لەگەڵ درێژبوونەوەی شەڕدا، بنگۆریۆن زیاتر بڕوای بـەوە دەبـوو، كـە سـەركەوتنی یـەكجارەكی دەبێ هـەواداریێتی ڕێكخراوەیـی

سیاسی و سەربازی لەیەکجیاببێتەوە. کاتێکیش سەرکەوتن لە 1949 بووە ڕاستییەکی بەرجەستە، هێشتا ئەو دو بەشە بەباشی ڕێکنەخرابوون .

لەجیاتی ئەوەی بارودۆخی هەواڵگری سەرچاوەی زانیارییەکان بڕیارێکی باو و بەکارهێنراوانەی بۆ بدرێ، بنگۆریۆن کە بووە یەکەمین سەرەک وەزیرانی یەکەم دەوڵەتی ئیسرائیل، پێنج دەستەی هەواڵگری دامەزراندن، بازنەی چالاکییەکانیان ناوەوە و دەرەوەی وڵاتی دەگرتەوە. هەرچی بۆ ناوەوەی وڵات بوو، دەزگا نهێنییەکانی بەریتانیای گەورە و فەڕەنسایان وەک مۆدێلێک وەرگرت. هەردوو ڕێکخراوەکەش ئامادەبوون لەگەڵ دامەزراوە تازەکەی ئیسرائیل کاربکەن. لە ڕێگەی جێمس جۆیس ئانگلتن James Jeuses Anglton کە لە جیاتیOSS فەرماندەی ئەو کاتەی تۆڕی دژە سیخوڕەکانی ئامریکا بوو لە ئیتاڵیا، پەیوەندی لەگەڵ نوسینگەی کارگوزاری ستراتیژی لە واشنتن داندرا. ئەو هاوکارییەی نێوان ئانگلتن و دامەزراوە نەشونماکەرەکەی ئیسرائیل، ڕۆڵێکی کارای لە پەیوەندی بەتینی نێوان هەردو دەزگا هەواڵگرییەکەی ئامریکا و ئیسرائیلدا گێڕا.

لەگەڵ ئەو ڕەوتە هەڵکشاوەدا بنگۆریۆن خەونی بە دەزگایەک دەبینی، کە ئەندامەکانی زۆر بەڕێکوپێکی(هارمۆنیانە) هاوکاری یەکدی بن، تیژڕەو بن لەگەڵ ژانی نەتەوەیەک کە بەزەحمەت و یەکدیگر هەستی ناسنامەی خۆی پەرە پێبدا. وەزیر و بیرۆکراتەکانی بن گۆریۆن بەردەوام لەسەر پایە و دەستەڵات لە ململانێدا بوون. ئەو زۆرانبازیەش ئاستی جیاجیای بەخۆیەوە دەبینی. کێ دەبێ زانیاری زانیاریبەخشەکان لەیەکهەڵاوێرێ و جیابکاتەوە؟ کێ ئەو زانیاریانە هەڵدەسەنگێنێ؟ کێ بەرپرسە لە دانان و سەرپەرشتیکردنی هەواڵگر و جاسوسەکان؟ ڕاپۆرتەکان یەکەم جار بۆ لای کێ بچن؟ کێ ئەو ڕاپۆرتانە پوختدەکاتەوە و ڕاڤەیان دەکات و بۆ بەردەم سەرکردایەتیی سیاسی وڵات ئامادەیان دەکات ؟

هیچ گرژی و توندییەک بەقەد گرژی و توندی نێوان وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی دەرەوە نەبوو. هەردو لا داوای ئۆپەراسیۆنەکانی دەرەوەی وڵاتیان

دەكرد. ئەوكات هەواڵگری لاو ئیسەر هارل Isser Harel لەو بڕوایەدا بوو كە هاوكارانی ئیشی هەواڵگری بەچاوی ڕۆمانسی سەرچڵی تەماشادەكەن. ئەوان وا كاریاندەكرد، تەواو هۆشمەندن و دەزانن چۆن كون و كەلەبەرەكانی دنیا ببینەوە. وا دەجوڵانەوە كە جۆرێك لە تۆڕی جاسوسی نێودەوڵەتی بن و دەرفەتیان لەقۆستنەوەی كەلێنە بچوكەكانی نێوان قاچاخ و قانونەوە دەدی.

لەو ناوەدا قوربانیانی كوشتار بەهۆی تیرۆری عەرەب و بۆمباكانیان بەردوامبوو. لەشكرەكانی سوریا و میسر و ئوردن و لونبان هەڕەشەیان لە ئیسڕائیل دەكرد. لەپشتەوەی ئەو لەشكرانەش بە ملیۆنان عەرەب ئامادە بوون بەشداری جیهاد و جەنگی پیرۆز بكەن. هەرگیز لە جیهاندا نەتەوەیەك بەو شێوەیە وەك ئیسڕائیلی تازە لەدایكبوو، بەدوژمن دەورە نەدرابوو.

بن گۆریۆن ژیلەمۆی مسیۆنارێتی دیینی هاووڵاتیانی ئیسڕائیل بوو وەك گەورە پیاوانی ئیسڕائیل لە مێژوی دورو درێژیاندا، كە توانای پاراستنی بیرو بڕوایان هەبوو. ئەو خۆشی دەیزانی پێغەمبەر نییە، بەڵكو جەنگاوەرێكە شەڕی سەربەخۆیی دژی عەرەبەكانی بردۆتەوە، ئەو شەڕەی عەرەبە دوژمنەكانی، بیست ئەوەندە چەك و سوپایان زیاتر هەبوو. لە دیرۆكی ئیسڕائیلدا لەدوای سەركەوتنی داودی شوانكارەوە بەسەر گۆلیاتی Goliath زەبەلاح و تێكوپێكشكاندنی فەلەستینییەكان سەركەوتنی وا گەورە ڕوینەداوە .

دوژمنی هەنوكەییمان تێكنەشكاوە. ئەو زیرەكانەترو بێویژدانانەتر تێهەڵدەچێتەوە. دوژمن وەك دزێكی نیوەشەو هەڵسوكەوت دەكات، ڕاست و چەپ، بێ هیچ ئازارێكی ویژدان لە بەرپاكردنی گۆمی خوێن نیشان دەگرێ و پاشان لەبەر چاوان وندەبێ.

چوار ساڵی ڕەبەق لە پێناو چارەسەركردنی كێشەكانی نێوان دەزگا هەواڵگرییەكان لە میانەی كۆبونەوەكان كە بنگۆریۆن سەرۆكایەتی دەكردن بەردەوام بوون. بۆ نمونە پلانی جاسوسیكردن بەسەر دیپلۆماتێكی فەڕانسایی لە میسر لە لایەن وەزارەتی بەرگریەوە ڕێپێگیرا. ئەوان واتە

وەزارەت دەیانەویست پیاوێکی خۆیان بەو کارە هەڵبستێ. ئەفسەرێکی گەنج کە تازە سەروسەودای لەگەڵ کاری تۆڕە جاسوسییەکان پەیداکردبوو، هەفتەیەکی نەبرد و ئاشکرا بوو تیمی دژە جاسوسی میسر پشتملیان گرت. لە ئاوروپاوە سیخوڕە ئیسرائیلییەکان بە هۆی بازرگانی ڕەشەوە دەگیران، کارە بازرگانییەکانیان بە مەبەستی بارتەقاکردنی خەرجییەکانیان بوو، چونکە بودجە تەرخانکراوەکەیان تێیهەڵنەدەهێنا. هەوڵی کێشکردنی دروزە Druz میانڕەوەکانی لوبنان ڕاگیرا. ڕاگرتنەکەش هەر لەبەر ئەوە بوو، دەزگا سیخوڕییە کێبەرکێیەکان لەسەر شێوازی کێشکردنیان هاوڕا نەبوون. ئەو نەیارییە گوماناوییەی ململانێی نێوان یەکدی زۆر لە پلانی سەرەکی کەمکردەوە.

دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە وەزیری کاروباری دەرەوە، سەرکردەی هێزەکان و باڵوێزەکان هەوڵیاندەدا خەباتی خۆیان بەسەر ئەوانیدیدا سەربخەن و خۆیانی پێ دەربخەن. یەکیان دەیویست زیاتر لە بوارەکانی ئابوری و سیاسی بایەخ بە کۆکردنەوەی زانیاری بدرێ، ئەوی دیکەشیان خوازیار بوو دەزگا هەواڵگرییەکان جەخت بکەنە سەر زانیاری دەربارەی توانای جەنگی و پلانەکانی دوژمن. باڵوێزی ئیسرائیل لە فەڕانسە پێیوابوو، دەبێ دەزگای هەواڵگری هەمان شێوازی ژێرزەمینی(نهێنی) فەڕانسییەکان پەیڕەوبکا، کە لە کاتی شەڕی دوهەمی جیهانیدا پەیڕەویاندەکرد، ئەو شێوازەش جۆشدانی هەمو جووەکانی وڵاتی دەگرتەوە. هەرچی باڵوێزەکەی ئامریکایان بوو پێی وابوو، دەبێ جاسوسەکان دەمامکی دیپلۆماسیانە بپۆشن و لە باڵوێزخانەکان بچنە پێش تاکو کەمتر جێی گومان بن. باڵوێزەکەی بوخارستیش وای بە باش دەزانی کە سیخوڕەکان وەک هیK.G.B ی یەکێتیی شورەوی بن و هەمان چەشنی کارکردنیشیان هەبێ وهەمان دڵڕەقی ئەوانیش پەیڕەوبکەن. هاوپیشەشی لە بۆینس ئایرس دەیەویست سیخوڕە ئیسرائیلییەکان کلێسەی ڕۆمی کاسۆلیک بخەنە ژێر چاودێرییەوە، چونکە

ئــەوان یارمــەتی زۆری نازییــەکانیان داوە بــەرەو   ئەرجــەنتین کۆچبکــەن. بنگۆریۆنیش بە حەوسەڵەوە گوێی لە هەموو ئەو پێشنیازانە دەگرت.

بنگۆریۆن لە 2ی مارتی 1951، فەرمانیدا سەرانی هەر پێنج دەزگاکە بچنە نوسینگەکەی. لەوێ بۆی ئاشکراکردن، نیازی وایە چالاکی هەمو دەزگاکان لە دەرەوە لە ژێر ناوێکی نوێ (ها مۆساد لێ تێومHa Mossad le Teoem پەیمانگا بۆ هاوکاری) ڕێکبخاتەوە.

"ئەو پەیمانگایە بە بودجەی بیست هەزار لە پارەی ئیسرائیلی دەستپێدەکا و لەو بودجەیەشدا 25% بۆ ئۆپەراسیۆنی تایبەت تەرخاندەکرێ، بەڵام ئەوەش تەنها دوای ڕەزامەندیی من دەبێ". دەزگا هەواڵگرییە نوێکە لە جۆشدانەوە و ریزبەندیکردنــەوەی دەزگــا هەواڵگرییــە کۆنــەکان پێکهــات. لــەو نێوەدا دەزگــا نوێیەکە تەنها بەناوی مۆساد واتە پەیمانگا مایەوە.

لە هەمو ڕروێکی سیاسی و کارگێڕییەوە مۆساد کەوتە ژێر باڵی قانونیانەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە. ئەمما دەزگاکانی دیکەی هەواڵگری وەک شـین بیتShin Bet (ئاسایسی ناوخۆ) و ئامان Aman (هەواڵگری سەربازی) و دەزگای هەواڵگریی هێزی سەربازی لە ناو مۆساددا نوینەرایەتیان لە ڕێگەی گــەورە ئەفســەرە هەواڵگرەکانــەوە دەبــێ. کــاری ئــەوان ئاگادارکردنــەوەی مۆسادە لە پێداویستی مەعمیلەکانیان. ئەگەر هەر جیاوازیەکیشیان لە نێواندا پەیدابوو، پێویستە کێشەکە بۆ نوسینگەی سەرۆک وەزیران بەرزبکەنەوە.

بنگۆریۆن بەشـێوازە تێبینیدارەکـەی پێیڕاگەیانـدن" کەواتـە پێویسـتە ئێوە لیستی داخوازیەکانتان بدەنە مۆساد. ئەو بەدوایدا دەچێ و مشوری گەیشتنی کەلوپەلــەکان دەخــوا. مۆســـاد هـــەر شـــتێکی داواکـــرد و خوازیـــاری پارەدانی کاڵایەک بوو، ئەوا ئەوە کاروباری ئێوە نییە".

بنگۆریۆن بەخۆی وەک کۆمیتەیەکی تاکەکەسی ڕکێفی کارکردنەکانی ئـەو دەزگا نوێیەی خستە ژێردەست و چاودێری خۆیـەوە. لەیاداشـتنامەکەیدا بۆ یەکـەمین بەڕێوەبـەری گشـتیی مۆسـاد، ڕیڤن شـیلۆە Reuven shiloah بنگۆریـۆن ڕێ لـە هـەر خـراپ لەیـەک تێگەیشـتنێک دەگـرێ کـە نوسـیویەتی"

مۆساد لەژێر سەرپەرشتی من کاردەکا، بەپێی ڕێنماییەکانی من هەڵدەسوڕێ و ڕاپۆرتیشی بۆ من بەرزدەکاتەوە". ئەو ڕێسایەش جێگیر کرا.

28ساڵی پڕ جەنجاڵ، دوای ئەوەی سەرکردە جووەکان، ئەو ئێوارەیەی پایزی(سێپتێمبەر) 1929 گەیشتنە یەک، بەوەی زانیاری بەهادار لەسەر عەرەبە دژبەرەکانیان کۆبکەنەوە، تاکو خۆیان لە پەلامارەکانیان بپارێزن، ڕێهەڵگرانیان بوونە ئەو دەزگا زانیارییە نهێنی کۆکەرەوە، کە ئەو ناوبانگە سامناکە بەسەریەکەوە بنێ و لەهەر دەزگایەکی هەواڵگری دیکەی جیهان، جیابیکاتەوە.

بۆ لەدایکبوونی مۆساد هەمو شتێک بووە تەنها ئەوە نەبێ کە ئاسان بووبێ. پەیمانگاکە رایەڵی سیخوڕێتی لە عێڕاق وەرگرتەوە، کە چەندان ساڵ لەژێرسەرکردایەتیی بەشی سیاسیی وەزارەتی بەرگریدا چالاکبوو. کارە سەرەکیەکەی ئەو تۆڕە چوونە نێو بازنەی دەسەڵاتی سەربازی ئەو وڵاتە بوو، تاکو بتوانێ ڕێگەی کۆچکردنی جووەکانی ئەوێ بۆ ئیسرائیل خۆشبکا.

لە ئادار1951دا تازە نۆ هەفتە بەسەر واژۆکردنی بڕیارنامەی بنگۆریۆن بە دروستکردنی مۆساد تێپەڕیبو، دەزگای دژەسیخوڕی عێراقییەکان لە پڕ بەسەر تۆڕی جاسوسانی ئیسڕائیلیان دادا. لەو هەڵکوتانەسەرەدا دو پۆلیسی ئیسڕائیلی لەگەڵ دەیان جولەکەی عێراقی و چەندان بەکرێگیراوی عەرەب گیران. ئەوانە کاریان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی هەڵاتنی جووەکان دەکرد، کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەربەست کرابوو. لەو پێشهاتەدا 28کەس بەتاوانی سیخوڕێتی داوایان لەسەر بەرزکرایەوە. هەردو پۆلیسە ئیسڕائیلیەکەش حوکمی مردنیان بەسەردا درا، 17 کەسیش حوکمی زیندانیی تا هەتایە و ئەوانی دیکەش ئازادکران، بەڵام دواتر هەردو پۆلیسە حوکمبەسەردراوەکە بە پارە ڕزگارکران. ئەوان سەربردەی دڕندانەترین ئەشکەنجەدانیان دەگێڕایەوە. بەڕەڵڵاکردنیشیان لە بەرامبەر بڕە پارەیەکی زۆر بوو، کە خرایە سەر کۆنتۆی وەزیری ناوخۆی ئەوکاتی عێڕاق لە بانکێکی سویسڕادا.

هەر دوای ئەوە زۆری نەبرد نەهاتی دوهەمیشی بەسەرداهات. کابرایەک بەناوی تیۆدۆر گرۆس Theodore Gross کە ماوەیەکی درێژ بوو بەناوی بەشی سیاسی بەرگری ڕۆما ئیشیدەکرد، دواتر ئیسەر هارێل Isser Harel سەرۆکی ئەوکاتی شین بێت Shin Bet نوسراوی بەڵگەداری لەسەر دوسەرەبوونی جاسوسێتی ناوبراو دەستکەوت. گرۆس لەوکاتەی بۆ ئیسرائیل کاریکردووە، جاسوسی میسریش بووە و پارەی لێیوەرگرتون.

هارل خۆی چوو بۆ ڕۆما، ناوبراوی بەبیانوی فەرمان دەرچوونی بۆ وەرگرتنی بەشێکی دیکەی تۆڕی جاسوسی لە تەلئەبیب، هێنایەوە. گرۆس بە نهێنییەوە دادگاییکرا. لە دادگاکەدا تاوانەکانی لەسەر سەلمێنراو بە 15 ساڵان حوکمی زیندانی دراو هەر لە زیندانیشدا مرد.

ڕێوڤن شیلۆەReuven Shiloh ی بەڕێوبەر، دوای ئەو ڕوداوە بە تێکشکاوی دەستی لەکارکێشایەوە. دوای ئەو هارل هاتە جێگەی. هارل 11 ساڵای دورودرێژ بەڕێوبەری گشتیی مۆساد بوو. سەردەمێک بوو لەوکاتەوە هاوتای نەبوو.

هارلی سەرکردەی مۆساد کە بە عبرییەکی ئەکسێنتداری ناوەڕاستی ئاوروپا دەپەیڤی، لە ئەیلولی 1952ەوە بەخۆی و باڵاکورتییە مەترو نیویەکەیەوە پێشوازی لە فەرماندەکانی دەکرد. باوک و دایکی لە 1930 لە لیتلاندLitland ەوە بەرەو فەلەستین کۆچیانکردبوو. جلەکانی هارل بەشێوەیەک دەهاتنە بەرچاو کە هەر دەتگوت پێیانەوە نوستووە. دەستپێکی قسەکانی بۆ کاربەدەستانی مۆساد بریتی بوو لە" لێرەوە خاڵێک دادەنێین و بۆ دواوە ناگەڕێینەوە. نابێ چیدیکە هەڵەی قەبە دوبارە ببێتەوە. دەبێ هەمومان بەیەکەوە بەرەو پێشەوە بچین. هەر دەبێ لەگەڵ خۆمان قسە بکەین نەوەک کەسی دیکە" .

هەر هەمان ڕۆژ مەبەستەکانی بۆ ئامادەبوان ڕونکردنەوە. دوای شیوخواردن بانگی شوفێرەکەی کرد. لەو کاتەی شوفێرەکە لێیپرسی بەرەو کوێ دەڕۆین؟ بەرسڤی دایەوە کە ئامانجەکەی نهێنییە، ئەوسا شوفێرەکەی

دابەزاند و خۆی ئۆتۆمبێلەكەی لێخوڕی. پاش كەمێک بە خۆی و كارتۆنێک كولیچە گەڕایەوە و دایە پیاوەكانی. ئیدی هەمویان تێگەیشتن كە تەنها ئەو پرسیار دەكا.

ئەودەم كە هارل سەرنجی كاربەدەستە ورە شلۆقەكانی بۆ خۆ كێشدەكرد، كاتێكی گونجاو بوو بۆ بڕیاردان. ئەو ورەو وزەی نوێیپێدان، بەوەی خۆی نمونەیەكی لێوەشاوەی نیشاندان. ئەو خودی خۆی بەنهێنی دەچووە وڵاتە دوژمنەكانی عەرەب تاكو بە خۆی ڕایەڵەكانی تۆڕی مۆساد ڕێكبخاتەوە. هارل هەمو ژن و پیاوێكی دەزگاكەی تاقیدەكردەوە. مەیلی ئەو زیاتر بەلای ئەو جوانەدا دەشكایەوە كە لە ئۆردوگاكاندا(كیبۆتەكان) Kibots گەورە ببوون.

"ئەو جۆە كەسانە دوژمنەكەمان دەناسن". ئەوە قسەی ئەو بوو لەبەرامبەر كارمەندەكان، ئەوانەی گومانیان لە پلانەكانی هەبوو. هارل ڕای وابوو كە " كیبۆتیەكان وەک عەرەبەكان ژیاون، نەوەک هەر ئەوەندە بەڵكو ئەوان فێری ئەوە بوونە كە خێراتر بیربكەنەوە".

حەوسەڵەی هارڵ زۆر بوو و كارمەندانیشی لەبیرنەدەكرد، بەڵام ئەوەی لەبازنەی ئەو نە بووایە بەچاوی گومان وەک " هەڵپەرستێكی بێ ویژدان" سەیریدەكرد. هارل نەیدەویست سەروسەودای لەگەڵ دیندارەكان كە خۆیان بە نیشتمانپەروەرێكی زێدەڕە و نیشاندەدا، پەیدابكا. ڕوانینی ئەو بۆ جووە ئەرسەدۆكسییەكان ڕەق بوو. لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵێ ئەرسەدۆكسی لە حكومەتی بنگۆریۆندا هەبوون. هەرزو ئەرسەدۆكسییەكان ڕقی زۆریان لە ئیسەر هارل بووەوە و هەوڵیاندەدا بەهەر شێوازێک بێ لای ببەن. سەركردە ناودارەكەی مۆساد هەوڵیدا دۆستایەتی كیبۆتنشینەكان و خودی سەرۆک وەزیران لەدەستنەدا.

لەو ناوەدا زۆری نەبرد چالاكییەكانی مۆسادی تازە بەسەرپێكەوتو بە ئەنجامی باش بە قازانجی مۆساد بشكێتەوە. كارمەندانی مۆساد لە شەڕی دژی میسرییەكان لە سینادا، ڕۆڵێكی كارایان گێڕا. لەهەر پایتەختێكی

عەرەباندا جاسوسێک یان زیاتری لێپەیداکرد، کە زانیاری زۆر گرانبەهایان دەناردەوە تەلئەبیب. هارل سەرکەوتنێکی دیکەی لەساڵی 1954 بەدەستهێنا ئەوکاتەی چاوی بە ئالن دەلەسAllen Dulles ی سەرۆکی ئەوکاتیCIA ی ئامریکی کەوت. هارل بەرەو واشنتن فڕی و خەنجەرێکی پێشکەش بە سەرۆکی CIA کرد کە ئەو ڕستە تەوراتیەی لەسەرهەڵکەنرابوو کە دەڵێ " شوانی ئیسرائیل هەرگیز ناخافڵێ و ناںوێ". پەرچەکرداری دەلەسیش ئەوەبوو کە" تۆ دەتوانی پشت بەوە ببەستی کە من و تۆ بەیەکەوە بێداربین".

ئەو پەیڤانە ڕێگایان بۆ هاوکاری نێوان مۆساد و CIA خۆشکرد. دەلەس مشوری ئەوەی بۆ مۆساد خوارد کە کۆمەڵێ کەلوپەلی بایەخداری وەک دەزگای بچوکی گوێلێڕاگرتن، ئامێری هەناردن بۆ وردەکاری جاسوسی کە بەکامێرا لەدورەوە کۆنترۆڵدەکران، دابینبکا. ئەو ئامێرە تەکنیکییە وردو گرنگانە وەک هارل دانیپێدانا، پێشتر پێی نەزانی بوون. ئەو دو پیاوە سەرەتای کەناڵی هاوکاریان بەیەکەوە داڕشت. بەهۆی تەلەفۆنێکی متمانەدار دەیانتوانی لە کاتی پێویستدا پەیوەندی لەگەڵ یەکدیداببەستن. ئەو کەناڵە پەیوەندییە ئاسایشییە هاوچەشنی پەیوەندی دیپلۆماتی نێوان هەردو وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەدوادا نەهات. ئەو پەیوەندییە باشە کاری نەکردە سەرباشترکردنی پەیوەندی بازنەکانی دیپلۆماتی هەردو لا.

هارل لە 1961 عەقڵی ئۆپەراسیۆنی پاپۆڕە گەورەکە بوو، بۆ هێنانی هەزاران جووی مارۆکانی(مەغریبی عەرەبی) بۆ ئیسرائیل. ساڵێکیش دواتر هەر ئەو سەرکردە ماندونەناسەی مۆساد خۆی گەیاندە خوارووی سودان بۆ یارمەتیدانی جەنگاوەرە دۆستە ئیسرائیلییەکانی لەخەباتیان دژی رژێم. هەمان ساڵ کۆمەکی قەڕاڵی ئەسیوبیا(حەبەشە)ی کرد و لە هەوڵی دژەکودەتا ڕزگاریکرد. هیلاسی لاسی قەڕال ماوەیەکی درێژ بوو دۆستی ئیسرائیل بوو.

لە وڵات جووە ئەرسەدۆکسییەکان لە حکومەتەکەی بنگۆریۆن ناحەزتر دەبوون .سکالایان لەسەر ئیسەر هارل هەبوو، گوایە زیاتر بۆتە کەسێکی ئاوتۆکرات و گرنگی بە هەواداریێتی ئۆلی ئەرسەدۆکسییەکان نادا، بەلای

ئەوان هارل هەر بەگوێی خۆیدەکا. بەڵێ رەنگبێ ئەو ئاواتی وەدەستهێنانی بەرزترین پایەی لە وڵات هەبووبێ. لێرەوە بنگۆریۆن زۆر هەستیارانە بەرامبەر سیاسەتوانە کێبەرکێکارەکان هەنگاوی دەهاوێشت، ئەمەش واکەوتەوە کە ساردییەک بکەوێتە بەینی ئەو و هارل. پێشتر دەستی هارلی واڵا کردبوو، کەچی ئێستا داوای لێدەکرد بە دورودرێژی کون‌وکەلەبەرەکانی چالاکی و ئۆپەراسیۆنەکانی بۆ ڕونبکاتەوە. هارل ئەو جۆرە دەستگرتنەی پێناخۆش بوو، بەڵام لەسەریشی بێدەنگ بوو. کەمپینی هەراسانکردنی هارل تادەهات چڕتر دەبووەوە.

لە شوباتی 1962دا گومانەکان لەسەر حیسابی ژیانی منداڵێکی هەشت ساڵانە بەناوی یوسل شخوماخەر Joselle schumacher تیژتر بوون. دو ساڵ پێشتر ناوبراو تاڕاددەیەک بەئاگایی دایک و باوکیشی لە لایەن ئایینزایەکی ئەرسەدۆکسە فەندەمەنتالەکان ڕفێندرا. باپیرەی یوسل لە لایەن دایکییەوە بەناوی ناهام شتارکەس Naham Shtarkes کە ناوی لەخۆنابوو نەتوری کارتا Netoerei Karta (ئێشکگری دیوارەکانی ئۆرشەلیم) یەکێک بوو لەو ئایینزایە. ئەو گومانی رفاندنەکەی لێکرا. پۆلیس بە بەرفراوانی بەدوای ڕفاندنەکەدا چوو، کەچی نەیانتوانی شوێنپێی ڕفێندراوەکە هەڵبگرنەوە. بۆ ماوەیەکی کورت ناهامی باپیرە گیرا، چونکە ئامادە نەبوو هاوکاری تیمی لێگەڕان لە منداڵە ڕفێندراوەکە بکا. ئیدی ئەرسەدۆکسە فەندەمەنتالەکان کابرای باپیرەیان وەک شەهیدێک دانا، بەهەزاران خۆپیشاندانیان سازدا و دروشمی وایان هەڵدەگرت کە بنگۆریۆن و نازییەکانیان لەیەک ڕیز دادەنا. لەبەرئەوەی چۆن وێراون پیرە پیاوێکی وەک ناهام زیندانیبکەن. کاتێکیش ناهام بەهۆی ناتەواوی لەشساخییەوە بەردرا، دیسان خۆپیشاندانەکان سەریان هەڵدایەوە.

ڕاوێژکارانی بنگۆریۆن هۆشداریان دا، کە ئەو بەسەرهاتە کارانگازی بەسەر هەڵبژاردنی دادێدا دەبێ. لەوەش خراتر گومانی ئەوەش نەدەڕەوایەوە کە هەندێ لەو ئەرسەدۆکسانە لە شەڕی نوێی عەرەب و ئیسرائیلدا، ڕەنگبێ

لایەنگری عەرەبەکان بکەن. ئەوکات سەرۆک وەزیرانی توانجتێگیراو فەرمانی بەهارل دا، بەدوای منداڵە ڕفێندراوەکەدا بگەڕێ. هارل گوتی ئەوکارە ناچێتە چوارچێوەی چالاکییەکانی مۆسادەوە. پاشان هارل لەو بارەیەوە گوتی" کەشی نێوانمان تەڕدەست بەستی. ئەو (واتە سەرەک وەزیران) دوپاتیکردەوە کەوا ئەوە فەرمانە. منیش پێمڕاگەیاند دەبێ دۆسیەکەی لای پۆلیس ببینم. سەرەک وەزیران یەک سعاتی مۆڵەتدام".

دۆسیەکە قەبە و ئەستور بوو. بەڵام لەکاتی خوێندنەوەکەدا شتێک لای هارل وروژا، کە مافی دایک و باوکانە منداڵەکەیان پەروەردەبکەن بێ ئەوەی لە لایەن بیروڕای توندڕۆیی ئۆلیەوە بخرێنە ژێر گوشارەوە.

یۆسێل Joselle لە ئازاری 1953 لەدایکبووە،. باوکی ناوی ئارتۆر Arthurو دایکیشی ئیدا شوماخەر Ida schumacher بووە. لەسۆنگەی نەبوونییەوە دایک و باوک کوڕەکەیان ڕەوانەی لای باپیریان کردووە لە ئۆرشەلیم. لەوێ کوڕەکە خۆی لە نێو بازنەیەکی داخراوی هەوادارە دیینیە توندڕەوەکان بینیەوە، ئەوانەی خۆیان لاپەڕگە کردبوو لە شار دابڕابوون. باپیرە نەوەکەی خۆی بەو جغزە داخراوەی باوەڕەکەی و ڕێنماییەکانی گۆشدەکرد. کاتێک دایک و باوکی هاتن و داوای کوڕەکەیان کردەوە، باپیرە زۆر بەتوندی بە بیانووی ئەوەی دایک و باوکەکە بەگوێرەی لێکدانەوەی باپیرە بە دینەکەییان گومڕابوون، بەگژیان داچوو.

پیاوە پیرەکە لەو نەوە جولەکانە بوو کە بیروڕای ئاینیی یارمەتیدا لەهۆلۆکۆستدا دەربازببێ. کچی ناهامی پیرە و زاواکەشی لەو نەوە تازەیە بوون کە دەیانویست ژیانێکی خۆش بەسەر ببەن. لای ئەوان دین بەپلەی دوهەم دەهات.

کاتێک دایک و باوکی یۆسێل لە لایەن ناهام بەر ڕەخنەدران ، دەستبەجێ داوای کوڕەکەیان کردەوە. ناهام پێیڕاگەیاندن ئەوە گوناهێکی مەزنە دەرهەق بەو کوڕە، چونکە دەرهێنانی لە چوارچێوە پەروەردە ئاینییەکەدا، کار

لەبەرپرسیارێتی مەزنبوونی دەکا. ئەو قسانە شەڕو دەمەقاڵێ بەدواداهات. بۆ سەردانی داهاتوی دایک و باوک، کوڕەکە شوێنبزرکرا.

سۆشیال دیموکراتە جووەکان هەروەک ئەرسەدۆکسەکان ئەو ڕوداوەیان وەک دەرفەتێکی دەربڕین قۆستەوە، تا بڵێن ململانێیەک هەیە نەتەوەکە لەیەکدەترازێنێ. ئەو ڕاستییەش ڕون و ئاشکرابوو، پارتی کاری بنگۆریۆن بەجێکردنەوەی نوێنەرانی لایەنە ئۆلییەکانی ناو کنێست(پەرلەمان) لە حکومەتەکەیدا لەسەر دەسەڵات دەمێنێتەوە. بۆ ئەو سەودایە، ئەرسەدۆکسییەکان کۆمەڵێ ڕێسای توندیان بۆ تەوافوقکردن پێ پەسندکردن. ئەوان داوای زیاتریشیان دەکرد. سۆشیال دیموکراتە جووەکانیش دەستبەجێ داوای گەڕاندنەوەی یۆسێلیان دەکرد بۆ لای دایک و باوکی.

دوای ئەوەی هارل دۆسیەکەی خوێندەوە، سەرەک وەزیرانی دڵنیاکردەوە کە دەتوانێ مۆساد بۆ ئەوکارە بەکاربێنێ. هارل تیمێکی 40 کەسی بۆ گەڕان بەدوای یۆسێل پێکهێنا. زۆرێکیش لە فەرمانبەرەکانی ڕاشکاوانە نارەزاییان دەربڕی، چونکە توانا و پسپۆڕێتیان بۆ شتێکی دیکە بەکاردێ.

هارل کورتە پشوە بێدەنگییەکەی هاوڕێکانی بەدەرەفەت زانی و پێیگوتن" هەرچەندە ئێمە لە دەرەوەی بازنەی کارەکانمان چالاکی دەنوێنین، بەڵام ئەوە پرسێکی یەکجار گرنگە. ئەوە بنەما و پێشینەکەی لە نێو کۆمەڵگا و ئاییندا هەیە. لەبەرئەوەش زۆر گرنگە چونکە سەنگ و دەسەڵاتی حکومەتەکەمان لەسەنگی محەک دەدا. سەرباری ئەوەش کارەکە بایەخەدارە، چونکە کارێکی تەواو مرۆیانەیە".

هەر زو لەسەرەتای هەفتەکانی یەکەمەوە تێگەیشتن لێکۆڵینەوەکەیان چ ئەرکێکی بە فەرە. یەکێک لە پیاوەکانی مۆساد دواتر پلە و پایەی تا سەرۆکایەتی شین بیت Shin Bet ڕۆیشت، لێگەڕا تا ڕیشی خۆی تەواو هات و خۆی وەک فەندەمەنتالێکی ئەرسەدۆکس نیشاندا و بەمەبەستی چوونە نێو ڕیزەکانیانەوە، بەڵام ئەو هەوڵەیان سەرنەکەوت. پیاوێکی دیکەی مۆساد

ئەرکی چاودێریکردنی قوتابخانەیەکی جولەکانی پێسپێردرا، بەڵام یەک دو ڕۆژی نەبرد ئەویش ئاشکرابوو. سێهەم پیاویان خۆی وەک تازیەدارێکی شاسی(گروپێکی ئایینی جووەکانن) Chassidis نیشاندا گوایە دەچێتە ئۆرشەلیم کەسێکی خۆی لێبنێژێ. ئەویش هەر ئاشکرا بوو، چونکە وەک شاسەکان نەیدەزانی وێردە ئایینییەکان بخوێنێتەوە.

هەمو ئەو شکەستانە هارلی لەسەر کردەی پشکنینەکە سورترکرد. ئەو بە تیمەکەی گوت کەوا بڕوای وایە منداڵەکە لە ئیسرائیل نەماوە، ڕەنگبێ لە ئاوروپابێ یان دورتر. بۆیە بنکەی لێگەڕانەکەی بۆ ماڵێکی ئارامی مۆساد بۆ پاریس گواستەوە. لەوێوە پیاوەکانی بۆناو کۆمەڵگە ئەرسەدۆکسییەکان لە هەر یەک لە ئیتاڵیا و نەمسا و فەڕەنسا و بەلژیک و شانشینی یەکگرتوو ناردن. کاتێک لەوێ هیچیان دەستنەکەوت ئنجا پیاوەکانی ڕەوانەی خواروی ئافریکا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا کردن .

کردەی بەدواداگەڕانەکە پڕبوو لەشتی سەیروسەمەرە. کاتێک 10 پیاوی مۆساد لە نوێژی یەکشەممە لە سیناگۆگێکی(کەنیشتەی جووەکان) لەهێندۆنی لەندەنی ئامادەدەبن، ڕدێنی ساختەی هەندێکیان بەهۆی ڕیتوێلەکە دەکەوێتەخوارەوە، جووە نوێژکەرەکان بانگی پۆلیس دەکەن تا ئەو" فێلبازە دیندارانە" بگرن. پیاوەکانی مۆساد لە ڕێی باڵوێزخانەکەیان کە داوای لە وەزارەتی ناوەخۆی ئینگلیز کرد، ئازادکران. ڕابایینێکی Rabbijn ئۆرسۆدۆکسی بەحورمەت بە بیانوی ئەوەی خێزانێکی جوی دەوڵەمەند دەیەوێ کوڕەکەی سونەت بکا، بۆ پاریس رفێندرا. لە فڕۆکەخانەوە لە لایەن دو پیاوی مۆسادەوە بەقات و شەپقەی ڕەشەوە وەک دو کەسی شاسیی پێشوازی لێکران. ئەو دوانە دو پیاوی مۆساد بوون، ڕاپۆرتەکەشیان کۆمیدیایەکی ڕەش بوو" ڕابانەکە بێ ئەوەی ئاگای لە هیچ بێ، بردرایە سۆزانیخانەیەک. لەپڕ دو سۆزانی کە پارەمان بۆ ئەو مەسەلەیە دابونێ، دەرکەوتن و خۆیان لە پیاوە ئایینییەکە هەڵسوێ، ئێمەش لەوکاتەدا وێنەمان گرتن. ئنجا چووینە بەرچاوی و پێمانگوت گەر پێمان نەڵێی منداڵەکە لە کوێ

شاردراوەتەوە، ئەوا وێنەکانت بۆ کۆمەڵگاکەت دەنێرین. لەدواییدا ڕابەینەکە توانی پێمان بسەلمێنی کە ئاگای لە هیچ نییە، ئیدی ئێمەش لەبەرچاوی ئەو وێنەکانمان دڕاندن".

ڕابەینێکی دیکە بەناوی شای فرێرShai Freyer کەوتە بەر بازنەی بایەخپێدانی هارلەوە کاتێک بۆ سۆراخککرنی منداڵەکە بە دوای جووە ئەرسەدۆکسەکان دەگەڕا. بەدوای رابایینەوە دەڕۆیشتن، لەوکاتەی لە پاریسەوە بەرەو ژنێڤ دەچوو. دوای ئەوەی تەنگەتاویان کردبوو، کاتێک زانیان ئەو بەشەقامێکدا دەڕوا لەوسەرەوە داخراوە، هارل فەرمانی بەگرتنی ڕابەینەکەدا و بردیانە خانوێکی مۆساد لە سویسرا. بڕیاریدا ڕابەینەکە لەوێ بمێنێتەوە تا تەواوی کردەی لێگەڕانەکە سەردەکەوێ، چونکە لەوە دەترسا ڕابەینەکە هەمو کۆمەڵگای ئەرسەدۆکسە جووەکان لە بنگۆریۆن بوروژێنێ.

دەبوایە بەشێوەیەکی دیکەی نوێ سۆراخکردنەکەیان درێژە پێبدەن. ئەوەش لەڕێی مادلین فرای Madeleine Frei بوو. مادلین کچی خانەوادەیەکی ئەرستۆکراتی فەڕەنسی بوو. لە کاتی جەنگی دوهەمی جیهانیدا ئەندامی هێزی بەرەنگاری فەڕەنسی بوو. وەک کچێکی بەرەنگاریکار میدالیای پاڵەوانێتی پێدرابوو. مادلین کۆمەڵە منداڵێکی زۆری جووەکانی لە مەترسی ژوری گازی نازییەکان ڕزگارکردبوو. دوای تەواوبوونی شەڕ چووبووە سەر دیینی جولەکان .

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەرکەوت، مادلین بەردەوام سەردانی ئیسرائیلی دەکرد و سەروسەودای لەگەڵ گروپی نێتوری کارتا Netoeri Karta هەبووە و تەنانەت چەند جارێکیش باپیرەی یوسێلیشی دیتبوو. دوا سەردانەکەشی بۆ ئیسرائیل لە دەوروبەری ئەوکاتە بوو کە منداڵەکە بێ سەروشوێن ببوو. دواتر مادلین نەگەڕایەوە ئیسرائیل.

لە ئابی 1962 دو پیاوی مۆساد شوێنپێی مادلینیان لە گەڕەکی دەرەوەی پاریس هەڵگرت. کاتێک ئەوان خۆیان بەمادلین ناساند، پەشۆکا. ئەوسا پیاوەکانی مۆساد هارلیان ئاگادارکردەوە.

هارل بە مادلینی گوت بە چ ناهەقییەکی گەورە ئەوەت لەگەڵ دایک و باوکی یۆسێل کردووە. ئەوان هەقی خۆیانە کوڕەکەیان بەهەر شیوەیەک بێ گەورە بکەن. کەس ناتوانێ ئەو مافە لە دایک و باوکان بستێنێتەوە. مادلین سوربوو لەسەر ئەوەی هیچ دەربارەی یۆشێل نازانێ. هارل سەرنجیدا کە پیاوەکانی بڕوایان بە قسەکانی مادلین کردووە.

هارل داوای لە مادلین کرد پەساپۆرتەکەی پێنیشانبدا. لەپشت وێنەکەی ئەو وێنەیەکی کچەکەی تێدا بوو. داوای لە پیاوێکی خۆی کرد وێنەیەکی یۆسێلیش بێنن. دەموچاوی وێنەی هەردو منداڵەکە وەک سیوێکی دوو لەت دەچوو. ئەنجا هارل تەلەفۆنی لەگەڵ تەلئەبیب کرد و گوتی" لەماوەی سعاتێکدا هەموو ئەو شتانەم زانی کە دەبوایە بیزانم. ئەوەشم هەرلە سەرەتای دواندنی مادلینەوە، لەمیهرەبانییەکەی سەردەمی خوێندکاری ئەو بۆ دەرکەوت، ئەوەش وایلێکرد دیینی خۆی لە کاسۆلیکی رۆمییەوە بۆ جولەکایەتی بگۆڕێ و بێتە ناو بزوتنەوەی ئەرسەدۆکسیی. من بە مادلینم گوت وەک ئەوەی بەجارێک هەمو شتێکم بۆ دەرکەوتبێ ئەو پرچی منداڵەکەی بۆیە کردووە و وای لێکردووە نەناسرێتەوە و لە ئیسرائیلی دەرکردووە. ئەو سەرەتا حاشایی لەوە کرد. من پێمگوت کەوا پاشەڕۆژی ئەو وڵاتە (واتە ئیسرائیل) کە تۆ ئەوەندە خۆشەویستیت بۆی هەیە لە مەترسیدایە و خەڵکەکەی کە دڵت بۆیان لێدەدا وا خەریکە بە بەردان دژی یەکدیدەبنەوە. هێشتا ئەو ڕازی نەبوو شتێک لەو بارەیەوە بدرکێنێ. ئەو جارەیان پێمگوت کە یۆسێل دایکێکی هەیە و زۆری خۆشدەوێ وەک تۆ چۆن هەمو منداڵەکانت خۆشدەویستن و لەسەردەمی شەڕدا بۆ ڕزگارکردن یارمەتیتدەدان".

لەکۆتاییدا قسەکانم کاریانکرد و لەپڕێکەوە دەستی بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد، چۆن لە ڕێی دەریاوە وەک گەشتیار(توریست) هاتۆتە حەیفا بۆ گەشتکردن. لە ناو پاپۆڕەکەدا برادەرایەتی لەگەڵ خێزانێکی کۆچکەرە نوێیەکان پەیداکردووە کە کچێکیان لە تەمەنی یۆشێل

هەبووە. مادلین لەدابەزینیان لە پاپۆڕەکەدا کۆمەکی کچەکەی دەکرد، فەرمانبەری کۆچبەرانیش لای وابوو ئەوە کچی خۆیەتی. فەرمانبەرەکە بەو شێوە لە دەفتەرەکاندا نوسی. بەم جۆرە هەفتەیەک دواتر بەبەرچاوی پۆلیسەوە مادلین لەگەڵ "کچەکەی" بەفڕۆکەوە گەیشتە( زیورخ) کە یەکێکە لەشارەکانی سویسرا. مادلین زانی چۆن سەری یۆشێل بۆیە بکا و جلی کچانەی پی بپۆشێ و دەر بکا.

ماوەیەکی درێژ یۆسێل لە قوتابخانەیەکی ئەرسەدۆکسی لە سویسڕا دانرا، لەوێ ڕابی شای فریر Shai Freyer یەکێک بوو لەمامۆستاکانی. کاتێک مۆساد ڕابییەکەیان رفاند، مادلین پەلی منداڵەکەی گرت و بردیە نیویۆرک و لەوێ لە ماڵێکی سەربە گروپی نیتوری کارتاNetoerei Karta ی دانا. هارل دوای ئەو چیرۆکە بە مادلینی گوت دەکرێ ناو و ناونیشانی ئەو خێزانەمان بدەیتێ؟

ماوەیەک بێدەنگیی خایاند، تا مادلین لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە" ئەو واتە یۆسێل هەنوکە لەو ئەدرەسە Penn Street, Brooklyn 126 لە نیویۆرک دەژی .ناوەکەشمان کردۆتە یانکیل گێتنەر Yankale Gertner.

هەر لەسەرەتای یەکناسینیانەوە هارل بەخەندەوە پێیدەگوت" سوپاس مادلین، من دەمەوێ بەوە سوپاست بکەم کە کارێکت لە ناو مۆساددا بدەم. خەڵکانێکی بەهرەداری وەک تۆ دەتوانن بۆ ئیسرائیل کەڵکبەخشبن". مادلینیش لەسەر ئەوە سوپاسیکرد .

پاشان ئاژانی مۆساد بەرەو نیویۆرک فڕین. لەوێ لە لایەن تیمێکی FBI چاوەڕواندەکران کە ڕۆبەرت کەنەدی Robert Kennedy وەزیری داد ڕینمایی دابوو کە کۆمەکیان بکەن. ئەوەش بەدوای سەردانێکی بنگۆریۆن بۆ کەنەدیدا هات. پیاوەکانی مۆساد چوونە بەردەم ئەدرەسەکە. گێرتنەر خانم دەرگای کردەوە. پیاوەکان یەکسەر بەپاڵنانەوە چوونە ژورەوە، هێشتا مێردی خانمەکە لە خەوهەڵنەستابوو، لەتەنیشت ئەوەوە کوڕێکی لێبوو

بەخۆیدادابوو. یەکێک لە پیاوەکان بەنەرمییەوە پێیگوت" یۆسێل چۆنی، ئێمە هاتوین بتگەڕێنینەوەماڵەوە".

لەو کاتەوەی مۆساد بەدوای سۆراخی یۆسێلدا بوو، هەشت مانگی خایاند. کردەکە نزیکەی یەک ملیۆن دۆلاری ئامریکی تێچوو.

دۆزینەوە و گەڕاندنەوەی یۆسێل بەلای کەمەوە ئەو درزانەی پێپڕنەکرانەوە کە بەهۆی ناکۆکی ئاینییەوە کەوتبوونەوە. دواتر حکومەتیش هەر بەو دەردەشلۆقیەوە دەینالاند، تەنانەت ڕوخانیشی بەهۆی گروپە ئەرسەدۆکسییەکان لە نێو کنێست پەرلەمانی ئیسرائیلدا.

هەرچەندە هارل لە دۆزینەوەی منداڵەکەدا سەرکەوت، بەڵام کاتێ گەڕایەوە ئیسرائیل روبەڕوی یەکێ لەپیاوە بەهێزەکانی بووەوە ، ئەویش مایەر ئەمیت Meir Amitنەیاری بەهێز بوو. ژەنەڕال ئەمیت ببووە سەرۆکی (ئامان) هەواڵگری سەربازیی. هەروەک چۆن هارل سەرنجی ڕەخنەگرانەی لەسەر ئەوانەی پێشخۆی هەبوون، ئاواش ئەمیت هارلی دایە بەر نەشتەری ڕەخنە، بەتایبەتیش ئۆپەراسیۆنی دۆزینەوەی یۆشێل زۆر شتی هێنایە پێشەوە.

ئەمیت Amit ئەو فەرماندە کارامەیە، بەپێی گۆڕانکارییە سیاسییەکان بووە برادەرێکی باشی بنگۆریۆن. ئەو بەسەرەک وەزیرانی ڕاگەیاند گوایە هارل زۆر دەستکراوە" بووە لەگەڵ سەرچاوەکانی، بەشێوەیەک ئۆپەراسیۆنە ڕزگارکەرەکان ماوەیەکی زۆریان خایاندووە، ئەوەش بخەسەر کە هارل زۆر وەک سەرۆکی دەزگاکە ماوەتەوە. وادیار بوو بنگۆریۆن لە یادی چووبوو کە خۆی فەرمانی بەهارل دابوو بۆ ئۆپەراسیۆنەکە، بۆیە لەگەڵ ئەمیت هاوڕابوو. لە 25 ئازاری 1963لەژێر کاریگەری کەمپینی هەراسانکردنێکی دورودرێژەوە، هارل لەتەمەنی50 ساڵیدا دەستی لەکارکێشایەوە. پیاوە تێگەیشتووەکان نەیاندەتوانی فرمێسکەکانیان بشارنەوە کاتێ هارل لە بارەگای سەرەکی مۆساد تۆقەی ماڵئاوایی لێدەکردن. هەمویان هەستیان بەوەکرد کە کۆتایی سەردەمێک هات.

سعاتێک دوای ئەوە پیاوێکی چوارشانەی درێژی سیما هەڵۆیانەی ڕوخسار جوان وەک ئەوە وابوو کە بە ئەکتەری(ڕۆڵنواندن) لەدایکبووبێ، جێی خۆی لە بارەگا سەرەکیەکە گرت. ئەویش مایر ئەمیت Meir Amit بوو، سەرۆکایەتیی مۆسادی پێسپێردرا. مرۆڤ پێویستی بەوە نەدەکرد پێغەمبەر بێ و لەداهاتوو بزانێ، هەمو کەس دەیزانی کە گۆڕانکاری گرنگ بەڕێوەیە.

دوای چارەکێک لەدەست بەکاربوون وهاتنی بۆ ناو بارەگاکە، بەڕێوەبەری گشتیی مۆساد فەرمانی کۆبوونەوەی فەرماندەکانیدا. ئەوان بە کۆمەڵ هاتن و لەبەردەمیدا وەستان، ئەمیت بە بێدەنگی سەیری هەموانی دەکرد، بەشێوازێکی توندو چڕوپڕ وەک چۆن پێشتر فەرمانداریێتی چەندان پێکدادنی لەشەڕگەکاندا کردووە، دەستی بەقسانکرد .

کۆتایی بەو سەردەمە هات کە بە دوای منداڵی ونبوودا بگەڕێین. هیچی دیکە کاری سیاسی ناشیاو و نابەجێ ناکرێن. ئەو دەبێتە پارێزەر و پشتیوانی هەریەکەیان بەرامبەر رەخنەی کەسانی دەرەوە، بەڵام نابێ هیچ کەس ڕەچاوی ئەو کاردانەوەی لێبکا کاتێک ببنە مایەی بێئومێدکردنی لەئەرکەکاندا. ئەو هەوڵی لە ڕادەبەدەری دەدا بۆ زیادکرنی بوجە و بەدەستهێنانی ئامێری باشترو پەیداکردنی سەرچاوەی یەدەگی دیکەی کۆمەک. ئەوەش بۆ ئەوە نەبوو تا ئەوەیان لەبیرکباتەوە کە لە ڕاستیدا یەک تاکە بناوان لەوانی دیکە لە هەمویان گرنگترە ئەویشHumint ە واتە هونەری زانیاری پەیداکردن لە ڕێگەی سەرچاوە زانیارییەکانی مرۆڤەوە. ئەو ویستی ئەو هونەرە کاراتر بکرێ و ببێتە لەپێشترین کارامەیی مۆساد.

کارمەندە نزیکەکانی بۆیان دەرکەوت کە سەرۆکەکەیان لەو کەسانەیە دورتر لە ئیشی ئەمڕۆ دەڕوانێ و چاویشی لەسەر دەرەنجامەکانی ماوەی ساڵانی ئایندەیە. بەکاربردنی تەکنەلۆژیای سەربازی، سەربەو بەشانە بوو کەدەیەویست مۆساد کاریپێبکا.

کەمێک دوای دەستبەکاربوونی ئەمیت وەک سەرۆکی مۆساد، کابرایەک بەناوی سەلمان بەخۆی سەری لە باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لەفەڕنسادا، بۆ

دەربڕینی پێشنیازێکی تێبینیداری سەرسام، ئەویش بە یەک ملیۆن دۆلاری ئامریکی کاش دەتوانێ مشوری گەیاندنی گرنگترین فڕۆکەی نهێنی سەر ئەو زمینە کە میگی MiG21 ی ڕوسییە بۆ دەستی ئیسرائیلییەکان بخوا. سەلمان ئەو پێشنیازە سەیرەی خستە بەردەم دیپلۆماتی ئیسرائیلی و سەردانەکەشی بەو داوا سەیرە کۆتاییپێهێنا، کە یەکێک بنێرنە بەغدا، لەوێ با تەلەفۆن بۆ ئەو ژمارەیە بکا و لە یوسف بپرسێ. مشوری ئەوەش بخۆرێ کە ملیۆن دۆلارەکە ئامادەبێ.

دیپلۆماتەکە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلی لەناوەڕۆکی قسەکان ئامادەکرد و بە کاتسای ڕەوانەی لای ئەمیتی کرد. کاتسا ئەو کەسە بوو کە لە ئۆپەراسیۆنە سەختەکەدا دەربازببوو. ئەو ڕاپۆرتەکەی ناردە تەلئەبیب بەژمارەی تەلەفۆنەکەی کابراشەوە.

مایر ئەمیت بەچەندان ڕۆژ هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکرد. ئەو سەلمانە رەنگبێ لەدواییدا فێڵباز یان هەوادارێک بێ، یان بەشێک بێ لە پیلانێکی عێراقی بۆ گرتنی پیاوانی مۆساد لەوێ. ئەوە دەبوایە لەگەڵ ئەو کاتسا گروپەی ئەوێ بە باشی تاوتوێبکرێ، لەلایەکی دیکەشەوە بەدەستهێنانی میکی 21 دواخستن هەڵناگرێ.

بەهۆی تایبەتمەندییە باڵاکان، خێراییە زۆر تیژیەکەی، ئاراستەی خۆگۆڕین و خولانەوە، چەکدار بوون و کەمخایەنی بۆ پاراستنی، ئەو ئامێرە گرنگترین چەکی ئاسمانی بوو لە هەموو دنیای عەڕەبدا. ژەنەڕاڵە ئیسرائیلییەکانی هێزی ئاسمانی خواخوایان بوو بەلەز و بێ دودڵی یەک ملیۆن دۆلار بۆ کەمێک لە کۆپی دیزاینی میگ 21پەیدابکەن، چجای فڕۆکەکە خۆی. مایر ئەمیت گوتی " ئەز پێیەوە گرفتاربووم، شەو لەگەڵیدا دەخەوتم و بیرۆکەکە وازی لێنەدەهێنام، گەر ئەز لەژێر دو شیش یان لەسەر مێزبام هەر بیرملێدەکردەوە. زانینی دوا زانیاری لەسە چەکە پێشکەوتوەکانی دوژمن بێگومان بۆ هەر دەزگایەکی زانیاری کۆکەرەوە پێشنۆرە دێت. ئەوەش هەڵناکەوێتەوە کە ئاوا بۆت بێتە بەردەست".

هەنگاوی یەکەمیان ناردنی پیاوێک بوو بۆ بەغدا. ئەمیت بۆ ئەو پیاوەی کە ناردی کەسێکی دیکەی لێدروستکرد، وەک ئینگلیزێک و پاسپۆرتێکی نوێی لە ژێر ناوی جۆرج باکۆن George Bacon بۆ دەرهێنا. هیچ کەسێک ئەوەی بەمێشکدا نەدەهات، جوێک ئەو ناوە هەڵبگرێ. باکۆن وەک ڕێبەرێکی بازرگانی کە لە لەندەن کارگەیەکی ئامێری ئیشاعە(ڕۆنتگەنRontgen) گرتن بە نەخۆشخانەکان بفرۆشێ، بەرەو بەغدا فڕی .

ئەو بە فڕۆکەیەکی سەربە هێڵی ئاسمانی عێراقی بە خۆی و چەند کارتۆنێکی کەلوپەلەکان گەیشتە بەغدا. ئەو کورتە خولێکی ڕاهێنانی چۆنیەتی فرۆشتنی ئامێری ئیشاعەی کیمیاوی بە نەخۆشخانەکان بینیبوو. باکۆن لە هەفتەی دوهەمیدا لەبەغدا زەنگی بۆ ژمارە تەلەفۆنەکی سەلمان لێدا. ڕاپۆرتەکانی باکۆن بۆ مۆساد وەسفێکی زیندویانەیان تێدابوون.

"من تەلەفۆنی قاوەخانەی میوانخانەکەم بەکارهێنا. دەرفەتی گوێلێڕاگرتنی ئەو تەلەفۆنە کەمتر بوو لە تەلەفۆنی ژورەکەم لە میوانخانەکەدا. یەکسەر کە زەنگملێدا هەڵیانگرت. دەنگێک کە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت بە فارسی پێیگوتم کە لەگەڵ کێ قسەدەکەم، ئەزیش بە ئینگلیزی بەرسڤم داوە و داوای لێبوردنم کرد و گوتم وادیارە زەنگم بۆ ژمارەیەکی هەڵە لێداوە. پاشان دەنگەکە ئەم جارەیان بەئینگلیزی پێیگوتم لەگەڵ کێ لەسەر خەتم . پێمگوت لەگەڵ برادەرێکی یوسف. ڕەنگبێ یەکێکی لا دانیشتبێ کە ئەو ناوەی هەبێ. پێیگوتم کەمێک چاوەڕێبکەم. من وامزانی تەلەفونەکە تۆماردەکا، ڕەنگبێ ئەوە داو بێ بۆ من. ئەوسا دەنگێکی بەڕێز لەگەڵم هاتە سەرخەت. گوتی کەوا من یوسفم و خۆشحاڵیشم کە زەنگت بۆ لێدام. پاشان لێیپرسیم ئاخۆ من لە فەڕەنسا ناسراوم. من گوتم ئەوە خۆیەتی".

باکۆن ڕازی بوو ڕۆژی پاشتر یوسف لە چایەخانەیەکی بەغدا ببینێ. لە وادەی دیارکراودا کەسێکی ڕو بەخەندە خۆی پێناساند کە یوسفە. ئەو دەموچاوێکی بە کوریشک وچرچ و لۆچی هەبوو، پرچیشی تەواو سپی ببوو. ڕاپۆرتەکانی باکۆن کە دواتر ناردبوونی وەسفێکی سوریالیانەی بەڕونی

تێدابوو، کە نوسیبوی" یوسف گوتی من زۆر شادمانم بەدیتنت، هەروەک ئێمە لەیەک خێزان بین بۆ ماوەیەکی زۆر سەیریدەکردم، کە دەستی بەقسان کردەوە، سەرەتا باسی ئاوهەوا و باسی بەرەو دواوەگەڕانەوەی بارودۆخ و ئەو جۆرە باسانەی کرد. من بیرمکردەوە کە من لە ناوجەرگەی وڵاتی دوژمندام، خۆگەر تۆڕی دژەجاسوسان گوێیان لێمانبێ و شتێک لەو پیرەپیاوە هەڵبکرێنن، ئەوا دەردەست واتای مەرگی من دەگەیەنێ. ئەز بەو دەرەنجامە گەیشتم کە ئەو یوسفە هەر چ پەیوەندییەکیشی لەگەڵ سەلمانەکەی فەرەنسادا هەبێ، نابێ پۆلیسێکی عێراقی تۆڕی دژە جاسوسی بێ. ئەوەش هزرێکی ئارامکەرەوە بوو. من پێمڕاگەیاند کە برادەرانی من بە بایەخەوە دەڕواننە ئەو کەلوپەلانەی کە برادەرەکەی ناوی هێنابوون. ئەو وەڵامی دامەوە " سەلمان پسمامی منە و لە فەرەنسادا دەژی. ئەو لە قاوەخانەدا گارسۆنە. هەمو گارسۆنە باشەکانی ئێرە هەڵاتوون". ئنجا یوسف کەمێک خۆی بەلامدا نەویکردەوە و گوتی" تۆ بۆ میگ Migەکە هاتوی. من کارەکەت بۆ ڕێکدەخەم. وەلێ نرخەکەی یەک ملیۆن دۆلارە". ئاوا بێ پێچو پەنا قسەکانی کردن.

باکۆن وای بۆ هات کە یوسف لەوە زیاتری پێیە کە هەیە. هێواشی و دڵنیابوونی لێدەتکا، بەڵام کاتێک باکۆن ویستی پرسەکانی بکا. پیرەمێرد سەری رادەوەشاند " لێرە نا، ڕەنگبێ خەڵک گوێی لێ بێ".

بۆ رۆژی پاشتر دانیشتنێکی دیکەیان سازدا. ئەو جارەیان لە پارکێکی سەر روباری دیجلە.(نوسەر نوسیویەتی روباری فرات، بەڵام هەر دیجلە بەناو بەغدادا دەڕوا، بۆیە پێم وایە بە هەڵە لەجیاتی دیجلە ناوی فراتی هێناوە- وەرگێڕی کوردی) ئەو روبارەی وەک ماندویەکی بە هەیبەت بەشاردا پێچدەدا. ئەوشەوە باکۆن چاوەکانی لێکنەنان. بەردەوام هەر بیری دەکردەوە. دەیپرسی تۆ بڵێی بەهێواش ملی لە قنارەوە نزیک نەبووبێتەوە، خۆگەر ئەوە لە لایەن تۆڕی دژە جاسوسی عێڕاقییەکانیش رونەدا، بەڵام کێ ناڵێ لەلایەن کەسانیکەوە نابێ کە ڕێوی ئاسا یوسفیان هەڵخەڵەتاندبێ و کردبیتیانە

دەمامکی خۆیان. چاوپێکەتنەکەی ڕۆژی دواتر زیاتری لەبارەی پاشخانی یوسف هەڵکڕاند.

ئەو لە خانەوادەیەکی هەژاری جولەکەی عێڕاقی بوو. هەرکە هەراش بووە کارکەری ماڵە کریستیانێکی مارۆنی دەوڵەمەند بووە. دوای خزمەتکردنی 30 ساڵی ڕەبەق، دوای بە نارەوا تۆمەتبارکردنی بە دزینی خواردن لەپڕ دەریانکردووە. بەو جۆرە لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بێ هیچ حیسابیۆکردنێک دەرکراوە. لەبەر ئەوەی تەمەنی ئەو بۆ ئیش دۆزینەوە بەسەرچووە، ناچارە بەو بڕە پارە کەمەی خانەنشینی بگوزەرێنێ. ئەو بڕیاریدابوو بەدوای ڕەگ و ڕیشەی جولەکایەتی خۆیدا بگەڕێ. سەبارەت بە ڕەچەڵەکیان لەگەڵ خوشکەکەی بە ناوی (مانو)ی بێوەژن کە دایکی مونیرە و مونیریش فڕۆکەوانە و لە خزمەتی هێزی ئاسمانی عێڕاقدا دایە، قسەی کردبوو. مانوش دانیبەوەدانابوو کە پڕبەدڵ حەزدەکا بەرەو ئیسرائیل کۆچبکا، بەڵام چۆن ئەو حەزەیان دەبێتە واقیع ؟ هەرتەنها قسەکردن لەسەر بیرۆکەکە، واتای زیندانکردنیان لە عێڕاقدا دەگەیەنێ. خۆگەر ئەوانیش ڕۆیشتن و هەرکەسێکیان لە عێڕاق بەجێهێشت ئەوا بە توندی ئازارو ئەشکەنجە دەدرێ، ڕەنگبێ بشکوژرێ. بێجگە لەوەش پارەی خەرجییەکان لەکوێ بێنن؟ بەو شێوەیە وایلێهات بیرۆکەکە خەونێکی بەدینەهاتو بێ.

بیرۆکەکە لە مێشکی یوسف جێگای گرتبوو. لەسەر نانخواردن زۆر جاران مونیر بە خاڵی دەگوت کە فەرماندەکەی بەشانازییەوە پێیڕاگەیاندون کە ئیسرائیلییەکان پارەیەکی زۆر بەو فڕۆکانە دەدەن کە لەژێر ئێوەدایە، ڕەنگبێ ملیۆنێک دۆلار بدەن.

ئەو بڕە پارە خەیاڵییە یوسفی دەهەژاند. ئەو دەتوانێ بەو پارەیە کاربەدەستان بکڕێ و ڕێگای فڕینیان بۆ دابینبکا. بەو پارە زۆرە دەکرێ هەمو ئەندامانی خانەوادەکە لە عێڕاق دەربازبکا. هەرچەند بیری لەو پرسە دەکردەوە، وای بۆ دەردەکەت، کە دەتوانێ جێبەجێیبکا. منیر شێتی دایکی بوو .ئەو هەمو شتێکی بۆدەکرد تەنانەت رفاندنی فڕۆکەیەکی جەنگیی

وگۆڕینەوەی بە ملیۆنێک دۆلار. ڕەنگبێ ئەوە نەکەوێتە سەر یوسف کە ڕێی هەڵاتن دابینبکا، بەڵکو ئەوە دەکەوێتە سەر ئیسرائیلییەکان خۆیان. هەمولایەک دەیزانی کە کارەکە چەند سودبەخشە، بۆیە ئەو سەلمانی ڕەوانەی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل کردبوو.

"هەنوکە ئەی باشترین برادەر تۆ لێرەی" یوسف بە تاسەوە بە باکۆنی گوت.

"ئەی کاروبار لەگەڵ مونیر چۆنە؟ ئەویش ئەوە هەمووی دەزانێ؟"

"بەڵێ، بەدڵنیاییەوە. ئەو بەڵێنیداوە کە میگەکە بڕفێنێ، بەڵام ئەو دەیەوێ نیوەی پارەکە ئێستا بدرێ، نیوەکەی دیکەش کەمێک دوای تەسلیمکردنی فڕۆکەکە"

باکۆن هێدمەگرتوبوو بوو. هەرچی تائێستا گوێی لێببوو متمانەدار و لەکارهاتوبوو، بەڵام دەبوایە یەکەم جار ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل بۆ مایر ئەمیت بنێرێ .

لە تەلئەبیب بەڕێوبەری گشتیی مۆساد هەمو دانی پاشنیوەڕۆکە گوێی بۆ باکۆن هەڵخست، کە بە دورودرێژی ڕاپۆرتی لەسەر کارەکە دەدا.

ئەمیت لەدواییدا پرسی" یوسف دەیەوێت پارەی چۆن بدرێتێ؟"

"بخرێتە سەرحیسابی بانکێکی سویسڕی کە خزمێکیان بەهۆی نەخۆشی بە ناچاری دەبەنە ئەوێ، چونکە لە بەغدا چارەسەرناکرێ. دەسەڵاتدارانی عێڕاق ڕێگای پێدەدەن بچێتە سویسڕا. کە ئەو گەیشتە ئەوێ، وا چاوەڕواندەکا پارەکەی بۆ لەبانک دابنێن".

ئەمیت بەوشکی بە باکۆنی گوت" ئەوە چ دەستڕۆیشتنێکە کە یوسف لەتۆی دەوێ، گەر پارەکە بە تەواوی گەیشتە سەر حیسابەکە، ئیدی بەیەکجاری ئێمە یوسف نابینینەوە".

هەروەها ئەمیت ئەوەشی لە باکۆن پرسی کە" چۆن متمانە بە یوسف دەکەی؟"

" لەبەر ئەوەی تاکە دەرەتانێکە" ئەوەش وەڵامی باکۆن بوو بۆ بەڕێوبەرەکەی. ئەمیت پەسەندیکرد و چەکێکی نیو ملیۆن دۆلاری ناردە

بنکەی Credit Suisse لە ژنێڤ. ئەو نەک هەر پارەی لەسەر ئەو قومارە دانابوو بەڵکو شتی زۆرتریش. ئەمیت دەیزانی سەری تێدادەچێ، گەر هاتبا و یوسف هەلخەڵەتێنەرێکی کارامە بوایە وەک چۆن هەندێ لە ئەفسەرەکانی مۆساد بڕوایان بوو.

کاتی ئەوە هاتبوو ئەمیت سەرەک وەزیران بنگۆریۆن و سەرۆکی ستافەکەی ئیسحاق ڕابین ئاگاداربکاتەوە. هەردو پیاو دەنگیان بۆ بەجێگەیاندنی ئۆپەراسیۆنەکە دا. بەڵام مایر ئەمیت ئەوەی پێڕانەگەیاندن کە ئەو رەفتاری زیاتری نواندووە، ئەویش کێشانەوەی تەواوی ڕایەڵەکانی تۆڕی مۆسادە لەعێڕاقدا.

" گەر هاتباو ئەو ئۆپەراسیۆنە شکستی خواردبا، نەمدەویست کەس لەخۆم زیاتر بەرپرسیارێتی بخرێتە مل. من پێنج دەستەم پێکهێنان. یەکەمیان دەبوا لە سەرهێڵبوونی من لەگەڵ بەغدا مسۆگەربکەن. ئەوان دەبوایە تەنها لەباری زۆر ناچاردا پەیوەندییە رادیۆیەکە ببڕن. لەوە زیاتر هیچی دیکەم لەوان نەدەویست. دەستەی دوهەم دەبوایە لە بەغدا بن بێ ئەوەی کەسیان پێبزانێ، نەباکۆن و نەدەستەی یەکە، نەهیچ کەس پێیانبزانێ. ئەوان باکۆنیان لە عێراق دەربازدەکرد گەرهاتباو کێشەی بۆ پەیدابیا. هەروەها گەر کرابا یوسفیش. دەستەی سێیەم دەبوایە چاوی لەسەر خانەوادەکە بوایە. دەستەی چوارەم دەبوایە پەیوەندییان بە کوردەکانەوە کردبا، چونکە لە دوا قۆناخدا ئەوان یارمەتیاندەدایِن بۆ ڕزگارکردنی ئەندامانی خێزانەکە لە عێراق. ئەوان چەکیان لە ئیسڕائیل وەردەگرت. دەستەی پێنجەمیش دەبوا مشوری پەیوەندییەکان لەگەڵ واشنتۆن و ئەنکەرەدا بخۆن. گەر ئەو میگە لە عێڕاقەوە بفڕێ، دەبێ بەئاسمانی تورکیادا بڕوا تا دەگاتە بەردەستمان. واشنتۆن بنکەی لە بەشی باکوری تورکیا هەیە. ئەوان دەکرێ قەناعەت بەتورکەکان بێنن کە دەبێ هاوکاریمان بکەن، بەوەی پێیانبلێن کە لە دواییدا میگەکە بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەفڕێ. من دەمزانی عێڕاقییەکان دەترسان لەو ئەگەرەی کە یەکێ لە فڕۆکەوانەکان بەرەو ڕۆژئاوا هەڵبێ، بۆیە هەرگیز

تانکی بەنزینەکەیان پڕ نەدەکرد و بەنیوەییان دەهێڵایەوە. ئەوە ئەو شتە بوو کە دەبێ هەندێ گۆڕانکاری بۆ بکەین. بێجگە لەوە کێشەی دیکەش هەبوون. یوسف گەیشتە ئەو ئەنجامە کە نەوەک هەر خێزانەکەیان بەڵکو دەبێ ئامۆزا و پورزاکانیشی، ئەوانەی پلەی سێهەمیشن لە دەستوەشاندنەوەی عێراق دەربهێنرێن. بە هەموویانەوە یوسف دەیویست 43 کەس بەفڕۆکە روەو شوێنێکی ئارام بفڕێنن.

ئەمیت بەوە ڕازی بوو، بەڵام ڕوبەڕوی کێشەیەکی دیکە بووەوە. باکۆن پەیامێکی بۆ تەلئەبیب نارد، کە منیر بەگومانە لە سەرکەوتنی ڕفاندنەکە. بەڕێوبەری گشتی هەستیکرد کە چ لەئارادایە. منیر جارێ هاووڵاتییەکی عێراقییە. وڵاتەکەی بۆی باش بووە. ناپاکییکردن لە وڵاتەکەی عێڕاق بۆ ئیسرائیلی بە ئاسانی بۆ قوت نادرێ، چونکە ئێمە دوژمنیان بووین. بە درێژای تەمەنی ئەوەیان پێگوتووە. من بڕیارمدا کە تەنها بە شێوازێک بیهێنمە سەر ئەو بڕوایەی کارەکەی تەواو بکا، ئەویش بەوەی کە میگەکە دەنێردرێتە ئامریکا. بۆیە من بەرەو واشنتن فڕیم. لەوێ قسەم لەگەڵ ریچارد هێلمس Richard Helmsی بەڕێوبەریCIA کرد. ئەو گوێی لێگرتم و گوتی" کێشە نییە" بۆ ئەو جۆرە ئیشانە ئەو هەمیشە باش بووە. ئەو ئەوەی ڕێکخست کە پاشکۆی سەربازی لەبەغدا دیدارێکی لەگەڵ منیر سازدا. ئەو کەسە بۆی سەلماند فڕۆکەکە تەسلیمی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەکرێ. ئەو بڕوای پێهێنا کە چیرۆکێکی درێژە سەبارەت بەو چەکەی ڕوسی، ئامریکا دەیەوەێ هاوشانی روسیا بمێنێتەوە. منیر ئەو جارە ئەوەی بۆ قوتدرا و بەڵێنیدا کە لەسەر ڕفاندنەکە بەردەوامبێ". بەو جۆرە ئۆپەراسیۆنەکە کەوتە سەر هێڵی خۆی. خزمە نەخۆشەکەی یوسف ڕێگەی پێدرا عێراق بەجێبێڵێ و بەرەو ژنێڤ بفڕێ. لەوێوە کارتێکی نارد و لەسەری نوسیبوو" ئەو نەخۆشخانەیە بە ڕاستی زۆر باشە. دڵنیایانکردمەوە کە چاک دەبمەوە". ئەو پەیامە هێما بوو بۆئەوەی کە نیو ملیۆن پارەکەی دیکە خراوەتە سەر حیسابە بانکییەکەی .

بە متمانەوە یوسف بە باکۆنی ڕاگەیاند کە ئەوان ئامادەن. پێش ئەو ئێوارەیەی منیر بفڕێ، یوسف بەکاروانێک خانەوادەکەی بەرەو باکور، بەرەو چیا فێنکەکان برد. ئەوان لە ڕێگادا لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە هیچ گرفتێکیان بۆ دروستنەکرا، هەمو هاوینان خەڵکی پایتەخت لەبەر هەتاوی سوتێنەری شار ڕایاندەکرد. لە لاپاڵی شاخەکان کوردەکان و دەستەی پەیوەندیکارە ئیسرائیلیەکە چاوەڕوانیان دەکردن. ئەوان خانەوادەکەیان زیاتر بەرەو شاخەکان هەڵکشاند، تا ئەو شوێنەی هەلیکۆپتەرەکانی هێزی ئاسمانی تورکیایی چاوەڕوانیاندەکردن. لەژێر ڕادارەوە بە فڕین چوونە ناو سنوری تورکیاوە. پۆلیسێکی ئیسرائیل زەنگێکی بۆ منیر لێدا و پێیگوت کە خوشکەکەی لەشساخە و کیژۆڵەیەکی بووە . بۆ سبەینێ، 15 ئابی 1966 منیر زو بۆ مەشقی فڕینەکەی لە خەو هەڵسا. هەرکە مەودایەکی گونجاو لە فڕۆکەخانەکە دورکەوتەوە، بەنزینێکی زۆری دایە میگەکە، پێش ئەوەی فڕۆکەوانە عێراقییەکان بە مەرامی دورکەتنەوەکەی بزانن و تەقەی لێبکەن و بیخەنە خوارەوە، ئەو گەیشتە سنوری تورکیا. لەژێر سەرپەرشتی دەستەیەک لە فڕۆکە جەنگییەکانی ئامریکی فانتۆم Phantom منیر لەبنکەیەکی سەربازی هێزی ئاسمانی تورکیدا نیشتەوە. لەوێ بەنزینی تێکرد و هەڵسایەوە. لە ڕێگەی مایکرۆفۆنەوە ئەو پەیامەی پێگەیشت، بەڵام ئەم جارەیان بە زمانێکی ڕون " هەمو خانەوادەکەت بەسەلامەت دەرچوون و لە ڕێگادان لەگەڵ تۆ یەکبگرنەوە". سعاتێک دواتر میگەکە لە فڕۆکەخانەیەکی سەربازی لە باکوری ئیسرائیل نیشتەوە. مۆساد سەلماندی کە فاکتەرێکی گرنگە لەسەر شانۆی جیهان. لەسەر ئاستی دەزگای زانیاری سەردەمێکی نوێ دەستیپێکرد، دانیبەوەدانا کە چۆن لە ڕابردودا کارەکان کراون چ پێش ئەمیت و چۆن لەداهاتووشدا دەکرێن واتە دوای ئەمیت.

تێبینی: بەسوپاسەوە گۆڤاری K21 ئەم بەشەی لەژمارە جمکەکەی(2و3)ی خۆیدا بڵاوکردۆتەوە.

# 3

## بەردەنەخشی گالیلۆت

{شەڕی شەش رۆژە.. دزەکردنە نێو سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی میسر.. مۆساد کۆپی CIAو KGB نیە.. مەشقەخولەکانی ئاژانەکان.. گرتنو لەسێدارەدانی سیخوڕێک.. زاهیرەدین پسمامی حافز ئەسەد.. جەمال عەبدولناسر دوو ئاژان بەردەدا.. سایانم کێن؟.. پلانی مایر ئامیت..عەلی سەلامە.. کەوتنە خوارەوەی فڕینی 800و گیانلەدەستدانی سەرجەم سەرنشینانی.. ئەسەدو تابلۆی سەلاحەدین..}

ئەوکاتەی مایر ئامیت Meir amit ڕێگا خێراکەی باکوری تەل‌ئەبیبی بەجێهێشت، هێشتا خێراییکەی هەندێ لەسەروی ڕاددەی ڕێپێدانی ئەوپەڕی خێراییدا بوو. هەر لەو ساتەی پێش 30ساڵ تەحەدای رفاندنی میگە MIGعێراقییەکەی کرد و جێبەجێشیکرد، شێوەژیانی ئەو بەرامبەر ڕێساو ڕێنماییەکان دەستسوکی پێوە دیار بوو.

سەرپێچی ئەو بەوەی کوێرانە بەدوای ڕێساکان نەکەوێت، دەگەڕێتەوە پاشخانە گالیلیەکەی ' ئێمە هەمومان لەوێ کەللەڕەقین" ئەو لە شارە خۆشەویستەکەی شا هیرۆدۆس Herodes لەدایکببوو، تەبەریا Tiberias دورنەبوو لە کەناری دەریاچەی گالیلیا، هەر لەوێش بەشی هەرە زۆری لاوێتی لە کیبۆت(ئۆردوگا) بەسەربردبوو. هەر زوش بەهۆی دایکی، کە مامۆستای زمان بووە، ئەکسێنتی جوتیاریی دەڤەرەکەی لەسەر نەما. دایکەکە لەپاڵ ئەوەشدا خواستی سەربەخۆبوونی لای کوڕەکەی دەپاراست، بەتایبەتیش کە ئەو لەبەردەم گێل و گاڵتەجاڕەکان ملی نەدەدا، بەڵام گرنگترین شت کە دایکی هاندەری بوو، بەکارهێنانی توانستەکانی خۆی بوو بۆ لێکدانەوە و بیرکردنەوە.

لەوماوە درێژەی راژەیدا، ئەو ئەم خاسیەتانەی هەبوون، مەبەستی دوژمنەکانی لە کاتی خۆیدا بدۆزێتەوە. زۆر جاران ناتوانێ تا تەواو دڵنیا نەبێ ئارام بگرێ ئەوجا دەستبەکاربێ، هەروەها تەکنیک و پاڵنەرەکان و

لەخشتەبردن لە کاری ئەودا چەقی بازنەیان گرتبوو. هەندێ جار ڕەخنەگرانی لە نێو دەزگای هەواڵگرییدا خەمی ئەوەیان دەخوارد، کە پێیانوابوو مایر ئامیت سەرچڵییەکانی لە فانتازیاوە دێن. بۆ هەمو ئەوانە یەک بەرسڤی هەبو" ئاخر قوڵ بڕوانە دۆسیەی میگە دزراوەکە" .

بەیانیەکەی مارتی 1997، ئەوکاتەی مایر ئەمیت لە تەلئەبیب دورکەوتبوەوە، ئەو بە فەرمی خانەنشین کرابوو. کەس لە دەزگا هەواڵگرەکانی ئیسرائیلی باوەڕیان نەدەکرد کە هێشتا زۆر شتی ناوەوە و ئەزمون و ڕاستی پێماون، ئەو زانیاریانە زۆر لەوە بەهادارترن کە بخرێنە سەر ڕەفە.

ڕۆژیک پێشتر مایر ئامیت لە شاری هۆشیمینە گەڕابووەوە، لەوێ سەردانی ئەفسەرە هەواڵگرەکانی ڤیتکۆنگی vietcong کردبوو. ئەوان بەیەکەوە ئەزمونی خۆیان ئاڵوگۆڕکردبوو، بۆیاندەرکەوت کە خاڵی هاوبەشیان هەبووە. ڤێتنامییەکان ڕوبەڕوی زلهێزیی ئامریکا و ئیسرائیلییەکانیش بەرامبەر زلهێزیی عەرەبەکان ببوونەوە. مایر ئامیت سەری هەندێ شوێنی دیکەیدا، کە تیایدا مانۆڕی نهێنی کاتی خۆی هەرای نابووەوە وەک عەممان، قاهیرە و مۆسکۆ. کەس لە ئیسرائیل نەیدەوێرا لە مەبەستی ئەو سەردانانە بپرسێ، هەروەک ئەوەی کەس نەیوێراوە لەماوەی ئەو پێنج ساڵەی سەرکردایەتی مۆسادی دەکرد لە 1963-1968 سۆراخی ژێدەرو میتۆدەکانی کارکردنی بکا.

لەو ماوەیەدا ئەو زانیاری هەواڵگریی کۆکردنەوەی لە ڕێگای humint بۆ هونەرێکی سەلمێنراو بەرزکردەوە. هیچ دەزگایەکی هەواڵگری دیکە ئەو شانسەی نەبوو ئاژانەکانی خۆی بنێرێتە شوێنێک بۆ زانیاری خڕکردنەوە و لەبەرامبەر دژەکانیشدا بیانگوازێتەوە. ئەو پیاوە هەواڵگرەکانی خۆی بە ژمارەیەکی زۆر دەناردە هەمو دەوڵەتە عەرەبییەکان، هەمولایەک لە ئاوڕوپا، باشوری ئامریکا، ئافریکا و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا. کاتساکانی katsa ئەو خۆیان خزاندبووە ناو دەزگای هەواڵگریی سوری و دەزگای نهێنیی

ئوردن كە بە باشترین دەزگای عارەبی دادەنران. هەروەها توانیبوشیان بخزێنە نێو دەزگای هەواڵگری سەربازیی سوری كە بە درندەترینیان بەناوبانگ بوو. ئەوان پیاوێك بوون، دەمار پۆڵاو ورە لەبن نەهاتو، وەك ئەوەی هیچ رۆماننوسێك نەیوێرابێ وێنایان بكا .

كەمێك دوای دەستبەكاربوونی مایر ئامیت وەك بەڕێوبەری گشتیی مۆساد رێگای بە بڵاوكردنەوەی ئەو یاداشتنامەیە دا، كە لەڕێگەی باوەڕپێكراوێكیان لە نوسینگەی یاسر عەرەفاتی سەرۆكی رێكخراوی رزگاریخوازی فەلەستینPLO دەستیان كەوتبوو، تیایدا هاتبوو:

مۆساد دۆسیەی هەمومانی لایە. ئەوان ناو و ناونیشانمان دەزانن. ئێمە دەزانین كە دۆسیەكانیشمان دوو وێنەیان پێوەیە، یەكیان بەبێ عەگال و ئەوی دیكەشیان بەعەگالەوە. ئەمەش بۆئەوەی بزانن چۆن خۆمان هەڵدەخەین. بۆ مۆساد زەحمەت نییە چ بە عەگال یان بەبێ عەگال بماندۆزنەوە .

ئامیت تاكو زیاتر بیان تۆقێنێ كۆمەڵێ هەواڵدەرو راپۆرتنوسی عەرەبیشی پەیدا كردبوون. ئەو ژمارە زۆرەشی بەپێی بنەمای ئەو قانونە بوو، كە دەكرێ لە زۆرترین ژمارەدا ژمارەیەكی گونجاوی باشی خەڵك پەیدا بكەی. عەرەبە بەكرێگیراوەكان(جاشەكان-وەرگێڕ) تیرۆریستەكانیPLO یان بەخۆیان و تەواوی حەشارگەی چەكەكانیانەوە ئاشكرا دەكرد. بۆ هەر كوژراوێكی تیرۆریست بەدەست مۆساد، ئامیت برە پارەیەكی زیادی یەك دۆلاری دەدایە عەرەبە بەكرێگیراوەكان.

لەسەروبەندی شەڕی شەش ڕۆژەی 1967 بەلای كەمی كاتسایەك و بەكرێگیراوێكی مۆسادیان لە هەمو بنكە ئاسمانییەكانی میسر و بارەگا سەرەكیەكانییان چاندبوو. ئامیت خۆی لە بارەگای گشتی و سەرەكی قاهیرە سێ بناوانی هەواڵی لە ستافی ئەفسەران هەبوو، كەخۆی بڕوای پێهێنابوون كاری لەگەڵدا بكەن. هەرچەند ئەو خۆی قایم و تەیار دەكرد، گرنگترین رازی ئەوە بوو' هەندێ شت باشتر وایە ئاوا لێیبگەڕێی'.

بۆ هەر ئاژانێکی مۆساد و هەواڵگرێک هەمان رێنمایی هەبوون، ئەو هەر بەتەنها ' وێنە گشتییەکەی' ناویٚ بەڵکو ' کون و کەلەبەرەکانیشی' دەوێن. ئایا چەند پێویستە فڕۆکەوانێک لە مۆڵگەی خۆی بۆ ناندین بڕوا؟ ئایا چەند ئەفسەرەکان لە ترافیکی پڕ ئاپۆرەی قاهیرەدا دەچەقن؟ ئایا یەکیٚ لە ئەفسەرە پلە بەرزەکان دۆست (یار،عەشیقە)ی هەیە؟ تەنها ئەو بەدەقاودەقی چۆنێتی دەستڕاگەیشتن بەو راستیانە و بەکارهینانی دەزانی.

یەکێک لەکاستاکان ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخسا کارێک وەک بەردەستێک لە چێشتخانەی ئەفسەرانی لەپێشەوەی بارەگایەکی هێزی ئاسمانی پەیدا بکا. ئەوجا  هەمو هەفتەیەک زانیاری وردی لەسەر ئامادەباشی فڕۆکەکان و چۆنیەتی ژیانی فڕۆکەوانەکان و تاقمی تاکنیکی دەدا. تەنانەت زانیاری لەسەر خواردنەوەیان و مێبازیشی بۆ تەل‌ئەبیب رەوانە دەکرد.

زۆر نەبوو مۆساد دەزگایەکی بۆ لێکۆڵینەوەی دەرونی شەڕکەران لەژێر ناوی فەرمی Loh amma psichologit (LAP)  پێکهێنا، ئەو دەزگایە بیست و چوار سعات خەریکی لێکدانەوەی دۆسیەی ئەفسەرەکانی ستافی زەمین و ئەفسەرە میسرییە پلە بەرزەکان بوو. زانیارییەکانی سەبارەت بە کارامەییان شیدەکردنەوە. ئەو پرسەی دەکرد ئایا ئەوان پلەکانیان بە لێهاتویی وەرگرتووە یاخود بەتۆزو با ؟ ئایا ئەوان کێشەی خواردنەوەیان هەیە، ئایا مێبازن یاخود زیاتر بەلای لوسکەدا دەشکێنەوە؟

زۆر جاران وابوو مایر ئامیت تا درەنگانێکی شەو لەگەڵ ئەو دۆسیانەدا خەریکدەبوو، بە مەبەستی ئەوەی خاڵی لاوازیان تێدا ببینێتەوە، بەڵکو لە ڕێگای هەڕەشەوە بتوانیٚ بۆخۆیان کێشبکا و ئیشیان پێبکا. ئەو دەیگووت " ئەوە کارێکی  خۆش نییە، بەلاّم کاری زانیاریدەرهێنان هەندیٚ جار قێزەونیشە".

مالباتە جەنگاوەرە میسرییەکان وردە وردە نامەی پۆستکراوی قاهیرەیان بۆدەهات، تیایدا وردودرشتی رەفتارو هەڵسوکەوتی کەسوکارە خۆشەویستەکانیان تێدا بوو. سەبارەت بەو کارە ڕاپۆرت بۆ تەلئەبیب چوو،

لە دەرەنجامی نامەکان کێشەیان بۆ پەیدابوو، تا وایلێهات یەکێک لە ئەفسەرەکان داوای مۆڵەتی نەخۆشی بکا. ستافی ئەفسەرانیش تەلەفۆنی نادیاریان سەبارەت بە کونوکەلەبەری ژیانی تایبەتی هاورێکانیان بۆ دەهات. مامۆستایەک لەلایەن ژنێک بەدەنگێکی پەرۆشەوە دەربارەی تەمبەڵی خوێندکارێکی دیارکراو کە ئەفسەرێکی باڵایە تەلەفۆنی بۆکرا، ئەویش لەبەر ئەوەی بەدزیەوە دۆستێکی هەیە بێجگە لەدایکی خوێندکارەکە. تەلەفۆنەکە ئەوەی لێکەوتەوە کە کابرا گوللەی لەبناگوێی خۆیدا و خۆی کوشت. ئەو کەمپینە بێ بەزەییە بووە مایەی نانەوەی ناتەبایەکی زۆر لە ڕیزی سەربازیی و مایەی خۆشحاڵیش بۆ ئامیت.

لە بەرایی ساڵی 1967دا زانیارییەکانی تۆڕی هەواڵگری لە میسر ئەوەیان نیشاندا، کەوا سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر بەتەمای هەڕەشەکردنی هەڵگیرساندنی شەڕێکی نوێیە دژی ئیسرائیل. ئەوسا لە ڕێگەی هۆکاری ڕەوا و ناڕەوا، بەکرێگیراو و زانیاریدەر زیاتر لە میسر خرانەگەڕ، تا وایلێهات بتوانن زانیاریی ورد سەبارەت بەهێزی ئاسمانی و ئەفسەرو پلەدارەکان و هەڕەمی دەسەڵاتی هێزی هەوایی میسری بدەنە مۆساد، هەروەک چۆن ئەوەی بارەگای سەرەکی قاهیرە دەیزانی.

لە سەرەتای مانگی ئایاری 1967دا، مایر ئامیت توانی دەقاودەق بە ژەنەڕاڵەکانی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل بڵێ، کە چ ساتێک ئەوان دەتوانن هێرشێکی کتوپڕ بە زەبرێکی گورجکبڕ بسرەوێننە هێزی ئاسمانی میسریی. لێکدەرەوەکانی مۆساد توانیبوویان لێکۆڵینەوەیەکی وردیان لەسەر پێگە و بارەگاکانی هێزی ئاسمانی میسریی هەبێ.

خاڵی هەرە لاوازی ڕادارەکانی بارەگای هێزی ئاسمانی لەنێوان سعات 07:30و07:45دابوو. لەو چارەکە سەعاتەدا نۆرەی ئێشکگری شەو، کەشەکەت و ماندوون و کاتی ئاڵوگۆڕیانە، لەوکاتەی نۆبەتی ڕۆژ هێشتا سەد لە سەد وشیار و تەیار نەبوون، دەهات. زۆر جاران وابوو ئەو نۆبەیە دوادەکەوت بەهۆی درەنگ بە بەرکەوتنی نانی بەیانی. فڕۆکەوانەکان نانی

بەیانیان لەنێوان 07:30و07:45 دا بوو. دواتر ئەوان بەپێ بەرەو مۆڵگەی فڕۆکەکانیان دەڕۆیشتن تا بیانفڕێنن. ئەو ماوەیەش ئاسایی دە خولەکی دەخایاند. زۆربەی فڕۆکەوانەکانیش یەک دوو خولەکیان دەویست بۆ سەرئاوکردن پێش ئەوەی هەڵوێستی خۆیان لەناو فڕۆکەکە بدەن. بەم جۆرە ئەوان سعات 08:00 دەگەیشتن، ئەو کاتەش کاتی فەرمی دەستپێکردنی ڕۆژێکی نوێ بوو. لەو ماوەیەشدا تاقمی زەمینی خەریکی لەنگەرکردنەوە لە فڕۆکەکان و بۆمبرێژکردنیان و پڕ بەنزینکردن و ئامادەکردنی فڕۆکەکان بوون .لەچارەکی داهاتوشدا خەریکی لابردنی لەنگەرو تانکیەکانی بەنزین و ئۆتۆمبێلە موشەکهەڵگرەکان بوون.

هەروەها سەبارەت بەستافی ئەفسەرە پلەبەرزە فەرماندەکانیش لەقاهیرە نامیلکەیەکی پڕ وردەکاری لەبەردەستدا هەبوو. بۆهەریەک لەستافی ئەفسەرە پلە بەرزەکان نیو سعاتی دەویست تا لەماڵی خۆی لە یەکێک لەشارە نزیکەکان، بگاتە بارەگای سەرەکی لە قاهیرە. ئەفسەرەکانی تیمی پلانە ستراتیژییەکان تا 08:15 بۆیان نەدەکرا لەبارەگاکانیاندا بچنە پشت مێزەکانیان. ئاسایی ئەوان دە خولەکێکی دیکەیان دەویست تا خۆیان ساز بدەن و بەدەم قاوەخواردنەوە هەندێ قسەی دیکە لەگەڵ هاوڕێکانیان بکەن. هەروەها ئەوەش زانرابوو کە ئەفسەرەکان پێش 08:30 هێشتا ئامادەنەدەبوون بۆ تاوتوێکردنی ئەو پەیامانەی کە شەوی پێشتر لە بارەگا جۆربەجۆرەکانی دیکەی هێزی ئاسمانییەوە هاتبوون.

مایر ئامیت حیسابی ئەوەی لەگەڵ فەرماندەکانی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل کردبوو کە دەبێ فڕۆکەکانیان لەنێوان 08:00و 08:30دا لەسەر ئامانجەکانیانەوە بن. لەو 30 خولەکەدا دەتوانن بارەگای هێزی ئاسمانی دوژمن هەڵتەکێنن، چونکە ئامیت دەیزانی لەو ماوەیەدا هێشتا پیاوە فەرمانبەدەستەکانی میسری لەبارەگاکەیاندا ئامادەنەبوون، کەواتە فەرمانێک نییە بۆ بەرگری.

له 5ی مای 1967دا هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی بەدەقاودەقی لە08:15دا هێرشی چرووپڕی خۆی دەستپێکرد. ئەوان بەنزمی بەسەر سیناوە فڕین و بەسەر هەمو مۆڵگەیەکی هێزی ئاسمانی میسردا بۆمبیان بەردایەوە، ئاگریشیان دە ئەپارتمانەکانیان بەردا. دەرەنجامەکە کوشندە بوو. لەماوەی یەکدو خولەکدا ئاسمان لەسۆنگەی گڕی ئاگری تانکەکانی بەنزین و بۆمبی فڕۆکەکان و تەقەمەنی سورو ڕەش هەڵگەڕا .

مایر ئامیت لەبارەگای خۆی لە تەلئەبیب کە پشت پەنجەرەی نوسینگەکەی روەو باشور دەیڕوانی، دەیزانی کەوا لێکدەرەوەکانی مۆساد چۆن ئەنجامی ئەو جەنگە هەڵدەسەنگێنن. ئەمە بڵێسەیەکی دیاری لێوەشاوەییە ڕیزپەڕیەکەی ئامیت بوو، کە ڕێزێکی زۆری بەدوادا هات لەچاو ئەو ژمارە کەمەی ماوەی ژیانی لە ناو مۆساد دا.

هەر لەوکاتەی مایر ئامیت بەڕێوبەرایەتیی مۆسادی گرتە دەست، بەرەنگاری ئەو هەڵانە بووەوە کە مۆساد ببێتە کۆپیەکیCIA یاخودKGB . ئەوان دامودەزگایەک بوون کە هەزاران کەسیان لە لێکدەرەوەکان، زاناکان، پسپۆڕو پلاندانەرە ستراتیژییەکان لەخۆگرتبوو، هەمویان پسپۆڕبوون لەکارەکانیان و پیاوی تایبەتیشیان لەبەردەستدابوون. عێراقییەکان و ئێرانییەکان بە مەزندە دە هەزار پیاویان بۆ ئۆپەراسیۆنەکانیان هەبوو، تەنانەتDGI ی کوبیش هەزار سیخوڕی خستبووە کار.

مایر ئامیت سەرسەختانە پێی لەسەر ژمارەی هەرە زۆری جێگیری پیاوانی مۆساد دادەگرت کە دەوروبەری 1200کەسێک دەبوون، بەڵام هەر پیاوێکی مۆساد دەبوایە توانایەکی زۆری هەبوایە و خۆی بۆ زۆر لە کاروبارەکان تەرخان کردبا و تەنها کارێکی دیارکراوی نەکردبا. دەبوایە گەر پێویست بوایە زانایەکی مۆساد لە مەیداندا ئیشبکا، کاستایەک دەبوایە ئامادەبوایە کەسی دیکە پەیدا بکا لە ژێر پسپۆڕێتی خۆیدا کاربکا.

بۆ هەریەکێک لەوانە دەیەویست memoene یێک بێ بۆ خۆی. پەیڤەکەش عیبریە واتای 'یەکەمیان لەنێو یەکسانەکان' دەگەیەنێ. لەوکاتدا ئەو بێ مۆڵەت

سەردانی سەرەک وەزیرانی دەکرد، ساڵانەش دەبوایە بودجەی دەزگاکەی پێشکەش بە کابینەی وەزیرانی ئیسرائیل بکا لەگەڵ داوای پەسندکردنی .

ماوەیەکی باش پێش دەستپێکردنی شەڕی 1967ئامیت ئەوەی خستەڕو، کە مۆساد چەند باڵا دەستە لە چاندنی تۆی تۆقاندن لە ناو دوژمنەکانی ئیسرائیلدا، بەوەی لە ناو خۆیان سیخوڕ پەیدابکا و نهێنییەکانیان ئاشکرا بکا و کاریگەریانەش بیانگۆڕێ. لە ماوەیەکی کەمدا ناوبانگێکی ئەفسانەیی بۆ مۆساد پەیداکرد.

زۆر لەسەرکەوتنەکانی بۆ ڕێساکانی خستنەگەڕی کاستاکان دەگەڕایەوە، کاستا دەبوایە ئەو پیاوە بەتوانایە بێ کە سەرکەوتنی مۆسادی لەسەر بەندبوو. ئامیت بە دروستی ناخی پاڵنەری ئەو ژن و پیاوانەی دەزانی کە دەیانەویست ببنە کاستا، ئنجا دوای گوێلێگرتنیان و پێیدەگوتن کە دەکرێ ئەوان ببنە ئەندامی مۆساد و دەستی دەگوشین، ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو ئەوان دەتوانن لەسەر ڕێنماییەکانی مۆساد بڕۆن.

هەرچەندە لەوکاتەوە زۆر گۆڕان بەسەر مۆساددا هاتووە، بەڵام ئامیت لەبەیانییەکی ئازاری 1997دا دەیزانی کە ڕێساکانی هێنانەڕیزی پیاوانی مۆساد هێشتا هەر کاری پێدەکرێ.

'مۆساد هیچ کاستایەک ناخاتە گەڕ گەرپاڵنەرەکەی پاداشتکردن بێ. بۆ ئەو زایۆنیستانەی کە ڕەوشت پاڵنەریانە، ئەو کارە گۆڕەپانی ئەوان نییە. ئەو مەرجەی پێویستە هەبێ قوڵبوونەوە و هاوسەنگی بڕیاردانە و بەرچاوڕونی و بەرەوپیشەوە ڕوانینە. ئەوانەش ئەو هۆیە جۆربەجۆرانەن کە خەڵک والێدەکات لەگەڵ مۆساد کاربکەن. هەندێک کەس لەبەر کاری سەرچڵیانە دێنە ناو مۆساد، هەندێکی دیکە پێیان وایە لە ناو مۆساد ڕوانینی گەورەتر دەبێ لە داهاتودا گەورە دەبن. کەمێکیشیان بەتەمای ئەوە دێنە ڕیزی مۆساد، تاکو لە هێزی نهێنی مۆساد سودمەند ببن.

هەمیشە و هەموکاتێک و لەهەرشوێنێک پێویستە مشوری ئەوە بخۆی کە پیاوەکەت لە مەیداندا ئەوە بزانێ کە تۆ بێسنور بەردەوامی لەسەر

داکۆکیلێکردنی یان کە تۆ مشوری مالباتەکەی دەخۆی و مشوری منداڵەکانی وەک خۆی دەخۆی. لەسەروی هەموشیانەوە پێویستە تۆ ئەو بپارێزی، ئەگەر ژنەکەی پرسیاری لێکردی کە مێردەکەی یەکێکی دیکەی هەیە، دەبێ دڵنیابیکەیتەوە کە وانییە. گەر واش دەرچوو پێویستە لەدەمی تۆوە نەزانێ. گەر ژنەکە ویستی بە دوای مەسەلەکەدا بگەڕێ، پێویستە تۆ بەربەست نەخەیتە سەر ڕێگەی، ئەوەش بێ ئەوەی مێردەکەی پێبزانێ. تۆ نابێ ئاگاهی مێردەکە لەئیشەکەی بەولاوە بەشوێنێکی دیکەدا ببەی. ئەوە ئەرکێکی گەورەی باشی جاسوسانە، چونکە ئەو وا مشوری خەڵکی خۆی دەخوا وەک خانەوادەی خۆی. ئەو دەبێ وابکات کە بەردەوام بە ڕۆژ و شەو لە ڕاژەیان دابێ، گرنگ نییە چ کات ئەوان پێویستیان پێبێ. ئەوە وادەکا کە کاتسایەکە دڵسۆزت بێ و ئەوەت بۆ دەکا کە داخوازتە. بۆ زیاتر خستنەسەر دەبێ ئەوە بڵێم ئەوەی تۆ داخوازتە بەردەوام سەنگی قورسترە!.

هەر کاتسایەک سێ ساڵان بەچڕی مەشقدەدرێ و پەروەردەدەکرێ، تەنانەت لە کاتی پرسیارو وەڵامدا بە باری توندوتیژیی فیزیکیشدا تێدەپەڕێ. ئەو دەبێ بتوانێ چەکەکانی مۆساد، دەمانچەیBeretta و کالیبەری 22 بەکاربهێنی.

یەکەمین کاتسا کە لەدەرەوەی جیهانی عەرەبی دانرا، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، بەریتانیای گەورە، فەڕەنسا و ئاڵمان بوو. لە وڵاتە یەکگرتوەکاندا کاتسای جێگیر لە نیویۆڕک و واشنتۆن بوون. کاتساکانی نیویۆرک بۆ خۆخزاندنە نێو هەمو نێردە دیپلۆماتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵە ئەتنیە زۆرەکانی نیۆیۆرک بوون. کاتسای واشنتۆنیش هەمان ئەرکیان هەبوو، بەڵام دەبوایە بەردەوامیش چاودێری کۆشکی سپی بکەن.

کاتساکانی دیکەش لە شوێنە پڕ ئاژاوەکان بوون لەوکاتەی ئەرکەکانیان تەواو دەبوو، دەگەڕانەوە ماڵەوە.

مایر ئامیت بنەمای ڕێکخراوەیی مۆسادی دەوڵەمەندکرد بەوەی کە کارگوزاری زانیاری کۆکردنەوەی بۆ زیادکرد، کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی

ئۆپەراسیۆنەکانی دەرەوەی وڵات بوو، لەگەڵ زیادکردنی بەشی چالاکی سیاسی و بەشیLiaisons . ئەو بەشە کاری ڕاگرتنی پەیوەندی دۆستانە بوو لەگەڵ هاوتا دۆستەکانی لەپێشەوەCIA M16 دا. بەشی لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕانیش پێکهاتبوو لە 50 بەشۆکە کە بۆهەر وڵاتێکی عەرەبی بەشۆکەیەکی هەبوو، هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، کەنەدا، ئامریکای لاتین، شانشینی یەکگرتو، ئاوروپا و یەکێتیی شۆرەویش بەشۆکەی خۆیان هەبوو. ئەو بنەمایە بەپێی ڕۆژگار بەرفراوانتر بوو تاکو بەشۆکەکان چین، باشوری ئافریکا و ڤاتیکانیش لەخۆبگرن. ئەوە هەمو ئەو گۆڕانانەبوون بەسەر قەوارەی مۆساد دا هاتن کە وەک ڕێکخراوێکی قەوارە سادە مایەوە.

هیچ ڕۆژ بەبێ هاتنی کۆمەڵە ڕاپۆرتێکی زۆر لە هۆبە جۆربەجۆرەکانی مۆساد لە هەندەراندا تێنەدەپەڕی. ئەو ڕاپۆرتانە لە نێو ژورەکانی ئەپارتمانە هەراسانکەرە بۆرەکەی سەر شەقامی King Saul Boulevard دەهاتن و دەچوون. لەوەشدا ئامیت قسەی خۆی هەبوو" گەر یەکێک لە تەماشای ئەو ڕاپۆرتانە نیگای لەوی دیکە خێراتر بوایە، ئەوا خراپ نەبوو، چونکە بێگومان بەمە دوژمنمان زەبونتر دەبوو".

کاتساکان بە ڕاستی دەمار سارد و چالاک و تەڕدەست بوون، ئەوان ئامادەبوون ئاگر بە ئاگر وەڵام بدەنەوە. لێرەولەوێ هەندێ هەواڵ دزەیدەکرد، کاردانەوەی ئەوەی هەبوو تۆوی دودڵی و بێبڕوایی دەزگا هەواڵگرییەکانی عەرەبانی لەقتردەکرد. مۆساد دژە پڕۆپاگندەی ڕەشی بڵاودەکردەوە و خەڵکی دیکەی دەهێنایە ڕیز، هەموشی لەسەر بنەما فەلسەفییەکەی مایر ئامیت کە بەکردەوە ' پەرتکە و زاڵ بە' بسەلمێنن. لە سەر ئەو چالاکیانە ستافی نوێی پیشەیی (پرۆفیشیۆناڵ)یان دانان، ئەوان وەک تارمایی بە شەو دەخشان و لە دوای خۆشیان شوێنپێی مەرگ و تێکدانیان بەجێدەهێشت. هیچ کەسیان لە بەردەست قوتارنەدەبوو.

هەرکاتێک لە کارەکانیان تەواودەبوون دەگەڕانەوە تەلئەبیب، لەوێ مایر ئامیت لە نوسینگەی خۆی کە دەیڕوانیە سەر ئیسرائیلی کۆن

چاوەڕێیدەکردن، تاکو ڕاپۆرتی دورو درێژی خۆیان بدەن. هەر لە نوسینگەی خۆیەوە، ئامیت سەرپەرشتی دو جاسوسی دەکرد، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ. بۆ بەبیرهێنانەوەی ئەو کارە تایبەتییە ناوازەی ئەوان، سەرەتا ئامیت دودڵبوو لەگێڕانەوەی، دواتر بەخەندەیەکی پاکانەدارەوە بۆ بوێری خۆی ئنجا دەستی بەگێڕانەوە کرد.

ئێلی کۆهین Eli Cohen لە 16دیسێمبەری 1924دا لە ئەسکەندەرییەی میسر لەدایکبووە. دایک و باوکی دینداری ئەرسەدۆکسی جولەکە بوون، ئەویش لەو ژینگەیەدا پەروەردە بووە .

لە دیسێمبەری 1956 ئێلی لەو جووانە بوو، کە بەهۆی تەنگژەی سوێس لە میسر دەرکرا. ئەو گەیشتە حەیفا و لە وڵاتی نوێێ باپیرانی هەستی بەنامۆیی دەکرد. لە 1957 خزێنرایە نێو ڕاژەی دژە جاسوسێتی ئیسرائیل، بەڵام کارەکەی وەک لێکدەرەوە بە دڵ نەبوو. ئەو ویستی لە مۆساد وازبێنی، بەڵام سەرەتا ویستەکەی ڕەتکرایەوە. ئامیت دەڵێ ڕەتکردنەوەی ئێلی وەک سوکایەتییەک هاتە پێشچاو. لە سەربازی وازیهێنا و ژنێکی عێراقیشیی بە ناوی نادیا مارەکرد.

دو ساڵی درێژ ئێلی کۆهین وەک یاریدەدەری ئارشیف لە نوسینگەیەکی بیمە لە تەلئەبیب بێ هیچ سەرنج نانەوە بەسەریبرد. بێ ئەوەی ئەو ئاگای لێبێ پاشخانی ئەو سەریهەڵدایەوە لەو کاتەی مایر ئامیت سەرنجی کۆمەڵێ دۆسیەی بەربژارە ڕەتکراوەکانی دەدا. ئامیت لەو کات بە دوای پیاوێک بۆ ئەرکێکی تایبەتمەند وناوازە بە تایبەتمەندییەکی دیارکراوەوە دەگەڕا. لەو کاتەی ئامیت لە دۆسیە ئەکتیڤەکان کەسی وا لەباری دەستنەکەوت، پەنای بردە بەر دۆسیە ڕەتکراوەکان. پێدەچوو کۆهین تاکە تواناداری ئەوکارە بێ. ئامیت بڕیاریدا کۆهین بخەنە ژێر چاودێرییەوە. ڕاپۆرتەکانی چاودێران هەواڵیان لەسەر وردەکاری ژیانی کۆهین و هاوسەرەکەی و مالباتە تازەکەی دا. لە ڕاپۆرەتاکاندا دەرکەوت کە ئەو زۆر ئیشدەکا، بە خێراییش لە شتان

دەگا و بەکارامەییش دەتوانێ لە ژێر گوشاردا کاربکا. دوای ماوەیەک پێیڕاگەیەنرا کە ئەو شیاوە و دەتوانێ لەگەڵ مۆسا کاربکا.

ئێلی کۆهین دەستی بە خولێکی چڕو پڕی شەش مانگی لە مەشقەفێرگەی مۆساددا کرد. پسپۆڕە تێکدەرەکان فێریانکرد کە چۆن لە شتی زۆر سادە ماددەی تەقێنەرەوە و بۆمبی تەوقیتکراو دروستبکا. ئەو زۆر بەجوانی فێری تەکنیکی شەڕی بێچەک بوو، نیشانشکێنێک و خانوبڕێکی ناقۆڵای لێدەرچوو. ئەو نهێنی کۆد دروستکردن و کۆدشکاندن فێربوو، هەروەها فێری ئەوەش بوو چۆن لەگەڵ پەیامی ڕادیۆدا کاربکات و پەیام بە مەرەکەبی بزر بنێری و ئاشکراش نەبێ. مەشقپێدەرانی بە تواناکانی کۆهین سەرسامببوون. دیاردەی لەبەرکردن و هۆشیاری دەگەڕایەوە سالآنی لاوێتی کە دەقە درێژەکانی تەوراتی لەبەرکردبوون. لە دوا ڕاپۆرتدا هاتبوو ئەو هەمو ئەو تایبەتمەندی و توانایانەی تێیدا هەن ، کە بۆ کاتسا پێویستن. کەچی هێشتا ئامیت هەر دڵنیا نەبوو.

'ئەز سەدان جار لەخۆم دەپرسم، ئایا ئێلی ئەوەی لە باردایە ئەو کارەی کە پێیدەسپێرم بە ئەنجامی بگەیەنێ؟ بێگومان من وای نیشاندەدەم کە بەردەوام بڕاوم پێی هەیە. من دەمەوێ ئەو بۆ ساتێکیش بیر لەوە نەکاتەوە کە ئەو کارەی بەو سپێردراوە ببێتە تەڵە و سەری تێدا بچێ. هەرچەندە پیاوە هەرە کارامەکانی مۆساد هەموشتێکیان کە دەزانی فێری کۆهینیان کرد. لەدوایدا بڕیارمدا ئەو کارەی پێبکەم'.

چەند هەفتەیەکی خایاند تا مایر ئامیت ناوی کەسایەتییەکی نوێی بۆ کۆهین دۆزیەوە و ئیشی پێبکا. بەیەکەوە لەگەڵ ستافەکەی لێکۆڵینەوەیەکی وردیان کرد و کۆمەڵێک وێنەی بۆینس ئایرس و هەڵگێڕو وەرگێڕ کرد، ئێلی کۆهین خۆی وا خستەپێش کە بەتەواوی بڕوای بە پاشخان و ناسنامە نوێیەکەی لە ژێر ناوی کامل ئەمین تابەس Kamil –Amin taabes هەیە. بەڕێوبەری گشتیی مۆساد بە خۆی شاهید بوو لەسەر ئەوەی کە کۆهین چەند بەخێرایی ڕۆڵە نوێیەکەی وەرگرت.

'بە چەند جارێکی کورت کۆهین پۆرترێتی پیاوێکی بازرگانی هێنان و هاوردنی سوریایی لەخۆدا جێکردەوە. ئەو هەمو شتێکی پەیوەندیداری بە ئیشە نوێیەکەی وەک نامەی ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرەکان، گرێبەستەکان، مۆڵەتنامەی هێنان و بردن و زامننامەی بانکی لە مێشکی خۆیدا چاپکرد. پیاوەکە وەک ئەسفەنجێک وابوو هەموو شتێک هەڵبگرێ، بەڵام سەرباری ئەوەش کامیلیۆنێک بوو بۆ خۆی. لە پێش چاوی من کۆهین بە کامل تابەس گۆڕابوو، ئەو پیاوە سورییەی کە هەرگیز لەهیوای گەڕانەوەی بۆ دیمەشق بێ ئومێد نەببوو. لەگەڵ ڕۆژگاردا کۆهێن زیاتر بڕوا و متمانەی بەخۆ پەیداکرد و بە لەز بوو تاکو ڕۆڵەکەی بە باشترین شێوە ببینێ . ئەوە وەک کامپیۆنێکی ماراسۆن دەهاتە پێش چاو کە ڕاهێنرابوو، هەر لەسەرەتای هێڵی دەسپێکردندا بردنەوەی مسۆگەر بێ. بەڵام ماراسۆنەکەی ئەو دەبێ چەندان ساڵ بخایەنێ. ئێمە ئەوەی لەسەرمان بوو کردمان تاکو وای لێبکەین ڕۆڵی نوێ و ژیانی نوێ بەباشترین شێوە دەربازبکا. ئەوی دیکەش دەمایەوە سەر خۆی. ئەوەشیان لای هەموان زانراو بوو، بۆیە پێویست بەماڵئاواییەکی بەرفراوان نەدەکرا، سا هەر واشمانکرد. ئەو ئاساییانە و بێهەرا وەک جاسوسەکانی من ئیسرائیلی بەجێهێشت'.

با یەکجار بگەڕێینەوە پایتەختی سوریا، دەبینین کۆهین خێرا توانیویەتی شوێنی خۆی لە جیهانی بزنسمانەکان بکاتەوە و کۆمەڵێک کەسی پایەبەرز لە دەورەی خۆ کۆبکاتەوە. یەکێک لە برادەرە نوێکانی مازی زاهیرەدین بوو، کە پسمامی سەرۆکی سوریا بوو.

زاهیرەدین کەسێک بوو خۆی گەورە نیشاندەدا . پیاوێک بوو، دەیەویست وادەربخا کە سوریا هەرگیز نادۆڕێ. کۆهین زۆر باش سودی لە کارامەیی خۆی دەبینی. زۆری نەبرد ئەو مێواندارێ لە بەرەکانی پێشەوەی جۆلاندا بۆ کرا. لەوێ هەمو ئەو سەنگەرە قایمانەی هاوردەی سۆڤیەتی بینین، کە تۆپخانەی قورسیان تێدا حەشاردرابوون. ڕێبەرەکەی ڕێگای پێدا تەنانەت وێنەش لەوێ بگرێ. لەو کاتەی200 تانکی سۆڤییێتی جۆری T-54گەیشتنە

سوریا، لە ماوەی چەند سعاتێکدا کۆهین بە تەلئەبیبی ڕاگەیاند. تەنانەت ئەو دەستی گەیشتە دانەیەکی کۆپیکراوی نەخشەی ستراتیژی سوری بۆ باکوری ئیسرائیل کە چۆن پەلاماری بدەن و لە بەشەکانی دیکە دایببڕن. ئەو جۆرە زانیاریانە نرخیان تەواو نەدەبوو.

لەو کاتەی کە کۆهین ئەو زانیاریانەی دەناردنەوە تەلئەبیب، ئامیت پێیوابوو یەک پیاوی وا تیپێکی سەربازی دەهێنێ، بەڵام کۆهین دەستی بە هەندێ لاساری کرد. ئەو هەمیشە هەواداریکی سەرسەختی تۆپی پێ بوو. ڕۆژێک تیپێکی تۆپی پێی میوان لە ئیسرائیل لە تیپی خانەخوێی بردەوە، ئەوسا کۆهین هەرچەندە سەرپێچیکاریش بوو، نەدەبوا پەیامە ڕادیۆ نێردراوەکانی بۆ ئەو کارانە و کاری تایبەتی دیکەش بەکاربێنێ، بەڵام ئەو هەر کردی ڕۆژێک نوسی ' ڕۆژێک دادێ فێربین و لە گۆڕەپانی یاریش ببەینەوە '.

بێجگە لەوە پەیامی دیکەشمان بۆ هات شفرەمان کردەوە کە تیایدا هاتبوو' هیوای جەژنێکی خۆش بۆ خێزانەکەم دەخوازم' هەروەها هاتبوو ' پیرۆزبایشم بۆ ساڵڕۆژی لەدایکبوونی کیژەکەم هەیە ' .

ئامیت لەناخەوە زۆر تورە بوو. ئەو ئەوەندەی دەزانی کە دەکەوێتە ژێر گوشاری پیاوەکانی تاکو بوێرن بڵێن کۆهینیش هیچ نییە بێجگە لە جاسوسێکی ئاسایی، کە بەدوای شتاندا دەگەڕێ، هەر وەک چۆن گەورەترین جاسوس ئاوهای بەسەر دێ. من هەوڵمدا خۆم بچمە ژێر پێستی کۆهین. ئایا ئەو کارەی لە بێ ئومێدییەوە بوو، یاخود شێوازێکی نمایشکردنی وشیاریی بوو؟ هەوڵمدا لە شێوازەکەی بگەم، ئەویش بە گەڕانەوە بۆ زانست و ئەو ژیانەی بۆ ئەوم نوسیوەتەوە. دەبوا هەزاران هۆکارم بەهەند هەڵگرتبان، بەڵام لە دواییدا تەنها یەکێکیان دەمایەوە، تۆبڵێی هێشتا کۆهین بەبەریەوە مابێ و ئەرکەکەی بگەیەنێتە سەر؟ مایر ئامیت دواتر گەیشتە دەرەنجامێک، کە کۆهین دەتوانێ تاسەر کارەکەکانی ئەنجامبدا.

ئێوارەیەکیان لە یانیوەری 1965دا ئێلی کۆهین لە ژوری نوستنەکەی لە دیمەشق چاوەڕێی کات و ساتی لەباری دەکرد بۆ ناردنی پەیامەکانی. ئەو تازە دەزگای ناردن و وەرگرتنی دانابوو کە هێزێکی دژە جاسوسانی سوری بەسەر ژورەکەیان دادا. کۆهین بەئامرازی کارەوە گیرا، ئەوەش بەیارمەتی نوێترین دەزگای پشکنینی دەزگا ڕادیۆییە وەرگرەکانەوە بوو، کە سوریا لە سۆڤیەتی بۆ هاتبوو.

لەکاتی لیکۆڵینەوەدا ئەو ناچارکرا پەیامێکی دیکە بۆ تەلئەبیب بنێرێ. سوریەکان هیچ تێبینی خێرایی و تەڕدەستی پەیامناردنی ئەویان نەکرد. ئێلی پەیامەکەی نارد. لە تەلئەبیب ئامیت هەواڵی دەستگیرکردنی کۆهینی پێگەیشت. دو ڕۆژ دواتر سوریەکان گرتنی جاسوسێکی جولەکەیان پشتڕاستکردەوە.

'ئەمە وەک ئەوە وابوو، تۆ ئەندامێکی خانەوادەکەت لەدەستبدەی. تۆ هەر ئەو پرسانە دەکەی کە پیاوێکت ئاوای بەسەر بێ و بگیرێ. ئایا دەکرا ئێمە ئەو ڕزگار بکەین؟ چۆن ئەو دۆزرایەوە؟ ئایا بەهۆی بێ باکی خۆی بوو، یان بەهۆێ یەکێکی دەوروبەری؟ ئایا ئەو خۆی خۆی ئاشکرا کردووە و ئێمە پێمان نەزانیوە؟ ئایا ئەو مەیلی وابوو بگیرێ و حەزی لە مردن بوو؟ ئەو جۆرە شتانەش ڕودەدەن. یان ئەوە بەهۆی هەڵەیەکی بەدبەختی بوو؟ تۆ هەر پرس دەکەی پرس دەکەی. تۆ هەرگیز بە بەرسڤێک ناگەی کە تەواو بڕوات پێی هەبێ .وەلێ پرسکردن شێوازێکە تاکو بەکاکڵی وەڵام بگەی.

سوریەکان بەهیچ شێوازێک نەیانتوانی کۆهین بڕوخێنن. هەرچەندە پێش ئەوەی بڕیاری مردنی بەسەردا بدەن، ئازار و ئەشکەنجەیەکی لە ڕادە بەدەریاندا.

مایر ئامیت نزیکەی هەمو کاتی خۆی بۆ هەوڵی ڕزگارکردنی کۆهین تەرخانکرد. لەو کاتەی نادیای هاوسەری کەمپینی ڕاگەیاندنی سەرتاسەری جیهانی بۆ ڕزگارکردنی مێردەکەی کرد. ئەو پەنای بۆ پاپای ڤاتیکان و شاژنی بەریتانیا برد و ئامیتیش بەدزییەوە بەچەند سەرۆک و سەرەک وەزیرانی گوت. ئامیت چووە ئاوروپا تاکو لەگەڵ هاوتا فەڕەنسی و

ئاڵمانییەکەی قسە لەوبارەیەوە بکا، بەڵام ئەوان نەیانتوانی هیچ شتێکی بۆ بکەن. ئەو بەشێوەیەکی نافەرمیش پەنای بردە بەر یەکێتیی سۆڤیەت، ئەو لە هەوڵەکانی بەردەوامبوو، تا 18ی مایسی 1965 کەمێک دوای دوی شەو، کاروانێک لە زیندانی ئەلمەزا El Maza لە دیمەشق هاتەدەر. لە یەکێک لە ئۆتۆمۆبێلەکان کۆهینی تێدابوو.

نەسیم ئاندابۆ Nissim Andabo رابی(قەشەی جولەکان) تەمەن 80ساڵەی سوریشی لەگەڵدا بوو. بەهۆی گیرانەکەی و ئەوەی بەسەریاندادێ رابییەکە دەگریا. ئێلی کۆهینیش دڵی پیرەمێردەکەی دەدایەوە. کاروانەکە گەیشتە گۆڕەپانی ئەلمەرجە Al Marga لە ناوەڕاستی دیمەشق. لەوێ کۆهین سروتی ڤیدۆی Vidoe دەخوێندەوە، کە درودێکی عبری بوو دەربارەی پیاوێک کە لەسەر ئان و ساتی مردن بێ ' خوای گەورە، لە هەمو گوناح و سەرپێچیەکانم خۆشبە' .

لە سعات 3:35 خولەکدا بەدەورەدراوی بە هەزاران سوریایی، لە بەر ڕوناکی زەقوزۆپی تەلەفزیۆن، کۆهین بەپەتی سێدارەوە بینرا.

لە تەل‌ئەبیب نادیای هاوسەری شاهید بوو بەسەر چۆنیەتی مردنی مێردەکەی، بۆیە هەوڵیدا خۆی بکوژێ، بەڵام زو ڕزگاریان کرد و بردیانە نەخۆشخانە.

بەو بۆنەیەوە ڕۆژی پاشتر ئامیت لە ژورەکەی خۆیدا قسەی کرد و بە ئازایەتی کۆهینی هەڵدا. دواتر بایدایەوە سەر کاروباری ئاساییانەی خۆی، لەنێویشیاندا ڕێبەرایەتیکردنی کەسی دوهەم و کاتسای دوهەم.

وۆلفگانگ لۆتز Wolgang Lotzجوێکی ئاڵمان بوو. هەر دوای دەسەڵات وەرگرتنی هیتلەر خۆی گەیاندە فەلەستین. لە 1963دا مایر ئامیت ئەوی لەناو کۆمەڵێ بەربژاردا بۆ کاری سیخوڕی لە میسر لێگرت. لەو کاتەی کە لۆتز هەمان بڕوای دینیی و مەشقی کۆهینی هەبوو، لێ ئامیت داودۆزانەتر بە دوای پۆرترێتێک دەگەڕا کە لۆتزی لەناودا بشارێتەوە. ئامیت پیشەی ئەسپ بەخێوکەری دایە لۆتز بەوەی لۆتز پەنابەرێکی جەنگی جیهانیی دوهەمە و لە

ئاڵمانی ڕۆژهەڵاتڕا هاتووە و لە ڕاژەی سەرکردایەتیی هێزی ئافریکادا بووە و ئێستاش گەڕاوەتەوە میسر تا دەست بەکاری خۆی بکاتەو. زۆری نەبرد لۆتز دۆستایەتی لەگەڵ گوڵبژێری قاهیرەدا پەیداکرد، ئەوانیش هەوادارانی ئەسپسواری لە دەورەی یەکێتیی کۆمەڵگای باڵا high society ڕێکخرابوون.

لۆتز زو توانی مەعمیلی باش بۆخۆی پەیدابکا، لە نێویاندا جێگری فەرماندەی کاروباری هەواڵگری سوپایی میسر و فەرماندەی یەکەی پاراستنی بێهودەی کەناڵی سوێس هەبوون. هەروەک کۆهین، لۆتزیش توانی برادەری میسری وا پەیدابکا، تا بەرەکانی پێشەوەی شەڕ ببینێ، وەک تۆڕی ڕۆکێتە ئاسمانییەکانی سینا و سەر سنوی میسر و ئیسڕائیل لە نەقەب.

لۆتز توانی لیستی تەواوی ئەو زانا نازیانەی کە لەمیسردا دەژیان بەدەستبێنێ کە بۆ باشترکردنی ڕۆکێت و سیستمی چەکیان، کاریان لەسەر چەکی میسری دەکرد. زۆری نەخایاند پیاوەکانی مۆساد توانیان ئەو زانایانە سیستماتیکیانە لەناو بەرن.

دوای ئەوەی دو ساڵ لەژێر ناوی خوازراودا لەمیسر کاری خۆی دەکرد، ئەویش ئاشکرابوو و گیرا. میسرییەکان لە سورییەکان تێگەیشتوتر بوون و لۆتزیان نەکوشت. دەیانزانی ئەو بەهای زۆرە و هەڵیانگرت تا شەڕێک لەگەڵ ئیسڕائیل پەیدادەبێ ئنجا بە ئەفسەرە دیلکراوەکانی بگۆڕنەوە، بەڵام لێرەش ئامیت زۆر مشوری بەردانی لۆتزی خوارد.

ئامیت نامەیەکی بۆ سەرۆکی ئەوسای میسر جەمال عەبدولناسر نوسی، داوایلێکرد کە لۆتزو خیزانەکەی بە چەند جەنگاوەرێکی دیلی میسری لە ئیسڕائیل بگۆڕێتەوە. ناسر ئەمەی ڕەتکردەوە. ئەوسا ئامیت دەستی بە گوشاری دەرونی بۆ سەر ناسر کرد.

' من بەدیلەکانم گوت، ئێوە لەبەر ئەوە بەرنابن، چونکە حکومەتەکەتان نایەوێت بەرببن، چونکە ئێمە ڕازین ئێوە لە بری دو کەسمان بەربدەین.

دیلەکانی لای ئێمە بۆیان هەبوو نامە بۆ ماڵەوەیان بنێرن. لەنامەکانیاندا بە درێژی ئەو باسەیان لەگەڵ ڕای خۆیان بەئاشکرا نوسیبوو'.

دوبارە ئامیت نامەی بۆ ناسر نوسیەوە. ئەو جارەیان تاکو تیایدا بەڵێنبدا کە دیلە میسرییەکان بەئاشکرا لەبەرچاوی خەڵک بەوپەڕی ڕێزەوە ئازادیاندەکا، بەمەرجێک ئەوانیش لۆتز و ژنەکەی بەبێدەنگی بێ ئەوەی قسەیەکیش بۆ ڕای گشتی لەسەر ئەوان بڵێن، بەربدەن، بەڵام هێشتا ناسر ڕەزامەندی نەنواند. ئەو جارەیان ئامیت دۆسیەکەی دایە دەست فەرماندەی ئاشتیپارێزی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئاشتی سینایان خستبوە ژێر چاودێرییەوە. ئەو ئەفسەرە پلە باڵایە بەرەو قاهیرە فڕی، لەوێ دڵنیایانکردەوە کە ' لە داهاتودا ڕۆژێک' لۆتز و خێزانەکەی بەردەدەن.

ئامیت لەو نامەیە شت لەخۆگرەوە گەیشت. مانگێک دواتر لۆتز و هاوسەرەکەی زۆر بە نهێنی لە قاهیرەوە بەرەو جنێڤ فڕین. یەک دوسعات پاشتر لەنوسینگەی خۆمدا دیتنمەوە'.

ئامیت وەک ئەوانی دیکە نەبوو، دەیزانی پیاوەکانی پێویستیان بە پشتگیرییەکی باش هەیە. ئەو جۆرە کارمەندێکی دیکەی ئافراند ئەویش سایانم-sayanim یارمەتیدەری خۆبەخشی جو- بوو. هەر سایانێک نمونەی پێشینە مێژوییەکەی گوێڕایەڵی جووەکانی هەندەران(دیاسپۆرا) بوو. بەدەر لە هەوادارێتی بۆ وڵاتی باب و باپیران هەر یەکێک لە سایانەکان دەیزانی کە دڵسۆزی بۆ ئیسرائیل دەگەڕێتەوە لایەنی کاراکتەریەکی ئەفسانەیی، ئەوەش دەبوایە دژی دوژمنەکانیان بپارێزن.

سایانەکان زۆر کەلێنیان پڕکردنەوە. سایانێکی گواستنەوە وەک بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی ئۆتۆمۆبیل بەکرێدان، مشوری ئەوەی دەخواست کە کاتساکان بە شوێنی پێویست بگوازرێنەوە بێگوێدانە بەڵگەنامەی فەرمی پێویست. سایانێکی دەلال مشوری ئاکنجیبوونیانی دەخوارد. سایانێکی بانکی هەوڵی پارەی لە دەرەوەی سعاتەکانی کار بۆدەدان. سایانێکی دکتۆر گەر پێویست بوایە یارمەتی پزیشکی دەدا بۆ نمونە دەرهێنانی گوللە و تیمارکردن بێ

ئەوەی دەسەڵات بە ڕەسمی بزانن .سایانەکان تەنها پارەی هاتوچۆیان وەردەگرتەوە.

بەیەکەوە کۆمەڵێک داتای جۆربەجۆری تەکنیکیان کۆدەکردەوە، هەروها زانیاری ڕاگەیەنراویشیان کۆدەکردەوە، بۆ نمونە: گۆتەیەکی نێو شایی، هەواڵێکی ڕادیۆیی یان ڕۆژنامەوانی، نیوە سەربردەیەک لەکاتی چێشت خواردندا، ئەوان هەموو ئەو ئاماژانەیان دەدانە کاتساکان. وایلێهاتبوو مۆساد بەبێ سایانەکان کارەکانی پێ ڕاییەکرێ.

ئەو کارە بەجێماوەی ئامیت نەک هەروەک خۆی مایەوە، بەڵکو پەرەی زیتری پێدرا و زۆر گەورەتر کرا. لە 1977دا تەنها لە شانشینی یەکگرتوی بەریتانیادا 4000 سایان و لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئامریکاشدا چوار ئەوەندەی بەریتانیا هەبوون. هەرچەندە ئامیت دەیویست بودجەکەی سنوردار بێ و ئاواشی بهێڵێتەوە، بەڵام مۆساد تەنها بۆ بەردەوامبوونی چالاکیەکانی لە دەرەوەی وڵات بەملیۆنان دۆلاری بۆ کرێی هاتوچۆی سایانەکان، کرێی خانوە ئارامەکانیان و کرێی لۆجستی و ئۆپەراسیۆنەکانیان خەرجدەکرد. لەو ماوەیەی کە ئەو (واتە ئامیت) سەرۆکیان بوو قسەیەکی ئەویان یاددەکردەوە. سیستمی نوسین و پێشکەشکردنی ڕاپۆرتەکان پێیدەگوترا ناکا' Naka تروسکایی ڕۆژ' دەربڕینێک بوو بۆ بەرزترین ئاگاداری. کیدۆن Kidon لای مۆساد ئەندامی کۆماندۆی مەرگ بوو، نێڤیۆتNeviot پسپۆڕی شوێنپێهەڵگر، یاهالۆمین Yahalomin یەکەی پەیوەندی نێوان کاتساکان بوو، سافایانیم Safayanimئەوکەسەی بۆ راوەدونانی ئەندامێکی PLO دادەنرا، بالدەر Balder تەتەر و سلیک Slick شوێنی شاردنەوەی بەڵگەنامەکان و تودسToeds یش ساختەکاری بوو.

کاتێک لە بەیانییەکی ئازاری1997دا مایر ئامیت بەرەو ماڵ دەبووەوە، هێشتا هزری لای ئەو گۆڕانگارییانە بوون، کە بەسەر مۆساد هاتوون. لەژێر گوشاری سیاسی بەتایبەتی هی سەرەک وەزیران بنیامین ناتانیاهو Benyamin Natanyahoمۆساد لەگەڵ هاوتایەکانی، دەزگا

هەواڵگرییەکان لە دەرەوەی وڵات، توشی دابڕانێکی کوشندە هاتبوو، ئەو پەیوەندییەی کە ئامیت بەخەمخۆرییەکی زۆر دروستیکردبوو، خەریک بوو لە دەستدەدرا. بەگوێرەی دروشمەکە تەنها شتێک گرنگ بوو بۆژیان 'یەکەم و دوەم و هەمیشە هەر ئیسرائیل'، بەڵام وەک ئامیت گوتی بەشە دەقێکی دیکە لە ئارادابوو ' کاتێک بەسەرت دابدەن کە تۆ دەستت لە کاروباری برادەرێک وەردەدەی' بە خەندەوە پێی لەسەر پەیڤی بەسەرداداان دادەگرت و ئنجا درێژەی پێدا.

نمونەیەک لەوە زیادبوونی خۆخزاندنی مۆساد بوو لە وڵاتەیەکگرتوەکانی ئامریکا، بەتایبەتیش لە کاروباری ئابوری و زانست و زانیاری لەسەر تەکنەلۆژیا. یەکەیەکی تایبەت لەژێر کۆدی 'عبری بۆ باڵا' لە کالیفۆرنیا و بۆستن لە بۆسە بوون بۆ دزینی نهێنیەکانی پیشەسازی کارەبا. لەسەر ئەوە CIAلە ڕاپۆرتێکیدا بۆ لیژنەی هەواڵگری سیناتدا – ئەنجومەنی پیران- نوسیبووی کە ئیسرائیل یەکێکە لە شەش دەوڵەتەکان کە بەقسەی حکومەتەکەیان پیاوەکانی هەواڵگرییان هەوڵی تێکدانی ئابوری وڵات دەدەن و زانیاری لەسەر نهێنییەکانی پیشەسازیمان کۆ دەکەنەوە.

بەڕێوبەری گشتیی ئاسایشپارێزی ناوەخۆی ئاڵمان Bundesamt fur Verfassungsschutz(BFA) لەلایەن سەرانی بەشەکانی خۆی ئاگادارکراوەتەوە کە مۆساد هێشتا یەکێکە لەدەزگا مەترسیدارەکان و بەپلەی یەکەم دێت، چونکە هەوڵیداوە نوێترین نهێنی کۆمپیوتەری وڵاتەکە بدزێ. نزیکەی هەمان ئاگادارینامەش لەلایەن هاوتای فەڕەنسی Direction generale de la Securite(DGS)ەوە، دوای ئەوەی پیاوەکانی مۆساد لە دەوروبەری مەڵبەندی ڕاقەکردنی وێنە سەتەلایتەکان لە کرێل Creil گیران، دەرچوو. ئیسرائیل لە مێژە هەوڵدەدا تواناکانی خۆی لە بواری وێنە سەتەلایتەکان لەئاست هێزە ئەتۆمیەکاندا ڕابگرێ. دژەجاسوسیەکانی بەریتانیاش M15 لەڕاپۆرتێکی بەرزکراوەیان بە درێژی بۆ تۆنی بلێری سەرەک وەزیرانی تازە هەڵبژێردراویان ڕونکردەوە کە مۆساد خەریکی

کۆکردنــەوەی نهێنییــە زانســتییەکان و داتــای ســەربازییە لــە شانشــینی یەکگرتووی بەریتانیادا .

ئاخر مایر ئامیت لە کاتی پێویستدا دژی ئەو جۆرە هەوڵانە نەبوو، بەڵام ئەو لەوە دەترسا کە هەنوکە ئەوکارانە زۆر بە مشورخواردنێکی ئاگاییانە ناکرێن و پلانەکانیش زۆر وردنین و زۆریشیان چاو لەسەر شوێنەوارەکانی نیە لە ئایندەیەکی درێژخایەندا.

هەرهــەمان نــارەزایش لەســەر شــێوازی دەروونناســەکانی LAP بــۆ جێبەجێکردنی کامپینەکەیان هەبوو. لەسەردەمی ئەودا کاروباری دەروونناسی کاتی شەڕ تۆڕێکی جیهانی بەربڵاوی هەبوو، پەیوەندی لەگەڵ میدیا هەبوو و بڕیارەکانیشی بە لێزانییەوە دەردەکردن. کارێکی تیرۆرستی لە شوێنێک لە ئاوروپا، دەبووە مایەی ئەوەی تەلەفۆن بۆ ئاژانسی دەنگوباس یان ڕۆژنامە بکرێ هەندێک زانیاری سەبارەت بەپاشخانی کارەکە بدرکێنرێ کە ئاژانسەکە یان ڕۆژنامەکە دەیقۆزێتەوە و بۆ بڵاوکردنەوە، بەم جۆرە LAP ببووە جۆرێک لە بناوانی هەواڵدانLAP. بەردەوام هەندێ زانیاری دروستدەکرد و دەیدایە بەشە ڕۆژنامەنوسی باڵوێزخانەکانی، تا ئەوانیش بە دەوری خۆیان لەکاتی قسەکردن و قاوەخواردنەوەدا بەسەر ڕۆژنامەوانانداندا پەخشی بکەن. بەمجۆرە ڕۆژنامەنوسەکان دەستیان بە نهێنییەکان ڕادەگەیشت کە هەندێ جار بە ناڕاستەوخۆ بۆ ناوزڕاندنی کەسانیش بەکاردەهات.

هەرچەندە ئەو تاکتیکە ڕەشەی پڕوپاگەندە لە ڕاستیدا گۆڕانی زۆری بەســەردا نــەهاتووە، بــەڵام جیاوازییــەکی گرنــگ لێــرەدا هەیــە ئــەویش دەستیشانکردنی مەبەست و قوربانیەکەیە. مایر ئامیت سەرنجی ئەوەی دەدا کە زۆر جاران ئەو جۆرە داوایانە بەهۆی سیاسیەوە بوونە، چونکە جاری واهــەبووە نەیانویســتووە تیشــک بخرێتــە ســەر مــانۆڕە سیاســیەکانیان لــە ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاســت. یــاخود بــەو هەوڵــەیان کەمتربوونــەوەی ڕومــەتی ئیسرائیل بەرزبکەنەوە بەتایبەتیش لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا.

کاتێک گەشتی فڕینی ژمارە Trans World airlines 800 لە 17تەموزی 1996 لە کەناری باشوری ڕۆژهەڵاتی ئایسلاند کەوتە خوارەوە و هەر 230 سەرنشینەکانی گیانیان لەدەستدا، LAP بانگەشەی ئەوەی لەمیدیاکاندا بڵاوکردەوە کە ئەوە دەستی تێکدەرانەی دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسرائیل، ئێران و عێراقی لە پشت ئەو کارەساتەوەیە. ئەو بانگەشەیە زیاتر لە هەزار وتار و ڕاپۆرتی لە میدیاکاندا لەسەر بڵاو کرایەوە. نزیکەی ساڵێک دواتر دوای لێکۆڵینەوە کە خەرجییەکەی گەیشتە پێنج سەد هەزار دۆلارو دە هەزار سعاتی کار لەلایەن سەرۆکی تیمی FBI ەوە James K.Kallstrom ڕاگەیەنرا کە لە کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەکەدا کاری تیرۆرستی بەدور گیراوە. هەروەها هیچ شوێنەواری تاوانێک لەوبارەیەوە دەرنەکەوت. لە بازنەیەکی تەسکی هاوکارەکانی گوتبوی ' گەر شێوازێک هەبایە و ئەو بیژمۆتانەی تەلئەبیبی پێ تەمبێ کرابا لە جیاتی بە فیڕۆدانی ئەو هەمو کات و پارەیە، ئاوم لێ نەدەخواردەوە. ئێمە دەبوایە بە دوای هەمو هەواڵێکی ئەواندا بگەڕاباین کە لە میدیاکاندا بڵاویان دەکردنەوە'.

دوای بۆمب تەقینەوەکەی یاریە ئۆلۆمپییەکانی ئاتلەنتا، دیسان Lap کاری خۆی کردەوە. ئەوجارەیان ئەو گۆتەیان بڵاو کردەوە گوایە 'هەمو ئاماژەکانی' ئەو بۆمبە دەسکردە بۆ ئەوە دەچن کە زۆر وەستایانە دروستکرابێ و سەرچاوەکەشی بۆ دۆڵی بیقاعی لوبنانیەوە دەگەڕێتەوە. چیرۆکەکە وا خوێ و بۆ کرابوو کە LAP هۆنیبویەوە، سیماکانی والێکردبوو جۆرە ترسێک لە ئامریکا بڵاوبکاتەوە کە لەنێو ماڵیان کردەی تیرۆرستی ئەنجام دەدرێ. دواتر دەرکەوت تاکە گومانلێکراو کەسێکی سەرنج ڕانەکێشی دەستەی ئاسایشی یارییەکان بوو، کەسێک بوو، هیچ پەیوەندی بە تۆڕی تیرۆری نێو دەوڵەتییەوە نەبوو، کاتێکیش تۆمەتەکەی لەسەرلاچوو، ئیدی بەتەواوی چاوی سەرنج لەسەر تەواوی چیرۆکەکە وەلاکەوت.

بەڵام هێشتاش ئامیت لەوە دەگەیشت کە زۆر گرنگە جیهان لە کاری تیرۆرستی بەئاگا بهێنرێتەوە. وەلێ ئاگاهینامەکە " من هەمیشە لەگەڵ ئەوەدام، کە دەبێ بەردەوام بنەمای ڕاستی بۆ ئەو هۆشدارییە هەبێ". ئەو دانپێهێنانەی بەشانهەڵتەکانەوە بوو، هەروەک ئەوە وابوو بە پەتویەک ئاگرێکی پەنهان بکوژێنێتەوە. ئەو لەمێژ بوو، فێرببوو هەستەکانی لە درکاندنی کون‌وکەلەبەرەکان بێلایەن ڕابگرێ و بەتارمایی بیانهێڵێتەوە. هەروا لەخۆڕا نەبوو خاڵی بەهێزی ئەو بەدرێژایی ساڵان هەڵسوکەوتی ڕازپارێزیانە بوو.

بەگوێرەی ئەو، کێرڤی مۆساد بە کوشتنی ئیسحاق ڕابین لە نۆڤێمبەری 1995 لە کاتی خۆپیشاندانێکی ئاشتیانە لە تەل‌ئەبیبدا گەیشتە خاڵی هەرە نزم. بەکاتێکی کەم پێش کوژرانی ڕابین بە دەستی جووێکی توندڕەوی ئەرسەدۆکسی- بەقسەی ئامیت سیمای داڕوخان کۆمەڵگەی ئیسرائیلی داگرتبوو- بەڕێوبەری ئەوکاتی مۆساد شاباتی شاڤیت Shabatio Shavit ستافی ڕابینی لە ئەگەری هەوڵی لەناوبردنی ڕابین ئاگادار کردبووەوە. بەپێی کەسێکی نزیک لە ستافەکەوە، ئاگاهینامەکەیان بەهەند هەڵنەگرتبوو، چونکە هۆشداریەکە لە بەرامبەر دەستنیشانکردنی هێڵەکانی مەترسیە کوشندەکە زۆر تەماویی بووە.

لە ژێر سەروکاری مایر ئامیتدا هێشتا مۆساد ئەو دەسەڵاتەی پێنەدرابوو، کە لەناو ئیسرائیلیشدا کارەکانی خۆی بکا هەروەک چۆنCIA یش لە ناو ئامریکادا ئەو دەسەڵاتەی نەبوو. سەرباری ڕەخنەی زۆریش ئامیت پێیخۆشبوو بڵێ کە بەختی مۆساد هەر هەمان بەختی ئیسرائیل بوو. لە سەردەمی ئەودا کردەوەکانی مۆساد لە دنیادا سەدایان دایەوە. ئەو کارە پاڵەوان ئاسایانەی بە دڵسۆزی وێنا دەکرد و ئێستاش بوونەتە بەشێک لەدیرۆک. هێشتاش خەڵک لەسەر کارەکانی ئەو دەڕۆن- کەهەم دژوار و هەم قێزەونیشن- بەڵام دواتر لەوە دەپرسن ئاخۆ بەرپرسیاریەتەکە بدەنەوە کێ، بەرپرسیاریەتەکە نەوەک بۆ کەسی یەکەمی دەزگاکەیان، بەڵکو بۆ

هەندێ بیچمی سیاسی وپاشخانیان دەگێڕنەوە. ئەو ئەو زەحمەتیانەی دەربڕی ئەوە بوون کە بەردەوام ئەو خەیاڵپلاوییە هەبوو؛ دەگوترا دیموکراسی ڕاستەقینە لە ئیسرائیلدایە.

لە ڕۆخی جاددە خێراکەی نێوان هێرزەلیا و تەلئەبیب کۆمەڵە ئەپارتمانێک پڕ لە ئەنتێن دەبینی، ئەوە فیرگەی مەشقی مۆسادە. یەکێک لەشتە سەرەتاکان کە دیپلۆماتێک یان پۆلیسیکی باڵوێزخانەیەکی وڵاتێک لە تەلئەبیب فێردەبێ، ئایا ڕاستە ئەو کۆمەڵگا ئاڵۆزە ئەپارتمانە لماویانە دەبینرێنەوە. هەرکەسێکیش لەسەر ئەوە بە ئاشکرا شتێک بڵاو بکاتەوە توشی ڕاوەدونان و سزا دەبێ. لە ساڵی 1996دا لە نێو دەزگا هەواڵگریەکانی ئیسرائیلدا مشتومڕی گەرم پەیدا بوو، لەسەر ئەوەی چی بکەن دوای ئەوەی یەکێک لە ڕۆژنامەکان ناوی بەڕێوبەری گشتیی مۆسادی ئەوکاتی دانی یاتوم danny Yatom ئاشکرا کردووە. دەنگی وا هەبوو ئەو ڕۆژنامەنوسە چەقاوەسوە و دەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەکە بگرن، بەڵام لە دواییدا هیچ ڕوینەدا، چونکە مۆساد زانی کە بەو شێوەیە ناوی یاتوم ئیدی لە هەمولایەکی جیهان بڵاوبۆتەوە .

مایر ئامیت بە توندی دژی ئەو ئاشکرا کردنانە بوو. ' ئاشکراکردنی ناسنامەی بەڕێوبەرێکی لەکارکەوتوو زۆر مەترسییە. جاسوسیکردن کارێکی زۆر نهێنییە بە هیچ شێوەیەک خۆخەریککردن نییە بە خۆشی و ڕابواردن. بە بێگوێدان بەوەی ئەو کابرایە چی کردووە، لێ پێویستە تۆ بەردەوام لە دەستی دەستدرێژی دەرەوەی بپارێزی. لە ناوەوە دەکرێ تۆ ئەو بخەیتە بنباڵی خۆت، بەڵام لە دەرەوە تۆ ناتوانی ئەو کارەبکەی، بۆیە واباشترە ناوی بە نەناسراوی بمینێتەوە'.

لەسەردەمی ئەودا وەک بەڕێوبەری گشتی نازناوەکەی رام Ram بوو. ئەو پەیڤە سەدایەکی دڵنەواکارانەی تەوڕات بوو، بۆ ئەو لاوەی کە لە ژینگەیەکی توندی سەرەتاییدا پەروەردە ببوو، لەسەردەمێک کە عەرەبەکانی فەلەستین بە هەمو توانایانەوە بەرەنگاری دەسەڵاتی بەریتانی جولەکە ببوونەوە. ئەو هەر لەتەمەنی هەرزەکارییەوە جەستەی توندبوو. هەرچەندە ئەو

جەستەیەکی ناسکی هەبوو، بەڵام وای گەشە بەخۆدا کە ببێتە گەنجێکی تێکسمڕاو لەگەڵ باوەڕەکەی بگونجێ، بەوەی وڵاتەکەی Eretz Yisraelوڵاتی گەلی ئیسرائیله. ئەوە هیچی لەوە نەدەگۆڕی کە جیهان دەبوایە تا ساڵی 1947چاوەڕوانی کردبا، ئەوساڵەی نەتەوەیەکگرتوەکان دەنگی بۆ دابەشکردندا، هەربەناوی فەلەستینەوە ناودێربکرێ.

لە دایکبوونی نەتەوەی ئیسرائیل، شەڕێکی وای بەدوادا هات، خەریک بوو نەتەوە ساواکە بە هۆی لەشکرکێشی وڵاتانی عەرەب لەناوبچێ کە داوایاندەکرد خاکەکە بگەڕیننەوە ژێر ڕکێفی خۆیان. ئەو کات شەش هەزار جو لەناوچوون، بەڵام نازانرێ ژمارەی لەناوچووانی عەرەبەکان چەند بوون. ڕامانێک بۆسەر ئەو هەمو لاشانە، پێواژۆی پێگەیشتنی ئامیتی لە لاوێکەوە بۆ کەسێکی بالق گۆڕی. ئەو پرۆسەیە هاوکات بوو لەگەڵ هاتنی پاشماوە ڕزگاربووەکانی ئۆردوگا زۆرەملێکان، کە هێشتا مۆرە شینەکەی ئۆردوگاکانیان لەسەر باسکیان هەبوو. ' نیگایەک بۆسەر ئەوانە، ئەوەی بیر ئێمە دەخستەوە کە تا چ ئەندازەیەک دەکرێ مرۆڤ ڕاوبنرێ'. ئەو پەیڤانە لەسەر زمانی کەسێکی دیکە واتای بێزاری و بێ ئومێدیان دەگەیاند، بەڵام لای ئامیت واتای ژیرییان دەدا.

تۆماری ژیانی سەربازیی ئامیت بیۆگرافیایەک بوو، دەکرا تا لوتکە بچێ، لە جەنگی سەربەخۆخوازی 1948دا فەرماندەیی کەمپینێک بوو، دو ساڵ دواتر فەرماندەی بەتالیۆنێک بوو لەژێر سەرکردایەتی مۆشێ دایان Moshe Dayan، تەنها پێچ ساڵ دواتر سەرۆکی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان بوو کە بەرزترین پایەی نێو هێزی بەرگری ئیسرائیل بوو. ڕوداویک کۆتایی بە ژیانی سەربازی ئامیت هێنا، ئەویش پاراشوتێک لە ئاسمان بە تەواوی نەکرایەوە. حکومەتی ئیسرائیل لەسەر خەرجی خۆی ناردیە زانکۆی کۆلۆمبیا columbia ، لەوێ بڕوانامەی لە زانستی بەڕێوەبردندا هێنایەوە. کاتێکیش گەڕایەوە ئیسرائیل، بێ ئیش بوو.

مۆشێ دایان ئەوکەسە بوو کە ئامیتی بۆ سەرۆکایەتیی هەواڵگری سەربازیی ناوزەدکرد. هەرچەندە بۆ ئەو کارەی دژبەر و ناڕەزایی توند هەبوون، چونکە ئەو هیچ ئەزمونێکی ڕاستەوخۆی لەو کارەدا نەبوو، بەڵام لە دوایدا هەر دانرا. ' کارەکە باش ڕۆیشت، چونکە من فەرماندەیەکی سەربازیی سەر گۆرەپان بووم، دەمزانی زانیاری باش چەند بۆ سەربازێکی شەڕکەر گرنگە'. لە 25ی ئازاری 1963دا بەرپرسیاریێتی مۆسادی لە ئیسەر هارێل Isser Harel وەرگرت. ئەو لەوکاتەوە زۆرشتی کرد، ناوهێنانی دەسکەوتەکانی تۆماری خۆی دەوێ، ئەو ئەو پیاوە بوو کە ستراتیژیەکی نوێی بە ئاراستەی لە ناوبردنی دوژمنەکانی ئیسرائیلیی بۆ مۆساد دارِشت، ئەو پەیوندیەکی نهێنی لەگەڵKGB دا پەیداکرد، لەکاتێکدا لە یەکێتی شۆرەویدا بە ملیۆنان جو دەچەوسێندرانەوە، ناوەڕۆکێکی نوێی دایە ڕۆڵی ژن و چۆنیەتی گونجاندنی جۆشدانی سێکسیی بۆکاری زانیاریدەرهێنان، ئەو ڕێگایدا خۆیان بخزێننە نێو ماڵی شا حوسێن، پێش ئەوەی میرێکی هاشمی لەلایەن CIA یەوە وەک جاسوسێک لە دنیای عەرەب بخرێتە کار.

ئەو تەکنیکانەی ئەو بۆ چەسپاندنی چالاکیەکانی بەکاری دەهێنان و هێنانیە نێو مۆسادەوە تا ئێستاش کاریان پێدەکرێ. هیچ کەسێکی دەرەوە نازانێ ئەو چۆن بەو شێوە نەشونمای کرد. لەمەڕ پرسێکم سەبارەت بەو مەسەلانە دەماری شەویلاگەکانی گرساندن و هەرهێندەی درکاند 'تۆ ڕازت هەن و تۆ ڕازەکانی منت هەن'.

کاتێک بە گوێرەی ئەو کاتی ئەوە هات کەسێکی نوێ جێگەی بگرێتەوە، بەبێ ڕێتوێلی بەهەراوهوریای خواحافیزیلێکردن، مۆسادی بەجێهێشت. ئەو لە کارمەندەکانی قەدەغەکرد و بەبیری هێنانەوە، گەر ڕۆژێک ئەوەیان بۆ دەرکەوت و ساخ بووەوە، کە جو بوونی خۆیان و کاریان لەگەڵ مۆساددا ناکۆکە، ئەمەش وایان لێدەکا لە نێوان مژاری ئێتیکی ناسنامەیان و خواستی نەتەوە هەڵبژێرن، لەو کاتەدا دەبێ بێ سێودو واز بهێنن. دوای ئەو قسانە تەوقەی لەگەڵ هەموان کرد و بەجێی هێشتن. هیچ بەڕێوبەرێکی گشتی

مۆساد لەوە دوانەدەکەوت کە بەدوای ئامیتدا بگەڕێ و لە نوسینگەکەیدا لە شەقامی Jabotinsky لە تەلئەبیب سەردانی نەکات و بەیەکەوە قاوە نەخۆنەوە. لەو بۆنانەدا دەرگای ئامیت بە تەواوی دادەخرا و تەلەفۆنەکانیش هەڵدەگیران.

'دایکم هەمیشە دەیگوت لە دەستدانی متمانە لە دەستدانی برادەرە' ئەوەی بەئینگلیزی و کۆنەلێزانیەک بۆدەردەبڕیم.

بێجگە لە خزمە نزیکەکانی، منداڵە کەمەکانی، نەوەکانی، ئامۆزاو خاڵۆزاکانی نوێنەرە زیندووەکانی هەمو بەرەکان، کەسانێکی کەم هەن کە بە ڕاستی ئامیت بناسن، ئەویش لەوە زیاتری ناوێت.

ئەو بەیانیەی ئازاری 1997 ئامیت لەپشتی ستێرنی ئۆتۆمۆبێلەکەی گەنج دیار بوو، کەمتر لە شەست ساڵی لەوەی هەفتا و پێنج ساڵی تەمەن بێ. ئەو جەستە تێکسمڕاوەی کە لە شاردا لە خزمەتدا بەسەری بردبوو، بەئاگاهاتبووەوە لە ژێر کراسە نیوقۆڵیەکەی ورگی دەبینرا، نیگای بایی ئەوەندە هەبوو کە ڕیزی بگیردرێ و سەرباری ئەوەش نیگای بەتەواوی تەماوی بوو. ئەو ڕێگایەکی دوسەرەی لەو جیهانە داڕشت کە بە داری گەورە داپۆشرابوو.

ئەو کاروانی زۆرکردبوون، ژمارەکەی لێونببوو. هەر سەردانێکی ڕاستیەکی کۆنی بەبیر دەهێنایەوە ' ئەوەی وەک جولەکەیەک بمێنێتەوە دەبێ تا دوا هەناسەی بەرگری بکا '.

هەمان باوەڕیش لەنێوچاوانی ئەو سەربازانە دەخوێندرایەوە، کە لەژێر دارەکانی مۆڵگای فێرگەی مەشقی سەرەتایی لە گلیۆت Gliotی باکوری تەلئەبیب چاوەڕێی چوونە ژورەوە بوون. ئەوان زۆر بەتاسەوە بوون، ڕەنگبێ هەندێکیش لوتبەرز. ئەوان لە ڕاژەی ئیلزامی هێزی بەرگری ئیسرائیلدا بوون، لەسەر ئەو باوەڕە بوون، ئەوان بەشدارن لە سوپایەک کە باشترین لەشکری دنیایە.

کەم لە سەربازان تێڕامانی ئامیتیان دەنرخاند. بۆ ئەوان پیاوێکی پیر بوو، هاتبوو سەرێکی مۆنومێنتی جەنگ بدا، کە لەشوێنی ئەوانەوە دور نەبوو. ئیسرائیل پڕیەتی لەو جۆرە مۆنومێنتانە. هەمویان بەیەکەوە ژمارەیان زیاتر لە 1500 مۆنومێنت دەبێ، مۆنومێنتەکانیش بۆ یادی پەرەشوتوانەکان، فرۆکەوانەکان، تانکسواران و سەربازانی هێزی پیادە دانرابوون. ئەو مۆنومێنتانە یادەوەری کوژراوەکانی زیاتر لە پێنج جەنگی تەقلیدی و نزیکەی پەنجا ساڵەی سزای سنوربەزاندن و ئۆپەراسیۆنەکانی جەنگاوەرانی پارتیزانەکان بوون. یادکردنەوەی ئەو پاڵەوانانە وەک ئەوەی جیهان نییە، بەڵکو بە شێوازی ڕۆمانییە کۆنەکانە کە ئێستا لە دنیا بەدیناکرێن، ئەو مۆنومێنتانە بەراورد دەکرێن لەگەڵ ئەو یادەوەریانە و مایر ئامیتیش پشکی بەهاداری لەو مۆنومینتانەدا هەیە.

لەنێو ئەپارتمانەکانی فێرگەی مەشقەکەدا دیواری کۆنکریتی گەورە بە بەردی گەورە ڕازاونەتەوە کە بەیەکەوە شێوەی مێشکی مرۆڤ پێکدەهێنن. ئامیت ئەو شێوەی هەڵبژاردووە، چونکە ' لە کاری زانیاری و هەواڵگریدا هەمو شتێک لەسەر زیرەکی دەسوڕێ'. ناشتوانی هەموی لە پەیکەریکی برۆنزیدا ڕەفتارێکی پاڵەوانانە نیشان بدەی.

مۆنۆمینتەکە لە 557 نەخشی سەر بەرد پێکهاتووە، ناوی ئەو ژن و پیاوانەی لەسەر بوو، کە لەکاتی جیبەجێکردنی کارەکانیان بۆ دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل گیانیان لەدەستداوە، لەوانە 71کەسیان لە ڕاژەی مۆساددا بوونە.

ئەوانەش لە کوچە و قوژبنەکانی دنیادا مردون، لە چیاکانی عێراق، لەچیاکانی ئێران، لە دارستانەکانی باشورو ناوەڕاستی ئامریکا، لە دارستانی ئافریکا، لە شەقامەکانی ئاوروپا. هەمویان و هەریەکێکیان بە شێوازی خۆی بەگوێرەی ئەو پەندەی مۆساد بژی و کاربکا' تۆ شەڕێک لە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندنەوە دەکەی'.

مایر ئامیت زۆری لەوانەی وەک خۆی دەناسین، ئەو ببووە هۆی مردنی هەندێکیان ئەوەش لە ڕێگەی ئەرک پێسپاردنیان، وەک خۆی دانیپێدا نا ' گەورەترین مەترسی ئەوەیە لەگەڵ خۆت بێنی لەوەی پەسندی بکەی، بەڵام بەداخەوە لەوکارەدا ناتوانی بەلاوەیبنێی. مردنی تاک دەبێ هەمیشە لەبەرامبەر ئاسایشی نەتەوەدا هەڵبسەنگێنی، لە ڕابردوشدا هەر ئاوا بووە'.

نەخشی سەر دیوارە بەردینەکە تەنها ناو و بەرواری مردنی لەسەرهەڵکەنرابوو. هیچ ئاماژەیەک بە بارودۆخ و چۆنیەتی مردنەکەی تێدا نەهاتبوو، لە بەردەم خەڵک لە قەنارەدان (ئەمەش بەختی هەر جاسوسێکی جولەکە بوو لەدنیای عەرەب گەر ئاشکرا بووبا)، لە پشتدانی چەقۆیەکی کوشندە، فرێدانێکی بێناو لەکۆلانێکدا، گوللەیەکی بێبەزەیی و ئازارێکی زۆر لەزینداندا. کەس ئەوە نازانێ، تەنانەت ئامیتیش زۆر جاران دەبوایە وەک مەتەڵ هەڵیبێنێ، ئەو بەردەوام ئەو جۆرە هزرە نارۆشنانەی بۆخۆی دانابوون.

مۆنومێنتی شێوە مێشک، تەنها بەشێک بوو لە مۆنومێنتەکانی کۆمەڵگە ئەپارتمانەکە. لە نێو دیوارەکانی کۆمەڵگەکەدا هۆڵی دۆسیەکان هەبوو. پڕ بوو لە بیۆگرافیای کەسایەتیی پیاوانی لەناوچوو. بۆ هەر یەکێکیان تۆماری ژیانی لاوێتی و سالانی ڕاژەکەی بەڵگەدار کرابوو،بەڵام دۆسیەکەی هیچی لەسەر دوا ئەرک و دوا نهێنی تێدا نەبوو. هەر پیاوێکی لەناوچوو ڕۆژی یادکردنەوی لە سیناگۆگیکی بچوک یاد دەکرایەوە.

لە پشتەوەی سیناگۆگێکە هۆڵێک هەبوو تیایدا ئەندامانی خانەوادەکەی لەناوچوو لە ڕۆژی یادکردنەوەی دەزگای هەواڵگری کۆدەبونەوە و بەیەکەوە یادی لەدەستچوویان دەکردەوە. هەندێک جاریش ئامیت قسەی بۆ دەکردن. لەوێش سەردانی مۆزەخانەی دەزگای هەواڵگریان دەکرد کە پڕ بوو لە کەرەستە و ئامرازەکانی کاری هەواڵگری وەک: ئامێری بچوکی ناردن لەناو پێڵاو، کامیرایەکی نێو چادان، مەرەکەبێکی نەبینرا و لەشوشەیەکی بۆندا، ئامێری تۆمارکردنێک کە بۆ گوێگرتن لەقسەی نێوان شا حوسێنی ئوردن و

جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر لەسەروبەندی شەڕی شەش ڕۆژەی 1967دا بەکاردەهات.

مایر ئامیت چیرۆکی پیاوەکانی کە ئەو جۆرە کەرەستانەیان بەکاردەهێنا هەڵدەگرت تاوەک سەربردەیەکی پاڵەوانێتی ئەفسانەییان نیشانبدا. ئەو بایەخی بە بەرگە مۆمیاکەی Ya`a Boqa دا کە لە کاتی پەڕینەوەی بۆ ئوردن پۆشیبووی، تا لە 1949 لە عەماندا گیرا و لەسێدارە درا. هەروەها ئامێری وەرگرتن و ناردنە کریستالیەکەی max Binnet و Moshe Marzuk کە بەسەرکەوتویی بۆ جاسوسکاری مۆسادیان لە میسر بەکارهێنابوو، پێش ئەوەی لە زیندانی قاهیرەدا بە دڕندەیی و لەسەرەخۆ بیانکوژن. مایر ئامیت گوتی " ئەوان گیدونی من بوون'. گیدون Gidoen لەتەوراتدا ئەو پاڵەوانە بوو لە ژێر فەرماندەیی ئەودا هێزێکی گەورەتری لەهی خۆی بەزاند، ئەوەش بەهۆی ئەو ڕاستییە بوو کە ژێیەکانی باشتر بوون.

لە دواییدا کاتی ئەوە هات بە یاوەری سەرپەرشتی مۆزەخانەکە بگەڕێتەوە نێو دیوارە بەردینەکانی مۆزەخانەکە. ئەوان لەبەردەم هەر نەخشێک رادەوەستان، سەریان بۆ ناوەکان دەلەقاند و دەڕۆیشتن. لە پڕێکەوە کۆتاییهات و هیچ ناوی کوژراوی دیکە نەمان سەری نەوازشیان بۆ دانەوێنن، تەنها شوێنی بەتاڵ بۆ ناوی ئایندە لەسەر ئەو دیوارە زەبەلاحەدا مابووەوە.

ئامیت هەندێک کەوتە سەر کەڵکەڵەی ئەندێشە و خەیاڵەوە. پاشان لەسەرەخۆ بەچرپە بەسەرپەرشتکاری مۆزەخانەکەی گوت" هەرشتێک ڕوبدا، پێویستە مشوری ئەوە بخورێ ئەو شوێنە هەر بمێنێ".

لە بادانەوەیەکی کتوپڕدا ئامیت لە قسەکەی خۆی زیادکرد و گوتی" حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریا، دیواری نوسینگەکەی بە تابلۆیەک ڕازاندۆتەوە کە وێنەیەکی گەورەی مەیدانی شەڕی 1187ی سەلاحەدینە کە لە خاچدارەکانی بردەوە. ئەو سەرکەوتنە وایکرد عەرەبەکان لەئۆرشەلیمدا سەربکەون.

بەگوێرەی ئامیت خۆشەویستی ئەسەد بۆ ئەو وێنەیە' واتای خۆی بۆ ئیسرائیل هەیە. ئەو لە چاوی سەلاحەدینەوە ئێمە دەبینێ، لە چاوی ئەودا ئێمە ئەو وڵاتەین کە لەدواییدا دەیگرێتەوە. زۆرن ئەوانەی ئەو ڕامانەیان هەیە .هەندێکیان خۆیان بە دۆستی ئێمەش دەزانن. بەتایبەتی لای ئەوان پێویستە ئێمە دان بەخۆماندا بگرین'.

ئەو بێدەنگ بوو، خواحافیزی لەسەرپەرشتیاری مۆزەخانەکە کرد و گەڕایەوە لای ئۆتۆمبێلەکەی وەک ئەوەی ئەو زۆری گوتبێ، ئەو ترسا لەوەی بایی ئەوەندەی گوتبێ ببێتە مایەی چرپە و گۆتەگۆت لە نێو دەزگاکانی هەواڵگری لە ئیسرائیلدا. چوارچێوەی قەیرانە نوێیە بێماناکەی نێوان مۆساد و CIA ئەگەری دەرەنجامی کارەساتباری بۆئیسرائیل لێدەبێتەوە.

یەکێک لەوانەی بەداوی شەرمەزاریەکەوەوە بوو، یەکێک لە بەتوانا و دڵڕەقەکان بووە، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ژێر سەرپەرشتی ئامیتدا کاریدەکرد. پیاوێک جێگەی لەنێو سەرنجدەرەکانی مێژو بۆخۆی کردۆتەوە ئەو پیاوە بوو کە Adolf Eichmann ی ڕفاند. ئەو پیاوە هەمیشە دەتوانێ یاری بەئاگر بکا.

# 4

## جاسوسێکی دەمامک ئاسنین

{رافی ئیتان کەڵەپیاوی مۆساد.. سەرکردەی نازیو بەرپرسێکی هۆلۆکۆست ئەدۆلف ئایخمان لە ئەرجەنتینەوە دەرفێنرێتە ئیسرائیل.. دادپەروەری دوای زیاتر لە 20 ساڵان.. دەستەی ئەیلولی ڕەش.. عەلی حەسەن سەلامە(سورە میر-الامیر الاحمر-).. دزینی زیاتر لە 2000 نەخشەی فڕۆکەی جەنگی میراجی فەڕەنسی..تەقاندنەوەی بارەگای هێزە چەکدارەکانی ئامریکا لە لوبنان.. سەرەتای چیرۆکە وروژێنەرەکەی پۆلاردی ئاژان..}

ئاکنجییە خواپێداوەکانی بەشە شاری Afeka لە کەرتی باکوری شاری تەلئەبیب، لەسەر ئەوە ڕاهاتبوون نیگاکانی ڕافائیل ئیتان، ئەو پیرە پیاوە تایبەتمەندە تێکسمڕاوە سنگ پانە، ببینن. ئەو کاتەی لە شەڕی سەربەخۆخوازی1948دا دەجەنگی، خەریک بوو سەری تیابچێ، لە دواییشدا گوێی ڕاستی بە تەواوی لە دەستدا. ئەو بەردەوام بەخۆی و بۆڕی و زنجیرە ژەنگرتووەکانی پایسکل دەگەڕایەوە ماڵەوە. هەرزانترین پانتۆڵی کاوبۆ و کراسی لەبەردەکرد، دەم و چاویشی بە چاویلکەیەکی لەحیمکردن داپۆشیبوو، دیمەنەکەی لەگەڵ کەلوپەلەکانی تابلۆیەکی سوریالی دەنەخشاند.

هەندێک لە دراوسێکانی وایاندەزانی ئەو شێوەژیانەی ئەو بۆ لە بیربردنەوی ڕابردووەکەیەتی. ئەوان دەیانزانی ئەو پیاوە بۆ وڵاتەکەی خەڵکی کوشتووە، بەڵام نەوەک کوشتنێکی ئاشکرا و ڕووبەڕو وەک لەبەرەدا دەکرێ، بەڵکو ژێربە ژێر بە نهێنی لە ڕێگای دەزگا هەواڵگرییە نهێنییەکان، بەتایبەتیش لەو دیدارە نهێنیانەی کاتی شەڕ، کە بە ئاشکرا لەگەڵ دوژمنەکانی سازنەدەکران. کەس نەیدەزانی ئێتان تەنانەت بە لەپە پانەکانی چەند کەسی کوشتون. ئەوەی بەردەوام بۆی ئاشکرا دەکردن ئەوەبوو کە دەیگوت" هەمیشە کاتێک من کەسێک دەکوژم دەبێ تەماشای چاوی بکەم. سپیلکەی

چاوی، ئەوسا هێوردەبمەوە و لە کارەکەم وریا دەبم، تەنها بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەرکەکەم چییە، ئنجا کارەکەم دەکەم، هەرئاواش بووە".

ئەو پەیڤانە لە بۆرە پیاوێکەوە دەرچوون کە لە ناخەوەی هەڵدەقوڵان، بەتایبەتیش کە پیاوە بەهێزەکان بیانەوێ پەسندنامەی کەسانی لەخۆ لاوازتریان پێ وەربگرن.

رافی ئیتان نزیکەی 25 ساڵان یاریدەدەری بەڕێوبەری گشتیی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد بوو. ئەو پیاوێکی کردەیی بوو، حەزی لە پشت مێز نەبوو تاکو ڕاپۆرتان بخوێنێتەوە و پیاوەکان بۆ کاری قورس بنێرێتە مەیدان. ئەو هەمو دەرفەتێکی دەقۆستەوە لە هەر قوژبنێکی دنیادا بوایە، تا خۆی کارەکان بکا. بە بەخۆڕاپەرمونێکی زۆرەوە بۆی دەچوو، بە پاڵپشتی ئەو فەلسەفەیەی کە خۆی لەو چەند وشانەی پف دەدان" گەر خۆت بەشێک نەبی لە چارەسەر کەواتە بەشێکی لە کێشەکە".

کەسێک نەبوو شان لەشانی بدا، کاتێک باس لە دلڕەقییەکی سارد و ڕێویبوون و تەڕدەست هاتنەسەرڕێ و دەستکردنەوە بکات، ئەو بەهرەی وای هەبوو، کە ڕێوی ئاسا بۆ ئامانجەکانی بچێ و نێچیری وا بەداوێوە بکا کە لە گیران نایێ، هەمو ئەو توانا و لێهاتوییەی دەبوایە لە چالاکییەکانی بۆ پەیداکردنی نازناوی نەمری بەکارهێنابا، ئەویش کردەی ڕفاندنی ئەدۆلف ئایخمان Adolf Eichman ی بیرۆکراتی نازی بوو، کە ببووە هێمای دڕندایەتی هۆلۆکۆستی هیتلەر.

ڕافی ئیتان بۆ دراوسێکانی لە شەقامی شای Shay پیاوێک بوو دەبوایە ڕێزی بگیرێت، ئەو ئەو کەسە بوو، کە بۆ خزمە لەدەستچووەکانیان تۆڵەی کردبووەوە، ئەوسەرکردە جەنگاوەرەی پێشو، هەمو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی ئاشکرا و ڕون نیشانی دنیای بدا، کە " هیچ زیندویەکی نازی لەسەر ئەم زەمینە نابێ بە ئارامی بژی". گەر سەردانی بکرابا کەس لە قسەکانی وەڕەز نەدەبوو، گوێیان تێرنەدەبوو لە باسی گێڕانەوەی چیرۆکەکەی سەبارەت چالاکیە ناوازە و بوێرەکانی. لە ژورە پڕ لە کەلوپەلەکەی هەردو

باڵی لەیەکدەدا و ملی هەندێک خواردەکردەوە خۆی دەگەڕاندەوە ئەو ساتەوەختانەی کە ئیسرائیل لە ژێر چەپەرۆکی چەوساندنەوەدا نوزەی دەهات. ئەوجار بەدەنگێکی نێر و زبر، بە دەنگێک کە هەمو ڕۆڵەکانی وازیکردبوون، تاکو برِوا بە برادەرە گوێگرەکانی بێنی کە چۆن خۆی ئامادەباش کردبوو، تاکو ئەدۆلف ئایخمان بەدیل بگرێ. وەلێ ،سەرەتا بە هەمو مشورخواردنێکەوە دیمەنەکانی دراماییترین کاری ڕفاندنی لە هەمو سەردەمێکدا وێنادەکرد.

زۆری نەبرد دوای جەنگی دوهەمی جیهان ئەوانەی لە داوی هۆلۆکۆست ڕزگاربببوون، بە دوای ڕاوی سۆسیال ناشیۆنالەکانی نازی، تاوانبارانی شەڕدا دەگەڕان. ئەوان ناویان لە خۆیان نابوو تۆڵەستێنەکان Nokmin. لە دادگای سزاداندا داوایان لەسەر تۆماردەکرن، لە هەر شوێنێک نازیەکیان چنگ کەوتبا، لەسێدارەیان دەدا. ڕافی ئیتان بە بیری نایەت کە لەو پێواژۆیەدا کەسێک بە هەڵە کوژرابێ. بە فەرمی لە ئیسرائیلدا زۆر بایەخ بە هەڵمەتی ڕاوەدونانی تاوانبارانی جەنگ نەدەدرا، ئیسرائیل کاری پێشنۆرەتری هەبوون، ئیسرائیل ئەوکات لە بارێکی ناسک و ئاڵۆزدابوو. وڵاتەکە لە هەر چوارلایەوە بە دوژمنە عەرەبەکانی ئابلۆقە درابوو. دەوڵەت تەواو لە ڕوی ئابوورییەوە پەرپوت ببوو. پارەی ئەوەندە نەبوو بۆ ڕاوەدونانی بەڵایەکی ڕابردووی تەرخان بکا.

لە 1957دا مۆساد پەیامێکی مسۆگەری بۆهات کە ئەدۆلف ئایخمان لە وڵاتی ئەرجەنتین بینراوە. ئەوکات ڕافی ئیتان لە نێو مۆساددا ئەستێرەی بەختی لە گەشانەوە دابوو، بەهۆی هەڵمەتە تیژەکانی بۆسەر دوژمنە عەرەبەکانی، ئەو دەستنیشانکرا و ئەرکی گرتنی ئەدۆلفی پێسپێردرا، تاکو بیهێنێتە ئیسرائیل و لەوێ دادگاییبکرێ.

سەبارەت بە چالاکی گرتنی ئەدۆلف حیساب لەسەر ئەوە دەکرا کە دەرەنجامەکەی چەندان لایەنی ئەرێنی لێدەکەوێتەوە. ئەو کارە بۆ گەلی ئیسرائیل وەک دادپەروەرییەکی خوایی وابوو. جارێکی دیکە کردەوە

دڕندانەکانی ئۆردوگا زۆرەملێکانی مەرگی بە بیر جیهاندا دەهێنایەوە، تاکو مشوری ئەوە بخورێ، کە هەرگیز هۆلۆکۆست دوبارە نەبێتەوە. بەو کارە پێگەی مۆساد لە نێو دەزگا هەواڵگرییە نهێنییەکانی وڵاتان زۆر دەچووە پێشەوە. هیچ دەزگایەکی نهێنیی هەواڵگر لەمەوپێش خۆی لەکردەیەکی وا بوێرانە نەداوە، بەڵام سەرباری ئەوەش ئەو چالاکیە سەرچڵییەکی زۆرگەورەی لەدواوە بوو، چونکە دەبێ بە هەزاران کیلۆمەتر لە دوری وڵات بێ و پاسپۆرت و ناسنامەی ساختە بەکاربهێنرێ. ئیتان بە تەواوی لەبەر توانا و کارامەیی و تەڕدەستی هەڵبژێردراوە تاکو ئەو کارە لە ناو جەرگەی دوژمندا ئەنجامبدا، چونکە ئەرجەنتین وەک بەندەرێکی ئارامبەخش بوو بۆ نازییەکان. ئەگەری ئەوەش لە گۆڕێدا هەبوو، کە تەواوی تیپەکەی مۆساد بگیرێن یان بکوژرێن.

کاتێ فەرمانی کردەوەکە تەواو بوو، ڕافی ئیتان تەزی. ئەو بە تەواوی ئەوەی هەڵسەنگاند کە ئەگەربێت و سەرنەکەوێ ئەوا سیاسەت و دیپلۆماسیی و کارنامەی خۆشی زەبری کوشندە دەخۆن. هەروەها ئەوەشی لەخۆ پرسی، کە ئەگەربێت و پۆلیسی ئەرجەنتین دەستی بەسەردا ڕابگا و ئەو و ئەدۆلف بەیەکەوە بگرن، " بێگومان بڕیارمداوە کە بەدەستەکانی خۆم پێشتر ئەدۆلف بگرم و تاملی نەشکێنم بەری نادەم. گەر منیشیان لەسەر ئەوکارە بردە بەردەم داداگا، دەڵێم گەورەم کارێکم کردووە بەگوێرەی بنەمای ئینجیل، چاو بە چاو و ددان بە ددان".

کۆمپانیای ئەلعالی ئیسرائیلی لەسەر خواستی مۆساد فڕۆکەیەکی تایبەتی بەناوی بریتانیان بۆ ئەو مەبەستە بەکرێگرت، تا گەشتە دورودرێژەکەی بۆ ئەرجەنتین بکا، پارەی گەشتەکەش لە بودجەی نهێنی مۆسادەوە درا. ڕافی ئیتان لەو بارەیەوە گوتی" ئێمە کەسێکمان ناردە بەریتانیا تا فڕۆکەیەکی لەو جۆرە بکڕێ. ئەو پارەکەی تەسلیم کردن و ئێمەش فڕۆکەکەمان هێنا. بە فەرمی گەشتەکە بۆ ئەرجەنتین بەو ناوە بوو کە نێردەیەکی ئیسرائیل بەشداری لە ساڵوەگەڕی سەد و پەنجا ساڵەی ڕزگاری وڵاتەکەدا دەکەن.

هیچ لەوکەسانەی کە نوێنەر بوون، نەیاندەزانی کە ئێمەش سەرنشینی ئەو فڕۆکەیەین، ئەوەش هەرلێگەڕێ کە ئێمە ژورێکی تایبەتمان لە سەر کلکی فڕۆکەکە بۆ گرتنی ئەدۆلف ئایخمان چێکردبوو" .لە یەکەم ڕۆژی نیسانی 1960دا ڕافی ئیتان و تیپەکەی گەیشتنە بۆینس ئایرس Buenos Aires . ئێمە چووینە یەکێ لەو حەوت خانوە ئارامانەی مۆساد کە لەوێ بەکرێی گرتبوون. یەکێکیان کۆدی Maoz بە عبری واتە قەلاّیان بۆ دانابوو. ئەو باڵەخانەیە وەک بنکەیەکی پەلاماردانمان بەکاردەهێنا. خانوێکی دی ناویان لێنا Tiraواتە کۆشک، ئەوەش بۆ ئەوەی کاتێ ئەدۆلفمان گرت، تا کاتی بردنەوەی بۆ ئیسرائیل شوێنی حەوانەوەی دەبێ. خانوەکانی دیکەش هەر پێویست بوون بۆ کاتی ناچاری گەربێت و ئەدۆلف لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە ترسی ڕاوەدونانی پۆلیس بگوێزینەوە. بۆ ئەو چالاکیەش 12 ئۆتۆمۆبێلیان ئامادەکردبوو.

کاتێک ئەوان بەیەکجار گەیشتن و دامەزران، ئیتان بە دەمار ساردییەوە دەستبەکاربوو. هیچ گومانێکیان لەسەرنەکەوتن نەما، ئەو دڵەڕاوکێیەی چاوەڕوانکردنیش، بووە دڵەڕاوکێ بەرەوپێشبردنی جێبەجێکردنی نەخشەکەیان. سێ ڕۆژان لەسەر یەک ئیتان و تیپەکەی بە دوای سایەی ئەدۆلفەوە بوون، بێئەوەی هیچ پەرێزێک بەدوای خۆیانەوە بەجێبێڵن. ئەدۆلفیش ئەو پیاوە بوو لەساڵەکانی شەڕدا بە مارسیدیسێکی گرانبەها هەمو شوێنێک دەگەڕا، کەچی ئێستا بە سواری پاس هاتوچۆدەکا. ئەو هەمو ڕۆژێک بەیانیان لە گۆشەی شەقامی گاربالدی Garibaldi Street کە دەکەوێتە گەڕەکێکی دەرەوەی شار لە خەوهەڵدەستا، هەروەک جاری جاران کە بەیانیان فەرمانی ڕەوانەکردنی هەزاران کەسی بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکانی مەرگ مۆردەکرد.

لەئێوارەی 10ی نیسانی 1960دا ئیتان و شۆفێرێک و دو کەسی دیکەی تیپەکەی ڕاسپاردن، ئەرکی بەرزەفتکردنی ئەدۆلف بگرنە ئەستۆ، کاتێ بە یەکجار دەیخەنە ناو ئۆتۆمبێلەکەیان. یەکێک لە دو کەسە دەستنیشانکراوەکە

مەشقی تایبەتی لەسەر بەرزەفتکردنی قوربانییەکانی دیتبوو، کاتێ لەسەر شەقام دەیانگرێ، ئیتانیش لە تەنیشت شوفێرەکە دادەنیشێ و لەسەرپێ و ئامادە دەبێ گەرهات و لەپشتەوە هەر یارمەتیەکیان بوێت.

ئەوان بڕیاریاندا کردەی رفاندنەکە ئێوارەی داهاتو ئەنجامبدەن. بە دەقاودەقی سعات 20:00ی ئێوارەی 11ی نیسان، ئەو ئۆتۆمۆبێلەی کە مۆساد بەکرێی گرتبوو بەرەو شەقامی گاریبالدی کەوتە ڕێ.

هیچ دڵەڕاوکێیان پێوە دیارنەبوو، ئەوان ئەو قۆناخەیان بڕیبوو. کەس هیچی نەگوت، ئاخر لەو کاتەدا هیچ نەدەگوترا. ڕافی ئیتان سەیری کاتژمێرەکەی دەستی کرد، سێ خولەک لە هەشت لایداوە. ئەوان شەقامەکەیان بەجێهێشت و گەڕانەوە. لە هەشت و چوار خولەک پاسێک ڕادەگرێ. یەک خولەک دواتر پاسێکی دیکە دێت و ڕایدەگرێ. دیتیان ئەدۆلف ئایخمان لە پاسەکە دابەزی. بە گوێرەی ئیتان" ئەدۆلف ماندو دیاربوو. ڕەنگبێ ئەو وای هاتبێتە پێش چاو دوای ئەو هەمو ڕۆژانە کە ئەندامانی گەلەکەی ڕەوانەی مەرگ دەکرد".

شەقامەکە تادەهات چۆڵتر دەبوو. لە پشتەوە من گوێم لەسیرەی دەرگا بوو کە پسپۆڕی بەرزەفتکەرمان ویستی دەرگای پشتەوە بکاتەوە. ئێمە لەسەر لێخوڕین بەردەوام بووین تا تەواو گەیشتینە سەر پشتی ئەو. ئەو هەنگاوەکانی هەڵێنا، وەک ئەوەی ویستبێتی زو بگاتەوە ماڵ و نان بخوا. من گوێم لێبوو پسپۆڕەکەمان بە قوڵی هەناسەیەکی خواردەوە وەک لە مەشقدابێ وابوو. ئەو تەکنیکەکانی ئەو کارەی واخستبونە ژێر ڕکێفی خۆیەوە کە تەنها 12 چرکەی بۆ کارەکەی دەویست. دەرگا بکرێتەوە، پشت ملی پیاوەکە بگرن، ڕایبکێشنە ژور، دەرگاکە دابخەنەوە، ئنجا یاڵڵا برۆ، گیرا و بابگەڕێینەوە.

ئۆتۆمبێلەکە بە تەنیشت ئەدۆلفدا دەڕۆیشت. نیوە ئاوڕێکی دایەوە، بەڵام سەرنجی نەدا کە پیاوێک لەپڕێکەوە لە ئۆتۆمۆبێلەکە دەرپەڕی. لەو کاتەدا پیاوەکە بە برغویەکی کراوەوە بوو، زۆر نەمابو بەزەویدا بکەوێ. ئیتان چاوی لێچووە تەوقی سەر و خۆی پێنەگیرا. ئەو لە بنی دنیادا هاتووە تا ئەو

پیاوە دەستگیربکا، کە دەستی لە ناردنی شەش ملیۆن جو بۆ فڕنەکانی غاز هەبووە، ئێستاش دەرفەتی گیرانی هەبێ و دەرفەتەکە بەهۆی برغوێکەوە لەدەست بدەن. ئەدۆلف ئایخمان هەنگاوەکانی خێراترکردن. ڕافیش خۆی بۆ لە ئوتۆمۆبێلەکە فڕێدایەخوارەوە.

"من لە ملەوە گرتم، وا بەهێزم گرت، دیم چاوەکانی لەیەکدەدا. هەندێکی دیکە توندترم بگوشیبا ملم دەشکاند. پسپۆڕەکەمان خۆی لە برغوەکە ڕزگار کرد و دەرگای پێشەوەی کردەوە، منیش ئەدۆلفم فڕێدایە کورسیەکی پشتەوە، پسپۆڕەکەشمان نیشتەسەری، نیوەی لەسەر ئایخمان بوو. هەمو ناخۆشیەکە پێنج چرکەی خایاند". لە کورسی پێشەوەش کاتێک ئەوهەناسەی دەدا ئیتان هەناسەی ئایخمانی بۆنکرد. پسپۆڕەکەش هەر لێگەڕی کە بە هەناسە هەڵمژینەکەی ئەو کەللەیی ببوو. ئەدۆلف ئایخمان هەندێ هێوربووەوە. دەرفەتی ئەوەی هەبوو بپرسێ بۆچی بەوشێوە کەڕامەتشکێنە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەن.

کەس وەڵامی نەدایەوە. بەکرێ گەیشتنە ئەوخانوە ئارامەی کە هەر پێنج کیلۆمەتر دور بوو. لە ژورەوە ئیتان ئاماژەی کرد کە ئەدۆلف دەبێ جلەکانی دابکەنێ. ئەو جەستەی ئەدۆلفی دەپێواو لەگەڵ ئەو دۆسیەی SS کە کەوتبوە دەستیان بەراوردی دەکردن. ئەو ئەوەی پێ سەیر نەبوو کە ئەدۆلف بە شێوەیەک لەشێوەکان نیشانەکوتانەکەی SSی لەسەر جەستەی خۆی لابردبوو. ئیدی هەمو پێوەرەکانی جەستەی لەگەڵ دۆسێکە ڕێک دەهاتنەوە، قەبارەی سەر، ڕوبەری نێوان بازند و ئانیشک، ئەژنۆ تا سەر قولەپێی . ئەدۆلفیان لە چوارپایەیەک توند بەستەوە. دواتر لێیگەڕان دە سعاتان لە بێدەنگییەکی کوشندەدا بەتەنها بمێنێتەوە. ڕافی ئیتان بەو کارەی دەیویست تەواو هەستی بێئومێدی لەلا دروستبکا. کەمێک دوای ڕۆژهەڵهاتن ئەدۆلف ورەی ڕوخابوو. من لێم پرسی ئاخۆ ناوت چییە؟ ئەو ناوێکی ئیسپانی پێگوتم. من پێم گوت نەخێر، ناوە ئاڵمانییەکەت بڵێ. ئەو ناوێکی دیکەی خوازراوی ئاڵمانی گوت تاکو لە ئاڵمان پێیەوە نەناسرێتەوە. دوبارە

پێم گوتەوە نەخێر، ناوە راستەقینەکەت بڵێ، ناوی SSت بڵێ؟. ئەوسا ئەو لەسەر تەختەبەندەکە هەڵسا، وەک ئەوەی لەباری ئامادەباشیدا بێ، ئنجا بە دەنگێکی بەرز گوتی " ئەدۆلف ئایخمان". زیاتر من هیچی دیکەم لێنەپرسی، چونکە هەر پێویستیش نەبوو.

حەفت ڕۆژەکانی دواتر ئەدۆلف و زیندانکارەکانی لە پشت دەرگای داخراوەوە لە هەمان شوێن مانەوە. تا ئەوکاتیش هیچ کامێکیان هیچیان لەگەڵ بەندکراوەکە باس نەکردبوو. لە ژێر ئەو هەمو بێدەنگییەدا، دەبوایە نان بخوات و دوش بکات و بچێتە سەرئاو. ئیتان گوتی" بێدەنگ مانەوە کارێکی زۆر پێویست بوو بۆ چالاکیەکەمان. نەماندەویست ئەدۆلف بزانێ کە ئێمە چەند دەمار گرژبووین. گەر وا بوایە ئەو هیوایەکی پەیدادەکرد. هیوا وا لە پیاوێکی بێهیوا دەکا کە زۆر ترسناک و کوشندە بێ. من دەمەویست ئەو تەواو هەست بە بێهیوایی و بێ یارمەتی بکا، هەروەک چۆن خەڵکی ئێمەی بێ یارمەتی دەناردە ئۆردوگا زۆرەملێیکانی مەرگ".

بڕیاری گواستنەوەی ئەو بۆ ناو فڕۆکەکە، لە کاتی گەڕانەوەی نوێنەران بۆ وڵات هاتبوو، ئەوەش بەدەرنەبوو لە گاڵتەجاڕییەکی خۆش. سەرەتا دەبوایە ئەدۆلف ئایخمان یەکبەرگیی دەستەی ئەلعالی فڕۆکەوانی بپۆشێ، کە ئیتان لە ئیسڕائیلەوە بۆی هێنابوو. دواتر ناچارمانکرد یەک بوتڵی وێسکی هەڵقوڕێنێ، تا تەواو مەست دەبێ و ئاگای لە شتان نەمێنێ".

ڕافی و پیاوەکانیشی جلی یەکبەرگیی کۆمپانیای ئەلعالیان پۆشی و بوتڵە وێسکییەکەشیان پڕکردەوە. شەپقەیەکیان لەسەری ئەدۆلف کرد و پاڵیاندا تا پشتەوەی ئۆتۆمۆبێلە بەکرێگیراوەکەیان، کە لەلایەن ئیتان خۆیەوە بۆ فڕۆکەخانە لێدەخوڕا. لەو کاتەدا فڕۆکەکەی بەریتانیا دەستی بەگڕەگڕ کردبوو، لەسەر ئەوان وەستا بوو.

لە دەروازەی فڕۆکەخانەکە لەلایەن پۆلیسی ئەرجەنتینییەوە وەستێنران. لە پشتەوە ئەدۆلف هەر دەیخرپاند. ئیتان ئەوکاتە وەها دەگێڕێتەوە" بۆنی خواردنەوەکە ڕێیە ڕۆژێک دەڕۆیشت. ئەو ساتانە هەمومان شایەنی ئەوە

بووین ئۆسکاری مۆسادمان لە یەخە بدرێ. ئێمە ڕۆڵی ئەو جولەکانەمان وازیدەکرد کە زو سەرخۆش دەبن و لەبەر خواردنەوەی ئەرجەنتینی خۆیان ناگرن. پۆلیسەکانی بازگەکە مۆرەیەکیان لێکردین و زۆر بەبێ بایەخیش سەیری ئەدۆلفیان کرد".

لە 21ی نیسانی 1960، سعات دوازدە و پێنج خولەکی نیوە شەو، بەریتانیا فڕی، ئەو فڕۆکەی ئەدۆلف ئایخمانی لە شوێنی تایبەت لە سەر کلکەکەی هەڵگرتبوو کەهێشتا هەر دەیخرپاند.

دوای پێواژۆیێکی دادوەریانەی کۆتایی نادیار، ئایخمان بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی تاوانبارکرا. لە ڕۆژی لە سێدارەدانیدا لە گرتوخانەی ڕامەڵلا لە31 ی نیسانی 1962دا ڕافی ئیتانیش لە ژوری لەسێدارەدانەکەدا ئامادە ببوو. " ئایخمان تەماشایەکی کردم و گوتی: ئەی جولەکە! کاتی تۆش دێ کە بەدوامدا بێێ" . " لەبەرامبەریدا وەڵامم دایەوە " بەڵام ئەدۆلف ئەمڕۆ نا "، دواتر یەکسەر کونەکەی ژێری کرایەوە و ئەدۆلف دەنگێکی نەرمی لێوەهات و خنکا. ئێمە بۆنی بۆگەنیمان کرد کاتێ لەپەتەکەیان کردەوە و ژێکانی لەبەر توندی پەتەکە دەلەرزی، ئەوە لە گوێمان وەک لەرینەوەی موزیک بوو.

فڕنێکی تایبەت بە سوتانی لاشەی ئەدۆلف رێکخرا بوو. پاش سعاتێک خۆڵەمێشەکەی لەسەر ڕوبەرێکی فراوان فڕێدرایە ناو زێ. بن گۆریۆن لەخەمی ئەوەدا بوو کە نابێ هیچ پاشماوەیەکی بمێنێ نەوەک هەوادارنی بیکەنە پاڵەوانێکی نازی. فڕنەکەش دواتر لەباریەکهەڵوەشێنرایەوە و هەرگیز بەکار نەهێنرایەوە. ئەو ئێوارەیە ڕافی ئیتان بەدیار زێوە ڕاوەستابوو چاوی دور تێبڕیبوو. ئەو بەتەواوی هەستی بە ئارامی کرد " لە ڕوی زانستییەوە من ئەرکەکەم بە تەواوی گەیاندە جێ، ئەوەش هەمیشە هەستی خۆشیم پێ دەبەخشێ".

ئیتان وەک یاریدەدەری بەڕێوبەری گشتیی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد بە کونوقوژبنەکانی ئاوروپادا گەڕاوە تاکو تیرۆریستە عەرەبەکان لەناو ببا. ئەو چ ئەوەی لە دور لە ڕیگەی کۆنترۆڵەوە بۆمبی دانراوی لە ژێریاندا

دەتەقاندنەوە، یان گەر ناچار بوایە بە دەستەکانی ملی قوربانییەکەی دەگرت تا نەیشکاندبا بەری نەدەدا. ئەو هەمیشە کوشتنەکانی بێ هیچ ویژدان ئازاردانێکەوە ئەنجام دەدا.

گەر ئەو لەماڵ با، بە سعات لەبەر پریشکی ئاسنگەرییەکەی دەمایەوە تا ئەو کانزایە بە ئارەزوی خۆی نەیچەماندبایەوە شتێکی لێدروست نەکردبا، وازی لێنەدەهێنا. زۆری نەبرد دیسان ئەو دەرکەوتەوە، ئەمجارەشیان چەندان فرۆکەی گۆڕی تا بگاتە شوێنی مەبەست. بۆ هەر گەشتێکیش پاسپۆرت و ناسنامەیەکی جیای دەبرد، کە سندوقی مۆساد لێیان تەژی بوو. هەندێکیان ڕاستی و هەندێکیشیان وا دروستکرابوون، هەر دەتگوت ڕاستین، هەموشیان بۆ ئەو مەبەستانە بوون کە سەفەری وڵاتانی پێبکەن.

لەپاڵ ئیشەکەی وەک بکوژ، کارێکی دیکەشی پێڕاسپێردرا بوو، ئەویش هێنانەڕیزی سایانیمی Sayanim جووی خۆبەخشی یارمەتیدەر بوو. ئەو ڕۆڵەی زۆر بە زیرەکانە و دڵسۆزییەوە بۆ وڵاتی باوانی دەگێڕا.

'من پێم دەگوتن، گەلی ئێمە دو هەزارساڵی ڕەبەقە هیچی نەکردووە تەنها خەونبینین نەبێ. ئێمە بیست سەدەی ڕێکە تەنها نوێژ بۆ ڕزگارکەرێک دەکەین. لە گۆرانیەکانمان، شیعرەکانمان، لە ناخی دڵمانەوە ئێمە ئەو خەونەمان بە زیندویی ڕاگرت، خەونەکانیش لە لای خۆیانەوە ئێمەیان بە زیندویی هێشتەوە. ئێستاش خەونە و بۆتە ڕاستی. ئەوسا من لێم زیاددەکرد و دەمگوت: بۆ ئەوەی ئەو بارە ڕاستیە ڕاگرین و بیپارێزین، پێویستیمان بە خەڵکی وەک ئێوە هەیە".

لە قاوەخانەکانی کەنار ئاوەکانی پاریس، لە چێشتخانەکانی لێوارەکانی سەر ڕوباری ڕاین، لە شارەکانی وەک مەدرید، ئەنتوێرپن و لەندەن، ئەو پەیڤەکانی دوبارە دەکردنەوە. زۆر جاران سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا و تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ بۆ ئەوەی بە جویی بمێنیتەوە سایانی نوێی دەهێنانەڕیز. گەر کەسێکیش دودڵ بووبا، ئیدی ئەو باری کەسایەتی لەگەڵ سیاسەت تێکەڵ دەکرد. ئەوسا باسی کاتی خۆی هی سەردەمی هاگانای بۆ دەکردن و

چیرۆکـە پەسـنەکانی لەسـەر بـن گۆریـۆن و سـەرکردەکانی دیکـە بۆ دەگێڕانەوە. زۆر جاران دوا ڕستەکانی بەرامبەرەکەی خاو دەکردنەوە و دەهاتەڕیز.

پاش ڕۆژگارێک ئەو ڕایەڵێکی تەونی پەیوەندی بەرفراوانی لە ساینەکانی ئاوڕوپا ڕاچاندبوو، ساینەکان لـە پارێزەران، پزیشـکی ددان، مامۆسـتایان، دکتۆران، بەرگدروان، دوکانداران، ژنـانی ماڵـەوە خانمـانی سکرتاریەتەکان بوون. ئەو زۆر پەرۆشـی گروپێکـی تایبـەت بـوو، ئـەوانیش جـوە ئاڵمانـەکان بوون، کە دوای بەسەرچوونی هۆلۆکۆست بۆ وڵاتەکەیان گەڕابوونەوە. ڕافی هەمیشە ئەوانەی ناودەنا ' جاسوسە لەژیان ماوەکانم'.

ڕافی ئیتان وەک جەنگاوەرێکی بەرەی پێشەوەی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد هەمیشە دەیزانی بە نهێنی لە عەممان لە نێودەزگای هەواڵگری سەربازیی و لە شین بێت Shein Bet دەزگای ئاسایشـی نـاوەخۆ چـی ڕودەدا. هـەردو دەزگا هەوڵیاندەدا شتێک لە فەرماندەی باڵای مۆساد هەڵبکرێنن. ئـەو گـوێی لێبوو کە پلان هەیە ڕاپۆرتی بە مۆری Eyes Only کە زۆر نهێنییە و تەنها بـۆ کەسـانی دیـاریکراوە، ناردرانـە نوسـینگەی سـەرەک وەزیـران. لـە ژێـر سەرکردایەتیی مایر ئامیت Meir Amit دا مۆساد هەمیشەخۆگرترو لەشکان نەهاتووبوو بەرامبەر هەر هەوڵێک لەدەسەڵاتی کەم بکرێتەوە.

کاتێک ئەو ڕۆژە هات کە مایر ئامیت چیدیکە فەرمان دەرنـەکات و مۆسـاد بەجێبێڵێ. ئیتان وەک پێشان بە شەنقاوە گـەورەکانی ڕێرەوی باڵەخانەکـەی نەدەپێوا و نیگـا و پێکەنینـە درێژەکەشـی بزربـوو. هاوڕێیـانی ئیتـان زۆریـان هەوڵدا و لۆبیان دروستکرد، بەڵکوئیتان جێگەی ئامیت بگرێتەوە، چونکە هەمو توانا و کارامەیی ئەو کارەی تێدا بوو کە مۆسـاد حیسـابی خـۆی لەسـەربکا، بەڵام بڕیارەکە بە هۆی پارتی کـارەوە لـە قـازانجی ئیتـان نەشـکایەوە بـەڵکو پۆستەکە درایە زڤی زامیـر Zvi Zamir نـەیاری هەراسـانکەر. ڕافـی ئیتـان دەستلەکارکێشـانەوەکەی خـۆی پێشکەشـکرد. ئـەو هـیچ کێشـەی لەگـەڵ بەڕێوبەری نوێ نەبوو، بەڵام لەو باوەڕەدا بوو گەر زۆرتر لە نێو مۆسـاددا

بمێنێتەوە، هەست بە خۆشی ناکا. لە ژێر سەرپەرشتی ئامیتدا دەستی تەواو کراوەبوو لە تایبەتمەندی خۆی بۆ ئیشکردن، کەچی ئەو ڕکی لەوە بوو کە ' زڤی زامیر شتی دەقاودەق وەک نامیلکەی بەردەست دەوێ' ئەوەش بۆ من هیچ شتێکی نەدەگەیاند.'

ڕافی ئیتان بۆ ئاسایشی کۆمپانیاکان ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی کردەوە. ئەو تواناو کارامەیی خۆی نیشانی بەڵێندەرەکان دەدا تاکو ڕاوێژی ئاسایشپارێزی کۆمپانیاکانیـــانی پـــێ بکـــەن، یـــان بزنســـمانە گـــەورەکان تاببێتـــە ڕاهێنەرێپاسەوانەکانینان دژی کردەوە تیرۆرستییەکان. پاش ساڵێک دیسان ئیتان ئارەزوی خۆی نیشاندایەوە تاکو جارێکی دیکە لە دەزگای هەواڵگری کاربکاتەوە. ئەوکاتەی ئیسحاق ڕابینYitzhak Rabin لە 1974دا بوو بە سەرەک وەزیران، لەپڕ ئیسحاق هۆفیYitzhak Hofi کە پیاوێکی کردەیی بوو کردیە سەرۆکی مۆساد. کەواتە دەبوایە هۆڤی ڕاپۆرت بداتە ئارییێل شارۆنیAreil Sharon ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی. هۆفی بە خەستی ئیشی لەگەڵ ئەوپیاوە کرد کە ویستەکانیان لەیەکدەچوون تەنانەت لە نێو دەزگایەکی هەواڵگریش.

سێ ساڵ دواتر دیسان حکومەت گۆڕانی بەسەردا هات. ئەوجارەیان سەرەک وەزیرانی نوێ مناحیم بێگن Menachem Begin ڕافی ئیتانی کردە ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی بۆ کاروباری تیرۆریزم. یەکەمین کاری نوێی ئیتان لەناوبردنی ئەو فەلەستینیانە بوون کە بەرپرسبوون لە کارە دڕندانەکەی تەقینەوەی نوێنەرایەتیی ئیسرائیل بۆ یارییەکانی ئۆلۆمپی لە 1972دا لە میونیخ، کە لەوێ 11 گەورە وەرزشوانانی ئیسرائیلی بوونە قوربانی. لە ڕاستیدا تاوانبارە ڕاستەقینەکان هەموویان یەک لە دوای یەک لە لایەن مۆسادەوە تۆڵەیان لێکرایەوە و کوژران.

یەکەمیان کە کوژرا لە فلاتەکەی خۆی لە ڕۆمای پایەتەخت بوو. 11 گوللەیان لێدا بەقەدەر 11 وەرزشوانەکە. دوهەمیان بە لیستی ڕەش مرد لە فلاتەکەی لە پاریس کاتێ تەلەفۆنی هەڵگرت، سەری لە لەشدا جودا بووە

بەهۆی بۆمبێکی بچکۆڵانە کە لە مایکی تەلەفۆنەکە بەسترا بوو، لە دورەوەش بە کۆنترۆل تەقێنرایەوە. سێهەمیشان لە میوانخانەیەک لە قوبرس لە شیرینەخەودا بوو، کاتێ بە بۆمبیکی هاوچەشن ژورەکەی بەسەردا ڕما. تاکو باقی تیمە لە ژیانداماوەکەی گروپی ئەیلولی ڕەش بتۆقێنن ، کە بەرپرسیارێتیان لە تەقینەوەی وەرزشوانە ئۆلۆمپییەکانی مونشنیان ڕاگەیاندبوو، سایانە عەرەبەکانی مۆساد جارێ مەرگیان لە ڕۆژنامەکان دابوو بەوەی لەژیاندا نەماون. خزم وکەسوکاریان بەوجۆرە فاتیحا و گوڵیان بۆ دەناردن، زۆریشی نەبرد بەکردەوە هەمویان کوژران.

ڕافی ئیتان ئەمجارەیان مشوری ئەوەی خوارد کە چۆن سەرکردەکەیان عەلی حەسەن سەلامە، کە لە هەمو شوێنێکی جیهانی عەرەبی بە شازادەسوور (الامیر الاحمر) ناسراو بوو، ڕاوبنێ و بیکوژێ. لە دوای مونشنەوە لە 1972را ئیتان لەو پایەتەختی عەرەبی بۆ ئەوی دیکەی دەهات و دەچوو، تا فەرمانی جێبەجێکردنی ستراتیژە دانراوەکەیان بداتە پیاوانی مۆساد. هەر جارە کە ڕافی ئامادە بوو دەست بوەشێنێ شازادەسور بۆ شووێنێکی دیکەی دەگوازتەوە. لە دواییدا خۆی لە نێو بۆمچێنەکانی بەیروت گرتەوە. ڕافی ئەوشارەی هەر وەک بەرپێی خۆی شارەزا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەرەتا ویستی یادەوەرییەکانی خۆی تەواو نوژەنبکاتەوە. ئەو بە ناوی بزنسمانێکی گریکی چووە ئەوێ. لە ماوەی ڕۆژێکدا بە تەواوی بۆی ئاشکرا بوو، کە سەلامە لە کوێ خۆی حەشارداوە و خەریکی چیشە.

ڕافی ئیتان گەڕایەوە تەلئەبیب تا داوی پلانەکەی باش ڕابچێنێ. سێ ئاژانی مۆساد کە دەکرا لە ڕێگەی فەلەستینییەکانەوە ڕەت ببن، سنوریان بڕی و پەڕینەوە لوبنان و چوونە بەیروت. لەوێ یەکیان ئۆتۆمبێلێکی بەکرێ گرت، دوهەمیشیان ئۆتۆمبێلەکەی بە تەقەمەنی لە قەپاخی شانسی و بنمیچ و لە دەرکەکانی چاند. سێهەمیشیان ئۆتۆمۆبێلەکەی لە شوێنێک ڕاگرت لە نزیک ئەو شوێنەی کە هەمو بەیانیان شازادە سوری بەرە و بارەگاکەی پێدا ڕەتدەبوو. بە گوێرەی ئەو وەسفەی ئیتان کردبووی بۆمبەکانیان وا

دانابووەوە کە هەرکاتێ بە دەقاودەقی بیانەوێت بیتەقێننەوە بتەقێ. هەرواش ڕویدا، لە کاتی تێپەڕینی سەلامە ئۆتۆمۆبێلەکە تەقیەوە و ناوبراوی هەپڕون بە هەپڕون کرد.

ڕافی ئیتان جارێکی دیکە بۆ دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلی سەلماند کە چ توخمێکی گرنگە. سەرەک وەزیران مناحیم بێگن بڕیاریدا کە نابێ چیدیکە ڕافی بەخۆی کاری دەرەوە بکا، چونکە ئەو کەسێکی گرنگە بۆیە دەبێ بپارێزرێ، لە کاری وا ڕەنگبێ سەری تێدا بچێ. ئیدی سەرۆک لەمەودوا بڕیاری بۆ ڕاوێژکارەکەی دەرکرد کە دەبێ لە نوسینگەکەی لە پشت مێزەوە کاربکا و لە پشت چالاکیەکانەوە بێ، نەوەک لە بەرەی پێشەوە. کەمێک پێش ئەوە ڕافی ڕۆڵی لە فلیمێکی جاسوسی ترسناک بەناوی The little Drummer Girlدی کە تێیدا سەرکەوتو بوو باندێکی تیرۆرستان ڕاو بنێ.

ئەو لایەنە زانستییە فانتازی فلیمەکە کە دانەرەکەی پێوە خەریک ببوو، بۆ ئیتانی هەمیشە بزێو، هیچی نەدەگەیاند. ئەو دەیەویست بجولێ، پەلامار بدا، نەوەک لە نوسینگەیەک بە مێز و کورسیەوە ببەسترێتەوە و هەر کۆبوونەوە بکا. هەولێدا بێگنی سەرۆک بهێنێتە ڕایێ، کە کارێکی دیکەی پێ بسپێرێ.

دوای کەمێک دودڵی، دۆزینەوەی ڕاوێژکارێکی باشتر لە ئیتان بۆ کاروباری تیرۆریزم، ئەوسا بێگن ئیتانی بۆ کارێکی دیکە ناوزەدکرد، کە پۆستێکی قورس بوو لە نێو دەزگای هەواڵگری نهێنییدا. ئەوکارە نەوەک هەر بیرتیژیی دەویست، بەڵکو پێویستی بەوە بوو تەواو بازوی بۆ لێهەڵماڵێ، ئەویش بەڕێوبەری زانستیی ڕایەڵەکانی پەیوەندی بوو، کە بە زمانی عبری لاکام Lakam یان پێدەگوت.

ئەو دامەزراوە لە 1960ەوە وەک بەشێکی جاسوسی سەربە وەزارەتی بەرگری بوو، هەموو هەولێکی دەدا بۆ کۆکردنەوەی هەر کەرەستەیەک تا زانیاری پێ کۆکرێتەوە. ئەوەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵک بۆ زانیاریدان بکڕدرێ. لە سەرەتاوە لاکام لە لایەن مۆسادەوە تەگەرەی دەخرایە پێش و ڕەفتاری ناحەزانەیان لەگەڵدا دەکرد، چونکە گوایە ئەو

دامەزراوە نوێیە شارەزا نییە. چ ئیسەر هارل Isser harel چ مایر ئامیت هەوڵیاندا لاکام بخەنە ژێر پەردە، یاخود وەک بەشێک بە مۆسادەوەی بلکێنن. شیمۆن پێرس ئەوکات، جێگری وەزیری بەرگری بوو، پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ وەزارەتی بەرگری دەزگایەکی هەبێ و لە ڕوی زانستییەوە خەریکی کۆکردنەوەی زانیارییەکان بێ. ئیدی بە هێواشی لاکام دەستبەکاربوو. دواتر وایلیێهات هۆبەی لە واشنتۆن، نیویۆرک، بۆستن و لۆس ئانگلس کردەوە و بەرەبەرە تەکنەلۆژیای هەمەلایەنەی بابەتەکەی کۆکردەوە. هەمو هەفتەیەک کارمەندانی لاکام بەدەرزەن گۆڤارە تەکنیکییەکانی بۆ ئیسرائیل دەناردەوە، لەکاتێکدا ئەو چالاکیەیان بە ورد و درشتی لە لایەن FBI یەوە چاودێری دەکرا.

چاودێری بەسەریانەوە لە 1968دا تیژتربوو، کاتێ دەرکەوت کە یەکێ لەو ئەندازیاریانەی لە دروستکردنی فڕۆکەی جەنگی فەڕەنسی میراج Mirage IIICکاریدەکرد، زیاتر لە 2000 نەخشەی دزیبوو. ئەندازیارەکە گیرا و چوار ساڵ و نیو حوکمدرا، چونکە دزیەکەی بۆ لاکام بوو، ئەوانیش لە ئیسرائیل بڵاویان کردەوە و بەوە ئیسرائیل دەیتوانی هەمان فڕۆکە دروستبکا. دوای ئەو کودەتایە لاکام کەمتر توانی سەرکەوتنی نوێ بەدەستبێنێ.

ئیتان بیری لە کودەتای میراجەکە دەکردەوە، بەلای ئەو پرسەکە چارەنوسساز بوو، لە خۆی دەپرسی ئەوەی ئەو کات بەدی هات، بۆچی ئێستاش بەدینایەت. ئەو هەوڵیدا لاکام سەرلەنوێ ببوژێنێتەوە، ژیانێکی نوێی بەبەردابکا و حیسابی لەسەر بکرێ.

ئەو لە نوسینگەیەکی بچکۆلە لە بەشێکی سەرنجڕانەکێشی تەلئەبیب دەستیبەکارکرد. لەوێ قسەی بۆ کارمەندەکانی دەکرد کە هێشتا هەیبەتی ئەویان لامابوو، زۆرەکانی بەسەردا دابەشکردن و پێیگوتن کە 'من هەمیشە شاگردێکی تیژڕۆ بووم'.

ئەو لەکارەکەی، خۆی لە ژێر جیهانی زانستیدا ونکرد، تا بتوانێ باشترین توانای بناوانە زانیارییەکان بۆ دەزگاکەی بەدەستبێنێ. ئەو هەر لە بەرەبەیانەوە لە ماڵ دەردەچوو، نیوە شەو خۆی و کۆمەڵە دەستەیەک کاغەز دەگەڕایەوە لەوێش سعاتێک لێیدەکۆڵینەوە. کاتی بۆ ئەوەش تەرخاندەکرد کە کار لەگەڵ کوپەلە کانزاییەکانی خۆشی بکا. هەرچەندە ئەو زانیاری زۆری کاتی خۆی لەیادەوەریدا مابوون، بەڵام پەیوەندییە کۆنەکانی بە دەزگاکانی دیکەوە نوێکردنەوە. مۆساد لەوکاتەدا بەڕێوبەرێکی دیکەی بۆهات ئەویش ناحوم ئادمۆنی بوو. ناحومیش وەک ئیتان لە ناخەوە گومانیان لە نیازەکانی ئامریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەبوو. لە ڕوی دەرەوە واشتنتۆن وای نیشاندەدا کە پەیوەندی گەرم و توندوتۆڵی لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیە. هەروەها سیاش ئەو کەناڵە نهێنییەیان پاراست، کە ئیسەر هارل و ئالن دەلەس Allen Dulles کاتی خۆی دروستیانکردبوو، بەڵام ئەدمۆنی گلەیی ئەوەی هەبوو کە ئەو زانیاریانەی لەو کەناڵەوەڕا دێن واتای کەم دەگەیەنن یان هەر بێواتان.

بەڕیوبەری گشتیی مۆساد خەمی لەو ڕاپۆرتانە دەخوارد کە لەکاتساکان و سایانمی خۆی لە واشنتۆنەوە بۆدەهاتن. لەو ڕاپۆرتانەدا بۆنی ئەوەدەکرا کە دانیشتنی نهێنی لە نێوان وەزارەتی دەرەوەی ئامریکا و هەندێ لە کەسە نزیکەکانی یاسر عەرەفات سازدەدرێ، بەو مەبەستەی ئامریکا گوشار بخاتە سەر ئیسرائیل ڕەفتاری لەگەڵ فەلەستینییەکان بگۆڕێ. ئادمۆنی بڕوای بەئیتان کرد کە دەیگوت ئامریکا چیدی بە " دۆستی ڕۆژە سەختەکان"مان نەماوە. زیاتر ئەو ڕەفتارەشیان بەوە پشتگیری لێدەکرا کە باوەڕی ئەمریکیەکان لە نێو خۆیاندا وەک ساڵەکانی دوای شەڕی ڤێتنام لەرزۆک بووە و زەفەری پێدەبردرێ.

لە ئابی 1983دا پیاوانی مۆساد بۆیان دەرکەوت کە نەخشەی کردەیەکی تیرۆرستی بۆ سەر سەربازانی ئامریکا لە بەیروت کە هێزی ئاسایشپارێزی

نەتەوەیەکگرتوەکان بوون لە ئارادایە. کاتساکانی مۆساد ئۆتۆمۆبێلێکی بارهەڵگری مارسیدیسیان بەدیکرد کە نیو تۆن تەقەمەنی تێدایە. بە گوێرەی پەیمانی هارل و دەلەس بوایە، دەبوایە یەکسەر مۆساد زانیارییەکەی بدابایە دەستی سیا، بەڵام لە کۆبوونەوەی بارەگای سەرەکی مۆساد لە King Saul Boulevardبەسترا بە ستافەکە گوترا ' پێویستە دوربەدور چاودێری مارسیدیسەکە بکەن. هەرچی دەربارەی ئەمریکییەکانە، ئێمە بۆ ئەوە نین ئەوان بپارێزین. با ئەوان خۆیان پێش کەپوی خۆیان ببینن. گەرئێمە زۆرشتمان بۆ (یانکی) ئەمریکیەکان کرد، دواتر ڕێچکەی خۆمان پیس دەکەین'.

لە23 ئۆکتۆبەری 1983دا کە بەتەواوی مارسیدیسە بارهەڵگرەکە لەلایەن مۆسادەوە چاودێری دەکرا، دواتر ئۆتۆمبێلە پڕ تەقەمەنییەکە چوە نێوبارەگا سەرەکییەکی بەتالیۆنی هەشتەمی مارینزی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا لە بەیروت. تەقینەوەکە ژیانی 241 مارێنزی فتکرد.

بەپێی قسەی پیاوی پێشوی مۆساد ڤیکتۆرئۆسترۆڤسکی Victor Ostrovskyکاردانەوەی ڕوداوەکە لە لایەن پایەبەرزەکانی مۆساد ئەوەبو کە ' ئەوان خۆیان لە کاروباری لوبنان هەڵبقورتێنن، ئەوەش باجەکەیەتی کە دەیدەن'.

ئەو گریمانەیە وای لە ڕافی ئیتان کرد، سەرلەنوێ بەجدی ئەوە هەڵبسەنگێنێ و بۆ ئامریکا لە ناو نانێکی گەرمی دابنێ. زانستی ئەوان لە دنیادا تاکی نەبوو، تەکنەلۆژیای سەربازیی ئامریکاش کەسی بە هاوشانی خۆی نەدەزانی. ئەوسا زۆر گرنگ دەبوو، لاکام دەستی بەو گەنجینە زانیاریانەدا ڕابگا. یەکەمین کۆسپیش لەبەردەم ئەوکارە ئەوە بوو، کەسێکی شیاو بدۆزنەوە ئەو کەلوپەلە نهێنیانەیان تەسلیم بکا.

لیستی ساینیمە ئەمریکییەکانیان هێنایە گۆڕێ کە پێشتر ڕۆڵێ کارایان لە بیناکردنی مۆسادا دیوە، لە دوایدا تێبینیانکرد کە کەسێکی هەواداری ئیسرائیل لە ئەمریکادا هەیە و ئەوپاشخانە زانستییەی هەیە. چەند مانگ

ڕۆیشتن، بەڵام هیچ ڕوینەدا. تاکو لە ئەپڕیلی 1984دا کۆلۆنێل ئاڤیم سێلا Aviem Sellaلە هێزی ئاسمانی ئیسڕائیل، مۆڵەتی وەرگرتبوو تاکو زانستی کۆمپیوتەر لە زانستگای نیۆیۆرک بخوێنێ. ئەوچووە ئاهەنگی دکتۆرێکی دەوڵەمەندی جو لە Upper East Side ی بەشی مانهاتن، لەوێ کۆمەڵێ لەهەرە ناسراو و دەوڵەمەندەکانی دیتن. سێلا لە نێو کۆمەڵگەی جودا ڕێزی دەگیرا و پلەی سەرکردەی پێدرا، چونکە وەک فڕۆکەوانێک سێ ساڵان خزمەتی هێزی ئاسمانی ئیسڕائیلی بەباشی کردووە. لەو فڕۆکەوانانەش بوو کە مەڵبەندی ناوکی عێڕاقیان تێکوپێکدا.

لە نێو ئاهەنگەکەدا گەنجێکی شەرمنۆک هەبوو، کە هەستی بە ناڕاحەتی لە نێوان ئەو هەمو پزیشک و پارێزەر و خاوەن بانکانە دەکرد،. ئەو خۆی بە سێلا ناساد کە ناوی جۆناتان جێی پۆلارد pollard Jonathan jay ەو تەنها بۆ ئەوە هاتۆتە ئاهەنگەکە بیبینێ. سێلا هەندێک لەو خۆناساندنە ڕووبەڕووە سڵەمیەوە و هەوڵیدا بە قسەی دیکە بیگۆڕێ. ئەو لەسەر ئەو باسە لابەلایەی بەردەوام بوو تا پۆلارد هەموشتێکی بۆ ئاشکراکرد، کە ئەو نەوەک هەر زایۆنیستە، بەڵکو سەربە هەواڵگریی نهێنیی مارێنزی ئامریکاییە. هەر زو سێلا بۆی ئاشکرا بوو کە پۆلارد لە سەنتەری ئاگادارکردنەی کاری تیرۆرستی، کە بەشە هەرە نهێنییەکەی هێزی مارینزە لە میریلاند Marylandئیشدەکا. ئەرکی پۆلارد ئێشکگرتنی ئەو ئامرازە زۆر نهێنیانەیە کە چاودێری جموجۆڵی تیرۆریستان لە دنیادا دەکەن. کاری ئەو ئەوەندە بایەخدارە کە بۆ سێلا وەک ئەوە وایە پوختەی کاری دەزگای هەواڵگریی ئامریکای لەسەر بەند بێ.

کۆلۆنێل خەریک بوو بە گوێچکەکانی بڕوا نەکا، کاتێ پۆلارد هەندێ لایەنی وردە ڕوداوی لە بارەی دەزگای نهێنی ئامریکادا باسدەکرد، کە نەیاندەویست لەسەرهەندێ شت لەگەڵ هاوشانەکانیان لە ئیسڕائیل هاوکاری بکەن. سێلا پرسیاری لەخۆدەکرد تۆ بڵێی FBI پۆلاردی بۆ لای من نەناردبێ تاکوبمهێنێتە ڕیزی ئەوان، بەڵام بە ڕاستی لە دڵسۆزێتی پۆلارد دەکەوت کە

ئەو قسەکانی بەڕاستین. هەرهەمان شەو سێلا زەنگی بۆ ئیسڕائیل لێدا، تاکو دیدارێک لەگەڵ فەرماندەی هێزەکانی ئاسمانی ئیسڕائیل سازبکا. زۆری نەبرد پەیوەندی ڕێکخست لەگەڵ فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانی، ئەویش فەرمانیدا سێلا لەگەڵ پۆلارد بەردەوام بێ .

ئاوا یەکدیان لە شوێنی خلیسکانەی سەر بەفر، لە قاوەخانەکەی Forty-Eight Srteetو لای گۆلەکەی سەنتڕاڵ پارک دەدی. هەمو جارێک پۆلارد کۆمەڵێک دۆکیۆمەنتی تەسلیم دەکردن، تاکو بیسەلمێنی کە قسەکانی ڕاستین، سێلاش بەتەتەرێکی تایبەت شتەکانی بۆ تەلئەبیب ڕەوانە دەکردن و پۆلاردیش هەستی بە خۆشییەک دەکرد، چونکە خەریکی کارێک بوو کە نهێنیی بوو. ئاخر مایەی تێگەیشتن بوو کە سێلا سەری لەوە سوڕبمێنێ کە مۆساد ئاگاداری تەواوی پۆلارد بوو، چونکە بەر لە دوو ساڵ پۆلار خۆی پیشکەشی مۆساد کردبوو، بەڵام مۆساد ئەوی بە کەسێکی ناجێگیر دادەنا، یەکێ لە کاتساکانیش ئەو تێبینییەی لەسەر نوسیبوو کە پۆلارد' کەسێکی تەنهایە، ڕوانینێکی واقعیانەشی لەسەر ئیسڕائیل نییە'.

سێلا ئامادە نەبوو بەبێ چالاکی و تەنها لە پشتی کۆمپیۆتەر وازبێنێ، بۆیە سێلا بە دوای ڕێگایەکدا گەڕا پەیوەندییەکانی بەزیندویی ڕابگرێ. لەو ماوەیەدا لە نیویۆرک پەیوەندی لەگەڵ پاشکۆی زانستی کۆنسولخانەی ئیسڕائیل بە ناوی یوسف یاگور Yosef Yagur پەیداکرد. ئیتان یوسفی وەک سەرۆکی لاکام لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەستنیشان کردبوو.

سیلا یوسفی لەگەڵ پۆلارد بۆ نانخواردن بانگهێشتکرد. لەسەر نانخواردن پۆلارد گوتی ئامریکاییەکان ئەو زانیارییانەیان لە ئیسڕائیلیەکان شاردۆتەوە، کە بەهۆیەوە دەتوانرێ بەرگری لە کارە تیرۆریستییەکانی عەڕەبەکان بکا، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئامریکا نایەوێ پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتە عەڕەبییە نەوتدارەکان تێکبدا.

ئەو ئێوارەیە یوسف لە ڕێی دەزگایەکی نهێنیپارێز لە کونسلخانەکەوە پەیوەندی لەگەڵ ڕافی ئیتان کرد. لە ئیسڕائیل ئەو کاتە کاتی دەوام

تەواوبوون بوو، بەڵام ئیتان هێشتا لە نوسینگەکەی خۆیدا کاریدەکرد. هێشتا ڕۆژ هەرمابوو کە دەسکی تەلەفۆنەکەی دانایە و بە خۆشییەوە هەناسەی هەڵکێشا، ئیدی ئەو زانیاریدەری خۆی چنگکەوت.

لە سێ مانگی داهاتودا لەلایەن یاگور و سێلا، پۆلارد و هاوسەرەکەی ئان هێندرسۆن Anne Hendrson بەگەڕخران. ئەو دوانەیان دەبردنە چێشتخانەی زۆر گرانبەهاو و تەماشاکردنی فیلمە تازەکان. پۆلارد بەردەوام زانیاری گرنگی دەدانێ. ڕافی ئیتان، لەبەر بایەخی زانیارییەکان خەریک بوو بڕوا نەکا. ئیدی بڕیاریدا کە کاتی ئەوە هاتووە خۆی زانیاریدەرەکەی خۆی ببینێ.

لە نۆڤێمبەری 1984دا سێلا و یوسف پۆلارد و هاوسەرەکەیان بۆ گەشتێکی پارەبۆدراویان بۆ پاریس بانگهێشتکردن. یوسف بە پۆلاردی گوت ' وەک پاداشتێکی ئەو چاکەی تائێستا لەگەڵ ئیسرائیلت کردووە، ئەو گەشتە پشووە بچکۆلانەیەت بۆ سازدەدەین' . ئەوان بە گەشتێکی بزنسمانەکان فڕین و لە دابەزینیشدا ئۆتۆمبێلێکی بە شوفێرەوە بۆ ئامادەبوو، گەیاندیانە میوانخانەی بریستۆل Bristol Hotel لەوێش رافی ئیتان چاوەڕێیدەکردن.

تا کۆتایی ئەو ئێوارەیە ڕافی ئیتان هەمو لایەنە وردودرشتە کردەکەی تێگەیاندن کە پێویستە چۆن بەردەوام بن لەسەر ناپاکییکردن بەرامبەر وڵاتەکەیان. نەدەکرا ئەو گەشتە بەردەوامبێ. سێلا دەبوایە بگەڕێتەوە، چونکە ڕۆڵی لە ئیشەکەدا تەواوبوو. یوسفیش دەبوایە وەک کۆڕسێکی پۆلارد دەستبەکاربێ و سیستمێکیان تاقیکردەوە بۆ بەکاربردنی دۆکیومەنتەکان. پۆلارد دەبوایە تەواوکەری دۆکیۆمەنتەکانی لە باڵەخانەی Irt Erb بداتە کچە سکرتێرەکەی باڵویزخانە لە واشنتۆن. لە چێشتخانەکەیدا دەزگایەکی کۆپی زۆر خێرا دانرا بوو بۆ لەبەرگرتنەوەی دۆکیومەنتەکان. پۆلارد دەبوایە سەردانەکانی بۆ لای ئەوخانمە لەگەڵ چوونە کەمەکانی بۆلای شوێنی ئۆتۆمۆبێل شوشتن ڕێکبخا. لەوکاتەی ئۆتۆمۆبێلەکەی دەشورێ، پۆلارد دۆکیۆمینتەکان دەداتە یوسف، کە ئۆتۆمۆبێلەکەی ئەویش لە ڕیزی

شوشتندایە. لە نێو دەشبولی ئۆتۆمۆبێلی یوسف دەزگای کۆپی دانراوە. فلاتی Irt Arbکە شوێنی شوشتنی ئۆتۆمۆبێلەکانە زۆر دور نییە لە فرۆکەخانەی واشنتۆن، بەوشێوەیە یوسف بە ئاسانی لەنێوان واشنتۆن و نیویۆرکدا بێت و بچێ. لە کونسولخانەکەش کەلوپەلەکانی بە فاکسێکی کۆدەدار دەنارده تەلئەبیب.

ڕافی ئیتان گەڕایەوە تەلئەبیب و چاوەڕێی دەرەنجامەکانی دەکرد. پێشهاتەکان لەسەروی چاوەروانکردنەکانی بوون، زانیاریی ورد و ناوێزە لەسەر چەکپێفرۆشتنی ڕوسیا بە سوریا و هەندێ دەوڵەتی عەرەبی دیکە، ڕێکخەری بنگەی ڕاکیتی SS21 وSA-5، کارت و نەخشەی وردی سەتەلایتی حەشارگەی چەکەکانی عێراق، سوریا و ئێران تەنانەت فابریکەکانی چەکی کیمیاوی و بایەلۆژییە پەرەپێدراوەکانیشیان.

زو بۆ ڕافی ئیتان ڕێگەشێوازی کۆکردنەوەی دەزگای نهێنی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان نەوەک هەر لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، بەڵکو لە خواروی ئافریکاشدا بۆ ڕونبووەوە. پۆلارد ڕاپۆرتەکانی پیاوانی سیاسیشی تەسلیم دەکردن، چونکە لە ڕیگەی دەزگاکەی کۆنترۆلی دەکرد و دەستی بەسەریاندا ڕادەگەیشت. یەکێ لەوبەڵگەنامانە بە دورودرێژی ئەزمونە سەرکەوتووەکەی ناوەکی باشوری ئافریقای کە لە 14یسێپتێمبەری 1979دا لە ئۆقیانوسی هیندیدا سازدا بوو، وێنا کردبوو. ڕژێمی پریتۆریا لەسەر هەمو ئاستێکەوە حاشایی دەکرد کە چەکی ناوکی هەبێ. ڕافی ئیتان مۆسادی هاندا تا کۆپیەکی تەواوی بەڵگەنامەکەی بداتە بریتۆریا لە باشوری ئافریقا، ئەمەش واتای ملشکاندنی سیای بوو لەو وڵاتە، کە تۆڕێکی پەیوەندی باشیان لەوێ هەبوو. لە ئەنجامدا 12 ئاژانی سیا ناچار بوون بەپەلە وڵاتەکە بەجێبێڵن.

یانزە مانگی داهاتوش پۆلارد بەردەوام بوو لەسەر ناردنی زانیارییە بەڵگەدارەکانی دەزگای نهێنیی ئامریکا بۆ ئیسرائیل. هەرهەموی بەسەر یەکەوە نزیکەی هەزار بەڵگەنامەی زۆر نهینیی ناردنە ئیسرائیل. ئەو

دۆکیۆمینتانە ئەوەندە بە وردی لە لایەن ڕافییە دەخوێندرانەوە و هەڵگێڕو وەرگێڕیان پێدەکرا ئەوسا دەیدانە دەستی مۆساد. ئەو زانیاریانە وایان لە ناحوم ئادمۆنی کرد حکومەتە ئیتیلافیەکەی شیمۆن پێریز کە پێشتر کاریان لەگەڵ یەک زەحمەت ببوو، لە سایەی زانیارییەکانی کاردانەوەی سیاسیان لە بەرامبەر سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئامریکادا هەبێ. مەحزەرنوسێکی دانیشتنی حکومەتی ئورشەلیم لە یەکشەمواندا پێیڕاگەیاندین ' گوێگرتن لە ئادمۆنی بەقەد کورسیەکیOval Office ی واشنتۆن بوو. ئێمە نەوەک تەنها لە پوختەی ڕایەکانی واشنتۆن لە هەلومەرجەکانی ناوچەکەی تایبەت بە ئێمە ئاگادار بووین، بەڵکو ئەوکاتەشمان هەبوو تا لە ژێرتیشکیەوە بیر لە باشترین کاردانەوەمان بکەینەوە'.

پۆلارد بووە توخمێکی چارەنوسساز لە بڕیاری سیاسەتی نهێنی ئیسرائیل و هاوکات لەگەڵ گوڵبژێرێکی تێکچڕژا و ئاڵۆزیشی دەڕەخساند. رافی ئیتان بە دڵنیایەوە داوای پاسپۆرتێکی ئیسرائیلی بەناوی Danny Cohen بۆ پۆلارد کرد. هەروەها مانگانەیەکی باشیشی بۆ بڕیەوە. لە بەرامبەردا ڕافی داوای کونوکەلەبەرەکانی دەزگای گوێلێهەڵخستنی ئەلەکترۆنی کرد، کە نوسینگەی ئەمریکی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی NSA=National Security Agency لە ئیسرائیلو باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە واشنتۆنو لە بەشە دیپلۆماتەکانی دیکەی ئیسرائیل لە وڵاتە یەکگرتەوکانی ئامریکادا بەکار دەهێنرا.

پێش ئەوەی پۆلارد ئەو زانیاریانە بداتە دەست، گیرا. ئەوەش لە 21ی نۆڤێمبەری 1985دا لەبەردەم دەرگای باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە واشنتۆندا ڕویدا. سعاتێک دوای ئەوە یوسف، سێلا و خانمی سکرتاریەتی باڵوێزخانەکە بە فڕۆکەیەکی ئەلعالی لە نیویۆرکەوە گەیانرانە تەل‌ئەبیب، تاکو FBIنەیانخاتە ژێر لێکۆڵینەوە. لە ئیسرائیل بەهۆی باڵە پارێزەرەکانی دەزگای نهێنیی شاردرانەوە و بزربون. پۆلار حوکمی هەتاهەتایەی بەسەردا درا و هاوسەرەکەشی پێنج ساڵی زیندانیان بەتەنگەدا دا .

لـەو نێـوەدا ڕافـی ئیتـان تـوانی لـەپاڵ سـەرکەوتنەکانی جـارێکی دیکـە لەبەرامبەر وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا پاڵ بداتەوە، کە بەهۆیەوە وڵاتەکەی گەیاندە ئەو ڕادە پێشکەوتنە، کە ببێتە گرنگترین وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ بەدەستهێنانی توانای چەکی ناوەکی.

# 5

## شمشێری ناوەکیی گیدۆن
## Gideon

{رافی ئیتان و کەڵکەڵەی چەکی ناوەکیی.. بنگۆریۆن‌و بیابانی نەقەب.. دروستکردنی شاری ناوەکی دیۆنا.. سەلمان شاپیرۆو نۆمیک‌و هاوکاری دیمۆنا.. بەدەستهێنان و دزینی پێداویستی چەکی ناوەکیی..یۆرانیۆم بە ڤۆدگا.. لەروسیاوە کڵاوەی ناوەکی دەدزرێ.. لەیلا و ئاژانەکانی دیکەو چەک.. ئیسرائیل هێزێکی ناوەکییە..گۆبەندی بیل کلنتن لەگەڵ مۆنیکا لوینسکی و دەستهەبوونی مۆساد......}

له تاریکایی هۆڵی سینەمای تەلئەبیبدا، ڕافی ئیتان سەیری گەواهی دەستی دوهەمی چەرخی ناوەکی ( ئەتۆمی ) دەکرد، کاتێ لە 6 ی ئابی 1945دا هیرۆشیمای پێخاپورکرا. لە کاتێکدا ئەفسەرە لاوەکان بە خۆشیەوە لە دەورەی ڕافی کۆببونەوە و خۆشحاڵیان بەنمایشی کۆپلە تێکدەرەکانی فیلمەکە دەردەبڕی، کە چۆن شارێکی ژاپۆنیان وێرانکرد. ئەو شتی دیکەی لە مێشکدا بوو، تۆ بلێی ڕۆژێک دابێ ئیسرائیلیش ئەو چەکەی بە چنگ بکەوێ؟ ئەدی باشە وادابنێ عەرەبەکان پێش ئیسرائیل، چەکە بۆرەیان بەدەستهێنا، چ دەقەومێ؟

له ماوەی دە ساڵی دوایدا هەمەن پرس لە مێشکیدا هەر گینگڵی دەخوارد. گەر هاتباو میسر ئەو چەکەی هەبووایە، ئەوا شەڕی کەناڵی سوێسی دەبردەوە، هەرگیز شەڕی شەش ڕۆژەی1967 یان شەڕی یۆم کیپەر Jom Kippoer( شەڕەکە لە ئۆکتۆبەری 1973دا رویدا، لای میسرییەکان بە شەڕی ئۆکتۆبەر ناسراوە) روویاننەدەدا. دەنا دەبوایە ئیسرائیل ئێستا بیابانێک بووایە، بەڵام گەر ئیسرائیل ئەو چەکە بەدەستبهێنێ ئەوا هەرگیزلە شکاننایەت .

لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە پرسانە بۆ دەزگایەکی هەواڵگریی پرسی ئەکادیمی بوون، چونکە دەزگا بەکاری هەرە لەپێشتر خەریک بوو، ئەویش

لەناوبردنی تیرۆریستان بوو. چارەدیتنەوە بۆ پرسی ناوەکی کاری ئەوانی دیکە بوو. وەلێ ئێستا ڕافی ئیتان ڕابەرایەتی دەزگای لاکام دەکا، بۆیە بەجدی لوتی دەژەنیە ئەو جۆرە بابەتانە. ئەو زۆر خۆی سەرقاڵی دۆزینەوەی بەرسڤی ئەو پرسە دەکرد، ئایا دەتوانێ بۆ رۆنانی قەڵغانێکی ناوەکی وا یارمەتی ئیسرائیل بدا؟

تا نیوەشەو ئەو هەر بەو فایلەوە خەریک بوو لەگەڵ ئەوەش ڕۆژانە 40 حەبی ڤیتامینداری قوتدەدان. بەو شێوەیە بۆی دەرکەوت کە سیاسەتی ئیسرائیل و جیهانی زانست سەبارەت بە پێویستی بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی بەجدی لەیەکجودان. ' لە نێو فایلەکاندا بە درێژی دەمەقاڵییەکانی نێو کابینەی حکومەت و کۆنوسی دەمەتەقێ ناخۆشەکانی زانایانیشی لەو بارەوە تێدا بوو. هەمیشە دایڤد بنگۆریۆنی دەنگبۆدراوی هەموان لە نێو ئەو هەمو دەنگە جیایانە، سەبارەت ئەو پرسە پێچەخولانە (زیگزاگانە) دەهات و دەچوو.

زەحمەتییەکان لە 1956ەوە دەستیانپێکرد، ئەو کاتەی فەڕەنسا دەزگایەکی ناوەکی بە توانای بیست و چوار مێگاوات دایە ئیسرائیل. بەگوێرەی ڕاگەیاندنەکەی بنگۆریۆن، مەبەست لە دەزگاکە بەکارهێنانی بوو وەک سەرچاوەیەکی وزەی پۆمپەکان، تاکو بیابانی نەقەبی پێبکرێتە وڵاتێکی پڕ داروبارو بەهەشتی باخچەکان. ئەوەش ساڵانە لە ڕێی پاڵاوتنی چوار ملیارد لیتر لەئاوی زێ. سەرباری ئەو دڵنیاکردنەوانەش کە دەزگاکە بۆ کاری کشتوکاڵییە، شەش لە حەوت کۆمیتەی وزەی ئەتۆمی دەستیان لەکار کێشایەوە و ناڕازیبوون، نەوەک ئەو دەزگایە پێشەنگێک بێ بۆ چەکی ناوەکی کە ئەوەش سەرچڵییەکی سیاسیانە بوو، ئەوکات 'هەمو دنیا لە دژمان ڕادەوەستێ'. ئەوانەش لەلایەن ستراتیژیدانەرە سەربازییەکانەوە پشتگیریان لێدەکرا. هەڵوێستی گەورە بەرپرسانی سەربازی، ئیگال ئالۆن Yigal Allonی پاڵەوانی گەورەی شەڕی ئازادیخوازی 1948 هەروا بوو، دەیگوت ' مژاری ناوەکی، باشە مرۆڤ وەک چەمک تێیبگا'، ئیسحاق ڕابینیش کە کەمێک دوای ئەوە بووە سەرکردەی هەمو هێزەکانی بەرگری، بە توندی دژی چەکی

ناوەکی بوو. تەنانەت ئەوکات ئاریێل شارۆنیش کە هەمو دەم هەر هەڵۆ بووە، دژی بەدەستهێنانی جبەخانەی چەکی ناوەکی بووە و دەیگوت' ئێمە باشترین هێزی تەقلیدی شەڕکەرمان لەهەمو ناوچەکەدا هەیە'.

بنگۆریۆن هەمو نارەزاییەکی خستە ژێرپێ و فەرمانیدا ئەو دەزگایە لە بیابانی نەقەب لە شوێنێک دابنرێ، کە دور نەبێ لە شاری دیمۆنا Dimonaی ئالودە بە لمی بیابان. دیمۆنا هەمیشە لەکۆندا شاری بەیەکبەستنەوە بووە لە نێوان کاروانی قاهیرە- ئۆرشەلیم، بەڵام ئەو زەمانە لە مێژە وەستاوە. لە بیابانی باشوری تەلئەبیب نەخشەی زۆر کەم لەبەردەستدابوون بۆ دەزگادانان. لەمەوپاشیش نابێ نەخشەی ئەوێ هەر بگیردرێ، نەوەک بۆ کەسانی دیکە رێوشوێنی یەکەمین دەزگای ناوەکی ئیسرائیلی ئاشکرا ببێ .

قوببە زیوینەکەی دایمۆنا کە لە ژێریەوە دەزگای ناوەکی دانراوە، لەو بیابانە لماویەدا، وا دەبینرا کە مەلەدەکا. ناوی دەزگاکە بەعبری Kirya le Mehekar Garinyبوو، تیایدا کار بۆ دەوروبەری 2500 زانا و تەکنیکار پەیدابوو. ئەوان لە ژێر باشترین تاقیگەی پارێزراوی جیهاندا کاریاندەکرد. لمی دەوروبەری شوێنەکە بەردەوام لە ژێر چاودێریدا بوو، نەوەک کەسێک شوێنپێی هەڵگرێ. فڕۆکەوانەکان دەیانزانی هەرفڕۆکەیەک بەسەر ئەو شوێنە قەدەخەکراوەدا بە ڕوبەری 10 کیلۆمەتردا بڕوا، ئەوا توشی مەترسییەکی کوشندە دەبێ و دەخرێتە خوارەوە. ئەندازیارە ئیسرائیلییەکان چاڵێکی 25 مەتریان لە بیابان لێدا و دەزگایان تیادا چەسپاند. ئەو بەشە بەشێکی تابڵیی نهێنی و ئاڵۆز بوو بەناوی Machon-2. ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە کەرتەکان و کارگەکەی و ئەو بەشانە بوون کە لە فەڕەنساوە بە پشتی پاپۆڕەکان هێنرابوون؛ لەسەریشیان بە هێڵێکی درشت نوسرابوو دەزگاکانی ڕستن و چنین TEXTIELMACHINES.

لە ڕاستیدا مەڵبەندەکە لەوە بچوکتر بوو، کە چەکی ناوەکی دەست ئیسرائیل بخا. بۆ ئەو جۆرە بۆمبانە ماددەی کەرتکراوی چەشنی یۆرانیۆم Uranium

و پلوتۆنیۆمێکی Plutonium زۆری پێویست بوو. ئەو دەستەیەش کە خاوەنی هێزی ناوەکی بوون، هەمویان لەسەر ئەوە کۆک بوون، تەنانەت گرامێکیش لەو ماددانە نەدەنە هیچ کەسێکی بەدەرە لە یانەی خۆیان. مایەی سەرنج بوو، دەزگای دیمۆنا تا کانزا بڕەڕەکانی بۆ نەهات هیچ نەبوو، شتێکی جوان نەبێ.

سێ مانگان دوای دانانی ئەو مەڵبەندە، لە شاری ئاپۆلۆ Apollo ی ولایەتی پنسلڤانیاPennsylvania دا کارگەیەک کە لەسەر پاشماوەی کەلوپەلی ناوەکی لە شوێنی کارگەیەکی گەورەی تاواندنەوەی پۆڵای کاتی جەنگی جیهانیی دوهەمدا کرایەوە. ئەو کۆمپانیایە بەناوی نومێک Nucleair Materials and Equipment (Numec)بوو، بەڕێوبەرەکەشی د. سەلمان شاپیرۆ Salman Shapiro بوو.

لە بانکی زانیارییەکانی لاکامدا، کە دەربارەی هەمو ئەو جوە ئامریکیانەی پلەیەکی زانستیان هەبوو، ناوی شاپیرۆشی تێدابوو. ئەو یەکێک بوو لەجوە هەرە لەپێشەکان، کە کۆمەکی ئیسرائیلیان کردبوو. ئیتان زانی کە چارەیەکی بۆ دەزگای دیمۆنا دۆزیەوە تاکو کەلوپەلی سوتەمەنییەکەی بۆ دابینبکا، فەرمانیدەرکرد کە زانیاریی ورد لە سەر پاشخانی شاپیرۆ و تەواوی کارمەندانی کۆمپانیاکەی پەیدابکەن. فەرمانەکەش گەیشتە کاتساکانی ئامریکا بۆ جێبەجێکردن.

لەو کاتەی لێکۆڵینەوە لەسەر فەرمانەکەی بەردەوام بوو، ئیتان بیری لەگەرمەسێری بیابانی دیمۆنای بۆ رێڕەوە ساردەکانی کۆشکی سپی گواستەوە. لەنێو ئەو ڕاپۆرتانەی کاتساکانی ئامریکا بۆ تەلئەبیبیان ڕەوانەدەکردن، یاداشتنامەیەکی کۆمسیۆنی وزەی ناوەکی ئامریکی لە 20ی فێبرایری 1962 تێدا بوو. لەو یاداشتنامەیدا شاپیرۆ ڕاشکاوانە لە سزای هەر سەرپێچییەک لە پێوەرە ئاسایشپارێزەکانی قانوننامەی وزەی ئەتۆمی ساڵی 1954 و قانوننامەی تایبەتمەند بە کاری سیخوڕێتی ئاگادارکرابووەوە.

ئەو هەڕەشەیە هەستی ڕافی ئیتانی زیاتر لەسەر دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ دەستبەسەرداگەیشتنی پیشەسازی ناوەكی ئامریكی وروژاند. دواتر نۆمیك دەرچوو نەوەك هەر لە ڕوی ئاسایشپارێزییەوە پتەو نییە، بەڵكو لە چاو دەزگای چاوەدێری وزەی ناوەكی ئامریكی، ڕاگری حیساباتەكەی و بەڕێوبەرایەتییەكەشی زۆر لە مەرجەكانی پەیڕەونەكردون. لە ڕوانگەی ئەو خاڵە لاوازانەی نۆمیكدا، لاكام زیاتر مرخی خۆی لێخۆشكرد.

سەلمان شاپیرۆ كوڕی ڕابییەكی ئەرسەدۆكس بوو، بەهۆی زیرەكی گەیشتبووە ئەوپایە. لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵیدا لە زانكۆی Johns Hopkins دكتۆرای لە زانستی كیمیا بەدەستهێناوە. بەهۆی زیرەكی و زۆر كاركردنی هەر زو بووە كارمەندی تاقیگەی تۆژینەوە و پێشبردنی ناوەكی لە Westing houseی سەربە هێزی مارینزی ئامریكی، كە ڕاسپێردران پەرە بە هێزی ناوەكی (غەواسە) ژێردەریاییەكان بدەن. لە ئەنجامی گەڕان بەدوای زانیاری لەسەر خودی خۆی، ئەوە دەركەوت كە چەند خزمی ئەو ببوونە قوربانی هۆلۆكۆست، ئەویش بە نهێنی كۆمەكی یەك ملیۆن دۆلاری بە پەیمانگەی Techniom لە حەیفا كردووە. لەو پەیمانگایەدا خوێندكاران فێری زانستی ماتماتیك و جیۆلۆجی و دروستكردنیmachine دەكران.

لە 1957ەوە شاپیرۆ لەWestinghouse ەوە دەرچوو، ئەنجا نومیكی دامەزراند. ئەو كۆمپانیایە 25 پشكی هی كەسانێك بوون، بێ سێ و دوو بە ڕاشكاوانە هەواداری ئیسرائیل بوون. شاپیرۆ سەردەستەی ئەو گروپە بەڵێندەرە كەمانە بوو، كە ملی لە تیغ دەخشاند. لەگەڵ ئەوەشدا نومیك لەوەدا سەركەوت چەند گرێبەستێك لەسەر پیتاندنی یۆرانیۆم مۆربكات، ئەو پرۆسەیەش ئەوە لەگەڵ خۆی دێنێ، لە كاتی پیتاندنەكەدا بڕێك لە یۆرانیۆم دیارنەمێنێ. ئەوەش زۆر ئەستەم بوو بزانرێ ئەو بڕە بزربووەی یۆرانیۆم چی لێدێ یان بۆكوێ دەچێ؟. ئەو زانیاریانە وای لە ئیتان كرد، زۆر بە قوڵی بەدوایدابچێت كاتێ سەودا لەگەڵ قوربانی داهاتویدا دەكا.

ڕافی پەیوەندییەکانی ئامریکای لەگەڵ وڵاتەکەی زۆر بەقێزلێکراوی و بێواتایی بەرامبەر ویستی دەوڵەتی جولەکە بۆ پەرەپێدانی توانای هێزی ناوەکی دەدی. دواتر پەیوەندییەکان لە کاتی سەردانی بنگۆریۆن لە 1960دا بۆ واشنتۆن خراپتر بوون. لە هەندێک دانیشتندا لەگەڵ گەورە بەرپرسیارانی وەزارتی دەرەوەی ئامریکا پێیانگوترا، گەر ئیسرائیل چەکی ناوەکی وەگیربکەوێ، ئەوا هاوسەنگییە لەرزۆکەکەی هێز لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بە تەواوی لاسەنگ دەبێ. سەرۆک جۆن کەنەدیش John F.Kennedy لە فیبرایری 1961دا نامەیەکی بۆ بنگۆریۆن نوسیبوو، پیشنیازی کردووە جارێ وا باشە بەردەوام دەزگای دیمۆنا لە لایەن کۆمسیۆنی نێودەوڵەتی بۆ وزەی ناوەکییەوە بپشکنرێ.

بە شڵەژاویەوە بنگۆریۆن بۆ دیداری کەنەدی چووە نیۆیۆرک. لە میوانخانەی Waldorf-Astoria Hotel یەکدیان دیت. سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل خەمی زۆری لەسەر' فشارە سەرنجڕاکێشەکەی ئامریکا' خوارد. کەنەدیش بێبایەخ وەلامی دایەوە ' پێویستە چاودێرەکان بێن'. بنگۆریۆنیش تاپیشان بدا هێشتا بەڕیکوپێکی دەجوڵێتەوە، شل بوو. کاتێ بەرەوە ماڵ گەڕایەوە، هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە ' ڕۆمێکی کاسۆلیک بۆ ئیسرائیل لە کۆشکی سپی خراپە'. پاشان بنگۆریۆن ڕوی خۆی بە تەواوی کردە تاکە کەسێک لە پنتاگۆن کە جێی باوەڕ بوو، ئەویش ئەبراهام فێنبێرگ Abraha Feinbergبوو، کە زایۆنیستێک بوو تەواو لە پشتی خواستی ئیسرائیلەوە بوو بۆ دۆزی ناوەکیی.

فێنبێرگی قانونناس لە دایکبووی نیۆیۆرک بوو، گەورە کۆمەککاری پارتی دێموکرات بوو. ئەو نەیدەشاردەوە کە بۆچی بە ملیۆنان دۆلار کۆمەک بۆ پارتەکە پەیدادەکا، هەر دۆلارێک بەو مەبەستەیە تاکو پارتی دیموکرات مشوری پشتگرتنی ئیسرائیل لەکۆنگرێسدا بخوات. ئەو بە نهێنیشەوە چەندان ملیۆنی بۆ پرۆژەکەی دیمۆنا کۆکردبووەوە. ئەو پارەیەش لە ڕێگەی چەکی بێناو دەگەیشتە بانکی ئیسرائیل لە تەلئەبیب. بەمەش خۆیان لە لایەنی

کۆنترۆڵی گۆڕینەوەی پارەی بیانییەوە دەشاردەوە. بنگۆریۆن داوای لە فێنبەرگ کرد' ئەو پیاوە گەنجە بخەرە سەر ڕاستەڕێ، خەمی ئەوەش بخۆ کە ئەو واقعیش لە ژیاندا ببینێ'.

شێوازی ئیشکردنی فاینبێرگ پێچاوپێچی سیاسیانەی تێدا نەبوو، ڕاستەوخۆ دەستی بە گوشارەکانی کرد، بە جۆرێک کە لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردندا کەنەدی هەراسانکردبوو. لەوکاتەدا فاینبێرگ وتارەکەی خۆی بەو شێوەیە ڕاگەیاند" ئێمە ئامادەین خەرجییەکانی تۆ بدەین، بەڵام لەبەرامبەردا دەبێ سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستت بە بەرژەوەندی ئێمەوە پابەندبێ". کەنەدی ئەوکات بەڵێنیدابوو کە ' بە هەمو تواناوە یارمەتی ئیسرائیل بدا'. لەبەر ئەوە فاینبێرگ پێیگوت، کە ئامادەیە جارێ بۆ یەکەم هەڵمەتی خۆهەڵبژاردنی پێنج سەد هەزار دۆلار بدا ' دواتریش تەماشا دەکەین ئاخۆ زیاتری بەدوادابێ یان نا'.

ئێستاش هەمان ڕوبەڕوبوونەوەی سیاسیانە لەگۆڕێدایە ' گەر سەرۆک کەنەدی هەر پێداگرێ لەسەر پشکنینی مەڵبەندی ناوەکی دیمۆنا، با حیساب لەسەر پشتگیری دارایی جووەکان لە خۆهەڵبژاردنی دادێدا نەکا'. فاینبێرگ لە گۆشەیەکی چاوەڕواننەکراودا بە توندی پشتیگیرا. ڕۆبەرت ماکنمارا Robert S.McNamaraی وەزیری دەرەوەی سەرۆک کەنەدی بۆی ڕونکردەوە' زۆر باشە تێبگەین کە بۆچی ئیسرائیل بە پەرۆشەوەیە، چەکی ناوەکی هەبێ؟'.

لەگەڵ ئەوەشدا کەنەدی هەرپێی لەسەر پشکنین داگرت و ئیسرائیلیش ناچاربوو ڕازیبێ. سەرۆک لەدوا ساتدا، لەبەرامبەر ڕێگەدانی پشکێنەرانی بۆ دیمۆنا دەستبەرداری دو شت بوو، وڵاتە یەکگرتووەکان بڕیاریدا ڕۆکێتی هاوکHawk ی دژەئاسمانی بداتە ئیسرائیل. لەو سەردەمەدا پێشکەوتوترین سیستمی دژە ئاسمانی بوو لە جیهاندا. دوهەمیشیان، پشکنەرەکان مەرج نییە کارمەندەکانی کۆمسیۆنی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی بن، بەڵکو هەمو

دەستەکە ئامریکایی دەبن. هەروەها دەستەکەش پێشکات ئیسرائیل لە چوونەکەی ئاگاداردەکاتەوە.

ڕافی ئیتان بە ڕاپۆرتە پڕ وردەکارییەکە خۆشحاڵ بوو، کە چۆن ئیسرائیلییەکان دەستەی پشکنەریان لە خشتە بردووە.

لە سەروی مەڵبەندە ڕاستییەکەی دیمۆنا مەڵبەندێکی دیکەی ساختەیان پڕ لە کەرەسە لەیەکچوەکانی دیمۆنا بەشێوەیەک تەواو لە ڕاستی بچن، دروست کردبوو. ئەنجا وایان نیشاندا کە بەهۆی ئەو مەڵبەندەوە، کاتێ بە تەواوی بکەوێتەگەڕ، بیابانی نەقەب دەبوژێنێتەوە. ئەو بەشەی دیمۆناش کە ئاوی قورسیان لە نەرویج و فەڕەنساوە بەقاچاخ بۆ هێناوە، لەبەر هۆی ئاسایشپارێزی ڕێگەی پشکنەرەکانیان نەدا، چونکە تەنها قەبارەی ئاوە قورسەکە بەس بوو، تاکو پشکنەرەکان تێبگەن، دیمۆنا بۆ مەبەستی دیکە، وەک بەرهەمهێنانی یۆرانیۆمی پیتێنراو کە پێکهێنەرێکی چەکی ناوەکییە، بەکار دێ.

کاتێکیش پشکنەرە ئامریکاییەکان گەیشتن، ئیسرائیلییەکان هەناسەی ئۆخەیان هەڵکێشا، چونکە کەسیان زمانی عبریان نەدەزانی. ئەوەش وایکرد کە پشکنەرەکان دەرفەتی مەبەستە ڕاستەقینەکەی دیمۆنایان بۆ دەربکەوێ، بچوک بوو. ئێستا ئیدی دیکۆرەکە ئامادەیە بۆ چالاکییەکانی ڕافی ئیتان.

کرانەوەی دەروازەی کۆمپانیای نومیک Numec بۆ ئیسرائیلییەکان ئاسان بوو. لە واشنتۆن باڵوێزخانەی ئیسرائیل بە فەرمی داوای لەکۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی ئامریکاکرد، ڕێگە بە نێردەیەکی پسپۆڕانی ئیسرائیلی بدەن، سەردانێکی ئەو شوێنە بکەن، تاکو لە نزیکەوە ئاگاداری ڕاستی هۆشدارییەکان بن و لەمەودوا بە باشی مشوری ڕێنماییەکان بخۆن، بەتایبەتیش کە دەستەی پشکنەرەکان دیمۆنا دەپشکنێ. ئەو داوایەیان پەسەند کرا، هەرچەندەFBI ڕاستەوخۆ کەوتەگەڕان، ئاخۆ شاپیرۆ بۆتە سیخوڕێکی ئیسرائیلی یان نا.

ئاوهاش نەبوو، ئەو هەرگیز واش دەرنەچوو. ڕافی ئیتان کە زانی شاپیرۆ نیشتمانپەروەرێکی ڕاستەقینەیە، زایۆنیزمێکیشە بڕوای بەمافی ئیسڕائیل هەیە بۆ لەسەرخۆکردنەوە، زۆر دڵخۆش بوو. شاپیرۆ نەوەک هەر لە خانەوادەیەکی خواپێداو بوو، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش ئەو سەرمایەکەی بەهۆی وەبەرهێنانە بەجێکانی لە بۆرسەکان بێجگە لە قازانجی زۆری کۆمپانیای نومیک قەبە کردبوو .سەرەڕای ئەمەش شاپیرۆ لە جۆری پۆلارد نەبوو بۆ دڵسۆزی. ئەو ناپاکێک نەبوو، وەک هەموان دەیانزانی ئەو ئامریکای خۆشدەویست. ڕافی ئیتان لەوە تێگەیشت گەر هەوڵ بدرێ شاپیرۆ بهێنرێتە ڕیزی دەزگا، ئەوا کاردانەوەی پێچەوانە دەبێ. بۆیە دەبێ شاپیرۆ لەسەرەتاوە دوور بێ لە چالاکیەکانی ڕافی ئیتان، کەدەیەوەێ لە بوارەدا بیکا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارەکەیان لە سەرچڵیەوە بەدوور نەبوو. تاکو ئیتان شتی زیاترلەبارەی نومیکەوە بزانێ، دو پیاوی لاکامی ڕەوانەی ئەپۆللۆ Apolloکرد، Aryanham Hermoni وەک ڕاوێژکارێکی زانستی سەر بە باڵوێزخانەی ئیسڕائیل و Jerham Kafkafi کاستایەکی ئامریکی کە نوسەری بابەتی زانستی بوو لە چەندان گۆڤار.

هەردو پیاوەکەی لاکام بۆیان هەبوو، بەناو کۆمپانیاکەدا بگەڕێن، بەڵام بۆیان نەبوو وێنە بگرن. شاپیرۆ ئەوەشی گوت، ئەوکارە سەرپێچیەکی ڕێنماییەکانی کۆمسیۆنی ئامریکی بۆ کاروباری وزەی ئەتۆمییە. بەوشێوە شاپیرۆیان وەک پیاوێک کە ڕەفتاری لەدڵەوەڕا بکا، بەڵام لەهەمان کاتیشدا وەک هێرمۆنی ناوی دەبرد " پیاوێک بوو خەریکی بەرەوپێش ڕۆیشتن بوو".

ڕافی ئیتان هاتەسەر ئەو باوەڕەی کە کاتی هاتووە، خۆی سەرێکی ئاپۆللۆ بدا. ئەو گروپێکی پێکهێنا، لە پێکهاتەکانی گروپەکە دو زانای دیمۆنا، کە پسپۆڕ بوون لە بواری کارپێکردنی پاشماوەکانی سوتەمەنی ناوەکیی. ئەندامێکی دیکەی گروپەکەش لە ژێر ناوی بەڕێوبەری بەشی ئەلکترۆنیکا بوو لە زانستگای تەلئەبیب، کەچی لەڕاستیدا ئەو کارمەندە هەر بوونی نەبوو. ئەویش وەک لاکامی پسپۆڕ لە پاراستنی کەلوپەلەکان، ئەرکی ئەو

دۆزینەوەی ڕێگەیەک بوو تاکو بەهۆیەوە بتوانێ یۆرانیۆمی کارپێکراو لە کۆمپانیاکە بدزێ. ئەو گروپە هێرمۆنیشی تێدا بوو. ئەو دەبوایە خاڵە لاوازەکانی کۆمپانیاکە دەستنیشان بکا، چونکە پێشتریش چەندان جار سەردانی ئەوێی کردبوو. ڕافی ئیتانیش بەناوی خۆی وەک ڕاوێژکارێکی زانستی سەربە نوسینگەی سەرەک وەزیرانی ئیسرائیلیان لەگەڵدا هات.

نێردەکە لەلایەن باڵوێزخانەی ئامریکا لە تەلئەبیب ڕێگەدراون و ڤیزەیان وەرگرت. ئیتان تاقمەکەی لەوە ئاگادار کردەوە، کە لە ساتی یەکەمی دابەزینیان لە نیویۆرک لەلایەن FBI بەوردی چاودێری دەکرێن. بەڵام جێی سەرسوڕمان بوو کە بۆ ئەو پیاوە پڕئەزمونەش شوێنەواری چاودێری بەسەروەکردنیان نەدۆزیەوە.

گەیشتنی نێردەکەی لاکام هاوکات بوو لەگەڵ گەڕانەوەی شاپیرۆ لە گەشتەکەی تایبەت بە هێنانە ڕیزی ئەو زانا ئەمریکیانەی زانستگاکان، کە بەچاوی دۆستانە سەیری ئیسرائیلیان دەکرد، زاناکانی هاندا بەمەبەستی یارمەتیدانی سەردانی ئیسرائیل بکەن، بۆئەوەی ' کێشە زانستی و تەکنیکییەکانی بۆ چارەسەربکەن'. ئەو خەرجی هاتوچۆیان دەگرێتە ئەستۆ، تەنانەت پڕکردنەوەی موچەکانیشیان گەر لەماوەی سەردانەکەیان کەم بکا، قەرەبودەکاتەوە.

سەردانی ئیتان و تاقمەکەی بۆ ئاپۆللۆ زۆر بە کرپی و بێدەنگی بوو. ئەوان شوێنیان لە مۆتێلێک گرت و بەشی هەرە زۆری کاتیان بە سەردانی بەشی کارپێکردنی کۆمپانیاکە بەسەربرد. لەو بەشەدا بە پرۆسە ئاڵۆزەکەی گۆڕینی دۆخی هێکسافلۆرایدیۆرانیۆم uraniumhexafluoride بۆ پیتاندنی پلەبەرزی یۆرانیۆم ئاشنابوون. شاپیرۆ بۆی ڕونکردنەوە کە کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی سزای قورسی بەسەر نومیک داناوە گەربێت و چەندایەتی ئورانیۆمە پیتێنراوەکەیان بۆ ئاشکرا نەکا، هەر گرامێک 10 دۆلار یان هەر پۆندێکیش 4500 دۆلار.

ئیتان و سیخوڕەکانی چۆن بەبێدەنگێ هاتن ئاواش بەکرپی گەڕانەوە .

ئەوەی بەدوایدا هات، تەنها لە ڕاپۆرتەکانی FBI دەردەکەوێ، بەڵام ئەوانیش هەندێ پرسی لابەلایان وەڵام نەداوەتەوە. وەک ئەو پرسەی تاچەند شاپیرۆ هەستی بە مەبەستە لە دواوەکانی سەردانی ئیتان و تاقمەکەی کردووە. لە ڕاپۆرتێکیFBI دا هاتووە" تەنها دوای مانگێک لەسەردانەکەی تاقمەکەی ئیتان، نومیک دەستی هاوکاری لەگەڵ ئیسرائیل تێکەڵکرد، بەوەی بەیەکەوە کۆمپانیایەک دابنێن لە شێوازی لویس پاستۆر بۆ کەلوپەلی خواردن و دەرمان لە ڕێگای تیشکەوە".

هەروەها لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا ئاگادارینامەیەک هاتووە" هەر کانتینەیەک کە دەنێردرێتە ئیسرائیل هۆشدارییەکە بۆخۆی، چونکە ئەگەری کەرەستەی رادیۆئەکتیڤی تێدایە، کەسیش ئامادەنییە ئەو کانتینانە بکاتەوە و بپشکنێ، هەروەها کەسیش ئامادەنییە ئەو کارەمان بۆ بکا".

هۆی نەپشکنینەکەش لە باڵوێزخانەی ئیسرائیلییەوە بوو، چونکە باڵوێزخانە ئاگاداری وەزارەتی دەرەوەی ئامریکای کردبوو، هەر هەوڵی پشکنینی ئەو کانتینانە بدرێ، ئەوا باڵوێزخانە باری حەسانەی دیپلۆماتی دەداتە ئەو کەلوپەلانە. وەزارەتی دەرەوەش ئاگاداری دەزگا پەیوەندیدارەکانی کردەوە، بەوەی هەر هەوڵێکی پشکنین قەیرانێکی دیپلۆماتی لێدەکەوێتەوە. تاکە شتی بێئومێدی FBI کە بیکات ئەوەبوو، بۆی هەبوو سەیری کانتینەکان بکا لە فڕۆکەخانەی Idlewart Airport کاتێ لە فڕۆکەی بارهەڵگری ئەلعال باردەکران.

سەرەڕای ئەو بارگرژییەش، سەرۆکی نوسینگەی سیا لە تەلئەبیب، جۆن هادن John Hadden ئامادەنەبوو بیسەلمێنی کە دوا هەواری کەنتینەکان دیمۆنایە. FBI لە ماوەی شەش مانگی دوای سەردانەکەی ئیتان و تاقمەکەی ئاماژەی بە شەش جار باری وای کردوە. ئەوان تێبینی ئەوەیان کردبوو، کە کەنتینەکان لە ئێوارە تەسلیم دەکران و لە کازیوەی بەیانیشدا بەرەو ئیسرائیل باردەکران. بارەکەش بە قورقوشم پێچرابوو وەک ئەوەی بۆ یۆرانیۆمی پیتێندراو دەکرێ. لەهەر کەنتینێکیش بە زمانی عبری نوسرابوو'

کەنتینەکە بۆ حەیفا دەچێ'. چەند جارێک FBI ئەوەی دەدی کە لەسەر شۆستەی بارکردنی نومیک بۆ کەنتینەکان فڕنی سالامەندریان دانابوو – کەنتینەی تایبەت بۆ یۆرانیۆمی پیتێنراو- . هەر سالامەندەرێکیش ژمارەی تایبەتی خۆی هەبوو، ئەوەش واتای ئەوەبوو کە لە حەشارگەیەکی زۆر ئاسایشپارێز دەرهاتون. لە یاداشتنامەیەکیFBI دا هاتووە' فشاری وەزارەتی دەرەوەیان لەسەر دەستتێوەرنەدان لەسەر هەبووە، تاکو هیچ ڕوداوێکی دیپلۆماتی لێنەکەوتێتەوە'.

دوای دە مانگان لەهیکەوە ناردنی بارەکان وەستا. FBI ئەو گریمانەیەی لادروست بوو، کە دیمۆنا ئێستا بەشی خۆی لەیۆرانیۆمی پیتێنراو پەیداکردووە. دوای ماوەیەک لێکۆڵینەوە لەگەڵ شاپیرۆ لەلایەن FBI یەوە، ئەوەی نەسەلماند کەهیچ جۆرە ماددەیەکی دابێتە ئیسرائیل بۆ چەکی ناوەکی بەکار بێ. لە ئەنجامی کۆنترۆڵکردنی دەفتەرەکانی نومیک، دیاربوو درزێک هەیە. ڕاگەیاندەکەشی دەربارەی بڕە یۆرانیۆمی دیار نەماو، ئەوەبو' ڕونکردنەوەیەکی لۆژیکییە ئەو بڕەی دیار نەماوە فڕێمان داوەتە ژێر زەوی، یان بووەتە هەڵم'. ئەو درزەی دۆکیمێنتەکانی نومیک بریتی بوو لە 90 کیلۆ یۆرانیۆم، شاپیرۆش هەرگیز لەسەر ئەوە وەک تاوانبار سەیرنەدەکرا.

ساڵەکانی دواتر، دوای لەباریەکهەڵوەشانی یەکێتی شۆرەوی، ئیتان بیری کردەوە کە بەدەستهێنان و دزینی یۆرانیۆم چەند ئاسانە. ئەوەشی لە ڕوداوی 10ی ئابی 1994 لە فڕۆکەخانەی Sheremeteyevo ی مۆسکۆوە بەباشی بۆ دەرکەوت.

لەو ڕۆژەدا لە سعات 12.45 خولەکدا جوستیانۆ تۆرێس Justiano Torresبەخۆ و قاتێکی خەمناکی بۆرە کە تایبەت بۆ ئەوگەشتەی کڕیبوو، تاکو لەگەشتی فڕینی ژمارە3369 لە لوفتهانزا Lufthansa بەرەو مونشن بفڕێ. هەرچەندە خۆی بەهێزبوو، بەڵام لەبن قورسایی ئەو جانتا پێست رەشەی هەڵیگرتبوو، ئارەقەی کردبوو. ئەو بە پێکەنینەوە بلیتی کڵاسی یەکەمی نیشانی کارمەندی پشکنینی فڕۆکەکە دا . پێکەنینەکەی بەو کامیرا

نهێنییەی پشت مێزەکەوە تۆمار کرابوو، چونکە مەبەستیان بوو ڕەفتاری گەشتیارەکان بزانن.

مانگەکانی پێشتر چەندان کامیرا بەدزیەوە وێنەیان گرتووە. بۆیان دەرکەوت کە چاوپێکەوتنی زۆری لەگەڵ زانای ناڕازی بواری ناوەکی روسیادا ئیگۆر تاشانکا IgorTashanka هەبووە. بەیەکەوە گەشتێکیان بە بەلەم لەسەر ڕووباری مۆسکادا کردبوو، بەیەکەوە لە چێشتخانەیەکی ڕوسی بە پارێزگاری مافیاوە نانیاندەخوارد، تا گەیشتە ئەو یەکدیدتنەیان کە تاشانکا هەگبەکەی بداتێ، ئەویش زەرفێک بوو کە تەنها 5000 دۆلاری تێدا بوو، دایە دەستی، ئیدی تۆرێس وایدەزانی کارێکی گۆڕینەوەی سەرکەوتوی ئەنجامداوە. هەگبەکە یۆرانیۆمی تێدا بوو.

جوستیانۆ تۆرێس تەتەرێکی کۆلۆمبۆی کارتێلی ماددە بێهۆشکەرەکان بوو، بازنەی جموجۆڵەکانی بۆ بازاڕێکی کوشندەتر فروانکردبوو. ئەو جانتایەی دەستی جوستیانۆ لە ناو پاکەتی قایمکراو دوسەد گرام پلاتۆنیۆمی 239ی تێدا بوو، کە تاشانکا تەسلیمی کردبوو. نرخی ئەوبڕە پلۆتۆنیۆمە 50 ملیۆن دۆلار بوو. پلۆتۆنیۆم وا کوشندە و بکوژ بوو تەنانەت دەستپێکەوتنی وردیلەیەکی میکرۆسکۆئاساش بەسبوو بۆ کوشتنی کەسێک. ناوەڕۆکی جانتاکە بەس بوو بۆ دروستکردنی بۆمبێکی بچکۆلانەی ناوەکی.

لەچاوی ئوری ساگوی Uri Saguy سەرۆکی پێشوی دەزگای هەواڵگری سەربازی ئیسرائیل، مایەی نیگەرانی و هەژانێکی زۆرە، مایەی کارەساتە کە باندێکی تیرۆرستی ئەوەندە یۆرانیۆمی هەبێ شارێکی وەک تەلئەبیب یان هەر شارێکی دیکەی پێوێرانبکا. ئەرکی هەمو دەزگایەکی هەواڵگرییە، بەرەنگاری ئەو باندانە ببێتەوە.

لەمێژبوو دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل دەیزانی، کە تیرۆرستان دەتوانن بۆمبی سەرەتایی ناوەکی پەیدا بکەن. چەند ساڵێک دەبێ خوێندکارێکی فیزیا لە ئامریکا هەمو هەنگاوە پێویستەکانی دروستکردنی ئەو چەکەی وێنا

کردبوون. نوسینە بڵاوکراوەکانی وردەکارییەکانی هەمو لایەکی بەتایبەتیش مۆسادی وروژاند.

ئیدی سەرباری بڵاو بوونەوەی هەواڵی لەو جۆرە چەندان سیناریۆ دەهاتنەپێش. دەکرێ یەکبەیەکی بەشەکانی ئەو کەلوپەلانە لەسەر پشتی کەشتی باربکرێن و لە سنور ئاودیو بکرێن و بگەیەنرێنە ئیسرائیل، لەوێ کۆبکرێنەوە. چەکی ناوەکی گەر مەرجی خۆی بۆ دابینبکەی لە دوریشەوە کاری پێدەکرێ. ئایا حکومەت مەحکەم لەسەر قاچەکانی خۆی وەستاوە؟ توێژەرەوەکانی مۆساد گەیشتنە دەرەنجامێک کە نابێ دانیپێدابنرێ. ئەو چاوەڕوانیکردنە لە مێشکی گەورە تیرۆرستانی ئەوکات خولی دەخوارد' لە ساڵەکانی حەفتاشدا هەندێ لە توندڕەوەکان هەوڵی بەگیرکەوتنی بۆمبی ناوەکیاندا تا لە شوێنێک بیتەقێننەوە و نرخی سیاسی پێ وەربگرن، بەڵام ئەوان لەخودی ئەو نەتەوەیەی گرتبویانە خۆ، دەرپەڕێنران'.

لەباریەکهەڵوەشانەوەی یەکێتیی شۆرەوی ترس و نیگەرانییەکانی مۆسادی زیندووکردنەوە، چونکە مەیدانێکی زۆری نائارامی پەیدا ببوو. کەس لەوە مسۆگەر نەبوو کە بارودۆخەکە لە ڕوسیا چۆن بەرەو پێشەوە دەڕوا. مۆساد ئەوکات زو زانی، ڕۆکێتی سکود Scud دەستکردی یەکێتیی شۆرەوی بە پارە دەنێردرانە وڵاتە جیاجیاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. زاناکانی شۆرەوی یارمەتی جەزائیریان دا بۆ بەدەستهێنانی دەزگایەکی ناوەکی. ڕوسیا جبەخانەیەکی قەبەی چەکە بایەلۆژییەکانی وەک میکرۆبی نەخۆشی کوشندە هەبوو کە بێ سێودو بە ملیۆنان خەڵکیان دەکوشت. جا گەر وایدابنێی بەشێکی بچوکی ئەو ماددانە دەست تیرۆرستان بکەوێ، چی بەسەر دێ؟ شوشەیەک لەو میکرۆبە کوشندانە بەسە بۆ لەناوبردنی خەڵکی شارێکی وەک تەلئەبیب. بە ڕاستی ترسی گەورە لەوەدا بوو، ڕوسیا ئامادە بێ بەشێک لە جبەخانەی ناوەکی خۆی بفرۆشی . بەگوێرەی ئوری ساگوی ئەو مەترسییە هی ئەوە نییە، کەس پشتگوێی بخا.

پسیکۆلۆژەکانی مۆساد کەوتنە خۆ بۆ لێکۆڵینەوەی باری پسیکۆلۆژیکی زانا ناوەکییە ڕوسییەکان، ئایا ئامادەن ئەو جۆرە کەلوپەلانە بدەنە کەس؟ ئایا مەبەستیشیان لە تەسلیمکردنی ئەو جۆرە کەلوپەلانە چییە؟ بێگومان لەنێویاندا هەیە، کارەکە بۆ پارە بکا، تێشیاندا هەیە بیرکردنەوەی ئاڵۆزترە و هۆی ئایدیۆلۆژی پاڵی پێوەدەنێ ئەو کارەبکا. لیستی ئەو شوێنانەی کە ئەو کەلوپەلە مەترسیدارەی تێدایە و ئەگەری دزەکردنی هەیە، بە سەرسوڕمانەوە درێژ بوو. بەڕێوەبەری گشتی ئەوکاتی مۆساد شاباتی شاڤیت Shabati Shavit بە مەبەستی دزەکردنە نێو کۆمەڵگەی ئەو جۆرە چالاکانە، دو کاتسای ڕەوانەی ئەویندەرێ کردن.

لەیلا Lila یەکێ لەو کاتسایانە بوو. ئەو لە دایک و باوکێکی جوو لە بەیروت لەدایکببوو. ئەو خانمە بەشی فیزیای لە زانستگای عبری ئۆرشەلیم تەواوکردبوو، کاری بۆ بەشی زانستی زانیارییەکانی مۆساد دەکرد. ئەو گەواهیدەر بوو بەسەر پەیوەندییەکانی تۆرێس و تاشانکا و پلانی گواستنەوەی پارە و کەلوپەلەکانیان.

لەیلاو هاوڕێکەی بەیەکەوە لەگەڵ ئاژانەکانی مۆساد لە ئاڵمان و شوێنانی دیکەش کاریان بەیەکەوە کردبوو. بەدواداگەڕان و شوێنپێهەڵگرتن لەیلای بۆ کۆلۆمبیا نارد، لەوێشەوە بەرەو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. کاتساکانی دیکەش کارەکانی چاودێری خۆیان لە قاهیرە، دیمەشق و بەغدا دەدی. لەو هەمو شوێنانەوە ئاماژە و سەرەداوی نوێ دەرکەوتن، ئەوە دەرکەوت کە بۆسنیا وەک وێستگەیک وایە بۆ ئاودیوکردنی پلۆتۆنیۆمی 239 تاکو بگاتە عێراق. ئەوەش جاری یەکەم نییە کە زەحمەتی ئەوە هەبێ دەستی ڕژێمی عێراقی پێوە ئاشکرا بێ.

هەر ئەوەش وایکرد تۆرێس بە خۆی و جانتا بکوژەکەی لە ڕیزی گەشتکارەکان، بێ سەرنجراکێشان بوەستێ، ئەنجا سوار بێ. بڕیاری ئاگاداربوونەوە ئەوکاتە درا کە سەرانی دەزگا نهێنییەکانی ڕوسی و ئاڵمانی هۆشداریاندا. ئەوان مەزندەیان کرد، کە پلاتۆنیۆم وا بپەسترێ و زۆر بچوک

بکرێتـەوە. هـەردوو حکومەتەکـە رێگەیانـدا، تـاکو تـۆرێس بخەنـە داوەوە، بیانگەیەنێتـە لای ئـەو لایەنـە کڕیـارەی ماددەکـە. ئیسـڕائیلیان لـەو پێشـهاتە ئاگادار نەکردبووەوە. ئەو بەیەکەوە هاوکاریکردنە بە فەرمی لە نێو ڕوسیا و ئاڵماندا بوو، بەڵام لەپێشودا مۆساد لە زیاتر لەیەک بارودۆخی ئاوادا بەشدار بوو، بۆیە بێدەنگ بوو، لەوکاتەی هەندێ دەزگای دیکە چالاکیەکەیان بەناوی خۆیان هەڵدا.

لەیلا لەو بەیانییـەی ئابدا لـە شـوێنێک خـۆی حەشـار دابـوو کـە دەروازەی هەمو هۆڵەکانی لێوەدیار بوون، ئیدی زانی کـە ڕۆڵـی ئـەو لێرەدا تـەواوبوو، کاتسـایەکی دیکـە بـەناوی Adler لەیـەکێ لـە هۆڵـەکانی میوانخانـەی Excelsior Hotel لە مونشن، چاوەڕێیدەکرد تا تۆرێس جانتاکەی تەسلیم بکا. پیاوێکی دیکـەیان لـە فرۆکەخانـەی مونشـن چاوەڕێی گەیشـتنی فڕینـی ژمارە 3369ی دەکرد.

پۆلیســیکی دیکــەیانIb دوریــز لەپشــتی تۆرێســەوە جێــی گرتبــوو، لەوکاتـەی فڕۆکەکـە سـێ سـعاتی گەشـتی خـۆی بـەرەو ڕۆژئـاوا دەفـڕێ. لەلایـەکی دیکـە لـە ناوەڕاسـتەوە لـە تەنیشـت تـۆرێس ڤیکتـۆر سـیدۆرنێکۆ Viktor Sidorenko جێگری وەزیری وزەی ناوەکی ڕوسی دانیشـتبوو. ئەویش بەرپرسیار بوو لە پاراستنی جبەخانەی کەرستە ناوەکییەکان. ڕوسیا سەد و سی تەن یۆرانیۆمی پیتێنراوی هەبوو. ئەو بڕە بەشـی شـانزە هـەزار بۆمبی نـاوەکی دەکـرد، کـە هـەر یەکـەیان دوجـار هێـزی کاولکـاری بەقـەد بۆمبەکەی سەر هیرۆشیمای هەبوو.

سیدۆرنیکۆ هەندێ ڕاپۆرتی وروژێنەری لەبەردەستدابوون، لەمەڕ نەبوونی کۆنترۆڵێکی توند و ورەنەمانی کارمەندانی سەدان مەڵبەندی تۆژینەوەی توانا ناوەکییەکان. مانگێک پێشتر کرێکارێکیان گرتبوو بە خۆی و جانتاکەیەوە، پڕ بوو لە تۆپە یۆرانیۆم. کرێکـاری دیکـەی ئێشـکگری کارگەیـەکی نـاوەکی لـە مینسک Minsk پێنج کیلۆگرام یۆرانیۆمیان بردەوە ماڵ و شاردیانەوە. ئـەو دزیانەش لەوکاتەوە دەرکەوتن کە یەکێکیان کیلۆیەک لەماددەکەی بە بیست

بوتڵ ڤۆدگا فرۆشـتبوو. ئێسـتاش جێگری وەزیـر بۆیـە دەچێتـە ئاڵمـان تـا ڕاوێژکارەکەی هێلمۆت کۆل Helmut Kohl و حکومەتەکەی دڵنیا بکاتەوە، چیدی لەو جۆرە کارانە ڕونادەنەوە. ئاخر پیشتر ئاڵمان گەفی سزای ئابوری لێکردبوو.

لە کاتی خۆی شەش و چارەگێک فڕینی ژمارە 3369 لـە شـەقامی فرانس یوسفی فڕۆکەخانەکەوە بۆ تەرمینالی C ڕۆیشت. یەکەمین کەس فڕۆکەکەی جێهێشت، سیدۆرنیکۆی جەنابی جێگری وەزیر بوو. ئەو سواری ئۆتۆمبێلێک کرا کە پێشوەخت ئامادەکرابوو، برایە شوێنێکی چاودێری چڕ لە باڵەخانەکە. لەوێ پێیگوترا کە تاشانکا لە مۆسکۆ گیراوە.

پاشان یاغر یاغر تۆرێس بەرەو هۆڵی گەیشتن هات. پۆلیسە پڕ چەکەکان، ئـەویان سـەرسـام نـەکرد، چونکـە لـە دوای تەقاندنـەوەی نێردەی ئۆلـۆمپی ئیسرائیل، پۆلیس بەو شێوە لە فڕۆکەخانەکان دەبینـران. تۆرێس زەنگی بۆ میوانخانەی Excelsior لێدا، لەوێشەوە پەیوەندییەکـەی بـەژوری ژمـارە23 بەسـترایەوە. لـەوێ کابرایـەکی ئیسـپانی بـەناویJavier Arratibel، کـە پاسـپۆرتەکەی پیشەسـازوانی نیشـاندەدا، چـاوەڕێی تۆرێسـی دەکـرد. لـە ڕاستیشدا ئەو کەسی نێوانکاری گواستنەوەی یۆرانیۆمەکە بوو. ئەویش لەلای خۆیەوە زەنگی بۆ کەسێک لێدا کەهەر ئەوەندەی دەزانی ناویJulio O یە.

پۆلیسی دژەجاسوسی ئاڵمانی گوێی لە تەلەفۆنەکان هەڵخستبوو. لەوکاتەی تۆرێس بەرەو ڕێرەوی جانتا هەڵگرەکان چـوو، هـەڵی بگـرێ، لـە نوسـینگەی هۆڵی گەیشـتن لەلایـەن بەرپرسـی پشـکنەران Wolfgang Stophasiosی پۆلیسی شارەوانی مونشـن و سـەرۆکی ئەفسـەرانی هـەواڵگری ناوچەکـە بـە وردی چاودێریدەکرا.

تۆرێس بێ ئەوەی هیچ ئاشکرا بکا دەسـتیدایە جانتاکـەی، بـەرەو ڕێـرەی دەرچوون ڕۆیشـت. ئیب و مۆرت بەدوایداچوون، لـەوە زیـاتر نەیانـدەتوانی هیچ بکـەن. ئـەوان لێرە هـیچ دەسـەڵاتێکی گرتنیـان نـەبوو. ستۆفاسـیۆس لـە نوسینگەکەی هاتە دەرەوە، ئەمەش نیشانەی دەستبەکاربوون بوو.

لـە مـاوەی چەنـد چرکەیەکـدا ئابڵوقـەی تـۆڕێس درا و بـردرا. جانتاکـەش ڕەوانـەی ژورێکی دیکە کرا. لـەوێ یـەکێ بـە دەسـتەوانەی سـپی و بـەرگی بەرگریدارەوە بە هاوکاری دو پسپۆڕی تەقینەوەی یۆرانیۆم چاوەڕێیاندەکرد. ئەوان کورسییەکی وێنەگریان بۆ جانتاکە دانا، تاکو بزانن بۆمبی لێبەستراوی پێوەیە یان نا. بۆیان دەرکەوت بۆمبی لێنەبەستراوە. ئاماژەی کورسییەکە خێراتر لە ئاسایی خۆی لێنەدا. ئەوسا جانتاکەیان کردەوە. لەناو جانتاکە و لە پاکێتی پلاستیکدا بلۆکی پلۆتینیۆمی 239ی تێدا بوو. ئەوان پاکەتەکەیان لـە ناو جانتاکە دەرهێنا و خستیانە سندوقێکی تایبەتی بـە دژە بۆمب، خستیانە ئۆتـۆمبێلێکی قەڵغاندار، ئەویش ماددەکەی بەرەو مەڵبەندی وزەی نـاوەکی ئاڵمان برد.

هەر لەوێ Arratib لە میوانخانەکەدا گیرا، بەڵام کەسی سێهەم بە ناوی Julio Oنەگیراو بەرەو هەنگاریا تێیتەقاند. پۆلیسی هەنگاریاش گوتی، ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین. لە مونشن کەس باوەڕی بەو قسەیە نەکرد، چونکە هەنگاریا بە دەروازە وێستگەی ڕۆژئاوا لەسەر تاوانبارانی ڕوسیا ناسرا بوو.

پیاوەکانی مۆساد ڕاپۆرتی خۆیان بۆ مۆساد لەسەر ڕەوتی پێشهاتەکە نوسی. بەڕێوبەری گشتی شاباتی شاڤیت ئەو دەرەنجامەی بە سەرکەوتنێک لە نێو دەریایەک زۆرانبازی دژی تیرۆرزمە ناوەکییەکان لێکدەدایەوە. هەر ئەو نەبوو بە تەنها ئەو پرسەی لەخۆیدەکرد، تۆ بڵێی چەند هەگبەی دیکەی وا ڕۆیشتبن و ئاشکرا نەکرابن؟ چەندی دەوێ تا ئەو گەفەی تیرۆری ناوەکی ببێتە ڕاستی؟

هەر تەنها کیلۆمەترێک دوور لەو شوێنەی شاڤیت بە قوڵی لە مەسەلەکەی دەکۆڵیەوە، ڕافی ئێتان ئەوپیاوەی لە پشت ئەو پرسە بوو، بە گوێرەی FBIو CIA کە دزی لە یۆرانیۆمی پیتێنراو لە کۆمپانیای نومیک لە ئاپۆلۆ کراوە، کاتی پشوی خۆی بە هەڵکۆڵینی پەیکەر لەئاسن و برونز بەسەر دەبرد. بە ڕواڵەت ئەو لەگەڵ جیهاندا ئاشتبۆتەوە، بەڵام یادەوەرییەکانی لەگەڵ چالاکی پۆلارد و نومیک لێڵاوی ببوون، پاش ناچارکردنیش گوتی من

هیچم لەبارەی ئەو دۆزانەوە لەبیر نییە. لاکام بە فەرمی هەڵگیراو نەما. ڕافی وا وەسفی کاری ئێستای کرد، کە وەک جاری جارانە: ئەو بەڕێوبەری کەشتیوانیەکی بچوکە لە هاڤانا Havana، بەڵام ئەو ئارەزوی لە کۆمپانیایەکە بە هۆیەوە مادە لەناوبەرەکان بۆ کشتوکاڵ و باخچەوانی بەرهەم بهێنێ. ئەو پێی لەوەنا کە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ فیدل کاسترۆدا هەیە، وەک ئەو گوتەنی ' ئەمریکییەکان بەو پەیوەندییە خۆشحاڵ نین'. ئەو گوتی من گوێم لێنییە و باکیشم پێی نییە، بە تایبەتی گەر بیانەوێ پرسیارگەلێکیان لەمەڕ پۆلارد و سەردانەکەم بۆ نومیک لە ئەپۆلۆ لێ بپرسن.

لە پڕێکەوە لە ئەپریلی 1997دا ناوی ڕافی ئیتان بەهۆی پابەندبوونی بە ئاشکرابوونی پیاوێکی مۆساد لەلایەن FBI لەواشنتۆنەوە لەژێر نازناوی مێگا Megaدەرکەوتەوە.

سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی مۆساد بۆ ئیتانی باسکردبوو، کە FBI لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە دەکا، ئاخۆ مێگا بوو ڕێنمایی پۆلاردی دەکرد. ڕەنگبێ مێگا ئەو سەرچاوە بێ کە کەلوپەلە زۆر نهێنییەکانی پۆلارد لەڕێیەوە بەرەو ئیسرائیل دەڕۆیشتن. لە ژێر فشاردا پۆلارد لە زیندان دانیبەوەدانا بە هۆی کلیلەکۆدەکەی ئەویش نەدەتوانرا دەست بەسەر هەندی دۆکیۆمەنت ڕابگا کە پیاوی مۆساد یوسف داوای لێدەکرد FBI. دەیزانی ئەوجۆرە بەڵگەنامانە کلیلەکۆدەیەکی تایبەتیان هەیە، تەنها لای ئەویش هەیە، کە دەیەوێ بیبینێ. ئەوکۆدانەش زوبەزو دەگۆڕدران، هەندێ جاریش هەمو ڕۆژێک دەگۆڕدران. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یوسف لەماوەی سعاتێکدا دەیزانی چ جۆرە کۆدەیەک بداتە پۆلارد بۆ دەرهێنانی بەڵگەنامەکان. ئایا مێگا ئەو سەرچاوەیە بووە؟ ئایا ئەو، ئەو دووەم جاسوسەی ئیسرائیلییە بووە، لە واشنتۆن دەمێکە FBI بەدوایدا دەگەڕێ؟ ئایا تاچەند ئەو کەسە لە ڕافی ئیتانەوە نزیک بووە؟.

ئەو جۆرە پرسە مەترسیدارانە لە واشنتۆندا دەکران. پرسەکانیش هی ئەوەبوون نێوانی واشنتۆن و تەلئەبیب زیاندار بکەن.

دوای ئەوەی FBI دەمامکی لەسەر ئەوە هەڵدایەوە کە ئیتان لەپشت پۆلاردەوەیە، ئیدی ئیتان تێگەیشت کە کاتی ئەو بە تەواوی لەگەڵ دەزگای هەواڵگریی ئیسرائیل تەواوبووە. ئەویش دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە، کە دوا ڕۆژەکانی ژیانی وا کۆتایی پێدێن کە بە سەرچڵییەکانیەوە نەسوتێن وەک سوتێنەری لەحیمی کۆگاکەی لەماڵەوە.

ئەو لەخۆیەوە زانی پێشهاتەکانی واشنتۆن مەترسی دەنوێنن، بەڵام نەوەک مەترسی تەنها بۆ سەرخۆی، چونکە ڕەنگبێ هەمیشە ئەو دەرفەتە هەبێ کە سیا تیپێک بنێرێتە کوباو بیرفێنن، بەڵام دوای ئەوە چی دەبێ؟ ئەوە کەس پێشبینی نەدەکرد. دەمامک هەڵدانەوە لەسەر مێگا زۆر وروژێنەر و مەترسیش دەبێ لەسەر سەرانی دەزگا نهێنییەکانی ئیسرائیل، بەتایبەتیش Vaadat Rashei Hesherytinکۆمیتەی سەرانی دەزگاکان، چونکە سەرەک وەزیران ئەرکی ڕێکخستنی بوارەکانی جاسوسی و دژە جاسوسی لەناوە و دەرەوەی وڵاتی پێ سپاردبوون.

تەنانەت ئەوانیش مێگا و کارەکانیان نەدەناسی. تەنها شتێکیان پێگوترابێ، ئەوە بوو کە مێگا پۆستێکی باڵای لە حکومەتی کلنتندا هەیە. بەڵام ئەوە زۆر بە نهێنی مایەوە، ئایا ئەوە لە حکومەتی سەرۆک بوشەوە بە میرات بۆ حکومەتی کلنتن ماوەتەوە. بە تەنها بەڕێوبەری گشتیی مۆسادی سەرکار مێمۆنا Memoena ( میمۆنا بە عیبری ناونیشانی بەڕێوبەری گشتیی مۆسادە) دەیزانی، ئاخۆ مێگا لەکەیەوە دەستبەکارە.

ئەندامانی کۆمیتەکە زانیان کە دەستەی دژە تیرۆری FBI گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامە، کەموکورتیان سەبارەت بە نەکردنی کارێک دژ بە مۆساد دەگەڕێتەوە بۆ فشاری لۆبی جولەکە لەسەر واشنتۆن، حکومەتە یەک بە دوای یەکەکانی واشنتۆنیش نایانەوێ ڕووبەڕوی ئیسرائیل ببنەوە. ئەو لۆبیە داوای لێدەکرێ، ئەمجارەیان ئەو ئاگرە لەوەتەی دەمامک لەسەر مێگا لەلایەن FBIهەڵدراوەتەوە، بیکوژێنێتەوە. لە 16ی فێبریوەری 1997دا نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەیی (NASA) کۆنوسێکی دایە FBI کە قسەی تەلەفۆنی ئەو

ئێوارەیەی نێوان پیاوێکی مۆساد و باڵویزخانەکەیان تێدا بوو، بە دڵنیاییەوە ئەو دۆڤDOVە، کە گەورە بەرپرسێکە لە تەلئەبیب، تائێستا ناوەکەی نەهاتووە.

دۆڤ ڕاوێژی دەویست، دەیویست بزانێ ئایا دەکرێ مێگا ڕابسپێردرێ دانەیەکی کۆپیکراوی نامەی وارن کریستۆفەر Waren Christopherی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئامریکا بۆ یاسر عەرەفاتی سەرۆکی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستین، بۆ بنێری. نامەکە چەندان برگەی گرەنتی کریستۆفەری بۆ عەرەفات تێدا بوون. تیایدا هاتبوو کە هێزەکانی ئیسرائیل لە شاری هیبرۆن Hibron ی کەرتی ڕۆژئاوای سەر سنوری ئوردن بکشێتەوە. دەنگەکەی ئەودیوی تەلەفۆن لە ئیسرائیلەوە گوتی، نامەکە لەبیرکە، ئێمە مێگامان بۆئەو کارە لەوێ نەچاندووە.

ئەو کورتە تەلەفۆنە، یەکەمین ئاماژەبوو بۆ بایەخدان بە مێگا. ئەو کۆدەیە پێشتر هەرگیز لای FBI نەبیسترا بوو، هەرچەندە باڵوێزخانەی ئیسرائیل و دیپلۆماتەکانیان بیست و چوار سعات چاودێریدەکران. FBI کەوتە گەڕ بۆ سۆراخکردنی مێگا. سیستمێکی کۆمپیوتەری بەرفراوان و وردی بۆ ئەوکارە بەگەڕخست، لەوەدا سەرکەوت کە ناسنامەی مێگا بگەیەنێتە کەسێک کە لەگەڵ FBI ئیشدەکا، یاخود ڕێگەپێدراوە لەگەڵ گەورە بەرپرسانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی NCS بێ، ئەو ئۆرگانەی ڕاوێژکاری سەرۆکە بۆ کاروباری هەواڵگری و هەڕەشەکانی سەر وڵات. ئەندامانی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی پێکهاتوون لە جێگری سەرۆک و وەزیرەکانی دەرەوە و بەرگری و بەڕێوبەری گشتیی سیا و سەرۆکی گشتیی هێزەکان و ئەوانەش ڕۆڵی ڕاویژکار دەبینن. ڕێکخەری ئەو ئۆرگانەش لە لایەن سەرۆک وەک ڕاوێژکاری سەرۆک بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی دەستنیشاندەکرێ.

بەڵام ئاخۆ چۆن باڵوێزخانەی ئیسرائیل زانی کە وا ئەو تەلەفۆنە کە زۆر بە نهێنی و بە ئامێری کۆدەداری ئاسایشپارێز کراوە، لە لایەن ئامریکاییەکانەوە

گوێی لێگیراوە، ئەوەش کارێکی نهێنیی گرنگ بووە هەروەک ناسنامەی مێگا. هەمو نێردە و نوێنەرێکی ئیسرائیل و باڵوێزخانەکەیان ئامێری سیستمی نوێیان بۆ پەیوەندیکردن هەبوو، ئەو ئامێرانەش لە ڕێگەی دزینی دۆکیۆمێنتی نهێنیی ئامریکی دەربارەی دروستکردنیانەوە دزرابون و دروستکرابوون.

لە بەیانییەکی بەهاری 27ی فێبرایری 1997دا لە تەلئەبیب، سەرانی هەمو دەزگا هەواڵگرییەکان لە نوسینگەکانیانەوە بە ڕێگای جادەی Rehov Shaul Hameleku بەرەو دەروازەیەکی توند کۆنترۆلکراو چوون، کە بە تێلدڕ دەورەدرابوو؛ ئەوەی لەو خانوانە دیار بوو تەنها دیواری بەرز بوو. لەسەروی بانەکە تاوەرێکی گەورەی هەبوو، کە لە هەمولایەکی تەلئەبیبەوە دیار بوو. لەئاستی جیاجیاوە سێڵی سەتەلایتی لێقایمکرابوو. تاوەرەکە هێمای بارەگای سەرەکی هێزەکانی بەرگری نیشاندەدا. هەمو باڵەخانەکە بە ناوی کیریا Kirya ناسرا بوو، کە بە عبری واتای 'شوێن' ی دەدا.

نزیکەی سعات 11ی بەیانی سەرانی هەمو دەزگا هەواڵگرییەکان، ناسنامەی ئەلەکترۆنیان بەکارهێنا تا نزیک باڵەخانەکەی تاوەرەکە بکەونەوە. وەک هەمو هۆڵی دەزگاکانی حکومەت، هۆڵەکە کەم مۆبیلیات و هەژارانە بوو.

کۆبوونەوەکە لەلایەن دانی یاتوم Danny Yatom بەڕێوەبرا، کە لەمێژ نەبوو لە لایەن بنیامێن ناتانیاهۆی سەرەک وەزیران کرابووە بەڕێوبەری گشتیی مۆساد. یاتوم وەک سەرۆکەکەی لەگەڵ هێڵی توند بوو. بە پێی دەنگۆی ڕۆیشتوی تەلئەبیب، بەڕێوبەرە گشتییە نوێکەی مۆساد سەرەک وەزیرانەکەی پاراست، کە خراپ کەوتبووە بەر هێرش و تانە لێدان، لەسەر دەوڵەمەندی ژیانی تایبەتی، کە خەریک بوو بەهۆیەوە پایەکەی لەدەستبدا. پیاوەکان لەسەر کورسییە دارینەکانیان هەمو جەستەیان گوێ بوو بۆ قسەکانی یاتوم، کە باسی ستراتیژی نوێی دەکرد گەر هاتو 'بارودۆخی مێگا' زیاتر وروژا و قەیرانێکی گەورەی لێکەوتەوە.

ئیسرائیل بەزمانێکی توند نارەزایی خۆی بەرامبەر شکاندنی حەسانەی دیپلۆماتی باڵوێزخانەکەی لەسەر گوێهەڵخستن لە پەیوەندییەکانی دەردەبڕی،

بێگومان ئەوەش حکومەتی کلنتن ناڕاحەت دەکا. ئەنجا سایانەکانی ئەمریکاش دەخاتە گەڕ تاکو دزە بکەنە نێو میدیاکان و ئەوە بڵاو بکەنەوە کە مێگا Megaشێوازێکی ناحەزانەی پەیڤی ئێلگاElga ی عبریە، ئەو دەستەواژەیەی کە ساڵەهای ساڵە بۆ سیای بەکار دێنێ. سەرەڕای ئەوەش مێگا بەشە دەستەواژەی مێگاوات Megawatt ە، ئەو دەستەواژەیەش سیا و مۆساد بەیەکەوە بەکاریانهێناوە، ناوی هاوکاری نێوانیان بووە بۆ گۆڕینەوەی زانیارییەکان. هەروەها سایانەکان ئەوەشیان خستەسەر کە هەردو دەزگاکە زاراوەی کیلۆواتیشیان بەکارهێناوە بۆ گۆڕینەوەی زانیارییەکانیان لەسەر تیرۆریستان.

یاتۆم بە ئامادەبووانی ڕاگەیاند ' بەڵام جارێ لەباری ئێستاماندا هیچ کاردانەوەیەک ناکەین '.

لە 27ی ئازاردا کلنتن سەرلەنوێ بانگی مۆنیکا لوینسکی Lewinsky بۆ ژوری Oval office کرد. لەوێ پێیگوت من لەو باوەڕەدام کە باڵوێزخانەیەکی بیانی گوێی بۆ قسەکانمان هەڵخستوە. ئەو هیچ شتی گرنگی دیکەی پێ نەگوت. کەمێک دوای ئەوە کۆتایی بەگۆبەندەکە هات . ستراتیژداڕێژەرەکانی مۆساد لە تەلئەبیب بە قوڵی بیریان لەوە دەکردەوە، کە چۆن سود لە تۆمارە ئازاردەرە گوێهەڵخستنەکانیان وەربگرن و بەکاریبێنن، ئەوان ئەو تۆمارکراوانەیان بۆ گوشارخستنەسەر بوو، هەرچەندە کەسێک ئەوەی نمایشنەکرد کە گوشار بخاتە سەر سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا و دەماری بگرێ. هەندێکیان لەو نەوارە تۆمارکراوانەدا چەکێکی بەهێزیان بینی، کاتێ لە کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پشت لە ئیسرائیل بکرێ و چیدی حیساب لەسەر پشتگیری کلنتن نەکەن .بێگومان مرۆڤ ئەوە دەزانێ کەFBI ش لە قسەکانی نێوان مۆنیکا و کلنتن ئاگادارە. هەندێک لە ستراتیژداڕێژەران پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە لە دەرگەی پشتەوەی گۆبەندەکەی واشتنتۆنەوە بدرێ، بەوەی بگوترێ مۆساد دەزانێ کە FBI گوێی لەدەمەتەقێکانی مۆنیکا و کلنتن هەڵخستوە. ئەوەش هەروا کارێکی

هەستیاری ئاسان نییە تا بۆ FBI ڕونببێتەوە، ڕاوە گەورەکەی سەر مێگا بوەستێنێ. هەندێ لێکدەرەوەی دی پێیان باشبوو جارێ چاوەڕوان بکرێ. هەمو لەسەر ئەوە کۆک بوون کە زانیارییەکان، بێگوێدانە کاتی بڵاوکردنەوەیان هەرا دەنێنەوە، ئەوەش هەڵوێستی ئامادەبووانی هۆڵەکە بوو.

لە سێپتێمبەری 1998دا، ڕاپۆرتی تایبەتی داواکار ستار Kenneth starr ئاشکراکرا. لە ڕاپۆرتەکەدا کورتە ئاماژەیەک بۆ گفتوگۆکەی کلنتن لەگەڵ مۆنیکا لە ئازاردا تێدا بوو، کە هۆشداری ئەوەی دابوو باڵویزخانەیەکی بیانی قسەکانیان بیستۆتەوە. ستار لە بەدواچوونەکەیدا سەبارەت بەو گۆبەندە هیچ پرسێکی دیکەی ئاراستەی مۆنیکا نەکرد. FBI ش ئەوکاتە زانیارییەکانی لەو بارەیەوە دەداتە دەست، کاتێ بەڵگەی سەلمێنراوی دیکە بکەوێتە بەردەست کە دەمامکی سەر مێگا هەڵداتەوە.

بەگوێرەی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی دەزگای هەواڵگری، کەمێک دوای ئەوە ڕافی ئیتان لە یاتومەوە تەلەفونێکی بۆ کرا، بە ڕاشکاوانە پێیگوت کە دەبێ لە پاشەڕۆژێکی نزیکیشدا لە شوێنێکی ئارامداری دور لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا بێ .

پێویست نەبوو کەس بە ڕافی ئیتان بڵێ کە چارەنوسی ئەویش چەند گاڵتەجاڕی دەبێ وەک قوربانییەکانی دیکە، بۆ نمونە وەک رفاندنی ئەدۆلف ئایخمانی لێ بێ. خراپتریش لەوە گەر هاتو بە بێدەنگی لەناو بردرا، هەروەک شێوازەکان کە بەناوی ئەوەوە لکاون، ئەوکارەش بەشێک بوو لە ئەرکەکانیان.

# 6

## تۆڵەستێنەکان

{ئـامێری گوێقـوڵاغ.. کـیمخو ئۆستروڤسکی.. کوشـتنی ئـەبوجیهاد لـە تـونس.. ئیسـحاق رابـین لەسـەر ئاسـمانی جەزائیرو تونس.. بەدەنگهاتنی ئایزەر وایزمەنی سەرۆک.. جەبــەل تــاریق رێــڕەوی ســیخوڕان.. ئێرلەندیــە جوداخوازەکان و حزب الله.. فەتحی شـەقاقی دەکوژرێ.. د. جیرالـــد بـــۆلی ئەنـــدازیار دەکـــوژرێو تۆپـــە زەبەللاحەکەشـی تێـک دەشـکێنرێو سـەددام خەونەکـەی نایەتە دی.. ناتانیاهۆ کەتن دەکا.. خالد مەشعەل دەکەوێ بـەڵام نـامرێ.. شـا حسـێنی ئـوردن دێتـە سـەر خـەت.. ئەحمەد یاسین ئازاد دەکرێ..}

لــە پاشــنیوەڕۆیەکی گــەرمی نیــوەی ئۆکتۆبــەری1995دا، تــەکنیکارێکی هۆبــەی ئاسایشــپارێزی نــاوەخۆی مۆســاد Aoetahat Payloet (Medienit(APAMبـە ئـامێرێکی سـکانی دەسـت، خـەریکی سـکانکردنی باڵەخانەیک بوو لە پشت شەقامی Pinsker Stre لە سـەنتەری تـەل‌ئـەبیب. مەبەستی سکانکرنەکەی کۆنترۆڵکردن بوو، ئاخۆ ئەوباڵەخانەیە هیچ bugs ی وەک ئامێری تۆمارکردن لە نێو دیوارەکانیدا هەیە. ئەوە یەکێک لەخانووە ئارامەکانی مۆساد بوو، مۆساد لەوجۆرە ماڵانەی لەناوە و دەرورووبەری شار هەبوون. چاودێریکردنەکە نیشانەی ئەوە بوو کە بەو نزیکانە کۆبوونەوەیەکی زۆر نهێنیی لەو شوێنە دەبەسترێ. تەکنیکارەکە کـە باڵەخانەکـەی جێهێشـت، گوتی بەپێی ئامێرەکە بێ ئەوخانووە هیچ دەزگایەکی تۆمارکەری ئەلەکترۆنی تێدا نییە.

ڕێکخستنی ئەو باڵەخانەیە دەگەڕایەوە بۆ ناڕێکوپێکییە کۆنەکەی، چونکە هیچــی لەگــەڵ یــەک نــەدەگونجا. بــە دیوارەکانییــەوە تــابلۆی هــەرزان هەڵواسرابوون، ئەو تابلۆیانەی کە گەشتیارانی هاتو بۆ ئیسرائیل حەزیان لە دیتنیان بوو. لەهەر یەک لە ژورەکاندا تەلەفۆنێک بە ژمارەی نهێنی تایبـەتی خۆی هەبوو. لە ژوری ئاشپەزخانە لەجیاتی کەلوپەلی خواردن کۆمپیوتەرێک

و مۆدەمێک، دەزگایەکی کاغەزخۆر، فاکسێک و لەجێگەی ئەوشوێنەی کە دەبوایە فڕنییەکی لێبوایە، سندوقێکی دژەئاگری لێبوو.

به گشتی ئەوشوێنە تایبەت بوو بۆ کەسانێک، مەشقی بەکاتسابوونیان لە فێرگەکەی مۆساددا پێدەکرا. وردەکاری و شێوەی بەدواداچوونیان فێردەکردن، بۆ نمونە چۆن دەبیە سایەی کەسێک بێ ئەوەی هەستپێبکا، یان پێچەوانەکەی دەپارێزی، چۆن پۆستێک دروستدەکەی، چۆن زانیارییەکانت دەپارێزی و لە نێو ڕۆژنامەیەکدا دەیشاریەوە و دەیگەیەنی. شەو و ڕۆژ ئەوانە لەسەر شەقامەکانی تەلئەبیب چاودێریدەکران. هەر بگەیشتبانە ماڵەوەش وانەکان دەستیان پێدەکردەوە، چۆن کاتسایەک ڕادەهێنی و ئامادەی دەکەی کە لەدەرەوەی وڵات دەستبەکاربێ، چۆن نامەکانت بەمەرەکەبێکی تایبەت دەنوسی، چۆن دەتوانی کۆمپیوتەرێک بەکاربێنی و تێیدا زانیاری بە ماوەیەکی کورت بە ڕیگەیەکی کۆدەداردا بنێری.

بەشێکی گرنگی مەشقە بەسعات کۆتایینەهاتووەکان، بۆ ئەوەبوو، کە چۆن پەیوەندی لەگەڵ کەسانێک دروستدەکەی،کە لەگومان بەدوربن. یاکۆڤ کۆهن Yaakov kohenکە 25 ساڵە لەم سەرو ئەو سەری جیهان بەنهێنی وەک کاستا کار دەکا، باوەڕی وایە کە وانەکانی مەشقەخولەکە هۆی هەموو سەرکەوتنەکانیەتی: 'هەمو کەسێک دەتوانێ ئامێرێک بێ بۆ خۆی. من دەتوانم بەرامبەریان، کاتێ فشاریان خستمەسەر درۆ بکەم، چونکە لەپەیوەندی من لەگەڵ ئەواندا لەدرۆ بەدەر هیچی دیکە نییە، بەڵام تاکە شت کە بکرێ، چۆن ئەوان بە کەڵکی ئیسرائیل بەکار دەهێنی. هەر لەسەرەتاوە ئەز بە فەلسەفەیەک گۆشکرام، کە هەمیشە ئەوەبکەم کە بۆ مۆساد و بۆ ئیسرائیل باشە'.

هەرکەسێک بەو باوەڕە کارنەکا، بەماوەیەکی کەم دەچێتە دەرەوە. یان هەروەک David Kimche یەکێ لەباشترین پیاوانی مۆساد گوتی:' ئەوە چیرۆکێکی کۆنە، زۆرن ئەوانەی دەستەن، بەڵام کەمن ئەوانەی گوڵبژێرکراون. لە بارەی ئەمەوە ئێمە لە کڵێسەی ڕۆمی کاسۆلیک دەچین.

ئەوانەی دەمێننەوە، وا پەرە بە پەیوەندییەکانی خۆیان دەدەن کە ژیانیان درێژ بکەنەوە و بەرەو پێشەوە بڕۆن. ئەوەش ڕێسای ژیانمانە" من یارمەتیت دەدەم، تۆش یارمەتیم دەدەی". تۆ فێری ئەوە دەبی لە ژیانتدا بڕوا بەئەوانی دیکە بێنی. هیچ پیاوو ژنێک ناتوانێ متمانەیەکی زۆرتر بداتە ئەوی دی.'

هەر ڕاهێنراوێک هێنرابێتە ئەوخانوە ئارامانەوە بۆ هەنگاوی داهاتو ئامادەکرابێ، ئەو فەلسەفەیەی سەروی لە مێشکدا چەسپیوە. هەنوکە ئەو مەشقپێکراوانە بوونەتە کاتسا و ڕەوانەدەکرێن تائەرکەکانیان بەجێبێنن. ئەوان بە " بۆقەکان" ناودەبران، چونکە دەنێردرانە دەرەوەی وڵات، تاکو لەماوەیەکی کورتدا کارەکەیان ئەنجامبدەن و بگەڕێنەوە. لە وڵات بگەڕێنەوە خانوە ئارامەکە و تیایدا بنوسن' بناولێدەر'. ئەوکەسەش زۆری پێ لەوێناکردنەکەی هەڵبڕیبێ، لای گەورەکان پەسندنامەی وەرنەدەگرت.

ئەو جۆرە خانوە ئارامانە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ زانیاریدەرەکان، هەروەها بۆئەوانەش کە بڕیاریان لێدراوە بهێنرێنە ڕێز وەک(جرج) بەکاردەهێنران. تاکە نیشانەی بەشێک لەوانە گەڕانەوەیان بوو بۆ سەر ڕابەری مۆسادی پێشویان ڤیکتۆر ئۆستروۆڤسکی Victor Ostrovsky . بەقسەی ئەو ژمارەی هەمویان لە جیهاندا لە 1991دا نزیکەی 35000دەبوو، لەوانە 20000یان دەستبەکارو 15هەزاریشیان کارپێنەکراو بوون. پۆلیسی ڕەش زاراوەیەک بوو بۆ زانیاریدەرەکان عەرەبەکان، پۆلیسی سپیشیان بۆ ناعەرەبەکان بەکاردەهێنا. پۆلیسە هۆشدارەکانیش بۆ ئەو ستراتیژدارێژەرانە بوو، کە مۆسادیان لە خۆئامادەکردنی شەڕ ئاگادار دەکردەوە، هەروەک پزیشکێک لە سوریا هەواڵی دەنارد کەوا بڕێکی زۆری بەرچاوی ئەمپیسیلین و کەرەستەی برینپێچی وەرگیراون، یان کرێکارێکی بەندەر دەیدی ژمارەی زۆری کەشتییە جەنگییە هاتو و دەرچووەکان سەرنج ڕاکێشە.

هەندێک لەو کاتسایانە ڕێنماییەکانیان لەخانوە ئارامەکان وەردەگرت، وەک ئەو پاش نیوەڕۆیەی ئۆکتۆبەرو هەمان خانوی ئارامی گۆرین، لە ناوەڕاستی تەلئەبیب کە تازە لە دژی ئامێری تۆمارکردنی شاراوە تۆمارکرابوو. دواتر

خانووەکە پڕبوو لە کادرە لەپێشەکانی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل تا بەیەکەوە لە ژوری نانخواردن کۆببنەوە و لەسەر کردەیەکی تەقینەوەی بکوژ قسەبکەن، دوای ئەوەی ئیسحاق ڕابینی سەرەک وەزیران بە تەواوی پەسەندی کردووە.

لەو سێ ساڵەی کە ڕابین پایەکەی وەرگرتووە، هەردەم لە ناشتنی جووە کوژراوەکانی دەستی تیرۆر کە زیادیان کردووە، ئامادەبووە. کاتێ ئەو لەپشت دارەبازەکانەوە دەڕۆیشت، دەیدی چەند کەسانی باڵق ناوبەناو لە کاتی نوێژی بە کۆمەڵی سەر گۆڕەکانیان، ڕێگا بە فرمێسکەکانیان دەدەن، بێنە خوارەوە. لەهەر بارێکی تازیەداری ئاوادا ' لە دڵی خۆیدا تازیەی دادەنا'. دواتر هاتە سەر ئەو بڕوایەی بەدوای پێغەمبەر Ezechiel دا بڵێتەوە ' دوژمن دەبێ بزانێ کە تۆڵەی خۆم سەندەوە، من پیاوم'.

ئەوە جاری یەکەمی ڕابین نەبوو، نیگای بخاتەسەر تۆڵەکردنەوە، بەڵکو خۆشی بەشداری کردەی تۆڵەسەندنەوەی کردبوو. لەپێشترین کردەی تۆڵەستێنەوەی ڕابین، کوشتنی خەلیل ئەلوەزیری جێگری یاسر عەرەفات بوو، کە لە جیهانی عەرەبی بە ئەبوجیهاد (واتە دەنگی شەڕی پیرۆز) ناسرابوو، لەهەمان کاتیشدا ئارمانجێکی گەورە بوو لای مۆساد. بارەگای ئەبوجیهاد لە تونس بوو. لە 1988دا ڕابین وەزیری بەرگری بوو، ئیدی لەهەمان باڵەخانەی نزیک Pinsker Street بڕیاری بە لەناوبردنی ئەبوجیهاد درا.

دو مانگان پیاوانی مۆساد چاویان لەسەر هەلومەرجی دەوروبەری ئەبوجیهاد بوو، بە تەواوی کەوتبووە ژێرچاودێری پیاوانی موساد کە لە ڤیلایەک لە شوێنێکی خۆش لە سیدی بوسەید Sidi Bou Said لەدەرەوەی تونسی پایەتەختدا دەژیا. ئەوان هەمو لایەکی ڤیلاکەیان خستبووە ژێرچاودێرییەوە، سەرجەم ڕێچکەکان کە بۆ خانووەکە دەچوون، دەروازەی خانووەکە، شورەی دەوروبەری، دەرگا و پەنجەرەکانی، کیلۆنەکانی، ئامێری

هۆشدارییەکەی و شوێنپێی پاسەوانەکانی، کاتێ بەدەوری خانووەکەدا دەخولێنەوە. ئینجا دیسان جارێکی دیکە کۆنترۆڵیان کردەوە.

ئەوان چاودێری یاریکردنی هاوسەری ئەبوجیهادیان لەگەڵ منداڵەکانیادا دەکرد. ئەوان بە دوای هاوسەرەکەیەوە بوون، کاتێ دەچووە بازاڕ شت بکڕێ یان کە دەچووە لای سەرتاش. ئەوان بە تەلەفۆن گوێیان لە قسەکانی خۆی و مێردی دەگرت، تەنانەت ئامێری تۆمارکەریان کە بەBugy ی ناسراو بوو، لە ژوری نوستنەکەشیاندا دانابوو، گوێیان لەهەست وخوستی ئەڤینداری و دەستگەمەی شەوانەشیان بوو. نێوان ژورەکانیان ڕوپێوکرد، ئەوەشیان تۆمارکرد کە کەی لەماڵ دەرەچن و کەی دەشگەڕێنەوە. پاشان ژمارە و مارکە و ناو و ڕەنگی هەمو ئەو ئۆتۆمبێلانەشیان تۆمارکردن کە بەکاریاندەهێنان.

ڕێسا ئاسنینەکەی مایر ئامیت کە چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بۆ کردەی کوشتنی دانابوو، لەمێشکیان دەخولایەوە ' باش بیرلە نیشانەکەت بکەرەوە و ئاگاداربە کاتێ پەلاپیتکەکە دەبزێوی'.

تیمی ڕەوانەکراوی تونس بە متمانەبەخۆبوونەوە گەڕایەوە. مانگی داهاتو لە خانویەکی لەیەکچوو لە ڤیلایەکی ئەبوجیهاد لە حەیفا گروپێک، مەشقی لەسەر ئەنجامدانی کردەی کوشتنەکە کرد. لەوکاتەی ئەبوجیهاد دەگاتە ماڵەوە تەنها بیست و دوو چرکەیان پێویستە بۆ کوشتنی .

لە 16ی نیسانی 1988دا بڕیار درا پلانەکە پیادە بکرێ.

لەو ئێوارەیەدا چەندان فڕۆکەی بۆینگی 707 لە فڕۆکەخانەی خواروی تەلئەبیب هەڵسان. لە یەکێک لەوفڕۆکانە ئیسحاق ڕابین و هەندێ گەورە ئەفسەری ئیسرائیلی تێدابوون. ئەو فڕۆکەیە بە هێڵێکی ئاسایشپارێز بەردەوام لەگەڵ دەستەکەی دیکە لەپەیوەندیدا بوو، کە کاری کوشتنەکەیان پێسپێردرابوو، دەستەکەش لەژێر فەرماندەیی کەسێک بوو نازناوی' شمشێر' ی هەڵگرتبوو. فڕۆکەی دوهەمیش پڕبوو لە دەزگای تەشویشپەیداکەرو ئامێری گوێلێگرتنی نهێنیی و ئامێری پەیوەندی ئەلەکترۆنی. دوو فڕۆکەی

دیکە ڕۆڵیان وەک تانکی سوتەمەنی فڕۆکەکان دەبینی. ئەو پۆلە فڕۆکەیە زۆر بەرز بەسەر جەزائیردا خولانەوە و لە ڕێگەی پەیوندی کۆدەداریشدا ئاگایان لەدەستەکەی سەر زەوی بوو لە تونس. کەمێک دوای نیوەشەو، لە17ی نیساندا، ئەفسەرەکانی فڕۆکەکە زانیان کەوا ئەبوجیهاد بە مارسدیسەکەی، کە یاسر عەرەفات بۆ ژنهێنانی کردۆتە دیاری، گەڕایەوە ماڵ. دەستەی کۆماندۆی مەرگچێنەکانیش مایکی هەستیاری نێرەریان لە ڤیلاکە دانابوو، تاکو بزانن لە ژورەوە چی ڕودەدا.

شمشێر لەشوێنی خۆیەوە، لە ڕێگەی مایکە بچوکەکەی گوێی لە دەنگی شەنقاوەکانی ئەبو جیهاد بوو، کە بەسەر پلیکانەکە بۆ ژوری نوستنەکەی سەرکەوت، لەوێ چەند وشەیەکی چرپاندە گوێی ژنەکەی، ئینجا بەسەری پەنجان بۆ ژوری نوستنی کوڕەکەی چوو و ماچیکرد. دواتر جارێکی دیکە لە پلیکانەکان دابەزیە خوارەوە بۆ ژوری نوسینگەکەی لە نهۆمی سەرزەوی. هەمو ئەو وردەکاریانە لە ڕێگەی فڕۆکەی ئەواکسی ئەمریکی کەتایبەت بۆ ئیسرائیل دروستکرابوو، درایە ئەو فڕۆکەیەی کە ڕابین و ئەفسەرەکانی تێدایە و لە ئاسمان دەخولێتەوە. حەڤدە خولەک دوای سعات دوانزەی نیوەشەو ڕابین فەرمانیدا ' بۆ پێشەوە دەستبەکاربن'.

لەدەرەوەی ڤیلاکە شوفێرەکە لە نێو مارسدیسەکە ڕازابوو. یەکێ لەپیاوەکانی شمشێر بەرەو پێشەوە خشی، لولەی دەمانچە بێدەنگەکەی کردە ڕاستی گوێی شوفیرەکە و پلی لێنا، شوفێرەکە جەستەیەکی بێ گیان کەوتە سەرستێرنی ئۆتۆمبێلەکە.

لەو ماوەیەشدا شمشێرو ئەندامێکی دیکەی دەستەکەی بۆمبی پەستێنراویان خستە بەردەم دەرگا و بەپاڵێک کردیانەوە. لە ژوەرە دوو پاسەوان لە هۆڵەکەدا بوون، بەڵام هێشتا مایانبوو سەریان لەو تەقینەوە سوڕبمێنێ و بە گوللەی دەمانچەی بێدەنگ هەردووکیان بەلاداکەوتن و ساردکرانەوە.

شمشێر ئەوسا بۆ نوسینگەکە غاریدا، لەوێ کتوپڕ گەیشتە سەر ئەبو جیهاد کە خەریکی سەیرکردنی هەندێ کاسێتی ڤیدیۆی ڕێکخراوەکەی بوو. لەوکاتەی ویستی هەڵبستێ، شمشێر دوو گوللەی ڕەوانەی سینگی کردن. ئەبوجیهاد بە قوڕسی کەوتە سەر زەوی. بە پەلە شمشێر بازیدا سەری و دوو گوللەی دیکەشی خێواندە تەپڵی سەری .

لە چوونەدەرەوەدا شمشێر توشی هاوسەرەکەی ئەبو جیهاد بوو کە منداڵەکەی لەباوەش بوو.

شمشێر بەزمانی عەرەبی فەرمانی پێکرد 'بگەڕێوە ژورەکەت'.

دواتر شمشێر بە خۆی و تاقمەکەی بەو نیوەشەوە لەبەرچاوان ونبوون. لەوکاتەی دەرگایان کردەوە و چوونە ژورەوە تا ئەوکاتەی لەماڵەکە دەرچوون، سیانزە چرکەی خایاند، نۆ چرکە خێراتر بوون لەوەی بۆیان دانرابوو.

بۆ یەکەمجار دەستکرنەوەکەی ئیسرائیل لە نێو ماڵی خۆی ڕووبەڕوی ڕەخنەی ئاشکرا بووەوە. ئایزەر وایزمان Ezer Weizman ئەندامی کابینەی حکومەتی ئیسرائیل گوتی ' لەناوبردنی تاکەکەس لەخزمەتی پێواژۆی ئاشتیدا نییە'.

سەرباری ڕەخنەکانیش ئەو کردەوە بکوژیانە هەر بەردەوام بوون.

دوو مانگان پاشتر پۆلیسی باشوری ئافریقا دانی بەوەدانا کە لەژێر فشاری ئیسرائیل، لەمێژە ئەو زانیارییە دەزانێ، بەڵام نەیدرکاندووە، ئەوە مۆساد بوولەپشت کوشتنی بزنسمان ئالان کیدگەر Alan kidger لە جۆهانسبێرگ Johannesburg نوێترین دەزگای بە عێراق و ئێران دەفرۆشتن. بەهۆی ئەو دەزگایانەوە توانرا چەکی بایەلۆژی بەرهەمبهێنرێ. کاتێ جەستەی کیدگەریان دۆزیەوە، دەست و قاچی پەڕی بوون. سەرۆکی پۆلیسی لێکۆڵەرەوە کۆلۆنێل چارلس لاندمان Charls Landman ڕایگەیاند کە ' ئەوجۆرە کوشتنە پەیامێکی ڕونی حکومەتی ئیسرائیلە، لەسەر دەستی مۆسادەوە گەیەنرا '.

شەش هەفتە بەرلە کوشتنی ئەبو جیهاد، مۆساد پشکێکی گرنگی لە کردە کوشتنێکی نایەکانگیردا هەبوو. ڕوداوەکەش کوشتنی سێ ئەندامی بێچەکی IRAبوون، کە لە پاشنیوەڕۆی یەکشەمە لە جەبەلتاریق لەلایەن نیشانئەنگێوەکانی فڕۆکەیەکی تایبەتی بەریتانی تەقەیان لێکرا و کوژران.

لەساڵەکانی پێش ڕوداوەکە، ڕافی ئیتان بەنهێنی پۆلیسی نهێنی بەریتانی بانگهێشتی تەل‌ئەبیب کردن، تا نیشانیانبدا چۆن ئەوان تیرۆرستە عەرەبەکان لە بەیروت و دەشتی بیقاع ڕاودەکەن و دەیانپێکن.

چوار مانگ پێش تەقەکەی جەبەلتاریق، مۆساد لەپێشدا لە ڕێی دو پیاوی خۆی بە ناویMairead Farrell و Sean Savge بەناوچەکەدا دەگەڕان، بە بیانوی ئەوەی ڕێگە لەچەک فرۆشتنی عەرەبان بۆ IRA بگرن.

ئەو تامەزرۆییەی مۆساد بەدوای چالاکییەکانی IRA دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە جارێک مارگرێت تاچەری سەرەک وەزیرانی بەریتانیا ڕافی ئیتانی بانگی بێلفاست Belfast کرد، تا دەزگای دژەتیرۆریان نیشانی میوانەکە بدا، کە چ پەیوەندییەکی بەهێزلە نێوان تیرۆرستە ئێرلەندییەکان و حیزبوڵڵا(حزب الله)ی لوبنانیدا هەیە.

'ڕۆژێکی باراناوی گەیشتمە ئەوێ. تامن لە ئیرلەندا بووم، هەر باران بوو. هەرچی لای من هەبوو بە ئینگلیزەکانم ڕاگەیاند. پاشان گەشتێکی پشکنەرانەیان بە گشت پارێزگاکان هەموی تاسەر سنوری کۆماری ئێرلەندا پێکردم. من هەندێک لەوێ مامەوە. بۆ خۆت هەڵێنە کە حکومەتی ئیرلەندی چی بە من گوت کاتێ من گەیشتمە لایان. بەر لەگەڕانەوەم، ئەوەم ڕێکخست کە ئەندامانی SAS بێنە ئیسرائیل تاکو شێوازەکانی خۆمانیان بۆ لەناوبردنی تیرۆریستان فێربکەین.

لەچرکەساتی یەکەمەوە ئیدی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان SAS ومۆساددا پەیدا بوو. زو گەورە بەرپرسانی مۆساد بەرەو بارەگای سەرەکی SASلە هێرفۆرد Hereford دەفڕین، تا دەستەی گوڵبژێری ئەوان لەچالاکییەکی ناوازەی مۆساد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئاگاداربکەنەوە. لانی

کەم لە پێشهاتێکدا دەستەیەکی مۆساد و SAS بەیەکەوە بەدوای دوو پایەداری گەورەیIRA دا چوون، کە لە بەلفاستەوە بەرەو بەیروت فڕین. لەوێ دەستە هاوبەشەکە توانیان وێنەی دو کەسەکە لەگەڵ سەرکردەکانی حیزبوڵلا لە بەیروت بگرن.

لە ئۆکتۆبەری 1987دا پیاوانی مۆساد بە دوای کەشتی بارهەڵگری Eksundەوە بوون، کە سەد و بیست تەن چەکی لە ڕۆکێتی دژە ئاسمانی، بنکەی ڕۆکێت هەڵدان، کلاشینکۆف، میترالیۆزی سوک و تەقەمەنی قورسی هەڵگرتبوو. کەشتییەکە بە ڕێگەی دەریای سپی ناوەڕاست بەرەو شوێنی مەبەستی دەچوو. ئەو هەمو چەکانە بەهۆی کەسانێکی پەیوەندیداری IRA وە لەبەیروت کڕدرابوون. کەشتییەکە لەلایەن مارێنزی فەرەنسیەوە ڕێی پێگیرا.

مۆساد نەیتوانی لەگەڵ دەزگای دژەجاسوسی ئیرلەندی ئیشبکا، چونکە لانی کەم گەورە بەرپرسێکی مۆساد لەوباوەڕەدا بوو کە ئەو پەیوەندییە بەردەوام، لەگەڵ دژایەتیکردنی حکومەتی ئیسرائیل بۆ هێزی ئیرلەندی وەک هێزی نەتەوەیەکگرتووەکانی ئاشتیپارێز لە لوبنان یەکناگرێتەوە. مۆساد لەبەر ئەوە SASی بەریتانی ئاگاداردەکردەوە تا ئەوانیش هۆشداری بدەنە دبلن Dublin کەوا باری چەکی گەورەتریش بۆ باکوری ئیرلەندا بەڕێوەیە.

پیاوانی مۆساد کە سێ کەسەکانی IRA یان لە ئیسپانیا بەدیکرد، هەر زو زانیان کە بۆ چاوپێکەوتنی بازرگانە چەکفرۆشەکانی عەرەب نەهاتوون، هەروەها نەشهاتون پەیوەندی لەگەڵ ETA ی ڕێکخراوی تیرۆرستی باسکدا سازبدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامبوون لەسەر ئەوەی دەستەی دژەتیرۆری ئیسپانی بڵێن کە بەدوایاندا بچن و سایەیان هەڵبگرن.

لە ڕاستیدا سپانییەکان ڕەفتارێکی دوربەدورانەیان لەگەڵکردن. ئەوەش چالاکی ئەوان بوو، بۆ یەکەمین جارە ئەوان ڕۆڵێکی کارا بەهاوبەشی لەگەڵ M15و SAS دا لە ڕوی IRA ەوە بگێڕن. ئەوەش ڕونبوو کە سپانییەکان خۆشیان بەوە نەدەهات سەرکەوتنی خۆیان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بەشکەن.

مۆساد هەر زو بۆ سپانییەکانی ڕونکردەوە، کە ڕۆڵی ئەوان تەنها یارمەتیدانە و بەس. ئیدی سپانییەکان ئەو جارەیان بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵ مۆساددا دەستبەکاربوون .

کاتێک سپانییەکان فارێل Mairead Farrel یان لەبەر چاوان ون بوو، کاستایەکی مۆساد دۆزیەوە. کاتساکە ئاشکرایکرد کە فارێل ئۆتۆمبیلێکی دیکەی، فۆرد فیستایەکی سپی بەکرێگرتووە. ئۆتۆمبێلەکە بە 64 کیلۆ تەقەمەنیSemtex و 36 کیلۆ Shrapnel بارکراوەو لە گەراجێکی ژێرزەمینی لە ماربێلا Marbella ڕاگیراوە.

ئەو شوێنە گەشتیارییە مۆدرێنە تەنها ڕوگەی عەڕەبە خواپێداوەکان نییە کە دەیانەوەێ بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ لە گەرمەسێری بیابان و لە دەست ئەو خەونەی کە ئیسرائیل دێ و پانیان دەکاتەوە، ڕادەکەن. ماربێلا لەبەر ئەوەی دەکەوێتە نزیک بەندەری Puetro Banus ڕاوچییە بەناوبانگەکان، بۆیە شێخەکانی نەوت دێنە ئەوێ و بە ملیۆنان لەو دەریاچەیە بۆ ڕاو خەرجدەکەن. مۆساد لەمێژ بوو لەوە دەترسا نەوەک ئەو بەلەمە ڕاوچیانە چەک و تەقەمەنی بۆ تیرۆرستان ئاودیوبکەن. ئەوان پێیانوابوو کە ئۆتۆمبێلەکەی کابراش هەر بۆئەوە ئامادەکراوە لە بەلەمێکی ئەو ڕاوچیانە باربکرێ و بەرەو وڵاتی پیرۆز بنێردرێ.

مۆساد بڕیاریدا بەدوای فیستا سپیەکە بکەوێ. پیاوەکانی مۆساد بۆیان دەرکەوت کە فارێل خۆشی لە پشت سوکانی فێستایەکی دیکەیە، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە هەفتەی ڕابردوو لە سپانیا McCan و Savageی سوارکردبوون. دووپیاوەکەی مۆساد بە دوای هەرسێ پیاوەکە کەوتن تا گەیاندنیانە باشور واتە Puerto Banus. 190خولەک پاش ئەوەی فارێل مێربێلای جێهێشت، گەیشتە دەروازەی بەندەری ڕاوچیان، بەردەوام بوو کەنارو کەنار دەڕۆیشت.

لە ڕێی دەزگای ڕادیۆکەی ڕێپێدراویان لەلایەن پۆلیسی سپانییەوە، پیاوەکانی مۆساد پۆلیسیان لەوە ئاگادارکردەوە کە سێ پیاوەکە بەرەو

جەبەلتاریق دەڕۆن. سپانییەکان دەستەڵاتی ئینگلیزییان لێ ئاگادارکردەوە. دەستەی پەیوەندیداریSAS یش جێگەی خۆیان وەرگرت. هەر سعاتێک دوای ئەوە Farrell، McCann و Savage دەستڕێژیان لێکراو کوژران. ئەوان هۆشداریان پێنەدرا تا ڕابوەستن، چ جای دەرفەتی خۆبەدەستەوەدان. ئەوان بێ سێ‌ودوو لەناوبردران.

هەفتەیەک پاش ئەوە ستیفان لاندەر Stephan Lander فەرماندەی ئەو ئۆپەراسیۆنە دواتر بوو بە بەڕێوبەری گشتی M15 زەنگی بۆ بەڕێوبەری گشتی ئەوسای مۆساد ناحوم ئادمۆنی لێدا، تاکو سوپاسی خۆی بۆ ئەو هاوکارییە پێشکەش بە مۆساد بکا.

ئەو ئێوارەیەی ئۆکتۆبەری ساڵی 1995 هەمو شتێک لەوخانوە ئارامەی نزیک شەقامی Pinsker Street لە ناوەڕاستی تەلئەبیب ئامادە بوو، تاکو بڕیار لەسەر کردەکوشتنی داهاتو بدرێ.

فەتحی شەقاقی Fahi Shkaki سەرکردەی دینیی جیهادی ئیسلامی بەربژاری هەڵمەتی لەناوبردنی داهاتو بوو. مۆساد کوشتنی بیست هاوڵاتی ئیسرائیلی سەرنشینی پاسێک لە سەرەتای ساڵ لە فبرایردا لە لایەن دو خۆکوژی تیرۆریست لە دەرەوەی شارۆچکەی BeitLid تەقێنرایەوە، لەملی دەستەکەی فەتحیەوە دەزانی.

ئەو ڕوداوە ئەڵقەیەک بوو لە زنجیرە ڕوداوی ئاوها، کە بە دە هەزار لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی بەسەرچوودا مەزندە دەکرا. لەو ماوەیەدا چوار سەد ئیسرائیلی کوژران و هەزاری دیکەش برینداربوون. زۆر لە بەرپرسیارانی کوشتن و پەکخستنەکان، شوێنپێیان هەڵگیراو کوژران. وەک یاکوڤ کۆهنی کاستا کە خۆی چەند جاران وەک تۆڵەسێنەوە دەستبەکاربوو، گوتی ' ئاوا لە پشت دیوارێک لە شەقامێکی لابەلا چەقۆیەک جێگای گوللەی دەگرتەوە تاکو یەکێک بکوژی یان بکوژرێیەوە'.

لەو دنیا بێبەزەییەدا شەقاقی لە لای خەڵکەکەی ببووە پاڵەوان و بە پێشەنگ دادەنرا. ئەو خۆی بۆمبی گیانلەبەری خۆکوژیانەی لە BeitLid

جۆشـدەدان تەسـلیم دەکـردن، ئەمـەش لـە گـەڵ ڕێسـای قەدەخـەکردنی خۆکوشـتنی ئیسـلامێتی نـاکۆک بـوو. بۆیـە ئـەو هـەمو قوڕئـانی هـەڵگێرو وەرگێڕکرد، ئینجا ئەو فەلسەفەیەکی داهێنا کە چەوساندنەوە و چەوساوان ناچاردەبن شێوازی نوێ بۆ بەرگری لـەخۆکردن بدۆزنـەوە. بۆ سـەلماندنی بیرۆکەی بۆمبی گیانلەبەری جولاو(مەبەست خۆکوژەکانە -وەرگێڕ-) خەڵکی گەنجی بیرو گیان ناکامڵ و ناجێگیری وەک هەراشەکانی کامیکازی ژاپۆنی لە جەنگی دووهەمی جیهان بەکاردەهێنا. شەقاقی گەنجەکانی دەهێنایە بارێکی دەرونـی ئاینـداری دەروێشـاوی، تـاکو خۆیـان وەک ئـەوەی لـە ڕوداوی پاسـەکەدا ڕویـدا، بتەقێننـەوە. شـقاقی خـەرجی هـەواڵی خۆکوشـتن و پرسەنامەکەیان لە ڕۆژنامەی جیهاد لەئەستۆ گرت و لە نوێژی هەینییش لە مزگەوتدا بەشان و باڵهەڵدان و پەسنی قوربانیبوونەکەیانی دەکرد، بە باوک دایک و کەسوکاریشیان دەگوت کە شوێنێکی لەبەهەشت بۆخۆی گرتووە.

لەو گەڕەکانەی بازنەی جموجۆڵەکانی دەگرتەوە، مایەی شەڕەف بوو بۆ خانەوادەکان کە کوڕەکانیـان بـۆ ئـەوجۆرە قوربانیانـە ڕەگـەڵ شـێخ بخـەن. بیرهێنانەوەی ئـەو کوژراوانـە ڕۆژانـە یاددەکرانـەوە، ئـەویش کـە بانگدەری مزگەوت بە دەنگی بەرزی مایکرۆفۆن بانگی نوێژی دەدا. لە مزگەوتە سارد و سڕو نیوە ڕوناکەکانی بەیروت ئەو یادەوەریانە زیندوو ڕادەگیران.

کـاتێ فـەتحی بـەربژاری خـۆی دەستنیشـان دەکـرد و ئارمانجەکـەی دیاریدەکرد، پیاوەکانی دەناردە لای بۆمبدروستکەرەکان. ئەوان پسپۆڕ بوون لەکارەکەیاندا، دوای وێنەگرتنی ئامانجەکەیان دەیانزانی چەندی لەتەقەمـەنی پێویستە. ئەوان وەک کیمیاگەرە کۆنـەکان ئـەزمون و سـەلیقەیان ڕابـەر بـوو لەگەڵیدا هاوارکردنێک وەک بیترشێنە، دێزەنتری بکە، بیپەستێنە، کونبڕی بکە تـاکو مـەرگ لەگـەڵ خۆیـدا بێنـێ. ئـەوان جێبڕوای فـەتحی بـوون. ئـەویش بەخۆشـــییەوە خزمـــەتی گوتـــەی ســـەرکردەیەکی ئیســـڕائیلی دوژمنـــە قینلێبووەکەی دەکرد ' ئێمە دەجەنگین، لەبەر ئەوە ئێمە ماوین'.

ئەو ئێوارەیەی ئۆکتۆبەر، کاتێ لەخانووە ئارامەکەی مۆساد لە تەلئەبیب بڕیار لەسەر چارەنوسی فەتحی دەدرا، ئەو لای هاوسەرەکەی خۆی فەتحیە بوو لە دیمەشق. ڕاخستنی باڵاخانەکەی ئەو تەواو پێچەوانەی هەژاری و پەڕپوتی ئۆردوگای پەنابەران بوو. لەسەر زەوی مافوری گرانبەها ڕاخرا بوون، دیوارەکانیشی بە پەردە و لاکێشی جوان ڕازابوونەوە، ئەوەش دیاری ئایەتوڵلاکانی ئێران بوو بۆی. لەسەر مێزیک وێنەیەکی فەتحی لەگەڵ موعەمەر قەزافی لە چوارچێوەیەکی ئاوزێڕدا دانرابوو، کە دیاربوو دیاری سەرۆکی لیبیا بوو. ئەو جلوبەرگەی فەتحی کە لە سوریا دەیپۆشی، تەواو جیابوون لەگەڵ بەرگە پەڕپوتەکەی نێو جەماوەری سەر شەقامەکانی خواروی لوبنان. ئەمەش تاکو هەوادارنی زیاتر بکا. لێرە باشترین و جوانترین جلی لەبەر دەکرد، وەک بازاڕگەی Savile Row لە لەندەن. پێڵاوەکەشی بەدەست لە ڕۆماوە دروستکراوە، نەوەک قاپقاپەی سەر شەقام کە بۆ جەماوەری نیشانبدا.

لەوکاتەی فەتحی خەریکی خواردنە هەرە حەزلێکراوەکەی کوسکوس(خواردنێکی مارۆکانییە لە پیرخەنی لای خۆمان دەچێ- وەرگێڕ) بوو، خێزانەکەی لەوە دڵنیاکردەوە کە لە سەفەرەکەی بۆ لیبیا بەمەبەستنی وەرگرتنی باربوی نوێی قەزافی، هیچی بەسەر نایەت. ئەو چاوەڕوان بوو بە ملیۆنێک دۆلار بگەڕێتەوە، وەک پێشتر بە فاکس داوای وای لە سەرکردایەتیی شۆڕشی تەڕابلوس کردبوو. وەک هەمیشەش وابووە پارەکە لە ڕێگەی بانکێکی لیبیایی لە Valletta بۆ ماڵتا دەنێردرێ. فەتحی بڕیاریدابوو ڕۆژێکی تەواو لەو دوورگەیە نەمێنێتەوە یەکسەر بەفڕۆکە بێتەوە ماڵ.

ڕاگەیاندنەکەی کەوا پێویستە لەماڵتاش دابەزی، دو کوڕە مێردمنداڵەکەی هێنایانە سەر ئەوەی لەوێ شتیان بۆ بکڕێ، بۆهەریەک لە کوڕەکانی شەش کراس لەوانەی فەتحی خۆی لەهەمان بازاڕدا پێشتر کڕیبوونی، بێنێ.

فەتحیەی هاوسەری ئەوەی ئاشکرا کرد ' مێردەکەم لەو بڕوایەدا بوو، گەر ئیسرائیلییەکان پیلانی لەناوبردنی منیان هەبوایە، لەمێژ بوو جێبەجێیان کردبوو. جووەکان کاردانەوەی خێرایان لە هەمبەر ڕوداوەکاندا هەیە. پیاوەکەم تەواو دڵنیابوو کە ئەوان لەبارەی ئەوەوە هیچ ناکەن، تا سورییەکان توڕە نەکەن'.

گەر هاتباو فەتحی ئەوەی پێش سێ مانگان گوتبا، مەزندەکەی دەربارەی مەیلی تەلئەبیبی ئەوکات ڕاست دەردەچوو. سەرەتای هاوینی 1995 ڕابینی سەرەک وەزیران ڕێگەی بە جێبەجێکردنی پلانێکی مۆساد بە تەقاندنەوە و سوتاندنی باڵەخانەکەی فەتحی لە بەشی پێشەوەی ڕۆژئاوای دیمەشق نەدا. ئوری ساگوی Uri Saguy ئەوکات هێشتا سەرۆکی دەزگای هەواڵگری سەربازی بوو، بەڵام لەونێوەدا لە سەرانی دەزگای هەواڵگری بوو، بەڵکو لەپێشتریش بوو لە مۆساد، سەرنجی ڕابینی بۆ گۆڕانێکی پێشچاوی دیمەشق ڕاکێشا. ' ئەسەد لە چاوی بێگانانەوە هەر دوژمنمانە. تاکە شێوازێک کە خۆمانی نیشانبدەین، ئەوەیە کە کارێکی کتوپڕ ئەنجامبدەین. ئەوە واتای ئەوە دەگەیەنێ، ئێمە لەجۆلان بکشێینەوە. دەسا هەمو پیاوەکانت لەوێ بکێشەوە، بە دڵنیاییەوە ئەوە نرخێکی زۆر گەورەیە. ئەوەش باشترین ڕێگایە کە ئاشتییەکی سەقامگیرانە بچەسپێنێ'.

ڕابین زۆر بەوریایەوە گوێی لەوقسانە هەڵخستبوو. ئەو دەیزانی کە جۆلان چەند قورس لەسەر کەسی ئوری ساگوی خۆی کەوتبوو. ئەو گیانی بەشێکی زۆری هێزی چەکداری لەسەر بەرگریکردن لەو بەرزاییانەی جۆلان دانابوو. هەر لەوێ بەخۆی چوار جاران بریندار ببوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیە واز لەو هەموە بێنی بەرامبەر ئاشتی بۆ ئیسرائیل.

سەرەک وەزیران نەخشەی لەناوبردنی فەتحی دواخست، تاکو دەرفەت بداتە ساگوی هیواخوازیەکەی بە پێوەری واقیعبینی بپێوێ.

چاوەڕوانییە پڕهیواکانی لەبەر تینی سوتێنەری گەرمای هاوین لە بەین نەما، لەوکاتەی ڕابین بۆ خەڵاتی نۆبل بەربژارکرا، فەرمانیدا گەر بکرێ فەتحی لەناو ببەن.

شاباتی شاڤیت کە دوا چالاکی گەورەی بوو وەک سەرۆکی مۆساد ' پیاوێکی ڕەشی' ناردە دیمەشق تاکو چاودێرییە ئەلکترۆنییەکەی باڵەخانەکەی فەتحی جارێکی دیکە بخەنە ژێر چاودێرییەوە. ئامێرە ئامریکاییەکەی دەستی پیاوە ڕەشەکە ئەوەندە وردبوو، ئامێرە پشکنەرەکەی دەستکردی ڕوسیای فەتحیشی بێدەنگ دەکرد. وردەکارییەکانی سەردانی فەتحی بۆ لیبیا وماڵتا گەیەنرانە تەل‌ئەبیب.

هەنوکە لە ئێوارەیەکی ئۆکتۆبەری 1995دا سەرانی هەر سێ دەزگا هەواڵگرییە دەستەڵاتدارەکەی ئیسرائیل، ڕێگەیان لە نێو ئاپۆرەی شەقامی Pinsker Street بەرەو شوێنی کۆبوونەوە تەیکرد. هەرسێکیان هێڵیان بەژێر مەرجەکانی لە ناوبردنی دوژمنە ئاشکراکانی ئیسرائیلدا هێنا، کە کاتی خۆی مایر ئامیت وەک بەڕێوبەری گشتیی مۆساد دایڕشتبوون:

'نابێ باس لە کوشتنی سەرکردە سیاسییەکان بکرێ. ئەوان دەبێ بە ڕێگای سیاسی لەسەر بدرێن. هەروەها ڕێگا بە کوشتنی خاوخێزانی تیرۆریستانیش نادرێ. بەڵام گەر خاوخێزانیان بونە تەگەرەی بەردەمیان، ئەوا کێشەی ئێمە نیە. هەر کردەی لەناوبردنیکێش پێویستە ڕەزامەندی سەرەک وەزیرانی دەستبەکاری لەسەر بێ. هەموش دەبێ بەگوێرەی ڕێنماییناەمەکە بێ. دەبێ کۆنوسی ئەو کۆبوونەوەیە هەبێ، کە تیایدا بڕیاری لەناوبردنەکە دراوە. ئەو چالاکیانەی ئێمە نابێ وەک کوشتنێکی ژێر فەرمانی دەوڵەت تەماشا بکرێ، بەڵکو وەک گەورەترین سزای دەوڵەت دابنرێ. گەر وابێ، جیاوازیمان لەگەڵ لەسەردەرێکی(جزار) فەرمی دەوڵەتە قانونییەکانی دیکە نابێ' .

لەگەڵ سەرکەوتنی کردەی ڕاوکردن و کوشتنی هەر نۆ تیرۆریستە بکوژەکانی گەورە وەرزشوانەکانی ئۆلۆمپی لە 1972دا لە مونشن، هەمو

کردە کوشتنەکانیان بەگوێرەی ڕێنمایە ئاماژە بۆکراوەکان بەڕێوە چوون. نزیکەی سی و دوو ساڵ دوای ئەوەی ئامیت ئەو ڕێنماییانەی نوسینەوە، ئەوان بەرەو خانووە ئارامە دەستنیشانکراوەکە ڕۆیشتن.

یەکەمین کەسیان شاباتی شاڤیت چووە ژورەوە. هاوڕێکانی هیچیان لەشێوەی چوونە ژورەوەی بەبێ زەحمەتی بۆ بەردەم پرسگەی میوانخانە هەرزانەکە تەلئەبیب نەگوت. ئەو ئاوەها پەلەیی پێوە دیاربوو. شاڤیت ئەوە سێ ساڵە لەو پایەدایە، بەڵام جێی سەرنجەکە بەخۆشی نازانێ چەندی دیکە لەو پایەیدا دەمێنێتەوە.

دوای ئەو ژەنەڕاڵ دۆران تامیرDoran tamir ی سەرۆکی دەزگای تایبەتی هەواڵگری بەرگری بەژور کەوت. ئەو لاوازێکی هێزداربوو، ئەوپایەکەی بەری ڕەنجی ساڵانی ئەفسەریەییەکی ناوسوپا بوو .

دوایی ئوری ساگوی Uri Saguy گەیشت. بەچەشنی پاڵەوانێکی شەڕ، هەنگاوی بۆ ناو ژورەکە دەنا وەک ئەوەی پایەیەکی باشتری لەوەی ئێستای هەیە کە بەڕێوبەری ئامان AMAN، دەزگای هەواڵگری سەربازییە، چاوەڕێ بکا. بەدەنگە نەرم و نمایشە خاکییەکەی دەمەقاڵییەکی خستە نێو هاوڕێکانی بەوەی پێیدادەگرت کەهەر چەندە سوریا گەفە شەڕخوازانەکانی نوێ دەکردنەوە، بەڵام هێشتا هەر ئامادەیە دانوستان لەسەر ئاشتی بکا.

پەیوەندی نێوان ئەو سێ مرۆیە وەک شاڤیت وێنای دەکرد ' لەناخەوە بوونێکی وشیارئامێزانەیە'. ئوری ساگویش لەو بارەیەوە دەیگوت' ئێمە بەزەحمەت لەگەڵ یەک بەراورد دەکرێین. وەک سەرۆکی ئامان ڕێبەرایەتی دوانی دیکە دەکەم. کێبەرکێ لەنێوانماندا هەیە، بەڵام تا ئەو کاتەی خزمەت بەهەمان ئامانج دەکەین، من ئەوە زۆر بەباشی دەبینم'.

دوو سعاتی ڕەبەق لەسەر مێزی خواردن دانیشتن، تاکو پلانی لەناوبردنی فەتحی شەکاکی تاوتوێ بکەن. ئەوەش بێگومان کردەیەکی تەواو تۆڵەکردنەوەیە لەسەر بنەمای ' چاو بە چاو و ددان بە ددان'. ئیدی ئەوەش ڕەوایەتی دەدایە کردەکوشتنەکانی مۆساد. هەندێ جار مۆساد کەسێکی وای

دەكوشت كە سواری ملی خۆی دەبوو بە هیچ شێوەیەك ڕازی نەدەبوو كارامەییەكەی خۆی بخاتە خزمەتیان. تاكو بەهرەكەی بۆ كەسێكی دیكە بەجێنەمێنێ، ئەوا ڕاستەوخۆ لە شوێنی خۆیدا ساردیان دەكردەوە.

زانای كەنەدی دكتۆر جێرالد بول D.Gerald Bul لە دنیا بە پسپۆڕی بواری تۆپخانەی دوورهاوێژی بالیستی ناسرابوو. ئیسرائیلییەكان هەوڵێكی بێئەنجامی زۆریان لەگەڵدا، تاكو بەپارە كاریان بۆ بكا. هیچ جارێك زانای ناوبراو ڕكەبەرایەتی خۆی لەهەمبەر دەوڵەتی جو نەدەشاردەوە.

لەبریتی ئەودا جێرالد بول پسۆڕیەتییەكەی خۆی خستە بەردەم سەددام حوسێن بۆ دروستكردنی تۆپی زەبەلاح، كە بەهۆیەوە تەقەمەنی ناوكی یان هەر تەقەمەنییەكی ژاراوی وڤایرۆساوی دیكەی لە بەغداوە پێ بهاوێژێتە ئیسرائیل .

بول نەخشەپرۆژەی دروستكردنی جۆرە سوپەرتۆپێكی دانا كە درێژییەكەی سەد و پەنجا مەتر دەبوو، تۆپەكە لە پۆلایەكی پەستێنراو بە قورسایی سی و دو تەن دروستدەكرا. ئەوەش بە دەزگای بەریتانی دروستدەكران و بە پاپۆڕیش ڕەوانەی عێراق دەكران. لە كۆتایی 1989دا لە موسڵی باكوری عێراقدا بۆ پرۆڤەكردن نمونەیەكی لەو تۆپە تاقیكردەوە. سەددام حوسێن سێ لەوچەكانەی بەرامبەر بیست ملیۆن دۆلار داواكردبوو. بولیش وەك ڕاوێژكارێكی تەكنیكی یەك ملیۆن دۆلاری بەركەوت. نازناوی پرۆژەكەش بابل بوو.

بەڵێندەرایەتی بول بە ناوی (Space Reseach Corporation(SRC لە ژوری بازرگانی بروكسل وەك نوسینگەیەكی نەخشەسازی سیستمی چەك تۆمار كرابوو. لەوێوە بۆ دابینكردنی تەقەمەنی و كاڵا دەقاودەقە پێویستییەكانی، ژمارەیەكی زۆری كۆمپانیای ئاوروپایی خستبوونەگەڕ، لەوانە بیست بەڵێندەری بەریتانیایی.

لە 17ی فێبرایەری 1990دا كاتسایەكی مۆساد لە بروكسل دەستی بەسەر چەند بەڵگەنامەیەكی تەكنیكی پرۆژەی بابلدا گەیشت، كە تیایدا وا

وێنای پڕۆژەكە كرابوو: لە ڕاستیدا تۆپی زەبەلاح دەبێ وەك بنگەیەكی تەقەمەنی هاوێشتن بەكاربهێنرێ كە دوریەكەی بەقەد ڕۆكێتێكی مامناوەندیهاوێژ بێ. تۆپە زەبەلاحەكە دەبێ ببێتە چەقی بازنەی سیستمی ڕۆكێتەكان: دەستەیەكی تۆڕی هەشت ڕۆكێتی سكود كە توانای گەیشتنیان بگاتە 2500 كیلۆمەتر. ئەوەش واتای ئەوەی دەگەیاند كە نەوەك هەر ئیسرائیل، بەڵكو دەگەیشتە شارە گەورەكانی ئاوڕوپاش. بول لەو باوەڕەدا بوو لەدوایدا سوپەر تۆپێك دروستبكا لە بەغداوە لەندەنی پێ بۆمببارانبكرێ .

ناحوم ئادمۆنی بەڕێوبەری گشتیی پێشوی مۆساد بە پرتاو داوای دانیشتنێكی لەگەڵ سەرەك وەزیران ئیسحاق شامیر كرد. شامێر وەك سەركردەیەكی جەنگاوەرانی ناوشار لە دوا هەفتەكانی ماندێتی بەریتانییەكان بەسەر فەلەستیندا دژی سەربازانی ئینگلیز دلڕەقانە جەنگا، ئێستاش وەك سەركردەیەكی سیاسی كە بەدڵی مۆساد بوو، پیاوێك بوو پشتگیری لەهەمو كردەیەك دەكرد، كە دوژمنانی ئیسرائیل لەناوببا؛ لەكاتی پێویستدا و كاتێك شێوازەكانی دیكەی بەرەنگاری شكستیاندەهێنا ڕێگەی شێوازی مۆسادی دەدا. لە شەستەكاندا كاتێ ئەندازیارە ڕۆكێتەكانی نازی تەواو سەرقاڵی پێشخستنی سیستمی ڕۆكێتهەڵدانی میسری بوون، تاكو لە سیناوە ئیسرائیلی پێ دابێژن، مۆساد هانای بردە بەر ئەزمونی شارۆن تاكو نەخشەی لەناوبردیان بۆ بكێشێ. شارەزایەتییەكەی لە بەرەنگاربوونەوە و لەناوبردنی ئەفسەر ئینگلیزییەكانی بۆ مابووەوە. شامێر ئەوكات ئەندامانی دەستەژێر زەمینییەكەی خۆی بۆ لەناوبردنی ئەندازیارە ئاڵمانەكان ناردنە میسر. هەندێ لەو كیدۆنانە(كیدۆن واژەیەكی عیبرییە بۆ ئەندامی دەستەی مەرگی مۆساد بەكار دێ) پاشان بوونە سەردەستەی كۆماندۆی مەرگ لای مۆساد.

شامێر كاتێكی كەمی بۆ تاوتوێكردنی فایلی بولی بەس بوو. هەروەك هەموجارێك دەزگا كارەكەی بەپوختی كرد، سەرەتا تیشكی خستە سەر لایەنە گەفدارەكان و كارنامەی بولی بە وردی خستەسەر نەخشە. ئەو لە تەمەنی بیست و دوساڵیدا دكتۆرای لە زانستی فیزیا بەدەستهێناوە، ئینجا لە

پەیمانگای کەنەدی بۆ توێژینەوە و بەرەوپێشبردنی سیستمی چەک Armaments and research Development Establishment کاریکردووە.

ئەو هەر زو لەگەڵ کۆنە هاوکارەکانی کەوتە کێشە، لەوێوە سەرەتای ڕکهەڵگرتنی لە بیرۆکراتەکان لا چەکەرە بوو. ئەو ئەوکات نوسینگەیەکی بۆ چەکدارکردن دانا بەناوی"a gun for hire’’ چەک بۆ بەکرێدان هەروەک لە فایلەکەشدا بە پێکەنینیوە باسکراوە، دانا.

ناوی بول بەتەواوی لە1967 وەک داهێنەرێکی چەک دەرکەوت، لەو کاتەی تۆپێکی کورتیhouwister ی پەرە پێدا تا بتوانێ ئامانجەکانی لە دوری 40 کیلۆمەتر بپێکێ، تاکە چەکی بەراوردی ناتۆ لەگەڵ هی ئەو، مەودای هاوێژتنی لە بیست و حەوت کیلۆمەتر تێنەدەپەڕی. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بول بەکردەوە بەرەو حکومەتە نیشتمانییەکان وەرچەرخێ. ئەندامانی پەیمانی باکوری ئەتلەنتی (ناتۆ) چەکە نوێکەیان لێنەکڕی، چونکە گەورەچەکە بەرهەمهێنە ئاوروپییەکان لۆبیەکی کارایان بەسەر حکومەتەکانەوە هەبوو. لەکۆتاییدا بول چەکە نوێکەی خۆی فرۆشتە باشوری ئافریکا.

پاشان بول گواستییەوە چین، تاکو دەستی یارمەتی بۆ سوپای ڕزگاری گەل درێژبکات، سیستمی چەکداریان پەرەپێبدا. لەوێ بەشێوەیەک پەرەی بە سیستمی ڕۆکێتەکان دا، کە هەڕمێن پەیدا بکا. چین ئەو جۆرە ڕۆکێتانەی دەفرۆشتنە سەددام حوسێن. سەددام ئەو چەکانەی بە بەربڵاوی لەشەڕی درێژخایەنی لەگەڵ ئێراندا بەکارهێنا، بەڵام ئەوەندە بنکەی ئەو جۆرە ڕۆکێتانە لەعیراقدا هەبوون، ئیسرائیل ترسا کە بۆ ئەویشی بەکاربێنێ .

لەو نێوەدا پرۆژەی بابل مەزندەی خۆی پەیداکرد. ئیدی دەست بەهەندێ پرۆڤەکرا تاکو پرۆژەی سوپەرتۆپ تاقیبکرێتەوە. نەیارەکانی سەددام کە وەک ڕاپۆرتنوسی مۆساد کاریاندەکرد، ئەوەیان ڕاگەیاند کە ڕژێم لە قۆناخی بەرەو پێشبردنی کڵاوەی کیمیاوی و بایەلۆژیە بۆ تۆپە بۆرە.

لـە دوای نیـوەڕۆی 20ی ئـازاری 1990دا سـەرەک وەزیـران ئیسـحاق شامیر لەگەڵ ناحوم ئەدمونی یەکانگیربوو لەسەر ئەوەی، دەبێ جیرالد بـول لەناوببردرێ.

دو ڕۆژ دوای بڕیارەکە دەستەیەکی دووکەسی کیدۆن گەیشتنە بروکسل. ئەوان لەلایەن کاتسا چاوەڕوانی دەکران، کە ڕێوشوێنی بولیان خستبووە بەرچاوان.

لـە ئێـوارەی 22ی ئـازاردا، سـعات حـەوت و چـارەک، هەرسـێ پیاوەکـە سـواری ئۆتـۆمبێلێکی بـەکرێ بـوون، بـەرەو شـوێنی نیشـتەجێی بـول لـەنێو ئاپارتمانەکەیـدا ڕۆیشـتن. هـەردوو کیدۆنەکـە چـەکی دەسـتیان لـەژێر پاڵتۆکەیاندا شاردبووەوە.

بیست خولەک دواتـر بولی شەسـت و یـەک سـاڵە دەرگـەی لەبـەر لێدانی زەنگدا کردەوە. ئـەو پێـنج جـاران لەسـەرو کەلەکەیـەوە پێکرا. کیدۆنـەکان دەمانچەی جۆری کالیبەر 7.65یان لەجەستەی بول خاڵی کرد و بـەمردویی بەجێیانهێشـت. دواتـر میشـێلMichael ی کوڕی جیرالـد بـولی ڕایگەیانـد، باوکی ئاماژەی ئەوەی لابـوو کـە مۆسـاد دەیکوژێ. کوڕەکـەی هیچـی دیکـە لەسەری نەڕۆیشت، نەیگوت ئایا بـاوکی ئاماژەکـانی لـەکوێ وەرگـرتن، یـان بۆچی هۆشداری نەدایە پۆلیس.

دوای ئـەوەی کیدۆنـەکان دەرچـوون و گـەڕانـەوە ماڵـەوە. ئەوسـا مۆسـاد چیرۆکی کوشتنی بولی وا بۆ میدیاکان باسکرد، گوایە بول لە قسە و پەیمانی لەگەڵ سەددام حسێن پەشیمان بۆتەوە، بۆیە وای بەسەرهات. هەنوکە دوای پێنج ساڵان بەسەر تێپەڕبوونی کوشتنی زانایەکی کاروباری چەکسازی وەک بـول، هـەمان تاکتیـک بـۆ لـەناوبردنی فـەتحی شـەقاقی گـەورە تیرۆریسـت دەگیرێتە بەر، بـەڵام ئـەمجارەیان فەرمانەکە لـە خـودی کەسـایەتی سـەرۆک وەزیرانێکی دیکەیە کە ئیسحاق ڕابینە.

لـە 24ی ئۆکتۆبـەری 1995دا دو پیـاو سـەروی تەمـەن بیسـت سـاڵە، بەدوای یەکدا لە ژێر نازنـاوی گیل و ڕان GIL وRan بـە فڕۆکـەی تایبـەت

تەلئەبیبیان بەجێهێشت. ڕان ڕوەو ئەسینا و گیلیش بەرەو ڕۆما فڕی. لەوێ لە فڕۆکەخانەکان لەلایەن سایانە خۆجێییەکان هەریەکە و پاسپۆرتێکی نوێی بەریتانیان وەرگرت. ئەوان دوای نیوەڕۆ گەیشتنە ماڵتا، لەوێ لەمیوانخانەی Diploma hotel کە بەسەر بەندەری ڤاتیلالادا دەڕوانێ، دابەزین.

ئەو ئێوارەیە ڕان ماتۆڕێکی وەرگرت، ڕان بەوکەسەی کە بە ماتۆڕەکەی هاوڕا بوو، گوت کە دەیەوێ گەشتێک بەناو دوورگەکەدا بکا. پاشان کەس لە نێو میوانخانەکە بەبیری نایەت کە هەردو کەسەکەیان بەیەکەوە دیتبێ. بەشی هەرەزۆری کاتەکەیان لەژورەکەیاندا بەسەر دەبرد. کاتێک کارمەندێکی میوانخانەکە بە گیلی گوت، هەگبەکەت زۆر قورسە، بەچاوداگرتنێکەوە وەڵامی دایەوە کە پڕە لە زێڕ.

هەر هەمان ئێوارە کەشتییەکی بارهەڵگر کە لە ڕۆژی پێشترەوە حەیفای بەرەو ئیتاڵیا جێهێشتبوو، لە دەوازەی نوسینگەی بەندەرەکەوە هەواڵ هات کە کەشتییەکە لەبەر پەککەوتنێکی ماشێنەکەی جارێ بۆ چاککردنەوە لە کەنارەکە دەمێنێتەوە. شاباتی شاڤیت بەخۆی و دەستەیەکی بچوکی پەیوەندی لەسەر پشتی کەشتییەکە بوون. ئەوان لە ڕێی دەزگای ڕادیۆوە پەیوەندیان لەگەڵ گیل دەگرت، کە دەزگایەکی بچوکی وەرگرتن و ناردنی لە ناو جانتاکەیدا هەبوو.

کلیلەکانی جانتاکە دەبوایە بەپێچەوانەی ساتەژمێری کاتژمێر بسوڕابا تاکو لە کشانی هەردو سپرینگەکانی قەپاخی جانتاکە لەبارییەک ببا. گەر هاتباو جانتاکە ئاساییانە کرابایەوە لەبەرچاوی هەموان دەتەقایەوە. ئەنتێنەی دەزگا نێرەرەکە کە چوارسەد مەتری تایبەت بوو، وا پێچرابووە و کرابوە تیرەیەکی پانزە سانتیمەتری. بەپێی سەرەکانی، بە ئەنتێنی قوژبنەکانی جانتاکەوە بەسترابووەوە. لەوئێوارەیەدا گیل هەندێ پەیامی لە کەسانی سەر پاپۆڕەکەوە پێگەیشت.

فەتحی شەقاقی ئەو ڕۆژە زو بە بەلەمی هێڵی پەیوەندی تەڕابلوسی لیبیا و ڤاتێللا لە ماڵتا گەیشتبووە دورگەکە. دو پۆلیسی لیبیشی لەگەڵدابوون،

بەڵام ئەوان لە بەلەمەکە دانەبەزیبوون. ئیدی بەرپرسیاریێتی ئەوان تەواوبوو فـەتحیش بەتـەنها ڕێیکـرد. ئـەو بەپاسـپۆرتێکی لیبـی خـۆی بـە دەزگـای کۆچبەرانی دورگەکە وەک هاووڵاتیـەکی لیبی بـەناوی ئیبرِاهیم داویش Ibrahim Dawishناسـاند. دوای خۆناونوسـکردن هاتـە میوانخانـەی دیپلۆمـات Diplomat Hotel ، دو سـعاتی داهـاتوی لەقاوەخانەکـەی بەندەرەکە بەخواردنـەوەی قاوە لەگەڵ شـەکرلەمەی عـەرەبی بەسـەر برد. هەروەها کۆمەڵێک تەلەفۆنیشی کردن.

بەیانییەکـەی ڕۆژی پاشـتر خـۆی وانوانـد، لەگـەڵ ئـەو کراسـانەی بـۆ کورەکانی کڕیبوونی بە نیازی گەڕانەوەیە بۆ ماڵ. ئەو لـە دورگەکـەدا بـەپێ دەڕۆیشـت، دو پیـاوی ماتۆڕسـواری گەیشتنەسـەر. یـەکێ لـە پیاوەکـان لەمەودایەکی کورتدا شەش گوللەی خێواندە سەری سەرکردەی جیهادییەکان. فەتحی دەستبەجێ تـەواوبوو. هـەردو ماتۆڕسـوارەکە لەبـەرچاوان ونبـوون هەرگیز نەشدۆزرانەوە. سـعاتێک دوای ئـەوە بەلـەمێکی ماسیگر لەبەنـدەری ڤاڵیتا دەرچوو، تاکو پاشتر لەلای پاپۆڕە بارهەڵگرەکەی کەنار لەنگەر بگرێ. کەمێک دواتر کەشتییەکە بە نوسینگەکەی بەندەرەکەی ڕاگەیاند، کە بـەکاتیی دەزگاماشێنی کەشتییەکان چاککردۆتەوە، بەڵام بۆ چاککردنەوەی تەواو دەبێ بگەڕێنەوە حەیفا.

لە ئێرانی ولاتی ڕۆحیی فەتحی، مەلاکان ڕۆژێک ماتەمینی نیشتمانیان بۆ ڕاگەیاند. کـاتێکیش ڕۆژنامەنوسـێک لـە تەلئـەبیب داوای لەسـەرەک وەزیـران ئیسحاق ڕابین کرد بۆ کۆمێنتارێک لەسەر پێشهاتەکە گوتی ' من هیچ مایەی بارێکی ماتەمینی پێوە نابینم '.

یەک ڕۆژ دواتر لـە 4ی نۆڤمبـەری 1995دا ، ڕابین خۆشـی لـە مەیـدانی ئاشتی لەتەلئەبیبدا، لە کاتی ئامادەبوونی خۆنیشاندانێکی جەماوەریدا کوژرا، شوێنی کوشتنەکەی لە خانووە ئارامەکەی مۆسادەوە دور نەبوو، کە تیایدا بڕیاری لەناوبردنی فەتحی درا. ڕابین لـە لایـەن توندڕەوێکی جولەکە ئیگال

ئامیر Yigal Amir کوژرا، کە لە زۆر ڕووەوە هەمان دڵڕەقی کردەکانی مۆسادی هەبوو، کە ڕابینی سەرۆک وەزیرانی پێ کارانگاز ببوو.

ئیسحاق ڕابین ئەو هەڵۆیەی ببووە کۆتر، سەرکردەیەکی سیاسی بەهێز گەیشتبووە ئەو بەرچاورونییەی کەبڵێ ' تەنها یەک ڕێگاچارە بۆ ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەیە، ئەویش تواندنەوەی شمشێرەکانمانە تاکو بێڵی لێدروست بکەین و ئەوسا بەیەکەوە لەگەڵ دراوسێ عەرەباکانمان کێڵگەی پێ هەڵبقەنێنین'. ئەو ئەو قسە نەستەقەی بەردەوام دەگوتەوە و لە کتێبە لاخۆشەویستەکەی تەوراتی وەرگرتبوو، کەچی هەمان ئیسحاق ڕابین لەلایەن یەکێک لە نەتەوەی خۆی دەکوژرێ. ئەو نابینا بوو بەرامبەر ئەوەی هەڵوێستی ناحەزەکانی ناوخۆی لە توندڕەوە جووەکان وەک دوژمنە کۆنە عەرەبەکانی دەبێ. هەردو لایان بڕیاریاندابوو ڕوانینی ئەو بۆ دوارۆژ تێکوپێک بشکێنن.

لەساڵی 1998دا ژمارەی دەستەی مەرگی کیدۆنەکانی مۆساد گەیشتنە چل و هەشت کەس، لە نێویاندا شەش ژن هەبوون. هەموشیان بێڕیزپەڕ لە خواروی سی ساڵیدا بوون و لە ڕوی جەستەیشەوە لەوپەڕی لیاقەدا بوون. ئەوان کارو ژیانیان لە دەرەوی بارەگا سەرەکییەکەی مۆساد لە تەل‌ئەبیبەوە بوو، بارەگا سەرەکییەکەیان کە بۆ کەسانی دیکە قەدەخە بوو، بەشێک بوو لە مۆڵگەی سەربازیی لە بیابانی نەقەب. مەیدانەکە خێرا بەباڵەخانە دروستدەکرا تاکو مەشقی شەڕی جادە و شوێنی بۆمبلێچاندنی بۆ بکرێتەوە. ئۆتۆمبێلی پێدەربازبوون و کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم هەڵاتنیان لێدانابوو تاکو مەشقی تەواوی لەسەر بکەن.

لە ڕێنماییە کارپێکراوەکانیان فێرکردنی هەمو جۆرە چەک و بۆمب و تەقەمەنییەک هەبوو، تا بتوانن بە باشی لەگەڵیدا هەڵبکەن و بتوانن حەشاریشی بدەن. ئەوان فێرببوون کە چۆن لە حاشامات و ئاپۆرەی خەڵکیدا دەرزییەکی کوشندە لە کەسێک بدەن، یان چۆن کەسێک بکوژن و وای نیشانبدەن کە ڕوداوێکی لابەلابووە. کیدۆنەکان زۆر بەوردی سەیری

فلمی کوشتارگەیان دەکرد وەک کوشتنی سەرۆک کەنەدی لە دالاس، لە دەموچاو و نەریتی خەڵکی ئامانجلێگیراویان دەکۆڵیەوە. زانیارییەکان لە داتاسیستمێک ئاخنرابوون، تەنها بۆدەستەی بژاردە هەبوو بیانبینێ. هەروەها دەبوو ئەوان نەخشە گۆڕاوەکانی شارو فڕۆکەخانە و بەندەرە گەورە و بەناوبانگەکانی جیهان لەبەربکەن .

کیدۆنەکان دەستە دەستە کاریان دەکرد. هەر دەستەیەکیان لە چوار کەس پێکهاتبوو. بەردەوام دەنێردرانە شارەکانی وەک لەندەن، پاریس، فرانکفۆرت و شارەکانی دیکەی ئاوروپایی تاکو شارەزایان بن. هەندێ جار گەشتیان بۆ نیویۆرک و لۆس ئانجلس و تۆرنتۆش دەکرد. لەو گەشتانەیاندا ئەرکیان ئەوەبوو خۆیان ئەوە هەڵبسەنگێنن کە تاچەند دەتوانن چالاکیەک ئەنجامبدەن، بێ ئەوەی سەرنجی دەوروبەر ڕابکێشن و ئاشکرابن. ئامانجە تاقیکراوەکانیان لە لایەن سایانە خۆجێیەکان، ئەو خۆبەخشانەی کەتەنها پێیاندەگوترا کە بەشداری تاقیکردنەوەیەکی کردەیەکی نهێنییت لە پاراستنی بەرژەوەندییەکی ئیسرائیلیت وەک سیناگۆکییەک یان بانکێکی کردووە، دەستنیشاندەکرا. ئەو خۆبەخشانە لە کاتێکی چاوەڕواننەکراودا لەسەر جادەیەکی هێمندا پەلاماریان دەدا و دەخرانە نێو ئۆتۆمبێلەکان، یاخود لە نیوەشەودا دەستەیەکی کیدۆن هەڵیدەکوتایە سەرماڵەکەی، ئیدی پەشۆکاو بە دیتنی بریقەی چەکی دەستی کیدۆنەکان لەخەو بەئاگادەهاتن.

بەردەوام کیدۆنەکان ئەو ئەزمونانەیان زۆر بەهەند هەڵدەگرت، چونکە هەر دەستەیەک بە ڕوداوە مێژووییەکەی ناسراو بەنوشستییەکەی لیلەهامەر Lillehammer ئاشنا بوون.

لە تەموزی 1973دا لە تۆپکەی ڕۆژانی ڕاونانی بکوژانی گەورە وەرزشوانانی ئۆلۆمپی لە مونشن، مۆساد ئاماژەنامەیەکی پێگەیشت کەوا میری سور(الامیر الاحمر) عەلی حەسەن سەلامە داڕێژەری پلانی تەقینەوەکە، وەک چایەچییەک لە شاری لیلهامەری نەرویجی کاردەکا.

میشێل هاری Michael Harri بەڕێوبەری پێشوی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد، دەستەیەک کە ئەندامی دەستە کۆماندۆکانی مەرگ نەبوون، کە ئەوان بەدنیادا بڵاو ببوونەوە ڕاوی بکوژانی وەرزشوانانیان دەکرد، ڕێکخست و ڕەوانەی ئەوێی کردن. دەستەی هاری هیچ ئەزمونێکیان لە مەیداندا نەبوو، بەڵام ئەو بڕوای بەئەزمونی خۆی وەک کاتسایەک لە ئاوڕوپادا هەبوو. سیلڤیا ڕافائیل Sylvia Rafael و ماریانا گلادنیکۆف Marianne Gladnikkofکە دو ئافرەت بوون، لەنێو دەستەکەی هاریدا بوون. هەروەها لەنێو دەستەکەدا کەمال بننامە Kamal Benname ی جەزائیریشی تێدا بوو، کە تەتەرێکی دەستەی سێپتێمبەری ڕەش بوو پێش ئەوەی هاری ناچاری بکا وەک جاسوسێکی دوسەرە ئیشبکا.

چالاکی لیلەهمار هەر لەسەرەتاوە کارەساتی لێکەوتەوە. گەیشتنی دەستەیەکی بێگانەی دە کەسی بۆ لیلەهمار، کە نزیکەی 40 ساڵە حاڵەتی کوشتنی تێدا ڕونەداوە، هەرزو بووە مایەی دەنگۆ کەوتنەوە. پۆلیسی شارەوانییەکە ئەو لایەنانەی خستنە ژێر چاودێرییەوە. بەو شێوەیە پۆلیس لەنزیکەوە بوو کە هاری و دەستەکەی چایەچییەکەیان کوشت کە کابرایەکی مارۆکۆیی بوو بەناوی ئەحمەد بوچیکی Ahmed Bouchiki و هیچی لەگەڵ تیرۆریستاندا نەبوو چ جای سەلامە. هاری و دو لە دەستەکەی توانیان دەرچن، بەڵام شەش ئاژانی مۆسادیان لێگیرا، کە لەنێویاندا هەردو ژنەکان بوون.

گیراوەکان دانیان بەهەمو شتێکدا نا، بەم جۆرە یەکەم جار بوو ئەوە لە مۆساد ئاشکرا بکرێ کە بۆ لەناوبردنی نەیارەکانی ئەو شێواز و تیمانەی هەن. هەردو ژنەکە و هاوکارە پیاوەکانیان بە تۆمەتی کوشتن تاوانبارکران و هەر یەکەشیان پێنج ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە.

دوای گەڕانەوەی، هاری لەسەر ئیشەکەی لادرا، بێجگە لەوەش تۆڕی پەیوەندییەکانی خانووە ئارامەکانیان، ئەدرەس و تەلەفۆنە نهێنییەکانی ئاورووپای مۆساد هەڵوەشێنرانەوە.

پاش ئەوە شەش ساڵی دیکەی خایاند تا عەلی حەسەن سەلامەیان کوشت. ئەویش وەک دوا دەرەنجامی ئەو چالاکییەی ڕافی ئیتان نەخشەی بۆکێشا و سەرپەرشتی جێبەجێکردنەکەشی کرد. ئەو دواتر لەبارەی نوشستییەکەوە گوتی ' لیلەهمار نمونەی جێبەجێکارێکی هەڵە بۆ ئەرکێکی هەڵە بوو. نەدەبوایە ڕوبدا و ناشبێ ڕوبداتەوە'. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕویدا.

لە31ی تەموزی 1997دا ڕۆژێک دوای کردە خۆکوژییەکەی دو پیاوی حەماس کە لە بازاڕێکی ئۆرشەلیمدا خۆیان تەقاندەوە و لەئەنجامدا 15 کوژاو و 157 بریندار لێکەوتەوە، دانی یاتوم Danny Yatom لەگەڵ بنیامێن ناتانیاهۆی سەرەک وەزیران ئامادەی کۆبوونەوەیەک بوو. سەرەک وەزیران تازە لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی وروژێنەردا هاتبووەوە، لەوێ بەڵێنیدابوو کە ئەو خۆشی لە خۆی نابینێ و بێدەنگ نابێ تا ئەوانەی لەپشت تەقینەوەکانن تەمبێ نەکا و نابێ ئاوا چیدی مەترسیدار بن.

لەبەر چاوی خەڵک و کامێرا ناتانیاهۆ خۆگرو لەسەرخۆبوو، بە هێواشی وەڵامی پرسەکانی دەدایەوە. حەماس نابێ لەو کردەوانەی وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچێ، بەڵام بە چ شێوازێک تۆڵە بکرێتەوە، ئەوە هێشتا لەتاوتوێکردندا بوو. ئەو دیسان بیبی Bibi یەکەی جارانی سەردەمی شەڕی کەنداو بوو، ئەوکات ناتانیاهۆ بەری ڕەنجی هێزی مەزندەکانی دەخوارد بەرامبەر کاردانەوەکانی سەددام حوسین لەمەڕ ئیسرائیل.

بەڵام ئەو ڕۆژەی کۆبوونەوەکە، ئەو ڕۆژە گەرمە کە کامێرای لەسەر نەبوو، تەنها لەگەڵ یاتۆم و هەندێ گەورە ئەفسەری هەواڵگری و ڕاوێژکاری سیاسی دانیشتبوو، بەجۆرێکی دیکە خۆینواند. ئەو هەمو شتێک بوو تەنها دەمارسارد و لێکدەرەوە نەبوو. ئەو لەهۆڵە پڕەکەی تەنیشت نوسینگەکەی، بەردەوام قسەی بە قسەکەرەکان دەبڕی و دەیقیژاند ' من دەبێ ئەو زۆڵانەی حەماس، گەر دوا کاریشم بێ، تەمبێ بکەم '.

بەگوێرەی قسەی یەکێک لە ئامادەبووان ناتانیاهۆ بەو شێوەیە درێژەی پێدا " ئێوە بۆ ئەوە لێرەن کە پێمبڵێن چۆن چۆنی بۆ ئەو کارە بچین، بەڵام من نامەوێ چاوم بە ڕۆژنامەکان بکەوێ تیایدا نوسرابێ کە ئەوە تۆڵەکردنەوەی بیبییە. ئەوەی ئێمە دەیکەین پەیوەندی بە داپەروەری و ڕەوایەتیەوە هەیە".

یاتۆم کە لەسەر دەنگلەرینەوەکەی سەرۆک وەزیران ڕاهاتبوو، لەوسەری مێزەکە دانیشتبوو بێدەنگ چاوەڕیی بەردەوامبوونی ناتانیاهۆی دەکرد. سەرۆک لە قسەکانی بەردەوام بوو" من دەمەوێ ملی سەرانیان خلۆر بێتەوە. دەبێ ئەوان بمرن. لای من گرنگ نییە چۆن دەبێ. من دەمەوێ ئەوە ڕوبدا و بەس، چەند زوتر بێ باشترە".

بارگرژییەکە هەورازتر چوو، کاتێک ناتانیاهۆ داوای لە یاتۆم کرد لیستێکی بەناوی سەرانی حەماس و شوێنی نیشتەجێی ئێستایان بداتە دەست. هەرگیز وا ڕوینەداوە کە سەرەک وەزیران بەو شێوە وروژێنەرە و لەو قۆناخە بەراییەدا، ئەو داوایە بکا. زۆرینەی ئامادەبووان ئەو سەرنجەیان لادروستبوو کە " بیبی دەریخست دەیەوێ بارەکە بهێنێتە ڕایێ".

بەلای هەندێ لەسەرانی مۆساد ئەو کۆبونەوەیە نائارامییەکی نایەوە، بەوەی سەرەک وەزیران مەودایەکی کەمی لەگەڵ مۆساددا هێشتەوە. ڕەنگبێ لای یاتۆمیش هەمان سەرنج دروستبووبێ، چونکە بەسەرەک وەزیرانی گوت کە دواتر ئەو لیستەکەی لەگەڵ تاوتوێدەکا. وەک ئەوەی بیەوێ بابەتەکە بگۆڕێ، بەڕێوبەری گشتیی مۆساد گوتی " کاتی ئەوە هاتووە سەیری لایەنە پراکتیکییەکەی کێشەکە بکەین". دەستنیشانکردنی سەرکردەکانی حەماس لەگەڵ ' بەدواداچوونی هەندێ جرجی زێرابەکانی بەیروت' یەکیدەرگرتەوە.

ئەوجارەشیان ناتانیاهۆ قسەکانی پێبڕین. ئەو دەیویست گوێی لەهیچ پاکانەیەک نەبێ، ئەو کردەی دەوێ. ئەو دەیەوێ لە ئێستاوە دەستپێکی هەڵمەتەکە بێ.

چەندانێک لە ئەفسەرە هەواڵگرییەکان ئەو سەرنجەیان لا پەیدابوو، بیبی ناتانیاهۆ ئەو هێڵە باریکانەی نێوان سیاسەتێکی بە ئاگابوون و ئۆپەراسیۆنێکی بەرپرسانەی شکاندن. کەسێک لە ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە ئەوەی لاشاراوە نەبوو، ئەو هەڵوێستە توندەی ناتانیاهو وەڵامێکی هەڵبژاردنەکانە، تاکو نیشانیبدا ئەو کاردانەوەی هێڵی توندی سیاسیانە بەرامبەر تیرۆرستان، کە بەهۆیەوە دەرچەی هەڵبژاردنەکانی بردەوە هەر قسە و ڕەوانبێژی دواندان نەبوو. سەربارى ئەوەش کۆڵێک شەرمەزاری لەکۆڵدا بوون، لە دوادوایدا بەوە ڕاگەیشت، هەندێکیان لەکۆڵ خۆی بکاتەوە و بەکۆڵ یەکێکی دیکەیدا بدا. ئاستی بەجەماوەربوونی ئەو تەواو شۆڕببووە خوارێ. ژیانی تایبەتیانەی خۆی لەسەر جادە باسدەکرا. ئەو هەمو هەوڵێکی پێویستی دەدا تا بڵێن هێشتا سەرەداوەکانی کۆنترۆڵکردنی بارەکەی لەدەستدایە. گەر ئەو توانی سەری سەرانی حەماس خلۆر بکاتەوە، ئەوا دەرەقەتی هەمو نارێکییەکانی خۆی دێ و تێهەڵدێنیتەوە.

گەورە ئەفسەرێکی هەواڵگری ئسرائیل بە ئەرخاینبوونەوە بیرۆکەی مێشکی هەمو ئەوانەی لە کۆبوونەوەکە بوون هێنایەسەرزمان بەوەی بڵێ " هەرچەندە هیچمان لاریمان لەسەر ئەوە نەبوو کە دەبێ مار لەسەریەوە پان بکرێتەوە تا بکوژرێ، بەڵام ئێمە خەمی ئەوەمان بوو بۆ وا بە پەلەپروزێ. هەمو قسەکانی بیبی بەوەی"کار هەر ئێستا دەبێ بکرێ" دەمهەراشی بوون. هەر چالاکیەکی لەوجۆرە نەخشەیەکی مشورخۆرانەی پێویستە. بیبی چاوەڕوانی دەرەنجامی وەک یارییەکی کۆمپیوتەریی دەکرد، یان هەروەک پاڵەوانی فیلمە تۆقێنەرە کۆنەکان. جیهانی ئاسایی و ڕۆژانەمان ئاوها نییە، وەک ئەو دەیویست".

یاتوم فەرمانی دەستبەکاربوونی بۆ بەدواداگەڕان و کۆکردنەوەی زانیاری هەمەلایەنە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان دەرکرد، هەروەها چەند کاتسایەکیشی ڕەوانەی غەززە و کەرتی ڕۆژئاواکردن تاکو زیاتر لە بارەی شوێنی سەرانی حەماسەوە بزانن. بە درێژایی مانگی ئاب چەند جارێک یاتوم بانگکرایە

نوسینگەی سەرەک وەزیران تا ڕاپۆرتی خۆی لەسەر بەرەوپێشوەچوونی ڕەوتی بەدوا گەڕانەکانی خۆی پێشکەشبکا، بەڵام شتی وا نەبوو. لەنێو دەزگا هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل بەندوباو لەسەر خواستە مەحاڵەکانی ناتانیاهو بڵاو بوونەوە، سەرەک وەزیران داوای لە یاتوم کرد خەڵکی زۆرتر بخاتە گەڕ، لەوەش زیاتر پێیگوت گەربێت و بە خێرایی ئەنجام نەدەی بەدەستەوە، ناچارم بەشێوەیەکی دیکە ڕەفتاربکەم. کاتێ ناتانیاهو بەڕێوبەرە گشتییەکەی بەوشێوە لەقوللەی قاف هەڵبکێشێ، هیچی بەدەستنەدەهێنا. یاتوم بەهێواشی گوتی" ئەوەی لەتوانامانـدا هەیە دەیکەین" گەربێت و لەسەر ئەوکارەش دەرمبکا، کە دەتوانێ بیکا، بەڵام بێگومان ئەو ڕەفتارە دنەی بزواندنی پرسی جۆراوجۆر لەسەر خەڵک دەکاتەوە، تاکو بپرسن پشکی ناتانیاهو لەو کارەدا چەندە. ناتانیاهو هەر مکوڕبوو لەسەر بەلای کەمی لەسەردانی یەکێک لە سەرکردەکانی حەماس، بەڵام بەلەز.

تا گەیشتە سێپتێمبەر ناتانیاهو خوی بەوەگرتبوو کەلە نیوەشەوان زەنگ بۆ یاتوم لێبدات و پرسی بەرەوپێشوەچوونی ڕەوتەکەی لێبکا. بەڕێوبەری گشتی لەژێر فشاری بەردەوامی سەرۆک شل بوو. ئەو کاتساکانی ئەرکەکانی دیکەی بانگکردەوە. بەگوێرەی یەکێکیان یاتوم هەمو دەزگای مۆسادی هەڵپێچا، تا خواستی سەرەک وەزیران ڕاییبکا. یاتوم پیاوێکی توند بوو. بەڵام گەر کار گەیشتە دەستلێهەڵماڵین، لەگەڵ ناتانیاهۆ بەراوردناکرێ. ئەو هەنوکە داوای خێراییان لێدەکا بەتایبەتیش کە برایەکی بەشدار بوو لە پەلامارەکەی ئەنتەبە Entebbe لە ئۆگەندا Oeganda دا. ئەو بەراوردکارییە لەجێی خۆیدا نییە. ئەو هەمو تواناکان بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی بەکاردێنێ.

لە 9ی سێپتێمبەردا هەواڵ گەیشتە ئیسرائیل کە جارێکی دیکە حەماس دەستی خۆی وەشاندۆتەوە. ئەمجارەیان دو پاسەوانی پاشکۆی کلتوریی باڵوێزخانەکەی ئیسرائیل لە عەمانی پایەتەختی ئوردن، بەخەستی بریندار کردون.

سێ ڕۆژ دواتر، کەمێک پێش دەستپێکردنی شەبات(شەممەی جووان)، لە ئێوارەی هەینیدا ناتانیاهۆ یاتومی بۆ فراوین بانگهێشتی ماڵەوەی کرد لە ئۆرشەلیم. هەردو پیاوەکە سوپ و سەلاتە و ماسیان خوارد و بیرە و ئاوی کانزاییشیان بەسەرداکرد. ڕاستەوخۆش سەرەک وەزیران باسی ڕوداوەکەی عەممانی کرد. ئایا چۆن تفەنگچییەکانی حەماس ئەوەندە لە باڵوێزخانەکە نزیک بوونەتەوە تا دو کەسمان لێبپێکن؟ بۆچی باڵوێزخانەکە لە ئەگەری کردەیەکی وا ئاگادار نەکراوەتەوە؟ ئەی باشە هۆبەی مۆساد لەوێدا چی دەکا؟

یاتۆم کە تاکو ئێستا قسەی نەکردبوو، قسەی بەسەرەک وەزیران بڕی. سەرکردەیەکی حەماس لە عەممان هەیە، ئەویش بەدڵنیاییەوە (خالد مشعله)ە، کە مەکتەبی سیاسی لە ڕێی نوسینگەکەی لە عەممانەوە بەڕێوە دەبا. مەشعەل بەچەندان هەفتە سەردانی وڵاتانی عەرەبی کردووە و لێیانماوەتەوە، بەڵام ڕاپۆرتچییەکان دەڵێن هەنوکە گەڕاوەتەوە عەممان .

ناتانیاهۆ چیدی توانای هەددانی نەما. ئەو لەوسەری مێزەکەوە گوتی" دەباشە، بۆ پێشەوە، ئەو زۆڵە لەناوبەرن، پیاوەکانت بنێرە ئەوێ و ساردی بکەنەوە، ئاوا بکەن".

دوای شەش هەفتان کە هێشتا سەرەک وەزیران لە فشارەکانی خۆی کەم نەدەکردەوە و باکیشی بە دەرەنجامی هەستیارێتی سیاسی کردەوەکەی دەزگا نەبوو، بەڕێوبەری گشتیی مۆساد هەنگاوی بۆ جێبەجێکردن هەڵهێنا. چاوەکانی لەپشت چاویلکەکەیەوە سورهەڵدەگەڕان، کاتێ هۆشداریدا کە ئەو جۆرە کردەوەیە بۆ پەیوەندییەکانی نێوان ئیسرائیل و ئوردن تێکدەرانە دەبێ، بەتایبەتی ئەو پەیوەندییەی ئیسحاق ڕابین پێش ناتانیاهو زۆر بەزەحمەت دروستیکردبوو. گەربێتو خالد مەشعەل لەسەر خاکی ئوردن بکوژن، ئەوا هەمو چالاکییەکانی مۆساد لەو وڵاتە دەکەوێتە بەر هەڕەشە، ئاشکراشە کە خاکی ئوردن چ بناوانێکی گرنگە بۆ زانیارییە بایەخدارەکانی هەواڵگریی لەسەر عێراق، سوریا و فەلەستینییە توندڕەوەکان. یاتوم گوتی زۆر باشترە

چاوەڕێ بکەین تا مەشعەل لە ئوردن دەردەچێ، ئەوسا زەبری خۆمان بوەشێنین.

بەگوێرەی دەنگۆکان ناتانیاهو بە یاتومی گوتووە " خێرا بن، دەنا دواتر گوێت لێناگرم، دەخێرابن، من کارم دەوێ هەر ئێستاش. گەل دەیەوێ کردەوەیەک بنوێنین. ڕۆش هاشانا Rosh Hashana ( ساڵی نوێی جولەکان، 2007 دەکاتە 5768 یەکەم ڕۆژی سەری ساڵیش دەکەوێتە 12ی سێپتێمبەری ساڵ –وەرگێڕ-) وا لەدەرگا دەدا، من دەمەوێ بەری ئەو کردەوەیە بکەمە دیاری سەری ساڵی نوێ".

لەوکاتەوە هەر ئیشێک یاتوم کردبای ڕاستەوخۆ لەگەڵ ناتانیاهودا باسیدەکرد. هیچ سەرەک وەزیرانێکی ئیسرائیل بەوشێوەیەوە زۆر کەسییانە خۆی لە کاروباری دەزگایەکی دەوڵەتی کاروباری کوشتن هەڵنەدەقورتاند.

خالد مەشعەل چل و یەک ساڵان بوو، پیاوێکی جەستە تێکسمڕاو و ڕدێنپڕ بوو. لە شوێنێک دەژیا دوور نەبوو لە کۆشکی شاحوسێن، بەگوێرەی زانیارییەکان ژنێک و حەوت منداڵی هەبوون. ئەو پیاوێکی ڕۆشبیرو بەئاگابوو، بەڵام لە نێو بازنەی بچوکی ئسولگەرا ئسلامییەکانی بزوتنەوەی حەماسدا، بەگوێرەی هەواڵ و زانیارییە جۆراوجۆرەکانی مۆسادەوە دەموچاوێکی نەناسراو بوو. مەشعەل بۆ کوشتنی خەڵکی سڤیلی ئیسرائیلی لەپشت ناردنی خۆکوژەکانەوە بووە.

زانیاری هەمەلایەنەیان لەسەر هاتن و چوونەکانی مەشعەل کۆکردوە، تەنانەت بە دزییەوە لە لایەن ئەفسەرێکی مۆساد لە عەممانەوە وێنەیەکیشی گیرا. ئەفسەرەکە فایلەکەی دایە دەست یاتوم لەگەڵیشیدا لێی پاڕایەوە، بەڵکو ناتانیاهو پاشگەزبکاتەوە، چونکە کارێکی لەو جۆرە لە عەممان‌دا مەحاڵە. کردەیەکی بێدوکەڵی وا هەوڵی بایەخداری دو ساڵەی دژە جاسوسی هاوکاری نێوان مۆساد و ئوردن لەباردەبا.

ناتانیاهو تکاخوازیەکەی بەلاوەنا و بەپێشبینی سەرنەکەوتنی دانا، کە ئەو بەهیچ شێوەیەک لەگەڵیدا نەبوو.

ئیدی دوای ئەوە یەكسەر دەستەیەكی كۆماندۆی مەرگچێنی هەشت كەسیان بۆ ئامادەكرد. هێرشەكە بە ڕۆژی ڕوناك لە لایەن دو كەسی دەستەكەوە ئەنجامدەدرێ و ئەوانی دیكەش لەسەر پێ دەبن بۆ هەر یارمەتییەك لەوانە پرسی هاتوچۆ. دەستەكەش بە ئۆتۆمۆبیل لە ئوردنەوە دێنەوە ئیسرائیل و بەسەر پردی ئەلنبیش دەگەڕێنەوە ئۆرشەلیم.

مۆساد چەكێكی ئەرسەدۆكسیانەی لەو كردەیەدا بەكارنەهێنا، نەئاگرەچەك وەك دەمانچە و تفەنگ، بەڵكو شلەپرژێنێك كە گازی دەمار بوو. ئەوە یەكەمین جاربوو كە مۆساد ئەو شێوازە بۆ لەناوبردن بەكاربهێنێ، هەرچەندە دەزگای KGB و دەزگاكانی هاوشێوەی لە بلۆكی شۆرەوی جاران بەكاریاندەهێنا. لەو دواییانەدا ئیسرائیل زانا كۆچكردووە ڕوسەكانی بۆ مۆساد بەگەڕخستن تاكو پێكهاتەی گازە ژاراوی و كوشندەكانی تابون و سارین وسۆمان كە بەپێی ڕێكەوتننامەی نێودەوڵەتی قەدەغەكراون، لەیەكبدەن و بەكاریانبێنن. مەبەست لەو گازانەش ئەوەبوو كە كەسێك ڕاستەوخۆ یاخود بەهێواشی بمرێنن. قوربانی ئەو گازانە دەسەڵاتی بەسەر ئەندامەكانی خۆیدا نامێنێ، ئازارو ژانێكی زۆری لەگەڵدایە كە مردن بەئاوات دەخوازێ. ئەوجۆرە مردنەیان بۆ خالد مەشعەل دەستنیشانكردبوو.

لە 24ی سێپتێمبەری 1997دا كیدۆنە مەرگچێنەكان لە ئەسینا و ڕۆما و پاریس بەرەو عەممان فڕین. لەوێش چەند ڕۆژێك مانەوە. ئەوان ناسنامەی فەڕەنسی و ئیتاڵیان هەڵگرتبوو، ئەوانەی كارەكە دەستاودەست جێبەجێدەكەن ناسنامەی كەنەدیان بەناوی باری بیدس Baray Beads و سین كەندال Sean Kandall هەڵگرتبوو. كاتێك ناویان لەمیوانخانەی نێودەوڵەتی عەممان نوسی، خۆیان بە گەشتیار لەقەڵەمدا. ئەوانی دیكەش كە لە باڵوێزخانەكە بوون، زۆر لە میوانخانەكە دوورنەبوون.

بیدس و كەندال ڕۆژی دواتر چوونە لای ئەوان. ئەو دووانە بۆ دڵنیابوونەوە گازپرژێنەكەیان كۆنترۆلكردەوە. كەس نەیدەزانی چ جۆرە گازێكی تێدایە. ئەوان هەر ئەوەندەیان دەزانی كە ئەوجۆرە گازانە لەخۆچوون

و دڵڕاوەستان و پاشان مردنی بەدواوەیە. پیاوێکی مۆساد پێیگوتن کە ڕۆژی پێشتر مەشعەل چیکردووە.

لە سێپتێمبەری 1978دا ئەو لە لەندەن بوو کاتێ پیادەڕۆیەکی بولگاری جۆرج مارکۆڤGorgi Markovی بەو گازە ژاراوییە کوشت. یەکێک لە پیادەڕۆیەکان بە دەرزی سەری چەترەکەی لە ڕانی مارکۆڤیدا. مارکۆڤ بەهۆی ژاری ریسینە Ricine بە ئازارێکی زۆرەوە گیانی لەدەستدا. پیادەڕۆیەکەش پیاوێکی KGB بوو کە هەتا ما نەگیرا.

پاش ئەو هەواڵە هاندەرانەیە بیدس و کەندال دوای نیوەشەو گەڕانەوە میوانخانەکە. ئەوان داوایانکرد نانی بەیانیان بۆ بهێننە ژورەکەیان کە بریتی بوو لە قاوە وشەربەتی پرتەقاڵ و نان. بیدس سپێدەی دواتر سعات نۆ لەهۆڵی میوانخانەکە گرێبەستی وەرگرتنی ئۆتۆمێلی بە کرێگیراوی یەکەمی مۆر کرد، کە تۆیۆتایەکی شین بوو. ئۆتۆمبێلی دووهەم کە هیوندایەکی کەسک بوو، نەهاتە ئەوێ، پاشان ڕۆیشتن. بە کەسێکی پرسگەیان گوت کە ئەو و برادەرەکەی باشوری وڵات بەسەر دەکەنەوە.

لە سعات 10.00دا مەشعەل لەگەڵ شوفێرەکەی بەرەو نوسینگەکەی لێیانخوڕی. لەپشتەوە لای ئەو سێ کەم تەمەنترین منداڵەکانی کە دوو کچ و کوڕێک بوون دانیشتبوون. بیدس لە مەودایەکی ئارامەوە بەدوایانداچوو. ئەندامانی دیکەی دەستەکە بە سواری ئۆتۆمبێلەکەی دیکەوە بەدوایانداهاتن.

کاتێ ئەوان گەیشتنە لای باخچەی عەممان، شوفێرەکە مەشعەلی ئاگادارکردەوە کە بەدوایانەوەن. مەشعەل تەلەفۆنی ناو ئۆتۆمبێلەکەی بەکارهێنا تاکو پۆلیسی ناوچەکە لە ژمارە و جۆری ئۆتۆمبێلی بیدس ئاگاداربکاتەوە.

کاتێ تۆیۆتا بەکرێگیراوەکە لەوان ڕەتبوو، منداڵەکانی مەشعەل دەستیان هەروەک بۆ ئۆتۆمبێلەکانی دیکەشیان دەکرد، ڕاوەشاند. کیدۆنەکەی مۆساد پشتگوێیخست. پاشان ئۆتۆمبێلەکەی کەندال هیوندایە کەسکەکەش ڕەتبوو . هەردوو ئۆتۆمبێلەکە ڕێگایان بڕی.

كـەمێک دواتـر پـۆلیس زەنگی بـۆ مەشـعەل لێدایـەوە كـە ئۆتۆمبێلەكـە بەكرێدراوەتە گەشتیارێكی كەنەدی. مەشـعەل هەناسـەی دایـەوە و دیتـی كـە منداڵـەكانی بێباكانـە دەسـت بـۆ ئۆتۆمبێڵـە ڕەتبووەكـان بەرزدەكەنـەوە و كەپویان بە جامی دەرگاكەوە گیركردووە. هەمو ڕۆژێک ئەوان لەگەڵ باوكیان دەچن، باوكیـان بۆ نوسـینگەكەی پاشـان شـوفێرەكە ئـەوانیش دەگەیەنێتـە قوتابخانەكەیان.

كەمێک پێش 10.30 خولەک شوفێرەكە گەیشتە شەقامی وەسفی ئـەلتال Wesfi al-tal، لەوێ لە دەروازەی بارەگای حەماس خەڵكانێک كۆببوونەوە. لـەنێو ئاپۆرەكـەدا كەنـدال و بیدسـیش بەدیـدەكران، بـەڵام كـەس گومـانی لێنەكردن، چونكە زۆرجاران گەشتیاری وا هەبوون حەزیان لە خواسـتەكانی حەماس بوو بزانن .

بەپەلە مەشعەل منداڵەكانی ماچ كردن و لە ئۆتۆمبێلەكە دابەزی. بیدس بۆ پێشـوەچوو وەک ئـەوەی بیـەوێ تەوقـەی لەگەڵـدا بكـا. كەنـدالیش لـە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو كیسێكی نایلۆنی لەدەستدابوو.

بیـدس بـە دەنگێكـی دۆسـتانەوە پرسـی" بـەڕێز مەشـعەل". مەشـعەلیش بەدردۆنگی ئاوڕێكی لێدایەوە. لەو ساتەدا كەندال ویستی دەرزییەكە لە كیسە نایلۆنەكە دەربهێنێ و بیپڕژێنێتە گوێچكەی چەپی مەشعەل .

سەركردەی حـەماس بـە پەشـۆكاوی بـەرەو دواوە گەڕایـەوە و چیچكـەی گوێی ڕاوەشاند.

كەندال هەوڵێكی دیكەیدا كە ژارەكە بڕژێنێتە گوێچكەی مەشعەل. خەڵكی ئەوێ تازە سەرسوڕمانییەكەیان لەسەر لاچوبوو پڕیاندایە كیدۆنەكان.

بیدس بە عبری گوتی" دور كەونەوە ".

بیـدس ڕایكـرد و كەنـدالیش شـوێنپێی كـەوت بـەرەو ئۆتۆمبێلەكـەیان كـە لـەولاوە ڕاگیرابـوو. شـوفێرەكەی مەشـعەل ئەمـەی هـەمو دیـت، خـەریكبوو پاشەوپاش گەڕایەوە، بەو مەبەستەی تۆیۆتایەكە ڕابگرێ .

لەونێوەدا مەشعەل بە نوزە و لەرزینەوە کەوتە سەرچۆکان. خەڵک چوونە بن هەنگڵی تا خۆی لەسەر قاچ ڕابگرێ و بەرنەبێتەوە. هەندێکیشیان هاواریانکرد بانگی فریادرەس (ئەمبیولانس) بکەن.

بیدس و کەندال هەناسە بڕکێ ببوون، هێشتا نیوەی ژارە بەکارهاتوەکەی لەدەستدا مابوو، توانی خۆی لە شۆفێری ئۆتۆمبێلی مەشعەل دەربازبکا و پێی لەسەر بەنزینەکە داگرێ تاکو دەرچێ.

ئۆتۆمبێلی دیکە ئەوانیان ڕاونا. یەکێک لە ئۆتۆمبێلەکان تەلەفۆنێکی دەستیان پێ بوو، زەنگی بۆ پۆلیس لێدا تا لە شەقامی بەرامبەرەوە بێ و ڕێگەیان پێ بگرێ. شوفێری مەشعەلیش تەلەفۆنی بۆ بارەگای سەرەکی پۆلیسکرد. ئەندامانی دیکەی کۆماندۆی مەرگچێنیش دەردەست گەیشتن. یەکێکیان ڕایگرت و ئاماژەی بۆ بیدس کرد کە دابەزێ و لەگەڵیان سەرکەوێ. لەوکاتەی هەردوو کیدۆنەکە لە تۆیۆتایەکە خۆیانفڕێدا، ئۆتۆمبێلێکیان هاتە بەردەم. پیاوەکان چەکداربوون. فەرمانیان بەسەر بیدس و کەندالدا کرد لەسەر زەوی درێژبن. ئەوسا پۆلیسیش گەیشتە سەریان. ئەندامانی دیکەی کۆماندۆکە تێگەیشتن ئیدی هیچیان پێناکرێ بۆیە تێیانتەقاند، ئەوان بەبێ پەرێزی توانیان دەرباز ببن و خۆیان گەیاندەوە ئیسرائیل.

بیدس و کەندال بەختیان کەمتربوو. ئەوان بردرانە پۆلیسخانە و لەوێ پاسپۆرتی کەنەدیان نیشاندان و گوتیان گوایە ئەوان قوربانی پیلانێکی نەگریسن. دەمامکی ئەوان بە گەیشتنی بەڕێوبەری بەسامی دەزگای دژەجاسوسی ئوردنی سامح بەتیحی Samih Batihi هەڵدرایەوە. ئەو گوتی کە ئەوان دەناسێ، چونکە پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی مۆساد لە عەمانەوە کردبوو. پاشان پێیگوتن کە کاتساکانی مۆساد لە عەممان پاکدەبنەوە. گوتی ئەو دو کیدۆنە لە وڵاتەکەیان هاتون و ئیسرائیل ڕاستەوخۆ ئەو پرسە لە گەڵ شادا تاوتوێدەکا.

بەتیحی بڕیاریدا ئەو دو کیدۆنەی مۆساد ڕەوانەی زیندانی تایبەت بکرێن بێ ئەوەی هیچیان دەرهەق بکرێ.

لـــەونێوەدا مەشـــعەل بردرایـــە نەخۆشـــخانەی ئـــەکادیمی عـــەممان و لەژێربەشی چاودێری چڕوپڕ دانرا. ئەو لەبەر ئازاری گوێی چەپە و لەرینەوە وەک ئـەوەی تـەزوی کارەبـای بەجەسـتەدا بگـەڕێ، دەینالاند. هـەروەها بەئاستەمیش هەناسەی دەدا. پزیشکەکان ئەویان لەژێر ئامێری هەناسـەداندا دانا.

هەواڵی شکستی چالاکییەکە لـە ڕێی تەلـەفۆنێکی شـێوێندراو لـە پیاوێکی مۆسادەوە لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە عەمانەوە بە یاتۆمی گەیەندرا. هەردو پیاوەکە لەو هەڵەیەدا تورە بوون.

لەوکاتـەی کـە یـاتوم گەیشـتە نوسـینگەی ناتانیـاهو، سـەرەک وەزیـران تەلەفۆنێکی شاحوسێنی لە ڕێی هێڵی گەرمی نێوانیان کە لەکاتی قەیرانەکاندا بەکاریانـدەهێنا، بۆهـات. دواتـر ئەفسـەرێکی هـەواڵگری لـەبارەی نـاواخنی تەلەفۆنکە ڕایگەیاند " حوسێن دو پرسیاری لە بیبی کردن. ماڵکاول، بەنیازی خۆت ئەوە خەریکی چی؟ ئایا دەرمانی ئەنتی ژاری ئەو گازانەت هەیە؟"

پاشـا گـوتی هەسـتی مـن وەک ئـەوە وایـە کـە باشـترین بـرادەرم بـەزۆر کچەکەم لێزەوت بکا. کاتێکیش ناتانیاهو بیر بکاتەوە و بیدرکێنێ، دەبێ بزانێ کە هەردو کیدۆنەکان دانیان بەهەمو شتێک داناوە. ئـەوەش لەسـەر کاسـێتی ڤیدیۆ تۆمارکراوە ئێستا لە ڕێگادایە بگاتە دەستی مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئامریکا لە واشنتۆن. ناتانیاهو بەسـەر تەلەفۆنەکـەی وەک ئـەوەی یەکێک بەسـەر دزییەکەوە گیرابێ، نوشتاوەتەوە.

ناتانیاهو پێیگوت بەنیازە ڕاستەوخۆ بەرەو عەممان بفڕێ تـا شـتەکە بـۆ شاحوسـێن ڕونبکاتـەوە. پاشـاش وەڵامـی دایـەوە باشـتر وایـە کـاتی خـۆی بەفیڕۆنەدا. پیاوەکەی هەواڵگری لەسەری ڕۆیشت: " تـۆ دەتـوانی لـە ڕێگـەی هێڵەکـەوە گوێـت لـە کرتـەکرتی بەفرەکـە بـێ. ناتانایـاهۆ نـاڕازیبونی خـۆی تەنانەت لەوەش نیشانندەدا کە شاحوسێن پێیگوت دەبێ ئیسرائیل دەستبەجێ شێخ ئەحمەد یاسینی سەرکردەی حەماس کە ساڵانێکە لە زینداندایـە، لەگـەڵ

کۆمەڵێ گیراوی دیکە بەربدرێ. تەلەفۆنەکە تەنها خولەکێکی خایاند، بەڵام سەخترین ساتەوەختی کارنامەی سیاسی ناتانیاهو بوو".

هەنوکە ڕوداوەکان خەریکن ڕێڕەوی خۆیان وەربگرن. لەماوەی یەک سعاتدا بەفڕۆکەیەکی ی ئیسڕائیلی دەرمانی دژەژار بۆ چاککردنەوەی مەشعەل ڕەوانەی عەممان کرا. مەشعەل وردەوردە چاک بووەوە و دوای ڕۆژێک لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسیدا گاڵتەی بە مۆساد کرد. ڕێبەری هۆبەی مۆساد لە عەممان و سامیح باتیحی کورتە دانیشتنێکیان کرد، لەو دانیشتنەدا چەند جاران تەلەفۆنیان لەگەڵ یاتوم کرد. بەڕێوبەری گشتیی مۆساد لەناخەوە بەڵێنیدا کە چیدیکە کردەی کوشتن لەسەر خاکی ئوردن ئەنجام نادرێ. ڕۆژی دواتر مادلین ئۆلبرایت دوجاران کورتە تەلەفۆنی لەگەڵ ناتانیاهودا کرد و تێیگەیاند کە ئەو چۆن لەو کردەوەی تێدەگا. هەندێ جار زمانێکی درشتری لەوەی شاحوسێنی بەکاردەهێنا.

کاتێک حکومەتی کەنەدیش زانی کەوا پاسپۆرتی کەنەدی بۆ ئەوکارە بەکارهێنراوە و ناوبانگی باشی کەنەدای پێ لەکەدارکراوە، بانگی باڵویزی ئیسڕائیل کرا پاشان زۆری نەبرد پەیوەندییە دیپلۆماتەکانیان لەگەڵ ئیسڕائیلدا بڕی.

کاتێکیش وردەکارییەکان بڵاو بوونەوە، چ لەلایەن ڕۆژنامەکانی ناوخۆ و چ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ناتانیاهو کەوتە بەر شاڵاوێکی ئاگراوی، گەر هەر سیاسەتمەدارێکی دیکە بوایە، دەستی لەکار دەکێشایەوە.

لەماوی هەفتەیەکدا شێخ ئەحمەد یاسین ئازاد کرا. لەگەڕانەوەی بۆ غەززە وەک پاڵەوان پێشوازی لێکرا. لەو ماوەشدا کەندال و بیدس بەبێ پاسپۆرتی کەنەدی گەڕاندرانەوە ئیسڕائیل. پاسپۆرتەکانیش دراونەوە باڵوێزخانەی کەنەدی لە عەممان. لەباڵوێزخانەکەش خستنیانە سندووقێکی قایم و کلیلیاندا.

دوو کیدۆنەکان نەگەڕانەوە سەر بەشی پێشویان. کاری نوسینگەییان لە بارەگای سەرەکی مۆساد پێسپێردرا. هەروەک ئەفسەرێکی هەواڵگری

ئیسرائیلی دەریبڕی " ماڵخراپ، ئەوان ئێستا پاسەوانی ئاودەستەکانن لە بارەگاکەدا".

یاتۆمیش کاری وەک بەڕێوبەری گشتیی مۆساد تەواو بوو. هاوکارە نزیکەکانی گوتیان دەبوایە بە توندی بەرەنگاری خواستی ناتانیاهو ببایەوە. کێرڤی ورە لەنێو مۆساددا گەیشتە نزمترین ئاست. هەواڵێک لەنوسینگەی سەرەک وەزیران دزەی کرد، بەوەی تەنها پرسی کاتە، تا یاتوم لەپایەکەی خواحافیزی بکا.

وەک گەورە ئەفسەرێکی مۆساد باسیکرد" یاتوم هەوڵێکی دیکەیدا تاکو شەپۆلی خنکان بۆ ژێر پێکانی بەربەست بکا ". ڕەفتارێکی نائاساییانەی نواند کە کارمەندەکان بەدەهۆڵی ئەو هەڵپەڕن. کەچی ناکۆکی و دەمەقاڵێ و ڕوبەڕوبوونەوەی تورە لە نێوان چەپ و ڕاستدا بەهەڕەشەی داوای دەستلەکارکێشانەوە ڕویدا.

لە فێبرایری 1998دا یاتوم خۆی دەستلەکارکێشانەوەکەی ڕاگەیاند، تاکو بەقسەی خۆی " نیمچە ڕاپەڕینەکە دابمرکێنێتەوە". سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بنیامێن ناتانیاهو سوپاسنامە و پێزانینی ماوەی ڕابردوشی کە پێواژۆیەکی ئاساییانە بوو بۆ بەڕێوبەری گشتی لەکارکەوتو نەنارد.

# 7
## جاسوسێکی ناوازە

کیمخ مام مۆتکی مۆساد.. بارەگای سەرەکی مۆساد لە سەر شەقامی شا شاولە.. تەنگەو تەنگژەی سوێس.. جوەکانی مەراکش.. شا حەسەنی مەراکش هانا بۆ مۆساد دەبا.. رفاندنی فرۆکەیەکی فەڕەنسی تەژی لە جو.. ئۆپەراسیۆنی ئەنتەبە..لەپڕ بەسەرداان.. شەڕی نۆکەندی سوێس.. لوبنان جێمەشقی سیخوڕەکان.. ئێرانگێت.. چەکی ئامریکی بە ڕێگەی ئیسڕائیل بۆ تاران.. عەدنان خاشوگچی بازرگانی شەڕ.. لیستی چەکەکانی ئێران ..}

له بەیانییەکی سارد و شێداراوی بەهاردا داڤید کیمخ david Kimche بۆ باخەوانە عەرەبەکەی ڕوندەکردەوە کە چۆن باخچە ڕازاوەکەی لە دەرەوەی شاری تەلئەبیب جارێکی دیکە دروستبکاتەوە. شێوازی کارکردنی ئەو شەرمنانە بوو، دەنگیشی نێرانە بوو بۆ ئەوە دەشیا لە هۆڵیکی گەورە قسە بکا، نەوەک فەرمان بداتە دو باخەوانی ڕەنگ دابزرکاو و دەستزبر. ئەو هزری بۆ لای کەسێک فڕی کە لە وەچەیەکی کاربەدەستە کۆلۆنیاڵە کۆنەکان بێ و لە شوێنیکی دور خزمەتی Union Jack (ئاڵای شانشینی یەکگرتو- وەرگێڕ-) کردبێ.

کیمخ لە ئینگلستان لەدایک و باوکێکی جوی چین مامناوەندی لەدایکببوو، بەڵام ڕەفتارو هەڵسوکەوتە بێخەوشەکەی دەتگوت سەر بە چینی باڵای بەریتانییە، بەڵام تەنها بە ئەکسەنتەکەیەوە وەک جلی گرانبەها لەبەر کەسێکی بیچم لاواز، خواردنی تەندروست و ڕاکردن بۆ وەرزش. ئەو بیست ساڵ بچوکتر دیار بوو لە تەمەنە شەست ساڵییەکەی، ئەو خۆی بە لاو دادەنا. شێوازی قسەکردنی لەگەڵ باخەوانە بەستەزمانەکان، بەوەی لەسەرەخۆ قسەبکا، پشوی درێژ بداتە قسەکانی وەک ناوبڕ، بیرکردنەوە لەوەی پێیانبڵێ، ئەوەش لە کەسێک فێرببوو کە لە زانکۆدا سەرپەرشتیدەکرد.

لە ڕاستیدا داڤید کیمخ وەک مایر ئامیت وێنایکرد ' یەکێک بوو لە عەقڵە هێزدارەکانی پشت ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد'. زیرەکییە بێ وێنەییەکەی هاوکار بوو لەگەڵ بوێرییە لە ڕادەبەدەرەکەی و توانای تاکو خۆپارێزترین کەسان بە کردە چاوەڕواننەکراوەکەی سەرسام بکا، بەو شێوەیەش دەیتوانی بەرامبەرەکانی ناچاربکا ڕێزیبگرن. لە لایەکی دیکەشەوە هەمان کەسایەتی زیرەک وای دەکرد کە ئەوانی دیکە زۆری لێنەیەنە پێشەوە، خۆشی بەدوردەگرت و ڕوانینێکی ئەبسرتاکتیانەی بۆ مرۆڤ هەبوو. زۆر لەوانەی لەژێر دەستیدا هەر وەک ڕافی ئیتان ڕایان وابوو: ' گەر داڤید بڵێ "بەیانیت باش"، ئەوا مێشکی ئەوە لێکدەداتەوە کە بەیانییەکە چەندی باش و خۆش بووە و چەندیشی ماوە وادەرچێ'.

لە نێو بازنەیەکی بەرینی مۆساددا وا تەماشای کیمخ دەکرا کە نیشانەی جاسوسێکی شۆڕەسوارانەیە، بەڵام لەگەڵیدا فێڵبازییەکەی لە پشیلەکانی سەرجادە دەچێ. کاری ئەو لەگەڵ مۆساد لە 1962ەوە و کەمێک دوای دەرچوونی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بوو. پاش ماوەیەک خرایە ڕیزی مۆساد، زۆریش نابێ مایر ئامیت سەرپەرشتیدەکا. ئامیت دەیەویست مۆساد بە عەقڵی کەسانی بڕوانامەداری زانکۆکان بەهێزبکا، وەک پێویستییەک بۆ پڕکردنەوەی بێبەزەیی کەسانی وەک ڕافی ئیتان، سود وەرگرتن لە بەهرە و کارامەییان کە بەکردەوە پەرەیانپێداوە.

چۆن و کێ کیمخی هێنایە ڕیز؟ پرسێکە و نایەوێ ئاشکرا بێ و خستویەتیە ناو باولێکی کلۆمدراو. لە دەم هەراش و بەندوباوەکانی دەزگا نهێنییەکانی ئیسرائیل هەندێ سیناریۆی جۆراوجۆر خولدەخۆن: گوایە ئەو لەسەر بانگهێشتی فراوینخواردنێکی چاپ و پەخشێکی لەندەنی کە جووێک بووە لەمێژە سایانە، واژۆی کردووە، یاخود پێشنیازەکە لە لایەن ڕابییەکە بووە لە یەکێ لەهۆڵی کۆبوونەوەکانی سیناگۆگێ لە Golders Green ، دەشگوترێ لە ڕێی خزمێکی دورەوە هاتۆتە ڕیزی مۆسادەوە.

بەڵام تاکە شتێکی دڵنیا ئەوەیە کە کیمخ لە سپێدەیەکی بەهاری سەرەتای شەستەکان لە بارەگای سەرەکی مۆساد وەژورکەوت و وەک کارمەندێکی نوێی بەشی ستراتیژی و پلاندانان دەستبەکار بوو. لایەکەی دیکەی دەروازەی بارەگاکە بەشی بانکی ئیسرائیل و نوسینگە جۆراوجۆرەکانی بزنسمانەکان قاوەخانەیەکی لێبوو. ئەوکات کیمخ نەیدەزانی چی لێچاوەڕواندەکرێ، ماوەیەک لە هۆڵەکە مایەوە پێش ئەوەی خۆی بناسێنێ. لە مێشکی خۆیدا لێکیدایەوە ئێرە چەند لەگەڵ دەرەوەی بارەگای سەرەکی سیا کە پڕوپاگەندەی لەبارەیەوە خوێندۆتەوە، جیاوازە؛ وەک دیوارو ژێرخانی مەڕمەڕ، لە دەروازەشەوە تابلۆیەکی گەورەی شانزە پەڵەی ئەستێراوی کە نیشانەی هەڵۆن ئەنجا بە درشتی لەسەری نوسراوە :central Intelligence Agency of the United States of America. لەسەر دیوارەێکیان ئەو ڕستەیەی یۆهانس (یۆحەنناJohannes شاگردی عیسای) : "راستی ئازادت دەکا" ی لەسەر نوسرا بوو. لەولاشەوە ئەسانسۆرەکان بوون هەریەکە و کارمەندێکی چەکداری لەدیار وەستاوە.

کەچی لێرە لەو هۆڵە ناشیرینەی بارەگای سەرەکی مۆساد لە شەقامی King Saulپاسەوانیکردن لە پشتی مێزەکانەوەیە. هەروەها لە هۆڵەکە خەڵک لەسەر کورسی وەک قاوەخانەکان دانیشتون. ئەوانە پێناچن لەشوێنێک بن کە کاری نهێنیی تێدا بکرێ. لە قوژبنە دورەکەی هۆڵەکە دەرگایەک کرایەوە کارمەندێکی لێهاتەدەر کە کیمخی دەناسی. لەوکاتەی لەگەڵی بە خەندەوە بەرەو دەرگاکە دەچوون، کارمەندە خانەخوێکە بۆی ڕونکردەوە کە پایە دیپلۆماتەکەی ڕوپۆشێکە مۆساد پێیبەخشیوە تاکو وەک کاتسایەک لە شانشینی یەککگرتوو کاربکا. لە بەردەم دەرگادا کابرا دو کلیلی دانە کیمخ و پێیگوت لەمەوپاش تۆ دەتوانی تەنها بەو کلیلانە بێیتە ئەو بارەگا سەرەکییەی مۆساد. کلیلێکیان بۆ دەرگاکە بوو، ئەوی دیکەشیان بۆ دەروی ئەسانسۆرێک بوو کە دەیگەیاندە نهۆمی هەشتەمی باڵەخانەکە. بە ڕاستی

بارەگاکە "خانویەک بوو لەناو خانوو"، خاوەنی وزەی کارەبای خۆی و ئاو زێرابی تایبەتی خۆی، سەربەخۆ بوو لەگەڵ باقی باڵەخانەکە.

لێرە لەدوای کۆتاییهاتنی شەڕی نۆکەندی سوێس لە 1956دا بارەگای سەرەکی مۆسادی لێجێگیرببوو .

لە مانگی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا هێزەکانی فەڕەنسی و بەریتانی و ئیسڕائیلی بەیەکەوە هێرشیانکردە سەر نۆکەندەکە تاکو دەسەڵاتەکەیان لە دوای خۆماڵیکردنەکەی سەرۆکی ئەوکاتی میسر جەمال عەبدولناسر، وەرگرنەوە. پەلامارەکە مۆری ' کورتەشەڕی دیپلۆماسی ' بەنێوچاوانەوە بوو کە ڕۆژئاوا لەمێژبوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لەبن دەسەڵاتدا بوو. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا هێشتا بەتەواوی لەهێرشەکە ئاگادارنەکرابوونەوە، کە پەلامارەکە بووە واقیع. ئەوە دوا نوزەی قەڵەمڕەویتی فەڕەنسی و بەریتانییەکان بوو لە ناوچەکە. واشنتۆن گوشارێکی خەستی دیپلۆماتی خستەسەر لایەنە شەڕکەرەکان تاکو کۆتایی بەهێرشەکە بێنن، لەترسی ئەوەی نەوەک یەکێتیی شۆرەوی هێزەکانی خۆی لەو ناکۆکییەدا بخاتە پاڵ میسر. لەو بارەدا دەبوایە هەردو سوپەر هێزە زاڵبەدەستەکە بەرامبەر یەک بوەستنەوە و شەڕبکەن. کاتێ تەقەی تفەنگ و تۆپەکان لە کەنارەکانی نۆکەندی سوێس بێدەنگکران، دەبوایە بەریتانیا و فەرەنسییەکان بیانزانیبایە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا وەک زلهێزێک جێی ئەوان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەگرێتەوە. ئیسڕائیل ئەوکات سوربوو لەسەر بەدەستەوەنەدانی ئەوخاکەی لە سینا گرتبووی. ڕیچارد هێلمس Rchard Helms کە دواتر بوو بە بەڕێوبەری سیا CIA، بەرەو تەلئەبیب فڕی، لەوێ لە بارەگای سەرەکی مۆساد لە لایەن سەرۆکی مۆساد پێشوازی لێکرا. لەچاوی هێلمسیان ئەوەی خوێندەوە کە " گروپی ماڵە باوانیان شانازی بەوە دەکەن کە ئەوان ماڵی نوێیان پەیدا کردووە" .

لەکاتی گەڕان بە ئەسانسواردا ڕێبەرەکە بۆ کیمخی ڕونکردەوە، لە نهۆمی سەرزەویدا مەکۆی گوێ لێهەڵخستن و پەیوەندییەکانە، لە نهۆمی یەکەمیشدا

نوسینگەی کارمەندەکانی پلە نزمە. هۆبەی لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانیش یەک نهۆمی تەواوی لەخۆگرتووە. نهۆمی باڵاش لەسەر لێکدەرەوەکان و نەخشە داڕێژەرو کارمەندانی ئۆپەراسیۆنەکان پاوانە. بەرزترین نهۆمیش نوسینگەی بەڕێوبەری گشتی و تاقمەکەیەتی.

نوسینگەیەکیان لە لای نەخشە و ستراتیژداڕێژەرەکان دایەکیمخ. نوسینگەکەی وەک هەمو نوسینگەکانی دیکە ڕاخسترابوو، وەک مێزێکی دارینی هەرزان، سندوقێکی پۆلاینی بۆ ئارشیف کە تەنها یەک کلیلی هەبوو، تەلەفۆنێکی ڕەش، لەگەڵ ڕابەری تەلەفۆنەکانی نێوخۆ کە لەسەری نوسرابوو" لەگەڵ خۆتی مەبە". دارو دیوار بە ڕەنگی کەسکێکی زەیتونی بۆیە کرابوون، پەنجەرەکەش دیمەنی جوانی شارەکەی نیشاندەدا. هەموش بە ڕایەخێکی تەنک ڕاخرابوو. دوای 13 ساڵان باڵەخانەکە نیشانەی ڕوخانی پێوەدیار بوو، ڕەنگی سەر دیوارەکان کە چەند جاریش بۆیە کرابووەوە، کاڵ ببووەوە، ڕایەخەکەش داخورا بوو.

لەگەڵ ئەو هەمو کەموکورتیانەش کیمخ هەستیکرد لەسەردەمێکی وەرچەخاندا هاتۆتە نێو مۆساد. خواحافیزییەکەی مایر ئامیت لەکردندایە و دوای ڕۆیشتنەکەی زۆر نابا ڕافی ئیتان و هەندێ گەورە ئەفسەری دیکەی مۆسادیشی بەدوادا دێن.

کیمیخ هەر زو سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی هاوکارەکانی پەرەی بە ڕوانینی خۆیدا: ئەو شیکارەی کە مەزندەکارییە نەگۆڕاوییەکان بەو گوتانە ڕابەڕایەتی دەکا:' ئەوە مانۆڕێکی ئاوروپییە، بەشێوازی خۆی بەقەد کلاوزفیتز Clausewitz کلاسیکە' یان ئەو سەرۆک بەشەی کە ڕەفتارەکەی شتی دەدرکاند، بەوەی توتنەڕەشەکەی پایپی دەستی دەپەستا، کە ئەوە هەمو لایەک دەیزانی کە بڕیار لەسەر چالاکییەک دراوە، یاخود ستراتیژی دانەرێک هەمیشە کە نامەکانی لەنێوزەرفدا دادەخست لەگەڵیدا ڕادەگەیاند ، کاروباری جاسوسی دەرسێکە لەسەر لاوازییەکانی مرۆ. ئەوە شێوازی ئەو پیاوانە بوو کە شایانی بوون، هەموشیان بەخێرهاتنیان لە کیمخ کرد، کە گیان و شێوازی

کارکردنی وایە بەردەوام بتوانی چارەسەری کێشەکان لەسەروبنەوە بکا. هەروەها لەوەش گەیشتن کە لێتێگەیشتنی زانیاری چەواشەکاری دوژمن بەقەد بەردەوامبوونی پەیوەندییە زانیارییە چەواشەکارییەکانی مۆساد گرنگە.

بەشێکی ئیشەکەی کیمخ بریتی بوو، لە بەوردی خستنە بەرچاوی پێشهاتەکانی وڵاتی مارۆکۆ، لەوێ لەژێر ڕژێمی چەوسێنەرانەی شا حەسەن کۆمەڵێکی بەرچاوی جو دەژین. بۆ سوککردنی باری ژیانیان مایر ئامیت پەیوەندییەکی پیشەییانەی لەگەڵ دەزگای بەسامی ئاسایشپارێزی ناوخۆی ماراکۆ دروستکرد، ئەوەش لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکی هاوبەش بەرامبەر جوڵەکانی سەرۆکی میسر عەبدولناسر، چونکە دوژمنایەتی ناسر بۆ ئیسرائیل بەقەد ناحەزییەکە بوو بەرامبەر حەسەن. ناسر ئەوەی لەپاشای ماراکۆ دەبینی کە کۆسپێکە لەبەردەم بەدیهێنانی خەونەکانی لە هاوپەیمانییەتییەک هەر لە نۆکەندی سوێسەوە تاکو کەناری ڕۆژئاوا لەسەر زەریالوشی ئەتلەنتی بگرێتەوە. مەترسی بیرۆکەی ئەو یەکگرتنە، مایر ئامیتی هێنایە سەر ئەو ڕایە کە هاوکاری ڕژێمی مارۆکۆیی بکات و دەزگای دژە جاسوسیان فێری تەکنیکەنانی خۆی و شێوازەکانی کوشتنی پابەند بەئازاردان بکا.

لە مارۆکۆدا ئۆپۆزسیۆنێکی بچوک لە قەوارە، بەڵام نەوەک لە بێبەزەییدا بەڕابەرایەتیی مەهدی بن بەرکە Mahdi Bn-Barka هەبوو. کیمخ ژیان و کارنامەی بن بەرکەی خستەنێو نەخشە: ئەو سەرەتا مامۆستایەکی دڵسۆزی شا بوو، پاشان سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاوێژی نەتەوەیی پاشا، کە لە ڕاستیدا پەرلەمانێکی بێزمانی وا، کە نەیدەتوانی بەرەنگاری بۆنەنامە چەوسێنەرەکان دژی گەلی خۆی ببێتەوە. دوای هەموان تاکە قسەکەری دەنگ دلێری نەیار دژی پاشا. جار لە دوای جار بن‌بەرکە لە دوا چرکەدا لە گرتن و زیندانیکردن دەربازی دەبوو. بن‌بەرکە زانی کە زیندانیکردنەکەی تەنها کێشەی کاتە بۆیە بەخۆی و کەسایەتییە کاریزمایەکەی بۆ ئاوروپا تێیتەقاند. لەوێ زۆر کارابوو لەسەر ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی شا حەسەن.

بن بەرکە دو جاران کردەی تەقینەوە، بچوک بەڵام کاریگەرییانەی بەرەنگاربوونەوەی خێواندە ڕژێم و ژیانی پاشای گەڤدارکرد، بەڵام لە دوا چرکەساتدا پوچەڵکرایەوە. پاشای تورە فەرمانیدا بنبەرکە هەر بە دزی بگرن و لەسێدارەیبدەن، کەچی کاردانەوەی بنبەرکە کردەی تەقینەوەیەکی دیکە بوو بۆ سەر پاشا.

شا حەسەن لە ئایاری 1965دا داوای لەمۆساد کرد بۆ لەناوبردنی بنبەرکە یارمەتییبدەن. ئەرکی هەڵسەنگاندنی ئەو داوانامەیە بە داڤید کیمخ سپێردرا. هەر هەمان مانگ کیمخ بە پاسپۆرتە بەریتانییەکەی بە بیانوی پشو بەرەو لەندەن فڕی. لە ڕاستیدا دەیەویست دواپنت لەسەر پیتەکانی پلانەکەی دابنێ. ئەنجا لەوێ بە پەساپۆرتی دوهەمی کە پەساپۆرتێکی قەڵبی ڕاستیئاسا، کە لەسایانێکەوە بۆی هاتبوو لەگەڵ ڤیزەیەکی مارۆکۆیی لەسەر، چووە ڕۆما، ڕۆژێک لەوێ مایەوە تاکو وا بکا ئەو نیازی دیکەی نییە و لە لایەن کەسیشەوە چاوەدێری ناکرێ، تاکو لەوێشەوە بچێتە مارۆکۆ.

لە فڕۆکەخانەی ڕەباتدا لە لایەن موحەمەد ئۆفکیر Muhammed Ufkir ی وەزیری ناوەخۆی بەسام پێشوازی لێکرا. ئەو ئێوارەیە لەسەر خواردن کە لە لایەن چەند سەماکەرێکی هەرە باشەوە گوێیان لێگیرا، ئۆفکیر بۆ میوانەکەی ڕونکردەوە کە پاشا سەری بن بەرکەی دەوێ. لەگەڵ ئەو ڕونکردنەوەیەدا وەزیر تاکو کەشی دانیشتنەکە خۆش بکا، کە تەنها ئەوەندە زانیارییەشی لەسەر دیرۆکی جولەکان هەبوو، گوتی: ' لە دوایدا وەک لەمێژوشدا هاتووە کە شازادەخانی ئێوە سالۆمێ Salome سەری پاشا هیرۆدس Herodesی حەساندەوە".

کیمخ پێیگوت ڕاستە وابوو، بەڵام بەداخەوە بڕیاری ئاوا لەدەسەڵاتی مندا نییە. ئۆفکیر دەبوایە لەگەڵیدا بگەڕێتەوە ئیسرائیل.

ڕۆژی پاشتر بەجوتە بۆ ڕۆما فڕین و پاشانیش بۆ تەلئەبیب. مایر ئامیت خۆی لە یەکێ لەخانوە ئارامەکان دانیشتنێکی لەگەڵدا سازدا. ئەو بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ڕەفتاریکرد، بەڵام کە تەنها خۆی و کیمخ بوون بە

ئاگادارییەوە گوتی ' من خۆشحاڵ نیم بەو کردەوەیە، بۆ ئۆفکیر دەستمان ئالودە بکەین، ئەو لەسەرئەوە ڕاوەستا کە دەبێ پشکی ئێمە لەوکارەدا تەنها ئامادەکاری بێ'.

ئەوەی کەمایرئامیر نەیدەزانی دەستتێکەڵکردنی ئۆفکیر بوو لەگەڵ دەزگایەکی فەڕەنسی دژە جاسوسی بەناوی Service de Documentation Exterieure et de Contre- Espionage بۆ کوشتنی بنبەرکە، کاتێ کە هەڵکەوت ناوبراو لە ڤیلاکەی خۆی دەربهێنرێ و بێتە سەرسنوری سویسرا – فەڕەنسا. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا مائیر ئامیت لەگەڵ کردەکەدا نەبوو، بۆیە بڕیارەکەی بردەوە لای سەرەک وەزیرانی ئەوکات لیڤی ئەشکۆل Eshkol Levi. سەرەک وەزیرانیش پلانەکەی پەسندکرد.

ئیدی مۆساد کەوتەگەڕ. کاتسایەکی لەدایکبووی مارۆکۆیان ناردە جنێف، لەوێ توانی نزیک ڤیلاکەی بنبەرکە ببێتەوە دزەی بۆ بکا. لە ماوەی چەند مانگێکدا کاتساکە هاتە سەر ئەو بیرۆکەیەی بڵێ بنبەرکە هاموشۆی ملیۆنێرێکی فەڕەنسی دەکا، کە هەواداری بزوتنەوەی بەرەنگاری شا حەسەنە و دەیەوێ شا حەسەن لەسەر تەخت نەمێنی و لەجێیدا حکومەتێکی دێموکراتی فەرمانڕەواییبکا. چیڕۆکەکە لای کیمخ بوو. لە 26ی ئۆکتۆبەری 1965دا هەواڵی بۆهات کە بنبەرکە وەک Rode Pimpernel (کەسێک بوو سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسا و بەقاچاخ دەردەچواند، کەسایەتی ڕۆمانی Baronesse Orczyکەلە 1905 بڵاوکراوەتەوە–وەرگێڕ–) دەیەوێ بچێتە پاریس.

سەنتەری پەیوەندییەکانی مۆساد پەیامێکی کۆدەداری بۆ ئۆفکیر بۆ مارۆکۆوە نارد. ڕۆژی پاشتر وەزیری ناوەخۆی ماراکۆ(مەغریب) لەگەڵ تاقمێکدا گەیشتنە پاریس، لەوێ جەنابی وەزیر لەلایەن بەکرێگیراوەکانی SDCEفەڕەنسی لە وردەکارییەکان ئاگادارکرانەوە. ئەو لەوێ لە ڕێی کیمخ تەلەفۆنی بۆ پیاوەکەی مۆساد کرد کەسایەی بنبەرکە بوو، تا شتی دیکەیان

پێبڵێ. کیمخ بە مایەری گوت ئەو دەستورپێدانی دەوێ. هەردوکیان هاوڕا بوون، دواتر ئامیت بەوشێوە ڕایەکەی دارشت " باش نییە بەرەو ئاگرەکە بڕۆن، دەبێ بەپێچ بۆ شتەکە بچین".

ئێوارەی پاشتر ئۆتۆمبێلی بەدواداگەڕانی SDECE لەبەردەم دەروازەی چێشتخانەکەی St. Germaine District لەپاریس ڕاوەستا. لەو ئێوارەیەدا بنبەرکە ویستی فراوین بخوات و چاویشی بە ملیۆنێرەکە بکەوێ. کاتێک ئەو سعاتێک چاوەڕوانیکرد، بەڵام کەس پەیدا نەبوو، بڕیاریدا هەستێ و بڕوا. هەر ئەو گەیشتە دەرەوەی چێشتخانەکە، دو پیاوی SDECE گرتیان و خستیانە نێو ئۆتۆمبێلەکەیان. ئەوان بنبەرکەیان بردە ڤیلایەک لە گەڕەکی Fontenery-el-Vicomte کە دەزگاکە جاربەجار بۆ لێکۆڵینەوە لە کەسە گومانلێکراوە گرتووەکانی بەکاردەهێنا. هەمو شەوەکە ئۆفکیر سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەکەی دەکرد، کە ئازارێکی وایدا ڕۆژی پاشتر بنبەرکە وەک کابرایەکی ڕوخاو لەسێدارەدرا. ئۆفکیر وێنەی تەرمەکەی پێش شاردنەوەی لە باخچەی هەمان ڤیلاکەدا گرت. جەنابی وەزیر بەخۆی وچەکەکەی کە فلیمەکە بوو گەڕایەوە ماڵ و نیشانی پاشای دا.

کاتێ تەرمەکەش دۆزرایەوە، هەر لە جەماوەری فەڕەنسی تا کۆشکی ئەلیزێش ناچاربوون داوای لێبوردن بکەن، نەوەک هەر ئەوەندە بەڵکو شاڕل دیگۆل بڕیاری لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی دا و بەهۆیەوە پاکسازی هەمو دەزگای SDECE یشی گرتەوە. بەڕێوبەری دەزگای نهێنی فەڕەنسی هەوڵێکی زۆریدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆساددا ڕابگرێ و مۆساد لەوکێشەیە بە دوربگرێ، بەڵام دیگۆل کە لەکۆنەوە دۆستی ئیسرائیل بوو، بڕوای وابو کە لەو کارەدا جێدەستی مۆسادی پێوەدیارە. بە کاردەبەستە نزیکەکانی خۆی گوتبوو هەموو کردەوەکە " دروستکراوی تەلئەبیبە ". ئەو گوتی تەنها ئیسرائیلییەکان ئەو کارە بەسەدایانە دەکەن، ئەوەش بێڕێزکردنی قانونی نێودەوڵەتییە. ئیدی کاتی پەیوەندییە قوڵەکەی نێوان فەڕەنسا و ئیسرائیلی سەردەمی شەڕی نۆکەندی سوێسی 1956 بەسەرچوو. لە

پڕێکەوە دیگۆل بڕیاریدا هەمو کردەی چەکدانە ئیسرائیل بوەستێنن، بەوەش کۆتایی بەهاوکاری نێوان دەزگا نهێنییەکانیان هات. مایر ئامیت ئـەوە ' وەک مشتەکۆڵەیەک لە پاریسەوە بە بیر خۆی دێنێتەوە'.

لـەچاوی کیمخ ' زۆر بەئاسـانی هەڵوێسـتی مـایر ئـامیتی پاڵەوانانـە هاتـە بەرچاو، چونکە ئەو دەیتوانی شانەی دەرەنجامەکانی ئەو کردەوەیە لەسەری من و ئەوانی دیکە بشکێنێ، بەڵام لەبری ئەوە بەرپرسیارێتیەکەی بە تەواوی گرتە ئەستۆی خۆی. ئەو بەڕاستی سەرکردە بوو'.

حکومەتی ئەشکۆلی سەرەک وەزیران لەبەر کاردانەوەی پاریس شلی کرد و خۆی لە بەڕێوبەری مۆساد بـەدورگرت. لـەوەش قورسـتر دەنگی ڕەخنـە لـە قوژبنێکی چاوەڕواننەکراودا بەرزبووەوە. هەرچەند مایر ئامیت دەیگوت ڕۆڵی مۆساد لە پەراوێزەوە بووە، زیاتر لە پێدانی دو پاسپۆرت و بـەکرێگرتنی ئۆتۆمبێلەکان نەبووە، دەنگی نارەزایی بەرامبەرانی زیاتر دەبوو بە تایبەتیش ئایسـەر هارێل Isser Harel کـە پێش خۆی بەڕێوبـەری مۆسـاد بـوو، دەیقیژاند لەسـەردەمی من کـەتنی وەک بنبەرەکـە هـەرگیز ڕوینـەداوە. مـایر ئامیت هۆشداری دایە سەرەک وەزیران کە لەوانەیە ئەو کاردانەوەیە سەری هـەردوکیان بخـوا. ئەشـکۆل لـە بەرامبـەردا کۆمیتەیـەکی لێکۆڵینـەوەی بـە سـەرۆکایەتی گۆلـدا مـایرGolda Meirخانمـە وەزیـری دەرەوە پێکهێنـا. کۆمیتەکـە بـە دەرەنجامێکـەوە هاتـەوە، کـە دەبـێ مـایر ئامیـت دەسـت لەکاربکێشێتەوە، بەڵام مایەر ئەو هەڵوێستەی تا سەرەک وەزیرانیش هەمان شت نەگرێتەبەر، ڕەتکردەوە. ئەو پێشهاتە بـاری کشـماتی هێنایـە ئـارا. پـاش ساڵێک مایر ئامیت هاتە سەر ئەو بڕوایە کە نـاتوانێ زیـاتر لـە ژێر هێرشـە ئاگریناوییەکانی کوشتنی بنبەرکە بمێنێتەوە، بەڵام ئەوەش لەهیچی نەگۆڕی کە ئاخۆ کەتنەکە بووە مایەی سەرخواردنی؟

لەو نێوەدا کیمخ هەندێ کاروباری دیکەی بۆ پەیدا بوو. فەلەستینییەکان بە نهێنی دەستەیەکی کۆماندۆیان مەشقداوە تا لە خاڵێکی لاوازی ئاسایشپارێزی کۆمەڵگەی ئیسرائیلی دزە بکەن، کە مۆسادیش پێشتر خەمی لێ نەخواردبوو،

ئەویش ڕفاندنی فڕۆکەکانە بە تەواوی سەرنشینەکانییەوە. گەر ئەوان دەست بەسەر فڕۆکەیەکی وا دابگرن، ناچاریدەکەن لە پایتەختێکی عەرەبی دۆستیان بنیشێتەوە. لەوێش سەرنشینەکان بەبارمتە دەگیرێن، ئەوسا چ داوای بڕە پارەیەکی زۆر بکەن، یاخود بە گیراوە فەلەستینییەکانیان بگۆڕنەوە. سەرەڕای ئەوەش هەواڵەکە دەنگدانەوەیەکی زۆری لەمیدیاکانی جیهاندا دەبێ، ئەوەش خەڵاتی سەربارە بۆ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی PLO .

لە تەمموزی 1968دا فڕۆکەیەکی ئەلعال لە ڕۆماوە ڕفێنراو ناچارکرا لە جەزائیر بنیشێتەوە. مۆساد لەبەر ئەو کردە ئاسان و بوێرانەیە چاوی هەڵدەگلۆفتن. لەو کاتەی کیمخ و هاوڕێ پلاندارێژەرەکان سەرقاڵی دۆزینەوەی نەخشەیەک بوون بۆ ئازادکردنی سەرنشینە تۆقیوەکان، کاتسایەک بەرەو جەزایر فڕی. هەر هەوڵێک بۆ پەلاماردانی بارمتەکارو بارمتە کراوەکان کۆسپی ئامادەبوونی کامێرای میدیای جیهانی لەبەردەمدا بوو. کیمخ ڕای وابوو کە کات بدرێتە هەرکردەیەکی ڕزگارکەرانە، چونکە بە تێپەڕبوونی ڕۆژ هەواڵەکان ڕۆژەڤ نامێننەوە، تا ئەو کاتیش کاتساکان جێی خۆیان لەوێ دەگرن. ڕفێنەرەکان بەردەوام هەڕەشەی خوێنڕشتنیان دەکرد، گەر بێت و داخوازییەکانیان جێبەجێنەکرێن. داخوازییەکانیشیان بەردانی گیراوە فەلەستینییەکانی گرتوخانەکانی ئیسڕائیل بوون. حکومەتی جەزائیریش پشتگیری بارمتەکارەکانیان دەکرد. کیمخ واقیعیانە بیری دەکردەوە دەیگوت ' ئێمە لەنێوان دو ئاگران داین'. ئەو لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە دژی گۆڕینەوەی گیراوەکان بوون بە سەرنشینە بارمتەکراوەکان، چونکە ' پێویستە دەرەنجامی ئەو بازرگانیکردنە بەهەند هەڵبگرین و هەڵی بسەنگێنین'. ' لەسەرکەوتنیان ڕێگە بۆ ڕفاندنی دیکەش خۆش دەبێ. لەمەوپاش کاروباری PLO گەورەترین ڕوبەری میدیاکان دەگرێ. ئیسڕائیل چۆتە باری بەرگرییەوە هەروەک دەوڵەتێکی ئاوروپی کە کارێکی وای لێدەقەومێ، بەڵام ئایا ئێمە چی بکەین، ئەوە لەسەر کردەی رفاندنی دادێ وەستا بوو ؟'

ئەوان هەر ڕانەدەوەستان، هەر ڕفاندنێکی دیکە ئامادەباشی زۆرتریان بۆ کردبــوو. لــە ماوەیــەکی کەمــدا توانیــان کــەمتر لــە شــەش فڕۆکــەی سەرنشـینهەڵگر کۆنترۆڵبکەن. ئەوان تـەنها هـەر لـە شـاردنەوەی چـەک و تەقەمەنی بۆ ناو فڕۆکەکان پسپۆڕ نەبوون، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش مەشقی لێخــوڕینی فڕۆکەشــیان پێکرابــوو، کاتێــک پێویســـت بــێ بچنـــە ژوری فڕۆکەوانـەکان و جێگـەی ئـەوان بگرنـەوە. ئـەوان لـە بیابـانی لیبیـا مەشـقیان لەسەر ڕفاندن و شەڕی نێو فڕۆکەیان دەکرد، چونکە دەیـانزانی لەمـەوپاش فڕۆکـە بێ پاسـەوانی چەکدارهەڵناسـتێ. هەڵنەسـتانی فڕۆکـە بێ پاسـەوانی چەکدار یەکـەمین کردەکاردانـەوەی کیمخ بـوو. هـەروەها ئـەو بـە تـەواوی پێشبینی ئەوەشی کردبوو کە ڕفێنەران شارەزای قانونی ئەو وڵاتانەشـن کـە فڕۆکــەکانیان بــۆ لێــوە دەڕفێــنن، تــاکو بتــوانن لــە ڕێــی دانوســتانەوە داخوازییەکانیان بچەسپێنن و ناچاریان بکەن گوێیان لێبگرن.

کیمخ لەوە تێگەیشت کە مۆساد بە ناچاری پێویسـتی بـە پێشـهاتێکە تـاکو دەرفەتێکی وای بۆ ڕێکبکەوێ دەرسێک بدەنە ڕفێنەرەکان، دەرسێکی بەسام وەک ئەوەی مۆسادی پێوە ناسراوە: دەرسی فێڵبازی و بێبەزەیی. هەروەک ڕفێنـەرەکان سـودیان لـە میـدیاکان وەرگـرت، کیمخـیش دەیوسـت کردەیـەک ئەنجام بدەن بەقەد گرتن و دادگاکردنی ئایخمان بە بەرژەوەندی ئیسرائیل لە جیهاندا دەنگبداتەوە. ئەو ڕوداوەی کیمخ پێشبینیدەکرد تێکەڵییەکی دراماتیکی و سـەرچڵییەکی بەرچاوانـە بـوو بـە دەرەنجـامێکی دەرفـەت قۆسـتنەوە. ئـەو توخمە پێکهێنەرانە بۆ هەمو لایەکی روندەکاتەوە کە مۆساد دەستپێشـخەری بۆخۆی دەگەڕێنێتەوە.

لە 27 ئایاری 1976دا فڕۆکەیەکی سەر بە هێڵی ئاسمانی فەڕەنسی کە لە سەرنشینانی جو تەژی بوو لە پاریسەوە بۆ تەلئەبیب، لەوێستگەی وەستانی لە فڕۆکەخانەی ئەسیناوە، کە فڕۆکەخانەکە بە شلیی ئاسایشپارێزی ناسراو بوو، ڕفێندرا. ڕفێنەرەکان تاقمی تیرۆرستی وادی حەداد Wadi Haddad بـوون و دو داواکاریـیان هـەبوو: بـەردانی (40) چـل گیـراوی فەلەسـتینی لـە

گرتوخانەكانی ئیسرائیل لەگەڵ ئازادكردنی دوانزە ( 12) گیراوی دیكە لە گرتوخانەكانی ولاتانی ئاوروپادا، بێجگە لەوەش بەردانی دو تیرۆرستی ئالمانی كە لە كینیا گیرابوون و ویستبویان بە ڕۆكێتی سام 7 فڕۆكەی جەنگی ئەلعال لە فڕۆكەخانەی نایرۆبی لە كاتی هەڵسانیدا، بخەنە خوارەوە.

دوای كورتە وەستانێكی لە كازابلانكادا خەرتوم مۆڵەتی نەدا لەوێ هەڵبنیشێتەوە، دوایی ڕویكردە ئەنتەبە Entebbe لە ولاتی ئۆگەندا Oegenda. لەوێ ڕفێنەرەكان جاڕیاندا كە ئەوان فڕۆكەكە بەسەرنشینەكانەوە، گەر بێت و داخوازییەكانیان بەجێنەهێنن دەسوتێنن. دوا ماوەشیان 30 ئایار دانا.

لە دوای دەرگا داخراوەكان كابینەی حكومەت لە تەلئەبیب كۆبوەوە زیاتر ئەو بیرۆكە لایان گەلاڵە دەبوو: هیچ لەبەردانانێك بۆ تیرۆرستان ناكەین' هیچ مەرجێكیش قبوڵ ناكرێ. ڕابینی سەرەك وەزیران ڕاپۆرتێكی شین بێت Shin Bet( دەزگای ئاسایشی ناوەخۆی ئیسرائیل) خستە سەرمێز، كە تیایدا هاتبوو پێشینە هەیە بۆ ئازادكردنی تاوانباران. سەرۆكی دەستەی هێزە چەكدارەكان مۆردەخای Mordechai Gur ئاماژەی ئەوەی دا كە ئەو ڕای لەسەر كردەیەكی سەربازی نییە، لەبەر كەمی زانیاری دەربارەی ئەنتەبە. لەوكاتەی ئەوان بەترسەوە درێژەیان بە گفتوگۆكانیان دەدا، هەواڵێك لە ئەنتەبەوە هات بەوەی دەستیان بە لە یەكجیاكردنەوەی سەرنشینە جووەكان لە غەیری جو كردۆتەوە، ئیدی غەیرە جووەكانیان ئازاد كردون، وا دەگەڕێنەوە پاریس.

ئەوە ئەو دەرگا كردنەوەیە بوو كە مۆساد پێویستی پێبوو. ئیسحاق هۆڤی Yitzhak Hoviبەڕێوبەری گشتیی ئەوسای مۆسا كە پێدەچوو تۆپكەی سەردەمی كارنامەی بێ، بڕوای وابوو و زۆریشی پێدادەگرت و لە ناخەوە داوای كردەیەكی ڕزگاركەرانەی لێكردن. ئەو نەخشەی ڕافی ئیتان بۆ گرتنی ئەدۆلف ئایخمانی لە ئەرشێف دەرێنا و تۆزە لەسەر نیشتووەكەی لەسەر لابرد و لێیكۆڵییەوە. هەندێ خاڵی لەیەكچوو هەبوون: ئیتان و پیاوەكانی

دەبوایە لەدور، لە خاكێكی دوژمناوی دەستبەكاربن و بگەڕێنەوە. ئەوان دەبوایە بەیارمەتی فایلە ئەستورەكە هەنگاوی قەبە هەڵێنن. هۆفی تا چاوی لەسەر ئامادەبووانی پشت مێز وەربگێڕی هەردەیگوت و دەیگوتەوە كە شتێكی ئاوا دەكرێ بێتە جێ، تا دەنگی سوار بوو.

' ئەگەر ئێمە لێبگەڕێین خەڵكمان بمرێ، وەك ئەوەیە دەروی كونەكان بكەینەوە. ئەوكات هیچ جوویێك و لەهیچ شوێنێك ئاسایش نابێ. ئەوكات هیتلەر لە گۆڕەوە سەركەوتو دەبێ'!

ئەوسا ڕابین گوتی " دەباشە، كەواتە ئێمە هەوڵدەدەین".

لەگەڵ كیمخ هەمو ستراتیژ و پلاندانەرەكان دەستبەكاربوون. یەكەمین كار پەیوەندی ئاسایشداری نێوان تەلئەبیب و نایرۆبی بوو، پەیوەندی مۆساد و دەزگای كینی كە كاتی خۆی مایر ئامیت دروستی كردبوو هۆفیش پاراستی. هەنوكە ئەو پەیوەندییە بەریگرت. كاتسایەكی شەش كەسی نێردرانە نایرۆبی و لە خانوێكی ئارامی دەزگای نهێنیی كینی جێگای خۆیان گرت. ئەوان دەبێ وەك پردی پەڕینەوەی دەستەی هێرشبەر بكەونە كار. لەو نێوەدا دەبوایە كیمخ خۆی بە كێشەیەكی دیكەوە خەریكبكا. هەر كردەیەكی ڕزگاركەرانە دەبوایە لە نایرۆبی وێستگە بۆ سوتەمەنی پڕكردن دابینبكرێ. ئەو دەستی دایە تەلەفۆن و لە ماوەی سعاتێكدا سەركەوت بڕوا بە دەستەڵاتی كینی بێنێ، لەو ڕوەوە لەسەر بنەمای "هۆكاری مرۆیی" یارمەتیانبدا.

هێشتا گرفتێكی گەورەتر مابوو: ئایا چۆن بگەنە ئەنتەبە؟ PLO فڕۆكەخانەی ئەوێی خستبوە ژێر هەژمونی خۆی بۆ ئۆگەندا، لەوێوە ڕێكخراوی فەلەستینی دژایەتی ڕژێمی ئەپارتایدی دۆستی ئیسڕائیلی لە باشوری ئافریقادا دەكرد. عیدی ئەمین Idi Amin دكتاتۆری ستەمكارو بەسامی ئۆگەندا دوای پەیوەندی بڕینی لەگەڵ ئیسڕائیل لەساڵی 1972دا، باوەشی بۆ PLO گرتبووەوە تەنانەت باڵەخانەی باڵوێزخانەی ئیسڕائیلیشی دابوونێ.

لای کیمیخ چارەنوسساز ئەوە بوو، کە بزانێ ئاخۆ هێشتا PLO لەکینیا ماون یان نا. جەنگاوەرە سەرسەختەکانی PLO ئەو توخمانەن کە سەربکەون، لەو ماوە کورتەی کە کردەیەکی ڕزگاریکەرانە پێکبهێنن: سەربازە ئیسرائیلییەکان هەر یەک دو خولەک دەبێ لەسەر زەوی بمێننەوە، ئەگەرنا ڕوبەڕوی سەرچڵییەکی ترسناک دەبنەوە. کیمخ دو کاتسای لەنایرۆبییەوە بە بەلەم بەرەو گۆلی ڤیکتۆریا نارد. ئەوان خۆیان گەیاندە نزیک ئەنتەبە دیتیان بارەگای PLO چۆل دەکرێ: فەلەستینییەکان زۆر نابێ ئەوێیان بەجێهێشتووە چوونەتە ئەنگۆلا.

لەوکاتەدا ئەو پێشهاتە بە قازانجی سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکە زانرا. یەکێک لە پۆلیسی دەزگای نهێنیی کینی کە یاوەری کاتساکان بوو، بۆی دەرکەوت یەکێک لەخزمەکانی ژنەکەی ئەندامێکی پاسەوانی بارمتەکانە لەفڕۆکەخانەکەدا. کینییەکە بەبەهانەیەکەوە خۆی گەیاندە فڕۆکەخانەکە و دیتی کە بارمتەکان هەمویان ماون، بەڵام لەهەمان کاتیشدا 15 ڕفێنەری تورەی چەکداری لەوێ هەن. ئەو زانیارییە ناردرایە تەلئەبیب.

لەو نێوەدا دو کاتسا دو فڕۆکەوانی ئەزموندار و فڕۆکەیەکی Cessna بەکرێگرت، لە نایرۆبییەوە بۆسەر گۆلی ڤیکتۆریا فڕین، گوایە وێنەی گەشتیاریی گۆلەکە دەگرن. فڕۆکەکە بەسەر فڕۆکەخانەی ئەنتەبەدا چوو، لەسەر فڕۆکەخانەکە کاتساکە وێنەیەکی ڕونیی فڕۆکەخانەکە و ڕێگاکانی گرت و ناردیەوە تەلئەبیب. کیمخ ئەو وێنەی بۆ سەرلێشواندنی ڕفێنەرەکان بەکارهێنا.

بە گوێرەی تەلەفۆنە هەمەجۆرەکان کە لەگەڵ کۆشکی دیکتاتۆری ئۆگەندا عیدی ئەمین و لایەنی دانوسانە ئیسرائیلییەکان دەکرا، تەلئەبیب ئەوەی نیشاندەدا کە حکومەتەکەی ئامادەیە مەرجەکانی ڕفێنەران لەبەرچاوبگرێ. دیپلۆماتێکی ئەنجومەنی ئاوروپا لە ئۆگەنداوە بەکارهێنرا تاکو وەڵامدانەوەی لەبەر نواندنەکەی ڕاستگۆیانە بخاتەبەرچاو : ئەو بەمتمانەوە ' داوای کرد هەوڵی ئەوە بدا کە لەگەڵ ڕفێنەرەکان بەیەکەوە دارشتنێک دابنێن مایەی

پەسندکردن بێ'. کیمخ لە دیپلۆماتەکەی گەیاند :' نابێ دارشتنەکە بۆ ئیسرائیل ئابڕووبەرانە بێ، بەڵام نابێ لەهەمان کاتیشدا وابێ، کە ڕفێنەرەکان بێ ئومێد بکا'. دیپلۆماتەکە بەلەز بۆخۆی و هەواڵەکە بەرەو فڕۆکەخانەکە ڕۆیشت تا ئەرکە زەحمەتەکەی لە دارشتنێکی بەجێدا ببینێتەوە. ئەو لەوێ هێشتا هەر خەریکی کارەکەی بوو کە ئۆپەراسیۆنی بروسکەتۆپ Thunderball لە قۆناخی کۆتاییدا بوو.

فڕۆکەیەکی بۆینگی 707ی ئیسرائیلی بێ ژمارە کە دو فڕۆکەوانی سەربازی شارەزا بە فڕۆکەخانەی ئەنتەبە، لە فڕۆکەخانەی نایرۆبی نیشتەوە. ئەو فڕۆکەیە وەک فڕۆکەیەکی نەخۆشخانە دەکەوێتە گەڕ. شەش کاتساش لە دەوروبەری فڕۆکەخانەکە جێی خۆیان گرت. هەریەکەیان چەکدار بە ڕادیۆ نێرەرێکی HF و ئامێرێکی ئەلەکترۆنی تەشویشکار کە هاتوچۆ دەشێوێنێ. ئەو ئامێرە هێشتا بەکردەوە لەشەڕدا تاقینەکرابووەوە.

پەنجا پەرەشوتوانی فڕۆکە خەستەخانەییەکە فڕۆکەکەیان بەجێهێشت بۆ گۆلی ڤیکتۆریا. لەوێ بەلەمە چوپەکانیان فودان و سەوڵیان لێدا تاگەیشتنە کەناری ئۆگەندا و ئامادە بوون بۆ هێرشکردنە سەر فڕۆکەخانەی ئەنتەبە. لە تەلئەبیب دەستەی ڕزگاریکار مەشقی تەواویان پێدرابوو. لە کاتی پێویستدا فڕۆکەی گواستنەوە جۆری C-130 Hercules بەسەر دەریای سوردا ڕوەو باشور فڕی، لە نایرۆبی سوتەمەنی هەڵگرت و بەسەر تۆپکی لێرەواری کینیا فڕی تا لە ئەنتەبە نزم ببێتەوە.

ڕادارە تەشویش پەیاکەرەکە زۆر بەچاکی کاری خۆیکرد. دامودەزگای هاتوچۆی ئاسمانی بە تورەییەوە هەوڵی ئەوەی دەدا، بزانێ بۆچی لەکاتی نیشتنەوەی سێ فڕۆکەی گواستنەوەی هێرکولیس و فڕۆکەیەکی خەستەخانەدار پشێوی کەوتەوە. کۆماندۆکان یەکسەر بەسەر ئەو خانوەیان دادا کە بارمتەکانی تێدا دانرابوون. تا ئەوکاتە تەنها جووەکان مابوون. سەرنشینەکانی دیکەی سەر بە ڕەگەزنامە جۆراوجۆرەکان لە لایەن عیدی ئەمین ئازادکرابوون، ئەمین بەوەی دەنازی کە سەرنجی جیهانی بۆلای خۆی

ڕاکێشاوە. پەڕەشوتوانەکان هەرگیز بانگنەکران تاکو دەستبەکاربن، بەڵکوسەوڵیان لێدایەوە بەرەو نایرۆبی گەڕانەوە. لەوێ هێرکۆلوسی چوارەم چاوەڕوانی دەکردن و گەڕانەوە ماڵەوە.

لە ماوەی پێنج خولەکدا، دو خولەک کەمتر لەو پێوەرەی بۆیان دانربوو، بارمتەکان ڕزگارکران و تیرۆرستەکانیش کوژران. شانزە سەربازی ئۆگەندیش لە پاسەوانەکانی فڕۆکەخانەکە لە نێو کوژراوەکاندا بوون. چالاکییەکە بە لەدەستدانی گیانی ئەفسەرێکی هێزی جەنگاوەری بەرگری ئیسرائیل جێگری کۆلۆنێل یۆناتان ناتانیاهو Yonatan Natanyahu براگەورەی بنیامێن ناتانیاهوی سەرەک وەزیرانی دواتر بوو. دواتر ناتانیاهو هەڵوێستی نەچەماوەی بەرامبەر تیرۆرستان دەرەنجامی کوشتنی یۆناتان بوو. هەروەها سێ بارمتەش ژیانیان لەدەستدا.

هەوڵی کیمخ لە زەبر وەشاندنێکی گورچکبڕ لە ڕفێنەرەکان لە جیهاندا بە ئەرێنی دەنگیدایەوە. سەدای ڕاوەدونانەکەی ئەنتابە بۆ ئەوکات لە هی گرتنی ئایخمان گەورەتر بوو، ئەوەش میدالیایەک بوو لە بەرۆکی مۆساد درا.

وردە وردە بازنەی جموجۆڵەکانی کیمخ لە ناو مۆساددا بۆ دژایەتیکردنی PLO زیاتر دەبوو. مەیدانی ئەو ململانێ خوێناوییە، دەرەوەی ئیسرائیل، لەسەر شەقامەکانی شارەکانی وڵاتانی ئاوروپا بوو. کیمخ وەک ستراتیژدانەرێک ڕۆڵیکی کارای هەبوو بۆ ڕێکخستنی کۆماندۆی مەرگچێنی تایبەت بە مۆساد، کە کیدۆنەکان بوون. ئەوان لە پاریس، مونشن ، ئەسینا و قوبرس دەستی خۆیان وەشاند. بەلای کیمخ ئەوە کوشتنی لەدورەوە بوو، وەک فڕۆکەوانی فڕۆکەیەکی جەنگی کە تەنها بۆمب بەردەداتە خوارەوە، بەڵام خۆی وێرانکاری بۆمبە فڕێدراوەکان نازانێ .چالاکییە سەرکەوتوو کاریگەرەکانی مۆساد بۆ زانیاری و زێدە گرنگی ستراتیژ دانەرەکان دەگەڕێتەوە، کە بەهۆیەوە کیدۆنەکان دەستیان دەکردەوە و قۆناخێک لە پێش دوژمنەوە بوون .

بەیانییەک کمیخ لە نوسینگەکەی بەسەر بارێکی پەشۆکاوی هاوەڵەکانیدا هات. یەکێک لە باشترین کاتساکانی لە مەدرید بەر گوللەی نیشانشکێنەکانی PLOکەتووە و کوژراوە. بکوژەکە نێوانکارێک بووە کە کاتساکە دەیویست بیخاتە گەڕو بۆ ناو PLO دزەی پێبکا.

ئیدی کاتی لەخۆدان و تازیەباری نییە. هەر پیاوێکی توانادار دەستی کراوەیە، تاکو ئاگر بە ئاگر وەڵام بداتەوە. ئەو سەردەمە بۆ کیمخ وەک ئەوە وابوو " چاوەڕوانی بەزەیی لە هیچێکیان ناکرێ، هەتا ئەوانەش وایان داناوە بەبەزەیی بن".

فشاری بەردەوام لەسەرئەوە هەبوو کە شێوازی نوێ بدۆزرێتەوە سەرانی PLO ناچاربکرێن ڕێرەوەی کاروباری ناوخۆ بخرێتە ژێر کۆنترۆڵ بە مەبەستی کوتانەوەی سەری سەرانی ڕێکخراوەکەی ڕزگاریخوازی فەلەستینی. بەلای کیمخیش 'سەرکوتانەوە تاکە ڕێگەیە بۆ کۆتایی پێهێنانی کلک ڕاوەشاندن'. یاسر عەرەفات ژمارە یەک بوو لە لیستی ئارمانجەکانی کۆماندۆی مەرگچێنی مۆساد.

بە هاتنی 1973 مەترسییەکی دژوارتر بووە چەقی بازنەی مشورخواردن و لێبەئاگاهاتنی کیمخ: ئەویش ئەگەری شەڕی دوهەمی عەرەب- ئیسرائیل لە لایەن میسرەوە بوو. دەنگی مۆساد لە ناخەوە لە بیابانەوە هاواری پێشبینی شەڕێکی وای دەکرد. مشورخۆریی کیمخ کە سەرانی خۆشی تێدا پشکدار بوون، لەلایەن ئامان (دەزگای هەواڵگری سەربازی) لەسەر مێز هەڵگیرا. بە گوێرەی ستراتیژداڕێژەرانی ئامان، میسر بیست هەزار ڕاوێژکاری شۆرەوی لە وڵات دەرکردن، ئەوەش نیشانەیەکی حاشاهەڵنەگرە، کە ئەنوەر ساداتی سەرۆکی میسر بە دوای چارەسەرێکی سیاسیانە بۆ کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگەڕێ.

کیمخ بڕوای بەو گریمانەیە نەبوو. بەپێی ئەو زانیاریانەی بۆ کیمخ دەهاتنە سەرمێز، ڕۆژ بە ڕۆژ بڕوای زێدەتر دەبوو کە سادات دەیەوێ یەکەمین زەبری کوشندەی لەناوبردن بسرەوێنێتە ئیسرائیل، چونکە تائێستا

داخوازییەکانی عەڕەبان لای ئیسرائیل بەرز نەنرخێندراون: میسر دەیەویست خاکە داگیرکراوەکەی بستێنێتەوە و داوای دەوڵەتێکی فەلەستینیش لەناو ئیسرائیلدا بکا. کیمخ بڕوای وابوو کەPLO ش هەڵمەتەکانی خۆی بۆ بەچۆکداهێنانی ئیسرائیل درێژە پێدەدا تا ئەوداخوازیەیان دێتەدی.

خەمخۆری و پەرۆشی کیمخ کاتێ زیاتر بوو، کە سادات وەزیری جەنگی لادا و هەڵۆخوازێکی لە جێدانا، کە یەکەمین کاری چەسپاندن و بەهێزکردنی هێڵەکانی پێشەوەی بەرەی ڕوبەڕوبوونەوە بوو لەگەڵ ئیسرائیل لە کەنارەکانی کەنالی سوئێس. فەرماندە گەورەکانی میسر بەردەوام سەردانی پایتەختە عەڕەبییەکانیان دەکرد تاکو لە پشتگیریان دڵنیا بن. سادات خۆشی ڕێکەوتننامەیەکی نوێی لەگەڵ یەکێتیی شۆرەوی بۆ وەرگرتنی سیستمی چەکداری مۆرکرد.

بۆ کیمخ ئەمانە ئاماژەی گەمەیەکی قێزەون بوون. ' ئەوە واتای ئەوە نییە کە شەڕ دەقەومێ یان نا، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئایا چ ڕۆژێک دەقەومێ'. بەڵام سەرانی ئامان هۆشدارییەکانی مۆسادیان بەهەند دانەنا. ئەوان بە فەرماندەکانیان دەگوت، گەربێت و شەڕیش بێتە پێشەوە ئەوا ماوەیەکی هۆشداری پێنج ڕۆژە پێش شەڕەکە دەکەوێ، ئەوەش بەلای ئەوان ماوەیەکی زیادە تاکو هێزی ئاسمانی گورزێکی سەرکەوتوی وەک شەڕی شەش ڕۆژە دوبارە بکەنەوە.

کیمخ دەیگوتەوە کە عەڕەبەکان پەندیان لە هەڵەکانی ڕابردویان وەرگرتووە. ئەو بەوەرگەڕاو دادەنرا و پێی دەگوترا ' دیسان بیچمێکی شەڕانگێزی مۆساد' ئەو تۆمەتبارکردنە زۆر گران لەسەر پیاوێک دەکەوت کە ڕاهاتبوو ڕایەکانی بە تەرازوی زێر هەڵبسەنگێنن. تاکە شتی کیمخ ئەوەبوو بەردەوام لەسەر لێکدانەوەکان و هەڵسەنگاندنی خۆئامادەکارییەکانی میسر تاکو ڕۆژی پەلاماردانەکەیان پێشبینی بکا.

گەرمەتاوی مانگی ئابی 1973 ئەیلولێکی ساردی لە تەلئەبیب بەدواداهات. ڕاپۆرتە تازە گەیشتووەکانی کاتساکانی بەری سینای سەر نۆکەندی سوێس

ڕایانگەیاند کەوا دوا ئامادەکارییەکانی کەشتییە جەنگییەکانیان تەواو بوونە . ئەندازیارە میسرییەکان خەریکی دوا قۆناخی دانانی پردەکان بوون تاکو تانکەکانیان بۆ سینا بپەڕنەوە. کاتێک مۆساد وای لە وەزیری بەرگری کرد ئەو خەمخۆرییەی خۆئامادەکردنی لایەنی میسری بۆ شەڕ بگەیەنێتە نەتەوە یەکگرتووەکان، نوێنەری میسر لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەنگێکی لەسەرخۆ و هێمنکەرەوانە گوتی:' ئەوانە مەشقی ئاسایی سەربازیمانن'. کیمخ ئەو پەیڤانە لە گوێیدا بەقەد قسەکانی باڵوێزی ژاپۆنی لە واشنتۆن لە ئێوارەی بەر لە هێرشی سەر بەندەری پیرل هابەر Pearl Habor ڕاستی بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئامان ڕونکردنەوەی لایەنی میسری بە ڕاستی دادەنا. کیمخ بڕوای نەدەکرد ئەوەی ئەو لە ئۆکتۆبەردا دیتی، بۆ هەرلایەک چاوی دەبڕی ڕاستی ئاماژەکانی پێشبینییەکەی بۆ دەردەکەوت: بۆنمونە لیبیا کۆمپانیا خۆرئاواییەکانی بواری نەوتی خۆماڵیکردن، لە وڵاتە نەوت بەرهەمهێنەکانی کەنداویش قسە لەسەر ئەوە دەکرا کە ناردنی نەوت بۆ ڕۆژئاوا ڕابگرن.

بەڵام هێشتاش ستراتیژداڕێژەرانی ئامان ئەو ئاماژانەیان بە هەڵە لێکدەدانەوە. کاتێ فڕۆکە جەنگییەکانی ئیسرائیل لەسەر ئاسمانی سوریا لە لایەن میگی MIG ی سوورییەوە ڕێیانپێگیرا، لەو شەڕە ئاسمانییەدا ئیسڕائیلییەکان بەهۆی تەکتیکە بەدەستهێنراوەکانیان لە فڕۆکەی میگی ڕفێندراوی عیراق سەرکەوتن، ئامان خستنە خوارەوەی 12 میگی سوری لەوشەڕەدا بەوە لێکدایەوە گەر عەرەبەکان بوێرن شەڕێکی دیکە هەڵبگیرسێنن، ئەوا چارەنوسیان لەوە باشتر نابێ.

لە شەوی 6 لەسەر 7ی ئۆکتۆبەردا بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری لەسەر دوژمنکاریی میسری بەدەستکەوت. ئاماژەکە مابووەوە سەر پرسی یەک سعات. کاتسا و ساینمەکانی لە میسر ڕاپۆرتیاندا کەوا سەرکردەی هێزە چەکدارەکان لە قاهیرە دوا پلەی ئامادەباشی ڕاگەیاندووە. ئەوە بەڵگەیەکی ماددی بوو کە نەدەکرا چیدیکە پشتگوێبخرێ.

لە سعات 06.00دا بەڕێوبەری گشتیی ئەوکاتی مۆساد زڤی زامیر Zvi Zamirلە وەزارەتی بەرگریدا چاوی بە سەرانی دەزگای هەواڵگریی سەربازیی کەوت. ئەو باڵەخانەیە چۆڵ بوو: هەنوکە یۆم کیپەرە Jom Kipporپیرۆزترین ساتی جولەکەکانە لەهەمو ئان و زەمانێکدا. لەو ڕۆژەدا تەنانەت نادینداره‌کانیش پشویان هەبوو، هاتوچۆی گشتی و ڕادیۆی دەوڵەتیش ئیشی نەدەکرد. هەمیشە ڕادیۆ لەکاتی داواکردنی یەدەگ و ڕەوشی ئاوەرتەی نیشتمانی تاکە کەرەستەی جۆشدان بووە.

لەوکاتەی هێزی چەکداری لەژێر بەڵگەی حاشاهەڵنەگری مۆساد دەستبەکاربوو، لەهەمو لایەکی ئیسرائیل زەنگی هۆشداربوونەوە لێدرا و دو بەرەی شەڕ کرانەوە؛ یەکیان لەباکورەوە لای سوریا و ئەوی دیکەشیان لەباشورەوە لای میسر، وادانرابوو لەناکاو بەسەر هەمو ئیسرائیلدا دابدرێ.

شەڕ لە سعات یەک و پەنجا و پێنج خولەکی شەو بەکاتی خۆجێی دەستپێکرد، کاتێکیش کابینەی حکومەت دانیشتنی نائاسایی بە پەلەی دوای دڵنیاکردنەوەکانی ستراتیژداڕێژەرەکانی ئامان کە کاری دوژمنکاری پێش سعات شەشی بەیانی دەستپێناکا، دواتر دەرکەوت کە ساتەوەختەکە هی پێکدادنێکی ئاسمانی زیاتر نەبوو.

هەرگیز لەمێژوی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئیسرائیلی هەڵەیەکی وا جەرگبڕ لەسەر پێشبینی هێرشی دوژمن نەکراوە. هەمو ئەو بەڵگە زۆرانەی کیمخ لە ئەوانی دیکەی بۆدەهاتن و کۆیکردبوونەوە و دابوونیە دەست دەسەڵاتداران پشتگوێخران .

کاتێکی شەڕی یۆم کوپەر( میسرییەکان ناوی شەڕی ئۆکتۆبەریان لێنا) کۆتاییپێهات، ئیسرائیل لە دوادوای شەڕەکە پێڕاگەیشت، جارێکی دیکە سەرکەوتنێکی دیکە تۆماربکا، کە دەرگای دۆزەخی شەڕیش داخرا پاکسازی لە نێو ڕیزەکانی ئامان دەستپێکرد. لەگەڵ ئەوەی گۆڕانکاری بەرچاو لەم لا و ئەولا کران، وەک لابردنی بەڕێوبەری گشتیی مۆساد زامیر، چونکە نەیتوانی بەرامبەر لایەکەی دیکە لە سەرانی ئامان خۆی بگرێ و بەپێی

پێویست پێیدانەدەگرت، لەجیاتی ئەو ئیسحاق هۆفی Yitzhak Hofi بووە بەڕێوبەری گشتی. جاریکی دیکە مۆساد دەستەڵاتە هەرە باڵاکەی خۆی وەک دەزگایەکی نهێنی هەواڵگری وەرگرتەوە.

کیمخ هەستی بەتێکەڵاوییەک دەکرد. لە هەندێ ڕووەوە وا دەچوو کە هۆفی و مایەر لە هەمان دارەوە داتاشرابن: هەمان ڕەفتاریان هەیە، هەمان ئەزمونی شەڕیان هەیە، هەمان دلێری و هەمان بێحەوسەڵەیی کە ڕێگە بەلاسارانی دەوروبەریان نادەن هەیە. هۆفی یەکسەرە بوو تا نەڵێن پیاوێکی توندو زبرە. گرژی نێوان کیمخ و هۆفی بۆ ئەوکاتە دەگەڕایەوە، کە هەردوکیان دو ئەرکی جیایان پێسپێردرابوو، ڕابەرایەتی بکەن لە فێرگەی مۆساد . هۆفی پیاوێکی پراکتیکانە و ئاکار کۆمەڵیانە بوو، ئەو خوای لە دەستەواژە ڕۆشنبیرییەکان و ئەکسێنتە ئینگیلزییە شەویلاک خوارکردنەوەکەی کیمخ لە کاتی گفتوگۆ و ڕاڤەکردندا نەمابوو. کیمخ نەوەک هەر پڕ ئەزمون بوو بەڵکو جێگرەوەی هۆفیش بوو. ئەو پێش ڕۆیشتنی زامیر ببووە یاریدەدەری بەڕێوبەری گشتی. هۆفی و کیمخ بە ئاگابوون کە دەبێ ناکۆکییە کەسییەکانیان بەلاوە بنێن، تاکو مۆساد بە باشترین شێوە بەڕێوەببەن .

ئەرکێکی گران بە کیمخ سپێردرا ئەویش چاودێریکردنی کێشەی لوبنان بوو. شەڕی ناوخۆ لەو وڵاتەدا بەر لە دو ساڵان دەستیپێکردووە. دوای شەڕی یۆم کوپەر و لەوکاتەی کیمخ دۆسیەی لوبنانی وەرگرت، کریستیانەکانی لوبنان شەڕیکی دۆڕاویان دەکرد. وەک کە ساڵانی زو رویدا، سەلمان خۆی گەیاندە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە پاریس بۆ دەستپێشخەری دزینی فڕۆکەی میگی عێراقی، یەکێ لە نێردەکانی کریستیانی لوبنان لە ئەیلولی 1975دا هاتە ئیسرائیل، داوای چەکی لێکردن بۆ بەرگرتن لە لەناوچوونیان. ئەو داخوازییە دوایی هاتە سەرمێزی کیمخ. ئەو ئەوەی بەدەرفەت زانی تاکو مۆساد دزە بکاتە نێو تەونی لوبنانییەوە.

کیمخ هۆفی تێگەیاند کە لە ڕوی سیاسییەوە یارمەتییەکی سنورداری کریستیانەکان دژی ئیسلامەکان کە دەیانەوێ ئیسرائیل لەناو ببات بەکەڵکە.

ئیدی داواکە پەسەند کرا. ئیسرائیل بایی ئەوەندە چەک دەداتە کریستیانەکان تا پێی لەسەری موسڵمانەکان بدەن، بەڵام بەو شێوەیە نا کە ببێتە هەڕەشە بۆ سەر ئیسرائیل. مۆساد دەستی بە چەک ناردن کرد بۆ لوبنان. لەگەڵ چەکەکەدا کیمخ هەندێ ئەفسەری مۆسادی لەگەڵدا ناردن. ئەوان گوایە بۆ ئەوە چوون کە کریستیانەکان فێری چەکەکان بکەن. لە ڕاستیدا ئەوان کۆمەڵە زانیارییەکی زێدە بەنرخیان بۆ کیمخ نارد بەهۆیەوە پێبەپێ لەگەڵ نەخشەی شەڕی ناوخۆ دەرۆیشت تەواو بەرچاوی ڕون بوو. ئەو زانیاریانە بوونە مایەی سەرخستنی چەندان چالاکی دژی بارەگاکانی PLO لەخواروی لوبناندا.

پەیوەندی نێوان مۆساد و کریستیانەکان لە یانیوەری 1976دا تێکچوو، کاتێک سەرکردە کریستیانەکان داوای کۆمەکی هێزی سورییان کرد دژی حزبوڵڵای لایەنگری ئێران. ئەو گروپە بەچاوی دیمەشق مەترسیدار بوون. بۆیە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا هەزاران لە هێزی سوریای شەڕکەر گەیشتنە لوبنان، هەرزو بوونە مایەی مەترسی بۆ سەر ئیسرائیلیش، چونکە نزیکبوونەوە لەسەر سنوری لوبنان- ئیسرائیل. ئیدی کریستیانەکان وەک کیمخ گوتی " سەری سوری گورگیان هێنایە ژورەوە ".

جارێکی دیکەش کریستیانەکان ڕویان لە مۆساد کردەوە. کیمخ بۆیدەرکەوت کە تەونە ڕاچێنراوە پەیوندییە کۆنەکانی بۆ چەکپێداناردن دەستناکەوێتەوە، بۆیە پێویست بە ئۆپەراسیۆنێکی لۆجستیکیانە لەناو ئیسرائیلەوە هەیە. لە ئیسرائیلەوە تانک و ڕۆکێتی دژە تانک و بنکەی ڕۆکێتهاوێژ و شتی دیکەیان بۆ کریستیانەکان نارد. شەڕی ناوەخۆی لوبنان خەریک بوو لەدەستدەردەچوو.

لەژێرەوە کیمخ بە دەستەی خۆی درێژەی بە شەڕی پارتیزانانەدا دژی دوژمنە دێرینەکانی PLO دا. هەرزو بادرایەوە سەر ئەوەش کە دەبێ لەگەڵ شیعەکانیش بجەنگن. لوبنان وەک مەیدانێکی مەشقکردنی لێهاتبوو بۆ تاکتیکەکانی مۆساد، نەوەک هەر بۆ کردەی کوشتن، بەڵکو بۆ شەڕی

دەرونیش. بۆ ئەو پیاوەی لەپشت مێزی مۆساد لە شەقامی King Saul دانیشتووە، گەشاوەترین ڕۆژەکانیەتی.

لەنێو دیوارەکانی باڵەخانەی مۆساد پەیوەندییەکانی کیمخ لەگەڵ هۆفی بەرەو خراپتر ڕۆیشتن. بەندوباو لەسەر جیاوازی تیژ لەنێوان هەردوکیان لەسەر هەلومەرجی ئۆپەراسیۆنەکان پەیدابوو. هەروەها ئەوەش دەگوترا گوایە هۆڤی ترسی ئەوەی هەیە کیمخ وازبێنێ، کیمیخیش هەستی بەوە دەکرد کە وەک پێویست ڕێزی پشکهەبوون لەسەروەرییەکانی مۆسادی لێناگیردرێ. تا ڕۆژی ئەمڕۆژیشی لەگەڵدابێ کیمخ باسی ئەوجۆرە شتانەی نەکرد. تاکە شتێک کە ویستی بیدرکێنێ ئەوەبوو ' ئەو هەرگیز بەقسە لەسەرکردن ڕێز لە بەندوباوێک نانێ'.

لە بەیانییەکی بەهاری 1980دا دایڤید کیمخ کلیلەناسنامەکەی کە هەمو دەرگاکانی پێدەکردنەوە چووەوە ژورەوە. هەرکە گەیشتە نوسینگەکەی پێیڕاگەیەندرا کە هۆڤی داوای دەکا. کیمخ هەڵسا بۆ لای نوسینگەی هۆڤی، لەدەرکەیدا، چووە ژورەوە بە هێواشی دەرگای داخست.

دواتر چی رویدا، ئەوە یەکێکە لە ئەفسانەکانی مۆساد، چیرۆکێک ئێستاش بەدەنگی بەرز تۆمەتباری دەردەبڕن. شەڕە بەدەنگەکەیان بیست خولەکی خایاند، کیمخ کەهاتە دەرەوە لە حەیفان لێوی خۆی دەکرۆشت. کارنامەی ئەو لای مۆساد تەواو بوو، بەڵام چالاکی جاسوسگەری بەردەوامدەبێ و بۆ بوارێکی دیکە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکای دەگوێزێتەوە. ئەو جارەیان بۆ دزینی یۆرانیۆمی هەوێنکراو نییە، بەڵکو بۆ شەرمەزارییەکە کە دواتر بە ئیرانگێت ناسرا.

کیمخ دوای ئەوەی بە تێرو تەسەلی بیری لە ئایندەی خۆی کردەوە، پایەی بەڕێوبەری گشتی لە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل پەسندکرد. ئەو پایەیە بۆ ئەو نمونەیی بوو، تاکو بەهۆی تواناکانی باش بیرلە هەلومەرجەکان بکاتەوە و ڕێگای خۆی تیایاندا بدۆزێتەوە. ئەو پایەیە دەرفەتی نێونەتەوەیی بۆ کیمخ

ئافراند، تا لەسەر ئەو گۆڕەپانەشدا ئەسپی خۆی تاودا، کە لەوێشەوە کاروباری لوبنانی لەیاد نەچوبوو.

لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا گۆبەندەهەرای نیکسۆن و واتەرگێت لە قۆناخی بەلاوەدانەنان بوو. بەو شەرمەزارییە سیا قەپۆزی شکابوو، لە دوای کوشتنی سەرۆک کەنەدی سیا چیدیکە نیشانەی لموزبەرزی و گومانلێکردن نەبوو. هێشتا هەر شتی دیکەی ژێربەڕە ئاشکرا دەبوون لە کاتی حکومەتی نیکسن دەبوونە دەنگوباس .

کیمخ هەمو لایەکی دراماکەی هەڵگێڕو وەرگێر دەکرد، تاکو پەند لەو نوشستییەیان وەربگرن، نوشستییەکە نەدەبوایە ڕویدابا. هەڵە کوشندەکەی نیکسۆن هەڵگرتنی کاسێتە تۆمارکراوەکان بوو. بێ ئەو کاسێتە تۆمارکراوانە ئەو لەوکاتەدا هەر بە سەرۆکی دەمایەوە!.

بە ڕاستی ئێران لە ماڵەوە نزیک بوو، هەر پێشهاتێکی ئەوێ بەرژەوەندی ئیسرائیلی بۆ خۆشتر دەبوو. کیمخیش خۆی بەو بارەوە خەریککرد. کاتێک خومەینی و ئایەتوڵڵا و مەلایەکانی دەستەڵاتیان لەوێ چەسپاند، بۆ کیمخ مایەی شڵەژان بوو، کە وەزارەتی دەرەوەی ئامریکا و سیا چەند خراپ بارودۆخی نوێیان هەڵسەنگاندبوو.

هەنوکە سەرۆکێکی نوێ لە کۆشکی سپییە. سەرۆک ڕۆنالد ڕێگن بەڵێنی سەرەداوستنەدەستی بە دەزگای سیا دا. دەزگای هەواڵگری نهێنی وەک کیمخ زانیاری لەسەر پەیداکرد، دەبێتە کارتی گەمەی سەرۆک لە کاروباری نێودەوڵەتیدا. سیا لەژێر فەرماندەیی ولیام کێیسیWilliam Casey دا بوو. کیمخ لەخۆیەوە وەک بۆهاتنێک زانی کە کێیسی دۆستی ئیسرائیل نییە، بەڵام گەر مەترسی هات، دەخرێ بخرێتە دەرەوەی گەمەکە.

دو ساڵی داهاتو کاری ڕۆژانەی کیمخ بە وردی بەدواداچوونی ئۆپەراسیۆنەکانی سیای لە ئەفغانستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. زۆریان بەلای کیمخ لە ئۆپەراسیۆنەکانی دەزگا هاوشێوەکانی هەواڵگری دەچوون،

ئیدی ببووە کارێکی ئاسایی زانیاری کۆکردنەوە، زۆر جاریش هاوکار بوو لە کردەی بێبەزەییانەی کوشتن.

تـا ئەوکاتـەی پێویسـت بـوو، سـەرنجی کـیمخ دیسـان بۆسـەر ئێـران و پێشهاتەکانی بەیروت گەڕایەوە.

دومانگ دوای ئەوەی کیمخ پۆستە تازەکەی وەرگرت، ئیسرائیل دەستی بەچـەکناردن بـۆ ئێـران کـرد و ئامریکـاش لەسـەری بێـدەنگبوو. ئامریکـا ئەوەی دەکرد تاپشکی هەبێ لە زەبونکردنی ڕژێمی بەغدا. ئەوەش لەمێژ بوو، بەشێک بوو لە پیادەکردنی ستراتیژی ئۆرشەلیم وەک کیمخیش ناوی لێنابو' یاریکردنی دووسەرە '.

سێ ساڵ دواتر، دو شت ڕویدا و کاری کردە سەر بارودۆخەکە. یەکەمیان ئۆتـۆمبێلێکی بارهـەڵگری تـەژی لـە تەقەمـەنی کوشـتارگەیەکی لـە بـەیروت نایەوە، کە تیایدا ژیانی 241 مارێنزی ئامریکی هەڵلوشی. لە ئامریکا گومانی وا پەیدا بوو، مۆساد هەر پێشکات بە کردەکەی زانیوە و دەزگای هەواڵگری نهێنـی ئێـرانیش دەسـتی لـە ئامادەکارییەکـەدا هـەبووە. فشـارخرایە سـەر ئیسرائیل تاکو ناردنی چەک بۆ ئێران بوەستێنێ. ئەو گوشارە بە ڕفانـدن و ئازاردان و دواتر کوشتنی ویلیەم بـوکلی William Buckley زێدەتر بـوو. بوکلی سەرۆکی هۆبەی سیا بوو لە بەیروت. کەمێک دوای ئەو ڕوداوە حەفت ئامریکی دیکە لە لایەن دەستە و تاقمێک کە ئێران پشتگیریدەکردن بە بارمتە گیران.

بەو ڕوداوانە حکومەتی ڕیگان تینی بۆ هات، پێویستی بە کردەی دژە تیرۆر بوو، هاووڵاتییە ئامریکییەکان لەژێر داروپەردوی وێرانەی بەیروت خەریکی بارکردن بوون تاکو داوای کاردانـەوە بکـەن. ئـاخر تۆڵەکردنـەوەش ئەسـتەم بـوو: بۆمبـارانکردنی تـەهران وەک ڕیگـان دەیویسـت، لـە لایـەن خـودی ڕاوێژکـارە هەڵۆئاسـاکانی پەشـیمان کرایـەوە. سـەرباری ئـەوەش بـە ڕای فەرماندەکانی Delta Force ناردنی دەستەیەکی ڕزگارکەر ئەگەری زۆری شکستهێنانی هەیە.

بارەکە وەک خۆی مایەوە تا دەمەتەقێیەک لەنێوان سەرۆک و ماک فارلانە McFarlaneکۆنە وەزیرێکی بە ئەزمون کە هەنوکە بۆتە ڕاوێژکاری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆک کرا . دواتر کیمخ بەبیری دێ کە دەمەتەقێیەکە تاڕادەیەک بەو شێوەیەی خوارەوە بوو.

'جەنابی سەرۆک، ئایا ئێرانییەکان ئێستا پێویستیان بە چی هەیە؟ '

'بۆب، دەپێم بڵێ پێویستیان بەچی هەیە؟ '

'چەک بۆ شەڕی دژی عێراق'

'کەواتە چەکیان بدەنێ، بەرامبەر گەڕاندنەوەی خەڵکی ئێمە.'

ڕیگان و ماکفارلانە لە ئەنجومەندا وایان لە کێیسی و سەرانی دەزگا هەواڵگرییەکان گەیاند کە نیازیان لە چەکدان بە ئێران تەنها بۆ ئەوە نییە کە مەلاکان فشاربخەنە سەر دەستە و تاقمەکانی لوبنان بۆ بەردانی بارمتەکانمان، بەڵکو پەیوەندییەکانیشمان لەگەڵ ئێراندا چاکبکەینەوە. ئەوەش پاداشتێکی زێدەی خستەسەر: لاوازکردنی پێگەی مۆسکۆ لە ئێراندا. لێرەوە تۆوی کەتنە گۆبەنداوەکە کە دواتر بە ئێرانگێت ناسرا، چێنرا.

ئۆلیڤەر نۆرس Oliver Northی سەرکردەی مارینز تەرخانکرا لەگەڵ ڕێکخراوی چەکپێدان. نۆرس و ماک فارلانە بڕیاریاندا سیا لە پلانەکەیان ئاگادارنەکەنەوە. ئەوان هەردوکیان پیاوی کاربوون. کردەی گورجکردن و خاوکردنەوە لە ڤێتنام کۆمەکیکردن، بە گوێرەی هەموانیش ئیسڕائیل لەو بوارە ناسراو بوو. کەواتە کاتی ئەوە هاتووە وەک نۆرس گوتەنی' ئیسرائیلیش ڕەگەڵ مێگەلەکە بخەین'. لەگەڵیدا نۆرس بەرژەوندییەکی تایبەتمەندیشی تێدابوو : ئەو زۆر حەزی دەکرد سەردانێکی وڵاتی پیرۆز بکا. وەک کریستیانێکی بڕوادار لەوێ بەشوێنپێی عیسادا بڕوا.

سەرەک وەزیرانی نوێی ئیسڕائیل ئیسحاق شامیر پێیوابوو کە تەنها یەک کەس ئەو توانستە چۆنایەتییەی هەیە داوای واشنتۆن بۆ یارمەتی لەو بوارەوە تەواو بە قازانجی ئیسڕائیل هەڵبسەنگێنێ. لە 3ی تەموزی 1983دا کیمخ بەرەو واشنتۆن فڕی، تا لەوێ دیدارێک لەگەڵ ماک فارلانە لە کۆشکی

سپی سازبدا. کیمخ ڕایگەیاند کە بڕوای هەیە باری چەک بتوانێ بارمتەکان ئازاد بکا. ئەو پرسی ئایا سیا لەو بوارەدا کارایە؟ پێیگوترا کە سیا پەیوەندی پێوە نییە.

لە لایەن خۆیەوە ماکفارلانە پرسی تاچەند مۆساد دەستی لەو کارەدا دەبێ؟ چونکە گەر باش بیخەملێنێ، پیاوانی ئەوانن کاری باشتان لە دەرەوە بۆ ئەنجامدەدەن. کیمخ بۆی شیکردەوە کە ئیسحاق ڕابینی وەزیری بەرگری و ئیسحاق شامێر بڕیاریانداوە مۆساد لە دەرەوەی بازنە بێ، تەواوی متمانەیان بەوداوە بۆ ئەوکارە. ماکفارلانە درکاندی کە پێیوایە هیوا باش دێتەوە. کیمخ ئەوەی لەبەرامبەرەکەی شاردەوە کە ناحوم ئادمۆنی بەڕێوبەری گشتیی مۆساد وەک ولیەم کێیسی لە سەرچڵی ئەو چەک گۆڕینەوەیە دەترسێ.

ماکفارلانە بەرەو نەخۆشخانەی ماریانا Marianahospitaal لە Bethesda ڕۆیشت تاکو کاردانەوەی کیمخی پێڕابگەیەنێ. سەرۆک لەوێ ماوەی چاکبوونەوەی دوای نەشتەرگەرییەکی ڕێخۆڵەکان بەسەردەبرد. سەرۆک یەک پرسی هەبو، ئایا کیمخ متمانەی تەواو دەدا کە ئیسڕائیل ئەو کردە گواستنەوەیە بە نهێنی بهێڵێتەوە؟ گەر شتێک لەوە دزەبکات و ئاشکرا ببێ ئەوا زیان بە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ وڵاتە عەرەبییە میانڕەوەکان کە لە پەرەسەندنی ڕادیکالیازمی ئێرانی پشتەنگن، دەگەیەنێ. بەگوێرەی کیمخ ماکفارلانە ڕیگانی لەوە دڵنیاکردەوە کە ئیسڕائیل ' سندوقەکە کونبڕ دادەخا ' . ئیدی نەخشەکە هاتەسەرجێبەجێکردن. کیمخ ڕوەو ئیسڕائیل فڕیەوە. دو هەفتە دواتر گەڕایەوە واشنتۆن. لەسەر نانخواردن کیمخ پلانەکەی بۆ ماکفارلانە ڕونکردەوە. کیمخ وا یادی گفتوگۆکە بەبیرخۆی دێنێتەوە:

کیمخ پرسی' ئایا لە بەراییدا دەتەوێ هەواڵی خۆش یان ناخۆش ببیستی؟ '

ماکفارلانە بەرسڤی دایەوە" هەواڵە خۆشەکە"

' ئێمە ئەو چەکانە بەهەمان ڕێچکەی کۆنماندا ڕەوانەدەکەین'

ماکفارلانە گوتی' گرفت نییە'.

کـیمخ مشـوری ئـەوە دەخـوا کـە ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی نێـوان وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئامریکا و ئێران ڕونـەدا، تـاکو هەڵوێستی حکومـەتی ڕێگان دژی تیرۆریزم بەدگومان نەبێ. هەروەها بۆئەوەی ئابلۆقەی چەکی ئامریکی بەرامبـەر ئێران وەک خۆی بمێنێتـەوە، بـە جۆرێک لـە ڕاسـتیدا ڕاسـتەوخۆ گۆڕینەوەی چەک بە بارمتەکانەوە نەبوو.

ماکفارلانه ' باشە ئەدی هەواڵە ناخۆشەکە چییە؟ '

کیمخ پێیگوت کەوا پەیوەندییە باوەڕپێکراوەکانی لـە ئێران بـە گومـانن کـە مەلاکان بتوانن ئازادکردنی بارمتەکان لە بەیروت بسەلمێنن.

' تاران دەستەڵاتی بەسەر ڕادیکالەکانی بەیروتدا نەماوە' قسەی کیمخ بـوو بۆ خانەخوێکەی.

ماکفارلاند بێئومێد ببوو، بـەڵام بەسـەر خـۆی نـەهێنا. ڕۆژی پاشـتر جـۆرج شـولتز George Shultz وەزیـری دەرەوە کە تـازە لـە ژوری Oval Officeدەرچووبوو، بۆ ڕێگانی ڕونکردبووەوە کە مەترسییەکی گەورە لەو سەرچڵییەی گۆڕینەوەی چـەک بـۆ ئێـران ڕەچـاودەکرێ. وا دابنـێ کـە ئێـران هەمو چەکەکانی وەرگرت، دواتر شتەکە ئاشکرا بکا تـاکو بـە قسـەی خۆیـان هەڵوێستی' شەیتانی گەورە" لەکەداربکەن. ئایا ئەوکات عێراق توندتر لەگـەڵ شۆرەوی نایەتە سەرهێڵ؟ کە بارمتەکانیش هێشتا هەر ماون. ئەوەش هەبوو مەزندە دەکرا خراپتریشیان بەسـەر بێ. هەمو بەیانییەکە دەمەتەقێیەکە گەرم بـوو. بـۆ نیوەڕۆکـەی ڕێگـان ماندوببوو. بـەڵام دواتـر چاوەڕاننەکراوانـە پـل لەپەلاپیتکەکە نرا: سەرۆک لەسەر ئەو پێشنیازە ڕازی بوو کە هەمو چەکەکان لە جبەخانەی ئیسڕائیلیەوە دەفرۆشرێتە ئێران بگۆڕدرێ. ئەمجارەشیان کیمخ بە دەرەنجامێکی ئەرێیانەوە گەڕایەوە ماڵەوە. شامیر هاتە سـەر ئـەوەی بڵـێ ئـەو ئەگـەرە لەگۆڕێدایـە گـەر کردەکـە گرفتـی لێکەوتـەوە ئـەوا مـن خـۆمی لێبەدوردەگرم و ئاگام لێ نەبووە.

تـاکو تـەواو دڵنیـا بـێ، کیمخ کۆمەڵـە بیچمێکـی هەمـەڕەنگی کۆکردەوە کـە دەتـوانن ئـەوکارە جێبەجێبکـەن. لەسـەرەتاوە عـەدنان خاشـوگچی Adnan

Khashoggi ملیاردێرێکی سعودی کە نەریتی وابوو کاڤیارێکی نیوکیلۆی هەڵلوشێ. ئەنجا ماناچەر تۆربانیفەرManacher Thorbanifer پیاوێکی کۆنی ساواک SAVAK دەزگای نهێنی بەسامی سەردەمی شای ئێران، ئەو هەمیشە وەک جاسوس ڕەفتاریدەکرد و کۆبونەوەکانی لە نیوەشەودا دەکردن. دوای ئەوان کەسی ڕازداری یاکۆڤ نیمرودی Yakov Nimrodiکە کاتی خۆی بۆ ئامان سەرپەرشتی جاسوسانی دەکرد و سەردەمی شاش پاشکۆی سەربازیی بوو لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە تاران. ئەو بەردەوام هاموشۆی ئال سویمەر Al Schwimmer دا ڕیژەری پیشەسازی فرۆکەسازیی ئیسرائیلی دەکرد.

خاشوگجی بۆ کردەوەی ڕەوانەکردنی چەکی پێشوتریش ناوبژیکار بوو. ئەو سەرپەرشتی گروپێکی زامنکار دەکا بۆ ئامریکا گەر هاتو ئێران بەشێکی فەرمانبەردارێتییەکەی لەو ڕێکەوتنە بەجێنەهێنا، هەروەها بە پێچەوانەشەوە بۆ ئێران گەر هاتو چەکەکان ئەو تایبەتمەندیانەیان تێدانەبوو کە تاران داوای دەکا. لە بەرامبەر ئەو زامنکارییە ئەو دەستەیە 10% عمولەی بۆ هەمو کردەی گواستنەوەیەکە وەردەگرن و وڵاتە یەکگرتووەکان کاش دەیدا. هەروەها ئەو دەستەیە ئەوەش لەخۆدەگرێ گەر کێشەیەک پەیدابوو، هەردو لایان چ ئامریکا، چ ئێران دەتوانن بەرپرسیارێتی لەسەر خۆیان لابەرن . هەمولایەک لەوە بەئاگا بوون کە ڕەفتاری دەستە زامنکارەکە سیاسی نییە بەڵکو تەنها مرخیان لە قازانجەکەی خۆشکردووە.

لە کۆتایی ئابی 1985دا فرۆکەیەکی بارهەڵگری پڕ لەچەک لە ئیسرائیلەوە فڕی و لە تاران دابەزی. لە 14ی ئەیلولیشدا بارمتەیەکی ئامریکی قەشە بنیامین وایر Benjamin Weir لە بەیروتەوە ئازادکرا. کاتێ ڕەوتەکە زیاتر پەرەی سەند کەسانی دیکەش وەک میلس کۆپلاندMiles Copelandی کۆنە ئەفسەری سیا، کە لە ئێوارەی پێش ڕوخانی شا و هاتنی مەلاکان لە ڕێی پیاوەکانیدا گەڵای سەد دۆلاری دەبەخشیە ئەوانەی دەوێران دروشمیان بۆ گیانی شا دەکێشا بەوەی بڵێن'بژی شاهەنشا' هاتە ڕیز دەستەی

زامنکاری کردەوە. هەروەها کەسانی دیەکەش وەک کۆنە ئەفسەری سوپای تایبەتی بەریتانی. لەو نێوەدا سیاسەتداڕێژەرانی تەلئەبیب و واشنتۆن سەیری ڕەوشەکەیان دەکرد. ئۆپەراسیۆنەکە لەبن کەپوی بەئاگانەبووی جیهان ڕێگای خۆی -هەرهیچ نەبێ جارێ- درێژە پێدەدا.

هەموی بەسەریەکەوە ئێران 128 تانکی ئامریکایی،200.000ڕۆکێتی کاتیۆشا ( لە باشوری لوبنان بوونە دەستکەوت)، 10.000تەن گوللەتۆپی هەمەچەشنە،3000 ڕۆکێت کە لە فڕۆکەوە دەهاوێژرێ، 4000تفەنگ و50ملیۆن گوللەی وەرگرت.

بە ڕاستی ئەوە هەر هەمو دۆزەکە نەبوو. لە مۆڵگەی هێزی ئاسمانی ماراما Marama لە ئاریزۆنا Arizona 4000 ڕۆکێتی TOW ڕەوانەی گواتیمالا کرد Guatemala لەوێشەوە بە ڕێگایەکی دورودرێژ دەگەنە تەل‌ئەبیب. لە پۆلۆنیا و بولگاریاشەوە8000 سام 7 ،کە ڕۆکێتێکە لەسەر زەوی نیشانەی ئاسمانی دەپێکێ لە پاپۆڕەکانەوە لەگەڵ AK-47100.000 بارکران. لە چینیشەوە سەدان رۆکێت کەلەسەر کەشتیەکانەوە بۆ ئامانجی سەرئاوکەوتو بەکار دێن،زرێپۆش و، ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی سەربازی جۆری amfibie گەیشتن. لە سوئێدیشەوە گوللەتۆپی 105ملم، لە بەلژیکاشەوە رۆکێتی هەوایی هاتن.

هەمو ئەوچەکانە بە کەتەلۆکێکەوە وەرگیران کە دوا مەنزڵیان ئیسرائیل دەبێ. دەستەی زامنکار هەمو چەکەکانی لە فڕۆکەخانەی سەربازیی نەقەب دانان، کە لەوێوە فڕۆکەی بارهەڵگر ئامادەن بیانبەنە تاران. بۆهەر بارێکی چەک ئێران پارەکەی لە بانکێکی سویسرِی دادەنا. عمولەی بازرگانییەکە هەموی گەیشتە حەوت ملیۆن دۆلار. ئیسرائیل هیچ پارەی وەرنەگرت، ئەوەی بەس بوو کە ئێرانییەکان بەوچەکانە شکست بە عێراقییەکان بێنن. بۆ کیمخیش ئەوە کاریگەری ڕێسای 'پەرتکە و زاڵ بە' ی سیاسییە کە ئەو مشورخۆری بوو.

بەهرە خۆرسکییەکەی پێیگوت کەوا ئەو ئۆپەراسیۆنە بەئاسانی دەستی پێکرد، هەروا ناڕوا و خەریکە لەدەست دەردەچێ. بە ڕای ئەو 'خەڵکانێکی نارێک چوونەتە نێو دەستە زامنکارییەکە '.

لە سۆنگەی بەردوامبونی دەستە زامنکارییەکە، ئەو جاریکی دیکە سیاسەتی واقیعیانەی ئیسرائیلی هێنایە بەرچاو. ئیسرائیل ئامادەبوو یارمەتی ئامریکابدا، چونکە دەیزانی بەبێ پشتگیری واشنتۆن ناتوانێ لەو هەریمەدا بمێنێتەوە. بێجگە لەوەش ئەوە شێوازێک بوو کە ئیسرائیل ئەوەی نمایشکرد کە ڕۆڵی کارا لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی دەگێڕێ ، بێ ئەوەی نهێنییەکانیشی بدرکێنێ .

هەرچەند ئۆپەراسیۆنی گۆڕینەوەی چەک بەبارمتەکان درێژە بکێشی، ئەوەندەش مەترسی ئاشکرابوونی لەئارادایە. کیمخ ئاوەها هەستیپێکرد. لە دیسێمبەری 1985دا ئەو بە دەستەی زامنکاری ڕاگەیاند کە هیچی دیکە پەیوەندی ئەو بەوکارە نەما، بەهانەی ئەو بەهانەیەکی کۆن بوو بەوەی کارێکی زۆری لەوەزارەتی دەرەوە بەجێهێشتووە دەبێ، بۆی بگەڕێتەوە.

دەستەکە سوپاسیکرد و لە میوانخانەیەکی زۆر باشی تەلئەبیب بانگهێشتیانکرد و لە کاتی نانخواردندا پێیانگوت کە ئیسرائیل ئامیران نیرAmiran Nirی ڕاوێژکاری شمعون پێرێز بۆ کاروباری دژەتیرۆری لەشوێندا داناوە. ئەوەش ئەوساتەوەختە بوو کە وەک کیمخ پێیلێنا تەواوی ئۆپەراسیۆنەکە ئاشکرا دەبێ. ئەوکەسەی دەبێتە مایەی ئاشکرابوون، خودی ئامیران نیرە. نیر وەک کۆنە ڕۆژنامەنوسێک مەیلی ناڕەحەتیانەی نیشاندا تاکو چالاکی ڕاستەقینەی جاسوسی بە پێودانگی فیلمە لە جیهان ناسراوەکانی جێمس بۆندانەی بپێوی. ئەو خاڵە کەموکوڕییە کوشندەیە ئەو و پیاوەکانی دیکەشی لەنێو مۆساد دەگرتەوە کە پێیانوابوو ڕۆژنامەنوسیش بۆ ئەو جۆرە کارانە دەشێن.

# 8

## ORA و دێوەکە

{بازاڕی چەک.. تێکومەکاندانی مۆڵگەی چەکی ناوەکی عێراق لە التواثية.. سەباح تکریتیو سویتی تایبەتی شیراتۆن.. سۆزانیەکی گرانبەها..ئایا فەرزاد بازوفت سیخوڕ بوو؟ .. شەڕی ئۆم کیپەر لای جو شتێکی دیکە لای عەرەب.. بنمێناشە.. هاشمی رەفسەنجانیو تێلیکسی ORA..}

له هۆڵەکەی میوانخانەی فەلەستین مێریدیان لەبەغدا وەک هەمیشە، دوا هەینی نیسانی 1988 پڕبوو لە میوانان. خۆشی باڵی بەسەر دانیشتوانەکانیدا کێشابوو. عێڕاق شەڕێکی گەورە و چارەنوسسازی لە کەنداوی بەسرادا بردبووەوە، بۆیە هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە کۆتاییهاتنی شەڕ نزیکە و دوادوایی ئەو جەنگە خوێناوییەی کە حەوت ساڵ درێژەی کێشاوە.

یەکێک لە هۆیەکانی نزیکبوونەوەی سەرکەوتنی عێڕاق لەشەڕەکەدا بۆ ئەو ئامادەبووە بیانییە جل کەشخانەی هۆڵی میوانخانەکە دەگەڕێتەوە. لە دەموچاویان نیشانەی خۆشحاڵی سەرکەوتنی بزنسمانەکان دەبینرێ. ئەوان ئەو بازرگانانەی چەکن، کە هاتون نوێترین چەک بە عێڕاق بفرۆشن، هەرچەندە ئەو چەکانەش بەدەگمەن بەکاردەهێنرێن. ئەوان پێیان خۆشبوو زیاتر وەک بێلایەنێک بێنەزمان بەشێوەی' ئەگەری نێوانکاری'، ' چاودێری یان سەرپەرشتیاری سیستم' یان ' پەرەپێدانی تواناکان' بن. هەموویان بەیەکەوە نوێنەرایەتی پیشەسازی چەکی ئاوروپی و یەکێتیی شۆرەوی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و چینیان دەکرد. زمانیان ئینگلیزی بوو، بەڵام بە زاراوە و ئەکسێنتی جۆراوجۆر.

عێراقییە خانەخوێکان پێویستیان بە وەرگێڕان نەبوو، چونکە ئەوەی پێشکەشیان دەکرا بریتی بوو لە بۆمبی زۆر و زەوەند، تۆرپیدۆ، مین و کەرەستەی شەڕی دیکەی لە دۆزەخ بناوانگرتوو. ئەو نامیلکە نمایشکارانەی ئەم دەست و ئەودەستیان دەکرد، ناوی جۆری هێلیکۆپتەری وایان هەڵگرتبوو کە لە فیلمی کارتۆن دەچوون وەک سی نایتSea knigh ، شینۆک Shinook و سی ستالیۆنSea Stalion . یەکێک لە گەورەترین مۆدێلەکانیان پردێکی بچوکی لەجێگەدا دەفڕی و جۆرێکی دیکەشیان کە بە ماشێنی سەرنجڕاکێش The Incredible Machine ناسراو بوو، دەیتوانی تاقمی تەواوی سەربازە فڕۆکەوانەکان هەڵبگرێ. لە نامیلکە نمایشنامەکانی دیکەدا نمونەی چەکی وای تێدابوو کە لە خولەکێکدا دووهەزار گوللەی دەتەقاند، یاخود بەهۆی نیشانە ئەنگێوی کۆمپیوتەریەکەی دەیتوانی خاڵێکی بچوک لە تاریکیشدا بپێکێ. لێرە هەمو جۆرە چەکێک دەفرۆشرا.

خانەخوێکان لەبەرامبەردا هەر ئەو دەستەواژانەیان دەگوتەوە کە بازرگانانی چەک باشیان لێتێدەگەیشتن وەک : ' بیستی مانگ' یان ' لە سی مانگدا و سعاتی ئەوەندە و ئەوەندە ' لەکاتی وەرگرتندا بیست ملیۆن دۆلار'، یاخود ' سی ملیۆن دۆلار بۆ ناردنی وەجبەی چەکەکە نیوەی پێشتر پارەی دەدرێ، نیوەکەی دیکەش دوای ئەوەی لە کەشتییەکە باردەکرێ'. هەمو پارەدانەکانیش بە دۆلار بوون، دۆلار لەو دنیا داخراوەشدا هەر پولە خۆشەویشتەکە بوو.

ئەو بازاڕەی چەک و چەکفرۆشی و دانوستانەکانی بازرگانانی چەک لەگەڵ خواردنەوەی چادا، بەردەوام لەژێر چاوەدێری ئەفسەرانی موخابەراتی ئەلعامەدا بوو. ئەو دەزگایەش گرنگترین دەزگای زانیاری عێراق بوو، کە لە ژێر فەرماندەیی سەباح Sabba`aی زڕبرای سەدامدا بوو. کە هەروەک خۆی دڕندە بوو.

هەندێ لەو بازرگانانەی چەک کە لە هۆڵەکە ئامادە بوون، پێشتریش لە سەردەمی زوتردا هەرلەوێ بوون، واتە بەر لە حەوت ساڵان کاتێ

خانەخوێکان ئەوکات باسی ئیسرائیلی دوژمنیان دەکرد و زیاتر لە عێراق ڕقیان لێدەبووەوە ئەوکات ئیسرائیل زەبرێکی کوشندەی لە ڕێگەی هێزی ئاسمانییەوە لە عێراق دا.

هەر لە دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە بە فەرمی باری جەنگ لە نێوان عێراق و ئیسرائیلدا هەیە. ئیسرائیل لەوە ئەرخاین بوو کە هێزەکانی لە شەڕی تەقلیدیدا دەباتەوە. لە 1977دا مۆساد بۆی دەرکەوت کە فەرەنسا کاتی خۆی یارمەتی ئیسرائیلی دا بۆ پەیدا کردنی چەکی ناوەکیی، کەچی ئێستا بۆ هەمان نیاز خەریکی کۆمەککردنی عێراقە. فەرەنسییەکان بۆ بەدەستهێنانی دامودەزگایەکی ناوەکیی یارمەتی عێراق دەدەن. هەندێک بەشی ڕەوانەکراوە لەگەڵیدا دەستەی یاریدەدەرە ' پسپۆڕە تەکنیکارەکانیش'. مۆڵگەی ئەو دەزگایەش لە تەواسیەیە (التواثیة) Al-Tuweitha ی باکوری بەغدا بوو.

هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی دەستی بە پلاندانان و نەخشەکێشان کرد تاکو تەلارەکانی ئەو مۆڵگەیە بەسەریەکدا خاپوربکەن، پێش ئەوەی دەزگای ناوەکیی لە شوێنی مەبەست جێگیر بگرێ و توخمەکانی کارا بکرێن. گەر ئەو شوێنە بەکارابوونی دەزگاکە لێبدرێ ئەوا دەرەنجامەکەی کارێکی سامناکی زەبەللاحانە دەبێ و بە ملیۆنان قوربانی لێدەکەوێتەوە. هەمو بەغدا و ناوچەیەکی زۆر لە عێراقدا دەکەوێتە بن باندۆری تێکدەرانەی تیشکدانەوەکەی : ئیدی لەوبارەدا هەمو جیهان دژی ئیسرائیل دەوەستێتەوە. لەبەر هۆیە ئاماژەپێکراوەکان ئیسحاق هۆفی Yitzhak Hofi دژی بۆمبارانێکی هێزی ئاسمانی لەو چەشنە بوو. دەیگوت کە ئەو جۆرە پەلامارە قوربانییەکی زۆری لێدەکەوێتەوە و لەنێویشیاندا تەکنیکارە فەرەنسییەکان، بەجۆرێک کارەکە دەبێتە مایەی لەباربردنی پەیوەندی نێوان وڵاتانی ئاوروپا و ئیسرائیل، پەیوەندییەک کە ماوەیەکی دورودرێژە هەوڵ دەدرێ متمانەیان پێبخاتە سەر نیازە ئاشتیخوازەکانیان. هەروەک پەلامارەکە دەبێتە کۆتاییهێنان

بەو هەوڵە دیپلۆماسییە هەستیارانەیەش کە بەنیازی واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ میسردا دەدرێ.
ئەو ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە بیروڕاکان لە نێو خودی ڕێکخراوەکەیدا لەسەر هەمان بابەت یەکانگیرنین. هەندێ لە سەرانی هۆبەکان لەو باوەڕەدا بوون کە هیچ ئەلتەرناتیڤێکی دیکە لەبەر دەستدا نییە، دەبێ بەهەر شێوەیەک بێ مەڵبەندی ناوەکیی سەددام لەناو ببەن. سەددام دوژمنێکی ئاسان نییە. گەر هاتو ئەو چەکی ناوەکیی بەدەستهێنا، ئەوا لە بەکارهێنانی دژی ئیسڕائیل دودڵ نابێ. ئاخر کەی ئیسڕائیل لەکاتی ناچاریدا زۆر مشوری دۆستەکانی لە ئاوروپادا خواردووە؟ ئامریکا تاکە وڵاتە کە گرەوی لەسەر بکا. ئامریکاش لەژێرەوە ئەوەی نیشاندا کە خاپورکردنی مەڵبەندی ناوەکیی عێڕاق لەوە زیاتر نییە کە پەنجەیەک لە پشتەدەستی حکومەتی ئامریکا بدەی.
هۆفی هەوڵی ئەوەی دا بەشێوەیەکی دیکە بۆ پرسەکە بچێ. هۆفی دەیوست وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا گوشار بخاتە سەر فەڕەنسا، بەڵکو بەشەگرنگەکانی مەڵبەندە ناوەکییەکە بۆ عێڕاق بوەستێنێ و چیدی نەیاننێرێ. کاردانەوەی پاریس بۆ واشنتۆن کورت بوو، بەڵام پوخت و تێگەیەنەر بوو کە ئەو داوایە جێ بەجێ ناکا. هەنوکە ئیسڕائیل مژاری ڕاستەوخۆی چارەسەرکردنی پرسەکەی گرتە بەر. هۆفی دەستەیەکی کاتسای ناردە کارگەی La Seyne-surmer لە تۆلۆن Tolon، لەوێ بەشە کەندوە کاراکەی ناوەکیی بنیاتدەنرێ. ئەو کەندووە لەلایەن ڕێکخراوێکەوە بەناوی دەستەی ژینگەپارێزی فەڕەنسییەوە، کە هێشتا ناوی نەبیسترابوو، تێکدرا. ئەو ناوەش خودی هۆفی دەستنیشانی کردبوو.
لەو کاتەی فەڕانسە خەریکی دروستکردنی کەندوویەکی کارای ناوەکیی دیکە بوو، عێڕاق یەحیا ئەلمەشەهد Yhay Al-Meshas ی ئەندامی کۆمیتەی وزەی ناوەکیی ناردە پاریس تاکو سەرپەرشتی گواستنەوەی سوتەمەنی مەڵبەندەکە بۆ بەغدا بکا. هۆفی کۆماندۆیەکی مەرگچێنی نارد، تاکو ساردی بکاتەوە. لەوکاتەی دەستەیەکی دیکە لە شەقامە

نزیکـەکانی شـوێنی ئەلمەشـهەد دەسـوڕانەوە، دو کیـدۆن بـەهۆی کلیلـە جۆکەرەکەی دەستیانەوە خۆیان کوتایە ژوری نوسـتنی ئەلمەشـهەد. لـەوێ چەقۆیان سرەواندە دڵی و ملیشیان پەڕاند. ژورەکەشیان سەراوبن کرد تاکو جێماوی دزینی پێوە دیاربێ. سۆزانییەک کە لە ژوری تەنیشـتییەوە بوو بـە پۆلیسی ڕاگەیاند، سعاتیک پێشتر ئـەو لـە خزمـەتی زانـا عێراقییەکـەدا بـووە. دواتـر کـە ڕۆیشـتو لەگـەڵ مـەعمیلێکی دیکـە خـەریک بـوو، گـوێی لـە 'نوسکەنوسکێکی نامۆ بوو' کە لـە ژورەکـەی ئەلمەشـهەد دا دەهـات، ئـەویش سعاتێک دوای قسەکانی لەگەڵ پۆلیس، بـە هـۆی ڕوداوێـک، ئۆتۆمـۆبیلێکی بەسەر کەوت و بە مردوی دۆزرایەوە .کەچی ئۆتۆمۆبیلەکە تائێستاش هـەر ونە. کۆماندۆی مەرگچێنیش بە فڕۆکەی ئەلعال گەڕایەوە تەل‌ئەبیب.

سەرەڕای ئەو کردە کوشتنە نوێیەش، عێڕاق بە یارمەتی فەڕەنسییەکان هەر بەردەوام بوو لەسەر بەدەستهێنانی توانای ناوەکیی. لە تەلئەبیب دەست بـە ئامادەباشـی هێـزی ئاسـمانی ئیسـڕائیلی کـرا، هەرچەنـدە سـەرانی دەزگـا زانیاریـیـەکان لەگـەڵ هـۆفی سـەبارەت بـە پەلامارەکـە لـە دەمەقاڵێـدا بـوون، ئـەوجارەیان سـەرۆکی مۆسـاد لـە گۆشـەیەکی نـەخوازراوەوە کـە جێگرەوەکەی ناحوم ئادمۆنی بوو، نەیاری بۆ پەیدا بوو . ئادمونی لەسەر ئەو ڕایـە بـوو کـە تێکوپێکـدانی مەڵبەنـدی نـاوەکیی عێـڕاق ڕەنگبـێ زۆر چارەنوسسازانە نەبێ، بەڵام دەرسێکی گەورەیە بۆ عەڕەبەکانی دیکە.

لـە سـەروبەندی ئۆکتۆبـەری 1980دا ئەوباسـە سەرباسـی مشـتومڕەکانی کابینەیەک بوو کە مناحیم بێگن سەرۆکایەتی دەکرد. بەڵگەوبەند(ئەرگومێنت)ە کۆنە بڕواپێکراوەکان دیسان هێنرانەوە سەرمێز. لەبەرامبەر ناڕازی بوون بۆ بۆمباردمانەکە هۆفی بەتەنها مایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەر پێیدادەگرت و دەینوسـی کـە دژی پـەلامارێکی لەوجۆرەیـە، هەرچەنـدە بـەم کـارەی خۆکوشتنێکی پیشەییانەی ڕادەگەیاند .

ئـادمۆنی تادەهـات گاڵتـەپێکردنـەکانی خـۆی بـە بیرۆکـەی هـۆفی لەمـەڕ پەلامارنەدان کەمتر دەشاردەوە. ئەو دو کۆنە برادەرە کە بوونەتە هاوکاری

یەكدی، بەڵام ئێستا بەتوندی بەرامبەر یەک وەستاون. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا شەش مانگی ڕەبەقی دیكەی لە كێشمەكێشی تاڵی نێوان بەڕێوەبەری گشتی و كاربەدەستە لەخوارخۆیەكانی خایاند، تا مۆڵەت درایە سەركردەی گشتیی هێزە چەكدارەكان بۆ هێرش بردن. ڕۆژی پەلامارەكەش بە رۆژی 15ی ئازاری 1981 دیاریكرا.

پەلامارەكە خۆی لە ڕوی تاكتیكەوە كارێكی لێزانانە بوو. هەشت فڕۆكەی بۆمباردمانی جۆری F-16 بە یاوەری شەش فڕۆكەی تیژڕۆی جۆری F-15بەسەر گردە لماوییەكانی ئوردن ڕوەو عێراق سوڕانەوە، كە دەقاودەق لە چركەساتی خۆیاندا سعات 17:34 بەكاتی خۆجێی گەیشتنە سەر ئامانجەكەیان، ئەوەش یەک خولەک دوای بەجێهێشتنی تیمە فەڕەنسییە كاركەرەكەی ئەوێ بوو. لە ئەنجامدا نۆ كەس كوژران و مەڵبەندە ناوەكییەكەش خاپوركرا. هەموو فڕۆكە ئیسرائیلیەكانیش بێ هیچ زیانێک گەڕانەوە مۆڵگەكانیان. لەسۆنگەی ئەوەوە هۆفیش پایەكەی لە دەستدا و ئادمۆنی شوێنی گرتەوە.

هەنوكە لەو بەیانییەی نیسانی 1988دا، ئەو بازرگانانەی كە پێش حەوت ساڵ خانەخوێكەیان بەهۆی پەلامارەكەی ئیسرائیل بۆ سەر مەڵبەندە ناوەكییەكەی پێویستی بەچەكی نوێ بوو ئێستا بۆی دابیندەكەن، بێگومان سەریان لەوە سوڕ دەمێنێ كە پیاوێكی مۆساد لەو هۆڵەدا هەیە و بەو پەڕی هێواشی و بێدەنگی ناو و جۆرەكانی چەكەكانیان دەنوسێ.

ئەو بەیانیەی هەینی كاروبارەكانی نێو هۆڵەكە بەهۆی هاتنی سەباح ئەلتكریتی فەرماندەی پۆلیسی نهێنی عێراق كە بە دەستەی پاسەوانە پڕچەكەكانیان دەورە درابوو، وەستێنرا. زڕبراكەی سەدام بەرەو ئەسانسۆرەكان ڕۆیشت، تاكو ڕوەو شوێنە تەرخانكراوەكەی لە بڵندترین نهۆمی میوانخانەكە بڕوا. لەوێ سۆزانییەكی بەژن درێژی گۆشتن، كە بەتایبەت لە پاریسەوە بۆیان هێنابوو، چاوەڕوانی دەكرد. بڕە پارەیەكی قەبەی پێدرابوو، بەڵام كارەكەش لەسەركێشی بەدەر نەبوو. هەندێ لە

سۆزانییەکان بی سەروشوێن دەبوون کاتێ سەباح کاری سێکسیانەی خۆی لەگەڵ تەواو دەکردن.

فەرماندەی پۆلیسی نهێنی لە پاش نیوەڕۆ ئەوێی بەجێهێشت. کەمێک دوای ئەو، گەنجێکی درێژ کە چاکەتێکی کەتانی شین و پانتۆڵێکی هاوینەی لەبەردا بوو لە سویتە (باڵ-جناح)ەکەی تەنیشت سەباحەوە بوو کە سۆزانییەکەی پاریسی لێجێگیر بوو، ڕۆیشت. ئەو کوڕێکی قۆزو لەبیچمیشدا لاوازبوو و نیگایەکی هەندێ تورەشی بەسەر سەروسمێڵەوە دیار بوو، نیشانەی ئەوە بوو بەشێوەیەک لە شێوەکان سەرنجی زەبوونبوونی ڕادەکێشا.

ئەو ناوی فەرزاد بازۆفت Farzad Bazoft بوو. بەپێی فۆرمی میوانخانەکە کە ڕاستەوخۆ دانەیەکی بۆ سەباح دەنێردرا ئەو خۆی بە' سەرۆکی پەیامنێرانی دەرەوەی ' ی The Observer کە یەکشەمموان دەردەچێ ڕۆژنامەی ناسراوی بەریتانی کە لەهەمو لایەکی ئینگلستاندا ئابونەداری هەیە، دەناساند. ئەو خۆناونوسکردنەش ڕاست نەبوو: ئەو ڕۆژنامەنوسانەی کە بە موچە لە دەرەوەی وڵات بۆ ڕۆژنامەکە کاریان دەکرد، دەکرا بەخۆیان بڵێن' پەیامنێری دەرەوەی وڵات'. بازۆفت بە موچەی بەردەوام بۆ ڕۆژنامەکە کاری نەدەکرد، بەڵکو بە وتار لەبارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پارەی وەردەگرت. بازۆفت هەمیشە لە بەرامبەر ڕاپۆرت نوس و هەواڵنێرانی میدیاکانی دیکەدا خۆی بە ' سەرۆکی پەیامنێرانی دەرەوەی وڵات'ی ڕۆژنامەکەی دادەنا، چونکە بەو شێوەیە لە شارەکانی بەغدا و بەسرادا باشترین میوانخانەی دەستدەکەوت. ئەو سوکە بوختان بەخۆکردنەی لای ئەوانی دیکە وەک ڕەفتار هەراشێکی دڵگیرانەی سەیردەکرا.

ئەو لایەنەی کە هاوکارەکانی خۆی نەیاندەزانی، ئەوە بوو کە بازۆفت کەسایەتییەکی تەواوی دیکەی هەبوو، ڕوی تاریکی بوو. ئەوەش هەرباش بوو، چونکە گەر ڕاستییەکەیان زانیبا و بۆیان دەرکەوتبا کە بۆچی ئەو لە بەغدایە، ئەوا توشی گێچەڵێکی کوشندەی دەکردن. بازۆفت سیخوڕێکی مۆساد بوو.

سێ ساڵ لەمەوبەر و دوای تێپەڕینی ماوەیەکی کەم بەسەر دەرچوونی لەتاران بۆ لەندەن، مۆساد ئەوی هێنایە ڕیزخۆی. لە تاران بە دەربڕینە ڕاشکاوەکانی دژی ڕژێمی خومەینی دەستی لە کونان وەردەدا. وەک هەمو غەیرە ئینگلیزێک بازۆفت لە لەندەن هەستیکرد کە پشیلەیەکە لە باڵەخانەیەکی بێ سەروبەردا. ئینگلیزەکان خۆیان تێکەڵ نەدەکرد. هەوڵیدا لەنێو کۆمەڵگەی ئیرانی لەمەنفا جێپێی خۆی بکاتەوە، ماوەیەکی درێژ زانیارییە باشەکانی لەسەر بونیادی نوێی سیاسی لەتاران بوونە مایەی جێکردنەوە و خۆشحاڵی لە نێو کۆمەڵگەی هەندەرانی ئیرانیدا. نیگای بیچمە هەمیشە وەک یەکەکانی دەرونی لاوە پڕ هیواکەیان تێر نەکرد، بەڵکو بووە مایەی وەڕەزمان و هەراسانبوونی.

ئەو بەدوای ژیانێک دەگەڕا کە بزۆزتر بێ لەهەواڵە کەمەکانی، کە لە تارانەوە دەهاتن. بازۆفت پەیوەندی لەگەڵ عێراقی دوژمنی ئیران پەیداکرد . لە دەوروبەری 1985دا کۆمەڵەیەکی زۆری عێراقییەکان لە لەندەن بوون، ئەوان سەردانکەری بەڕیز بوون. نەوەک لەبەر ئەوەی شانشینی یەکگرتوو، عێراقی وەک وڵاتێکی گرنگی بەرهەمکڕ تەماشا دەکرد، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەتەوەیەک لەژێر فەرماندەیی سەددام حوسێن دەبێتە لەمپەرێک لە بەرامبەر ڕژێمی خومەینی ئیسلامی فەندەمێنتالیدا .

بازۆفت بە ڕێکەوت چووە ئاهەنگی عێراقییەکان، دەبوایە بەخۆپارێزی لەسەر هێلکان بڕوا. خانەخوێ نوێکانی کەمتر گرژبوون، ئەوان زیاتر ئامادەبوون ڕوی خۆیان نیشانبدەن تا هی ئێرانییەکە. ئەوان بەشێوازی باش و دەرونە پاکەکەی بەرامبەر ئایەتوڵلاکانی تاران کارانگازبوون .

لە یەکێک لە ئاهەنگەکاندا بزنسمانێکی عێراقی بەناوی ئەبو ئەلحەبیب Abu Al-Habib ئامادەبوو. ئەو گوێی بۆ بازۆفت ڕاگرت بوو، کە تا ئێوارە درەنگانێک کەمێک مەست ببوو لەوەشی نەدەبڕاندەوە کە دەیەوێ ببێتە ڕۆژنامەنوس، پێشەنگەکانیشی لەکاری ڕۆژنامەنوسیدا Bob Woodward و Carl Bernstein ڕاپۆرتدەرەکان بوون کە بوونە مایەی ڕوخانی

سەرۆک نیکسن. بازۆفت دوپاتی دەکردەوە کە ئەو پێی خۆشە بمرێ کاتێ ئەو بە کارێکی وا ڕژێمی خومێنی بڕوخێنێ. لەو نێوەشدا بازۆفت هەندێ وتاری بۆ ڕۆژنامەیەکی بچوکی ئێرانی کە لە شانشینی یەکگرتوو دەردەچوو، دەنوسی .

ئەبولحەبیب نازناوی کاستایەک بوو لەعێراق لەدایک ببوو. ئەو ڕاپۆرتێکی بۆ تەلئەبیب نوسی و تێیدا وێنای بازۆفت و کاری ئێستای و ئارەزو و ئامانجی پیشەیی تێدا نوسی. لە تەلئەبیب شتێکی وا نوێ نەبوو، چونکە هەفتانە سەدان ناوی وادەهاتن و دەچوونە نێو داتابانکی مۆساد.

بەڵام هەنوکە مۆساد لەژێر سەرکردایەتیی ئامدۆنی دایە، کە زۆر بە پەرۆشە تەونی ڕایەڵی عێراقی فراوانبکا. کاتساکەی لەندەن فەرمانی بۆهات کار لەسەر بازۆفت بکا. لە کاتی نانخواردنی بەیەکەوەیاندا، بازۆفت گلەییدەکرد کە دەستەی نوسەران تواناکانی تەنها بۆ ستافەکەی بەکاردێنێ. خانەخوێکە ڕاوێژی ئەوەی بە بازۆفت کرد کە هەوڵێک لەگەڵ میدیایەکی ئینگلیزی گەورەتربدا. بێگومان شوێنێک هەر دەبێ بۆ نوسەرێک کە دەرەقەتی زمان بێت و زانیارییەکی زۆریشی لەبارەی ئێرانەوە هەبێ. لەوانەیە BBC دەسپێکێکی باشی ئەو هەوڵە بێ.

لە BBC دا سایانمی جۆراوجۆر کاردەکەن، ئەرکیان لەکاتی بەرنامە دروستکردندا ئەوەیە، ئیسرائیلیان لەبەرچاو بێ، هەروەها هەمان شتیش دەربارەی کەسەکانی بەشی عەرەبیش لە هەمان میدیادا. بە یەکێ لەسانمەکان با، بازۆفت هەرگیز لەوێ جێینەدەبووەوە، بەڵام دوای دیداری بازۆفت لەگەڵ ئەلحەبیب، بازۆفت وەک پرۆژەی لێکۆڵینەوە جێگەی لە BBC دا بۆ کرایەوە. ئەو بە باشی کاری خۆی دەکرد. دواتر ئەرکی نوێ هاتنە پێشەوە. دەستەی نوسەرانی نوسینگەکە تەواو بۆیان دەرکەوت کە بازۆفت لە تاران کاری باشی نەکردووە.

لە تەلئەبیب ئادمۆنی پێیوابوو کاتی هەنگاوی داهاتو هاتووە. هەنوکە لە ئامریکا ئاشکرابوونی ئێرانگێتی ڕێگان بە هەنگاوی خێرا دێتە پێشەوە، بۆیە

بەڕێوبەری گشتی بە ئەنقەست بڕیاریدا پەردە لەسەر ڕۆڵی یاکۆڤ نیمرۆدی Yakov Nimrodi ئاژانسی ئامان لە شەرمەزارییەکە هەڵبداتەوە. نیمرۆدی ئەندامێکی دەستە زامنکارییەکەی ئیرانگێت بوو کە داڤید کیمخ David Kimiche دایمەزراندبوو، تیایدا توانای شارەزایی خۆی بە شێوەیەکی باش بەکارهێنابوو، تاکو مۆساد لە دەرەوەی بازنەی شەرمەزارییەکە بهێڵێتەوە. نیمرودی پیاوێکی زۆرزان و ڕێوی ئاسای خاوەن شێوازێکی خێرا لەئاخاوتن، وای لە وەزیری دەروەی ئامریکا جۆرج شۆلتز کرد لە ڕێرەوەی کردەوەی گواستنەوەی ناواخنی ئێرانگێتدا بڵێ ' ئەجێندای ئیسرائیل لەگەڵ هی ئێمە هاوچەشن نییە، بۆیە پەیوەندی نێوان دەزگای زانیاریی ئێمە و ئیسرائیل پەیوەست بە ئێران ئەو پەیوەندییە نییە کە ئێمە نابینایانە بۆی بڕۆین'.

دوای ئەوەی کیمخ لە لیژنەی زامنکارییەکە کشایەوە، نیمرودی بۆ ماوەیەک جێیگرتەوە. کاتێکیش لەو بارەیەوە زیاتر گرژی پەیدا بوو ئیسرائیلیش تادەهات پێی شەرمندە دەبوو، کتوپڕ ئاژانسی ئامان لە نێویاندا نەما. ئادمۆنی کە لەسەر شێوازی سەوداکردنی نیمرودی بەرامبەر مۆساد تورە ببوو، پلانی دیکەی هەبوو. ئەو نیمرودی ڕاشکاوانە شەرمەزارتر دەکا و پاڵێکیش بە بازۆفتەوە دەنێ تاکو باشتر خزمەتی مۆسادی پێ بکا.

ئەلحەبیبی بەرامبەر پەیامنێرەکە زیاتر وردەکاری بابەتەکەی بۆ شیکردەوە تاکو بیهێنێتە سەر ئەو بڕوایە کە دەرفەتی باشی لە پێشدا هەیە. ئەویش بە چیرۆکەکەوە ڕویکردە The Observer. بابەتەکە بڵاو کرایەوە و کارێکی وایکرد شت لە بارەی ڕۆڵی شاراوەی ئیسرئیلییەک کە نیمرودی بوو لە ئێرانگێتدا بزانرێ. ئیدی هەر زوو بازۆفت بەردەوام پشکی خۆی لە بڵاوکردنەوەی The Observer دەدی. ئەو شتێکی دەستکەوت کە بە کەسی ڕۆژنامەنوسی وەک خۆی نەدراوە، ئەویش نوسینگەیەک بوو، بەڵام زو بۆیدەرکەوت کە دەرەقەتی پارەدانی خەرجی ئەو هەمو تەلەفۆنانەی کە بۆ تاران دەیکردن نایێ، تاکو چیرۆکێک دەستبخا و بیکاتە وتارێک لەگەڵ

خەرجییەکانی دیکە. ئەو پارەی وتارە بڵاوکراوەکانی وەردەگرت. ئەمە وای لێکرد وتاری زیاتربنوسێ و بەردەوامیش لە کاتی بوونی دەرفەتدا پێدابگرێ کە ڕەوانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکرێ، تاکو لە شوێنی گەرمی هەواڵەوە شت بنوسێ. لە کاتی ئەو سەردانانەدا پارەی باشی دەدرایە، دەیتوانی قەرزەکانی بداتەوە و هەندێکیشی لێ پاشەکەوت بکات و ژیانێکی خۆشی پێبباتە سەر. بۆ بازۆفت کورتهێنانی پارە هەمیشە گێچەڵ بوو، هەرچەندە ئەو لایەنە نادیارەکانی ژیانی بۆ هاوکارەکانی نەدەدرکاند. کەس گومانی لەوە نەدەکرد کە ئەو ڕۆژنامەنووسەی بە سعاتان بە زمانی فارسی تەلەفۆنی دورودرێژی بۆ تاران دەکا، پاشەڵی پاک نەبووە و لەسەر دزی حوکمدراوە. بازۆفت هەژدە مانگان لەزینداندا بووە دوای ئەوەی بەسەر پارەی بانکی بارمتەی داداوە. دادوەر لە کاتی بڕیار بە سەردادانیدا فەرمانی ئەوە بووە دوای تەواوبوونی ماوەی زیندانییەکەی دەبێ لە وڵات دەربکرێ و بنێردرێتەوە وڵاتی دایکی، بەڵام بازۆفت لەسەر بنەمای ئەوەی گەر بگەڕێتەوە ئێران ئەوا لەسێدارە دەدرێ، سکاڵانامەی بەرزکردەوە. هەرچەندە سکاڵاکەی ڕەتکرایەوە، کەچی ڕێپێدانێکی ناوازە Exceptional leaveی پێدرا، واتە ئەو تاهەتایە دەتوانێ لە شانشینی یەککگرتوودا بژی. پاڵنەری ئەو هەنگاوە تایبەتمەندەی وەزارەتی ناوەخۆی بەریتانیا تاکو ئێستا هەر بە شاراوەیی ماوەتەوە.

تا ئەوەندە پرسەکە ئەوەیە ئایا مۆساد دوای ئەوەی بازۆفتی بەیەکجارناسی، بەهۆی سایانمێکی پایەباشی لەWhitehal (شەقامێکە لە وێستمینیستەری لەندەن، زۆربەی نوسینگەکانی حکومەتی لێیە، بۆیە ئاماژەیە بە حکومەت- وەرگێڕ-) بڕیارەکە لە بەرژەوەندی بازۆفت شکایەوە، بەرسڤی پرسەکە ناداتەوە. لەوانەیە ئەو ئەگەرە بەدور نەگیرێ.

دوای بەردان، بازۆفت توشی شاڵاوی خەمۆکی هات کە نیشانەی نەخۆشییەکانی دیکەی لێدەرکەوتن. ئەو ڕاستییەش لەلایەن کاتسای مۆسادەوە بەدواداچوونی هەبوو. پاشان نوسەرێکی ئینگلیز Rupert

Alisonلەجیاتی ئەندام پەرلەمانێکی کۆنسەرڤاتیف و دەسەڵاتێکی ناسراو لە بواری شێوازەکانی هێنانەڕیز لە لایەن پۆلیسی نهێنییەوە، ئاماژەی بەوەدا کە کەسایەتییەکی وەک بازۆفت وا دەخوێندرێتەوە، کە بەربژارێکە بۆئەو دەزگایانە بە تایبەتیش بۆ مۆساد.

یەک ساڵ دوای یەکدیناسینیان ئەلحەبیب، بازۆفتی هێنایە ڕیزی مۆساد. لە کوێ و چۆن ڕویدا، هەرگیز ئاشکرا نەکرا. بێگومان داهاتی زیادە بۆبازۆفت باش بوو، چونکە دەبوایە ئەو بەردوام کاربکا. بۆ ئەو کە بە چاویلکەی ڕۆمانتیکی سەیری ژیانی دەکرد، ژیانی سیخوڕیش خەونێکی سەرنجڕاکێشە، ئاخر کیم فیلپی Kim Philpy یش وەک پەیامنێری The Observer کاری سیخوڕی بۆ یەکێتیی شۆرەوی دەکرد. ئەوەش بۆ ئەو پڕ واتا بوو.

هەرچۆنێک بێ، بازۆفت هەر سوربوو لەسەر ئەوەی ناو و ڕومەتێک بۆ خۆی پەیدابکا : ئەوەی لە شێوازەکەی کورتی دەهێنا، دەیویست لە لێکۆڵینەوەکانی تێیهەڵبێنێتەوە. هەرچی بە قوڵی لەبارەی ئێرانەوە دەیزانی، یەکسەر دایە دەستی کاتساکەی لەندەن. بێجگە لە وتارەکانی بۆ The Observerئیشی دیکەشی لەIndependent Television News و دەستەی ڕۆژنامەکانی Mirror وەرگرت. ئەو سەردەم نیکۆلاس داڤیس Nicholas Daviesسەرنوسەری دەرەوەی وڵاتی Daily Mirror بوو. بەهۆی گەشتەکانی بۆ پارکە پارێزراوەکانی ئاژەڵە کێوییەکان لەو لاپەڕە بۆ ئەو لاپەڕەی evelyn Waughs Scoop دەچوو. ئەو بەهرەی ئەوەی هەبوو کە وەک ڕۆژنامەنوسێک لە دایکبووبێ، بوێرانە قسەی دەکرد و بەرگەی کهولیشی دەگرت. ئەکسێنتە ئینگلیزییە باکورییەکەی بە هەوڵی بەردەوامی کە بە سعاتان پرۆڤەی لەسەر شێوەی ئاخاوتن دەکرد بەلاوەنا. ژنان حەزیان بە شێوازەکەی دەکرد، شێوازە دەسەڵاتداریانەکەی کە داخوازییەکانی لە جێی خۆی دەکرد، دەیزانی لە چ کاتێک و چ جۆرە مەیەک داوا بکا. ژنان کارانگاز بوون بە پیاوێک و شێوازەکەی کە باسی وڵاتانی دوری بۆ دەکردن وەک ئەوەی خۆی لێیان ژیابێ. ئەوەش هەرلێگەڕێ کە

ئێواران لە سەر مێز بەخۆی و پێکەکەیەوە نمایشێکی وای دەکرد کە زۆر ڕۆمانسیانە دەینواند.

هیچ ساتێک لەلایەن ناهاوکارەکانی لە Mirror هەروەها بازنەی فراوانی برادەرەکانی لە بواری ڕۆژنامەکان تەنانەت هاوسەرەکەشی کە لە ئوسترالیا لەدایکبووە و ئەکتەرێکی لێهاتوو بووە ڕۆڵی نمونەیی لەزنجیرەی BBC بەناوی Dr. Who وازی کرد، گومانیان لەوە نەدەکرد کە ناحوم ئادمونی فەرمانی دابێتە مۆساد بۆ هێنانەڕیزی داڤیس.

خودی داڤیس هەمیشە وا خۆی دەنواند کە هەو نییە، تەنانەت گەر داواشیان لێکرد ئەوا هەرگیز وەک پیاوێکی مۆساد ناکەوێتەکار. ئامادەبوونیشی لە هۆڵی میوانخانەی فەلەستین میریدیان لەو ئێوارەیەی هەینی نیسانی 1988 پەیوەندی بەکاری رۆژنامەگەرییەوە هەیە، دەیەوێ بزانێ چەند بازرگانی چەک بۆ ئەوکارە لێرەن. دواتر ئەوەی بەیاد نەدەهاتەوە کە بۆچی لەگەڵ بازۆفت لەو هۆڵەدا یەکیانگرتەوە و بەیەکەوە قسەیانکرد، بەڵام ئەو ئەوەندەی گوت: ' ئەز وا دادەنێم کە ئاخاوتنەکەمان لەسەر ئەوە بوو کە ڕۆژەڤ بوو' . هیچی دیکەی لەسەر نەڕۆیشت و بەردەوامیش بوو لەسەر هەڵوێستی هیچ نەدرکاندن .

هەردوکیان لەگەڵ دەستەیەکی بچوکی ڕۆژنامەنوسان کەوتن بۆ سەردانی عێڕاق ( کە لە نێویاندا نوسەری ئەو کتێبە بە هۆی ئەرکی ئاسیۆشێیتت پرێسPress Association ، ئاژانسی ڕۆژنامەگەری نیشتمانی شانشینی یەکگرتوش هەبوو ). لەکاتی گەشتەکەدا لە لەندەنەوە داڤیس چیرۆکی خۆشی لەمەڕ لایەنی سێکسی ڕۆبەرت ماکسوێل بۆ دەگێڕاینەوە، کە گروپی Mirror کڕیان. ئەو ڕۆبەرت ماکسوێل Robert Maxwellی 'دێوێکی مێباز وێنا دەکرد کە هەرگیز ئاسودە نە دەبوو تا سکرتێرەکەی خۆی هەڵنەخەڵەتاند'. ئەو جێی گومانی نەدەهێشتەوە کە کارمەندێکی نزیکی ماکسوێلە: ' کاپتن بۆب Bobئەهریمەنێکە لەو دەوروبەرە، بەڵام ئەو دەزانێ کە من زۆر دەربارەی ئەو دەزانم تا سەروکارم بکا". لێکدانەوەی داڤیس کە لەسەرکار لانادرێ،

چونکە زۆر دەربارەی سەرپەرشتیاری کارەکەی دەزانیێ، بەلای گوێگرەکانی هەرزە گۆیی بوو .

لەکاتی فڕینەکەدا فەرزاد بازۆفت نقەی لەخۆ بڕیبوو. ئەو بە ئاستەم لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەئاخاوت، بەڵام هەرکە گەیشتینە فڕۆکەخانەی بەغدا بەهرە زمانزانیەکەی کەوتە گەڕ و بە ئاستەم کێشەی لە یەکتێگەیشتنمان لەگەڵ ڕێبەرە عێراقییەکان بۆ پەیدا بوو. وەک ڕەفتارێکی شانۆییانە داڤیس بە گوێیداچرپاندین کە لەراستیدا ئەو ڕابەرانە سەربە پۆلیسی نهێنین." ئەو دەستە گەوجانە ناتوانن سیخوڕێک بناسنەوە گەر خۆت ئەوانت ناسی" ئەمە پێشبینی داڤیس بوو.

لە میوانخانەی فەلەستین میریدیاندا داڤیس ئەوەی بۆ هاوگەشتیارەکانی ڕونکردەوە کە ' ئەو تەنها بۆ ئەوە لێرەیە کە بۆ نەگبەتی، لەندەن دەستی لە بینە قاقا نرابوو'. ئەو ئەوەشی ڕاگەیاند کە حەز ناکا گەشتی فەرمیان لەگەڵدا بکا، کە لە میانەی گەشتەکاندا سەردانی بەرەکانی شەڕیش هەیە لە بەسرا، چونکە گوێی لە هاتوهاواری لەشکەری عێڕاقو پێهەڵدانی سەرکەوتنەکانی بەسەر هێزەکانی ئێراندا، کەڕ بووە. بازۆفتیش گوتی کە فەرمانپێکەرەکانی ئەو بایەخێکی ئەوتۆ نادەنە گەشتەکەی بۆ خوارووی عێڕاق لە کەنداوی بەسرادا.

دوای ئەوەی فەرزاد بازۆفت لەو ئێوارە هەینیەی نیسانی 1988دا بە سعاتان لە هۆڵەکە دانیشت تاکو هاتنوچوونی بازرگانانی چەک بخاتە ژێر چاودێرییەوە، جاربەجاریش لەگەڵ داڤیس قسان دەکا، بە تەنها سەرێکی لە قاوەخانەکەدا. ئەو سوپاسی ئەو بانگهێشتنەی کرد کە لەگەڵ هەندێ ڕۆژنامەنوسی دیکە لەندەنی بکەوێت، بەو مەبەستەی لە ' ئەجێنداکەی خۆی بکۆڵێتەوە'. لە کاتی فراویندا بانگکرا، چونکە لە هۆڵەکەدا زەنگی بۆ لێدرابوو. خولەکێک دواتر گەڕایەوە. دەموچاوی ئاماری بیرکردنەوەی پێوە دیاربوو. دوای داواکردنی پاشخۆراک لە شیرنەمەنی، لە پڕێکەوە بێگوێدانە پێکەنینی

ڕۆژنامەنوسـەکانی  دیکە کە گوتیـان " ڕەنگبێ لـە شـوێنێک کچێکـی جـوانی هەبێ" لەسەر مێز هەستا .

ئەو، تا ڕۆژی پاشتر ڕۆیشت؛ زیاتر سەرنجەکانی وروژاندن، کاتێک بە کیم فلیچەر Kim Fletcher ڕۆژنامەنوسی Daily Mail ی گوت: 'بۆ ئێوە هیچ ناگەیەنێ، ئێوە لە ئینگلستان لە دایکبوون و گەورەبوون. ئەز ئێرانیم، ئەوەش جیـاوازی زۆری لێدەکەوێتـەوە". هـەر تـەنها فلیچـەر بـە تـەنها ڕۆژنامـەنوس نەبوو بپرسێ" ڕەنگبێ بازۆفت جارێکی دیکـە منگـەمنگی لەسـەر ئـەوەبێ کـە پاشخانێکی دیکەی جودای هەیە".

بەشی زۆری ڕۆژی دوەم بازۆفت لە هۆڵەکە بێپەروا دەهات و دەچوو یان لە ژورەکەی ئەم سەرو ئەوسەری دەکرد. دو جاران لە میوانخانەکە دەرچوو و بۆی گەڕایەوە. لە هۆڵەکەدا جارێکی دیکە لەگەڵ نیکۆلاس داڤیس ئاخاوت. دواتر  داڤیس گوتی ڕەفتاری بازۆفت وای نیشـاندەدا ' هـەموان بـۆنی شـتێک دەکەن، بەڵام ئایا ئەوەی دێتەڕێ کـە هیواداریـەتی'. هـەرچی دەربـارەی ئـەو بوو وەک پەیامنێری هەندەرانی Mirror ڕایگەیاند ، ئەو هەر هیچ نانوسێ. ' لێرە هیچ شتێک نییە کە بەکەیفی کاپتن بۆب بێ'.

پاشان دوای نیوەڕۆ جارێکی دیکە بازۆفت میوانخانەکـەی جێهێشـت. وەک هـەمو  جارێکیـان یـاوەرێکی عێراقـی هـەبوو کـە بەدوایـدا دەچـوو. کاتێـک گەڕایەوە، بە تەنهابوو. هەندێ لە ڕۆژنامەنوسان گوێیان لێبوو کە بە داڤیسی گوت کە ئەو ' نایەوێت کەسی بەدوابکەوێ وەک دێڵە سەگێکی لەکەڵ.'

پێکەنینەکەی داڤیس هیچی لە دەنگی بازۆفت نەگۆڕی. جارێکی دیکە چووە ژورەکەی خۆی. کاتێک لە هۆڵەکە دەرکەوتەوە، ڕۆژنامەنوسە هەمەجۆرەکان گوتیان کەوا ئەو لەگەڵیان ناگەڕێتەوە لەندەن. ' دیارە شتێک لە ئـارادا هەیـە' ئەو قسـەیەی بە شێوەیەک گوت کە بۆنی پیلانێکی کردبێ.

فلێچـەر پێیوابوو' دەبێ چیرۆکێکی باش لێرە هـەبێ پێش ئـەوەی مـن لێـرە بمێنمـەوە'.

چەند سعاتێک دوای ئەوە بازۆفت میوانخانەکەی بەجێهێشتەوە. ئەم جارەیان دوا جاربوو کە هاوگەشتیارەکانی پێش ئەوەی جاریکی دیکە سەرهەڵبداتەوە بیبینین، بەڵام ئەم جارەیان لەڕێی ڤیدیۆکاسێتێکی بەربڵاوی عێراق، حەفت حەفتە پێش ئەوەی بگیرێت و ددان بەوەدا بنێ کە سیخوڕێکی مۆساد بووە.

لەکاتی سەردانەکەی بۆ بەغدا بازۆفت لەسەر ئەرکێکی مۆساد کاریدەکرد، کە بۆ کاتسای ئەویێ هێشتا زۆری مابوو تەواو ببێ. ئەرکەکە ئەوەبوو، هەوڵبدا چۆنیەتی جێبەجێکردنی نەخشە پڕۆژەی جیرالد بولی تۆپە زەبەللاحەکە ئاشکرا بکا. بەگەڕخستنی ڕۆژنامەنوسێک بۆ ئەو کارە مرخی فەرماندارانی بۆ خۆشکردبوو .مۆساد وای دانابوو گەر بازۆفت ئاشکرا ببێ و یەخەی بگرن، ئەوا وەک بەرزەکی بانان لێی دەردەچێ، چونکە ڕۆژنامەنوسەکە بۆ کۆمپانیایەکی لەندەنی سیستمی بەرەنگاری سنوردار (Defence Systems limited(DSLکار دەکا. کاتێک کە بازۆفت لەنزیک شوێنی سوپەر تۆپەکە گیراو ڕاپێچکرا، پۆلیسی نهێنی عێراق بۆی دەرکەوت کە بازۆفت کۆمەڵە تێبینی و ڕەشنوسێکی لەبەرکەدا بووە، و لە میوانخانەکەشەوە بە تەلەفون گەیاندویەتییە کۆمپانیای DSL . کۆمپانیای ناوبراو ئەوەی ڕەتکردەوە کە هیچی لەگەڵ بازۆفتدا هەبێ، یاخود لەگەڵ مۆساددا هیچی لەبن سەردا هەبێ.

لە کاسێتە ڤیدیۆییەکەدا ڕوانینی بازۆفت جاروبار بزرە تا لە پڕەوە بە ترسەوە چاو لە یەکدەدا لەو ژورەی لێیدانراوە، ژورەکە لە ماڵێک دەچێ پەردەکانی ڕەنگاوڕەنگن. بازۆفت وەک ئەوە دەبینرا کە لە خۆی خۆش بووبێ و مەرگی لەبنگوێبێ و هیچیش بۆ ڕزگارکردنی نەکرێ .

دەرونناسەکانی مۆساد بە وردی لە هەمو وێنەکانیان کۆڵیەوە. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو قۆناغەی کە ئێستا بازۆفت تێیدایە تەواو وەک ئەو قۆناغەیە کە ئیسرائیلیەکان تیایدا تیرۆرستێک دەگرن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەن. ڕەنگبێ لە سەرەتادا بازۆفت باوەڕی کردبێ کە ئەوەی بەسەردا دێ

هەمو شتێکی ڕەتکردبێتەوە. ئەوەش هەستێکی بەرزەفت و کوشندەی لادروستدەبێ، ئەو پێشتریش ئەو هەستەی لا هەبوو. لەو قۆناخەدا ڕۆژنامەنوسەکە بێدەستەڵات کاردانەوەی لە دوسەرە تێناپەڕێ: تۆقینێکی پەککخەرانە و خۆنەگرتن بۆ قسە درکاندن. ئیدی کاتی هاتووە کە ددان بەودا بنێ پیاوی مۆساد بووە وکاسێتەکەش تۆماربکرێ.

یەکدەنگی ژێکانی دەنگی ئەو گریمانەیان دەسەلماند کە ئەو لەزیندان‌دا هێرشی شەپۆلی خەمۆکی بۆهاتووە، ئەوەش بڕوابەخۆبوونی لا نەهێشتووە، لەوەشدا دەوروبەری شێواوی ژیانی ئاساییانەی گرتوخانەکە هاوکاری بووە. ئەو ڕەنگبێ هەمیشە هەراسان و ماندو بووبێ، ئەو پیچە خەوەش کە ڕێگەیان پێداوە بایی ئەوەی نەکردووە بێتەوە سەرخۆی. لەو کاتەدا خۆی خۆی بە تاوانبار زانیوە و تەواو هیوابڕ بووە، ئەوەش بێگومان تانزمترین ئاست شۆڕبۆتەوە. ئەو خۆبەتاوانبارزانینە بەسەریدا زاڵبووە. ئەوەش هەروەک زیندانییەکەی کتێبەکەی کافکا Kafka پێواژۆ Proces بێگومان ڕەخنەی لەخۆگرتووە کە چۆن گەوجانە خۆی خستۆتە داوێکی دژوار.

کاتێک سەیری کاسێتی ڤیدۆکە بکەی، لە چاوی بازۆفت ئەوە دەخوێنیتەوە کە لە ژێر کاریگەری مادده بێهۆشکەرەکان دابێ. دەرمانناسەکانی مۆساد ئەستەم بوو بزانن ئاخۆ چ جۆرە دەرمانێکیان داوەتێ.

ناحوم ئادمونی دەیزانی کە واتای بێزاری دەگەیەنێ کاتێ ئەو ددانپێدانانەی بازۆفت ببێتە مایەی سەرخواردنی. بەڕێوبەری گشتیی مۆساد فەرمانیدایە پسپۆڕانی شەڕی دەرونناسی، کە دەست بە کامپینێک بکەن بۆ ئەوەی پرسەکانی دەستتێکەڵی مۆساد لە بابەتەکە بکەنە دژە هێرش.

لە شانشینی یەکگرتو پەرلەمانتارەکان بەڕاشکاوانە ڕەخنەیان لە The Observerگرت، چونکە ڕۆژنامەکە بازۆفتی ناردۆتە عێراق. لەو نێوەدا ڕۆژنامەنوسە باوەڕپێکراوەکان چیرۆکی وایان پێگەیشت، کە سەرۆکی عێراق سەددام حوسێن خۆی پابەند بووە بەو پرسەو لەبەر کاسێتی ڤیدیۆی

تەواوی قۆناخەکانی لیکۆڵینەوەکەدا دانیشتوە و چێژی لێوەرگرتووە. ئەوە هەق نییە کە بەڕاستی دانەنرێ، بەڵام هەر چۆنێک بێ مایەی لێبوردنە کە بەیادی جیهان بهێنرێتەوە کەوا ئازاردان و کوشتن ئامرازی حکومەتن. لە ئازاری 1990دا بازۆفت لە بەغدا لە قەنارە درا. دوا پەیڤی پێش گیان دەرچوونی: ' ئەز سیخوڕی ئیسڕائیل نیم' بوو .

لە لەندەن نیکۆلاس داڤیس هەواڵی ڕۆیتەری لەسەر لە سێدارەدانی بازۆفت لەسەر مێزی نوسینگەی سەرنوسەری هەندەرانی Daily Mirror ی خوێندەوە .هەروەک جاران کە هەواڵێکی نوێ گرنگ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بێ، یەکسەر بەرەو نوسینگەی ڕۆبەرت ماکسویل ڕۆیشت.

لە 1974ەوە ئەو بڵاوکەرەوە دەستڕۆیشتوترین سایان بوو لە شانشینی یەکگرتودا. داڤیس بەبیر خۆی هێنایەوە: ' بۆب هەواڵەکەی بی هیچ کۆمێنتارێک خوێندەوە'. بەڵام بەخۆشی هیچی لەبیر نەماوە کە لەسەر هەواڵی لە سێدارەدانی بازۆفت چیان لەگەڵ یەکدا گوت.

لەنێو ئەوانەی لە ئیسڕائیل هەواڵەکەیان پێگەیشت، یەکێک کە پێشتر سەروسەودای لەگەڵ سەرانی دەزگا سیخوڕییەکان هەبوو، کەسێک بەناوی ئاری بنمێناشە Ari Ben-Menashe بوو. تا ئەوکات ئەو هیچی لەبارەی بازۆفتەوە نەدەزانی. ئەوە ڕێگەی لەوە نەگرت کە بنمێناشای بزۆز خەم لەوە بخوا کە ' جارێکی دیکە پیاویکی چاک لە شوێنێکی هەڵە و لەکاتێکی هەڵەدا بەکار بهێنرێ'. ئەو حوکمە سۆزداریانە وا لەو پیاوە قۆزە پرچڕەشە دەکەن ببێتە کلیلی چارەسەر لەنێو دەزگا زانیارییەکان. ئەو دە ساڵی ڕەبەق لە 1977تا 1987 پایەکی گرنگی لە خزمەتی پەیوەندییەکانی دەرەوەدا External relation department (ERD)ی وەزارەتی بەرگری ئیسڕائیلدا هەبوو. یەکێک لە ڕێکخراوە دەسەڵاتدارو نهێنییەکانی خزمەتی نهێنی وڵات بوو.

ERDلە 1974دا لە لایەن سەرۆک وەزیرانی ئەوکات، ئیسحاق ڕابینەوە دامەزرێندرا. مایەی سەرسوڕمانی و ترسناکی شێوازی هێرشی سورییەکان

لە سەرەتای شەڕی یۆم کیپەر، کارێکی وایکرد بگاتە ئەو دەرەنجامە کە تەنها یەک شێواز هەیە بۆ ڕێگرتن لە کەوتنی دەزگاکانی زانیاری، ئەویش دامەزراندنی دەزگایەک بوو کە چاودێری هەموو دەزگاکانی زانیاری بکات و لەهەمان کاتیشدا سەربەخۆش زانیاری کۆ بکاتەوە.

لەژێر چەتریERD دا چوار هۆبە ڕێکخران. هەرە لەپێشەوەیان SIM بوو، کاری ئەو ' کۆمەکێکی تایبەتمەندانە ' بوو بۆ لەبرەودابوونی 'بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان' لە ئێران و عێراق، بە پلەی کەمتریش لە سوریا و عەرەبستانی سعودی. هۆبەی دوهەم RESH بەرپرسیاربوو لە پەیوەندیگرتن لەگەڵ دەزگا زانیارییە دۆستەکان؛ لەنێویاندا نوسینگەی خواروی ئافریقای ئاسایشپارێزی وڵات گرنگترینیان بوو. مۆسادیش یەکەیەکی لەو جۆەری بەناوی TEVEL بۆ پەیوەندی ڕاگرتن لەگەڵ دەزگا زانیارییەکانی باشوری ئافریقادا هەبوو. زۆر جاران هەر دو دەزگاکە بەهۆی هاوبابەتیان لەگەڵ یەک گرژ دەبوون.

هۆبەی سێهەمی ERD پەیوەندییەکانی دەرەوەی لە ئەستۆ بوو، کاری لەسەر پاشکۆ سەربازییەکانی دەرەوەی وڵات و کەسانی سەربازی هەندەران دەکرد. هەروەها ئەو هۆبەیە ڕەفتارەکانی کردن و نەکردنی پاشکۆ سەربازییەکانی دەرەوەی وڵاتی خستبوە ژێر چاودێرییەوە. ئەوەش بووە مایەی تێکهەڵچون لەگەڵ شین بیت Shin Bet، چونکە ئەو تایبەتمەند بوو بە ناواخنی کارەکە . چوارەمین هۆبەی ERD بە دوانزە زانیاریی ناسراو بوو. ئەو یەکەیان تەرخان بوو کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆساددا ڕابگرێ، بەڵام یەکەکە پەیوەندی لەگەڵ بەزرترین نهۆمی باڵەخانەی شەقامی شا ساول King Saul Boulevard ئاڵۆزتر کرد. لە مێشکی سەرانی مۆساد بیرۆکەیەک زاڵبوو، کەوا ERD مەترسیە بەسەر دەسەڵاتەکەیان.

بن‌مێناشە پەیوەست بوو بە RESH و بەرپرسیار بوو لە دۆسیەی ئێران. ئەو لەسەردەمێکدا دەستبەکار بوو کە ئیسرائیل لەسەر خاڵی وەرچەرخانی لەدەستدانی هاوپەیمانە دەسەڵاتدارەکەی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

زیاتر لەچارەکە سەدەیک بوو شای ئێران زۆر بە توندی لە پشت پەردەوە خەریکی ئەوە بوو وا لە ولاّتە عەرەبییەکان بکات کۆتایی باری دوژمنکاری لەگەڵ ئیسرائیل پێبهێنن. ئەو هێشتا هەرخەریک بوو لەو بارەیەوە پەرەسەندن بەدەستبهێنێ بە تایبەتیش لای شا حوسێنی پاشای ئوردن، کە ئەوەندەی نەبرد شای ئێران لە ڕێگەی شۆڕشی خومەینی فێندەمەنتالیزمی ئیسلامی لە شوباتی 1979دا لەسەر تەخت لادرا. یەکەمین شت کە خومەینی کردی تەلاری باڵویزخانەی ئیسرائیلی لەتاراندا دایە PLO ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی. ئیدی ئیسرائیلیش خێرا بەخۆکەوت تا یارمەتی کوردەکان بدا لە شەڕی پارتیزانیان دژی ڕژێمە تازەکە، بەڵام ئەوەش ڕێگای لەوە نەگرت ئیسرائیل بەچەک یارمەتی تاران بدا دژی شەڕی عێراق. لێگەڕێ ' باخۆیان یەکدی لەناو ببەن' سیاسەتێک بوو داڤید کیمخ و سەرانی دیکەی مۆساد لایەنگری بوون و پیادەش دەکرا.

هەرزو بنمێناشە بە کیمخ پەیوەستبوو بۆ بارکردنی کەشتییەکان بە چەک و ڕەوانەکردنیان بۆ ئێران، لەبەرامبەر بەردانی بارمتەکانی لوبنان. هەردو پیاوەکە چوونە واشنتن، بنمێناشە بە گوتەی خۆی چۆتە کۆشکی سپی لە ڕێڕەوە بەرینەکەی کۆشکی سپی لەگەڵ سەرۆک ڕێگایان تەیدەکرد و لەگەڵ کارمەندە نزیکەکانی بەناوی یەکەمی خۆیان یەکدیان دەدواند .

بە پۆشاکە کەشخە و ناقۆزیەکەی خۆی بنمێناشە میوانی خۆشەویستی ئاهەنگی دەزگا زانیارییەکانی ئیسرائیل بوو، کە دەرفەتێک بوو بۆ سیاسەتمەدارە گەورەکان لەگەڵ سەرانی دەزگا سیخوڕیەکان بیروڕا ئاڵوگۆڕ بکەن تابگەنە قازانجی دوسەرە. کەم وابوو بتوانن وەک بنمێناشە چیرۆکی وا بهۆننەوە. لەسەروبەندی ئەوکاتەی، کیمخ خەریکی دەستپێکردنی گواستنەوەکاری ناوەڕۆکی ئۆپەراسیۆنەکە بوو، بنمێناشە بووە ڕاوێژکاری تایبەتی ئیسحاق شامێری سەرۆک وەزیران بۆ کاروباری هەواڵگریی، ئەوەش پاش ئەوەی بە سەرۆک وەزیرانی گوت کە دەزانێ هەموو ئەو تەرمانە لە کوێ شاردراونەتەوە. کیمخ هاتە سەر ئەو ڕایە کە بنمێناشە ئەو کەسە

نمونەیەیە کار لەگەڵ ئەفسەری دەزگای زانیاریی ڕافی ئیتاندا بکا کە لەخۆی زیاتر پێیەوە کارانگازە. سەرەک وەزیران تەواو ڕێگەی دایە و لە کارەکانی دیکەی مۆڵەت پێدا تاکو تەواو بۆ کارکردن لەگەڵ ئیتان تەرخان بێ. هەردو پیاوەکە لە ئازاری 1981 بۆ نیۆیۆرک گواستیانەوە. ئەوان هەروەک بن‌مێناشە بەبیر خۆی هێنایەوە ئامانجێکی ڕونیان هەبوو: 'دۆستەکانمان لە تاران دەست لەئەژنۆ و شەرمن ماونەتەوە بەرامبەر وردەکاری دەزگا ئەلکترۆنییەکانی هێزی ئاسمانی و بەرگری زەمینیان و دژەئاسمانیان. قسەی لەسەر نییە ئیسرائیل ئامادەیە لەشەڕەکەیان دژی عێراق یارمەتیان بدا'.

بە بەکارهێنانی پاسپۆرتە بەریتانییەکەیان کە باشترین بەڵگەنامەیە بۆ ئیسرائیل، لەناو جەرگەی ئابوری شاری نێۆیۆرکدا فیرمایەکیان(کۆمپانیا) دامەزراند. بە چەند جارێکی کەم کۆمەڵەیەکی نزیکەی پەنجا کەسیان خستە گەڕ تاکو بەدوای کەرەسەی ئەلکترۆنی پیشەسازی ئامریکیدا بگەڕێن، تاکو کەلوپەلی مەبەستدار دەدۆزنەوە. هەمو بارێکیش بڕوانامەیەکی لەگەڵدا بوو، لەسەری نوسرابوو دوا مەنزڵی کەرەستەکان ئیسرائیل دەبێ هەر لەوێش بەکار دێ. بن مێناشە گوتەنی ' ئێمە بڕوانامەیەکی زۆرمان کۆکردەوە و ڕەوانەی ئیسرائیلمان کردن ئەرشیف بکرێن، تاکو گەر هاتو یەکێک زەحمەتی کێشا تەماشایان بکا'.

سەرەتا ئامێرەکان بۆ تەلئەبیب باردەکران، بەڵام هەر لە فڕۆکەخانە پێش ئەوەی گومرگ بەسەری ڕابگا، هەمویان لە ئێرلەندا لە فڕۆکەیەکی بارهەڵگری بەکرێگیراوی Guinness Peat باردەکرانەوە و ڕەوانەی تاران دەکران. Guinniss Peat ئەو کۆمپانیا زەبەللاحە بوو کە بۆ ئەو کارە دەشیا. هەروەها بیرۆکەی بەکارهێنانی فڕۆکەوانە ئیرلەندییەکان هی ڕافی ئیتان بوو. ئەو هەمیشە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیرلەندییەکان ڕادەگرت. ئەو دەیگوت " گەر هاتو لەگەڵ ئیرلەندییەکان کارتکرد، دەزانی کەوا ئەوان ڕێساکان دەزانن. تاقە ڕێساش کە بخوات ئەوەیە دەبێ هەمان ڕۆژ دەقاودەق پارەکە بژمێری".

کاتێک ئاستی چالاکییەکان لە نیۆیۆرک بەرزبووەوە، پێویستی بە کۆمپانیایەکی حیسابڕاگرتن هەبوو کە لەو ڕێگەیەوە بەملیاران دۆلار لە کڕین و فرۆشتنی ئەو ئامێرە ئەلەکترۆنیانە دەست دەکەوت. ناوی ORA – بەعبری واتای چرا دەدا- بۆ کۆمپانیایەکە هەڵبژێردرا.

لە 1983دا بنمێناشە لە ڕافی ئیتانەوە پێیڕاگەیەندرا کە نیکۆلاس داڤیس بهێنێتە ڕیزیORA . پیاوە پیرە سالارەکەی سیخوڕێتی لە ڕێی مۆسادەوە بێگومان تێبینی لەسەر داڤیس پەیدا کرد، دەزگاش لە ڕیی بازۆفتەوە کە ڕۆژنامەنوسێکی ئازاد بوو وتاری بۆ بەشی دەرەوەی وڵاتیMirror ی دەنوسی، دەربارەی داڤیس شتی بیست. درەنگانێکی هەمان مانگ بنمێناشە و داڤیس لەهۆڵی میوانخانەی چەرچل ی لەندەنی یەکدیان دیت. لەوکاتەی کە لەیەک جیابوونەوە بنمێناشە زانی کە داڤیس' پیاوی ئێمەیە'. ڕۆژی دواتر بەیەکەوە بەرکوڵی بەیانیان لە ماڵی داڤیس کرد. لەوکاتەدا جانێت هاوسەری داڤیسیش لەوێ بوو. بنمێناشە هەر زو بۆی دەرکەوت کە داڤیس دەترسا هاوسەرەکەی لەدەستبدا. ئەوەشی بەدڵ بوو، چونکە' خاڵی لاوازیەتی'.

ڕۆڵی داڤیس لەنێوORA دا لە یەکدیدیتنەکەیان لە میوانخانەی Dan Acadiaی لێواری سەر ئاوی باکوری تەلئەبیب دیاریکرا. بنمێناشە گوتی: ئێمە ڕێککەوتین کە ئەو کەناڵی ئێمە دەبێ لە لەندەن بۆ چەک، پیاوی پەیوەستی ئێمە دەبێ بۆ هەر پەیوەندییەکی چەک گواستنەوە بۆ ئێران و وڵاتانی دیکە. لەسەر پۆست ئەدرەسی ORA دا ناونیشانی ماڵی ئەو دەنوسرێ و بە ڕۆژیش ڕاستەوخۆ ژمارە تەلەفونەکەی-822 – 3530 – لەلایەن پەیوەندییەکانی ئێرانمانە بەکاردەهێندرێ .

لەبەرامبەردا داڤیس عمولەی کردەی گواستنەوەکە وەردەگرێ و ئەرکە نوێیەکەی دەبێتە چەقی بازنەی ئۆپەراسیۆنەکە: چەک بە گۆڕینەوەی بارمتەکان. هەموی بەسەر یەکەوە یەک ملیۆن و نیو دۆلاری لە ڕێی بانکەکانی دورگەکانی کایمان Kaaiman، لە بەلژیک و لوکسمبورگ وەرگرت. بەشێکی پارەکەی دایە گرێبەستی لە یەکجیابوونەوەکەی لەگەڵ

ژنەکەی. جانێت یەکجار پارەی پەنجا هەزار دۆلاری وەرگرت. داڤیس هەمو قەرزەکانی دانەوە و خانویێکی چوار نهۆمی پێکڕی. خانووەکە بووە بارەگای سەرەکی ئاوڕوپی ORA و ژمارە تەلەفونەکەشی -231.0015 – بۆ دەرفەتی دوهەمی پێڕاگەیشتنی بازرگانانی چەک بوو. ئەو بازرگانانە بەشێکی چەسپاو بوون لە ژیانی داڤیسدا. بەهۆی ئەندامێتیەکەی لە دەستەی نوسەرانی دەرەوەی وڵات داڤیس سەردانی ئامریکا، ئاوڕوپا، ئێران و عێراقی کرد .

لە 1987دا ئایەتوڵلا عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی تیلێکسێکی لە ORAەوە سەبارەت بە فرۆشتنی چوارهەزار ڕۆکێتی تاو TOW لەبەرامبەر نرخێکی هەرزانی سیانزەهەزارو هەشتسەد دۆلار بۆهەر ڕۆکێتێک پێگەیشت. لەسەر پەیامەکە نوسرابوو' نیکۆلاس داڤیس نوێنەر زامنکاری ORA یە' .

ئەوە هەر تەنها دەرفەتی کەمپینێک نەبوو بۆ بنمێناشە و نیکۆلاس داڤیس، بەڵکو بۆ بیچمێکی دەستڕۆیشتوی لە دورڕا دیاری پشت پەردەی پێشهاتە پەرەسەندووەکان: ڕۆبەرت ماکسویل .Robert Maxwel هیچ کەسێک بۆ ساتێکیش بێ ئەو ڕاستیە ڕەقییەی داڤیسی بەهەند هەڵنەگرت کە بەخۆشیەوە دەیگوت" بێهۆ نییە کە ڕۆژ لەکەل هەڵدێ".

# 9

## بەرتیل و سێکس و درۆ

{ بن‌مێناشـــــه لەلەنـــــدەن.. ماکســــوێل زەبـــــەللاحی ڕۆژنامەگــەری‌و ســیخوڕێتی.. ســێکس ئــەمما ســێکس.. ڕۆژنامـــەکانی بـــەریتانیا.. CIAو KGB وگۆرباتشـــۆف.. نـاوبژیکردن بـه هەشـت ملیـۆن دۆلار.. مۆردەخـای ڤـانونو هەڵدەگەڕێتــەوە و بڤەیــە..دادگــاییکردن.. ژن‌و تــەفرەدان‌و سیخوڕێتیی..}

بارودۆخی بەیانیەکەی کۆتایی مارتی 1985 کاتێک بن‌مێناشە زو لەڕێی هێڵی ئاسمانی بەریتانییەوە بەرەو لەندەن فڕی، شتیکی دیکە بوو. لەوکاتەی خەریکی بەرکوڵی بەیانی بوو لە نێو فڕۆکەکەدا، بیری لەوەکردەوە کە ژیان هەرگیز ئەوەندە باش بەڕێوە نەچووە. ئەو نەوەک تەنها بڕە پارەیەکی زۆری دەستکەوت، بەڵکو زۆریش شت لە داڤید کیمخ لەسەروکاری بەیەکەوەیان، لە تەیکردنی ئەم سەرو ئەوسەری دنیادا بۆ چەک ڕەوانەکردن بۆ ئێران فێرببوو. سەرباری ئەوەش لە گەمەی هێزی نێوانی سیاسەتمەداران و سەرانی دەزگا زانیارییەکان زۆر شارەزا بوو.

بەگوێرەی بن‌مێناشە ' بازرگانێکی چەکی مام ناوەند بەبەراورد لەگەڵ هاوکارە پێشوەکانم وەک لاوێکی بەردەستی قەشە وایە'. ئەو گرفتەکەی سەلماند: لە شوێنەواری سەرکێشییەکەی لەشکری ئیسرائیل لە لوبناندا، کە لەدوایدا کشایەوە و بەزیان و بێ ورەییەوە مایەوە. لە بەلەزبوونیان تاکو دەرهاوێشتەی باش ببینن، سیاسەتمەدارەکان دەستی دەزگا زانیارییەکانیان والاکرد، تا بەشێوازە بێبەزەییانەی خۆیان شەڕی دژی PLO بکەن. لەچاوی ئەوان PLO بناوانی هەمو کێشەکانی ئیسرائیل بوو. دەرهاوێشتەکەی زنجیرە شەرمەزارییەک بوو کە تیایدا تیرۆرستە گومانلێکراوەکان تەنانەت

خاو و خێزانیشیان بەشێوەیەكی دڕندانە و بە خوێنساردی كوژران . ئیسحاق هۆفی سەرۆكی پێشوی مۆساد جێی لە كۆمیتەیەك – لەژێر گوشاری جەماوەر حكومەت دایمەزراندبوو– گرت، تاكو لەوكردەوە دڕندانانە بكۆڵنەوە. كۆمیتەكە گەیشتە دەرەنجامێك كە دەزگا زانیارییەكان درۆیان بەدەستەی دادوەری فرۆشتووە لەكاتی ناچاركردنی دركاندنەكان. زۆر جاران شێوازە پەیڕەوكراوەكان زۆر قێزەون بوون. كۆمیتەكە ڕێنمایی دەركرد كە لە مەودوا دەبێ بەگوێرەی 'ڕێكاری گونجاو' هەڵسوكەوت بكەن .

بن‌مێناشە ئەو ڕاستیەی زانی كە ئازاردان بەردوام بوو: ' ئەوەش باشە كە ڕێگایەك لەنێو ئەو دڕندایەتییەدا هەیە. ئەوەی خودی خۆی دەیكرد چەك دانە ئێران بوو تاكو بێژمار عێراقییەكانی پێ بكوژێ، كە بەگوێرەی ئەو، ئەم كارە شتێكی دیكە بوو. هەروەها ئەو خەمی ژانی بارمتەكانی بەیروتی نەدەخوارد هەرچەندە ئەوانیش ببوونە هۆی بازرگانییەكەی. تاقە شتێك كە لای ئەو دەیخوارد پەیداكردنی پارەبوو. تەنانەت دوای ڕۆیشتنی كیمخیش، بن‌مێانشە بڕوای وابوو كە ئاشەكە ئەو كاتە دەبێ بوەستێ، كاتێ بڕیار بدا، نیازیشی نەبوو جارێ بڕیار بدا تاكو پێی نەبێتە مولتی ملیۆنێر. بەپێی قەبلاندنەكەی دەستكەوتی ORA دەبوایە بگاتە سەدان ملیۆن دۆلار، بەشی زۆریشی لەو خانووەی نیكۆلاس داڤیسەوە دەهات كەلە بەشی پێشەوەی لەندەن بارەگای سەرەكی ئۆپەراسیۆنەكانی ORA ڕێكخستبوو.

بن‌مێناشە دەیزانی كە داڤیس بەردەوامە لە پارەكۆكردنەوە، چونكە ئەوەی لەORA ی دەستدەكەوێ زۆر لە موچەی ساڵانەی وەك دەستەی نوسەرانی دەرەوەی وڵاتی Mirror كە 65000 پاوەندە زیاترە. ئەوەی مانگێك لە ORAی دەستدەكەوێ بەقەدەر ساڵێكی موچەی ڕۆژنامەنوسییەكەیەتی. بن‌مێناشە گلەیی لەوە نەبوو كە ڕۆژنامەنووس 'پارچەیەكی زیادەی كێكەكە ببا، چونكە هێشتا زۆری دیكەی لێماوە'. هێشتا و هەمیشە كاتی شامپانیاو كاڤیارە.

هەمان خواردنەوە ڕۆبەرت ماکسوێل کەلە نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەی Mirrorبوو، بۆ میوانەکانی تێدەکرد. کاتێک فڕۆکەی هێڵی ئاسمانی بەریتانی نیشتەوە، لیمۆسینەکەی ماکسوێل بە شوفێرەوە بۆ بنمێناشە ئامادە بوو، ئەوەش واتای بایەخپێدانی ماکسوێڵی دەوڵەمەند بوو بە میوانەکەی. لەنێو لیمۆسینەکەدا ناحوم ئادمونی بەڕێوبەری گشتیی مۆسادیشی تێدا بوو کە بەر لەیەک سعات بە گەشتی ئەلعال گەیشتبوو. بنمێناشە پلانی وابو ئەو کاتە چاوەڕوانییەی لە هیترۆHeathroدا بۆ تاوتوێکردنی زانیاری لەسەر بەڕێوبەری ڕۆژنامە بەناوناگەکە کە مۆساد کردبوویە سایانمێکی گرنگ تەرخانبکا.

ماکسوێل لە ساڵی 1984دا لە کۆتایی کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ شیمون پێرێز لە ئۆرشەلیم، خزمەتەکانی خۆی پێشکەشکرد، ئەوەش کەمێک دوای پێکهێنانی حکومەتێکی ئیئتیلافی بوو. یەکێ لەکارمەندە نزیکەکانی پیرێس دانیشتی هەردولای بەبیرهاتەوە کەوەک ' مەزنە پیاوێک بوو'. پێرێس ڕەفتاری مەزنە دەسەڵاتدارێکی دەکرد، هەرچی ماکسوێلیش بوو ئەو تێبینییەی دا کە ' ئەز ئامادەم بەملیۆنان پارە بڕژێنمە ئیسرائیل" هەروەها " ئەز هەمو ئابوری نوێی وڵات دەژێینمەوە". ئەوەش لەوە دەچوو کە سیاسەتمەدار لە ڕەوشی هەڵبژاردندا بێ. ئەوسەنگین خۆی نیشاندەدا، قسەی بە بەرامبەر دەبڕی، ناوبەناو نوکتەی قۆڕی دەکردن. پێرس دانیشتبوو وای نیشاندەدا کە پێدەکەنێ.

پێرس هەستی کرد کە ماکسوێل بەتێپەڕینی ڕۆژگار پەیوەندی گرنگی لە ڕۆژهەڵاتی ئاوڕوپادا پەیداکردون، دیدارێکی لە نێوان ئادمۆنی و ماکسوێل لە سویتە سەرۆکایەتییەکەی میوانخانەی شا داود لە ئۆرشەلیم، کە ماکسوێل ئەوێی پێخۆش بوو، ڕێکخست. ئادمۆنی و ماکسوێل هەردوکیان پاشخانی ناوەڕاستی ئاوڕوپایان هەبوو: ماکسوێل بەخۆی لە چیکسلۆفاکیا لەدایکببوو( لە ڕاستیدا هەر ئەوەش بووە مایەی پێشبینیکردنی پێرس ' بەلای منەوە ئەوتاقە چیکییێکە کە زۆرباش لەگەڵ پارەدا هەڵدەکا' ) هەردو پیاوەکەش

زایۆنیستی پڕجۆش بوون، بڕوایان وابوو، کە خوا مافی داوەتە ئیسرائیل بمێنێتەوە. هەردولاشیان حەزیان لە خواردنی خۆش خۆش و نۆشکردنی مەی گرانبەها بوو .

ئادمۆنی بەبایەخەوە لە بڕوای ماکسوێلی دەڕوانی کە پێیوابوو چ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و چ یەکێتیی شۆرەوی بە پەرۆشن دەسەڵاتداریەتی جیهان بگرنە دەست، بەڵام بە ڕێگای تەواو لەیەکجیاواز. یەکێتیی شۆرەوی دەیەوێ کەڵک لە پاشاگەردانی (ئانارشی) نێودەوڵەتی بۆ ستراتیژی خۆی وەربگرێ، هەرچەندە واشنتنیش جیهانی دابەشکردۆتە سەر ' دۆست و دوژمن'، لە جیاتی ئەوەی هەمو نەتەوەکان بەرژەوەندی دژبەرایەتی ئایدیۆلۆژیان هەیە. ماکسوێل هێشتا هەندێ ڕوانینی دیکەشی هەڵدەڕشت: پەیوەندییە نهێنییەکانی CIA لەگەڵ هاوتا دژبەرە چینییەکان کێشمەکێشمی لە وەزارەتی دەرەوە لەسەر ئەوە دروستکردووە، کە ڕەنگبێ لە داهاتودا کێشە بۆ چالاکییە دیپلۆماتی و مەبەستە سیاسییەکان دروستبکا.

بەڕێوبەری ڕۆژنامەکە ڕوانینی کەسیی خۆی لەسەر دوو کەس کە بۆ ئادمۆنی بایەخێکی زۆریان هەیە ڕونکردەوە. لەیەکێ لە چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ ڕۆنالد ڕێگاندا کە ماکسوێل باسیدەکرد، هەستیکرد سەرۆک گەشبینێکی یەکڕەنگە و کاریزماکەی وابەکاردێنی کە نمایشی سیاسەتمەدارێکی بێبەزەیی پێبکا. کەموکورتی سەرۆکایەتیی ڕێگان لەوەدایە کە شتەکان بەتایبەتیش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاسانانە دەبینێ. بیرۆکەی دوهەم یاخود سێهەمیشی بەئاستەم باشترە لەوەی یەکەم.

ماکسوێل دیداریشی لەگەڵ ویلیەم کێیسی William Casey دا هەبووە. ڕای وابوو کە بەڕێوبەری گشتیی CIA پیاوێکە بیرمەندییەکەی کورتهێنە، ئەو بەهیچ شێوەیەک دۆستی ئیسرائیل نییە. کێیسی ڕابەڕایەتی دەزگایەکی نهێنی دەکرد خۆی گوتەنی 'هیچ شتێک مەحاڵ نییە' بوو، لەپشت ئەو دەنگانە بوو کە کاری دەزگای زانیاریی لەسەر گۆڕەپانی نوێی سیاسیدا ڕۆڵی هەبێ.

ئەوەش هەرگیز ڕوننەبوو، بەگوێرەی ماکسوێل بەتایبەتیش لەسەر پانتایی ئامانجی عەرەبەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا .

ئەوانە ئەو ڕستە ئاماژەدارانە بوون کە دەقاودەق لەگەڵ ئەوانەی ئادمۆنی یەکیاندەگرتەوە. دوای دیدارەکەیان بە ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی ئادمۆنی بەرەو بارەگای سەرەکی مۆساد هاژۆتیان، لەوێ ئادمۆنی میوانەکەی لە هۆبە جۆربەجۆرەکان گێڕا.

هەنوکە ساڵێک دواتر لە 15ی ئازاری 1985دا جارێکی دیکە یەکدیان دیتەوە. هەرکە ئادمۆنی و بنمێناشە گەیشتنە نوسینگەی ماکسوێل لە باڵەخانەی Mirror لە لەندەن کەرتی High Holborn، گوێیان لەخانەخوێکەیان بوو کە میوانێکی دیکە ئامادەیە کێک و قاوەیان لەگەڵدا بخواتەوە .

هەروەک جادوگەرێک کەروێشکێک لە ناو شەپقەکەکەی دەربهێنێ، ماکسوێل ڤیکتۆر چیبریکۆڤ Victor Tsjebrikov ی یاردیدەرەی بەڕێوبەری KGB یەکێک لە سەرە دەسەلاتدارەکانی دنیای سیخوڕێتی لە جیهان پێناساندن. دواتر بنمێناشە بەهەستێکی ئوستادانە ددانیپێدانا کە ' ڕەنگبێ ناکۆکبێ کەوا لەگەڵ سەرێکی KGB لە نوسینگەیەکی ڕۆژنامەیەکی لەندەنی ڕوبەڕو ببیەوە، بەڵام لەو ڕۆژگارەدا سەرۆک میخائیل گۆرباتشۆف باشی لەگەڵ سەرەک وەزیران مارگرێت تاتچەردا هەڵدەکرد. لەبەر ئەوە نامۆ نەبوو گەر چیبریکۆڤ لە لەندەن ببینی'.

جێی گومانە گەر بناغەدانەری تاتچەریسم و بنەما سەربەستییەکانی ئەجێندای گفتوگۆکانی بە لاییدە نەزانیبێ. بنمێناشە و ئادمۆنی ڕکێفی گفتوگۆکانیان لە نوسینگەی ماکسوێل و لەسەر کورسییە چەرمەکان گرتە دەست. ئەوان دەیانەویست بزانن ئاخۆ دەکرێ لە ڕێی بانکەکانی یەکێتیی شۆرەوییەوە پارە ڕەوانەبکرێتەوە، چیبرکۆف متمانەی ئەوەی دا بڕە پارەکە بگەیەنرێ. پارەکەش لەسودی ORA لەو سەودایەی چەکفرۆشتنی ئامریکا

بەئێران بەدەستهاتووە. چیبەرکۆفیش دەیویست بزانی ئاخۆ بڕی پارەکە چەندە.

بن‌مێناشە لەبەرسڤدا گوتی: ' چوارسەد و پەنجا ملیۆن دۆلاری ئامریکاییە، بەڵام بێگومان ئەوەندەی دیکەشی دێتە سەر. ڕەنگبێ هەموی ملیارێک یان زیاتر بێ'.

چیبەرکۆف ئاوڕێکی لە ماکسوێل دایەوە، تاکو بزانێ کە بەتەواوی گوێی لێبووە. ماکسوێلیش بە ورە بەرزییەکەوە' ئەوە تازە پرۆستریۆکایە' .

بۆ بن‌مێناشە گواستنەوەی پارەکە زیاتر داهات رژان بوو بۆی. هیچ ئەڵقەیەکی ناوبژی سەودایەکە بێ عمولە نابێ. ئەو دوکەسانەش ماکسوێل بەهۆی پەیوەندییە بەربڵاوەکانی و چیبەرکۆفیش وەک دەسەڵاتدارێکی وڵاتەکە متمانەدارتر بوو تاکو پارەکە بەبێ دەستلێدان بگا. لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە چوارسەد و پەنجا ملیۆنی یەکەم لە ڕێگەی Credit Suisse ەوە بۆ بانکی بۆدابست لە هەنگاریا بنێردرێ. بانکی ناوبراویش پارەکە دەنێرێتە بانکەکانی دیکە لە یەکێتیی شۆرەوی .

ڕۆبەرت ماکسوێل بەیەکجار داوای هەشت ملیۆن دۆلار بۆ ناوبژیکردنەکەی کرد .ئەوەش بە تۆقەکردنێک بۆی سەلمێنرا. ماکسوێل بەخۆشی پاشەڕۆژی ڕوسیا پێکی شەمپانیای لەگەڵ میوانەکاندا هەڵدا. دواتر بە کۆپتەرە تایبەتییەکەی خۆی گەیاندنیەوە فرۆکەخانەی هیترۆ تا لەوێوە بۆ وڵاتەکانیان بفڕن.

بێجگە لە نیکۆلاس داڤیس هیچ ڕۆژنامەنوسێکی دیکە کە لە باڵەخانەی Mirrorبوون، هەستیان بەو هەواڵە مەزنە نەکرد. پاشتر بەڵام درەنگ نا، ئەوباسە کەوتە نێو ناوان، ئەوسا ماکسوێل ناپاکیی لە پیشەی ڕۆژنامەگەرییتی کرد تاکو هەوڵی پاراستنی ئیسرائیل بدا .

هەر لەسەرەتای پەیوەندییەکانی ماکسوێل بە مۆسادەوە، ئەوە ڕونبووەوە کە ماکسوێل لەوە بەهادارترە کە بەکاری زانیاریی کۆکردنەوەی ڕۆژانەوە خەریک بکرێ. یەکێک لە ئەندامە کاراکانی دەزگای زانیاریی ئیسرائیل

سەبارەت بەماکسوێل گوتی" ماکسوێل مستەر فیکسیت Mr.Fixit ی مۆساد بوو لە ئاستێکی بەرزدا. ناوی ئەو دەروی زۆری لەسەر ئاستی بالادا لێدەکردینەوە. هێزی رۆژنامەکانی ببوونە مایەی متمانەدار کە سەرۆک دەوڵەت و سەرەک وەزیرەکان ئامادە بوون پیشوازی لێبکەن. لەسۆنگەی ئەو سیاسەتەشەوە ئەوان وەک دەوڵەتمەدار هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد، بێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێ کە ئەو زانیاریانەی لێیانوەردەگرێ لە کوێ دەنیشێتەوە. زۆر لەو شتانەی گوێیلێدەبوون، هەر قسەی ڕوت بوون، بەڵام لەنێویاندا پارچە ئاڵتونی زانیارییش هەبوون. ماکسوێل لەهونەری چۆنیەتی پرسکردن گەیشتبوو. ئەوەش نەوەک لە ئێمەوە فێربووبێ، بەڵام بێگومان سەرەداویشی لە ئێمە وەرگرتبوو کەئاراستەی گفتوگۆکانی دەستنیشان بکا".

لە 14ی سێپتێمبەری 1986دا ڕۆبەرت ماکسوێل ڕاستەوخۆ بەهێڵە پەیوەندییەکەی نێوانیان زەنگی بۆ ناحوم ئادمۆنی لێدا تاکو هەواڵێکی پەشۆکاوئامێزی پێ بڵێ. ڕۆژنامەنوسێکی کۆلۆمبی بەناوی ئۆسکار گوریرۆ Oscar Guerero پەیوەندی بە Sunday Mirror کە یەکێکە لە ڕۆژنامەکانی ماکسوێلەوە کردووە، تاکو چیرۆکێکی هەستیاریان بۆ بگێڕێتەوە. چیرۆکێک کە بەیەکجار ئەو پەردە تەنکەی بەسەر مەڵبەندی ناوەکیی دیمۆنادا دراوە، هەڵدەداتەوە. گوایە گوریرۆ زانیارییەکانی لەیەکێ لە کارمەندە تەکنیکارەکانی کە لەئەنجومەنی کارپێکراوە ناوەکییەکانە وەرگرتووە. لەو ماوەیەدا کارمەندەکە وێنەی شوێنەکەی و هەندێ بەڵگەی دیکەی کۆکردونەتەوە و دەیسەلمێنێ کە ئیسرائیل لە ناوچەکەدا خاوەن هێزێکی ناوەکییە، خاوەنی سەد کڵاوەی ناوەکییە کە هێز و توانای تێکدەرانەی هەیە.

هەروەک هەمو تەلەفۆنە ڕاستەوخۆکان بۆ بەڕێوبەری گشتیی مۆساد، ئەوەشیان ئۆتۆماتیکیانە تۆمارکرا. هەمان ئەندامی کارای دەزگای زانیاریی ئەوەی دەربڕی کە دەمەتەقێ تۆمارکراوەکە ئەو قسە گۆڕینەوەی نێوانیان تێدابوو:

ئادمۆنی: ناوی تەکنیکارەکە دەزانی؟
ماکسوێل: مۆردۆخای ڤانونو Mordoxay vanunu ە.
ئادمۆنی:  ئەوئێستا لەکوێیە؟
ماکسوێل: بەڕای من لە سدنی ئوستڕالیایە.
ئادمۆنی: زەنگت بۆ لێدەدەمەوە.

یەکەمین تەلەفۆنی ئادمۆنی دوای ئەوە بۆ شیمون پیرێزی سەرەک وەزیران  بوو، ئەویش فەرمانیدا هەمو شتێک بکرێ تا ' بادرودۆخەکە ڕزگاربکرێ'. بەو چەند پەیڤانە پیرێس ئەوەی پەسەندکرد  ئۆپەراسیۆنێک کە نمایشی ئامانج دڵڕەقانەی مۆساد بوو، ئەنجام بدرێ.

پیاوەکانی ئادمۆنی ئەوەیان ڕونکردەوە کە ڤانونو لە فیبرایری 1977 تا نۆڤێمبەری 1986 لە دیمۆنا کاری کردووە. ئەو لەوێ لە Machon-2 یەکێک لە نهێنیترین یەکەی بەرهەمی دەزگاکە ئیشی کردووە. ئەو تەلارە بێ دەلاقەی  کۆنکرێت داڕێژراوە لە ڕوی دەرەوەی لە کۆگایەک دەچوو. دیوارەکانی ئەوەندە ئەستور دروستکرابوون تەنانەت بۆ بەهێزترین سیستمی سەتەلایتیش ئەستەم بوو ناواخنەکەی بپشکنێ. دیوارە ساختەکەش دەیبردیە لای ئەسانسێرەکان، کە شەش نهۆم بۆ شوێنی یۆرانیۆم دادبەزی و تیایدا کار لەسەر چەکی ناوەکیی دەکرا.

ڤانونو دەیتوانی بچێتە هەمو گۆشەکانی مۆڵگەیMachon-2 .  ناسنامە تایبەتە  کۆدەدارەکەی بەژمارە 520 هاوکار لەگەڵ واژۆکەی لەسەر ڕاگەیاندنە نهێنیپارێزەکەی کە بەپێی قانونی نهێنیپارێزی سوێندی لەسەر خواردووە، دەرفەتی ئەوەی دەدا بێ ئەوەی کەسێک ڕێگەی لێبگرێ لەکاتی کارەکانی وەک  Menahil  یەکێک لە دەستەی کارمەندەکانی شەو' ئەم سەرو ئەوسەری دەزگاکە بکا.

ئادمۆنی سەرسام گوێی لەوە بوو، کە ڤانونو بەدڵنیاییەوە چەند مانگان بەشێوەیەک لە شێوەکان بەدزیەوە وێنەی سەرلەبەری دەزگاکەی گرتووە: وێنەی کەلوپەل و ئامێرەکان، کابینەی تیشکدانەوەکان، ماشێنی گواستنەوە و

کارپێکردنی یۆرانیۆم. ئاماژەی ئەوە هەبوون کە فیلمە تۆمارکراوەکانی لە باولی جلەکان دەشاردەوە تاکو لەبەر چاوی باشترین دەزگای ئاگاداری مەڵبەندەکە ئاودیویان بکا.

ئادمۆنی دەیویست بزانێ چۆن ڤانونو هەمو ئەوشتانەی پێکراون، ڕەنگبێ شتی زیاتریشی لەبن سەردا بێ. وادابنێ کە کەلوپەلەکانی دایە دەست CIA یان یەکێتیی شۆرەوی یاخود ئینگلیزەکان یان چینییەکان، ئایا چی دەبێ؟ زیانەکە ئەوەندە گەورەیە مەزندە ناکرێ. ئەوسا ئیسرائیل بۆ هەمو جیهان دەردەکەوێ کە نەتەوەیەکی درۆزنە، ئەو توانایەی هەیە بەشێکی گەورەی دنیا تەخت بکا. ئایا ئەو ڤانونوە کێیە؟ بۆ کێش کار دەکا؟

زۆری پێنەچوو بەرسڤەکان دەرکەوتن. ڤانونو جولەکەیەکی مارۆکۆیی بوو لە13 ی ئۆکتۆبەری 1954دا لە مەراکش لەدایک بووە، دایک و باوکی دوکانێکی بچوکیان هەبووە. کاتێکیش لە 1963دا لە مارۆکۆدا ئەنتی سامیزم بەیەکجار دەرکەوت و کاری توندوتیژی لێکەوتەوە، خانەوادەکە بەرەو ئیسرائیل کۆچی کرد و لە بیئر سەبعە Beersjeba لە بیابانی نەقەب ئاکنجی بوون .

وەک نەوجەوانێک مۆردەخای ڤانونو ژیانێکی ئاساییانەی بردەسەر. وەک هەمو لاوێک بانگی خزمەتی سەربازی کرا. ئەوکات پرچی سەری هەڵوەرا و کەچەڵ دەردەکەوت، بەشێوەیەک کە لە هاوتەمەنە نۆزدە ساڵییەکانی گەورەتر دیار بوو. ئەو لە یەکەی مینهەڵگرتنەوە گەیشتە عەریفی پلە یەک و لە بەرزاییەکانی جۆلان خزمەتی کرد. دوای تەواوبوونی ماوەی خزمەتی سەربازیی ناوی خۆی لە زانکۆی ڕامات ئەڤیڤ Ramat Aviv لە تەل‌ئەبیب نوسی. وەلێ، دوای کەوتنی لە دوو ئەزمونی فیزیا لە یەکەمین ساڵیدا دەستبەرداری خوێندنەکەی بوو.

لە هاوینی 1976دا بە پیر بانگەوازی خولێکی تەکنیکی لە دیمۆناوە چوو، تاکو دواتر ئیشی دەست بکەوێ. دوای گفتوگۆیەکی دورودرێژ لەگەڵ سەرۆکی بەشی ئاگالێبووی دیمۆنا، ئەو دوای خولێکی چڕوپڕ لە

سروشـتزانی و کیمیـا و بیرکـاری و  ئینگلیـزی وەرگیـرا. لـەوێ ئەرکـەکانی بەباشی راییکرد، تا لە فیبرایری 1977دا وەک تـەکنیکارێک لـە دامـەزراوەی دیمۆنا دەستبەکاربوو.

لە نۆڤێمبەری 1986دا پێیگوترا کە لەسەر ئیشەکە دەرکراوە. لە فایلەکەی تێبینـی ئـەوە هـەبوو نـاوبراو ' چـەپێکی هـەواداری عەرەبەکانـە'.  ڤانونو لـە ئیسرائیلەوە ڕوەو ئوستڕالیا ڕۆیشت، لە ئایاری ساڵی دوایدا گەیشتە سیدنی. لە ئان و ساتی گەشەیدا ڕەوتی زۆر لە گەنجانی ڕۆژهـەڵاتی دوری بڕی ، سەرەتا ڤانونو زۆر بەتوندی وازی لە بڕوای جویّتی هێنا و چووە سەر دینی کریستیانی. ئـەوە وێنـەی ئـادمۆنی بـۆ نـاوبراوی کردبـوو کـە سـەرچاوەی زانیارییەکانی لە دە لاوە بۆ دەهات، ڤانونو لە ڕوی فیزیکییەوە جێی تێبینی نییە و کەسێکە گۆشەگیر: بێ دۆستی کچ، بەردەوام لـەماڵ سـەری بەسـەر کتێبــەکانی   فەلســەفە و سیاســەتدا گرتــووە. دەرونزانــەکانی مۆســاد بــۆ ئادمۆنییان شیکردەوە کە کەسێکی وەک ئـەو ڕێیتێدەچێ لـەژێر کاریگـەری لێشێوانی هەستی بەهاداریّتی و وڕێنەکردن، زۆر گەوجانە ڕەفتاربکا. یەکێک بەو جۆرە کەسایەتییە بێ، لەوانەیە مەترسیدارێکی پێشبینەکراوبێ .

لە ئوستراليا لەوشوێنەی کە ڤانونو لە بۆیەکردنی کڵێسەیەک کاریدەکرد، ئۆسکار گۆریرۆی ڕۆژنامەنوسی کۆلۆمبی ناسی، کە لە سیدنی کاریدەکرد. هەرزو ڕۆژنامە نوسە زۆربڵێکە چیرۆکـی وای دەگێڕانـەوە برادەرەکـانی لـە گـەڕەکی پیس و پۆخڵی Kings Croos شـادمان دەکرد. ئـەوەی دەگوت گوایـە یارمـەتی زانایـەکی  فیزیـاوی نـاوەکی ئیسـڕائیلی داوە  کـە پلانـەکانی ئیسڕائیل بۆ هێرشکردنەسەر  عەرەبەکان بەچەکی ناوەکی بدزێ و ئێسـتاش کـابرا لـە گـەڕەکێکی دەرەوەی شـار  لـە ناونیشـانێکی شـاردراوە دەژی، گۆریرۆش سەرقاڵی ڕێکخستنی فرۆشتنی 'هەواڵی سەدەیەکەیەتی'.

ڤانونو زۆر بە توندی دنەی چیرۆکەکەی خۆی دەدا تاکو هەرمێن پەیدا بکا . لــەو نێـوەدا ئــەو کابرایــەکی پاســیڤ بــوو دەیەویســت چیرۆکەکــەی لــە ڕۆژنامەیەکی جدیدا بڵاو بکاتەوە، تاکو جیهـان لـە مەترسـی هێـزی نـاوەکیی

ئیسرائیل وشیاربکاتەوە. گیرۆرۆ پەیوەندی لەگەڵ نوێنەرایەتی Sunday Times لە سدنیدا پەیداکرد. ڕۆژنامە لەندەنییەکە کە ناوبانگی بۆ بوێریەتییەکەی دەگەڕێتەوە، پەیامنێرێکی نارده سدنی تاکو بە تەواوی گوێ لە گیریرۆ ڕابگرێ .

کاتێکیش لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی دادۆشرا، هیچ شتێک بۆ فەنتازیای گۆریرۆ نەمایەوە. کۆلۆمبییەکە هەستی کرد کەوا دەستی لە زانیارییەکانی ڤانونو بەردەبێ. ئەو هەستەش ئەو کاتە زێدەبوو کە پەیامنێرەکەی Sunday Times ڕایگەیاند کە بەنیازە ڤانونو لەگەڵ خۆی بباتە لەندەن، چونکە لەوێ باشتر گوتەکانی دەسەلمێنرێن. ڕۆژنامەکە دەیەویست بەدرێژی سەربردەکەیان بۆ زانایەکی فیزیاوی ئینگلیزی بۆ پرسی ڕاستگۆییێتی هەڵڕێژێ.

گیرۆرۆ ڤانونو و پەیامنێرەکەی دیتن کە سواری فڕۆکە دەبن و بەرەو لەندەن دەفڕن، ئەوەش بووە مایەی خەمناکی بۆی. ئەو کەسێکی دەویست ئامۆژگاری بکا تاکو بەتەواوی دەستی بەکارەکە ڕابگا. تاکە کەسێک بیری بۆ چووبێ ئەندامێکی پێشووی دەزگای زانیاریی و ئاسایشپارێزی ئوسترالی ASISبوو . پێیڕاگەیاند کە Sunday Times هەواڵێکی دنیا لەرزێنی سەبارەی بە کارەساتی ناوەکیی لەبندەست دەرهێناوە، دواتر بەدورودرێژی باسی ئەوشتانەی بۆکرد کە ڤانونو لەدیمۆناوە ئاودیوی کردبوون کە بریتی بوون لە شەست وێنەیMachon-2، لەگەڵ نەخشە و نیگاری دیکە. ئەو کەرەستانە بەڵگەی ئەوە بوون کە بێگومان ئیسرائیل هێزی ناوەکیی هەشتەمە لەجیهاندا.

ئەم جارەشیان گۆریرۆ کورتی هێنا و لەدەرگای کەسێکی هەڵەی دا. کۆنە جاسوسی ئوسترالی زەنگی بۆ دەزگا کۆنەکەی لێدا و هەمو ئەوەی گۆریرۆ بۆی باسکردبو بەسەروبەری لەچنگی دەزگای نا. لە نێوان مۆساد و ASISدا پەیوەندییەکی هاوکاری توندوبەند هەبوو. مۆساد زانیاری پەڕینەوەی تیرۆرستە عەرەبەکانی بۆ ئەوبەری پاسیفیک دەدایە هاوەڵە

ئوسترالییەکەی ASIS . ئاگاداری کاتسای پابەند بە باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە کانبێرا Canberraکردەوە، قسەی ئەو گوتە تەلەفۆنیەش ڕاستەوخۆ بۆ ئادمۆنی فاکس کرا. ئەویش تادەهات هەواڵی متمانەدارتری پێدەگەیشت. لە درێژەی گەشتەکانیدا بۆ ئوستڕالیا، ڤانونو لاشی دابووە نیپال، لەوێش سەرێکی لەباڵوێزخانەی یەکێتیی شۆرەوی لە کاتماندو Kathmandu دا بوو. بەڵام ئایا لەوێش کەلوپەلەکانی نیشانی ئەوان دابوون؟

سایانێکی سەر بەدەستەی کارمەندانی پاشای نیپال، خەریکی وەڵامی پرسەکە بوو، سێ ڕۆژ لەسۆراخکردن، ئەنجا بۆی دەرکەوت کە ڤانونو بۆ ئەوە چووبووە نیپال تا بزانێ بە چ پاسپۆرتێک دەتوانێ بچێتە یەکێتیی شۆرەوی و پشووی تێدا بەسەر ببا. ئەوانیش دەستەیەک کاغەزو فۆرمیان داوەتێ تا پڕیانبکاتەوە.

لەو سعاتانەی ڤانونو لەنێو فڕۆکەدا بوو بۆ لەندەن، گۆریرو بە هەر شێوەیەک بێ هەوڵیدا کۆپی ئەو کەرەستانەی لە ڤانونووەوە بەردەستی کەوتبوون بداتە دوو ڕۆژنامەی ئوسترالی. ڕۆژنامەکانیش شتەکانیان بە ساختە زانی و بەلایانەوەوە نا .

لە بەرزبوونەوەی ئاستی نائومێدیدا گوریرۆ بەخۆی بلیتێکی بڕی و بەرەو لەندەن فڕی تا سەروسۆراخی ڤانونو بکا. کاتێک ڤانونوی نەدۆزیەوە بەخۆی و کۆپی وێنەکانی ڕوی لە Sunday Mirrror کرد. لەنێویاندا وێنەیەکی ڤانونوش هەبوو کە لە ئوستڕالیا گرتبووی. لە چەند چرکەساتێکی کەمدا نیکۆلاس داڤیس لە مەسەلەکە ئاگادار کرایەوە یەکسەر خۆی گەیاندە لای ماکسوێل. ئەویش زەنگی بۆ ئادمۆنی لێدا. دوای چەند سعاتێکی دیکە کاتێ بەڕێوبەری گشتیی مۆساد زەنگی بۆ ماکسوێل لێدایەوە، سەرسامییەکی نوێی دیکە چاوەڕوانی دەکرد . SundayTimes چیرۆکەکەی بەجدی وەرگرتبوو. بۆیە زۆر گرنگ بوو بزانرێ ئاخۆ تەکنیکارەکە بە دەقاودەقی چ جۆرە وێنەیەکی گرتووە، بەو مەرامەی ئەوانیش بکەونەخۆ تاهەرچی زوترە قەبارەی زیانەکە گەورە نەبووە پەردەپۆشی بکەن. هەواڵەکانی

ئوستڕاليا وايان ڕادەگەياند كە گۆريرو لەبەر چاوتێبڕینە پارە بەدوای ئەو کارانادا دەچێ. گەر هاتو سەلمێنراش کەوا ڤانونو هەمان مەبەستی هەیە ئەوا دەتوانرێ دژە هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنیان لەهەمبەردا بکرێ، تاکو کارێکی وا بکەن کە بڵێن دوو کەسی هەڵخەڵەتێنەر Sunday Times یان لە خشتە بردووە.

بۆ ئەو هەڵمەتە بنمێناشەی ماندونەناسیشیان جۆشدا. ئادمۆنی بنمێناشەی بەگەڕخست بچێتە لەندەن تا دەستی بگاتە ئەو وێنانەی گۆریرۆ نیشانی Sunday Mirror ی داون. پاشان بنمێناشە بە سیمۆر هێرش Seymor Hersh ڕۆژنامەنوسی دێرینی گوت:

نیکۆلاس داڤیس دیدارێکی ئەوی لەگەڵ ' ڕۆژنامەنوسێکی بە پەرۆشی ئامریکی-کەخۆم بووم- ڕێکخست '. لەو دیدارەدا ڕۆژنامەنووسە ئامریکییەکە وای لە گیرورو کرد کە چیرۆکەکەی بە لایەنی سێهەم بفرۆشێتەوە و دوو وێنەی ڕەنگینی ڤانونوشی نیشانبدا. ئەوەی بۆ بنمێناشە زەحمەت بوو، ئەوەبوو کە هیچ شتێکی سودبەخشی لەوێنەکاندا نەبینی چجای واتاکەی. پێمگوت کۆپی ئەو وێنانەم دەوێ، ئەویش هیچی نیشاننەدا. ئایا دەتەوێ پارە ببینی؟ من دەمەوێ ئەوە بزانم ئایا وێنەکان ڕاستین. دڵنیامکردەوە کە نیکۆلاس داڤیس زامنی من دەکا'.

گۆریرۆ سێ دانەی کۆپیکراوی وێنەکانی ڤانونوی دایە بنمێناشە. وێنەکانیش ڕاستەوخۆ بەتەتەر ڕەوانەی تەلئەبیب کران.

گەیشتنی وێنەکان لێوردبوونەوی زیاتری خواست. دەستەی دیمۆنا وێنەکانی ناسیەوە کە هی Machon-2ن. یەکێک لەوێنەکان هی بەشی سەرەناوەکییەکان بوون کە بۆ مینەکان دادەنرێن، ئەوانەی لەسەر سنوری سوریا لەبەرزاییەکانی جۆلان دەرهێنراون. ئیدی هیچ نەماوە گومان بخاتەسەر ڕاستگۆییەتی ڤانونو. هەر زانایەکی فیزیاوی لەوێنەکاندا بڕوانێ ئامێرەکان دەناسێتەوە کەبۆ چ شتێک بەکاردێن.

سەرەک وەزیران دەستەی قەیرانی پێکهێنا تاکو بارەکە 'بخەنە ژێر ڕکێفیانەوە'. یەکێک لەسەرانی مۆساد لەگەڵ ئەوە بوو دەستەیەکی کۆماندۆی مەرگچێن ڕەوانەی لەندەن بکرێ، تا ڤانونو لەوێ سارد بکەنەوە. ئادمۆنی پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە. Sunday Times ئەو بوارەی نابێ هەمو ئەوەی ڤانونو درکاندویەتی چاپ و بڵاویبکاتەوە. بۆ هەمو زانیارییەکانی تەکنیکارەکە کتێبێکی تەواوی دەوێ، بەڵام کاتێ کتێبەکە تەواو دەبێ ئەوسا MI6 و CAI بەدرێژی بەدوای دۆزەکەدا دەچن، بەمەش سەرئێشەی زۆر بۆ ئیسرائیل دروستدەبێ. بۆیە گرنگە بزانرێ چۆن ڤانونو ئەو کارە جاسوسیانەیەی لە دیمۆناوە کردووە، ئایا هەر بەتەنها بووە یاخود کەسی هاوکاری لەگەڵدا هەبوون. گەر ئەمەش وابێ کەواتە بۆ کێ ئەو کارەیان کردووە؟ بۆ دەرخستنی ڕاستی پرسەکەش تەنها یەک تاقە ڕێگا هەیە: ئەویش هێنانی ڤانونوە بۆ ئیسرائیل تا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێ.

دەبوایە ئادمۆنی شێوازێک بدۆزێتەوە تاکو ڤانونوی پێ لەو کونە بهێنێتە دەرەوە کە Sunday Times بۆیان داناوە. کاتێک زانیان ئەو لەکوێیە، کارەکە ئاسانتر دەبێ، گەرهاتو لەدوایشدا کوژرا، ئەوا یەکەم جاری نییە مۆساد لەسەر شەقامەکانی لەندەن کەسانی بەربەست لەسەررێی خۆی پان بکاتەوە. لەکاتی ڕاوکردنی تەقێنەرەوەکانی کردەی کوشتارگەی یاریزانانی ئۆلۆمپی لە مونشن مۆساد یەکێک لە ئەندامانی ئەیلولی ڕەشی لەکاتی گەڕانەوەی بۆ میوانخانەی Bloomsbury بەلێزانی و وردەکاری بە ڕوداوی بەسەرکەوتنی ئۆتۆمۆبێل کوشت .

Sunday Times هەستیکرد کە ئیسرائیل هەوڵدەدا ڤانونو بەدرۆبخاتەوە، بۆیە مشوری ئەویان خوارد لە لایەن زانای فیزیاوی ئینگلیزی فرانک برانبی Frank Branby کە خاوەن پسپۆڕێتییەکەی بەناوبوو لە بواری چەکی ناوەکیی Aldermaston یش کاریکردووە، لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێ. ئەویش هاتەسەر ئەو بڕاویە کە وێنەکان ڕەسەنن و ئەو زانیارییانەی لە بیرەوەری ڤانونو دان ڕاستن .

ئیدی Sundy Times هەنگاوی پێویستری نا. پەیامنێری پابەند بەکارەکەی ناردە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە لەندەن، تاکو پوختەی ئەوەی لەڤانونویان وەرگرتووە پێ بڵێ، لەگەڵ کۆپی تەواوی پاسپۆرت و وێنەی کەسی خۆی هەروەها لەگەڵ سەلماندنامەیەکی دەستنوسی زانا . Dr.Branby مەبەست لەوەشدا ناچارکردنی حکومەتی ئیسرائیل بوو ئەو پرسەیە بەهەند هەڵبگرێ. دەستبەجێ باڵویزی ئیسرائیل کەرەستەکەی ڕەتکردەوە و بە ' تەواو ناکۆک لەگەڵ راستیدا' لەقەڵەمیدا .

کۆپیەکانی باڵوێزخانەکە هێندەی دیکە باری لێوردبوونەوەیان زیادکرد . بن‌مێناشە گوتی" هەنوکە تۆ سەما بەبوکە شوشەکان دەکەی. ئەز هێشتا هەر لە لەندەن دانیشتبوم، داڤیس پێپڕاگەیاندم کە ماکسوێل دەیەوێ بمبینێ . لەهەمان شوێن کە ڕێککەوتننامەی عمولەی هەشت ملیۆن دۆلارمان واژۆکرد و پارەمان لەپشت پەردە ئاسنینەکەوە شاردەوە، یەکدیمان دواند. ماکسوێل پێیگوتم کە لەوە تێدەگا چی بەسەر ڤانونودا بێ باشە". ئەو گوتی" من دەزانم چ پێویستە بکرێ. من لەگەڵ سەرانی تۆ لە تەل‌ئەبیب قسەم کردووە".

لەسۆنگەی تەلەفۆنێکەوە لە دواییدا ئادمۆنی شێوازێکی دۆزییەوە کە چۆن ڤانونو لەکونەکەی بهێنێتە دەرەوە.

لەژمارەی داهاتوی Sunday Mirrorی ماکسوێل بەوێنەیەکی ڕەنگینی گەورەی مۆردەخای ڤانونو وتارێک نوسرابوو کە گاڵتەی بە تەکنیکارەکە و ئۆسکار گۆریرۆ دەکرد و وایاننیشاندا کە کۆلۆمبییەکە درۆزن و هەڵخەڵەتێنەرە و کە ئیسرائیلیش گەیشتۆتە قۆناخی سەرە ناوەکی لە نوکتە بەدەر نییە. وتارەکەش ناوی خودی ماکسوێلی لەسەر بوو، مشوری ئەوەی خوارد بوو کە وێنەکەی ڤانونو شوێنی شیاوی بدرێتێ. بەوە یەکەمین گوللەی دژەزانیاریی لەهەڵمەتی دژ وەستانەوە لە لایەن شەڕی دەروونناسانی مۆسادەوە تەقێنرا .

دوای خوێندنەوەی وتارەکە، ڤانونو زۆر شڵەژاو بە ڕۆژنامەنوسەکانی Sunday Timesی گوت کەوا حەز بە خۆشاردنەوە دەکا. 'من نامەوێ کەس بزانێ کە لەکوێم'.

تەکنیکارە پەشۆکاوەکە لە میوانخانەی Shaftesbury Avenue دەژیا، لە ناوجەرگەی لەندەن کە ڕۆژنامەکە بۆی گرتبوو.

یەکسەر دوای بڵاوبوونەوەی وتارەکەی Mirror سایانمەکانی لەندەن جۆشدران و کەوتنەخۆ: هەریەکێک دەبوایە بەدوای شوێنەکەیدا بگەڕێ. دەیان جوی باوەڕپێکراوی خۆبەخش لیستی میوانخانە و شوێنی حەوانەوەیان لابوو، تاکو سەرو سۆراخی ڤانونو بکەن. ئەوان توانیان بەدقاودەقی بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لە ڕۆژنامەکە بڵاو کرانەوە بەدوایدا بگەڕێن. ئەوان گوایە بۆیە بەدوایدا دەگەڕێن کە لەخانەوادەی ئەون و دەیانەوێ بیدۆزنەوە .

لە چوارشەممەی 24ی سێپتێمبەردا ئادمۆنی لەمەڕ دۆزینەوەی سۆراخی ڤانونو لە لەندەنەوە تەلەفۆنێکی بۆکرا. ئیدی کاتی بەکاربردنی قۆناخی دوهەمی پلانەکەیان هاتووە .

پەیوەستی نێوان سیخوڕێتی و لەخشتەبردنی سێکسبازیانە بەقەد پیشەکەی سیخوڕێتی خۆی کۆنە. لە کتێبی یۆزوا Jozua دا ڕەخابی Rachabی سۆزانی ژیانی دوو لە سیخوڕەکانی یۆزای لە دەستی پاشای یەریخۆ Jericho رزگار کرد، کە نێردرابوون بیگرن. ئەوەش لە کۆنترین نوسراوەکانە و دەسەلمێنێ دوو پیشە چۆن بەیەک دەگەن. یەکێک لە هاوکارە سەردەمیانەی ڕەخاب لە سۆزانیتی و سیخوڕێتیدا ماتا هاری Mata Hari لەخشتەبەری فریزی هۆڵەندی بوو لە ڕۆژگاری جەنگی یەکەمی جیهانییدا بۆ ئاڵمانەکان کاری دەکرد و لە لایەن فەڕانسییەکانەوە گیراو لەسێدارە درا. هەر لەبەراییشەوە مۆساد کاری لەخشتەبردنی سێکبازی بەهەند هەڵگرتووە. مایر ئامیت لەو بارەیەوە گوتوویەتی:

بەسوک و ئاسانی ئەوە چەکێکە. ژن هەندێ توانا و کارامەیی هەن کە پیاو نییەتی. ئەوان دەتوانن لەسەر جێدا بێگرفت دەتوانن قسە بکەن و گوێڕابگرن. مێژووی نوێی سیخوڕێتی پڕیەتی لەچیرۆکی وا کە ژنان توانای لەخشتەبردنی خۆیان خستۆتە خزمەت وڵاتەکەیان. گەر بگوترێ کەوا ئیسرائیل ئەم کارەی هەرگیز نەکردووە، ئەوا بێواتایی دەگەیەنێ. ئافرەتەکانی ئێمە خۆبەخشن، دەزانن کە چ سەرچڵییەک چاوەڕێیان دەکا. ئەوەش بوێرییەکی تایبەتمەندانەی دەوێ. ئەوەش هەر ئەوەنییە لەگەڵ فلان یان فیسار کەس بچیە بن لێفە. بەڵکو ئەوەیە کەتۆ بە پیاوێک بسەلمێنی کە ئەو کارەی لەگەڵ دەکەی بەرامبەر ئەوەی کەبۆت باس دەکا، بەڵام ئەوەش سەرەتای ئەو کارامەییە نییە بۆ پێویستی کارەکە و راپەڕاندنی' .

ناحوم ئادمۆنی بەخۆی ژنە سیخوڕێکی وای دەستنیشانکرد کە کارامەیی وای هەیە بتوانێ مۆردەخای ڤانونو ڕادەستی مۆساد بکا.

چێریل بن تۆڤCheryl Bn-Tov بات لیڤیها Bat leveyha یەک ( پلەیەک لەخوار کاتسا) بوو. چێریل کیژی دایک و باوکێکی جوی دەوڵەمەندی ئۆرلاندۆی فلۆریدا بوو، ئەو چارەنوسی هاوسەرگیری باوک و دایکی بە توندوتیژی لەیەکجیابوونەوە دی .بۆ دڵنەوایی خۆی لە باوەشی خوێندنی دینیی دیتەوە و سێ مانگانیش لە کیبۆتێکی(کۆمەڵگە)ی ئیسرائیلی بەسەر برد. لەوێ لە دیرۆکی جو فێربوونی زمانی عبری قوڵبووەوە. لە کۆتاییدا بڕیاریدا لە ئیسرائیلدا بژی. لە تەمەنی هەژدەساڵیدا سابرا Sabra یەکی ناسی، ئەویش کە لەئیسرائیل لەدایکبووە و بەناوی بن تۆڤ Bn Tov وەک توێژەرەوە لە ئامان ئیشیدەکرد. چێریل حەزی لێکرد و دوای ساڵێک لە یەکدیناسین بوونە هاوسەری یەکدی.

لە ئاهەنگی بوکگواستنەوەدا کۆمەڵێک لەسەرانی دەزگا نهێنییەکان بانگهێشتکرابوون. لەنێویشیاندا سەرۆکی بەشی هێنانە نێوڕیزی مۆساد مێلوکها Meluckha بوو. لەکاتی ئاهەنگەکەدا مێلوکها جۆرە پرسێکی لەچیریل کردن کە تازە بوکێک چاوەڕیی دەکردن. ئایا ئەوان لەنەخشەیاندا

بوو لەسەر کاری خۆیان بمێننەوە؟ یاخود دەیانویست ڕاستەوخۆ خێزانێک پێکبهێنن؟ لە گەرمەی ئاهەنگەکەدا چێریل بەرسڤی دایەوە کە بەدوای شێوازێک دەگەڕێ چاکەی ولآتەکەی بداتەوە. ئیسرائیل باوەشی گەرمی بۆکردبووەوە، بۆیە چێریل نەتەوەکەی بە ' خانەوادەکەی ' ناودەبرد. مانگێک دوای گەڕانەوەی لەگەشتی بوکێنییەکەی تەلەفۆنێکی لە میوانی ئاهەنگی گواستنەوەکەی بۆکرا. پێیگوت کە زۆر بیری لەقسەکەی ئەو کردۆتەوە، هەنوکەش لەوانەیە ئەو شێوازەی بۆ دۆزیبێتەوە کە خزمەتی ولآتەکەی پێبکا .

ئەوان لە قاوەخانەیەکی سەنتەری شاری تەلئەبیب یەکدیان دی. لەوێ پێیگوت کە ئاگاداری ژیانییەتی چۆن بەدەقاودەقی لە قوتابخانە چی کردووە و پاشخانەکەی چییە و چۆن مێردەکەشی ناسیوە، هەمو ئەو زانیارییانە دەزانێ. لەبەر ئەوەی ڕەنگبێ بەو ڕاگەیاندنە زۆر توڕە ببێ، پێیگوت کەوا زانیارییەکانی لە فایلی مێردەکەی لە دەزگای زانیاریی سەربازی ئاماندا هەڵگیراون و لەوێ خوێندویەتییەوە .

کابرا دەیزانی کە پەیوەندی نێوان یەکێک بیەوێ کەسێک بهێنێتە ڕیز بە زەحمەت کۆتایی دێ. ئەوەش لەوە دەچێ کە جادوگەرێک بەربژارەکەی بە شێوازو ڕیتوێل و ویرد و درود قسەی ئامـاژەدارەوە بهێنێتە ڕایێ. سەختبوونی کارەکە بە وێنای فێرکردنی کەسێکە بە پیانۆ بێئەوەی خۆی حەزی لە موزیک بێ. دوای ئەوەی بۆ چێریلی ڕونکردەوە کە بۆ چ دەزگایەک ئیشدەکا، پێیگوت کە بۆچی ویستویەتی بیدوێنێ. پێیگوت مۆساد بەردەوام بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕێ کە دەیانەوێ خزمەتی ولآتەکەیان بکەن. لە ئاهەنگی گواستنەوەیدا ئەو ئیسرائیلی بە 'خانەوادە'ی خۆی ناوبرد. ئەوەش هەمان شتە بۆ مۆساد. گەر تۆ جارێ وەرگیرای ئەوا دەبیە خانەوادەی مۆساد، کە هەمیشە دەتپارێزێ. لە بەرامبەریشدا تۆ دەبێ بەهەر شێوەیەک بێ خزمەتی بکەی. ئایا ئەو مەیلی بۆکارکردنەکە چوو؟

بەڵێ مەیلی بۆ هەبوو. بە چێریل گوترا کەدەبێ سەرەتا هەندێ تاقی بکرێتەوە. سێ مانگی داهاتو لە خانوکانی مۆساد لە تەلئەبیب چەند

ئـەزمونێکی  نوسـراو و زارەکـی ئەنجامـدا. زیرەکییـە زۆرەکـەی لـە هـەمو ئەزمونەکانی بەپلەی 140 گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ پاشخانە ئامریکاییەکەی دەرچوو. زانیارییـە  گشـتییەکانی و کارامەییـە کۆمەڵایەتییـەکانی وایـانلێکرد هاوردەیەکی زێدە باش بێ.

سەرەڕای ئەوەش ، ئەو بۆ مەشقەخولەکەش لەباربوو.

بەڵام لەپێشدا دەبوایە لەگەڵ ئەوکەسەی هێناویەتیەڕیز قسان بکا. ئـەویش پێیگوت کەوا چیریل لە سەر خاڵیک وەستاوە بچێتـە نێو جیهانێکـەوە، بـەڵام نابێ بۆ هیچ کەس تەنانەت بۆ هاوسەرەکەشی باس لە ئەزمونەکانی بکا. لەو هەلومەرجە تەنیاییەدا وایلێدێ کە متمانە بەجۆرە کەسـانێکی دیـاریکراو بکـا. ئەو نـابێ بڕوا بەکـەس بکـا تـەنها هاوڕێکـانی نـەبێ. ئـەو مەشـقی فێڵبـازێتی پێدەدرێ، متمانەشی پێ بـە شـێوازەکان دەهێنـدرێ کـە لەگـەڵ ڕێکـوپێکی و شــەڕەف یەکــدی ناگرنــەوە. ئــەو دەبــێ بچێتــە ژێــر بــەرگی نــوێ تــاکو دەستبەکاربێ و لەگەڵیاندا هەڵبکا. تەنانەت هەندێ شتی لێچاوەڕێ دەکرێ کە زۆری پێ ناخۆشە، بەڵام دەبێ بیکا تاکو تەواو بەگوێرەی ڕۆڵی ئەوپەیامەی بۆی دیاریکراوە ڕەفتاربکا.

کـابرای دەیهێنایـەڕیز لـە سـەرمێزی دانیشـتن بـۆی نوشـتایەوە و پێیگـوت هێشتاش  دەتوانێ بیری لێبکاتەوە. کەسیش گلەیی لێناکـا، گـەر نەشـیکرد  وا مەزندەناکرێ کە وازی لەخزمەتی وڵاتەکەی هێناوە.

چیریل گوتی بە هەمو خۆتەیاربوونەوە ئامادەیە مەشقەخولەکەی بگەینێتە سەر.

دوو ساڵی داهاتوی بەژیانێک ڕاهات و ئاشنا بوو کە تا ئەو کات  تەنها بە شێوازە حەزپیکرنەکەی بە پاڵدانەوە لەبەردەم شاشەی سینەماوە دەیدی. ئەو فێری ئەوە بـوو چۆن دەمانچەیـەک سـواربکا لەوکاتـەی بەهێواشـی لەسـەر کورسـییەک دانیشـتووە، چەنـد زۆر نـاو دەرخ بکـا لەوکاتـەی بـەتیژی بـە بەردەمیدا ڕەتدەبن، فێربووکە چۆن دەمانچە بێرێتاکەی لەناو پانتلۆنی یان لە

کەمەریدا هەڵبگرێ، فێرببوو کە چۆن فیستان یان تەنورەکەی بدڕێنێ و وای بدورێتەوە تاکو چەکی تێدا بشارێتەوە و بەئاسانیش دەریبێنێ.

ئایا ئێستا و ئەوکات کەسی واهەبوو واز لە مەشقی ساڵانەکەی بێنێ، هیچ قسەیەک لەسەر ئەوە نەکراوە. ئەو مەشقی چڕو پڕی پێکرا: دزەکردن بۆ ژوری میوانخانەکان بێ ئەوەی ئاشکرا ببێ و لەوکاتەی میوانیشی تێدایە، دزینی بەڵگەنامەکان لە نوسینگە. شێوازەکانی بە سعاتان لە لایەن سەرپەرشتیارانی لێیدەکۆڵرایەوە. ئەو لە نیوەشەوان بەئاگا دەهێنرایەوە تا مەشقی نوێی پێبدەن: گەشتیارێک لە یانەیەکی شەوانە بدزێ پاشان لە دەرگای میوانخانەکەی شوێنبزر بکرێ. هەر هەنگاوێکی دەهاوێشت بەوردی لێیدەکۆڵرایەوە .

بە دورو درێژیش باسی ئەزمونی سێکسیانەی لەگەڵدا کرا. ئایا پێش ئەوەی مێردەکەی بناسێ لەگەڵ چەند کەسان چۆتە سەر جێگا؟ ئایا ئامادەیە گەر فەرمانی پێکرا لەگەڵ پیاوێکی لایەدا بچێتە بن لێفە؟ ئەو بە ڕاستی وەڵامی دایەوە کەوا کەسی پێش مێردەکەی نەناسیوە، بەڵام گەر ئەو مسۆگەر بێ کە سەرکەوتنی ئەرکەکەی وا دەخوازی لەگەڵ لایەدەکەدا بچێتە سەر جێگا، ئەوا ئامادەیە، بەڵام تەنها بۆ سێکس نەوەک بۆ حەز. فێربوو کە چۆن شۆخ و شەنگییەکەی بۆ لەخشتەبردن و ڕامکردن بەکاربهێنێ.

ئەو فێربوو کەسێک بە بەتاڵکردنی تەواوی مەخزەنەکەی بکوژێ. ئەویان بە کۆمەڵێک گروپی ئیسلامی ئاشنا کرد، فێرکرا چۆن سندوق پۆستێک دروستبکا. ڕۆژێکی ڕەبەق خەریکی ئەوەبوو کە چۆن مایکرۆفیلمیکی لەزگەدار لە دیوی ناوەوەی زەرفی نامەیەک بدا بێ ئەوەی هەستی پێبکرێ. ڕۆژی پاشتر پێویستبوو ئەوە فێربێ کە چۆن دەموچاوی خۆی بگۆڕێ بەشێوەیەک شتێک لە گوپەکانی بنێ تەواو ڕوی بگۆڕێ. هونەری ئۆتۆمۆبیل دزین فێربوو، خۆی وا لێبکا کە بەدمەستە یان پیاو بەرزەفت دەکا.

ڕۆژێکیان لە لایەن بەڕێوبەری مەشقەخولەکەی داوا کرا. زۆر بەوردی هەر لە بنی پێ تا تەوقە سەری تەماشایکرد وەک ئەوەی بیپشکنێ، بەشێوەیەک

هەر ئەندامێکی دەپشکنی مۆری ئەوەی پێوەنابێ کە لەپشکنین دەرچووە. لەکۆتاییدا پێیگوت کە ئەوە بەسەرکەوتوی دەرچووە.

چێریل هانین بن تۆڤ Cheryl Hanin Bn-Tov خرایە سەر هۆبەی Kaisrutی مۆساد کە پەیوەستبوو بەپەیوەندییەکان لەگەڵ باڵوێزخانەکانی ئیسرائیل لە دەرەوەی وڵات. ڕۆڵی دیارکراوی ئەو خۆدەرنەخستن و بێپەرێزمانەوەبوو بەوەی خۆی وا نیشانبدا کە 'دۆست' یان 'هاوسەر'ی یەکێک لەکاتساکانی سەر بە باڵوێزخانەیە. لە شارێک بۆ شارێکی دیکەی ئاوروپی گوزەریدەکرد کە بۆ هاووڵاتیەکی ئامریکی شیابا. پێویستنەبوو لەگەڵ هیچ کام لە 'دۆستەکان'ی یان' هاوسەرە'کانیدا بنوێ.

خودی ئامدۆنی ڕێنوێنی ئەرکە نوێیەکەی دەکرد: ئێستا شوێنپێی ڤانونو هەڵگیراوە، دەبێ ئەو هەمو کارامەییەکەی خۆی بخاتە گەڕ تا ڤانونو لە شانشینی یەکگرتوو بۆ وڵاتێکی دیکە بەلەخشتەبردن ببا. ئەمجارەیان دەمامکی گەشتیارێکی ئامریکایی بەکاردەهێنێ کە بەتەنها گەشتی ئاوروپا دوای ئەزمونی تاڵی لەیەکجیابوونەوە، دەکا. تاکو ڕاستگۆییەتی بداتە سەر پرسی لەیەک جیابوونەوەکە و بە بەرامبەرەکەی بسەلمێنی، هەندێ وردەکاری لەئەزمونی لەیەکجیابوونەوەی باوک و دایکی بەکارهێنا. دوا بەشی چیرۆکەکەی ئەوەبوو کە بڵی خوشکێکی لە ڕۆما دەژی. پێویستە هەوڵی ئەوەبدا ڤانونو بباتە ڕۆما.

لە سێشەممەی سێپتامبەری 1986دا چێریل خرایە نێو دەستەیەکی کاتسای نۆ کەسی کە لە لەندەن بوون. ئەوان لەژێر فەرماندەیی بەڕێوبەری ئۆپەراسیۆنەکانی مۆدساد بن زیڤی Bni Zeezi بوون، کە لەبەر زۆر جگەرەکێشان پیاوێکی زبری ددان بۆربوو.

کاتساکان جێی خۆیان لەمیوانخانەکانی بەشێکی لەندەن لە نێوان Oxford Streetو The Strand کردەوە. دو لەوان ناوی خۆیان لە میوانخانەی Regent Palace Hotel نوسی. چیریلیش ناوی خۆی کردە سیندی جۆنسۆن Cindy Johnson و ژوری ژمارە 320ی بەرکەوت. زیڤیش

ژورێکی لە میوانخانەی Mountbatten گرت، کە لە ژوری ڤانونو ی ژمارە105 دورنەبوو.

لەوانەیە ئەو یەکەمین کەس بێ کە هەستی بە گۆڕانی زەوقی ڤانونو کردبێ .ڤانونو تا دەهات نیشانەکانی هەراسانی لێبەدەردەکەوتن. ئاخر لەندەن ئەو شارە ئاسودەییە نییە بۆ کەسێک لەژینگەیەکی بیابانی وەک بیر سەبع گەورە بووبێ. هەرچەندە ڕۆژنامەنوسەکان hاموشۆیان دەکرد و دەوریان دابوو، هەستی بە تەنیایی دەکرد و حەزی لێبوو دۆستایەتی ژنان بکا. حەزی لێبوو لەگەڵ ژنێک بچێتە بن لێفە. دەروونناسەکانی مۆساد بە پێداگرتنەوە ئەو پێشبینییەیان کردبوو.

لە 24ی سێپتامبەر کاتێ ڤانونو زانی کە چاودێرەکەی Sunday Times بەجێی هێشتووە و ئێستا بەتەنها دەتوانێ بڕوا، چونکە بە ڕۆژنامەکەی گوتووە. ڕۆژنامەکەش لەسەر ئەوە رازی بوو، بەڵام بەپێخۆشبوونێکی زۆرەوە نا. یەکێک لە ڕۆژنامەنوسان بە دزیەوە تا گۆڕەپانی Leicester Squareی بەدوادا چوو. لەوێ دیتی ڤانونو لەگەڵ ژنێک دەستی بەقسان کردووە. ڕۆژنامەکە وا ژنەکەی وێناکردووە: ' تەمەنی لەسەروبەندی 25ساڵە ، نزیکەی مەترێک و شەست و پێنج سانتیمەتر درێژە، گۆشتن و پرچ زەرد و لێو ئەستورە، شەپقەیەکی بۆری لەسەرە و قاتێکی بۆری لەبەردایە و پێڵاوێکی پانی بەرزیشی لەپێدایە و پێدەچێ جوو بێ'.

دوای کەمێک جوتەکە لەیەکجیابوونەوە. لە گەڕانەوەی بۆ میوانخانەکە ڤانونو بە چاودێرەکەی ڕاگەیاند کەوا ئەمڕۆ ' کیژێکی ئامریکای' بەناوی سیندی ناسیوە، نیازیشی وایە زیاتر بیبینێ. پیاوەکانی Sunday Times مشوریان خوارد. یەکێکیان وتی لەپڕ دەرکەوتنی ئەو ژنە لەگۆڕەپانەکە چ ڕێککەوتێک بوو. ڤانونو چەند و چوونەکانی ئەوانی ڕەتکردنەوە. چیرلیش پێیگوتبوو حەز دەکا زیاتر بیبینێ، بەڵام نەوەک لە لەندەن بەڵکو لە خانوی 'خوشکەکەی' لە ڕۆما.

بن زیڤی و چوار کاتسای دیکە سەرنشینی هەمان فڕۆکە بوون کە سیندی و ڤانونی بۆ ڕۆما دەبرد. جوتەکە لە فڕۆکەخانەکەدا تاکسیەکیان گرت بەرەو خانوێک لە بەشە کۆنەکەی شار ڕۆیشتن .

لەوێش سێ کاتسا چاوەڕوانیان دەکرد. بەگەیشتنیان ڤانونویان بە توندی بەرزەفت کرد و لەسەر زەوی تەختیان کرد. دواتر ئێوارەکەی ئۆتۆمبێلیکی فریادڕەس (ئەمبیولانس) هات و ڤانونویان لەسەر چوارپایە سوارکرد و لە خانووەکەیان بردەدەر. کاتسایەک بەخەمخۆرییەوە بە درواسێ تەماشاچییەکانی گوت کەوا ئەندامێکی خانەوادەکەی نەساخە و فریادڕەسیان بۆ بانگکردووە .چیریلیش سواری فریادڕەسەکە بوو و دەرچوون.

فریادڕەسەکە بە خێرایی لە ڕۆما وەدەرکەوت و ڕوەو کەنار لێیخوڕی. لەشوێنی چاوەڕوانکراو بەلەمێکی تیژڕۆ ئامادەکرابوو. ڤانونویان هەڵدایەنێو بەلەمەکە و بەرەو پاپۆڕێک کە لە کەنار لەنگەری گرتبوو ڕۆیشتن. ڤانونویان بۆسەر پشتی پاپۆڕەکە بەرزکردەوە. بنزیڤی و چیریلی لەگەڵ ڕۆیشتن. سێ ڕۆژ دواتر لە نیوەشەودا پاپۆڕی بارەکە گەیشتە بەندەری حەیفا.

زۆری نەبرد مۆردەخای ڤانونو ڕوبەڕوی ناحوم ئادمۆنی کرایەوە تا بە وردی لیکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکا. ئەوەش بووە مایەی پێواژۆیەکی کورت و دواتر بڕیار بە 'زیندانی تەنیایی هەتاهەتایەی' درا. چێریلی بن تۆڤیش دیار نەماو سەرقاڵی کارە نهێنییەکانی دیکەی بوو.

سەروبەری ساڵێک دەبوو مۆردەخای ڤانونو لەزیندانە تەنیایەکەیدا بوو کە ئیسرائیل دەیەویست تا سەدەی داهاتوش هەر بەزیندانی بمێنێتەوە . بارودۆخەکەی شپرزە بووبوو: خۆراکێکی خراپ تەنها سعاتێک لە ڕۆژێکدا دەرفەتی خۆ جولاندنی هەبوو. باقی دیکەی ژیانی بە نوێژکردن و خوێندنەوە و نوستن بەسەر دەبرد. لە مارتی 1998دا ئیسرائیل لەبەر گوشاری نێودەوڵەتی شلی کرد و ڤانونوی بردە زیندانێکی هەلومەرج لەبارتر. ئەو هەمیشە بەپێی پێوەرەکانی ئەمنستی ئینتەرناسیونال 'زیندانییەکی ویژدانە'. Sunday Time یش بەردوام بە دێڕی درشتی خۆی ڤانونوی بەبیر

خوێنەرەکانی خۆی دەهێنایەوە. ڤانونو هیچ سنتێکیشی لە ڕۆژنامەکە سەبارەت بەهەواڵی یەکەمی شڵەژاندنی جیهان وەرنەگرت. لە1998 دا لە زیندانی تەنیایدا هێنرایە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ هەوڵی نوێی پارێزەرەکانی نەیانتوانی ئازادی بکەن، پێشناچی ئەو هەوڵەیان سەربکەوێ.

دەساڵ گەورەتر، گۆشتنترو پرچ کورتر چیریل لەگەڵ دوو کچەکانی بۆ بەسەربردنی پشو لە Disny World گەڕایەوە فلۆریدا .

کاتێک لەنیسانی 1997دا ڕۆژنامەنوسێکی Sunday Times چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کرد، ئەو ڕۆڵی خۆی لە ڕفاندنەکەدا نەشاردەوە. تاکە خەمی ئەوەبوو کە بڵاوکردنەوەکە زیان بە 'پێگەکەی' لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا بگەیەنێ .

ئاری بنمێناشەش بارودۆخی بەباشی نەدەڕۆیشت. ئەو زۆر پیاوی بینین هاتن و ڕۆیشتن، دوایییەکەیان وەک قوربانیەکی ململانێی ناشەریفانە لەنێو دەزگای زانیاری ئیسرائیلیدا. ئەو نەیدەزانی کە ڕۆژی ئەویش دادێ .

لە 1989دا لە نیۆیۆرک بە تۆمەتی 'پلانگێڕان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ' وهەوڵی فرۆشتنی فڕۆکەی هێرکولوس Hercules جۆری C130 بەئێران، بەپێشێلکردنی قانونی Arms Export Control Act گیرا. ئەو فڕۆکانە لە ڕاستیدا بە ئیسرائیل فرۆشرابوون.

لەکاتی لێکۆڵینەوەدا لیژنەی Jury دا حکومەتی ئیسرائیل ڕایگەیاند ' بنمێناشە ناناسن'. ئەو فایلێکی پڕ زانیاریی ئاماژەی بە سەرپەرشتیارانی خستە سەرمێز. بەگوێرەی حکومەتی ئیسرائیل هەمو ئەوانە ' ساختەو دروستکراو'ن. بنمێناشە بڕوای بە دادوەرەکان هێنا کە وانییە. بۆیە حکومەتی ئیسرائیل گوتی بنمێناشە هیچ لە 'وەرگێڕێکی پلە نزم' ی دەزگای زانیاریی زیاتر نەبووە. لەبەرامبەردا بنمێناشە ڕایگەیاند - داوای فرۆشتنی فڕۆکەکە- لەلایەن هەردو حکومەتی ئیسرائیل و ئامریکاوە پەسندکراوە. ئەوەشی دەربڕی کە' چەکفرۆشتن بەئێران سەدان ملیۆن دۆلاری لێکەوتۆتەوە و بەرەزامەندی هەردو حکومەتەکان بووە'.

سەرلەنوێ قاوەقاوی لێوردبوونەوە کەوتەوە تەلئەبیب. ڕافی ئیتان و داڤید کیمخ دەبووایە ئەوە ڕونبکەنەوە ئاخۆ تاچەند بن‌مێناشە بە کاروبارەکەی دەزانی و چەند زیان دەگەیەنێ. وەڵامەکان زیاتر گۆمەکەیان شڵەقاند. ڕافی ئیتان گوتی بن‌مێناشە ئەو پێگەیەی هەیە ڕایەڵی تەونی چەکپێدانی ئامریکی-ئیسرائیلی بەئێران ئاشکرا بکا. ڕایەڵەکەش سەرەداوی بۆ هەمو لایەک لێدەبووەوە: سەرەداوی ناوەڕاست و باشوری ئامریکا، لەندەن، ئوستڕالیا، وڵاتەکانی ئافریکا و تەنانەت سەرەداوی ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئاورووپاش.

لەوکاتەی لە Metropolitan Correction لە نیویۆرک چاوەڕێی دادگاییەکەی دەکرد، دەستەیەکی دادوەری بەنوێنەرایەتیی حکومەتی ئیسرائیل سەردانی بن‌مێناشەی کرد. ئەوان پێشنیازێکیان بۆکرد: گەر ئەو خۆی بەخەتابار بزانێ ئەوا دوای ئازادکردنی پاداشتێکی دارایی باشی مسۆگەربووی چاوەڕوان دەکا تاکو باقی ژیانی بەخۆشی پێ بباتە سەر. بن‌مێناشە بڕیاریدا ئەوەی ڕویداوە ئاشکرا بکا. ئەویش لەوساوە دەستیپێکرد کە دەستەی دادوەری (جوری Jury-فیدرال) لە1990 دا لەهەمو خاڵەکانی تۆمەتبارکردنی بێ خەتایان دانا .

کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی ئەوکاتی لە دەزگای زانیاریدا پێیانوابوو کە دەبێ بن‌مێناشە سوپاسی بەختی خۆی بکا: ئەو لەهەوڵی خۆئازادکردندا وەک گەورە ئەفسەرانی مۆساد وێنایان دەکرد پەنای بردۆتە ' پڕژانی ئاگر' چونکە ئەو هێرشیدەکردە سەر هەموان کە دەبووە هەڕەشە لەسەر ئازاد بوونی. کیمخ هیوای ئاگرینی زۆریانی دواتر وا دەربڕی ' تاقە شتێک کە ئێمە دەمانەویست، لەبەرچاو ونبوونی ئەو بوو. ئەو بەرامبەرمان زۆر توند بوو، زیانی بە وڵات و ئاسایشەکەی گەیاند. پیاوەکە بۆ هەموان مەترسی بوو و مەترسیشە'.

ئیسرائیل بەهەندی هەڵنەگرت کە بن‌مێناشە تۆڵە دەکاتەوە. ئەو کتێبێکی بەناوی سودەکانی شەڕProfitsof War نوسی، هیوای وابوو کتێبەکەی هەمان کارانگازێتی نوسینەکانی Woodward و Bernstein یان هەبێ

کاتێ پەردەیان لەسەر واتەرگێیت هەڵدایەوە و نیکسۆن Richard Nixonی ڕوخاند. بن‌مێناشە هیچ گومانی لە مەبەستەکانی نەبوو: ' ڕاستکردنەوەی نادادییە قێزەونەکەی هەشتاکان، پشک هەبوون لە وەرگرتنەوەی هێز لەوانەی لێی بەرپرسیار بوون'.

لەتەلئەبیب بەپەلە کۆبوونەوەیەک کرا. قسە لەسەر ئەوە کرا دەستنوسەکە بکڕن و بۆ هەتا هەتایە شوێن بزری بکەن. ئاماژە بەوەکرا کەبڕە پارەیەکی زۆری یەک ملیۆن دۆلاری بەرامبەر بێدەنگ بوونی بەلاوە ناوە. دەرفەتی ڕاگۆڕینی کەمە. بڕیاردرا کە هەمو سایانمەکانی نیۆیۆرک تێبگەینرێن و بخرینەگەڕ تاک و ڕێ لەچاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی بگرن. ئایا لەوەدا چەند سەرکەوتن، ئەوە پرسێکی کراوەیە، هەرچەندە لە ڕاستیدا دەستنوسەکە چەند جاران لە لایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی گەورە پێش بڵاوکردنەوەی Sheridan Square Press کە دەزگایەکی بچوکی چاپ و پەخشە لە نیۆیۆرک بڵاوبکرێتەوە، ڕەتکرایەوە .

بن‌مێناشە کتێبەکەی وا دەخاتەڕو:

...'چیرۆکێکە سەبارەت بەفەرمانڕەوایی لە ڕێگەی کرتەکردنەوە: چۆن چەند ئەندامێکی دەزگا زانیارییەکان لە ڕاستیدا سیاسەتی حکومەتاکانیان دەستنیشاندەکەن، کە بەنهێنیی ئۆپەراسیۆنی گەورە بەبێ بەرپرسیاربوون لەبەرامبەر جەماوەردا ئەنجامدەدەن، دەسەڵات و متمانەی جەماوەریان بە بەدی بەکاردەهێنن، درۆ هەڵدەبەستن، میدیا لەخشتە دەبەن و خۆڵ لە چاوی خەڵک دەکەن. لە دواییدا نەوەک لە کۆتایی چیرۆکێکە سەبارەت بە جەنگێک کە لە لایەن ژەنەڕاڵەکانەوە ناکرێ، بەڵکو لە لایەن کەسانی دەوڵەمەند و لە نوسینگە فێنکەکانیان کە هیچ پەرۆشی ئازارو مەینەتی خەڵک نین، ئەنجامدەدرێ'.

زۆرلەوانەی کتێبەکەیان دیوە وەک هەوڵێکی شەرمەزارییانەی پەشیمان بوونەوەیان دادەنا، ئەوانی دیکەش بە هەراشگۆیی خوێندنەوەی پێشهاتەکان داناوە، کە بنمێناشە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕا.

لە لەندەنیش ڕۆبەرت ماکسوێل وەک زۆر جاران دەیکرد خۆی لەپەنا قانوندا حەشار دا: ئەو هەڕەشەی ناو لەکەدارکردنی بە ڕێکاری دادوەری دژی هەر کەسێک دەکرد کە بوێرابا تۆمەتەکانی بنمێناشەی ئاراستە بکا. هیچ دەزگایەکی چاپ و پەخشیش ئامادەی وەڵامی داڕسانی ماکسوێل نەبوو، هەروەها هیچ ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزیش نەیوێرا بەدواداچونێک بکا تا لەکۆتاییدا نوسینەکانی بنمێناشە پشتڕاستبکاتەوە .

ڕۆبەرت ماکسوێل هەر وەک بنمێناشە هەمیشە لەو بڕوایەدا بوو کە گاڵتەی پێناکرێ و پشتی بە زەوی ناکەوێ لەبەر هۆیەکی ئاسان: ئەو بۆ مۆساد بۆتە دز .هەرچەند زۆر ئەو بۆ مۆساد بڕوتێنێتەوە، ئەوەندە بۆ دەزگاکە پێویستر دەبێ .

ڕۆبەرت ماکسوێلیش هەر وەک بنمێناشە لەسەردانەکەی بۆ ئیسرائیل گوتی کەوا ئەو دەزانێ تەرمەکان لەکوێ شاردراونەتەوە. ئەو گوتنە لەلای مۆساد بێ تێبینییلەسەر هەبوون تێپەڕنەبوو.

# 10

## پەیوەندییەکی دژوار

{ پـــارە قەبەکـــەی ماکســـوێل.. کتێبـــەکانی ڤیکتـــۆر ئۆستروڤســـکیو درکانـــدنی ڕازەکـــان..محمـــد تمیمـــی کـوژرا..دزینـی میگـی 29ی روسـی.. سـیاو مۆسـاد و چەمکی هاوکاریی.. بەرنامەی هاملتن.. باندۆری بەرنامەی پرۆمس.. دزەکردنـە نێـو تـۆڕی زانیاریـەکانی عـەڕەفاتو عەڕەبـــەکان.. بـــەئاگایی عـــەڕەفات.. ماکســـوێل وەک بازرگانێکی زەبەلاحو چارەنوسەکەی.. }

ڕۆبــەرت ماکســـوێل کــە ڕۆژێــک لـــە ڕۆژان ڕۆژنامەنوســـێکی لەســـەر بەرزکردنـەوەی لیستی خەرجییە زۆرەکانی دەرکـرد، بـە دزییـەوە پـارەی سندوقی خانەنشینی کارمەندەکانی بۆ پشتگیری مۆساد بەکاردەهێنا. بە لێشـاو شـاردنەوەی بـڕە پـارەی زۆر, ڕەنگدانـەوەی بێبەزییـە فێڵزانیەکـەی مۆساد بوو کە هێشتاش بەقەبارەی زۆرەوە ئامادەیە زیاتر قوماری پێوەبکا.
ماکســـوێل خـــودی خـــۆی پارەکـــانی لـــە ڕێـــی زنجیـــرە دەســـتەیەکی لـــە یەکگرێدراوەوە فێڵبازانە دەشاردەوە، کە کارمەندی لێکدەرەوەی حکومەتیش پێـی سەرسـام دەبـوو. لێـرەوە ماکسـوێل واتایـەکی تـەواو نـوێی دەدایـە دەستەواژەی ' شاردنەوەی بڕە پارەیەکی قەبە '. ئەو دەیبینی کە بە یەکجار سـەدان هـەزار پـاوەن دەخزێنرێتـە حیسـابی مۆسـادی بـانکی ئیسـڕائیل لـە تەل‌ئەبیب. هەندێ جار ئەو پارانە سەرەتا لە ڕێگەی حیسابی باڵوێزخانـەی ئیسڕائیل لە Barclays Bank سپی دەکرێنەوە، ئەنجا ڕەوانـەی تەلئـەبیب دەکرێن. لـە بانکـە جۆراوجۆرەکانی دیکـەدا کـە ماکسـوێل بـۆ گەنـدەڵی بـێ ئـەوەی پێـی بزانن بـە کـاری دەهێنـان، بـانکی Credit Suisse لە جنێڤی تێدابوو، ئەو بانکەی بن‌مێناشە 450 ملیۆن دۆلاری دەسکەوتی ORA ی بە پسپۆڕێتی ماکسوێل لێ سپیکردەوە. هەندێ جار پارەی سندوقی خانەنشـین

نیوەی دنیا بەوێستگەی دەوڵەتانەوە وەکChemical Bank لە نیویۆرک، First National Bank لە ئوسترالیا و بانکەکانی هۆنگ کۆنگ و تۆکیۆ دەگەڕا. تەنها ماکسوێل دەیزانی پارەکە لە کوێ حەشاردراوە و بە کوێدا دەڕوا. ئەوەی مەسەلەکەی ئاڵۆزتر دەکرد ئەوەبوو ماکسوێل ڕێنمایی دەدایە ڕۆژنامەکانی دژی تاوانی خۆدزینەوە لە باجدان بنوسن .

ڤیکتۆر ئۆسترۆڤسکی Victor Ostrovsky ئیسرائیلییەک بوو لە کانادا لە دایکببوو. لە 1984تا 1986وەک کاتسایەک کاری بۆ مۆساد کردووە، یەکەمین کەس بوو سەربردەکەی ئاشکرا کرد:

پارەی زۆر لە ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد لە ئاوروپا لەو پارەیەوە دەهات کە هی سندوقی خانەنشینی کارمەندانی ڕۆژنامەکانی ماکسوێل بوو. ئەوان کاتێ ماکسوێل گروپی ڕۆژنامەکانیMirror ی بەو پارەیەی لە مۆسادی قەرزکردبوو، دەستیان بەسەر سندوقی داهاتیدا گرت. ماکسوێل ڕاوێژی داراییانەی پسپۆڕەکانی دەزگاکەی بەکاردەهێنا. ڕوە نارەوای گەمەکە بێجگە لە شاردنەوەی پارە، ئەوە بوو کە هەرکەسێک لە دەستەی بەڵێندەران کاری کردبا و لە شوێنێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووایە، ڕاستەوخۆ گومانی کارکردنی بۆ ئیسرائیل لێدەکراو و تەنها بە دەنگۆیەک ملی لە پەتی سێدارەوە دوور بوو.

لەسەردانەکانیدا بۆ ئیسرائیل ماکسوێل وەک سەرۆک دەوڵەتان ڕیزی لێدەنرا. بەردەوام لەسەر شەڕەفی حکومەت ئاهەنگی مێزی فراوینیان بۆ ساز دەدا و بەو پەڕی ڕێز و ڕومەتەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا. وەلێ مۆساد مشوری ئەوەی دەخوارد کە خۆی بۆ ئەگەری لە پڕێکەوە خۆگرتن و کشانەوەی دەستی کەرەم ئامادە دەکرد. کاتێ مۆساد بەوەی زانی کە ماکسوێل لەبەردەم مێبازیدا خۆی ناگرێ و زیاتر حەزی لەسێکسکردنە لە ڕێگەی دەمەوە، دەزگا هەموجارێک کە ماکسوێل میوان دەبوو، مشوری ئامادەکردنی باشترین سۆزانی لەوانەی دەزگا بۆ دەمارگرتنی نەیارانیان ئامادەکردبوو دەخوارد. زۆری نەبرد مۆساد کاسێتێکی تۆمارکراوی

هەڵسوکەوتی مێبازییانەی ماکسوێلی دەستکەوت. سویتی میوانخانەکەی لە تەل‌ئەبیب بەردەوام بە کامێرایەکی شارەوە چێنرابوو.

تۆمەتبارکردنەکانی ئۆستروڤسکی osrtovsky لە دوو کتێبی دانراوی خۆی سەریان هەڵدایەوە و تەواوی دەزگای زانیاریی و نهێنیی ئیسرائیلی تورە کرد. کتێبی یەکەم بەناونیشانی By Way of Deceptiom و دوهەمیش The other side of deceptionبوو. هەردو کتێبەکە پەردە تەواوگیرییەکەی نهێنیپارێزی سەردەمی کاری ئەو لەگەڵ مۆساددا دڕاند. وێنای شێوازی ئۆپەراسیۆنەکان و ناوهێنانی کەسانێک کە هێشتا کاران لە ئیشەکەیاندا، بە جۆرێک کە بەهۆیەوە گومانلێکراو دەبن لەنێو دوتوێی کتێبەکانیدا هەبوون. بە کورتی شێوەیەکی کلاسیکیانەی پیاوێک بوو کەپێیوابوو بە باشی سەودای لەگەڵدا نەکراوە، بۆیە ئەویش پەردەی لەسەر ڕوی شتە شاراوەکان هەڵماڵیوە .

سەیرە کە حکومەتی ئیسرائیل ڕاوێژی ماکسوێلی لەمەڕ وەڵامنەدانەوەی ئۆستروڤسکی بەلاوە ناو بەهەندی هەڵنەگرت. لەکاتی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەرەک وەزیران ئیسحاق شامێر لەتەلئەبیبدا، ماکسوێل ئەو سەربردەی بۆ ڕونکردەوە کە تاتچەر چۆن هەوڵیدا چاپکردنی نوسینێکی پیتەر ڕایت Peter Wright کۆنە ئەفسەری دەزگای MI5 ڕابگرێ .

کتێبەکە Spycather چەند وردەکارییەکی ئازاردەری بۆ دەزگای ئاسایشپارێزی ناوەوەی بەریتانیا تێدابوون. لە هەوڵی حکومەت بۆ ڕێپێگرتنی بڵاوکردنەوە توشی بەرپرسیارێتی بوو بەرامبەر دادوەری ئوستڕالی، چونکە ئەوێ وڵاتی نیشتەجێی پیتەر بووSpycather. کتێبەکە هەڕمێنی نێودەوڵەتی پەیدا کرد و شانشینی یەکگرتوشی پێ ریسوابوو.

هەمان شتیش چاوەڕوانی حکومەتی ئیسرائیل دەکا. لە ژێر گوشاری ئەفسەرە کاراکانی مۆسادی ئەوکات بە تایبەتیش مایر ئامیت و ئیسەر هارل کە بەدەنگی دلێرەوە داوای کاردانەوەیەکی حکومەتیان دەکرد، شامێری

سەرەک وەزیران وەزیری دادی خۆی تێگەیاند کە ڕو بکاتە دادگا، تا کتێبی یەکەمی کاستای گۆرین لە وەشان پەکبخەن.

هەمو پرسەکە پڕ بە پێستی ڕەفتارە ئاگریناوییەکەی شامێری ئەنتی ئامریکایی بوو، هاتەوە؛ چونکە لە ناخەوە باوەڕی وابوو کە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئامریکا لە هۆلۆکۆست بەرپرسیارە. ئەوەش دەگوترا کە خودی خۆی بڕوای وابوو، دەبوایە سەرۆک ڕۆزڤلت Roosevelt لەگەڵ هیتلەر 'شتێکی وای ڕێکخستبا' ( دەستەواژەی هەرە خۆشەویست لای شامێر ) بەئاراستەی جێگرتنەوەی بەریتانیا کە دەسەڵاتدارترین هێز بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە دەوڵەتی ڕایخی سێهەمی ئاڵمان، لە بەرامبەردا هیتلەر بۆ کۆچ کردنە ئیسرائیل، ڕێگای بە هەمو جووەکانی ئاوڕوپا بدابا. ئەوکات هەرگیز هۆلۆکۆست ڕوینەدەدا.

هەرچەندە ئەو بیرکردنەوەیە بێ واتابوو، ڕاستییەکەی ئەو نیگایەی شامێر بۆ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئامریکا وا وەردەگیرا، کە هەندێ ڕک لێبوونەوەیە. هەر ئەویش ئەو پێشنیازەی وەک 'ئاماژەیەکی نیازپاکی' ( دەستەواژەیەکی دیکەی خۆشەویستی شامێر بوو ) پەسەندکرد کە پێنج سەد هەزار ڕوپەڕی بەڵگەنامەکانی یۆناتن پۆلار کە لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئامریکای بۆ ئیسرائیلی دزیبوون، بدرێنە یەکێتیی شۆرەوی. شامێر هیواداربوو بەو کارە پەیوەندییەکانی ئیسرائیل و مۆسکۆ باشتر بکا. لەنێو دۆکیۆمەنتەکاندا زانیاریی تازەی CIAی سەبارەت بە سیستمی بەرگری ئاسمانی یەکێتیی سۆڤیێتی تێدابوون، هەروەها ڕاپۆرتی ساڵانەی CIA ی سەبارەت بەهەمو هێزی جەنگاوەری بلۆکی خۆرهەڵاتی تێدا بوو، دۆسیەکە وێنەی سەتەلایتی، پەیامە نهێنییەکان، زانیاریی ڕادارەکان و ڕاپۆرتی پیاوانی CIA لە هەمو لایەکی یەکێتیی شۆرەوی تێدابوو. کاتێک ناحوم ئادمۆنی بە شامێری گوت بەڵگەنامەکان زانیاریی وردیان لەسەر دەزگای دژە جاسوسی تێدایە و بەهۆیەوە یەکێتیی شۆرەوی دەتوانێ جاسوسەکان بگرێ، تەنها شانی هەڵتەکاند.

لەمیانەی گفتوگۆکانی ماکسوێل سەبارەت بە کتێبەکانی ئۆسترۆڤسکی، شامێر هەر ئەوەی دوپاتکردەوە، کە ئامادەیە هەمو شتێک بکا تا دەستڕۆیشتنی ئامریکا لە جیهان کەمبکاتەوە، ئەو باوەڕی بەوە هەبوو کە واشنتن ئۆسترۆڤسکی هانداوە کتێبەکانی بڵاو بکاتەوە، تاکو تۆڵەی خۆی پێبکاتەوە.

شامێر داوای لە ماکسوێل کرد، میدیا زەبەلاحەکەی بخاتە کارو ڕاستگۆییێتی ئۆسترۆڤسکی لەکەدارو لەبەین ببا. ماکسوێل سەرنجی شامێری بۆ ئەوە ڕاکێشا کە دەبوایە مۆساد پاشخانی نوسەرەکەی هەڵدابایەوە، پێش ئەوەی بیهێنێتە ژێر خزمەتی خۆی.

ئەوە واتای ئەوە نەبوو کە ئۆسترۆڤسکی نەبێتە ئامانجی ڕەخنە و هێرشەکانی ڕۆژنامەکانی ماکسوێل لە نێویشیاندا ڕۆژنامەی Maarivی وروژێنەر کە لە تەل‌ئەبیب دەردەچوو، ماکسوێل ئەویشی کڕیبوو. نوسەری ناوبراو لەو ڕۆژنامانەدا بە وڕێنەکار، درۆزن و بە پێچەوانەی ماکسوێل کەسێک بوو کە دۆستی ڕاستەقینەی ئیسرائیل نەبوو. دوای ئاشنا بوون بە کتێبەکان، سەرانی دەزگا زانیارییەکان گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە زۆر لە وتنەکانی ئۆسترۆڤسکی ڕاستن. هەروەها دادگای نیۆیۆرک ئەو بەڵگەوبەندەی ئیسرائیلی کە دەیگوت پەردە هەڵدانەوەکانی ئۆسترۆڤسکی ئاسایشی ئیسرائیل دەخاتە ژێر گەفەوە، بەهەند هەڵنەگرت. کتێبەکەی لە ئامریکاش هەڕمێنی پەیداکرد .

هەرچەندە ئەو یەکەمین کەس بوو کە پەیوەندییەکانی ماکسوێلی لەگەڵ مۆساددا ئاشکرا کرد، بەڵام ئۆسترۆڤسکی بەڕەی لەسەر هەمو چیرۆکەکە هەڵنەدایەوە. هەروەک ڕاستییە چەکەکانی دیکەی مۆساد، پەیوەندییەکە بە توندی چالاکییەکانی برادەرە کۆن و قەدرگرانەکەی شامێر ڕافی ئیتانیشی دەگرتەوە.

هەردو پیاوەکە لە ساڵەکانی پەنجاکانەوە یەکدی دەناسن، کاتێک لای مۆساد کاریاندەکرد، بڕیاریاندا شوێنپێی ئیسرائیل لەو جیهانەدا بکەنەوە .

30 ساڵ دواتر، لە 1986دا هەر شامێر بوو کاتێ سەبارەت بە گۆبەندەکەی پۆلارد لێشاوی ڕەخنەی بە توندی ئاراستە کرا، دەستی بەسەری ئیتاندا داهێنا. ئیتان لەوێوە تێبینی ئەوەی لەسەر هەبوو کە 'دەستەیەکی ئەفسەرانی زانیاریی بۆخۆی بەیەکەوە ناوە و بێ گوێدانە دەسەڵات کارەکانی خۆی دەکا'.

ئەو درۆیە هەوڵێکی بێهودەی حکومەتی ئیسرائیلی بوو تا خۆی لە کودەتایەکە دور بگرێ ؛ دەزگای زانیاریی ئیسرائیل پێی سودمەند بوو، بۆ ئەوەی کاروباری یەکێتیی شۆرەویی و باشوری ئافریکادا بێدەنگی لێبکەن. هەردو وڵاتەکە بە پەسندنامەی تەواوی حکومەتی ئیسرائیلەوە زانیاری چالاکییەکانی جاسوسیانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکایان بە پەرۆشەوە وەرگرت.

وەک دەرەنجامی ئاشکرابوونی ڕۆڵی ڕافی ئیتان لە شەرمەزارییەکەی ئێرانگێتدا، کارنامە پیشەییەکەی ئیتان زیانێکی کوشندەی پێکەوت. هەرچەندە زۆر لەوە تورە بوو کە هاوڕێکانی ئەویان کردە قۆچی قوربانی، بەڵام ئەو سەردارەی جاسوسێتی بەئازارەوە هەموی خواردەوە و لەبەردەم ڕای گشتیدا بێدەنگ بوو. کەچی لەگەڵ دەستەی برادەرە نزیکەکانی ئەوانەی لە ماڵەوە پێشوازی لێدەکردن و سەربردەی گیرانی ئەدۆلف ئایخمانی بۆ دەگێڕانەوە، چیرۆکێکی نوێشی لەگەڵدا بۆ دەگوتن: کەچۆن ئیسرائیل دژی پیاوەکانی خۆشی وەستاوەتەوە.

تا دەهات ژمارەی ئەوانەی تەلەفۆنیان بۆ ماڵەوە لە Shay Street دەکرد، پێیبڵێن ئێمە بە چۆنیەتی بۆیەکردنی دیواری ماڵەوەت کارانگازین، کەمتر دەبوون. ئەو زۆر جاران کە بە سعاتان لەبەر دەزگای لەحیمکردن دەمایەوە، هەنوکە لە تورەیی ئەو جۆرە سەودایەی لەگەڵیدا کرا، دەستی ئامێرەکە ناگرێ، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە کە شێوازێک بدۆزێتەوە نەوەک هەر پێی' بەشداری یارییەکە بکا' بەڵکو سەرەڕای ئەوەش"برە پارەیەکی قەبەی دەستبکەوێ'. بڕیاری بەردەوامبوون لەسەر خزمەتکردنی وڵات، سەرەڕای

ناوزڕاندن و لەکەدارکردنی، گەواهی ئەوە بوون کە بە ئاسانی دەربیبڕێ: 'خۆشەویستی نیشتمان چیدیکە مۆدەی نەماوە. ئەز ولات پارێزم. من باوەڕم بە ولاتی خۆم هەیە. ئەوسا ڕاست بێ یان نا، من دژی هەرکەسێک دەوەستمەوە کە هەڕەشە لە ولات و گەلەکەم بکا'. ئەوە جۆش و خرۆشی بوو کاتێک پلانی ژێر بەژێری لە ئان و ساتی تۆپکەی پەیوەستبوونی بەئێرانگێیت بەرفراواندەکرد. هەروەک زۆر لە پلانەکانی ئەوەی لێچاوەڕوان دەکرا کە تەواوی بەهرە بایەخدارەکانی بۆ دادۆشینی بیرۆکەی یەکێکی دیکە بەکار بهێنێ. ئەوە پلانێک دەبێ کە خەڵک هەر بەپلانی ڕفاندنی ئایخمان یادی ناکاتەوە، بەڵکو بەپلانی هاوکاری توندوتۆڵ لەگەڵ ماکسوێل یادی دەکەنەوە.

لە ساڵی 1967دا پسپۆڕی ڕایەڵی پەیوەندییەکان ولیەم هاملتن William Hamilton لە ڤێتنامەوە کە سەرقاڵی ڕاچاندنی تۆڕێکی وێستگەی گویلێڕاگرتنی ئەلەکترۆنی بوو تاکو شوێنپێی جەنگاوەرانی ڤیتکۆنگ Vietcong لەنێو لێڕەواردا هەڵبگرێ، گەڕایەوە ئامریکا. لە نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەیی ئیش بە هاملتن درا. ئیشی یەکەمی پەرەپێدانی سیستمێکی کۆمپیوتەری بوو بۆ فەرهەنگی ڤیتنامی- ئینگلیزی، دواتر ئامێرێکی سەنگین بوو بۆ وەرگێڕانی پەیامەکانی ڤیکتۆنگ و لێکۆڵینەوە لەگەڵ دیلەکاندا.

ئەوەش ئەو سەردەمە بوو کە شۆڕشێک لە بواری پەیوەستییە ئەلەکترۆنییەکان لە تەکنەلۆژیای سەتەلایت، بەیەکەوە گرێدانی ترانزستۆرەکان و هەڵگرتنی زانیاری لەسەر چیپ، خەریکبوو جیهانی زانیاریی خێرا بگۆڕێ: چونکە بە هۆیەوە خێرا کۆدەی ئاسایشدار دەگەیشت و جفرەکان دەشکێنران و وێنەی باوەڕپێکراو خێراتر دەکەوتنە بەردەست. کۆمپیوتەرەکان بچوکترو خێراتر بوون، وردبینی سیستەمی چاودێری وایلێهات بە هەزاران دوان لە یەکدی جیابکاتەوە، لێکدانەوەی وێنەکان وایلێهات وێنەی مەبەست لە نێوان ملیۆنان وێنەدا بناسێتەوە ( کەلە 1962دا بووە مایەی ئاشکراکردنی ڕۆکێتەکانی شۆرەوی لەکوبادا ) و چیپی وردیلە

گوێلێهەڵخستن ئەو توانایەی هەبوو لە دوری سەد مەتر کاری خۆی بکا، تیشکی ژێر بنەوشەیی توانی چاوی مرۆڤ وەک کوندەبۆ لە شوێنە هەرە تاریک و نوتەکەکان تیژ ببینێ.

کابلی هەرە باریک سورِی دەمارێکی وای لەکۆمەڵگادا ئافەریدەکرد کە پشکی هەبێ و زۆریش کارابێ لە ئۆپەراسیۆنی جاسوسیێتی بەوەی ئەوەندە زانیاری کۆبکاتەوە و بەیەکەوەیان گرێبدا، کە لەسەروی مەزندەی مرۆڤەوەیە. ئەوەش بەدەسەڵاترین کەرەستە و شێوازی گونجێندراو بوون بۆ شوێنپێهەڵگرتنی کردە تیرۆرستییەکان. هەروەها کار لەسەر دروستکردنی سیستمێکی کۆمپیوتەری کرا کە خەڵک لە رِێگەی وێنەکانیانەوە زووبناسرێتەوە. ئەو Facial-Analyses Comparison and Elimination System (FACES) لە بواری ناسینەوەی ناسنامەی تیرۆریست و تاوانباران، شۆرِشێک بوو. لەسەر بنەمای چل و نۆ تێبینی FACESدەیتوانی لەماوەی چەند چرکەیەکەوە پانزە ملیۆن جوتە برِیاری بەڵێ/ نەخێر بدا. بە لێکبەستن و پاتری تەواوە دەتوانرا کۆمپیتەرە بەیەکەوە پەیوەستەکان ئاستی برِیارەکانی بەڵێ/نەخێریان بۆ چل ملیۆن لە چرکەیەکدا بەرز بکەنەوە. کۆمپیوتەرەکان هەرچەند بچوک بوون، بەڵام لەوکاتدا عەقڵی ناوەوەیان بەس بوو بۆ هەڵگرتنی کتێبێکی پێنج سەد لاپەرِەیی، تا دەهاتیش گەورەتر دەبوون.

هاملتن هێشتا هەر لەگەڵ نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەیی کاریدەکرد، کاتێ هەرِمێن پەیدابوونی بازارِەکەی بۆ دەرکەوت: دروستکردنی پرۆگرامێک بە جۆرێک ببێتە پردی بەستنەوەی بانکی زانیاریی چەندان سیستمی کۆمپیوتەری. گەرهاتوو ئەو سیستمە کەوتە بەردەستی دەزگا زانیارییەرکان، ئەوا خاوەنەکەی ئەو توانستەی هەیە سەیری سیستمەکان بکا بێئەوەی خاوەنەکانیان یان بەکارهێنەرەکانیان شتێک هەستپێبکەن. وەک وڵاتپارێزێک هاملتن دەیەویست یەکەمین حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا سەرمەشقی بەکارهێنی ئەو سیستمە بێ. هەروەک چۆن NASA وڵاتەکەی

لە بواری تەکنەلۆژیای ئاسمانناسیدا خستۆتە پێشەنگ، ئاواش ولیەم هاملتن - کە زۆری بڕوای بەخۆ بوو- دەیویست دەزگای زانیاریی ئامریکای لە پێشەوەی دەزگاکان بێ. بەهاندانی نوسینگەکە داهێنەرەکە شانزە سعاتان لە ڕۆژ و حەفت ڕۆژانیش لە هەفتەدا کاری لەسەر پرۆگرامە نوێیەکەی دەکرد. لە سۆنگەی پەرۆشی و مەیلی لەوەی لەگەڵ کەسدا باس لە مەبەستەکەی نەکا، ئەو نمونەی کەسێکی لێکۆڵەرەوە بوو، لەو جۆرە کەسانەش زۆر لە نێو نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەییدا هەبوون.

دوای سێ ساڵان هاملتن لە پێشکەشکردنی پرۆگرامە هەرە خێراو بە کەڵکەکەی لەهەمو سەردەمێکدا نزیک بووەوە: پرۆگرامێک بتوانی چاوەدێری بێژمار لە خەڵکی لەم سەر و ئەوسەری دنیادا پێ بکەی. هۆشدارینامەکەی سەرۆک ڕێگان ئێوە دەتوانن ڕابکەن، بەڵام ناتوانن خۆتان بشارنەوە 'you can`t hide' can run, butخەریک بوو ببێتە ڕاستی.

هاملتن لە نوسینگەکە وازیهێنا و کۆمپانیایەکی بچوکی بەناوی In-law کڕی. بە گوێرەی دەستورنامەی ژوری بازرگانی و فابریکەکان کۆمپانیاکە بە مەبەستی ڕاوێژی پێواژۆ دادوەرییەکانە کە لەگەڵ یەکدا بەراوردیانبکا، تاکو لەبارترین پێشینەیان کە لەگەڵ داواکەر، سکاڵاکەر، شاهیدەکان و خێزانەکانیان و تەنانەت پارێزەرەکانیشیان بگونجێ هەڵبژێرێ. بە کورتی هەر یەکێک بە شێوەیەک لەشێوەکان بە کێشەکەوە بەندەو دەیگرێتەوە. هاملتن سیستمەکەی ناونا Promis. لەسەروبەندی 1981دا وا گەشەی بە پرۆگرامەکەدا کە داوای مافی دانراوی سۆفتوێرەکەی بکا و لەسەر خاڵی وەرچەرخانی ئەوە بوو، کۆمپانیا بچوکەکەی ببێتە کۆمپانیاییەکی قازانجدەر. ئایندەی ڕون و پڕ هیوا بوو.

نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەیی ناڕەزاییەتی خۆی لەسەر ئەوە دەربڕی، کە هاملتن توانا لێکۆڵینەوەکانی نوسینگەکەی بۆ پەرەپێدانی بەرنامەکەی بەکارهێناوە. هاملتن بە تورەییەوە ئەو تۆمەتانەی ڕەتکردنەوە، بەڵام Promisی لەسەر بنەمای بەرابەری بەکرێ دایە وەزارەتی داد، بە شێوەیەک

هەر جارێ وەزارەت بەرنامەکە بەکاربهێنێ قەرەبوبکرێتەوە. وەزارەتی داد هەروەک دامودەزگاکانی دیکەی حکومەت سەدان گرێبەستی بۆ هەمو بوارە جۆربەجۆرەکان هەبوو. ئەوەی هاملتن نەیدەزانی ئەوەبوو کە وەزارەتی داد دانەیەکی لە پرۆگرامەکەی ناردۆتە نوسینگەکە بۆ ' گەشەپێدانی '.

ئایا بۆچی ئەمە ڕویدا؟ وەڵامەکەی هەرگیز ڕوننەبووەوە. هاملتن لەمێژ بوو پرۆگرامەکەی خستبووە بەردەم وەزارەتی داد، بەڵێنی دابوو کە سەرکەوتوانە ئەو ئەرکانەی پێی سپێردراون ڕاییبکا: پێبەپێی ڕێگە ئەلەکترۆنیەکە زانیاریی ڕەفتارکردن و نەکردنی خەڵکی بە شێوەیەکی نائاشنا تێبئاخنرێ Promis . بۆ وەزارەتی داد و بۆ مەڵبەندە لێکۆڵینەوەکەی FBI کەرستەیەکی بەهێز بوو دژی سپی کردنەوەی پارە و کردەکانی دیکەی تاوانبارانی ڕێکخراوە مافیاییەکان. هەروەها پرۆگرامەکە لە شەڕی دژی بناوانەکانی ماددە بیهۆشکەرە کۆلۆمبییەکان ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرت. بۆ CIA یش PROMIS چەکێک بوو لە هەمو ڕویێکەوە ئامانجی خۆی وەک سەتەلایتێکی جاسوسی دەپێکا. تواناکانی پرۆگرامەکە وادەرکەوتن کە بێ سنور بێ.

لەو نێوەدا ژمارەیەکی زۆر دەموچاوی کۆمەڵگا نێودەوڵەتییەکانی وردە بازرگانان و هەڵپەرستان لە ڕێگەی بەرنامەکەوە هەناسەی بوونیان هەڵکیشا .

ئێرل براین Earl Brain لە ماوەی حوکمی پارێزگارێتی ڕۆنالد ڕێگاندا وەزیری تەندوستی بوو. لەبەر ئەوەی براین فارسی دەزانی، ڕێگان هانیدا بە سیستمی نوێی کایەی لەشساخی یارمەتی حکومەتی ئێران بدا. ئەوەش بیرۆکەیەکی زیرەکانە بوو کە سەرۆکی ئایندەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکای پێ عەوداڵ بوو: ڤێرشنیکی نوێی سیستمی داودەرمانی بۆ ئێران ڕوی ئەرێنی ئامریکایان نیشاندەدا و لە هەمان کاتیشدا ناوبانگی ئامریکا لە ناوچەکەدا بریقەدار دەکا .دەمەتەقێیەکی سەنگین لە نێوان حاکمی ولایەتەکە برێین بەوشیوە بوو:' گەر سیستمی داودەرمانەکە لە کالیفۆرنیا ئیشیکرد، کەواتە لە هەمو شوێنیکی دنیادا کار دەکا'.

لەکاتی سەردانەکەی برێین بۆ تاران سەرنجی ڕافی ئیتانی بۆ پرۆژە بەرنامەکە ڕاکێشا. ئەوکات ئیتان ستێرنی پاپۆڕی گۆڕینەوەی چەک بە بارمتەکانی لەدەست بوو، تادەهات لە گاشە بەردە دژوارەکان نزیک دەبووەوە. ئەو برێینی بانگهێشتی ئیسرائیل کرد. هەر زو لە هاموشۆی یەکدی ڕاهاتن. برێین سەرسام بوو بە چیرۆکەکەی ئیتان لەمەڕ گرتنی ئایخمان، ئیتانیش بە چیرۆکەکانی میوانەکەی لەمەڕ ژیانی کۆمەڵگەی چینی باڵای کالیفۆرنیاوە داخبار بوو .

ڕافی ئیتان زو تێگەیشت کە برێین ناتوانی بە ئاسانی پەیوەندیی ئیرانییەکانی بشارێتەوە، ڕوانینیشی بۆ پێبەخشینی سیستمێکی نوێی داودەرمان لە لایەن ڕێگانەوە ' ئەوەندە بە گاڵتەجاڕی وەرگرت وەک ئەوەی لەمێژ بێ بیستبێتی' . لە ماوەی ساڵەکانی دواییدا هەر دو پیاوەکان پەیوەندییان لەگەڵ یەک بەردەوام بوو. ئیتان بەخۆی پۆستکارتێکی لە Apolloی پەنسلڤانیاوە کاتێک سەرقاڵی کاری بردنی کەلوپەلی ناوەکیی بوو لەگەڵ Numic بۆ نارد. لەسەر پۆستکارتەکە نوسیبووی ' ئێرەخۆشترین شوێنە، گەر بۆی بێی' . برێین ئەو پیاوە بوو کە ڕافی ئیتانی لە پرۆگرامی Promisی ئاگادارکردەوە.

لە 1990دا ئێریل برێین گەیشتە تەلئەبیب. ئەو نەوەک لە گەشتە دورودرێژەکەی ماندو ببوو، بەڵکو توڕە و ڕەنگ بزرکاو ببوو لەوەی کە زانی وەزارەتی دادی ئامریکای ڤێرشنێکی پرۆگرامی Promis ی بۆ بەدواداچوونی سپیکردنەوەی پارە و کردە تاوانەکانی دیکەی بەکارهێناوە.

هەستی خۆڕسکانەی خۆی بە ئیتانی گوت کە کۆنە برادەرەکەی لە کاتێکی گونجاودا نەهاتووە. دیسان دەمەقاڵییەکی زۆر لەنێوان مۆساد و دەزگا زانیارییە نهێنییەکانی دیکە لە ئیسرائیل پەیدابووە. هۆیەکەشی: ڕاپەڕینێکی نوێی عەرەبان بوو. دەکرێ Promis چەکێکی نیشانئەنگێو دژی ئەو جۆرە چالاکیانە بێ.

شـۆڕش بەسـەدا و خێراییـەکی زۆرەوە فـراوان بـوو، لـە سـۆنگەیەوە هێرشکرایە سەر ئیسرائیل، ئەمە وایکرد فەلەستینییەکانی کەناری خۆرئاوا و کەرتی غـەززە دەستبکەنەوە. هەرچەند سوپای ئیسرائیل خەڵکی دەگرت، ئازاری دەدان یـان تەقـەی لێدەکردن یـان لـە خانووەکانیـانی دەردەکردنـە دەرەوە، ڕاپەڕین خێراتر تەشەنەی دەکرد. لە دەرەوەی ئیسرائیلیش شتێک بەرپا بوو کە زۆر لەوە تێپەڕی کە لێتێگەیشتنێکی تورەییانە بە تایبەتیش لەو کاتـەی لاوێکـی عـەرەب بـە فڕۆکەیـەکی دەسـتکردی باڵدارەوە سنورە بـە ئەلەکترۆن پارێزراوەکەی لوبنانی بەزاند و توانی لە بیبان لە دەوروبەری باکوری شاری کریات شامۆنا Kiryat Shamona بنیشێتەوە و لە ماوەی خولەکێکدا پێش ئەوەی سەری خۆشی تێدا، بچێ شەش سەربازی پڕ چەکی ئیسرائیلی بکوژێ و نۆی دیکەشیان لێبریندداربکا.

ڕوداوەکە لە مێشکی سەرانی فەلەستینی چەسپا و لەنێودەزگا زانیارییەکانی ئیسرائیلیشـدا بـووە مایـەی یەکدی تۆمـەتبارکردن Shin Bet . لۆمـەی Amanی دەکـرد، ئامـانیش هـی شـین بیـت، بـە هەردوکیشـیان پەنجـەی تۆمەتبارییان بۆ مۆسـاد ڕادەهێشـت، چونکـە مۆسـاد هـیچ هۆشـدارییەکی لـە لوبنانەوە نەداوە. بارەکە هێشتا خراپتریشی لێهات. شەش تیرۆرستی سامناک لە پارێزراوترین گرتوخانەی غەززەدا هـەڵاتن و خۆیـان دەربـازکرد. مۆسـاد شین بیتی بە سست جوڵانەوە خەتابار کرد. ئەوانیش بە لای خۆیان گوتیـان کەوا نەخشەی هەڵاتنەکە لە دەرەوەی سنور کێشراوە لەبەر ئەوە مۆساد لـە ئاشکراکردنیدا کورتی هێناوە .

وایلیهـاتبوو ڕۆژانـە سـەربازە ئیسـرائیلییەکان و هاووڵاتیـان لەسـەر شەقامەکانی ئۆرشەلیم و تەلئەبیب و حەیفا دەکوژران. لە هەوڵێکی بێهودەدا تـاکو دەسـەڵات و ئـارامی بگێڕدرێتـەوە، وەزیـری بـەرگری ئیسـحاق ڕابـین ڕایگەیاند سیاسەتی 'توندوتیژی' و باری نائاسایی و سـزادان' دەگرێتـە بـەر، وەلێ ئەوەش سودێکی وای نەبوو .

دەزگا زانیارییەکان هێشتا دەستیان لە یەخەی یەکدی گیرکردبوو، نەیانتوانی لەسەر سیاسەتێکی هاوکاری بۆ پانکردنەوەی سەری سەرانی عەرەبە ڕاپەڕیوەکان بە ئەندازەیەک کە لەوەتەی شەڕی ڕزگاریخوازانەی 1948دا نەبینراوە، ڕێکبکەون. باری زێدە هەراسانکردنیش لە لایەن ئامریکەکانەوە هات، ڕەخنەیان لەو وێنە تەلەفزیۆنە دوبارەبووانەوە دەگرت کە لەشکری ئیسرائیل توند و تیژی دژی فەلەستینییەکان بەکاردەهێنا. بۆ یەکەم جار ڕایەڵی تەلەفزیۆنەکانی ئامریکا - کە هەمیشە ڕەفتاری دۆستانەیان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەبووە - دیمەنی وایان لە دڕندایەتی نمایشدەکرد کە لە سەردەمی گۆڕەپانی چینانمنی بێژینگی Tiananmen چینیش ڕوینەداوە. بەوجۆرە وێنەی دوو سەربازی ئیسرائیلی گیرابوو کە دەیانەویست باسکی لاوێکی فەلەستینی بەبەرد بشکێنن، وێنەی دەوریەیەکی دیکە لە کاتی بەدڕەفتاری لەگەڵ ژنێکی دوگیانی فەلەستینیدا گیرا، لە هیبرۆنHebron یش سەربازەکان بە قۆنداخە تفەنگ لە منداڵانیان دەدا، چونکە بەردیان دەهاویشت.

ڕاپەڕینەکە ببووە مایەی سەرهەڵدانی سەرکردایەتییەکی نیشتمانی یەکگرتوو. لە کۆمەڵگاکانی عەرەبیدا جۆرە پۆلێک بڵاوبوونەوە لەگەڵ ڕێنمایی بۆ ڕێکخستنی مانگرتن، داخستنی دەرگای دوکان و کارگەکان، خۆ بەدورگرتن لە کڕینی بەرهەمی ئیسرائیلی و گوێڕایەڵ نەبوونی هاووڵاتیان بۆ دامودەزگاکانی حکومەت .ئەو بارە بە توندی بارودۆخی بەرەنگاربوونەوەی فەرەنسییەکانی لە دوا ڕۆژەکانی داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن ئاڵمانەوە لەسەردەمی جەنگی دوهەمی جیهانیدا بەبیردەهێنایەوە.

بۆئەوەی مۆساد دەستپێشخەری خۆی بگێڕێتەوە، ناحوم ئادمۆنی دەستبەکاربوو. لە 14ی فێبرایری 1988دا دەستەیەکی کۆماندۆی مەرگچێنی نارده بەندەری لیماسۆل Limas sol لە قوبرس، تاکو بۆمبێکی بەهێز لە ژێر شاسی ئۆتۆمبێلی گۆلفی ڤۆلکس واگن دابنێن. ئۆتۆمبێلەکە هی سەرکردەیەکی ڕاپەرین بوو بە ناوی محەمەد تەمیمیMuhammad Tammie. ئەویش دو

لەسەرانیPLOی لەگەڵدابوون. ئەوان لەگەڵ کاربەدەستانی لیبیادا قسەیانکردبوو یەک ملیۆن دیناریان پێبەخشیبوون تاکو لە ڕاپەڕینەکەی خەرجبکەن. هەرسێ کەسەکە بە تەقینەوە گەورەکە کە هەمو بەندەرەکەی هەژاند، کوژران .

ڕۆژی پاشتر دیسان مۆساد دەستیکردەوە: مینێکی لەزگەداریان لەبنی Soy Phoneکە بەلەمێکی سەرنشین هەڵگربوو دانا، کە PLO کرێبووی بۆ گواستنەوەی کەسانی خۆی بەکاریدەهێنا. بەلەمەکە بە هەڵگرتنی نوێنەرانی میدیاکانی هەمو لایەکی جیهان بە تەمای ئەوە بوو بچێتە حەیفا، ئەمەش وەک ئاماژەیەک بۆ' مافی گەڕانەوەی پەنابەران' بۆ زێدی خۆیان بۆ ئەو فەلەستینییانەی لە دەرەوەی وڵات بوون، هەروەها لەهەمان کاتیشدا هێمایەکی یادکردنەوە بوو بۆ زۆر لەو پاپۆڕانەی کە کۆچکردوی جولەکەی تێدا بوون بۆ ئیسرائیل دەهاتن – فیلمی Exodus بە نەمری هێشتنەوە- کاتێک چل ساڵ لەمەوبەر مارینزی بەریتانی لەو جۆرە پاپۆرانەی دۆزینەوە و پاشماوە ڕزگاربووەکانی هۆلۆکۆست بە نیوەمەرگی گەیەنرانە وڵاتی ئیسرائیل Egrets Yisrael. ئەوە بوو Soy Phane تێکوپێکدرا .

ئەو ئۆپەراسیۆنانە لە ورەی فەلەستینییەکانی کەم نەکردەوە. جار لەسەر جار گەریلاکانیان زیرەکانە دەرفەتی ساردکردنەوەی ئیسرائیلییەکانیان بۆ هەڵدەکەوت، لەشکریش هەر لەو بارەدا بوو کە توندوتیژی بە توندوتیژی پتر وەڵام بداتەوە. جیهان هاتە سەر بیرۆکەیەک کە ئیسرائیل نەوەک هەر ڕاپەڕینەکەی پێ سەرکوت ناکرێ، بەڵکو پڕوپاگەندای شەڕیشی دۆڕاند. کۆمێنتارەکان هەلومەرجەکەیان بە هی داودDavid و گۆلیات Goliath بەراورد دەکرد، کە هێزی بەرگری ئیسرائیل ڕۆڵی گۆلیات ببینێ.

یاسر عەرەفات ڕاپەرینەکەی بۆ ئەوە بەکاردەهێنا تاکو دەسەڵات و هەژمونی بەسەر گەلە زەوتکراوەکەی بگەڕێنێتەوە. لە هەمولایەک دەنگی تورەی عەرەفات دەبیسترا، لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان وای قسە دەکرد کە کاردانەوەی ئەوەیە، ئیسرائیل خەریکە زیاتر زەوی فەلەستینییەکان دەدزێ .

ئەو داوای لە هەمو عەرەبێک دەکرد پشتگیریان بکەن. لە ڕۆژێکدا عەرەفات دەچووە کوێت تاکو پشتگیری گروپی تیرۆرستی حەماس بەدەستبخا و وایان لێبکا چەکە کوشندەکانیان بەکاربهێنن. دواتر لە لوبنان دیداری لەگەڵ سەرکردەکانی گروپی جیهاد ساز دەکرد. عەرەفات بە توندی پێداگیربوو شتێک بەدەستبهێنێ کە تاماوەیەکی کورت دەسکەوتی وا ئەستەم بوو: عەرەبەکانی سەر بەهەموو لایەنداربییەک وایان لێبکا کاری هاوبەش تەواوبکەن. بۆ هەمویان ئەوە گەشەی پێدرا کە ببێتە ' سەرۆکی فەلەستینی' یان کورتر ' سەرۆک'.

بەردەوام مۆساد لە لایەن تەکتیکەکانی عەرەفاتەوە کە لەو پایەتەخت بۆ ئەو پایەتەخت بازیدەدا بێدەنگ دەکرا. دەزگا زۆر زەحمەت بوو بزانێ ئاخۆ دواتر عەرەفات لە کوێ سەرهەڵدەداتەوە، یاخود لە مۆڵگەکەی خۆیدا لەگەڵ کێ گفتوگۆ دەکا.

ڕافی ئیتان بە دورودرێژی ئەو کێشانەی بۆ میوانەکەی ئیرل برێین شیکردنەوە .لە لایەن خۆشیەوە برێین کاریPromis ی بۆ شیکردەوە. بەپێی ئەو هێشتا زۆر کاری دیکە ماوە تا پرۆگرامەکە خێراتر بکرێ. ئیتان دەیزانی ئەنجا پرۆگرامەکە کاریگەری لەسەر ڕاپەڕینەکە دەبێ. لەسەرەتاوە دەبوایە سیستمەکە بخزێنرێتە کۆمپیتەرەکانی هەر حەڤدە بارەگاکانی PLOکە لە جیهاندا بڵاو بوونەتەوە، بۆ ئەوەی بزانرێ ئاخۆ عەرەفات بۆ کوێ دەڕوا یان چی لەناو هەگبەدایە. ڕافی ئیتان بۆ ماوەیەکی زۆر وازی لە ئارەزووە هونەرییەکەی هێنا، تا خۆی بۆ بەکارهێنانی شێوازی بوێرانەی جیهانی نوێ کە برێین بۆی وێنا کردبوو، تەرخان بکا.

ئیدی لەمەوپاش بۆ نمونە پێویستی بەوە نەدەکرد ئەوەی هەواڵی تازە و گەرمی سەر گۆڕەپانت بۆ بێ، تاکو بزانی نیازی تیرۆرستەکان چییە. لە سۆنگەیPromis ەوە بە دەقاودەقی دەزانی کە کەی و لە کوێ دەستبکەیتەوە Promis . دەتوانێ شوێنپێی هەمو هەنگاوەکانی تیرۆرستان هەڵبگرێ.

ئافەریدەکردنی ئەو ئامێرە هێز زەبەللاحە بێگومان وا لە ڕافی ئیتان دەکا، جارێکی دیکە ببێتەوە بیچمێکی دەستڕۆیشتو لەنێو دەزگای زانیارییدا. بەڕاستیش ئەو برینانەی کە کۆنە هاوکارەکانی تێیانکردووە، پاشماوەی دیاری لێ بەجێماوە. ئەوان بە موچەیەکی کەمی خانەنشینکردنو بە ساردیان بەجێ هێشتبوو. ئەو بەهۆی کارە دورو درێژەکەی پەڕپوت ببوو Promis . وای لێدەکا قەرەبوی هەموی بۆ بکاتەوە. گەر ئەو باش ئیش بکا ئەوا دەستی بە گەنجینەی پارەدا ڕادەگا، بەڵام سەرەڕای زیرەکایەتی، ئیتان هیچی لە کۆمپیوتەر نەدەزانی، لەو بوارە هەر ئەوەندەی دەزانی مۆدەمەکە هەڵبکات و بیکوژێنێتەوە. لە سۆنگەی ئەوەی کە بەساڵان لە دەزگای هەواڵگری لاکام Lakam بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی زانستیانە کاریدەکرد پەیوەندی لەگەڵ پسپۆڕاندا هەبوو کە ئێستا پێویستی پێیان هەبوو.

هەر کە ئیرل بریین گەڕایەوە ئامریکا، ئیتان دەستەیەکی لە کۆنە بەرنامەزانانی کۆمپیوتەری لاکام پێکهێنا. ئەوان بەشەکانی پرۆگرامی Promisیان هەڵوەشاند و سەرلەنوێ بەشەکانیان بە دەسکارییەک کە خۆیان پەرەیانپێدا لەسەر یەک نایەوە. هەنوکە هیچ کەس ناتوانێ داوای مافی خاوەنداریتی Promis بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیتان بڕیاریدا ناوی بنەڕەتی پرۆگرامەکە وەک خۆی بهێڵێتەوە، چونکە ' بەڵگە وبەندێکی باش خۆفرۆش دەبێ و یەکسەریش توخمەکانی دەناسرێنەوە کە چ سیستمێکە'.

پیاوەکانی دەزگای زانیاریی- تەنانەت ئەوکەسانەش کە لەبارەی تەکنیکی کۆمپیوتەر هەر ئەوەندەی لێدەزانن دوگمەکانی دابگرن- لەمەودوا دەروازەی زانیاری و بایەخی ئەوتۆیان لەسەر دەکرێتەوە تاکو بەهۆیەوە بڕیار بدەن، لە جیاتی ئەوەی کاتی خۆی لە مێشکیان دەرخیاندەکرد. دیسکێتێکی Promis لەنێو لاپتۆپێکدا دەکارێ ملیۆنان ئەلتەرناتیفی دەقاودەقت بداتێ بۆ لێهەڵبژاردنێکی زۆر لۆژیکیانە. ئەوەش وا دەکا لێوردبوونەوە لە هۆکارەکان ببەزێنێ، چونکە زۆر شتی ڕاست، بەڵام شایان نەبوو دێتە پێشەوە کە دەبوایە بە هەندی هەڵبگری کە زیرەکاتی مێشکی مرۆڤ دەرەقەتی نایەت،

بەڵام Promis دەکرێ وا بەرنامەڕێژبکرێ کە توخمەکانی هەرچی لێگەڕانی زێدەیە بەخێراییەک کۆبکاتەوە و ڕێکیانبخاتەوە کە لەسەرەوەی توانای مرۆڤەوەیە.

وەک بن‌مێناشە گوتی پێش ئەوەی پرۆگرامەکە بۆ فرۆشتن دابنرێ، دەبوایە ڕافی ئیتان توخمێکی دیکەی بۆ زیاد بکا. بن‌میناشە دەڵی بۆ ئەوێ بانگکرام و ڕۆڵێکی گرنگم لە دانانی دەریچەیەک (Trapdoor)ی چیپدار لەناو سیتمەکەدا دی، کە بەبێ ئەوەی ئەو کەسەی بەکاریدەهێنی بزانێ، ڕافی ئیتان دەیزانی بەدوای چ زانیارییەکدا دەگەڕێ .

بن‌مێناشە کەسێکی دەناسی کە ئەو جۆرە دەریچەیانە وا دروستبکا، کە نوێترین سکانیش نەتوانێ بیدۆزێتەوە. ئەو کەسە کۆمپانیایەکی بچوکی بۆ کاروباری توێژینەوە و پەرەپێدانی کۆمپیوتەر لە باکوری کالیفۆرنیاوە هەبوو. ئەو و بن‌مێناشە لە قوتابخانە بەیەکەوە بوون، ئامادەیە ئەو میکرۆچیپە بە 5000 دۆلار دروستبکا. بن‌مێناشە هەر بەخۆشی درکاندی کە نرخەکەی زۆرهەرزانە. هەنگاوی داهاتوو بەکارهێنانی سیستمەکە بوو.

ئوردن وەک گۆڕەپانی تاقیکردنەوە هەڵبژێردرا، ئەوەش لەبەرئەوەی نەوەک هەر سنوری بەسەر ئیسرائیلەوەیە، بەڵکو بەندەرێکی ئارامیشە بۆ سەرکردەکانی ڕاپەڕین. لە بیابانی شانشینەکەوە عەرەبە ڕاپەڕیوەکان دەگەیەنرانە کەناری خۆرئاوا و غەززە تاکو زیاتر پەلاماری ئیسرائیل بدەن. دوای ئەنجامدانی کوشتارگەیان تیرۆرسیتەکانی PLO بە سنوری ئوردندا دەربازدەبوون، زۆر جاران لەشکری ئوردنیش هاوکاری دەکردن.

هەر لە دەرهاوێشتەی پێشهاتەکان ئوردن ماوەیەکی زۆریش پێش ڕاپەرین بۆ مۆساد کایەی گەشەپێکردنە کردە تەکنیکارەکانیان بوون. لە ساڵەکانی حەفتادا مۆساد توانی دزە بکاتە نێو سیستمی کۆمپیوتەریIBM ی دەزگای هەواڵگری سەربازیی شا حوسێن. بەو شێوەیە زانیاری باسی دیکەیان پێگەیشت کە کەلێنەکانی ئەو زانیارییانەیان پێ پڕدەکردنەوە، کە ڕافی ئیتان

کاتسایەکی لەکۆشکی کۆماری بۆ زانیاریی دزین ناردبوو. Prpmis بەڵێنی زۆر زیاتری پێدان.

ئەستەم بوو سیستمەکە ڕاستەوخۆ بفرۆشنە ئوردن، دەبوایە چەندان ساڵ چاوەڕێ بکرابایە تا بازرگانی نێوان هەردو وڵاتەکە ئاسایی دەبووەوە. لەجیاتی ئەوە کۆمپانیایەکی ئێریل براپین بەناوی هاردۆن Hardon ئەرکی فرۆشتنەکەی لە ئەستۆی خۆ گرت. لەوکاتەی هاردۆن سیستمی کۆمپیوتەرەکانی بۆ لە بارەگای سەرەکی لەشکری لە عەمان دادەمەزراند، بۆیان دەرکەوت کە ئوردن بە سیستمێکی دیکە کە لە فەڕانسە پەرەی پێدرا بوو کاریانکردووە، بە هۆیەوە چاودێری هەڵسوکەوتی سەرکردەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینییان دەکرد. Prmis بە دزیەوە لەگەڵ سیستمە فەڕەنسییەکەوە گرێدرا. ئیدی ڕافی ئیتان لە تەلئەبیبەوە ڕاستەوخۆ بەسەر دەرەنجامەکان شاهید بوو، کە چۆن دەریچەکە نیشانیدەدان کە کامە سەرکردەی PLO لە ئوردنەوە لە ژێر چاوەدێریدایە .

قۆناخی داهاتو نۆرەی هۆنینەوەی چیرۆکی فرۆشتنی PROMIS بوو. یاسر عەرەفات وەک نمونەیەکی پێشەنگ هەڵبژێردرا. سەرۆکی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بە ڕەفتارهەڵێنەرێکی گەورە لەبواری ئاسایئشپارێزییەوە ناسرابوو. ئەو بەردەوام نەخشەکانی دەگۆڕین، هیچ جار دو شەو لەسەر یەک لە شوێنێکی دیارکراو نەدەڕازا، هەمو جارێکیش لەسەر یەک بەخۆی ساتەوەختی ژەمە خواردنەکانی لە دوا چرکەدا دەگۆڕی.

هەرجارێک عەرەفات جێگۆڕکێی کردبا، تەواوی وردەکارییەکانیان دەخستە نێو کۆمپیوتەرێکی ئاسایشپارێزی PROMIS .PLO دەستەوەستان نەبوو لە شکاندنی کۆدی ئاسایشپارێزەکە تاکو ئەوەی بۆ دەربکەوێ کە عەرەفات چ نازناوێک و چ پاسپۆرتێکی ساختە بەکاردەهێنێ. تەنانەت دەروازەی زانینی زانیاریی حیساباتی تەلەفۆنەکانیشی بە هەمو ئەو ژمارانەی تەلەفۆنی پێکردون لەبەردەستدا بوو. دواتر دەکرا پرۆگرامەکە ئەو بە تەلەفۆنی دیکە بە

هــەمان ژمــارەوە بــەراورد بكـا. بـەو جـۆرە Promis تـوانی تـەواوی پەیوەندییەكانی عەرەفات بخاتە سەر نەخشە.

كاتێك ئـەو ویسـتبای گەشـتێك بكـا، پۆلیسـی خـۆجێی لـە ئامـادەبوونی خـۆ ئاگاداردەكردەوە تاكو تەواوی ڕێكاری ئاسایشپارێزی بگرنە بەر. Promis دەیتـوانی وردەكارییـەكان لـە كۆمپوتـەری پۆلیسـی خۆجێییـەوە وەربگـرێ. ئەوسـا عـەرەفات بـۆ هـەر جێاگایـەك چووبـا و لەهـەر كوێیـەك بوایە لەبـەر چاوی Promis وننەدەبوو.

ڕافی ئیتان دەیزانی كە ئیرل برێین و بەڵێندەرەكانی ئەو ڕێوشوێنەیان نەبوو كە كەرستەكانیان لـە هەمولایـەكی جیهانـدا نمـایش بكـەن و بفرۆشـن. ئـەوە كەسێكی دەویست كە پەیوەندییەكی نێو نەتەوەییانە و وزەیەكی لە توانابەدەر و شارەزایی لە دانوستاندا هەبووایە. لە هەمو ئەو كەسانەی كـە ڕافـی ئیتـان دەیناسین تەنها یەك كەس تەواوی مەرجەكانی تێدا بوون، ئـەویش ڕۆبـەرت ماكسوێل بوو.

ماكســوێل بــە ئاســانی بــڕوای بــە كارەكــە هێنــا و - بــە شــێوازی خۆبەهەندزانینەكەی و پراكتیكیانەكە كە كاتێك بەرژەوەندی تێدابێ- ڕایگەیاند كە كۆمپانیایەكی كۆمپویتەری هەیە و دەكرێ كاری پێفرۆشتنەكانی Promis ئەنجامبدا. لە تەلئەبیب كۆمپانیایـەكی كۆمپیوتـەری بـەناوی دێگـم Degem Computers هـەبوو ڕۆڵـی بـە كـەڵكی بـۆ چالاكییـەكانی مۆسـاد گێـڕا. ماكسوێل ئەوەی بە باشزانی كـە پیـاوانی مۆسـاد جێگـەی كارمەنـدانی دێگـم بگرنــەوە، ئەوســا لقــی كۆمپانییاكــەی ناوەڕاســت و باشــوری ئامریكــا بەكاربهێنن. ماكسوێل نەوەك هەر دەرفەتی دەستكەوتی زیاتری فرۆشتنی Promisی لە ڕێی دۆگمەوە دیت، بـەڵكو سـەرەڕای ئـەوەش پێگـەی خـودی خۆی لەنێو مۆساد و نێو ئیسرائیلیشدا بەرزبكاتەوە.

لە نزیكترین سـەردانیدا بۆ ئیسرائیل، ماكسوێل هەندێ ئامـاری بیزاركردنـی لــێ بەدەركــەوتن. بــە ئــادمۆنی گــوت كــە بــەنیازە هەنــدێ لــە تێلێپاتیناســەكان(ئەوانــەی بیرۆكــەی بەرامبــەر بــەبێ دوان دەخوێننــەوە)

بەکاربهێنێ، تاکو بیرۆکەی دوژمنانی مۆسادیان بۆ دەربخەن. لەخۆیەوە دەستی بە ناوهێنانی چەند کەسانێک کرد کە بەربژاری لەناوبردن بن. دەیەویست بەخۆی کیدۆنەکان بناسێ و فێرگەی مەشقەخولیان بپشکنێ. هەمو ئەو داوا و پێشنیازانە لە لایەن ئادمۆنی بە شێوازێکی بەڕێزانە بەڵام بە پێداگرتنەوە ڕەتکرانەوە. لەنێو مۆساددا دەست بە پرسیارکردن لەسەر ماکسوێلدا کرا. ئایا ڕەفتارەکەی ئەو ڕەفتارێکی ئاساییانەی کەسێکی خۆ بەگەورە زان نەبوو؟ یان ئەوە پێشقەدەمی شتێکی دیکە بوو؟ ئایا دەکرا بگوترێ ئەو ماکسوێلەی کە زۆری بۆ ئیسرائیل کردووە هەنوکە گیانی ناهاوسەنگە و بوو بێتە پیاوێکی بێ متمانەی سەر بەگۆبەند؟

بەڵام ئەوەی گومانی لەسەر نەبوو ماکسوێل مێشکی زیرەکی پشت کردەی فرۆشتنی سیستمی Promis بوو، کە زۆر بەکاربوو. دەزگا کە سەرەتا سیستمەکەی بەدەستهێنا، بۆی دەرکەوت کە پرۆگرامەکە زۆر بە کەڵکە بۆ هەڵمەتی دژی ڕاپەڕینی فەلەستینییەکان. زۆر لە سەرکردەکانی ڕاپەڕین لە ئوردنەوە بەرەو شوێنێکی ئارام لە ئاوروپاوە ڕایاندەکرد، ئەوەش دوای ئەوەی کە کیدۆنەکانی مۆساد توانیان وەک سایە لە دوایاندا بخشێن و هەر لە ئوردنەوە ساردیان بکەنەوە.

سەرکەوتنی بەرچاو ئەوکاتە بوو کە فەرماندەیەکی ڕاپەڕینی هەڵاتو لە ڕۆماوە زەنگێکی بۆ بەیروت لێدا، بە گوێرەی کۆمپیوتەرەکانی مۆساد بۆیان دەرکەوت کە بۆمبچێنێکی دژوار لەوێ دەژی. پیاوەکە دەیەویست پسپۆڕی بۆمبچاندن لە ئەسیناوە ببینێ. ئیدی مۆساد پەنای بۆ Promis برد کە هەمو نوسینگەی گەشتیاران لە ڕۆما و بەیروتەوە بپشکنێ و بە دوای بلیت بڕینەکەی جوتە پیاوەکەدا بگەڕێ. زانیاریی زیاتر لە بەیروت ئەوەی دەگەیاند کە وەستای بۆمبدروستکردن بە کۆمپانیای کارەبا و ئاو و گازی گوتووە کە خزمەتەکانی لەسەر ماڵەکەی ببڕن، چونکە گواستویەتییەوە. دوای ئەوەی Promis لە ڕێی کۆمپیتەرەکانی PLOەوە بۆیدەرکەوت کە وەستای بۆمبچاندن لەدوا چرکەساتدا وادەی فڕینەکەی گۆڕیوە. ئەوەش وای نەکرد

گیانی لە مردن ڕزگار بکا، چونکە لە ڕێگای چوونە فرۆکەخانەی بەیروتەوە بە هۆی تەقینەوەی ئۆتۆمبێلیکی بە بۆمب چێنراو کوژرا. زۆری پێنەچوو فەرماندەکەی ڕاپەڕینیش لە ڕۆما بە کوژراوی بە هۆی 'ڕوداوێکی هاتوچۆوە' دۆزرایەوە.

لەو نێوەدا مۆساد Promisی بۆ خوێندنەوەی زانیاریی نهێنیی چەندان دەزگای زانیاریی دیکەی بەکاردەهێنا. لە گواتیمالاوە Promis ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی دەزگای زانیاریی وڵاتەکەی بە سەرانی باندی ماددە بێهۆشکەرەکان و ڕێوشوێنی فرۆشتنیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بۆ نیشاندان، مۆسادیش ناوەکانی ڕادەستیDEA و FBI کردن.

لە باشوری ئافریکاشەوە کاتسایەک لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل پرۆگرامی Promisی بەکارهێنا تاکو پەیوەندی شۆڕشگێڕانی وڵاتەکە لەگەڵ دەستە و تاقمی هاوشێوەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بخاتە سەر نەخشە. لە واشنتۆنیشەوە پسپۆڕانی Promis پرۆگرامەکەیان بۆ دزەکردنە ناو کۆمپیوتەرەکانی باڵوێزخانەی وڵاتان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و هەندێ دامودەزگای حکومەتی ئامریکاشیان بەکارهێنا. هەمان شتیش لە لەندەن، وپاریس و پایەتەختە ئاوروپییەکانی دیکە ڕویدا. سیستەمەکە بەردەوام بوو لە هەڵێنجانی زانیاریی زۆر بایەخدار بۆ مۆساد. لە 1989دا بە بەهای 500 ملیۆن دۆلار پرۆگرامی Promis بە شانشینی یەکگرتو و ئوسترالیا و کۆریای باشور و کەنەدا فرۆشرا. بڕی بەهای فرۆشتنەکە گەلێک لەوە زیاتر دەبوو گەر هاتباو CIA ڤێرشنە تایبەتەکەی خۆی بە دەزگا زانیارییە دۆستەکانی نەفرۆشتبا. MI5 ی ئینگلیزی پرۆگرامی Promisی بۆ بەدواداچوونی تیرۆرستان لە باکوری ئیرلەندا و ڕەفتارەکانی سەرکردە سیاسییەکانی Sinn Fein وەک جێری ( ئادەمز Gerry Adamsبەکاردەهێنا .

ماکسوێلیش ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخسا پرۆگرامی Promis بە UB دەزگای زانیاریی پۆلۆنیا بفرۆشێ. بۆ سەلماندنی کار لەگەڵ کردن بە گوێرەی

بن‌مێناشه، پۆلۆنییەکان ئامادەن فڕۆکەی میگ MiG 29 ی ڕوسی بۆ مۆساد بدزن. ئۆپەراسیۆنەکانی چالاکی دزینی میگی جۆری کۆنتری عێڕاقیان بەبیرهێنایەوە. ژەنەڕاڵێکی پۆلۆنی کە سەرۆکی نوسینگەیUB ی لە Gdanskبوو، بۆ یەک ملیۆن دۆلار کە بخرێتە سەر ژمارە بانکی Gitibankلە نیۆیۆرک، ئامادەبوو فڕۆکەکە بەناوی ئەوەی کە چیدیکە بۆ بەکارهێنان ناشێ لەقەڵەم بدا ، هەرچەندە فڕۆکەکە تازە لە کارگەیەکی ڕوسیاوە دەرچو. فڕۆکەکە لەبار یەک هەڵوەشێنرایەوە، لە بەرگێکی پلاستیک پێچرایەوە و لەسەری نوسرا دەزگای کشتوکاڵی و سواری فڕۆکەیەکی بارهەڵگرکرا و بەرەو تەلئەبیب فرێنرا. لەوێ جارێکی دیکە لەیەک درایەوە و لە لایەن هێزی ئاسمانی ئیسرائیلییەوە تاقیکرایەوە، بەو شێوەیە فڕۆکەوانەکان توانیان بەسەر میگ 29کانی سوریادا باڵا دەستبن.

چەند هەفتەیەکی خایاند تا ڕوسیا لە ڕێی لیستبەندییەکانی فڕۆکەکانی لە وڵاتەکانی پەیمانی وارشۆوە کردەی دزینەکەیان بۆ ئاشکرابوو. مۆسکۆ بەتوندی نارەزایی خۆی بەرامبەر ئیسرائیل نیشاندا و هەڕەشەی کرد یەکسەر کردەی کۆچکردنی جووەکان لە وڵاتانی یەکێتیی شۆرەویەوە بۆ ئیسرائیل قەدەخەبکا. حکومەتی ئیسرائیل - کە لەمێژە بە دزی هێزە ئاسمانییەکەی تەواوی فڕۆکەکەیان پشکنیوە - داوای لێبوردنی کرد بەوەی' هەندێ لە ئەفسەران لەخۆیانەوە ئەو کارە ناشایستەیان کردووە' و فڕۆکەکەیان گەڕاندەوە دەست خاوەنەکەی. لەو کەین و بەینەدا ژەنەڕالەکەی پۆلۆنی خۆی گەیاندبووە سامانەکەی لەسایەی دۆلارەکانی لە ئامریکا لێیپاڵدایەوە. واشنتۆن ڕازی بوو ناسنامەیەکی دیکە بداتە ژەنەڕاڵەکە، بەڵام بەرامبەر ئەوەی کە ئیسرائیل بهێڵێن هێزی ئاسمانی ئامریکاش فڕۆکەکە بپشکنێ.

وادەیەکی کورت دوای ئەوە ماکسوێل بە فەرمی بۆ چاوپێکەوتنێک لەگەڵ گۆرباتشۆف بەرەو مۆسکۆ فڕی. لە ڕاستیدا بۆ ئەوەبوو کە Promisبە KGB بفرۆشێ. لە ڕێگەی میکرۆچیپێکەوە 'دەریچەکەی' ئیتان سیستمەکە

دەروازەیەکی تاقانەی لەسەر ئیسرائیل بۆ چوونە نێو داتابانکی دەزگای زانیاریی شۆرەوی کردەوە، کە بەگوێرەی ڕوسەکان مۆساد باشترین دەزگای زانیاریی خۆرئاوایی بوو.

لە مۆسکۆوە ماکسوێل بەرەو تەلئەبیب فڕی. وەک هەمو جارێک وەک دەسەڵاتدارێک پێشوازی لێکرا. لە کاتی دابەزینی هەمو ئاماژەیەکی گومرگ پشتگوێخران و نوێنەریکی وەزارەتی دەرەوەش لە پێشوازی و بەخێرهاتنیدا بوو.

ماکسوێل وای ڕەفتار لەگەڵ پیاوەکەی دەکرد هەروەک کارمەندێکی لای خۆی بێ: وایکرد فەرمانبەرەکە هەگبەکەی هەڵبگرێ و لە تەنیشت شوفێرەکەش جێی خۆی بگرێ. دەیویست بزانی ئاخۆ دەستەی ماتۆڕسوارەکان لەکوێن. کاتێک گوێی لەو بەرسڤە بوو کە هیچ کامێکیان بەردەست نەبوون، گەفی ئەوەی کرد زەنگ بۆ نوسینگەی سەرەک وەزیران لێبدا تا فەرمانبەرەکە دەربکا. لەهەر ڕاوەستانێکی ترافیکی هاتوچۆدا تاکو گەیشتنە میوانخانەکە، ماکسوێل سەری دەکردە سەر فەرمانبەرە بەستەزمانەکە. لەوێوە سۆزانییە لەبەردڵەکەی چاوەڕوانی دەکرد. ئەو سوزانییەکەی بەلاوەنا و ڕەوانەی کردەوە، چونکە زۆر کێشەی لەپێشتر هەن لەوەی کەئارەزوێکی خۆی تێربکا.

بەڵێندارایەتی ڕۆژنامەکانی ماکسوێل لە لەندەن توشی کێشەیەکی دارایی گەورە ببوونەوە. بێ سەرمایە ڕژاندنێکی قەبە، زۆر نابا دەبێ دەرگای ڕۆژنامەکانی دابخا. لە شاری لەندەن کە تاهەنوکە بەئاسانی دەستی بە بناوانی پارەپەیداکردندا ڕادەگەیشت، کەچی ئێستا لایەنێکی وا شک نابا هاوکاری تەواوی بکا. پارەدارە بە ئەزمونەکان کە ماکسوێلیان دیت، هەستێکی خۆڕسکیان لاپەیدا بوو کە ئەو پیاوەی زۆری دەگوت و تاکتیکی ڕەفتار ستەمکار ئاسایانەی دەکرد لە پەنا زیرەکییە داراییەکەی خۆی شاردبووەوە و لە ڕابردوشدا وای نیشاندابوون کە چاوپۆشیان لێدەکا؛ کەچی هەنوکە خەریکە پایەکەی لە دەستدەدا. لەو ڕۆژانەدا لە بەرامبەر کەمترین

کاری نەیارانەدا تورە دەبوو هەڕەشەی دەکرد. بانکدارەکان بە زۆر لەخۆکردن لە هەمبەر تورەبوونی ماکسویڵدا خۆیان دەگرت، بەرامبەر داواکانیشی بێدەنگ دەمانەوە. لەلای بانکی ئینگلاندوBank of England و دامودەزگا داراییەکانی شارەکە دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە ماکسویڵ چیدیکە ئەو 'گرەو'ە متمانەدارە نییە.

ئەو زانیارییانە بەشێکیان بناوانیان لە ڕاپۆرتێکی باوەڕپێکراوی ئیسرائیلییەوە گرتبوو کە ماکسویڵ لە لایەن ئەوانەی کاتی خۆی پارەیان داوەتێ تاکو Mirror-group بکڕێ، خراوەتە ژێر فشارو داوای پارەکە دەکەنەوە. وادەی پارە دانەوەکە لەمێژە بەسەر چووەوە و تادەهاتیش پارەدارە ئیسرائیلییەکانیش لەسەر داواکارییەکانیان سورتر دەبوون. لە هەوڵێکدا بۆئەوەی داواکارەکان ڕابگرێ، بە مەبەستی دواخستنی بەڵینی سوێکی زۆری پێدان، کەچی ئەوان پەسندنامەیان دەرنەبڕی و ویستیان پارەکانیان بگەڕێنرێتەوە. ئەوەش پاڵنەری هاتنی ماکسویڵ بوو بۆ تەلئەبیب: هیوای وابوو بیانهێنێتە سەر ئەو ڕایە کە داواکەیان دوا بخەن، بەڵام ئاماژە پێشکاتەکان ئومێدبەخش نەبوون. لەمیانەی فڕینەکەیدا چەندان تەلەفۆنی تۆڕەی پارەدارەکانی بۆ کرا، گەفی ئەوەیان لێکرد کە پرسەکە ببەنە بەردەستی دەسەڵاتی دارایی لەندەن.

هێشتا کێشەیەکی دیکەش هەبوو، دەبووایە ماکسویڵ خەمی بخوا. ئەو برە پارەیەکی قەبەی لە دەستکەوتەکانی ORA شاردبووەوە، کە بە ڕێگەی بانکەکانی یەکێتیی سۆڤیەتەوە ڕەوانەدەکرا. ئەو پارەی پێویست بوو کە تەنگژەی دارایی Mirror-group پێڕابگرێ. هەروەها لەو کاتەی پارەی ORAتەواو ببوو، ئەو سندوقی فەندی خانەنشینی کارمەندەکانی دادۆشیبوو.

گەر هاتو هەمو ئەوانە ئاشکرا ببێ، ئەوا ڕووبەڕوی زۆر لایەن نەوەک هەر پارەدارەکانی ئیسرائیلی دەبێتەوە. کەواتە دەبێ ئەو بەرپرسیار بێ بەرامبەر ڕافی ئیتان کە زۆری پێناخۆش دەبێ و ئەزمونێکی تاڵی ماکسویڵ دەبێ.

لـە سـویتەکەی خـۆی لـە میوانخانەکـە ماکسـوێل سـەرقاڵی داڕشـتنی ستراتیژیەکەی بوو. لە پشکبوونی لە قازانجی Promis لە ڕێگای Degem ناتوانێ قـەرەبـوی قەیرانەکـە بکاتـەوە. هـەروەها بـەهۆی دەسـتکەوتەکانی ڕۆژنامـەیMaariv ی ئیسـڕائیلیش کـە هاوشـێوەیMirreorی لەندەنیـە کەلێنەکەی پێپڕناکرێتەوە. هێشتا ئەگەرێکی دیکە ماوە، ئەویش دامەزراوەی Cytex Corporationە تەلئەبیبە کە کۆمپانیایەکی زۆر بە کەڵکە لە بواری پیشەسازی گرافیک و هـی خۆیـەتی. گـەر هـاتو کۆمپانیاکە لەبەردەست بێ کەواتە دەستکەوتە قەبەکەی دەتوانێ کێشەکانی بۆ چارەسەربکا .

ماکسـوێل بـانگی سـەرۆکی دەسـتەی بەڕێوەبەرایـەتی Cytex کە کوڕی سەرۆک وەزیران ئیسحاق شامێر بوو بۆ سویتی میوانخانەکەی کرد. پیاوەکە هەواڵی ناخۆشی پێبوو: ناتوانێ بە خێرایی کۆمپانیاکە بفرۆشێ. هەرچەندە Cytexدەسـتکەوتی باشـە، بـەڵام ڕکەبەرایـەتیی نێودەوڵـەتی بـەهێزی بۆ دروسـتبوو. فرۆشتنەکەشـی کارمەنـدە پسـپۆڕ و کارامـەکانی بـێئـیش دەهێڵێتەوە، لە کاتێکدا کە ڕادەی بێکاری لە ئیسڕائیلدا بەخۆی کێشەیەکە.

کاردانەوەکـەی بـووە مایـەی توڕەبـوونێکی زۆری ماکسـوێل بـێ ئـەوەی دواهـەوڵی دەرەنجـامێکی ڕزگارکەریانـەی لێبکەوێتـەوە. لـە ڕوی تاکتیکـەوە هەڵەیـەکی گـەورە بـوو کوڕەکـەی سـەرەک وەزیـران لـە کێشـەکانی ئاگـادار بکاتەوە، چونکە ئەویش باوکی لە کێشە زۆرە داراییەکانی ماکسوێل ئاگـادار دەکاتـەوە. سـەرەک وەزیـران کـە بـە پەیوەنـدی نێوان ماکسـوێل و مۆسـاد ئاگــادار بــوو، نــاحوم ئــادمۆنی لــە پرســەکە ئاگــادارکردەوە، ئــەویش کۆبوونەوەیەکی بە کاربەدەستە نزیکەکانی کرد ئاخۆ چۆن کێشەکە بنبڕبکەن. پاشان ئەوە دەرکەوت لەسەر ئەگەری جواروجۆر گفتوگۆ کراوە.

مۆســاد دەیتــوانی داوا لــە ســەرۆک وەزیــران بکــا، نــەوەک هــەر وا لەپارەدارەکان بکا داواکەیان ڕابگرن، بەڵکو کێشەکە لە بناوانـەوە چارەسـەر بکـا، بـەڵام ئـەو پێشـنیازە ڕەتکرایـەوە، چونکـە ماکسـوێل بـە ڕەفتـارە خۆبەگـەورەزانین و بێباکانەکـەی لـە هەمبـەر شـامێردا هەلەکـەی لەدەسـتدا.

هەموان دەیانزانی كە شامێر بەهرەیەكی توندی خۆگیری پەرەپێداوە كە تەنها یەك شتی داخوازە: ئەویش چەند بكرێ لە ماكسوێل دور بكەوێتەوە.

ئەگەرێكی دیكە ئەوە بوو كە مۆساد سایانمە خۆجییەكانی لەندەن هانبدا بەهانای ماكسوێلەوە بڕۆن. ڕۆژنامەنووسە دۆستەكان هاندران كە وتاری پشتگیریكارانە لەسەر بەڕێوبەرە مەزنەكە بنوسن .

هەمو ئەو پێشنیازانە ڕەتكرانەوە. ئەو هەواڵانەی ئادمۆنی لە لەندەنەوە پێیدەگەیشتن، تەنها یەك دەرەنجامیان بە دەستەوە دەدا: زۆر لە سایانمەكان بەوە خۆشحاڵ بوون كە ئەستێرەی ماكسوێل ئاوا ببێ. بێجگە لە Mirror كەم ڕۆژنامە هەیە وتاری باش لەسەر بیچمی كەسێك بنوسێ كە ساڵانیكە مەترسی بووە لەسەر میدیاكانی دیكە.

دوا ئەگەر ئەوە بوو مۆساد سەرەداوی هەمو پەیوەندییەكانی لەگەڵ ماكسوێلدا بپچڕێنێ. لەوەیاندا سەرچڵییەك هەیە: لەو بارە ناڕەحەتە و پێشبینینەكراوەی ماكسوێلدا دەكرێ ڕۆژنامەكانی بۆ پەلامارێكی تێكدەرانە دژی مۆساد بەكاربهێنێ. لەگەڵ هەمو ئەوشتانەی ئەو دەیزانێ دەكرێ دەرهاوێشتەی ناقۆلای لێبكەوێتەوە .

لەو كەش وهەوایە ناخوازیارەدا كۆبوونەوەكە بڕیاری ئەوەی دا ئادمۆنی قسە لەگەڵ ماكسوێلدا بكات و ئەوەی بەبیر بهێنێتەوە كە بەرپرسیارە بەرامبەر مۆساد و ئیسرائیل. هەمان ئێوارە هەردو پیاوەكە لەسەر نانخواردن لە سویتی ماكسوێل لە میوانخانەكەدا یەكدیان دیت. ئایا چی لەنێوانیاندا ڕویدا، تا هەنوكە هەر بەشاراوەیی ماوەتەوە. چەند سعاتان دواتر ماكسوێل بە فڕۆكەی تایبەتی خۆی بەسەر ئەلئەبیبەوە فڕی. دواتر دەركەوت كە ئەمجارەیان دواجار بوو كەسێك ئەو بە زیندویی لەئیسڕائیلدا ببینێ .

ماكسوێل لە لەندەن دەركەوتەوە. ئەم جارەیان یەكسەر ویستی دژی تەوژمەكان Mirror-group ەكەی ڕابگرێ. لەهەوڵەكانیدا لە پارەدارێكەوە بۆ پارەدارێكی دیكە بۆ دەرچوون لە تەنگژەكەی وەك حاڵگرێكی دەروێشانەی لێهاتبوو. ویستی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئادمۆنی قسان بكا، هەمو

جارێک سکرتێرەکەی بەڕیوەبەری گشتی دەیگوت کەوا 'چیکییێکی بچکۆلە' – نازناوی ئەو بوولای مۆساد – لەسەر هێڵە. ئایا چی لە میانەی ئەو تەلەفۆنکردنەوە گوترا، بە شاراوەیی مایەوە.

کاتسایەکی ئەوکات ئاماژەیەک دەکا پەردە هەڵدانەوەکە بەو شێوەیە دەردەخا. ڤیکۆتۆر ئۆستروڤسکی بڕوای هێنا کە ماکسوێل ناچارکراوە پارەکە بداتەوە: ئەو سەرمایە قەبەیەی لە سندوقی خانەنشینی کارمەندانی Mirror group شاردراوەتەوە، هەرئێستا بگەڕێنرێتەوە. هەروەها ماکسوێل وا تێگەیەندراوە کە مۆساد لەبەر ئەو هەوڵی بەردانی ڤانونو دەدا، تاکو ئەو بتوانێ بیباتە لەندەن و بەخۆی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکا و لە ڕۆژنامەکانی بڵاوبکاتەوە. چیرۆکەکەش دەبێتە مایەی پەشیمانبوونەوەی ڤانونو، واش لەقەڵەمدەدرێ کە ئیسرائیل نەتەوەیەکی لێبوردەدەیە. بەو شێوە چالاکییە بزۆزییانە، ماکسویل پێیوابوو کە Mirror group دەبوژێنێتەوە و دەرگاکانیش لە لەندەن کە تاکو ئێستا لەسەری داخرابوون، دەکرێنەوە.

ئۆستروڤسکی بە تەنها نەبوو کە لەسەر ئەو باوەرە بێ کە ئەو پێشنیازە بێڕێزییەیان بۆ ماکسوێل، لە دواییدا وای لێدەکا ببێتە پڕۆژەیەکی دژواری بێ سەرپەرشت.

لە 30 سێپتامبەری 1991دا لە تەلەفۆنە هەراسانکەرەکانی ماکسوێل بەڵگەیەکی نوێی گومانەکانی دەستکەوت. ئەمجارەیان ماکسوێل هەوڵی نەدا گەفەکانی لە پەنا پەیڤەکانیدا بشارێتەوە. باری دارایی تادەهات خراپتردەبوو، هەروەها ببووە مایەی پرسیار لەسەر کردن لە میدیا و لەپەرلەمانی بەریتانیدا، کە ئەو توانیبووی لە ڕێی پارێزەرە گران بەهاکان و پێواژۆی گەندەڵی لەخۆی بەدور بگرێ. ماکسوێل ئەم جارەیان گوتی گەر بێتو مۆساد پارەی سندوقی خانەنشینی کارمەندەکانی نەداتەوە، ئەوا گرەنتی ئەوە نادا چیدیکە دیدارە نهێنییەکەی ئادمۆنی لەگەڵ فلادیمیر کریجوتشکوف Vladimir Krjoetsjkovی بەڕێوبەری گشتی پێشوی KGB بەشاراوەیی بهێڵێتەوە. کریجوتشکوف هەنوکە لە زیندانێکی مۆسکۆ چاوەڕێی

دادگاییکردنیـەتی بـە تۆمـەتی هـەوڵێکی لـەبارچووی لەسـەر کـارلادانی گۆرباتشۆف. لە قۆناخێکی گرنگی کودەتایەکەدا، دیدارەکانی ئادمۆنی لەگەڵ ناوبراودا لـە سـەرپشـتی بەلەمەکـەی ماکسـوێلدا لـە زێی ئادریاتیکدا بـووە، ئەوەش کەمێک پێش دەستپێکردنی کودەتایەکە بوو.

لەو دیدارانەدا مۆساد بەڵێنی ئەوەی داوە کە ئیسرائیل دەستڕۆیشتنی خۆی لە وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئامریکـا و ئاوروپـادا بـەکاردەهێنێ، بـەڵکو ددان بـە ڕژێمە نوێکەدا بهێنن. لە بەرامبەردا فلادیمیر کریجوتشکوف پەیمانـدەدا کـە هەمو جووەکانی یەکێتیی شۆرەوی بەرەو ئیسرائیل کۆچبکـەن. گفتوگۆیەکـە لەخۆڕا نەبوو کە کرا. گەر بهاتباو دۆزەکە ئاشکرا ببـا، ئـەوا دەبـووە مایـەی زەبر وەشاندنێکی گەورە لە ڕاستگۆییەتی ئیسرائیل لەبەردەم ڕژێمی مۆسکۆ هەروەها ئامریکاش.

ئیدی کاتەکە دواتر هی ئەوە بوو کە ئۆستروڤسکی بنوسێ ' قسەکردنێکی ئاساییانە لەنێو بچمە ڕاسـتڕەوکان لـە بارەگـای سـەرەکی مۆسـاددا ئـەوەی لێکەوتەوە کە بە نهێنی بڕیار لەسەر نەمانی ماکسوێل بدەن' .

گەر بێتو قسەکەی ئۆستروڤسکی ڕاست بووایە ، کـە ئیسـرائیل هـەرگیز بـە فەرمی ڕەتی نەکردۆتەوە، ئەوا ئەوە لێکنادرێتەوە کە گروپەکە بە پێی ڕای دەستەی سەروتری خۆی سەودای نەکردووە، هەروەها لەگەڵ بێدەنگبوونە پەسندنامەکەی خودی سـەرەک وەزیران، کە پیاوێک بووە زۆر جاران دەستی لە لەناوبردنی دوژمنانی ئیسرائیلدا هەبووە .

کێشـەکە بـۆ مۆسـاد لەگـەڵ بڵاوکردنـەوەی کتێبـە زانیـاری درکاندنەکـەی Seymour M. Hersh بـە نـاوی The SamsonOption:Israel, America and the bomb پڕ فشـارتر دەبـوو، کـە ئـەوەی درکانـدبوو چۆن ئیسرائیل زۆر بە نهێنی پەرەی بە تواناکانی خۆی دا تا بوو بە هێزێکی ناوەکی. بە بڵاوکردنەوەی کتێبەکە لە هەمولایەک هێرشکرایە سـەر مۆسـاد. هەرچەنـدە لێکۆڵینەوەکـەی Hersh هیچـی تێدا نەهێشـتەوە، بـەڵام مۆسـاد

وەستایانە بە بێدەنگبوون مامەڵەی لەگەڵدا کرد - پەندی هەڵەی پەنابردنە بەر داداگا لە دژی کتێبەکانی ئۆسترۆڤسکی بەکار بوو - .

لێرەدا کێشەیەک هەبوو: هێرش ئاماژەی بە پەیوەندییەکانی ماکسوێل لەگەڵ مۆسادا کردبوو. ئەوەش بەزۆری دەستتێکەڵکردنەکانی Mirror group بوو لەگەڵ چیرۆکی مۆردەخای ڤانونو، پەیوەندییەکانی نێوان نیک داڤیس، Ora ئیرانگێت و ئاری بن‌مێناشە. هەروەک ڕەچاودەکرا ماکسوێل لە ڕێی پارێزەرەکانی داوا لەسەر هێرش و دەزگای پەخش بەرز بکاتەوە. هێرش کە لەو بارەدا وەستا بوو پاداشتیPulitzer Prizeی بەدەستهێنابوو، وای نەکرد کەس قەڵسی بکا. لە پەرلەمانی لەندەن پرسی دڕکاوی سەبارەت بە پەیوەندییەکانی ماکسوێل لەگەڵ مۆسادا دەکران. گومانە کۆنەکان سەریانهەڵدایەوە. پەرلەمانتارەکان دەیانەویست بزانن – لە کاتی پێویستدا لە ڕێگەی داوای زێدەمافی پەرلەمانتارێتیان- ئاخۆ تاچەند ماکسوێل بە چالاکییەکانی مۆسادی لە نێو شانشینی یەکگرتودا زانیوە. ڤیکتۆر ئۆسرتۆڤسکی نوسی:' بەڕەی ژێر پێیەکانی ماکسوێل ڕادەکشرا' .

ئۆستڕۆڤسکی دەیگوت سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی پلانی لەناوبردنی ماکسوێل لە لایەن مۆسادەوە بەندە بە ڕاکێشکردنی ماکسوێل بۆ شوێنێک کە پیاوەکانی مۆساد بتوانن دەستیان بگاتێ. ئەو جۆرە پلانەش وەک کوشتنی مەهدی بن‌بەرکە لە پاریس دەنگۆی زۆری لێدەکەوێتەوە .

لە 29ی ئۆکتۆبەری 1991دا ماکسوێل تەلەفۆنێکی لە کاتسایەکی سەربە باڵویزخانەی ئیسرائیل لە مەدریدەوە بۆهات: داوای لێکرا ڕۆژی پاشتر بچێتە ئیسپانیا. بە گوێرەی ئۆستڕۆڤسکی کاتساکە بەڵێنی بە ماکسوێل دا ' چارەی کێشەکانی بەبێ ترس، بۆ بکا. ڕێنمایی پێگەیشت کە بەرەو جەبەلتاریق بفڕێ و لەوێش بچێتە سەر پشتی بەلەمەکەی کە بەناوی The Lady Ghislaineەوەیە. لەوێ دەبوایە فەرمان بە تاقمی بەلەمەکە بدا بەرەو دورگەکانی کەناری لێبخوڕن ، ' لەوێ چاوەڕێی پەیامی دیکە بکا' .

ڕۆبەرت ماکسوێل بەمە ڕازی بوو.

له 30 ئۆکتۆبەردا چوار ئیسرائیلی گەیشتنە بەندەری ڕەبات لـە مـارۆکۆ. لەوێ خۆیان بە گەشتیار (توریست) نیشاندا کە بۆ پشوی ماسی هاتون و بەلەمـەماتۆڕێکی گرانبـەهایان بـەکرێ گـرت. ڕاسـتەوخۆش ڕویـان لـە دورگەکانی کەناری کرد.

له 31ی ئۆکتۆبەردا لەو کاتەی بەلەمەکەی ماکسوێل لە بەندەری Santa Cruzی گەورەترین دورگەی کەناری Teneriefe لەنگەری گرتبوو، بە تەنها فراوینی لە Hotel Mercy دەخوارد. دوای خواردن کەسێک چوە لای و پاش کەمێک لەبەرچاوان ون بوو. ئایا ئەو کێ بوو؟ ئایا باسی چیان کرد؟، ئەوە بەشێکی ڕازی پەنهانی دوا ڕۆژەکانی ڕۆبەرت ماکسوێل بوو. کەمێک دواتر گەڕایەوە نێو بەلەمەکەی خۆی و فەرمانی بەهاژۆتندا دا. سی و شەش سعاتی داهاتو بەلەمەکە The Lady Ghislaine بە خێرایی جۆراوجۆر لەنێو دورگەکاندا دەسوڕایەوە. ماکسوێل بە کاپتنەکەی گوت کەوا هێشتا بیردەکاتەوە ئاخۆ دەرچوونی داهاتویان بەرەو کوێ بێ . پیاوەکانی سەر بەلەمەکە هەرگیز ماکسوێلیان وا بێ بڕیار نەدیتبوو.

له وتارێکی گرانبەها و هەواڵێکی تایبەتیانەی جیهان بڵاو لە ژێر ناونیشانی 'چۆن و بۆچی ڕۆبەرت ماکسوێل کوژرا' ڕۆژنامەی ئینگلیزی Business Age دواتر نوسی ' کەوا دو کۆماندۆی مەرگچێن بە شەو کە بە بەلەمە ماتۆڕەکایان بەدوای بەلەمەکەی ماکسوێلەوە بوون، خۆیان فڕێدایە سەر بەلەمێکی چوپ تاکو لە The Lady Ghislaine نزیک ببنەوە. لەوێ خۆیان هاوێشتە سەر پشتی بەلەمەکەی ماکسوێل و دیتیان لەپشتەوەیە. ئەنجا ماکسوێلیان بەرزەفتکرد تا هاواری فریاد ڕەس نەکا. کاتێک دەرزییەکیان لەدەماری ملی ماکسوێل دا، تەنها خولەکێکی خایاند تا مرد' .

ڕۆژنامەکە بەو دەرەنجامە کۆتایی بە وتارەکەی هێنا کە تەرمی ماکسوێلیان فڕێداوەتە ناو ئاوەکە و بکوژەکانیش بە بەلەمە ماتۆڕەکەیانەوە تێیان تەقاند و دەرچوون. شانزە سعاتی خایاند تا تەرمی ماکسوێلیان دۆزییەوە،

ئەوماوەیەش بەس بوو تا جێی دەرزییەکە لە تەرمەکەیدا بەهۆی قەپاڵی ماسیەکان بشێوێندرێ و نەناسرێتەوە .

بە دڵنیاییەوە لە شەوی 4لەسەر 5ی نۆڤێمبەردا هەمو ئەو کێشانەی مۆساد بە هۆی ماکسوێڵەوە توشی دەهاتن، بە شەپۆلە ساردەکانی زەریالوشی ئەتلەنتیدا چوون و لەکۆڵبوونەوە. دواتر لێکۆڵینەوەی پۆلیس و پشکنینی تەرمەکە لە لایەن دەستەڵاتدارانی ئیسپانیاوە کۆمەڵێک پرسیاری وروژاند.

ئایا بۆچی تەنها دوو لە یانزە کەسی تاقمی بەلەمەکە بێدار بوون؟ ئاساییانە ئێشکگری شەوان بە پێنج کەس ڕاسپێردرا بوو. ئایا ماکسوێڵ پەیامە فاکسدارەکانی لە کاتی سعاتە بەسەربردنەکانی ئەوێی بۆ کێ دەناردن؟ ئایا کۆپی ئەوانە چییان بەسەرهات؟ بۆچی تاقمی بەلەمەکە ئەوەندە کاتەی پێویست بوو تا بزانن ماکسوێڵ لەسەر پشتی بەلەمەکە نەماوە؟ ئایا بۆچی دەبوایە حەفتا خولەک چاوەڕوان بووبا تاکو هۆشدارکردنەوە لێبدا؟ تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەرسڤێکی بڕواپێهێنەرانە نەدراوەتەوە.

سێ تەرمپشکنەر فەرمانیان پێدرا کاری خۆیان بکەن. ئەوان دەیانویست کۆئەندامە بەهێزەکان هەندێ خانەی بنێرنە مەدرید بۆ زیاتر لێکۆڵینەوە. پێش ئەوەی ئەوکارە بکرێ، ماڵباتی ماکسوێڵ کەوتەخۆ. پێویستە تەرمەکە بشورێ و دەستبەجێش بگەنرێتە ئیسرائیل بۆ ناشتنی. دەسەڵاتی ئیسپانی لەسەر داواکە هیچ نارەزایەتیان نیشانندەدا، بۆ ئەوان ئەوە کارپێکراو نەبوو. ئایا کێ و چۆن بڕوایان بە خێزانەکەی هێنا کە بەو پەلەییە وا بکەن؟

لە 10ی نۆڤێمبەری 1991دا تەرمی ماکسوێڵ لە گردی زەیتون لە ئۆرشەلیم کە دوا ئارامگای کەسە هەرە ڕێزلێگیراوەکانی نەتەوەکەیەوە نێژرا. ڕیتوێلەکە هەمو ئاماژەکانی ناشتنی دەوڵەتمەداریانەی تێدا بوو، ئەندامانی حکومەت و ئۆپۆزسیۆن ئامادەی بۆنەکە بوون. بەکەمی شەش کەس لە سەرانی پێشوی دەزگای زانیاریی ئامادەبوون و گوێیان لە وتەکەی ماڵئاوایی خودی شامێری سەرەک وەزیران گرت کە دەیگوت: 'ئەو زۆرتری بۆ ئیسرائیل کرد لەوەی ئێستا بۆی دەکرێ' .

لەنێو ماتەمگێڕەکاندا پیاوێک بە قاتێکی ڕەشی سادە و کراسێکی هاوشێوە دەبینرا، کە هەمو قۆپچەکانی تەنها هی سەرەوە نەبێ لە بەر سەرما داخستبوون. ئەو پیاوە لاوازە بە ئاستەم 150سانتیمەتر درێژ و پەنجا کیلۆ قورس دەبوو، لە کریستیانەکانی لوبنانەوە بوو. پیتەر ئیبراهیم Peter Ibrahim قەشەیەکی مام ناوەندی بوو. ئەو بۆ وەزارەتی دەرەوەی ڤاتیکان کاریدەکرد.

ئامادەبوونە بێدەنگییەکەی ئەو نەوەک هەر ڕێزلێنان بوو لە مردنی ڕۆبەرت ماکسوێل، بەڵکو سەلماندنێکی پەیوەندیی نهێنی تائێستاشی لەگەڵدابێ نێوان بارەگای کورسی پیرۆز و ئیسرائیل بوو. ئەوەش تەواو پڕبەپێستی گریمانەکەی مایر ئامیت بوو کە درکاندی بۆ هاوکاریکردنی دەزگای زانیاریی هیچ سنورێک لەگۆڕێدا نییە.

# 11

## هاوپەیمانێتی ناپیرۆز

{ ڤاتیکان.. گۆلدا مایرو پاپا.. مۆسادو کورسی پیرۆز.. گۆلدا مایر لە رۆما ناکەوێتەبەر.. زانکۆی لۆمۆمبا یان.. پەیوەندیە گەرم و توندوتۆڵەکەی نێوان سیاو بارەگای کورسی پیرۆز.. هاتنو رۆیشتنی پاپا.. عەرەفاتو پاپا.. محەمەد عەلی ئاگجای تورک پاپا دەداتە بەر گوللە..گورگە بۆرەکان.. گۆرەپانی ڤاتیکان و رۆژی حەشر..}

هەر لەبەراییەوە سەرەک وەزیرانە یەکبەدواییەک هاتووەکانی ئیسرائیل بە مژاری پاپا کە وەک تاکە مەزنی تا لە ژیاندا ماوە هەڵدەبژێردرێ، مینای سەرکردەیەکیش لە بەرامبەر دەسەڵاتی قانونندانان و دادوەریدا بەرپرسیار نییە، سەرسام بوون. وەک تاکە مەزنی وهەرەمی دەستەڵات سەرۆکی قەشان دەستڕۆیشتنێکی زێدەی لەبواری ئابوری، سیاسەت، ئایدیۆلۆژیای جیهانی نەوەک هەر لەسەر بڕوادارانی ڕۆمی کاسۆلیک بەڵکو لەسەر باقی دیکەی دنیاش هەیە. جارێکیان داڤید بنگۆریۆن بە منگەمنگێکەوە گوتی: 'ئەوە شتێک نییە کە خەڵک باس لەوە بکا ئایا پاپا چەند لەشکری لەبەردەستن، تۆ پێم بڵێ دەتوانێ چەند خەڵک بە هاواریەوە بێ' .

مۆسادیش بە تایبەتی بە شێوەی کاری نهێنییپارێزی ڤاتیکانەوە سەرسام بوو . کۆمەڵگەیەکی داخراوی دزە بۆ نەکراوە، هەر شتێک کورسی پیرۆز بیکا بە پەنهانی دەیهێڵێتەوە. جاری وا هەیە چەند مانگی پێدەچێ تا تیشک بخرێتە سەر ئەو ئاماژانەی کە پاپا پەیوەستە بە دەستپێشخەریەکی سیاسیانە، خۆ تەواوی چیرۆکەکەش هەر ناگێڕدرێتەوە. هەر بەڕێوبەرێکی گشتیی مۆساد خواخوای بوو ڕێگایەک بدۆزێتەوە تاکو ئەودیوی پەردەکەی پێببینێ، بەڵام هەمو تەقەللاکانی چ مۆساد چ حکومەتی ئیسرائیل بۆ

بەدەستهێنانی پەیوەندییەکی گونجاوی کار لەگەڵ ڤاتیکاندا بە بەڕێزی، بەڵام بە یەکلاکەرەوەیی ڕەتدەکرایەوە.

کێشـە ئـەوەبوو کـە لـە نێـو دامودەزگـای پایـەی کورسـی پیـرۆز مینـای وەزارەتی دەرەوەی وڵاتان بوو، لایـەنگری بـەهێزی دژە ئیسـرائیلی لێبـوون. ئەو مۆنسێنیورانە( Monseigneur پایەکی بەرزی ڕوحانییەکانی ڤاتیکانە ) لەژێر بەرگە پان و پۆڕەکەیان بێگۆڕان لەسـەر غـەززە و کـەرتی خـۆر ئـاوا وەک 'ناوچە داگیرکراوەکان' و بەرزاییەکانی جۆلانیش وەک ' لکاندنی خـاکی سوریا' یان دەدوان. لە سعاتەکانی ئێوارەدا لـە شـارە- وڵاتـە بچکۆلەکـەیان سـەردانی عەرەبـە خواپێداوەکانی باڵەخانـەکانیVia Condott لـە ڕۆمـاوە دەکرد، یان دەچوونە لایان و لـە Pizza Navara بـە کۆکتێل خواردنـەوە گوێیان لە خەونی لە گۆڕنانی ئیسرائیل دەگرت.

قەشـە دیپلۆماتـەکان زۆر ئاگایـان لـە وشـە دەربڕینـەکانی خۆیـان بـوو، دەیانزانی کە دەوڵەتی جو لە هەمولایەکەوە چاوی بۆ چاوەدێری، گوێلێگرتن، ڕەنگبێ تۆمارکردن و وێنەگرتنیش هەبێ. یەکێک لە ڕێنماییە هاندەرەکان لە وەزارەتـی دەرەوەیـان کـاتێ هـەر کەسـێکی نوێ دێ ئـەو پۆسـتە وەربگری ئەوەیە کە ' دەبێ بەردەوام ئاگای لەخۆ بێ نەوەک چاوی لەسەر بێ و گوێی بۆ هەڵبخرێ'، بە تایبەتیش پۆلیسی ئـەو وڵاتانـەی کـە ڤاتیکـان دیپلۆماتیانـە نەیناسیوە'. ڕەنگبێ ئیسـرائیل لـە سـەرەوەی لیسـتی ئـەو وڵاتانـە بـێ. دوای هەڵبژاردنی لە 1978دا پاپا یۆهانس پاولی دوهـەم سـەلماندییەوە کە دەبێ جارێ کار وا بڕوا. دواتر زۆر بـە درەنگـەوە پایـە و شـکۆی پاپـا لـە دواییـدا بڕیاریدا بە تـەواوی ددان بـە پایـەی دیپلۆمـاتی ئیسـرائیلدا بنـێ. قەشـە ئـەو زانیارییانەی لەسەر ئیسرائیل بۆ پاپا دەچوون، بەردەوام لەسەرچاوەی قەشە دیپلۆماتەکان لە عەرەبانەوە بوو. دوای گەڕانەوەی قەشـە دیپلۆماتـەکان لـە سەردانەکانیان دەچوونە نهۆمی سێهەمی کۆشکی پاپایی کە پڕ بوو لە گڵۆپی چرای گازی، بەڵام دەلاقـەی هـەوا نوێکردنـەوەی زۆر بـاش نـەبوو بارەگـای دیپلۆماتیـان بۆ گواسـتبووەوە. ئـەو بەشـە بەرپرسـیار بـوو لـە پیـادەکردنی

سیاسەتی دەرەوەی کورسی پیرۆزی پاپا. بیست نوسینگەکە ئەوەندە کاریان لەسەر دۆکیومێنتەکان دەکرد هەروەک وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە گەورەکان، هەروەها هێشتا ڕێسای بەرفراوانکردنی جێپەنجەی دیپلۆماسیانەی ڤاتیکانیان لەبەردەستدا بوو.

نوسینگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان لە شوێنێکی بچووک بوو کە دەیڕوانییە گۆڕەپانە قەشەنگەکەی San Damaso لەناو جەرگەی کۆشکە گەورەکە. یەکێک لە بەڵگەنامە نوێکان کە خرایە بەردەستی پاپای نوێی پۆلۆنی، داوایەکی باش بەڵگەوبەندکراو بوو بۆ بە نێودەوڵەتیکردنی ئۆرشەلیم و پاراستنەکەشی بە نەتەوە یەکگرتووەکان بسپێردرێ، کە لەمیانەیدا ڤاتیکان بەرپرس دەبێ لە پیرۆزگاکانی کریستیانی. ئەو هەواڵەش لە 1979دا دوای ئەوەی کۆپییەکی لە ڕێی مۆنسێنیورێک بۆ دەوڵەمەندێکی گەورەی کریستیانی لوبنانی ئاکنجیبوی ڕۆما گەیشتە تەلئەبیب. کاتسایەک کە کارمەندێکی پیاوە دەوڵەمەندەکە بوو شتەکەی گەیاند. پێشنیازی بە نێودەوڵەتیکردنی ئۆرشەلیم مناحیم بێگنی هاروهاجکرد، فەرمانی بۆ بەڕێوەبەری گشتی ئەوکاتی مۆساد ئیسحاق هۆڤی دەرکرد کە تەقەللاکانی بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ ڤاتیکاندا دوهەند بکا.

هەر دو پیاوەکان زانیان چی ڕویداوە، دواجار کە مۆساد بەو ئاراستەیە هەنگاوی هەڵهێنا، لە ژێر دەمامکی سەردانی سەرۆکی حکومەتی پێش مناحیم بێگن گۆلدا مایری ناودار بوو.

لە کۆتایی 1972دا گۆلدا مایر وەڵامێکی لە پاپا پاولی شەشەم وەرگرتەوە: کە ئەو ئامادەیە کورتە چاوپێکەوتنێکی تایبەتیانەی شکۆدارانەی لەگەڵدا بکا. لە دیسێمبەری هەمان ساڵ، لە کۆبوونەوەی هەفتانەی کابینەی حکومەتدا وەزیرەکان پرسیان ئایا ئەو دیدارەی لەگەڵ پاپادا هیچی لێدەکەوێتەوە، لەوەش هەرگەڕێ کە گۆلدا مایر بە 'ستراکتۆری مارکسیستیانەی دارودەستەی پاپا سەرسامە. لە سەرەتاوە کاریگەری ڤاتیکان لە ڕوی داراییەوە بێ هاوتایە. دوهەمیش کاری ئەوێ بەبێ جوڵانی پارت و

سـەندیکاکان دەکرێ. هـەمو دامودەزگاکـەیان لەسـەر دەسـتەڵاتەوە بەنـدە، حکومەتی پاپا فەرمان دەداتە کاردینالەکان، کاردینالەکانیش فـەرمان بەسـەر سـەرەک قەشـەکان Bishop دا دەکـەن، ئـەوانیش بەسـەر قەشـە و پیـاوە ئایینییـەکانی دنیـای کریسـتیانیدا. ئـەو هـەمو وەزارەت و کۆمسـیۆن و ستراکتۆرەی سیستمەکە دەکرێ لەبار بێ بۆ چالاکی جاسوسیانە و زانیاریی کۆکردنەوە' .

ڕۆژی پێشوازی شکۆیانە سەرلەبەیانی 15ی یانیوەری 1973دیاریکرا. بە گۆڵدا مایر گوترا کە دقاودەق 35 خولـەکی مـاوەهەیـە بۆ قسـەکردن لەگەڵ پاپا، لە کۆتایی بۆنەکەشـدا دیـاری بەیەکدی دەگۆڕنـەوە. بۆ چاوپێکەتنەکـە ئەجینداپەکی پڕ وردەکاری نەبوو، بەڵام گۆلدا مایر هیوای وا بوو لە میانەی چاوپێکەوتنەکەدا پاپا بهێنێتە سەر ئەو ڕایە کە سەردانی ئیسرائیل بکا. هۆی فەرمیش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە پاپا وتارێکی ئۆلیانە بۆ نزیکەی سەد هەزار کریستیانی عەرەبی وڵاتەکە بدا. گۆلـدا مـایر دەیزانـی کـە سـەردانی پاپـا بۆ وڵاتەکەی زیاتر ڕوی ئیسرائیل لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا سپیدەکاتەوە.

لەبەر هۆکاری ئاسایشیی، پێشکات چاوپێکەوتنەکان ڕانەگەیەندران. دوای سەردانی گۆلدا مایر بۆ کۆنگرەی سۆسیال ئینتەرناسیونال لـە پـاریس، بـە فڕۆکـەی ئـەلعال دێتـە ڕۆمـا. ئەوسـا لـە کـاتی فڕینەکـەدا بـە ڕۆژنامەنوسـان ڕادەگەیەنرێ کە گۆلدا مایر سەردانی ڤاتیکان دەکا.

زڤی زامیر Zvi Zamir بەڕێوبـەری گشـتی ئـەوکاتی مۆسـاد بـەرەو ڕۆمـا فڕی تا بەخۆی ڕێوشوینی ئاسایشپارێزی بپشکنێ. شارەکە مۆڵگەی تـاقم و باندە تیرۆرستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاوڕوپا بـوو. هـەروەها ڕۆمـا لـەو کاتـەدا وێسـتگەیەکی گوێلێهەڵخسـتنی گرنـگ بـوو بـۆ مۆسـاد، چونکـە سـەرقاڵی ڕاوکـردن و بـەدواداچوونی تاوانبـارانی کوشـتارگەی یاریزانـە ئیسرائیلییەکانی ئۆلۆمپیادی مونشن بوو .

زامیـر باشـترین کاتسـای لـە ڕۆمـا مـارک هێنسـەرMark Hensser ی ڕاسپارد دزە بکاتە نێو گەورەترین کۆمەڵگای عەرەبی لەوێدا. لە شاری میلان

Milanیش کە مەکۆیەکی دیکەی جموجۆڵی تیرۆرستان بوو شای کاولای Shai Kaulyکاتسای پرئەزمونی ناردە ئەوێ. دوای ئەوەی زامیر وادەی نزیکبوونەوەی سەردانەکەی پێڕاگەیاندن، هەردوکیان هاتنە ڕۆما و بوونە یاوەری زامیر.

لە 1945دا(OSS (Office of Strategic Service کە دواتر CIA جێگەی گرتەوە، بە گوێرەی سەرکردەی OSS لە نوسینگەی ڕۆما James Angleton' Jeus باوەشی ڤاتیکانیان بۆ کراوەبوو'. پاپا پیۆسی هەوتەم و حکومەتەکەی داوایان لە ئانگلتن کرد کە دەستی هاریکاریان بۆ لەشکری خاچدارانە دژی کۆمیونیزم درێژ بکا و مشوری ئەوە بخۆن پارتی دیموکراتی کریستیانی لە ئیتالیا بێتە سەر دەستەڵات. ئانگلتن کە ئۆلدارێکی ڕۆمی کاسۆلیک بوو هەمو شێوازە بەردەستەکانی بەکارهێنا تا دەنگدەران بکڕێ، یان دەماریان بگرێ و بیانترسێنی بۆ ئەوەی دەنگ بۆ پارتی دیموکراتی کریستیانی بدەن. ئەو دەرویەکی بێکلیلی لە ڤاتیکان بۆ زانیاریی کۆکردنەوە لە هەمو ئیتالیادا لەسەر کرابووەوە، هەر هەمو قەشە و پاستۆرەکان ڕاپۆرتیان لەسەر جموجۆڵی کۆمۆنیستان لە ناوچەی کڵێسەکانیان کۆدەکردەوە و بۆ ڤاتیکانیان دەنارد. دوای ئەوەی ڤاتیکانیش زانیارییەکانی هەڵدەسەنگاندن، ئەنجا بۆ ئانگلتنی دەناردن، ئەویش یەکسەر بۆ واشنتنی بەڕێدەکردن.

لەوێش زانیارییەکان بۆ پشتڕاستکردنی ترسی وەزارەتی دەرەوە لەوەی کە یەکێتیی شۆرەوی مەترسییەکی گەورەیە لەسە ڕۆژئاوا، بە تایبەتیش لە ماوەیەکی درێژدا، بەکار دەهات. ئانگلتن فەرمانی پێدرا کە هەمو شتێک بکا بۆ ڕێگرتن لە چالاکی بەرگریانەی کۆمۆنیستان نەوەک حزبەکەیان لە ئیتالیادا بێتە سەر تەخت. ئانگلتنیش بە مەرەدی پاپا چووبوو لە تۆقان لە دیوزمەی مەترسی کۆمۆنیزمی جیهانیی کە گۆی زەوییان بەسەر دو بەرەی سەرمایەداری سۆشیالزم دابەشکردبوو، کە ئایدۆلۆژی هەردو سیستمەکەش هەرگیز بە ئاشتی لەگەڵ یەکدا هەڵناکەن. ستالینیش لەوەی زیاتر نەدەگوت .

پاپا لەو باوڕەدا بوو كە كۆمۆنیستەكانی ئیتاڵیا سەری ڕمن بۆ هەڵمەتێكی زیانبەخش بە كەنیسە گەر بۆیان هەڵبكەوێ. دیدارە بەردەوامەكانی نێوان پاپاو ئانگلتنی دیندار بە زۆری لەسەر دێوەزمەی كۆمیونیزم بوو. پاپا بە ڕاشكاوانە بە ئانگلتنی ڕاگەیاند كە دەبێ وڵاتە یەكگرتووەكانی ئامریكا هەر شتێكی لەدەستدێ بكا، تا مەترسی كۆمۆنیزم لەبەین بەرێ. پاپا كە بە بەرجەستەكردنی ئاشتی لە جیهاندا سەیر دەكرا، لایەنگرێكی بە جۆشی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئامریكا بوو بۆ ڕابەرایەتی شەڕی سارد.

لە ساڵی 1952دا جڵەوی نوسینگەی OSS كە بووە CIA كەوتە بەردەست ئۆلدارێكی دیكەی ڕۆمی كاسۆلیك، ئەویش ولیەم كۆلبی William Colby بوو. هەر ئەویش بوو مێشكی وستایانەی پشت چالاكییەكانی CIA لە ڤاتیكاندا. كۆلبی پەیوەندییەكی دۆستانەی لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەیان، كۆنگرەكانی ڤاتیكان و كۆمسیۆنەكانیان ڕایەڵی تەونی چاوی زانیاریهێنانی ڕاچاند. ئەوانیش یارمەتی CIA یاندا بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژە جاسوسێتی یەكێتیی شۆرەوی پێشێلكارییەكان لە هەمولایەكی جیهاندا. قەشەكان بەردەوام ڕاپۆرتیان لەسەر ڕەوشەكە بۆ ڤاتیكان دەنوسی. لە هەندێ وڵاتی وەك فیلیپین كە كۆمۆنیستەكان هەوڵیاندەدا جێپێیان قایم بكەن، ئەو وڵاتە لەوەتەی دەستەڵاتی ئیسپانیایان لە سەدەی شانزەهەمەوە بەسەرەوە بووە، نەتەوەیەكی ڕۆمی كاسۆلیكی بوو، CIA توانی دژە هێرشەكانی ئامانجی خۆیان بپێكن. پاپا پێیوابوو كە توندوتیژی وەك خراپەكارییەكی ناچاریانەیە كاتێكیش وڵاتە یەكگرتووەكانی ئامریكا ئەو كردەوە 'خەمناكانە بەڵام پێویستانە' بەكارنەهێنێ وەك پاپا ناوی دەبرد، ئەوا جیهان دەیان ساڵی دیكە دەبێ لەژێر باریدا بناڵێ.

لە ساڵی 1960دا ڕۆژگارێكی نوێی پەیوەندیداری CIA لەگەڵ ڤاتیكاندا دەستیپێكرد. كاتێك كاردینال مۆنتینی Montini كە لە میلانەوە هاتبوو، سێ ساڵ دواتر بوو بە پاپا پاولوسی شەشەم Paulus VI ناوی كۆمەڵێك

قەشەی دایە CIA بە هۆی ئەوەی ئەوان بەرامبەر کۆمۆنیزم لاوازو شلن. لە واشنتۆن شەڕی سارد لەوپەڕی گەرمیدا بوو، هەڵمەتی ڕاوەدونانیش لە تۆپکەدا بوو. FBI دەستی بە ڕاوەدونانی ئەو قەشانە کرد و زۆریشیان بەرەو ناوەڕاست و باشوری ئامریکا کۆچیانکرد. CIA بودجەیەکی باشی شاردراوەی بە ناوی پرۆژەی پارە Project Money بۆ خەڵک کڕین لەبەردەستدا بوو، لەو ڕێگەیەوە کۆمەکی هەتیوخانەکانی ڕۆمە کاسۆلیکەکان، قوتابخانەکان، دامەزراوەی خێرخوازی پێدەکرد، لەگەڵ نۆژەنکردنەوەی کڵێسەکانی ڤاتیکانی 'هەژار'. ئەو قەشە و نۆنانەی (ئەو ژنانەی خۆیان بۆخزمەتی مەسیح تەرخانکردوە) کە نیشتمانپەروەرێکی پڕجۆش بوون، پارەی پشوبەسەربردنیان بە تەواوی بۆ قەرەبو دەکرایەوە، سەرەک قەشەکانیش (بیسکۆپ) بە دەرزەن شامپانیا و تریانی پڕ لە شیرنەمەنی خۆشیان وەردەگرت، ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە وڵات هێشتا باری لاری کورتهێنانی خۆراکی ڕاستنەکردبووەوە. سەرە یەک بەدوای یەکەکانی نوسینگەکانی CIA بۆ ڤاتیکان لە باڵوێزەکانی ئامریکا گرنگتر بوون.

کاتێک ئەنگێلۆ گیسپە ڕۆنکالی Angelo Giuseppe Ronkcalli لە 1958دا بە پاپا هەڵبژێردرا و ناوی پاپا یۆهانی بیست و سێهەمی Johannes XXIIIی وەرگرت، حکومەتی کاردینالەکانی ڤاتیکان بە گوتەکەی سەرسام بوون کە گوتی کشانی خاچداران دژی کۆمۆنیزم شکستی هێناوە. فەرمانی بەسەر سەرەک قەشە ئیتالییەکاندا کرد، لەمەولا بێلایەن بمێننەوە. CIA یش زۆر لەوە توڕە بوو کاتی پاپا یۆهان بڕیاری دا دەروازەی ڤاتیکان لەسەریان دابخرێ. تۆقاندنەکە لەو کاتدا زیاتر بوو کاتێ CIAبەوەی زانی کە پاپا خەریکە بەشێنەیی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتیانەی دەگۆڕێ و سەرەداوی گفتوگۆشی لەگەڵ نیکیتا خرۆشۆڤ Nikita Chroesjtsjov سکرتێری گشتی و سەرۆکی ئەوکاتی یەکێتیی شۆرەوی ڕاچاندووە. بە گوێرەی ڕێبەری نوسینگەی CIA لە ڕۆما، 'چیدیکە ڤاتیکان لە

پشت سیاسەتی ئامریکاوە نییە، کورسی پیرۆزی ڤاتیکان بۆتە دوژمن و لەمەوپاش دەبێ چالاکییەکانمان لە ژێر ئەو رۆشناییەوە ئەنجام بدەین' .

لێکدەرەوەکانی CIA بڕیاری خۆیان لە ژێر ناونیشانێکی گەورە، مینای پەیوەندی نێوان ڤاتیکان و کۆمیونزم خستەڕو. لە بەهاری 1963دا نوسینگەی ڕۆما ڕایگەیاند کە کورسی پیرۆز بەنیازە بە تەواوی پەیوەندییە دیپلۆتییەکانی لەگەڵ یەکێتیی شۆرەوی گرێبداتەوە. جۆن ماککۆن John McConeی بەڕێوبەری CIA بەرەو ڕۆما فڕی و بە هەراوە خۆی گەیاندە پاپا و پێی بڵێ ڕاگەیەندراوی یەکەمین سەرۆکی ئامریکای ڕۆمی کاسۆلیکی جۆن کێنێدی John F. Kennedy پێیە. ئەو بە پاپا یۆهانی بیست و سێهەمی گوت ' دەبێ کەنیسە کۆتایی بە لەیەکنزیکبوونەوە لەگەڵ کۆمیونزم بهێنێ. ئەوەی کەنیسە دەیکات زۆر دژوارە پەسند ناکرێ. کۆمۆنیزم وەک ئەسپی تەڕوادە وایە، هەروەک چۆن لە بردنەوەی هەڵبژاردنەکانی ئیتالیاوە لە لایەن چەپەکانەوە دەرکەوت. کاتێ ئەوان هاتنە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، کۆمۆنیستەکان زۆر لەسەرەداوی سیاسەتەکانی کەنیسەی ڕۆمی کاسۆلیک کەلێرە پەیڕەودەکران، بەلاوە نا' .

دە خولەک ماککۆن بەو شێوە ئەوەی لەدڵی دا هەبوو هەڵیڕشت و بێئەوەی پاپاش قسەی پێ ببڕێ دوا. لە دواییدا بێدەنگی باڵی بەسەر ژوری دانیشتنە پڕ شکۆکەی کۆشکی پاپادا کێشا. پیرە پاپا نیگایەکی درێژخایەنی ئۆلدارییانەی بڕیە میوانەکەی، ئەنجا بەدەنگێکی نەرم ڕونیکردەوە کە بەڕابەرایەتی ئەو کڵێسە ئەرکێکی گرنگی هەیە: ئەویش هەوڵدانە بۆ لەباربردنی نەگبەتی هەژاری و پیشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و کۆمەکی گەڕەکە هەژارنشینە قوڕاوییەکان و نەهێڵانی جیاخوازی(ڕاسیزم) و چەوساندنەوەی سیاسیانە. ئەو ئامادەیە لەگەڵ هەمو کەسێک لەنێویشیاندا یەکێتیی شۆرەوی کە لەو بوارەدا دەستی یارمەتی درێژ بکا، قسان بکا. تەنها یەک شێواز هەیە بۆ بەرەنگاریکردنی کۆمۆنیزم ئەویش وتاری پشتبەستو بە بەڵگەوبەندی بەجێیە.

ماککۆن نەیدەتوانی چۆن جڵەوی توڕەبوونەکەی خۆی بکا، ' ئەز بۆ ئەوە لێرە نیم موناقەشە بکەم' دواتر دەریبڕی، بە پاپای ڕاگەیاند کە بەڵگەی زۆری لە دەستە لەوکاتەی پاپا دەیەوێ نێوانی لەگەڵ مۆسکۆ خۆش بکا، کەچی کۆمۆنیستەکان لە هەمولایەک لە بلۆکی خۆرهەڵات، لە یەکێتیی شۆرەوی، لە ئاسیا و باشوری ئامریکا قەشەکان ڕاودەنێن. پاپا یۆهان بەرسڤی دایەوە کەو هۆیانە بەسن بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ مۆسکۆدا باش بکەین. بە ورە بەردراوی ماککۆن بەو بڕوایە گەڕایەوە واشنتن کە پاپا یۆهانی بیست و سێهەم ' بەرامبەر پاپاکانی پێشوی خۆی نەرمترین هەڵسوکەوتی بەرامبەر کۆمۆنیزم هەیە' .

مەرگی چاوەڕواننەکراوی پاپا کە نەخۆشی سندانی(شێرپەنجە) هەبوو زو کۆتایی بەژیانی هێنا، ئەمەش بۆ ماککۆن و کێنێدی مایەی ئۆخەی بوو. کە کاردینال مۆنتینی لە 1963دا بوو بە پاپا پاولی شەشەم، واشنتۆن هەناسەی هاتەوەبەر. دو ڕۆژ دواتر بۆنەی بە پاپابوونی، لە بۆنەیەکی شکۆدارانەی تایبەتمەندانەدا پێشوازی لە کێنێدی کرد، لە میانەی دیدارەکەشدا ماککۆنی لە نێو باخی ڤاتیکاندا بەخۆی و ڕەفتارە فیززلییە داگیرکارییەکەی کە دوای ماوەیەک دابڕان گەڕاوەتەوە، پیاسەی دەکرد.

ماوە درێژییەکەی پاپا پاولی شەشەم لەبەر ناساخی خۆی و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیشدا لەبەر جەنگی ڤێتنام لەژێر چاواندا بوو. ئەو بڕوای بەوەبوو کە توندوتیژکردنی ناکۆکی لە 1966دا لە لایەن لیندۆن جۆنسن Lyndon Johnson ڕەوشتێکی ناپەسەند بوو، دەبوایە کورسی پیرۆز ڕۆڵی ئاشتیهێنەرانەی بدیتبا. سێ مانگان دوای ئەوەی نیکسۆن Nixon گەیشتە Oval off بۆ سەردانی پاپا بەرەو ڕۆما فڕی. سەرۆک ئەوەی درکاند کە لەمەوپاش قەبارەی بوونی ئامریکا لە ڤێتنام گەورەتر دەبێ. جارێکی دیکە CIA کەوتە دەرەوەی بازنەی ڤاتیکان.

هەمو ئەو زانیارییانە لە لایەن کاتسکانەوە بە زڤی زامیر گەیشتن. لە ڕۆژێکی هەتاوی 10ی یانیوەری 1973دا کاتێ خۆی و کاتساکانی بەرەو

ڤاتیکان لێیانخوڕی تاکو ڕێکاری ئاسایشپارێزی سەردانەکەی گۆلدا مایر بپشکنن، هیوای خواست سەردانەکە بۆ مۆساد ببێتە مایەی جێگرتنەوەی CIA، بەڵام بەئاگادار بوون لە ماوە دوورودرێژییە چاوبازییەکەی ڤاتیکان لەگەڵ دەزگا زانیارییەکانی جیهاندا.

ئەوان لە لایەن سەرۆکی ئاسایشپارێزی ڤاتیکانەوە لە دەرگەی کۆشکی پاپایی کە پیاوێکی درێژی دەموچاو خورمەیی سەرلەبەری لەبن یەکبەرگیی Vigiliدا پیشوازییان لێکرا. ئەو چەندان سعاتی بۆ تەرخانکردن و لە شارە بچوکەکەی گێڕان، تاکو لە هەمو ئەگەرەکانی خۆ حەشاردانی نیشانئەنگێوە عەڕەبەکانیان ئاگاداربکاتەوە گەر بیانەوێ گۆلدا مایر تیرۆربکەن. ئەوەی سەرۆکی Vigili بۆی نەدەچوو، چاوتێبڕینی زڤی ئامیر بوو کە لە شوێنێکی بەجێ دەگەڕا ئامێری گوێ بۆهەڵخرانی دابنێ کاتێ بە یەکجار پەیوەندیی کاریان لەگەڵ کورسی پیرۆز گرێ دەدەن. زامیر بەو بڕوایەوە گەڕایەوە تەلئەبیب کە ڕێوشوێنی ئاسایشپارێزی ڤاتیکان دەرەقەت دێن. لە بەرچاوی ئەو ئەوە گرنگرتر بوو کە پێیوابوو کورسی پیرۆز ڕەفتاری ئاسانکاریانەی بەرامبەر ئیسرائیل لەبەرچاوگرتووە.

کاتێک زڤی ئامیر گەیشتە ئیسرائیل، هەمو تایبەتمەندییەکانی سەردانەکەی گۆلدا مایر لەبەردەست بزوتنەوەی ئەیلولی ڕەشدا بوون، بێگومان ئەمەش لە ڕێی قەشە لایەنگرەکانی عەرەب لە وەزارەتی دەرەوەی ڤاتیکاندا بوو .بۆ عەلی حەسەن سەلامە سەرکردەی ئەوتاقمە، کە لەبەر مۆساد دوای کوشتارگەی مونشن رایکردووە، سەردانی گۆلدا مایر بۆ ڤاتیکان دەرفەتێکی زێڕینە و ناگەڕێتەوە. ئەو سەرقاڵی نەخشەدانان بوو تا بە ڕۆکێت هەرکاتێ فڕۆکەکەی گۆلدا مایر گەیشتە سەر فڕۆکەخانەی لیۆناردۆ داڤینشی Leonardo da Vinciلە ڕۆما پەلاماریبدا.

ئەو هیوای وا بوو نەوەک هەر سەرەک وەزیران بکوژێ بەڵکو چەند وەزیرێکی لەپێشی کابینەشی کە یاوەری سەردانەکەی دەبن، لەگەڵ چەند سەرێکی مۆساد، بێگومان لەگەڵیدا یاوەرن، لەناوببەن. لەو کاتەی کە

ئیسرائیل بەخۆ دەکەوتەوە، سەلامە هیوای وابوو خۆی و پیاوەکانی لە شوێنێکی ئارام لەگەڵ شۆڕەوی دەست بەدانوستان بکەن.
لە 1968ەوە کە نەوەی لاو دوای جەنگی دوهەمی جیهانیی لەدایکبوو، شەڕی خۆیان دژی کۆمەڵگا لەژێر ناوی وەک لەشکری سور لە ئیتالیا، Baader-meinhoff Gruppe لە ئاڵمان، سوپای رزگاری گەل لە تورکیا، ETA لە ئیسپانیا و Plo لە فەلەستین/ئیسرائیلدا ئەنجامدەدا، کرەملینیش حیسابی لەسەر ئەوە دەکرد کە ڕۆڵی ئەو بزوتنەوانە لەگەڵ هەوڵەکانی شۆڕەوی تاکو 'ئیمپریالیزمی خۆرئاوا' و لەنێویشیاندا ئیسرائیل لەناو ببا، یەکانگیر ببێتەوە.
تیرۆرستە عەرەبەکان بۆ شۆرەوی لە گروپەکانی دیکە لەبارتر بوون و سەرکەوتنیان زیاتر بوو. سەرەڕای ئەوەش ئەوان لە ململانێدا بەرامبەر مۆسادی بە سامیان وەستا بوونەوە، KGB یش بە هەستێکی تێکەڵاوی ڕکلێبوونەوە بە ئۆپەراسیۆنە بێبەزەییانەکانیان سەرسامن . KGB بانگهێشتی گوڵبژێرێکی چالاکوانانی عەرەبی کرد بۆ فێربوون لە زانکۆی پاتریک لۆمومبا Patrick Lumumba لەمۆسکۆدا کرد. ئەوێ هەر ئەکادیمیایەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو فێرگەیەکی باڵای تیرۆریزم بوو .
خوێندکارەکان نەوەک هەر لە ڕوی سیاسییەوە وانەیان پێدەدرا، بەڵکو بە دورودرێژی فێری تەکنیکی نوێی هەڵبژاردنی ئامانجی تیرۆرستانی بۆمب و تەقینەوەی کۆمیتەی ئاسایشپارێزی وڵات کە بە KGB ناسراوە دەکران. هەر لە 'زانکۆ'ی لۆمومبادا سەلامە نەخشەی کوشتارگەی مونشنی خستە سەر کاخەز.
دوای تەقینەوە سامناکەکە تاقمی رزگاربووی ئەیلولی ڕەش داوای مافی پەنابەرێتیان لە یەکێتیی شۆرەوی کرد. خودی شۆرەوییەکانیش دودڵبوون لە مافپێدانــدا، شــاڵاوی تــوڕەیی دوای کوشــتارگەکە خــودی کرەملینیشــی شەرمندەکرد لە پاراستنی تاوانبارانداا. بە سەلامەیان گوت کە داوای مافی پەنابەرێتی بۆ خۆی و هاوکارەکانی هێشتا لەژێر لێکۆڵینەوە دایە .

لە سەرێکی دیکەوە شۆڕەوییەکان هیچ دەستی یارمەتیان بۆ ڕاوەدونانی تاقمی ئەیلولی ڕەش درێژ نەکرد. لەوەش خراپتر پەنجەشیان بۆ ئەو ڕاستییە ڕانەهێشت کە مۆڵگەیەکی پڕ لە ڕۆکێتی شۆڕەویان لە یۆگسلافیاوە لەبەر دەستدایە. ئەو ڕۆکێتانە بوون کە نیازیان وابوو بۆ خستنەخوارەوەی فڕۆکەی گۆلدا مایر، بەکاریانبهێنن.

پلانەکە بوێرانە و سادەییانە وەک هەر پلانیکی سەلامە وابوو. ڕۆکێتەکان لە دوبرۆڤینک Dubrovink لە بەلەمێک باردەکران و بە زێی ئادریاتیک دەهێنرانە بەندەری باری Bari لە کەناری ڕۆژهەلاتی ئیتالیا. لەوێشەوە بە ئۆتۆمۆبێل کەمێک پێش گەیشتنی فڕۆکەی گۆلدا مایر بۆ ڕۆما دەگواسترانەوە.

سەلامە هیچ وانەیەکی تاکتیکیانەی پشتگوێنەخست، کە لە زانکۆی پاتریک لۆمومبا وەریگرتبوون: ' هەمیشە مشوری ئەوە بخۆ کە دوژمنەکەت لەدیوی دیکەوە تەماشات بکا'. سەلامە دەیویست سەرنجی مۆساد پێش ڕۆکێتەکان بۆ لایەکی دیکە ڕابکێشێ.

لە 28ی دیسێمبەری 1972دا دەستەیەکی ئەیلولی ڕەش پەلاماری باڵوێزخانەی ئیسرائیلیان دا لە بانکۆک. لەوێ بەیداخیPLO یان لەسەر باڵەخانەکە بەرزکردەوە و شەش ئیسرائیلیشیان بەبارمتەگرتن. هەر زو باڵوێزخانەکە بە پێنج سەد پۆلیسی تایلەندی ئابلۆقە درا. تیرۆرستەکان داوای ئازادکردنی سی وشەش گیراویPLO یان لە زیندانەکانی ئیسرائیلدا کرد، ئەگەرنا بارمتەکان دەکوژن.

لەتەلئەبیب سەرقاڵی سیناریۆ داڕشتن بوون. کابینەی حکومەت کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی کرد. سەرلەنوێ گفتوگۆ لەسەر هەڵبژاردنی ڕەفتارێکی شێلگیرانە یان ملبۆشلکردن کرا. زڤی زامیر تەنها توانی ئەوە بڵێ کە پەلامارێک لە بانکۆک پشتگریکردنی دەوێ کە ڕێگەکەش هەموی دوژمنکارانەیە، ئەوەش دابیننناکرێ. باڵویزخانەی ئیسرائیلیش لەناو جەرگەی بانکۆک دایە. حکومەتی تایلەندی بە هیچ شێوەیەک بواری تەقەکردن لەوێدا

نادا. دوای دانوستانێکی کورت تیرۆرستان کە چاوەڕوان نەدەکرا داوایەکی تایلەندییەکانیان پەسەندکرد ،بەوەی ئەوان بە ئازادانە لە وڵات دەربچن لە بەرامبەریشدا بارمتەکان بەربدەن. چەند سعاتێک دواتر دەستەی ئەیلولی ڕەش بە سواری فڕۆکەیەک گەیشتنەوە قاهیرە و لەوێ بزربوون.

لەو نێوەدا زڤی زامیر هەناسەیەکی خۆشی هەڵکێشا کە هیچ مردنێکی لێنەکەوتەوە. بزوتنەوەی ئەیلولی ڕەش بە باشی مەشقدرابوون، ئامانجی خۆشیان بە ڕونی لێوە دیار بوو، لە ڕوی داراییشەوە هیچ کەموکوڕییەکیان نەبوو تاکتیکەکانیشیان نیشانەی زیرەکیان پێوە دیار بوو. سەرکردەکانیان بەو شێوازانە ئاشنا بوون کە گوشار بخەنە سەر حکومەتەکان و بە چۆکیاندا بهێنن، بەڵام ئایا بۆچی ئەم جارەیان بەو خێراییە خۆیان بە دەستەوەدا؟ باڵوێزخانەی بانکۆک ئامانجێکی ئاسان بوو تاکو بە بەلاش پڕوپاگەندەی خۆیانی پێ بڵاوبکەنەوە و زیاترین ئەندامیش بۆخۆیان کێشبکەن. ئەوە سەلمێنرا بوو کە ئەوان بە پشتبەستن بە پرسی بەخت هەبوون ئامانجەکانیان هەڵنابژێرن. هەر کارێکی ئەو تیرۆرستانە ئەنجامیدەدەن بە ئامانجەوە کەمپینێکە دژی دیموکراسی. لە باڵوێزخانەی بانکۆکدا ئەوان بە گوێرەی ئامۆژگاری سەرکردەکەیان گیڤارا کرد' قین بەزیندویی بهێڵەوە'. بارمتەکراوە بێدەستەڵاتەکان ڕوبەڕوی بێڕێزیکردن و دروشمی دژەجو کرانەوە، بەڵام ئایا ئەوەش هەر هەوڵێکی لەخشتەبردن نەبووە؟ ئایا ئەوان پلانێکی دیکەیان لە شوێنێک دژی ئیسرائیل لەبن سەردا هەبووە؟ لە کوێ و کەی؟ زامیر هەر بیری لەو پرسانە دەکردەوە کاتێ لەگەڵ گۆلدا مایر لە ڕێگای پاریسدا بوو بۆ کۆنگرەی سۆسیال ئینتەرناسیونال. لەوێوە بەدوای بەرسڤەکان دەگەڕا.

سعاتێکی سەرلەزوی 14ی یانیوەری 1973 شتێکی گرنگ دەرکەوت. سایانمێک کە لە مەڵبەندی سەرەکی تەلەفۆنی ڕۆماوە کاریدەکرد، گوێی لە دو تەلەفۆنکردن گرت، کە لە دەزگایەکی تەلەفۆن لەو باڵەخانەیەی کە هەندێ جار تیرۆرستەکانیPLO ی تێدا دەمێنەوە. تەلەفۆنی یەکەم بۆ بەندەری

باری چوو و هی دوهەمیشیان بۆ ئۆستیا Ostia کە بەندەرێکی ڕۆما بوو. تەلەفۆنەکانیش بە زمانی عەرەبی بوون، ئەو زمانەی کە سایانمەکە تیادا وەستا بوو. قسەکەرەکە گوتی  کاتی ئەوە هاتووە ' مۆمەکان بۆ کێکی لەدایکبوون وەربگیرێن' .

ئەو پەیڤانە زامیریان هێنا سەر ئەو بڕوایە کە وشەکان کۆدەداربن و دەبێ پەیوەندییان بە پەلامارێکی تیرۆرستیانەوە هەبێ. ' دەکرێ مۆمەکان پەیوەستیان بە چەکەوە هەبێ، ئەو چەکەش کە توند بە مۆمەمەوە گرێدراوە' دەبێ ڕۆکێت بێ. ڕۆکێتیش نمونەترین شێوازە بۆ خستنە خوارەوەی فڕۆکەی گۆلدا مایر.

پێویست نەبوو سەرەک وەزیرانی لێئاگاداربکرێتەوە، چونکە ئەوترسی نەدەناسی. هۆشدارکردنەوەی ڤاتیکانیش ئەنجامنەدانی سەردانەکەی لێدەکەوتەوە، چونکە کورسی پیرۆز دواشت ئەوەیە کە ڤاتیکان پەیوەستبێ بە کردەیەکی تیرۆرستی بەتایبەتیش کە ناچاربێ دۆستە عەرەبەکانی پێ شەرمەزاربکا.

زامیر زەنگی بۆ هەر دو کاستا هێسنەر و کاولی لێدا، کە پێشتر لەگەڵی چووبوونە ڤاتیکانەوە. فەرمانی بە کاولی کرد بێتە ڕۆما. پاشان زامیر بەخۆی و دەستەیەکی بچوک لە پیاوانی مۆساد کە لەگەڵ گۆلدا مایر دەهاتن بە فڕۆکەی دوای ئەوان گەیشتنە ڕۆما. لەگەڵ ئەو بارەشدا مەیلی گاڵتەیان بەوە نیشاندەدا کە زامیر تێبینی ئەوەیدا، پێدەچی بۆ گۆلدا مایر شاری ڕۆمای ئەبەدی، ئەبەدی بێ.

لە ڕۆما زامیر ترسی خۆی بۆ سەرۆکی دەزگای دژە تیرۆری ئیتاڵی DIGOS باسکرد.  ئەویش خانوبەخانو لەو شوێنە گەڕا کە تەلەفۆنەکانی بۆ باری و ئۆیستا لێکراوە. لە پشکنینەکەدا لەیەکێ لەخانووەکان نامیلکەی ڕێنمای هەڵدانی ڕۆکێتەکان بە زمانی ڕوسی دۆزرایەوە. هەمو شەوەکە تیپەکانی DIGOS  بە چاوساخی کاتساکانی مۆساد بە دوای ناونیشانی ئەندامانیPLO دا دەگەڕان. لەوێدا هیچی وا نەدۆزرایەوە کە مەترسییەکانی

زامیر بسەلمێنێ. لەبەر ئەوەی ڕۆژی دواتر سەر لەزو فڕۆکەکەی گۆلدا مایر دەگەیشت، بڕیاریدا پشکنینەکانی لە دەوروبەری فڕۆکەخانەکەدا چڕتربکا.

کەمێک دوای ڕۆژهەڵاتن، هانسەر پاسێکی فیاتی لە کێڵگەیەکدا کە زۆر دور نەبوو لە ڕێگەفڕینی فڕۆکەخانەکەدا دۆزیەوە. کاتساکە فەرمانی بە شوفێرەکەدا بێتە دەرەوە. لە بری ئەوەدا دەرگای پشتەوەی پاسەکە کرایەوە تەقە کرا. هانسەر بەخۆی بەرنەکەوت، بەڵام کاتێ ئەو وەڵامی تەقەکانی دایەوە و دوو تیرۆرستەکەی پشت پاسەکە بە خەستی بریندار‌بوون. بە پێیان هێسنەر بە دوای شوفێرەکە کەوت، شوفێرەکە هەوڵیدا بگاتە ئۆتۆمبێلێکی ئاسایی تا بیڕفێنێ، بەڵام نەیزانی کە کاولی دەیهاژۆت. هەردو کاتساکە پیاوە بێدەرەتانەکەیان توند بەستەوە فڕێیاندایە پشتی ئۆتۆمبێلەکەیان و گەڕانەوە لای زامیر کە وێستگەی کۆماندۆکەیان بوو لە ئۆتۆمبێلێکی بارهەڵگر دابوو.

بەڕێوبەری گشتیی مۆساد هەواڵی بە ڕادیۆ پێگەیشت کە پاسەکە شەش ڕۆکێتی بارکردبوو. ئەو دەبوایە لەوە دڵنیا بووبایە ئاخۆ باری دیکەش ماوە. شوفێری پاسەکە دەبوایە ئازارێکی جەستەیی زۆر بخوا تاکو لە دواییدا جێگەی پاسی دوهەمیان بۆ بدرکێنێ. زامیر گومانی هەبوو کە ئەو فەرماندەیەکی بەشداربووی کوشتارگەی مونشن بێ. زامیر و هێسنەر و کاولی بەوپەڕی خێرایی بەخۆیان و تیرۆرستە نیوە مردووەکەی نێو خۆیان بەرەو شوێنی دوهەم کەلە سەروی شوێنی یەکەمی پاسەکە بوو، ملیان لێنا .

لەوێ چوونە سەر پاسی دوهەم کە لە کێڵگەیەک وەستێنرا بوو. بە سەرهەڵدانەوەی سێ ڕۆکێتی تێدابوو. لە دورەوە فڕۆکەکەی گۆلدا مایر بۆینگی 747 تارمایەکی دابەزینی لەبەر تیشکی خۆر دیار نەدەکرا. بەبێ دودڵی زامیر ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرەکی ڕاستە و ڕاست بەرەو پاسەکە مل لێنا تا وەریبگێڕێ. هەردو تیرۆرستەکەی نێو پاسەکە ڕۆکێتەکانیان بەسەردا کەوت و پەکیانکەوت .

زامیر تەنها ئەوکاتە وەستا کە شوفێرە لەخۆچووەکەی پاسەکە کە کابینەی پشتەوەی بارهەڵگرەکەدا بوو بخاتە خوارەوە. پێش ئەوەی بۆی دەرچێ DIGOS ڕایگەیاند کە 'ڕوداوێکی سەرنجڕاکێشتر ڕویداوە بۆیە باشتر وایە بۆلای ئەوێ بچن'. زامیر بیری لە هەڵسەنگاندنی کوشتنی تیرۆرستەکان کردەوە، بەڵام لەوە ترسا کە کوشتنیان گۆڵدا مایر لە دیدارە شکۆدارەکەی پاپادا بخاتە بارێکی شەرمنئاساوە.

سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل ئەو هەستەی لاپەیدا بوو کە قورسایی هەمو جیهان گوشاری بۆ شانە باریکەکانی پاپا هێناوە و خەریکە بیچمە لاوازەکەی سپیپات بکاتەوە. لە کۆتایی دیدارەکەدا پاپا پاولی شەشەم لە بەرسڤی پرسێکی مایردا ئایا جەنابیان سەردانی وڵاتی پیرۆز دەکەن؟ گوتی ئەو هاتنەکەی وەک' حەج' دادەنێ. کاتێکیش گۆلدا مایر لێی پرسی ئاخۆ کاتی ئەوە نەهاتووە بە فەرمی پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی نێوانیان دروست بکەن، بە هەناسە هەڵکێشانێک بەرسڤی دایەوە کە ' هێشتا کاتەکەی نەگەییوە'. سەرەک وەزیران دیارییەکەی کتێبێکی پێستداری پڕ لە وێنەی وڵاتی پیرۆز بوو، ئەویش دیارییەکەی نامەیەکی پاپا Humanae Vitae بوو کە تیایدا ئامانجەکانی پاپایەتی تێدا ڕەشنوسکرا بوو، وەرگرتەوە.

تیرۆرستەکانی بزوتنەوەی ئەیلولی ڕەش کە پشکیان لە کوشتارگەی مونشندا هەبوو بردرانە نەخۆشخانە، دوای چاکبوونەوەشیان دەرفەتی ئەوەیان پێدرا ڕوەو لیبیا بفڕن، چونکە حکومەتی ئیتاڵیا نەیدەویست بزوتنەوەکە لەخۆی بوروژێنێ، بەڵام ئەوەش داڵدەی نەدان، چونکە دوای مانگێک هەمویان لە لایەن کۆماندۆی مەرگچێنی مۆسادەوە کوژران.

ڕێسای تۆڵە' چاو بەچاو و ددان بە ددان' کە گۆلدا مایر پەسەندیکرد، لای پاپا پاولی شەشەم دژایەتی کرا، چونکە هەمو پاپایەتی ڕەگی لەسەر هێزی لێبوردەیی داکوتاوە. هەروەها بووە مایەی پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان ڤاتیکان وPLO ، سیاسەتێک کە پاپا یۆهان پاولی دوهەم لە بۆنەنامەی پاپایەتی بوونی لە 1978دا درێژیپێدا.

لەوکاتەوە پاپای پۆلۆنی یاسر عەرەفات و هاوکارە نزیکەکانی بە دورو درێژی لە ژوری تایبەتی خۆی شکۆدارانە پێشوازی لێکردوون و لەگەڵیان دانیشتووە . لەو بۆنەنامانەدا شێلگیرانە دەریبڕیوە کە ئەو ڕۆڵی کارا دەگێڕێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بە فەلەستینییەکان. PLO کە بارەگاکەی لە تونس بوو لە وەزارەتی دەرەوەی ڤاتیکاندا پەیوندی جێگیریانەی هەبوو هەروەها کورسی پیرۆزیش لای PLO نوێنەر Nuntiusی خۆی سەرقەشەیەکی بەناوی ئیدی ئەیاد Idi Ayad هەبوو.

قەشە ئەیاد بە پۆشاکە پانوپۆڕەکەی کە دامەنە درێژە هەڵدراوەکانی تۆزی لمی بیابانی تونسیان هەڵگرتبوو، شەپقەیەکی ڕەشی لەسەر نابوو خزمەتی پاپای دەکرد، بەڵام بە هەمو بایەخدانێک بە PLO . لەسەر دیواری ژوری نوستنەکەی پۆرترێتی پاپا یۆهان پاولی دوهەم و عەرەفات هەڵواسرابوون. لە 1980دا قەشە ئەیاد یارمەتی عەرەفاتی دا بۆ نوسینی نامەیەک بۆ پاپا کە خۆشحاڵی بکا، تیایدا هاتبوو: ' تۆ هاتیە خەونی من. لە مێشکمدا بەڕێزتانم دی دەچوونە ئۆرشەلیم، ئێوە بە ئاوارە گەڕاوەکانی فەلەستینی دەورەدرابوون، کە دەستیان پڕ لە چڵە زەیتون بوون لەبەر پێی تۆ دایاندەنان.

ئەیاد پێشنیازی بۆ عەرەفات کرد کە لە بۆنە دینییەکاندا بەڕێزەوە پاپا بە کارت بەسەر بکاتەوە: ئەوەبوو عەرەفات دەستپێشخەری کرد و کارتێکی کرێسمسی بۆ پاپا نارد، پاپاش سڵاوی خۆی لە یادی لە دایکبوونی پێغەمبەر موحەممەد بۆ ناردەوە. نوێنەرە ماندونەناسەکەی ڤاتیکان دەستی هەبوو لە سازدانی دانیشتنی نێوان وەزیری دەرەوەی PLO لەگەڵ هی ڤاتیکان مسیۆنیو کاسارۆلی Casaroli. دوای ئەوەی نوسینگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڤاتیکان بەرفراوانکرا، هەمو نوێنەرەکانیان لە جیهان ئەو پەیامەیان بۆهات کە لەو دەوڵەتانەی تیایدا نوێنەرن کار لە بەرژەوەندی PLOدا بۆ بیرۆکەی دەوڵەتێکی تایبەت بە فەلەستینییەکان بکەن. هەمو ئەو هەنگاوانە ختوکەی ئیسرائیلیان دەدا. پەیوەندییە فەرمییەکانی ئیسرائیل لە

گەل ڤاتیکان لە سەردانەکەی سەرۆکی حکومەت کە چەند خولەکێکی خایاند تێپەڕی نەکرد.

پەیوەندییە ساردوسوڕییەکەی نێوانیان بەشێکی بۆ ناڕێکوپێکی ڕاستەوخۆی دامەزراندنی ئیسرائیل لە 1948دا دەگەڕێتەوە. وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ڤاتیکان نوێنەرێکی nuntitus ی ناردە لای هایم کۆهنHaim Cohn ی تازە وەزیری داد، داوایکرد ئیسرائیل سەرلەنوێ تەماشای پێواژۆی دادوەری دژی عیسا بکا و بێگومان چاو بە بڕیارەکەدا بخشێنێتەوە. ئەنجا دوای ئەوە ڤاتیکان بە فەرمی ددان بە ئیسرائیلدا دەنێ. هەرچەندە بە دڵنیایەوە کۆهن نابینا نەبوو لە بایەخی گرێدانی پەیوەندی دیپلۆماتیانە لەگەڵ ڤاتیکاندا، بەڵام بەو شێوەیەی داواکراوە شتێکی' ڕوکەش و نەکراوە، ئەو نەوەک هەر بێ واتایە، بەڵکو ئێمە زۆرکاری گرنگترمان لەمێشکدا هەیە بیکەین، لەوانەش خۆڕزگارکردن لە پەلاماری عەرەبە دراوسێکانمان. ڕاتەکاندنی تۆزوخۆڵی گڵکۆی عیسا خاڵێکی زۆر تەماوییە لە لیستی پێشنۆرەکانی من' .

دوای ئەوەی کۆهن بە کورتی بەڵام بەپوختی داواکەی نوێنەری پاپای ڕەتکردەوە، ڤاتیکان بە توڕەییەوە کاردانەوەی نواند .

لەو کاتەوە تروسکاییەکی کەمی هیوا بۆ پەیوەندی نێوانیان تیشکی دایەوە کە کاردینال ئەلبینۆ لوسیانۆ Albino Luciano بەر لە ئۆهان پاولی دوهەم بوو بە پاپا، بەڵام تەنها 33 ڕۆژ چووە سەر کورسی پیرۆز، ئەو دەیویست پەیوەندی دیپلۆماتیانە لەگەڵ ئیسرائیل هەڵبسەنگێنێتەوە و پەیوەندی پەیدا بکا. دوای مردنی ناکاوی بەتەوژمی دڵ، وەک دەبیسترا لەژێر گوشارەوە شلک بوو کە کارۆل وۆتیلا Karol Wojtyla بە پاوس هەڵبژێردرێ. لە ماوەی پاپایەتیی ئەودا دەرگا برونزییەکانی کۆشکی پاپایەتی بە ڕوی ئیسرائیلدا تەواو داخران، هەرچەندە کورسی پیرۆز بەهاندانی پەیوندییە نۆژەنکراوەکانی لەگەڵ CIA دا بۆ دەستتێکەڵکردنی زیاتر لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا کەوتە گەڕ.

لە 1981دا ویلیەم کێیسی William Casey دینداری ڕۆمی کاسۆلیک بوو بە بەڕێوبەری گشتی CIA . ئەو لەیەکەمینی ئەو میوانانە بوو کە پاپا دوای هەڵبژاردنی لە کۆشکی شکۆداری تایبەتی خۆیدا پێشوازی لێکرد. کێیسی بۆ پاپای پۆلۆنی کاریزمادار نوشتایەوە و ئەڵقەی پیرۆزی پاپایەتی ماچکرد. بە گفتارو ڕەفتار کێیسی وەک نۆکەرێکی نزاکاری بەر دەرگەی پاپا خۆی نیشاندا، ئەوەش تەواو پێچەوانەی کەسە خۆگەورەگرە توندەکانی پێشخۆی بوو. هەرچەندە کێیسی لە ناخەوە بە گومان و ترس بوو لە کۆمۆنیستەکان و پێشی وابوو پاپای نوێ لەو کایەدا خزمی ڕۆحیتیان .

دەوروبەری سعاتێک هەردوو پیاوەکان لەسەر ئەو مژارانە دوان کە سەنگی سەردڵی هەردوکیان بوو. ئایا دەبێ چی لەگەڵ بلۆکی خۆرهەڵاتدا ڕوبدا؟ ئایا ڕژێمی پۆلۆنی و تەواوی بلۆکی خۆرهەڵات بە یەکێتیی شۆرەویشەوە چ کاردانەوەیەکیان بەرامبەر گۆڕانی دەسەڵاتی کڵێسا دەبێ؟ کاتێ کێیسی ژوری پێشوازییەکەی جێهێشت، تەنها یەک شتی دەزانی: پاپا یۆهان پاولی دوهەم کەسێک نییە بە دوای هەرزانفرۆشیدا بگەڕێ. ئەوەش هۆکاری کاریزماکەی بوو. ڕوانینە ڕونەکانی باشترین بەرسڤی پرسێکی کۆنی ستالینە کە دەیگوت ئایا پاپا کێیە؟ ئایا ئەو پیاوە چەند لەشکری هەیە؟ پاپا یۆهان پاولی دوهەم بڕوای بە کێیسی هێنا کە ئەو بە تەنها دەیسەلمێنێ کە باوەڕ بەرگری شاخی گەورەتر دەکا لەوەی توندوتیژی چەک بە تەنها.

کییسی گەڕایەوە واشنتن تا سەرۆک ڕێگان لە بابەتەکە ئاگاداربکاتەوە. بەڕێوبەری گشتیی CIA فەرمانی پێدرا بگەڕێتەوە ڕۆما و ئەوپەیامە بگەیەنێتە پاپا ( بەڕێچکەیەکی نهێنی لە لایەن سەرۆکیشەوە پەسندکرا ) کە ئەو لە هەمو ڕووەکانی سیاسەتی ئامریکای سەربازی و سیاسی و ئابوری ئاگاداردەکرێتەوە.

هەمو ئێوارەیەکی هەینی بەڕێوبەری CIA نوێترین زانیاری نهێنی کە بەهۆی چاوەدێری سەتەلیت، گوێلێهەڵخرانی ئەلەکترۆنی و جاسوسەکانیCIA دەدرایە کۆشکی پاپا. هیچ سەرەک دەوڵەتێکی دەرەوە

ئەو زانیاریانەی کە بۆ پاپا دەچوون پێنەدەگەیشتن. ئەوەش وایکرد پاپا ببێتە پاپایەکی پڕ زانیاری و مۆدێرن چ لەسەر ئاستی کلێسا و چ لەسەر ئاستی سیاسەتی جیهاندا پەنجەمۆری دیار بێ. لەو سۆنگەیەوە دیپلۆماسی پاپا – ناواخنی سیاسی هی بیروکراتیەتێکی مەڵبەندیانەی توندی ڤاتیکان-زیاتر بوو لەوەی پێنج سەد ساڵی ڕابردوی بە چڕی پەیوەستبوونی کلێسا بە پێشهاتەکانی نێودەوڵەتیانە. ئەو پەیوەستبوونە بەکاروباری دنیا خەریک بوو پاپا گیانی خۆی لەسەر دابنێ، ئەوەش کاتێ لە 13ی ئایاری 1981دا و لە گۆڕەپانی سینت پیترۆس St. Pieters دا تەقەی لێکرا.

دوو ساڵ دواتر لە 15 نۆڤێمبەری 1983دا لە شەوێکی ساردی زستاندا پاپا یۆهان پاولی دوهەم لەسەر ئەو پرسەخاڵە وەستا بوو' ئایا کێ لەپشت فەرمانی کوشتنەکەیدایە؟' هەر چرکەیەک لە ڕوداوەکە بۆ هەتاهەتایە لە مێشکیدا چەسپی بەردەوامیش وەک برینی گوللەکان سوێیان دەکردەوە.

لە پاشنیوەڕۆی 13ی ئایاری 1981دا دەوروبەری سەدهەزار کەس لە گۆڕەپانی سنت پیتەر St.Peter کۆببوونەوە. خەڵکەکە بە شێوەی سێ لەسەر چواری بازنەیەک بەخۆ پەستاندن جێی خۆیان بە پێوە لە دەروازەی گەلەریە بەناوبانگەکەی بەرنینی کردەوە Bernini کە 284 دینگە و 88 دیوارە دینگەی لەخۆگرتووە بانێکی ڕاگرتووە کە کۆتەڵی 162 قەدیسی لەخۆگرتووە. ڕێچکەیەکی باریکیش بەجێهێشرابوو تاکو پاپا بە هۆیەوە بگاتە سەر سەکۆ کە هەفتانە دوانی دەدا. بارودۆخەکە ئاهەنگاوی بوو خەڵکەکەش دەیانپرسی ئاخۆ پاپا لەگەڵ ئامادەبوونی ئەو ئاپۆرەیەدا بۆ لە کۆشکی پاپایەتی نایەتە دەرەوە .

بەڵام ئایا لە مێشکی کوڕە گەنجێکی تورکی لاوازی ڕەشتاڵە بە ناوی محەمەد عەلی ئاگجا Mehmet Ali Agca چی کەڵکەڵەی دەکرد؟ کەس نەیدەزانی. ئەو بەو پاش نیوەڕۆیە نیوەی ڕێگای بڕیوە و لە مەیدانەکە بە خۆتێپەستین بەرەو پێشەوە هات تا گەیشتە لای پێشەوە و بەردەم ئەو پەرژینۆکەی کە کەژاوەی پاپای بەبەردەمدا بۆ سەر سەکۆ تێدەپەڕی. ئاگجا

سەر بە تاقمێکی تیرۆرستی تورکی بوو کە ناوی "گورگە بۆرەکانیان" لە خۆ نابوو. ئەو وازیشی لە گورگە بۆرەکان هێنابوو، چوو بووە ڕیزی توندڕەوە ئیسلامییە ئسولییەکان و مەشقی ڕاهێنانی ئەوانی دیبوو، ئەو جۆرە ئۆردوگا مەشقانەش لە هەمو شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینران. هەنوکە ئەو خەریکە بگاتە کۆتایی هەندەرانبوونەکەی: ئاگجا بۆ ئەوە نەهاتۆتە گۆڕەپانی سنت پیتەر تاکو چەپڵە بۆ پاپا لێبدا، بەڵکو بۆ ئەوە هاتوە گوللەی پێوە بنێ و ساردی بکاتەوە.

لە سعات چواردا پاپا یۆهان پاولی دوهەم بەرگە سپیە پانوپۆڕەکەی پۆشی. ئەو بەرگە لەسەر ڕاوێژی CIA وا دروابوو کە لە ژێرەوە گوللەبەند لەبەربکا بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی دیار بێ. لەدوا سەردانەکەی بۆ لای پاپا، کێیسی هۆشداری دا ' لەو دنیا جەنجاڵەی ئەمڕۆدا تەنانەت پاپاش بەدەر نییە لە هێرش بردنە سەر. پاپا سەرباری بیروڕا جودا کەسێک بوو، دەرفەتی لەناوبردنی بە دەستی هەوادارێکیدا لە گۆڕێدا بوو' .

پاپا ڕەتیکردەوە کە گوللە بەندەکە بپۆشێ. تەنانەت بیرۆکەی هەڵگرتنی گولللەبەندەکە لەگەڵ پایەی پاپایەتی ناگونجێ، وەک پاپا بە سکرتێرە تایبەتییە ئینگلیز زمانەکەی مسینێرJohn Magee ی گوت.

دە خولەک بۆ سعات پێنج پاپا لە پلیکانەکان بەرەو باخی بەردەمی کۆشکی پاپایەتی دابەزی. سەرۆکی دەستەی ئاسایشپارێزانی ڤاتیکان کامیلیۆ سیبین Camilio Cibin بە دروستی چرکەساتی گەیشتنی پاپای لە دەفتەری کارنامە ڕۆژانەکەی تۆمارکرد. لە دیوی ناوەوەی بەرگە بۆرەکەی سیبینی تەلەفۆنێکی دەستی هەبوو تاکو پەیوەندی بە بارەگای سەرەکی پۆلیسی ڕۆماوە بکا. لە ڕاستیدا پاراستنی ژیانی پاپا لە ئەستۆی یەک بەرگەکانی ڤیگیلیVigili یەوە بوو. ئەو دەستە بچووکە، بەڵام تەواو ڕاهێنراوەی ئاسایشپارێزەی ڤاتیکان چاوی تیژی پشت کەژاوەی دەستەی پاسەوانی سویسڕایی بوو کە لە گۆڕەپانەکە جێی خۆیان گرت .

لە ژوەرەوە کورسیە گەڕۆکەکەی پاپایان بە قوماشێکی سپی داپۆشی و جێی پاڵدانەوەی پاپاشیان لەو دەرچوونە کورتەدا بۆ کردەوە تاکو پاپا دەستی خۆی پێوە بگرێ لە کاتی چوون و هاتنەکەی بۆ سەر سەکۆ ئامادەکراوەکەدا. بەردەستەکانی پاپا لە دەوەری کورسیەکەی کۆبوونەوە.
ماگی دواتر بە بیری هاتەوە کە پاپا ' لە هەرە باشترین ڕواڵەت' دابوو.
سعات پێنجی خشت کەژاوەی پاپا لە دەروازەکە هاتە دەرەوە. لە گۆڕەپانی سنت پێتر خەڵک خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. کاتێ کەژاوەکە گەیشتە لای کەوانەی کاتژمێرەکە، ڤیگیلییەکان هێشتا هێزی یارمەتی زیاتریان لە پۆلیسی شارەوانی ڕۆماوە بۆ دەهات و یەکسەر ئەوانیش بوونە یاوەری کەژاوەکە. کاتێ کەژاوەکە بەناو گۆڕەپانەکەدا دەڕۆیشت هاتوهاواری خۆشی خەڵک گوێی کەڕیان دەهەژاند. پاپا بە خەندەوە دەستەکانی بۆ خەڵکەکە دەهەژاندن: لە کاتی منداڵییدا ئەو بەشداری شانۆی کردبوو، هێزی کەسایەتی سەرسەکۆی بۆخۆ هەڵگرتبوو.
کەژاوەی پاپا بە خێرایی پێنج کیلۆمەتر لەسعاتێکدا ڕەوتی خۆی بۆ ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بۆ لای دینگە هەرەمئاساکەی میسری دەبڕی. دەقاودەق پێنج و چارەکێک کەژاوەکە لەژێر چاودێری سیبی کە خۆشی لەدوای کەژاوەکەوە دەڕۆیشت، جاری دوهەمی گەڕانەکە بەناو گۆڕەپانەکەدا دەستپێکرد. تا دەهات دەنگ و هەرای ئاپۆڕەکە زیاتر دەبوو. پاپا سەرپێیانە کارێکی کرد سیبینی تورەدەکرد. پاپا چەمایەوە و زارۆکێکی لەنێو ئاپۆڕەکەدا بەرزکردەوە. کیژە زارۆکەکەی ماچکرد و دایەوە دەستی دایکی کە زۆر پێی شادمان بوو. سیبینی هەمیشە لەوە دەترسا لەوکاتەدا کە پاپا نەتوانێ منداڵەکە لەباوەش بگرێ و لە دەستی بەربێتەوەوە، ئەوکات ڕوداوێکی ناخۆش و نەخوازراوە دەبوو. پاپاش ئەو مشورخواردنەی بەلاوە دەنا.
لە خولەکی هەڤدەهەمی دوای سعات پێنجدا جارێکی دیکە پاپا چەمایەوە، تاکو دەست بەسەری کچێکی سپی پۆشدا دابێنێ. ئەوەش شێوازی پاپای جێنشینی عیسا بوو تاکو نێوانی خۆی و خەڵک نزیکبکاتەوە .

ئەو مەترسیانەی لەنێو حەشاماتەکەوە بۆی لەبۆسەبوون، لەو چرکەساتەدا هیچ بە خەیاڵی پاپادا نەدەهاتن. هەرچەندە هەر سێ مانگ لەمەوبەر لە پاکستان لە16 ی فێبرایری 1981دا بۆمبێک لە ستادیۆمی شارەوانی کەراچی کەمێک پێش تێپەڕبوونی ئەو بەنێو بڕواداراندا تەقیەوە. بێجگە لەوەش دەزگای پۆلیسی نهێنی فەڕەنسا لە 1980ەوە پاپایان لە پیلانی کۆمۆنیستەکان بۆ کوشتنی ئاگادار کردۆتەوە. ئەوەش یەکێک بوو لە گەفە بێژمارەکانی سەر ژیانی پاپا کە ڕۆژانە بۆ ڤاتیکان دەهاتن. سکرتێری تایبەتی پاپا ماگی گوتی: ' لەڕاستیدا ئێمە هەر چاوەڕوان بووین. بێجگە لەوەش ئێمە دەمانویست کورسی پیرۆز لەنێو قەفەزی گولەبەند دابنیێن کاتێک کە ڕووبەڕوی جەماوەر دەبێتەوە، بەڵام هەمیشە ئەو لێنەدەگەڕا، بۆیە شتی کەممان بۆ مابووەوە کە بیکەین' .

پاپا یۆهان پاولی دوهەم لەسەر کەژاوەکەی بە دەستگرتنەوە هەڵسایە سەرپێیان. بەڵام لەپڕ بەلاداهات. یەکەمین گوللەی محەمەد عەلی ئاگجا بەر زگی کەوت و چەندان کونی لە ڕیخۆڵە ئەستورەی بەشی هەرە خوارەوەی ڕیخۆڵەکە کە بە هەناوی دەبەستێتەوە، کرد. خۆڕسکیانە پاپا دەستی لەسەر برینەکە دانا تا ڕێگەنەدا خوێن بۆ دەرەوە فیچقە بکا. دەموچاوی لەتاو ئازار گرژ بوو لەسەرەخۆ بەلاداهات و کەوتە خوارە. ئەوەش هەر چەند چرکەیەکی پێ چوو لە کاتی پێکەوتنی گوللەی یەکەمەوە.

گوللەی دوهەمی ئاگجا بەر دەستی ڕاستەی پاپا کەوت، ئەویش بەبێ هێزی کەوتە خوارەوە. خوێن بەرگی سپی پاپای سور هەڵگەڕاند. گوللەی سێهەمیش کە هی دەمانچەی کالیبەری 9ملیم بوو، بە سەروی شانی ڕاستی پاپا کەوت.

لێخوڕی کەژاوەکە سوڕایەوە بە دەمکراویی و حەپەسانەوە گەڕایەوە سەر کورسیەکەی شتێک بڵێ. سیبین بەسەریدا قیڕاند کە لێبخوڕێ. یەکێک لە یاوەرانی پاپا جەستەی خۆی بۆ پاپا کردە سوپەر. کەژاوەکە بەشڵەژانەوە کەوتە گەڕ. ئاپۆرەی خەڵکیش وەک شەپۆلی زێی لێهاتبوو بە ئاڵای باهەژێن

دەهــات و دەچــوو. کاتێــک بێــدەنگیش بــاڵی بەســەر ســەکۆکەدا گــرت، بــە حەپەسانیکی بابلییانە ئەوقسەیە کەتە نێوانەوە: 'پاپا بەر گولله درا' .

سیبین و ڤیگیلەکانی و پۆلیسەکان دەمانچەکانیان راکێشا و بە قیژاندنـەوە فەرمان و دژە فەرمانیان دەردەکردن تاکو بگەنە لای تەقەکەرەکە. ئاگجاش لە دەستی ئاپۆرەکە خۆی ڕاپچکاند و بە هـەمو هێزی خۆی و دەمانچـەش لـە دەسـتی ڕاسـتدا تێیتەقانـد. خەڵکەکـەش کـە چـەکی لەدەسـتدا دی، جێیـان بـۆ بەردا. کتوپڕ دەمانچەکەی فڕێدا. لە هەمان کاتدا بەرپێنێکیان دایێ و پۆلیسی شارەوانییەکە گەیشتە سەری و گرتی. دواتر هەردو پیاوەکە بە پۆلیسی دیکە دەورەدران. پۆلیسەکان هەندێکیان لە ئاگجا هەڵدا پێش ئـەوەی ڕاپێچـی نیـو ئۆتۆمبێلی خۆیان بکەن .

کەژاوەکە بە دەستاودەست و هێواشی گەیشـتە لای نزیکترین ئۆتۆمـۆبێلی فریـادڕەس، لـە نزیـک دەرگـا برونزییەکـەی ڤاتیکـان. فریادڕەسـەکە ئـامێری ئۆکسجینی نـەبوو بۆیـە پاپایـان گەیانـدە فریادڕەسـێکی دیکـە، بەمـە چەنـدان چرکەی زێڕین لەدەست چوون .

فریادڕەسەکە بە چرا ئاماژەدار و هۆڕنە تایبەتییەکەی ڕێگای نەخۆشخانەی جـەمیلی Gemelli کـە نزیکتـرین نەخۆشـخانە بـوو لـە ڤاتیکـان، لـە کـاتێکی قیاسی هەشت خولەکیدا بڕی. لە ماوەی نێو فریادڕەسەکەدا پاپا هیچ وشە و ناڵینێکی بێ ئومێدیانەی دەرنەبڕی تەنها لە منگەمنگی 'دایکە ماریا دایکە ماریا ' زیاتر.

لە نەخۆشخانەکە بە پەلە بە ئەسانسۆر گەیەنرایە نهۆمی نۆیەم کە هۆبـەی نەشتەرگەری بوو، پێکهاتبوو لە هۆڵیکی سڕکردن، ژورێکی نەشـتەرگەری و ژورێکی بەخۆهاتنەوە. لێرە – لـەو مەڵبەنـدی قەیرانـەدا– هـیچ شـوێنەوارێکی تۆقان و هیچ کات بە فیرۆدانێک و هیچ وشـەیەکی زیـاد نەدەبیسـترا . پاپـای پەشۆکاو دەیتوانی جارێکی دیکە هەندێ هیوا پەیدابکاتەوە.

بەرگە پانوپۆڕە لەخوێندا هەڵگەڕاوەکە و پانتلۆنەکـەی و ملوانکـە خاچـدارە ئاودامـان زیرەکـەی وەسـتایانە لەبـەر داکەنـدران. پەشـتەماڵی سـەوزی

نەشتەرگەرییان بەسەر جەستەی دا دا. بە پەنجەوانەی نەشتەرگەرییەوە ئامێرەکانی نەشتەرگەریان ئامادەکرد تاکو پزیشکی نەشتەرگەر کاری خۆی ئەنجامبدا. دوای ئەوەی پاپا پاش شەش سعاتان لە نەشتەرگەری هاتەوە هۆش، بڕوای وابوو کە بە پەڕجویەک کە لەسەر کڵێسای ڕۆمی کاسۆلیک زۆر بەڕێزەوە یادی دەکرێتەوە ڕزگار بووە، ئەویش ئاهەنگی یادکردنەوەی فاتیمە بوو لەگەڵ هەوڵی کوشتنی پاپا یەکدەگرێتەوە .

لە ماوەی مانگەکانی چاکبوونەوەیدا، پاپا بەردەوام ئەو پرسەی بەسەردا زاڵبوو ئاخۆ کێ لە پشت هەوڵی کوشتنیدا بووە. ئەو بەدوای هەر سەرەداوێک دەگەڕا کە لە لایەن پۆلیس و دەزگا زانیارییەکانیCIA، ئاڵمانی ڕۆژئاوا، وتورک و نەمساوە دەهاتن. زۆریش زەحمەت بوو هەموی بخوێندرێتەوە، چونکە تەوژمێکی زۆری پەیڤ و رونکردنەوە و لێکدانەوەکان کە بەیەکەوە ملیۆنان واژە بوون.

هیچ کام لەو بەڵگانە وەڵامی تەواویان بۆ پرسەکەی کورسی پیرۆز نەدایە دەست، ئایا کێ ویستویەتی پاپا بکوژێ؟ ئەو لە کاتی دادگاییکردنەکەی محەمەد ئاگجادا ئاگاداربوو. دادگا سێ ڕۆژی دانیشتنی بۆ سازدا، بێ ئەوەی هۆیەکانی گوللە تەقاندنی بۆ دەربکەوێ. ئاگجا بڕیاری زیندانی تاهەتایەی بۆ بڕایەوە، گەر بێت و تەواو نمونەی گوێڕایەڵانەش ڕەفتاربکا، تا ساڵی 2009دا ناکەوێتە بەر حوکمی بەردانێکی مەرجدار.

دو ساڵ دوای حوکمدانی ئاگجا ئەوسا پاپا یۆهان پاولی دوهەم بەڵێنی پێدرا کە بەرسڤی پرسە وروژێنەرەکەی وەربگرێتەوە. ئەویش لە لایەن قەشەیەکەوە بوو کە جێی متمانەی ئەو بوو، سەرۆکی کڵێسایەک کە بەفەرمی ناونیاشانی Nunzio Apostolico con Incarichi Speciali هەڵگرتبوو.
ئەو نازناوە قەبەیە نەیدەشاردەوە کە بیسکۆپ لودی پۆگی Luidi Poggi سەرۆکی دنیای نهێنی دیپلۆماتی پاپا بوو کە تایبەتمەند بوو بە زانیاری کۆکردنەوە لەسەر ڕۆژهەڵاتی ئاوروپای کۆمۆنستی. خەڵکی ڤاتیکان نازناوێکی ئاسانتریان بۆ ناوبراو هەبوو ئەویش ،جاسوسی پاپا بوو.

چەند مانگێک بوو پۆگی ڕایەڵی پەیوەندی لەگەڵ مۆساد ڕاچاندبوو. بە درەنگەوە کاتێ هەستیکرد بەرەوپێشەوەچوونێک هەیە، ئەوسا پاپای لە ڕەوتەکە ئاگادارکردەوە. یۆهان پاول هانیدا کە لەسەر ڕەوتەکە بەردەوامبێ. لەو کاتەوە دیداری لەگەڵ ئەفسەرانی مۆساد لە ڤیەننا و پاریس و وارشۆ و سۆفیا سازداوە. سەرۆکی کڵێسە (پرێلاتPrelaat ) و کاتسا هەردولایان بە دڵنیاییەوە دەیانزانی هەر لایەک چی لەوی دیکە دەوێ. دوای هەر پەیوەندییەکی نوێ دەگەیشتنە سەر سەری گەمەی داهاتو لە شەترەنجدا .

لەو نێوەدا چەند ڕۆژێک بەر لەئێستا، ئەم جارەیان لە ڤیەننا کە هەر یەک لە پرێلات و کاتسا بە شوێنێکی لەباری حەشاردراویان بۆ دیدارەکانیان دەزانی چاویان بەیەککەوت .

ئەوەش ئەو چاوپێکەوتنە بوو کە لە ئێوارەی ساردی نۆڤێمبەری 1983دا بیسکۆپ پۆگی گەڕایەوە ڤاتیکان. لە کۆتاییدا وەڵامی ئەو پرسە پرتاوەی پاپای پێ بوو: ئایا کێ فەرمانی بە ئاگجاداوە کە ئەو بکوژێ؟

# 12

## سەرکەوتوبن سەرانی جاسوسان

{ قەشـــە لـــوگی یـــوگی نوێنەرایـــەتی دیپلۆماســـیانەی بارەگـــای کورســـی پیـــرۆز.. وەزارەتـــی کاروبـــاری دەرەوەی ڤاتیکـــان..دیســـان محەمـــەد عـــەلی ئاگجـــای تـورک.. دیسـان گورگـە بۆرەکـان.. گوللـەکانی محەمـەد پاپـا نـاکوژن..ئایـەتوڵلا و پاپـا.. دیـداری قوربـانی و جەللاد ..چاو بەچاو دەکەوێتەوە.. محەمەدو ماچکردنی دەستەکانی پاپا.. دەزگا جاسوسیەکانی ئێران، لیبیاو بولگاریا لەو نێوەدا کاران..}

یەکێ لە دەرگا مۆنومێنتەکانی کاتژمێری کەوانەیی داخرا بوو- هەنگاوی یەکەمی ڕیتوێلی ئێواران کە هەمو دەرگاکان پێش سعات دوانزە دادەخران- کاتێک لیمۆسینێکی فیاتی ڕەنگ شینێکی تاریک گەیشتە بەردەم جادە بەردینەکەی دەروازەی دەرگاکە، ئەنجا لەبەر تیشکی چرا دو پاسەوانی سویسری هاتنەپێش. هەردوکیان لەبەر سەرما خۆیان باش پێچابوو. لە دوای ئەوانیش ئەندامێکی ڤیگیلی ڕاوەستا بوو. یەکێک لە پاسەوانەکان زیاتر هاتە پێشەوە و دەستێکی هەڵبڕی کە هەم نیشانەی سڵاو بوو هەم نیشانەی ڕاوەستانیش بوو. ئۆتۆمبێلەکە وەستا و دەموچاوی لیخوڕەکە دەرکەوت: یەکێک بوو لە شوفێرەکانی ڤاتیکان، بەڵام دوای تەقەکردن لەپاپا کەس نەیدەویست سەرکێشی بکا.

شوفێرەکە لە فڕۆکەخانەی ڕۆماوە چاوەڕوانی دابەزینی فڕینی ڤیەننای دەکرد، بەڵام لەبەر باری نالەباری کەشوهەوا هەندێ دواکەوت. پاسەوانە چەکدارەکە گەڕایەوە دواوە، دەستیشی بۆ لای چاوی بەرزکردەوە بۆ سڵاوکردن لەو بیچمە ڕەشتاڵەیەی کە لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبوو. سڵاوەکە وەڵامنەدرایەوە.

ئۆتۆمبێلەکە بەلای دیواری گۆڕەپانی سنت پیتەر و بەسەر جاددە بەردینەکە و باخچەی داماس تێپەڕی. ئیدی ئۆتۆمبێلەکە لە بەردەم دەروازەی سەرەکی کۆشکی پاپایەتی وەستا. شوفێرەکە گورج دابەزی تا دەرگا بۆ سەرنشینی دواوە بکاتەوە. جەنابی بیسکۆپ لوگی پۆگی Luigi Poggi بە بەرگێکی ڕەشی قەشەییانەوە دابەزی. تەنانەت هێڵە ئاودامانە سپییەکەی بە لاری لەژێر شاڵە ڕەشەکەی دەبینرا. بە ڕواڵەت لە ڕافی ئیتان دەچوو، هەمان شانی بازودار و سەرشانیان هەبوو، هەمان شێوازی ڕۆیشتن و نیگایەک بە سەرمای ئەو شەوەی نۆڤێمبەرەیان هەبوو.

وەک هەموجارێک پۆگی هەگبەیەکی بچوکی بەرگ پێستی پێبوو کە شتە تایبەتییەکانی خۆی لەناو هەڵدەگرت لەگەڵ جانتایەکی بەرگ پێستی دەست بۆ لەناونانی بەڵگەنامەکان. هەندێ جار دەیگوت کەوا کاتی خۆی زیاتر لەنێو فڕۆکەدا بەسەردەبا لەوەی نێو جێگای لە باڵەخانەکەی کە شوێنی مانەوەی بەردەوامی بوولە کۆشکی پاپایەتی.

کەم بوون ئەو وێستگانەی وەک ئەوەی ئێستای کە هەواڵێکی نوێی لە گەڕەکی جوان لە ڤیەنناوە هێنابێتەوە. لەوێ لەخانویەکی تەسک و بچکۆڵەی کە هەر سەد مەتر لە نوسینگەی سیمۆن ویسنتالSimon Wiesnthal ی نازی ڕاونەرەوە دور بوو، بە هەناسەلەخۆبڕین گوێی لە پیاوێک دەگرت کە تەنها دەبوایە بەناوی ئالی Ali ناسیبا .

پۆگی لە میانەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆساددا لەو جۆرە ڕێکارانە ڕاهاتبوو. کەس بێجگە لە پیاوانی ئاژانسی نهێنی ئیسڕائیل ئەو جۆرە کارانەی درێژە پێنەدەدا. تاکە تایبەتمەندی ئالی کە ئاشکرای کردبا، ئەوە بوو کە ناوبراو زۆر زمانی دەزانی و لە کۆتاییدا بەرسڤی ئەو پرسەی دایەوە ئاخۆ کێ لە پشت کردەی تەقە لە پاپا کردنەوە بووە.

لە ڕویێکی دیکەوە کاری لوگی پۆگی ئەوەندە نهێنی بوو تەنانەت Annuario Pontificio کە دەفتەرێکی ناونیشانهەڵگری ڤاتیکانە و هەمو ناو و ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی کارمەندانی ڤاتیکانی تێدا تۆمارکراوە، بە

هیچ شێوەیەک لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی ڕابردودا باس لە جموجۆڵەکان و پەیوەندییە نهێنییەکانی بیسکۆپ پۆگگی نەکراوە، کە هەر لە کرملینەوە تا واشنتۆن تا زۆر لە کابینەی حکومەتەکانی ئاوڕوپادا هاموشۆی هەبوو. ئەو یەکێک بوو لە یەکەمینەکان کە هۆی مردنی سەرۆکی یەکێتیی شۆرەوی یوری ئەندرۆپۆڤ Joeri Andropov ی بە نەخۆشی هەوکردنی جگەر زانی. پۆگی بەخۆی چووبووە تەلاری باڵوێزخانەی شۆرەوی لە جنێڤ، کە کۆشکێکی سەدەی نۆزدەهەمی پڕ لە باشترین ڤۆدکا و کاڤیار بوو، پڕ بە پێستی مجێزی بیسکۆپ، لەوێ یەکەمین هەنگاوی نا، بەوەی یەکێتیی شۆرەوی ئامادەیە ڕۆکێتە ناوەکییە ئاراستەکراوەکانی بەرەو ئاوروپا بکشێنێتەوە، گەر هاتو واشنتۆن کەمتر پێ لەسەر دۆزی چەک داماڵیندا بگرێ. هەواڵەکە لە یەکەمین ئێوارەی هەینی دوای ئەو ڕۆژە گەیەنرایە سەرانی CIA لە ڕۆما. ماوەی بیست ساڵ بوو پۆگی زانیاری ورد وردی وای دەدایە سەرۆکی خۆی پاپا، کەوایان لێبکا زانیارییەکانیان بەرامبەر بناوانەکانی دیکەی زانیاریی باشتر هەڵبسەنگێندرێن. بیسکۆپی ناوبراو لەنێو دیپلۆماتەکاندا وا کارامە بوو لە ماوەیەکی کورتدا هاوسەنگی حوکمدانەکانی لەسەر زانیارییەکانی نێوان دە سەرچاوە بە دە زمانی جیاجاش کە بە باشی قسەی پێدەکردن، ڕابگرێ.

هەروەها لە دواچاوپێکەوتنی لەگەڵ ئالیدا، بیسکۆپ پۆگی کە بە دەنگێکی نزم و نەرم دەناسرایەوە دەئاخاوت، چاوە قاوەییەکانیشی وشیارو ژێی لێوەکانیشی گرژدەبوون کاتێ خۆی بۆ پرسێک ئامادە دەکرد، بەڵام دەموچاوی بەردوام لەسەرەخۆ و ئارام بوو.

بۆ ئەو لەو شەوە ساردەی نۆڤێمبەردا کە لە گەشتێکی ماندودا گەڕابووەوە، باکی نەبوو بە پەلە لە پلیکانەکان سەرکەوت. ئەو یەکسەر بۆ ناوەوە ملی نا و ڤیگیلیەکەی بازدا و بە بەردەم پاسەوانە ئامادەبووەکان بەرەو ئەسانسێرەکە تێپەڕی تاکو بگاتە هۆڵی پاپا.

بەردەستە تایبەتییەکەی پاپا ڕێگەیدا بچێتە ژوری خوێندن. ڕەفە پڕ کتێبەکان پەرۆشی باوکی پیرۆزیان لە کاروباری جۆراوجۆر نەدەشاردەوە. لەپاڵ کتێبە بەرگ پێستەکانی کتێبە کلاسیکییەکانی پۆلۆنی، دانراوەکانی هەمەجۆری ییناسی و فەلسەفە دانەی کتێبی International Defense Reviewو The Problems of Military Readiness و Military balance and Surprise Attackی لێبوو. ئەوانە ئەوەیان ڕەنگدەدایەوە کە پاپا بڕوای وابوو دوژمنی هەرە لەپێش کە جیهانی ئازادی لە 1983دا دەخستە ژێر گەڤەوە، هەمیشە هەر کۆمۆنیزم بوو.

پاپا یۆهان پاولی دوهەم هیچ بۆنەیەکی نەدەبوارد تاکو بۆ کارمەندەکانی خۆی بەدڵنایییەوە ئەوە دوبارەنەکاتەوە کە پێش سەدەی نوێ ' گۆڕانکاری چارەنوسسازانە' لە جیهاندا سەرهەڵدەدەن. هەرچەندە پرسی زۆر دەربارەی سەروکاری ئەو گۆڕانکارییانە دەکران، بەڵام پاپا زیاتری لەسەر نەدەڕۆیشت. ئەو تەنها ئەوەندەی دەگوت کە لەسەر هەمومان پێویستە نوێژبکەین تاکو کەنیسە چیدیکە نەبێتە گۆڕەپانی کۆمۆنیزم یان سێکیولاریزم کە هەڕەشەی دەستەڵاتڕۆیشتن بەسەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و ئاڵمانی خۆرئاوا و هۆڵەندادا دەکا. ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە خانمە خۆشەویستەکەمان فاتیما Fatima گیانی ئەوی لە گۆڕەپانی سنت پێتەر پاراست تاکو ڕابەڕایەتی ململانێی ئەو پێشهاتانە بکا.

پۆگی دەیزانی کە ململانێیەکە - زیاتر لەهەمو ململانێکان - چ لە ڕوی دەرونی چ لە ڕوی جەستەیی زۆر لەسەر پاپا دەکەوێ. دوای سڵاو گۆڕینەوە لەگەڵ یەکدی پۆگی نەیتوانی ئەو سەرنجەی لاپەیدا نەبێ کە پاپا لە ژورە تایبەتییەکانی خۆیدا لە جاران زیاتر خەریکی خۆیەتی. گوللەکانی محەمەد عەلی ئاگجا نەوەک هەر پەردە تەنکەکانی هەناوی زیانمەند کردووە، بەڵکو جێبرینی بەسەر لایەنی سۆزیشدا بەجێهێشتووە، وای لەپاپا کردووە زیاتر بچێتە ناخەوە و هەندێ جارانیش داببڕێ.

پۆگی دانیشت و دەستی لە ئەژنۆ وەرینا، ئەو ڕەفتارەش کە دەریبڕی ئەوە بوو کە هەواڵێکی گرنگی پێیە. ئەوسا دەستی بە گێڕانەوەی ئەوە کرد کەچی لە هەفتەی یەکەم و دوهەمی دوای تەقەکردنی ئاگجا رویدا.

کاتێک هەواڵی ڕوداوەکەی گۆڕەپانی سنت پیتەری 13ی ئایاری 1981 گەیشتە تەلئەبیب، بەڕێوبەری گشتی ئەوکاتی مۆساد ئیسحاق هوفی دەستبەجێ گوتی ئاخۆ ئەو کردەوەیە هی چ شێتێک بووە. هەرچەندە ڕوداوەکە لە ڕۆما هەژێنەرانە بوو، کەچی لە دەرەوەی بازنەی مشورخواردنەکانی مۆساد بوو.

تادەهات عەڕەبەکانی نێو ئیسڕائیل ڕادیکالانەتر دەبوون، لە بەرامبەریشدا توندڕەوە جووەکان بە ڕێبەرایەتی ئەندامانی پارتی کاهنە کاخ Kahne Kach تادەهات مرازی خۆیان لە توندوتیژی زۆردا دەدیتەوە. لە دواچرکەساتدا دەزگای نهێنی بەسەر ئەوە ڕاگەیشت کە پیلانێکی توندڕەوەکان بۆ تەقاندنەوەی مەزارە پیرۆزەکەی موسڵمانان لە ئۆرشەلیم؛ مزگەوتی عومەر یان گومبەتە بەردینەکە پوچەڵ بکەنەوە. گەر هاتباو توندڕەوەکان لە تەقاندنەوەکە سەربکەوتبان، ئەوا دەرهاوێشتەکەی دێوەزمەیەکی گەورە دەبوو بۆ ئیسڕائیل. شەڕی لوبنان هەرچەندە دیپلۆماتەکانی ئامریکایی لە نێوان دیمەشق و بەیروت و ئۆرشەلیم دەهاتن و دەچوون، کۆتایی نەدەهات. کابینەی حکومەتی ئیسرائیل لە لایەن مناحیم بێگنەوە سەرۆکایەتی دەکرا، کە سەرۆکی پارتێک بوو دەیەویست ' بەپێوەری هێزێکی بڕیاردەری یەکلاکەرەوە' لەگەڵ PLO بجولێتەوە. کوشتنی عەڕەفات هێشتا مژارێکی بەردەوامی مۆساد بوو: لە هەمان مانگ کە تەقە لە پاپا کرا، دو هەوڵی سەرنەکەوتو بۆ کوشتنی سەرۆکیPLO دران .

ڕاستی ئەوەی کە دەزگا زانیارییەکانی ڕۆژئاوا لێکۆڵینەوەی خۆیان لەسەر هەوڵی کوشتنی پاپا دەستپێکرد، بووە مایەی ئەوەی کە هۆفی بڕیاربدا مۆساد خۆی لەو پرسەدا هەڵنەقورتێنێ. هەرچۆنێک بێ وای دانابوو کە

ئەمڕۆ  یان سبەی لە لایەن یەکێ لە دەزگا دۆستەکان لـە پاشـخانی دۆزەکـە ئاگاداردەکرێتەوە .

ئەو لە گریمانەکەدا بە هەڵـەدا چووبـوو، چونکـە لـە سـێپتێمبەری 1982دا لادراو ناحوم ئادمۆنی جێگەی گرتەوە. لە سۆنگەی پاشخانە پۆلۆنییەکەی – چونکـە باوانی لـە چینـی مامناوەنـدی گدانسـک Gdansk بـوون کـە بـەرەو ئیسـڕائیل کۆچیـان کـرد – هـەر زو ئـادمۆنی بـە بایەخـەوە سـەیری کڵێسـای ڕۆمای کاسۆلیکی کرد. کاتێ ئـەو لـە ژێـر دەمامکـەوە لـە فـەڕەنسـا و وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئامریکا کاریدەکرد، بۆی دەرکەوت کە دەستڕۆیشتنی کڵێسە چەند زۆرە. ڕۆما پشکی خۆی لە هەڵبژاردنی کینێدی John F.Kennedey بە سەرۆکدا هەبوو، هەروەها لە فەڕانسەش کڵێسە ڕۆڵێکی گرنگی لە بواری سیاسیدا وازیکرد.

یەکسەر دوای وەرگرتنی پۆستەکەی، ئـادمۆنی دۆسـیەی مۆسـادی لەمـەڕ ڕوداوەکـە  خسـتە ژێـر تیشـکەوە. فایلەکـە بریتـی بـوو لـە چەنـد ڕوپـەڕێکی ڕۆژنامەکان لەگەڵ ڕاپۆرتی کاتسای ڕۆما کە هیچ شتێکی تێدا بەدینـەدەکرا. ئەوەی کارپێکراو نەبوو کە تائێستا شەش دەزگای زانیاری نێهێنـی ڕۆژئـاوا بـە لێکۆڵینەوەکـە خـەریک  بوون و دیداریشـیان لـە ژێـر چاودێری توندەوە لەگـەڵ خـودی ئاگجـا لـە زینـدانـدا  کـردووە، کـەچی هێشـتا زانیارییـەکانیان یەکنەخراون. ئادمۆنی بڕیاریدا خۆی دەست بە لێکۆڵینەوە  بکا.

ولیەم کێیسی کە تا ئەوکات هەر بەڕێوبەری گشتیی CIA بوو، دواتر گوتی لەوانەیـە هـۆی بـەدواداچوونی ئـادمونی بـۆ دۆزەکـە ئـەوە بـێ کـە 'مۆسـاد دەرفەتێک ببینێ بۆ نزیکبوونـەوە لـە ڤاتیکـان. ئـادمۆنی لـەو بیرۆکەدایـە کـە شتێک ببینێتەوە لە بەرامبەریدا لەگەڵ کورسی پیرۆزدا ئاڵوگۆڕی پێبکا' .

دوای سـەرنەکەوتنی تەقەللای گۆلدا مـایر بـۆ ڕاچانـدنی تـۆڕی پەیوەنـدی دیپلۆماتیانە لەگەڵ ڤاتیکاندا، زڤی زامیر بڕیاریدا نوێنەرایەتییەکی بەردەوام لە ڕۆما دابنێ، بەڵکو بتوانێ لە ڤاتیکان نزیکببێتـەوە. کاتسـاکە لـە خانوێیـک کـە دور نەبوو لە باڵوێزخانەی ئیسڕائیلەوە لە ڕۆما دەستبەکاربوو، ئەویش چەند

هەوڵێکی بێهودەی دان تاکو زانیاری لە قەشەکان کۆبکاتەوە. ئەو ڕاپۆرتانەی ئەو گەیاندنی شتێکی وانەبوو، لە قسەی کارمەندانی خۆبەخۆی ڤاتیکان لە باڕ و چێشتخانە و قاوەخانەکاندا زیاتر نەبوو. ئەوان ئیرەییان بە سەرۆکی هۆبەی CIA لە ڕۆما دەبرد کە چۆن هەمو ئێوارانی هەینی بێڕێلێگرتن گفتوگۆی هەفتانەی لەگەڵ پاپادا سازدەدا، دوای ئەوەش پاپا لە برینداربوونەکەی چاکبووەوە و دەست بە دانیشتنەکان کرایەوە.

لە ماوەی لەسەرجێگاکەوتنی پاپا بۆ چاکبوونەوە، ڤاتیکان لە لایەن وەزیری کاروباری ڤاتیکان ئاگۆستینۆ کاسارۆلی Agostino Casaroli وە سەرپەرشتی دەکرا . کاتساکە گوێی لەوە بوو کە کاردینال کاسارۆلی یەک دوو تێبینی دیپلۆماتیانەی لەسەر CIA داناوە: بە گوێرەی ئەو، دەزگای نهێنی ئامریکایی لە پلانەکەی ئاگجا ئاگادار بووە. کاتسا ئەو بڕوایەی کاردینالەکەی گەیاندە تەلئەبیب.

لە نێو دەزگای زانیاریی ئامریکادا ئەو بیرۆکەیە زاڵ بوو، کەوا ئاگجا داردەستێکی KGB بووە و پیلانی ئەوانی بۆ کوشتنی پاپا جێبەجێکردووە. لە ڕاپۆرتێکیاندا کە مۆری زۆر نهێنی لەسەر بوو بە ناونیشانی هەوڵی کوشتنی پاپا لە لایەن ئاگجاوە، بەڵگە و بەندی هۆکاری تێوەگلانی KGB بەوە لێکدراوەتەوە کە پاپا بووبێتە ئاگری بن کای ناسیونالیزمی پۆلۆنی.

لە ساڵی 1981دا هاوپەیمانی ڕێکخراوە پشەییەکانی پۆلۆنی لەژێرناوی هاوکاری لە لایەن لیخ والیسا Lech Walesa ڕابەرایەتی دەکرا، بەهەمو هێزی خۆیەوە ملی لەبەر ملی حکومەت نابوو، شۆڕەویش گوشاری دەخستە سەر حکومەت تاکو چالاکییەکانی هاوکاری دابمرکینێتەوە.

پاپاش پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە نابێ لیخ والێسا کارێکی وا بکا ببێتە مایەی دەستتێوەردانی سەربازی شۆڕەوی لە پۆلۆنیا. هەروەها پاپا کاردینالی پۆلۆنی ستیفان ویزنسکی Stefan Wyszinski ناردە لای شۆڕەوی بۆ ئەوەی سەرکردە کۆمۆنیستەکان دڵنیابکاتەوە کە لێناگەڕێ هاوکاری زیاتر پێ لەبەڕە ڕابکێشێ. کاتێک هاوکاری ویستی مانگرتنێکی

سەرتاسەری ڕابگەیەنێ، کاردینال ویزنسکی خۆی گەیاندە والێسا پێداگیری کرد کە نابێ مانگرتنەکە بکرێ ئەگینا ناڕوا تا نەمرێ. والیساش مانگرتنەکەی هەڵوەشاندەوە.

لێکدەرەوەکانی مۆساد گەیشتنە ئەو دەرەنجامە کە پاپا لەبەر بەرژەوەندی پۆلۆنیا نایەوێ شۆڕەوی تەواو بکاتە دوژمنی خۆی، بۆ ئەوەی ئەو دەستکەوتە بەرچاوانەی هاوکاری تاهەنوکە بەدەستی هێناون، لەبەیننەچن. مۆسکۆش هەرگیز وا گەوج نەبووە پیلانێک بۆ کوشتنی پاپا دابنێ، بەڵام هێشتا ئەگەرێک مابوو کە جێبەجێکردنی هەوڵی کوشتنەکە بە وێستگەی دەزگایەکی زانیاری دیکە بپسێرن. لە ڕابردودا دەزگای نهێنی بولگاری KGB کردەی لەو جۆرەی کە زۆر پێویست بێ و بە نهێنیش بهێڵرێتەوە بۆ ئەنجامداون. لەسەرێکی دیکەشەوە لێکدەرەوەکان پێیانوابوو ئەوەش لەکردن نایە، کە کارێکی واگرنگ بەخەڵکی دیکە بسپێرن. بولگارییەکانیش هەرگیز بە دەستپێشخەری خۆیان ئەو کارەیان نەدەکرد .

ناحوم ئادمۆنی زیاتر لە پەیوەندی هەنوکەیی نێوان CIA و کورسی پیرۆز قوڵبووەوە. لە پاڵ سەردانی سەرۆکی هۆبەی CIA لە ڕۆما بۆئیشی هەفتانەیان، یاریکەرێکی گرنگتریش لە پەیوەندی هەردولایاندا هەبوو، ئەویش کاردینالی فلادیلفیا جۆن کرۆل John Krol بوو کە لە نێوان کۆشکی سپی و کۆشکی پاپایەتیدا لە هاتوچۆدا بوو. بە گوێرەی مسیۆنێر جۆن ماگی سکرتێری تایبەتی پاپا، کاردینالی کالیفۆرنی 'برادەرێکی لەپێشی باوکی پیرۆز بوو. هەردوکیان هەمان پاشخانیان هەبوو، سرودی نەتەوەیی پۆلۆنییان دەزانی و چیرۆک و سەربردەیان لەسەر مێز بە شیوەزاری پۆلۆنی کە زێدگای پاپا بوو، بۆیەکدی دەگێڕایەوە. ئێمەی غەیرەش بەپێکەنینەوە بەدیاریانەوە بێ ئەوەی هیچیان لی تێبگەین ڕادەوەستاین' .

کاردینال کرۆل ئەو پریلات(نوێنەر)ە بوو کە کێیسی بەڕێوبەری CIA ی دوای چاکبوونەوەی پاپا لەگەڵ خۆیدا برد بۆلای پاپا. دواتر کاردینالەکە نوێنەری کێیسی ڤێرنۆن والتەرسVernon Walters ی بە پاپا ناساند.

قسەوباسی پیاوەکەی CIA دەربارەی تیرۆرزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا سیاسەتی کڵێسە و لەشساخی ئاکنجیانی کرەملینی دەگرتەوە. ڕیچارد ئالن Richard Allenی ڕۆمی کاسۆلیک کە ئەوکات ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ڕێگان بوو بەخۆی گێڕایەوە: ' پەیوەندی نێوان CIA و پاپا هاوپەیمانێتییەکی گەورەی ئەو سەردەمە بوو. ڕێگان تەواو لەو بڕوایەدا بوو کە پاپا یارمەتی دەدا بۆ گۆڕینی جیهان' .

ئەوە ڕاستی بوو کە ئامانجە هاوبەشەکان دیارکرابوون. پاپا و سەرۆکی ئامریکا ڕایانگەیاند کە دژی کردەی منداڵ لەباربردنن. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا پشک هەبوونی یەک ملیۆن دۆلاری بۆ پرۆگرامێکی پەرەسەندنی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو وڵاتانە ڕاگرت کە دەیانویست ڕێژەی زاوزێ سنورداربکەن. لە لایەن خۆشیەوە پاپا لە ڕێگەی' بێدەنگی بە مەبەست' پشتگیری سیاسەتی سەربازییانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکای دەکرد، هەروەها لەو کاتەش کە ئامریکا ڕۆکێتی نوێی دورهاوێژی خستە بەردەم ناتۆ NATO . دەزگای CIA بەردەوام گوێی بۆ تەلەفۆنەکانی بیسکۆپ و پریستەرو قەشەکانی ناوەڕاستی ئامریکا هەڵدەخست، کە ئادیۆلۆژیای ڕزگاریخوازانەیان بڵاودەکردەوە و دژی پشتگیری ئامریکاش بوون بۆ جونتای نیکاراگوا و سلڤادۆر کە شەڕی بزوتنەوەی چەپی گەریلاکانیان دەکرد. بێگومان دەرهاوێشتەی تەلەفۆنەکانیش لە دانیشتنی هەفتانەی پیاوەکەی CIA لە ڕۆما لەگەڵ پاپادا باسدەکرا. سەرۆک ڕێگان بە خۆی فەرمانی دایە ئۆلیڤەر نۆرس Oliver North کاربەدەستی باڵای ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە قەرەبوی باشی پریستەرە دڵسۆزەکانی ڤاتیکان لە باشوری ئامریکا وئافریقا و ئاسیا بکاتەوە، پارەکەش بۆ شێوە ژیانی خۆشگوزەرانی بۆ پاڵپشتکردنی هەڵویستی نەیارانەی کورسی پیرۆز لە بەرامبەر سنوردارکردنی زاوزێ و تەڵاقدان بەکارهێنرا.

یەکێک لە ئیشەکانی سکرتێری تایبەتی پاپا مسیۆنێر ئێمری Emry Kabango ئەوە بوو کە بەردەوام لیستی پریستەرە دڵسۆزەکان بۆ پاپا

نۆژەنبکاتەوە. ئیشێکی دیکەشی ئەرشیفکردنی ئەو بەڵگەنامانە بوون کە CIAدەیدانە کورسی پیرۆز لەگەڵ کۆنوسی دانیشتنەکانیان.

کابانگۆ کەمێک دوای چاکبوونەوەی پاپا لە 30 نۆڤێمبەری 1981دا سەرە جاسوسەکانی واشنتۆنی دیتن. دوای ئەوەی کابانگۆ یەکەمین نوێژەکانی سەرەتای ڕۆژی لای ژورەکەی پاپا کردن، ئەنجا لەگەڵ پاپا هەردوکیان بە یەکەوە لە سعات پینج و چارەگدا بەرەو هۆڵی پاپا چوون، لەوێ پێشوازیان لە ڤێرنۆن والتەرس یاریدەدەری بەڕێوبەری CIA کرد. مسیۆنێر کابانگۆ ئاوای بەبیردا هاتەوە:

'ئەز لە گۆشەیەکی ژوری خوێندنەکە دانیشتم و دەفتەری کۆنوسیشم لە سەر چۆکدا دانا. هیچ وەرگێڕێک لەوێ نەبوو. ژەنەڕاڵ والتەرس دەیویست بزانێ بە چ زمانێک قسان بکا. جەنابی پاپا پێیگوت کە بە ئیتاڵی بدوێ باشترە. والتەرس بە گەیاندنی سڵاوی سەرۆک ڕێگان دەستیپێکرد. پاپاش وەڵامی سڵاوی بە سڵاو دایەوە. ئەنجا یەکسەر مەبەستی سەرەکی چاوپێکەتنەکەی باسکرا. والتەر لەناو هەگبەی دۆکیۆمەنتەکانیدا هەندێ وێنەی سەتەلیتی دەرهێنان و نیشانی پاپای دان، پاپاش لە وردەکاری وێنەکان سامگیر ببوو. یەک سعات والتەرس بە باس و خواسی ئامانجی نوێی شۆرەوی و ڕوانینی CIA ەوە خەریک بوو. لە کۆتایی ئاخاوتنەکەدا والتەرس چەند مومێکی پەمەیی دەرهێنان و خستنیە سەرمێز، داوای لە پاپا کرد بۆ خزم و برادەرەکانی لێیان بفرێسمێ. ئەویش وای کرد' .

بۆ زانینی ئەوەی کە چۆن دەکرێ سەرنجی پاپا لە کاروباری دەرونی بۆ دنیایی وەربگێڕدرێ، ناحوم ئادمونی دۆستایەتی خۆی لەگەڵ ژەنەڕاڵی دێرین و وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەککرتووەکانی ئامریکا ئەلکساندەر هیگ Alexander haig (ئەوان لەو کاتەوە یەکدیان دەناسی کە ئادمۆنی لە باڵویزخانەی ئیسرائیل لە واشنتن کاریدەکرد) بەکاربینێ تا دەستنوسیکی دەرونناسانی CIA سەبارەت بە ڕەوشی دەرونی باوکی پیرۆز بکەوێتە بەردەست.

ڕاپۆرتەكە لەسەر پیاوێكی ئۆلداردا بوو كە هەندێ جار وا قوڵ دەچووە نێو درودەكانی و دەستی بە گریان دەكرد، هەندێك جاریش لەسەر بەردی مەڕمەڕی ژورە تایبەتییەكەی دەبینرا: كەوتۆتە سەرچاوان هەردو باسكیشی بەچەشنی خاچ لەخۆی جیاكردونەتەوە ، وەك مردو هەستی لەخۆبڕیەوە. ئەو دەیتوانی بەسعاتان لەسەر ئەو ڕەفتارەی بەردەوامبێ، بەڵام زۆر جارانیش توڕەییەكەی تەقێنەرەوە و ترسناك بوو: ئەوكات بەدەنگی بەرز هاواریدەكرد. خۆتێكەڵكردنی لە سیاسەتی دنیادا سەرنجراكیش بوو، وەك دكتاتۆرێكیش چۆكدادانی نەبوو. هەروەها پاپا یۆهان پاولی دوهەم لە ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ Curi واتە وەزیری كاروباری ناوەخۆی ڤاتیكان، یان لەگەڵ دیپلۆماتی ئەزمونداری وەزیری كاروباری دەرەوە ئاگۆستینۆ كاسارۆل نەدەسڵەمیەوە. بە گوێرەی ڕاپۆرتە دەرونناسیەكە پاپا لەسۆنگەی ئەزمونە پۆلۆنییەكەی 'بەسیاسیكراوە ' و چێژیشی لەوە وەردەگرت كە ڕۆڵێكی سەرەكی لە سیاسەتی جیهاندا بگێڕێ.

لە چاوی ناحوم ئادمۆنیدا تەنها شتێك دەبریقایەوە: ئەویش ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵە دولایەنییەی نێوان پاپا و CIA بۆتە مایەی ئەوەی كە پاپا ڕوانینە ئامریكاییەكە لەسەر كردەی كوشتنی لە لایەن كرەملینەوە وەربگرێ.

بەڵام وا دابنێ كە گریمانەكە ڕاست دەرنەچوو، ئایا كاردانەوەی پاپا ئەوكات چۆن دەبێ؟ ئایا متمانە بوونی بە CIA درزی گەورەی تێناكەوێ؟ ئایا وایلێناكات كە دەبێ لەمەوپاش بەرامبەر هەر دەزگایەكی نهێنیی پێویستە وشیارتر بێ؟ ئایا ئەوكات مۆساد گەر توانی بسەلمێنێ دەستێكی دیكە لە پشت هەوڵی كوشتنەكەدا هەبووە، لە كۆتاییدا نابێتە مایەی ئەوەی دەرگا برۆنزییەكانی ڤاتیكان بە ڕویاندا بكرێنەوە؟ ڕەنگبێ گریمانەكە وەك ڕاوێژێكی دەزگایەكی نهێنیی تەواو نەیەتە جێ، بەڵام بەلای كەمی بۆ مۆساد دەرفەتێكە بە هۆی زانیارییە سەرنجڕاكێشەكان تەكانێك بە كورسی پیرۆز بدا و ڕەفتارەكەیان بەرامبەر ئیسرائیل پێبگۆڕێ.

شەش مانگ دواتر ئادمۆنی وەڵامێکی ئاسودەی بۆ یەکەمین پرسی پێگەیشت: ئایا کەسێکی دیکە دەستپێشخەر بوو بۆ هەوڵی سەرنەکەوتوی تیرۆرکردنەکە؟

پیلانەکە لە ئێران بە پەسەندنامەی تەواوی ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی داڕێژرابوو. کوشتنی پاپا دەرگا کرانەوەیەکی جیهاد بوو، ئەو شەڕە پیرۆزەی دژی ڕۆژئاوا کە خومەینی پێیوابوو نۆرم و بەهاکانی ڕۆژئاوا لە لایەن کڵێسەی کریستیانەکانەوە سەلمێنراوە.

ئەو ڕاپۆرتەی بۆ ئادمۆنی ئامادەکرابوو، تیای دەخوێندەوە: 'خومێنی سەرمەشقی فێرگە دینییە فاناتیکەکان بوو. ئەو خۆی بە مامۆستایەکی لە خواوە ڕاهاتو بۆ گەلەکەی دادەنا. تاکو ئەفسانەکە ڕابگرێ دەبوایە بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکا کە بە ئاستێکی هەڵچوو مەترسی بێ بۆ سەر ئیسرائیل و رۆژئاوا و لە ڕاستیشدا بۆ سەر تەواوی جیهان' .

لە بارێکدا گەر هەوڵی ئاگجا بۆ کوشتنی پاپا سەرنەگرێ، ئەوا سەرپەرشتیکارانی لە تاران ئاگجا بە فاناتیکێکی تاک ڕەهەندیان لەقەڵەمدا و لەگەڵ ئەوەشدا هەندی وردەکاریان بڵاوکردەوە. محەمەد عەلی ئاگجا لە گوندی یەسلتەپە Yesiltepe ی ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە دایکبووە، هەر لەوێش لە باوەشی ئسولگەراکانی ئیسلامی پەروەردە بووە. لە تەمەنی نۆزدەساڵیدا چووەتە ڕیزی گورگە بۆرەکان، ئەو تاقمە تیرۆرستەی لە توندوتیژی تورکیا بەرپرسیار بوون کە بە ئاستەم ڕژێمی دیموکراسی خۆی لێ پاراست. لە فیبرایری1979 دا ئاگجا سەرنوسەری ئەو ڕۆژنامەی کە بە هەواداریێتی ڕۆژئاوا تۆمەتبارکرابوو لە ئەستەمبۆلدا کوشت. دوای گرتنی بە یارمەتی گورگە بۆرەکان لە زیندانندا دەرهێنرا. لە ڕۆژی داهاتودا هەمان ڕۆژنامە نامەیەکی تەزی ئاسایان لەمەڕ سەردانی پاپا بۆ تورکیا دوای سێ ڕۆژ پێگەیشت. لە نامەکەدا هاتبوو:

'ڕۆژئاوای ئیمپریالیستی، لە ترسی ئەوەی تورکیا و وڵاتە ئیسلامییە براکان باری سیاسی و سەربازی و ئابوریان پەرەپێداوە، ئا لەو کاتە

چارەنوسسازەدا جێبەجێکاری کشانی لەشکری خاچداران یۆهان پاولی دوهەم لەژێر دەمامکی سەرکردەیەکی ئاینییدا دەنێرنە تورکیا. گەر بێت و سەردانەکە هەڵنەوەشێتەوە ئەوا من بە مەبەستەوە ژەنەڕاڵ پاپا لەناودەبەم' .

ئادمۆنی لەو بڕوایەدا بوو کە نامەکە لە تاران نوسرابێ، چونکە چ لە ڕوی شێواز و چ لە ڕوی ناوەڕۆکەوە نامەکە کە ڕەوانبێژییەکی زمانەوانی تێدا بوو، کەسێکی نیمچە خوێندەواری وەک عەلی ئاگجا دەرەقەتی نوسینی نەدەهات. لێکدانەوەی کۆمپیوتەرەکانی مۆساد ئەوەیان لە دوانەکانی خومەینیدا هەڵکڕاند کە ئەویش پاپای بە 'جێبەجێکاری کشانی لەشکری خاچداران' و ' ژەنەڕاڵ پاپا' ناساندووە.

لەدوایدا سەردانەکەی پاپا بۆ تورکیا هیچ ڕوداوێکی لێنەکەوتەوە. پۆرترێتی ئاگجا لە کۆمپیوتەری زۆر لە دەزگا زانیارییەکاندا بێجگە لە هی مۆساد هەبوو. ئۆتۆ کۆرمێک Otto Kormek کارمەندی دەزگای نهێنی نەمسا کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوو لەسەر ڕوداوی هەوڵی کوشتنی پاپا، بە پێویستی نەزانی مۆسادی لێ ئاگاداربکاتەوە'. ئیسرائیل لەو دنیایەدا دوا شوێن بوو کە ئاگجای بۆ چوو با' .

لێکۆڵینەوەی مۆساد دەریخست کە ئاگجا دوای دەرهێنای لە زیندان ئاودیوی ئێران کراوە، لەوێ بە مانگان لە کەمپی ڕاهێناندا بووە و ڕێنماییەکی تەواوی پێدراوە. بە هۆی سەرچاوەی تایبەت لەو کەمپەدا دیمەنی ژیانی ئاگجا لەو ماوەیەدا بۆ مۆساد ڕۆشن بوو.

ئەو سەرلە بەیانیانی زو لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لە ئۆردوگاکەدا بە مەشقکردن بەسەریدەبرد. وێنەیەکی گەورەی ئایەتوڵڵا خومەینی لەسەر دیوار لەپاڵ دروشمە شۆڕشگێڕییەکان بەو ئاراستەیە بوون کە ( درێژە بە کاری فاناتیکیانەیان بدەن). بڵندگۆکانیش لەو ڕۆژەدا سرودی وروژێنەرانەی هەمان مەبەستیان لێدەدا.

لە بن کراس و دەرپێ کورتەکەیدا ئاگجا دیمەنێکی سەرنجڕاکێش بوو: دوو لەپ و پێیە گەورەکانی لە چاو جەستەکەی، سینگە قوپاوەکەی باسک و لاقە

لاوازەکانی دیمەنێکی ناوازەیان نیشاندەدا. سەرەتای کاری ئەوو هاوڕێکانی لە ئۆردوگاکەدا سەرلەبەیانی جلی نوێژ بپۆشن و لە ژێر خوێندنەوەی (بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله رب العالمین، مالک یوم الدین..) دا سوژدە ببەن. پاشان دەبوایە دروشمی قیناویان کە لیستێک بە ناوی هەمو ئەو کەس و دامودەزگایانەی لەسەرەوە پێیاندەدرا دەبوایە بیاننوسنەوە. لیستەکە تادەهات درێژتر دەبوو، چونکە ناوی هەموو وڵاتە ئیمپریالییەکان و ئەندامانی ناتۆ و وڵاتە عەرەبییەکان تێدابوو کە دژی ڕاگرتنی نەوت بوون بۆ ڕۆژئاوا. ئەوان نزایان وابوو کە خوا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا کە باڵادەستترین هێزی جیهانە بڕوخێنێ، هەروەها نوێژیان بۆ ئەوە دەکرد کە شێوازی ژیانیان و ڕەوشت و بەهاکانیان سەرچاوەی ژیانیان بۆ هەتا هەتایە لێبستێنێتەوە.

دواتر تەنها مەبەستە دینییەکان بۆ قین بەسەردا ڕشتن مابووەوە. ئەوە خولیـــای نـــاوەوەی عـــەلی ئاگجـــای جۆشـــدا و وەک خانەیـــەکی سندانیی(شێرپەنجەیی) لە مێشکیدا جێگیربوو. ئەو هەمو سەرکردە دینییەکانی دیکەی بە مەترسی بۆ سەر ئایینی خۆی دەزانین. ڕێنماییکەرەکانی فێریانکرد کە هەموو ڕکوکینەی لە کەسێکدا کۆبکاتەوە، کە بە ئاسانی دەتوانرێ بخرێتە بەرچاو: تاکە پیاوێک کە بەرگێکی ئاودامان شۆڕی سپی پۆشیوە و لە کۆشکێکی زۆر گەورەدا دەژی. لەوێوە وەک خەلیفەکانی جاران فەرمان دەردەکا و بە سەدان ملیۆنیش ملکەچی دەبن. ئەو پیاوە شایانی ئەو ڕکوکینەیە بە هەمان شێوەی ئەوانی پێش خۆی لە سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەو پیاوە بە بۆنە و ڕیتوێلی ڕێزلێگیرانی زۆرتر لەخواش دەورەدراوە وەک: خزمەتکاری خزمەتکارانی خوا، باوکی گەورەی ڕۆژئاوا ، جێگرەوەی عیسا لەسەر زەوی، بیسکۆپی ڕۆما، تاکمەزنی شارەوڵاتی ڤاتیکان ، پاپا، باوکی پیرۆز، جەنابی قەدیس پاپا یۆهان پاولی دوهەم.

محەمەد عەلی ئاگجا بە شکۆوە بەڵێنیدا گەر هاتو بۆی هەڵکەوێ، پاپا بکوژێ. ڕێنماییدەرەکانی پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کەوا ڕێکەوت نییە پاپا لەو کاتەدا پایەکەی وەردەگرێ کە ئیمام خومەینی خۆشەویست، ئێران لە

دەست ستەمکارێتی ڕژێمی شا ڕزگاردەکا. ئەو 'کافرەی ڕۆما' وەک هەمو جار ئاگجا پاپای پێ پێناسە دەکرد، بۆ ئەوە هاتووە کە شۆڕشەکەی ئیمام کە بەناوی قورئانی پیرۆزەوە کردویەتی لەباربەرێ.

ڕاستییەک لەو شیکردنەوە هۆدارەدا هەبوو. جار بەجار پاپا یۆهان پاولی دووهەم زمانێکی گرژی بەرامبەر ئیسلام و مەترسییەکانی ئسولگەراکەی بەکاردەهێنا. لەکاتی سەردانێکیدا بۆ کارگەیەکی ڕۆنی زەیتون لەIvrea ی ئیتالیادا کارمەندەکانی کارگەکەی بەخوێندنەوەی ئەو برگە وروژێنەرە سامگیرکردن :

ئەوەی قورئان فێری خەڵکی دەکا، توندو تیژییە، ئەوەی ئێمەش فێری خەڵکی خۆمان دەکەین ئاشتییە. سروشتیشە کە بەردەوام مرۆڤ هەمو پەیامێکی دینیی وەربگێڕێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵک لە لایەن کەسانی ناشایستە و دابونەریتی خراپەوە ڕێیان لێدەشێوێندرێ، کەچی کریستیانێتی هەوڵی ئاشتی و یەکدی خۆشویستن دەدا. ئیسلام دینێکە هەر پەلاماردەدا. ئەوەی بە توندوتیژی لەگەڵ هەمو کۆمەڵگادا بجوڵێتەوە، ئەوا لەماوەیەکی دوردا توخمی نەرێنی لە لایەن هەموانەوە وەردەگریتەوە. ئێمە دەزانین ئەوە بۆ کوێمان دەبا: ئەو جۆرە کەسانە هێرشماندەکەنە سەر' .

لە 1981دا ئاگجا بە فڕۆکە چووە لیبیا. لە ڕاستیدا مۆساد نەیدەتوانی تیشکی تەواو بخاتە سەر ئەو ماوەیە، تا ئەوکاتەی لە تریپۆلی ئەوە دەرکەوت کەوا ئەفسەری هەڵگەڕاوەی پێشووی CIA ی فرانک تەرپیل Frank Terpil لەو کاتەدا لە لیبیا بوو. ئەو لە واشنتۆن لە لایەن دەستەی دادوەری(جوری)ەوە بە چەکدان بە لیبیا ، پیلان گێڕان دژی نەیارێکی قەززافی لە قاهیرە، هێنانە ڕیزی فڕۆکەوانە کۆنەکانی ئامریکا تاکو فڕۆکەکانی لیبی لێبخوڕن، هینانەڕیزی شەپقە سەوزە کۆنەکان تاکو ئۆردوگای ڕاهێنان بۆ تیرۆرستانی قەززافی بکەنەوە، تۆمەتبار کرابوو. لە لیبیادا تەرپیل باشترین ڕێگای نیشاندان تا خۆیان پێ لە سۆراخی ڕاوەدونانی دەزگا نهێنییەکانی ڕۆژئاوا ڕزگاربکەن. تەرپیل دواتر چووە

بەیروت و لەوێ خۆی ونکرد. مۆساد وایزانی کوژراوە، چونکە چیدیکە کەڵکی پێنەدەگەیاندن.

مۆساد ئێستا زانی کە ڕێنماییدەرانی ئاگجا پەیوەندیان بۆ لەگەڵ تەرپیل ڕێکخستوە، دوای هەوڵی سەرنەکەوتنی کوشتنەکەش، ئەو هەواڵانە بۆ لای KGB دزەیانکرد تاکو KGB بهێننە سەر ئەو ڕایە کە دەستی CIA لە پیلانەکەدا هەبووە. هەروەک مۆساد KGB یش بەشێکی کارای دەروونناسانی بۆ شەڕی دەرونی هەبوو. ئەوگریمانەی دەستەهەبوونی CIA لە ستونە دورودرێژەکانی ڕۆژنامەکان و هەواڵی تەلەفزیۆنەکاندا بڵاوکرایەوە. مەلاکانی تاران تاکو ئاگرەکە باشتر خۆشبکەن گوتیان کەوا ئاگجا لە فیبرایری 1981دا لیبیای بەجێهێشت و رویکردە سۆفیا لە بولگاریا، لەوێ لە لایەن دەستەیەک کە خۆیان بە دەزگای نهێنی وڵاتەکەدا ناساند پێشوازی لێکرا، بەڵام هەرگیز ئەو بەڵگەیە نەدۆزرایەوە ئەوان لە دەزگای نهێنی بولگاری بووبن. بە خێرایی لە کاردانەوەی تۆمەت دانەپاڵی KGB بۆCIA ، ئەوانیش وەڵامیاندایەوە کەوا ڕێنماییکەرانی ئاگجا لە بولگاریا بە فەرمانیKGB یەوە بووە.

ئەو بارودۆخە بۆ مۆساد زۆر نمونەیی بوو تا بەکردەوە دروشمەکەی ماکیاڤیللی 'پەرتکە و زاڵبە' کە کردبوویە دروشمی خۆی بسەلمێنێ: ' ئێمە پەرتدەکەین بۆ ئەوەی زاڵ بین'. مۆساد نەوەک هەر CIA لەبەر چاوی ڤاتیکان دەخا، بەڵکو لە کۆتاییدا دەزگاکە شێوازێکی دۆزیەوە ڕوانگەی تایبەتی خۆی بۆ پیلانەکە وەک شتێکی ڕاست بۆ پاپا بسەلمێنێ. دواتر ئەوە ئاسان دەبێ کە کاتساکان دەروازەی تەوژمی زانیاری سەنگینی وەزارەتی دەرەوەی ڤاتیکانیان بۆ بکرێتەوە، هەروەها دەرفەتی ئەوەشیان لە کاتی پێویستیدا دەبێ کە پریستەرو نۆنەکان بناسن. لە دوایشدا دەتوانن ئامێرە ئەلەکترۆنەکانیان لەو شوێنانەی ڤاتیکاندا بشارنەوە کە کاتی خۆی زڤی ئامیر خستبوونیە سەر نەخشەی خۆی ومرخی لێخۆشکردبوو.

کاتێک مۆساد ڕاپۆرتی لەسەر هاتنوچوونەکانی محەمەد عەلی ئاگجا لە تەلئەبیب تەواوکرد، ناحوم ئادمۆنی هەنگاوی پێویستی نا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە بۆی دەگونجا. لە هیکەوە لێکدانەوەی کۆمپیوتەری چارەسەری دۆزیەوە. یەکێک لە 'جاسوسە زیندووەکانی' ڕافی ئیتان کە کریستیانێکی ڕۆمی کاسۆلیک بوو لە مونشن، ڕاپۆرتێکی پێشکەشکرد بەوەی کە بیسکۆپ پۆگی ڕۆڵێکی ناوازەی لای کورسی پیرۆز هەیە. ناحوم ئادمۆنی ئالی Ali لە مونشن بانگکرد تا پەیوەندی بە پۆگیەوە بکا.

هەنوکە، دوای دەوروبەری دوو ساڵ بەسەر تەقەکردنی ئاگجا لە پاپا، بیسکۆپ پۆگی تا درەنگانێکی نیوەشە لە ژوری تایبەتی سەرۆکەکەی دانیشتووە هەمو ئەوەی ئالی بۆی درکاندەوە دەیگێڕێتەوە.

دوای مانگێک لە 23ی دیسامبەری 1983دا و لە سعات پێنج و نیوی بەیانی، کە نزیکەی سێ سعاتی مابوو تاکو چراکانی داری کێرست لە گۆڕەپانی سنت پێتەر بکوژێنرێنەوە و ڕۆژێکی نوێ دەستپێبکا، پاپا لە لایەن بەردەستە تایبەتییەکەی لەخەو هەڵسێنرا.

ژوری نوستنی پاپا زۆر بچکۆڵە بوو. دیواری ژورەکە هەر بەهەمان بۆیە کاڵە ڕەنگدارەکەی پاپای پێشو مابووەوە. ژێر خانە بریقەدارەکەش بە ڕایەخێکی دەستی نۆنەکانی پۆلۆنیا ڕاخرا بوو. لە دیوارەکەی سەری کە پێشتر چوار پاپای تێادا مردووە، ملوانکە خاچییەکەی هەڵواسرا بوو. لەسەر دیوارەکەی دیکە تابلۆیەکی جوانی مادۆنای ڕەشی پۆلۆنی هەڵواسرابوو. هەردوکی بەدیاری لە پۆلۆنیاوە بۆ هاتبوون. بێجگە لەبەردەستە تایبەتییەکەی، بەردەستەکانی دیکەش کە پاپایان لەوێ دی - لە یەکێ لە پریستەرە نزیکەکان کە خۆی ڕانەگرت هەواڵەکە نەگەیەنێ-هەناسەی ئۆخەیان هەڵکێشا کاتێ دیتیان پاپا یۆهان پاولی دوهەم وزە و هێزی جارانی گەڕاوەتەوە.

وەک هەمو جارێک باوکی پیرۆز ڕۆژە نوێیەکەی بە سەردانی prieu-dieu دەستپێکرد تا ساتێک بە بێدەنگی نوێژبکا. پاشان ڕیشی تراشی و

دوشـێکی کـرد و جلـەکانی کـە بەردەسـتەکە بـۆی ڕاگرتبـوون لەبـەرکرد: کراسـێکی سـپی قەشـەییانە، پاڵتۆیـەکی جـۆری چـەرمووی ئاودامانشـۆڕ، گۆرەوی سـپی تاسـەر چۆکـان، پێلاوێکـی بۆرو کڵاوێکـی سـپی. ئـەو ئێسـتا ئامادەیە بۆ سەردانی محەمەد عەلی ئاگجا لە زیندانی ڕەبیبیا Rebibbia ی ڕۆما.

چاوپێکەوتنەکە لەسەر داوای پاپا ڕێکخرا بوو، بە مەبەسـتی ئـەوەی وەک پاپا ناوی دەبرد 'ڕەفتارێکی لێبوردەییانە'، بەڵام لە ڕاستیدا پاپا دەیەویست بزانێ ئاخۆ مۆساد لـە گوتنەکەیاندا ڕاستدەکەن یان نا. پاپا لەگـەڵ ئـەو شـوفێرەی کـە کـاتی خـۆی کەژاوەکـەی دەهـاژۆت بـەرەو بەندیخانەکـە لێیانخوڕی. لەگـەڵ دەسـتەیەکی پۆلیسـی یـاوەر، پاپـا بـە لیمۆسـینەکە بـە جادەکانی ڕۆما بەرەو بەندیخانەکە لە خۆرهەڵاتی باکوری ڕۆما ڕۆیشت. لە ئۆتۆمبێلی دوای ئەوانیشدا دەستەیەکی بچوکی ڕۆژنامەنوسان ( لەنێویشیاندا نوسـەری ئـەم کتێبـە )هـەبوو. ئـەوان بانگهێشـتکرابوون تـاکو بەسـەر چرکەسـاتێکی مێژویـی کـە پاپـاو ' بکوژەکـەی' چـاو بـە چـاوی یەکـدی دەوەستنەوە گەواهیدەربن.

دو سعات دواتر ڕێگا بە پاپا یۆهـان پـاولی دوهـەم درا بچێتـە ئـەو بەشـە پاسەوانچڕەی کە ئاگجی تێدا زیندانیکرا بوو. پاپا بەتەنها ناوبڕەکەی بەرەو ژوری T4 کە ئاگجا لێی چاوەڕێدەکرد چوو. پەیامنێرەکانی میدیاکانیش لـە دورەوە بە یاوەری زیندانکارەکە وەستابوون نەوەک ئاگجا لەپڕ هەڕەشە لە پاپا بکا.

کاتێ پاپا دەستی بۆ ئاگجا درێژکرد، ئـەویش دەسـتی گـرت و ڕایگوشـی، دواتـر ئـەو دودڵ بـوو ئەوسـا نوشـتایەوە و ئەنگوسـتیلەی پاپـای مـاچکرد. ئەوسا بە خێرایی دەستی پاپای بەرزکردەوە و لەسەر نێوچاوانی خۆی دانا .
'Lei e Mehmet Ali Agca?' پاپا بە دەنگێکی نزم پرسیاریکرد. پێیان گوتبوو کە ئاگجا لە زیندان فێرە زمانی ئیتاڵی بووە.

ئاگجی بە شەرمە خەندەیەکەوە وەک ئەوەی بە شەرمەزارییەوە بێ گوتی 'Si'

'Ah Lei abita qui? پاپا تەماشایەکی ژورەکەی زیندانی کرد، بە دەوروبەرەکە سەرسام بوو کە بکوژەکە بەشێکی زۆری ژیانی تیادا دەباتە سەر.

'Si'(بەڵێ)

پاپا لەسەر ئەو کورسیە دانیشت کە لای دەرکەکە دانرا بوو. ئاگجاش لەسەر دارەکە کەوت و بە دردۆنگی لەپەکانی کردنەوە.

'Come si sente?' پرسی ئایا هەست بەچی دەکەی، باوکئاسا لەدەمی پاپا هاتە دەرەوە.

'Bene, bene' لەهیکەوە ئاگجا بە دەنگێکی مکورِو خێرا دەستی بە قسان کرد بە شێوەیەک وشەکانی لەیەک دەپەڕین، بەڵام وا نەرم کە تەنها پاپا گوێی لێدەبوو.

تێبینی سەر دەموچاوی پاپا بیرکردنەوەوی دەردەبڕی. ڕوی لە ڕوی ئاگجا نزیک بوو، تاکو بۆ ئەوانەی لەدورەوە وەستاون هیچ دیارنەبێ.

ئاگجا بە چرپەچرپ لە گوێی چەپی پاپا قسەی دەکرد و پاپاش وای سەر بۆ ڕادەوەشاند کە دیارنەبێ. ئاگجا پشوێکی دا و دەموچاویشی نادڵنیا بوو. پاپا بە جوڵەیەکی خۆی نیشانی ئاگجایدا کە لەسەر ئاخاوتنەکەی خۆی بەردەوامبێ. خەریک بوو سەری هەردوکیان بگاتەوە یەک. لێوەکانی ئاگجا بە ئاستەم دەجوڵان. لەسەر ڕوی پاپا هێڵی ئازار خۆیان نمایشکرد. چاوەکانی خۆی نوقاندن وەک ئەوەی بیەوێ زیاتر وردبێتەوە.

لەهیکەوە لە ناوەڕاستی ڕستەکەیدا ئاگجا وەستا. پاپا چاوەکانی نەکردنەوە. لێوەکانی بزوتن، تەنها ئاگجا توانی گوێی لێبێ.

ئەم جارە ئاگجا لەخۆوە دەستی بە قسان کردەوە. دوای یەک دوو خولەک جارێکی دیکە پاپا جوڵەیەکی دیکەی کردەوە. ئاگجا بێدەنگ بوو. پاپا یۆهان

پاولی دوهەم دەستەکانی لەسەر نێوچاوانی خۆی دانان وەک بڵێی چاوەکانی لە ئاگجا بشارێتەوە.

پاشان پاپا دەستێکی لەسەرشانی ئاگجا دانا، وەک ئەوەی سوپاسی بکا بۆ ئەوەی کە بۆی باسکرد. گفتوگۆکەیان بیست و یەک خولەکی خایاند، ئەنجا پاپا بەهێواشی هەستا. دەستی خۆی درێژکرد، هانی ئاگجاشی دا هەمان شت بکا. هەردو پیاوەکان تەماشای دورِ چاوی یەکدیان کرد. پاپا کۆتایی بەو ساتە دراماتیکییە هێنا و دەستێکی بردە بەرکەی و پاکەتێکی بچکۆڵەی سپی کە بە یادەوەرییەکی پاپایەتی ڕازابووەوە و دەریهێنا. پاکەتەکەی بۆ ئاجگا درێژکرد. بە سەرسورِمانییەوە ئاگجا پاکەتەکەی هەڵگێرِ و وەرگێرِکرد.

پاپا بە خەندەوە چاوەڕوان بوو. ئاگجا پاکەتەکەی کردەوە. پاکەتەکە ئەنگوستیلەیەکی پەمەیی سەر سیلڤەرو مەرجانی تێدابوو.

‘Ti ringrazio’ ئاگجا بە سوپاسەوە گوتی Ti ringrazio

پاپاش وەڵامیدایەوە‘Niete, niete’ ئەنجا کەمێک بەرەو پێشەوە چەمایەوە هەندێ پەیڤی دەربرِین کە تەنها بۆ ئاگجا بوون. دواتر بە بێدەنگی سورِایەوە و زیندانەکەی بەجێهێشت.

پاشان دەمرِاستی ڤاتیکان گوتی: ' عەلی ئاگجا تا ڕادەیەکی سنوردار ئاگای لێیە. ئەو هیچ لەسەر ئاستی بەرزتر نازانی. گەر بێتو پیلانێک لەگۆرِێدا بوایە، ئەوا لە لایەن پیشەچیانەوە کراوە، پێشەچیانیش شوێنەوار بە دوای خۆیاندا جێناهێڵن. ئێمە هەرگیز بە ئەرخاین بوون شتەکە نازانین' .

ئەوە جاری یەکەمیان نەبوو کە ڤاتیکان پاشبەندی زمانی دەرنەخا. ئاگجا ئەوەی پۆگی لە مۆسادەوە بیست بوو سەلماند. پیلانەکەی دژ بە پاپا لە تارانەوە دارِێژرابوو. ئەو زانیارییە ڕەفتاری پاپا یۆهان پاولی دوهەم بەرامبەر ئیسلام و ئیسرائیل ڕەنگدااردەکا. ئەو هێشتا بەڕاشکاوی بە کارمەندەکانی دەگوت" کێشەی داهاتوی جیهان ململانێی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و یەکێتیی شۆرەوی نییە، بەڵکو هی نێوان

ئسولگەراکانی ئیسلام و کریستیانێتییە". بە ئاشکرا و بە وردی جیاوازی نێوان ئیسلام وەک دین و ئسولگەرایی ئیسلامی دەکرد.

لێکدەرەوەکانی مۆساد لە تەلئەبیب لە هەڵسوکەوتی نوێی پاپا ئەوەیان خوێندەوە کە ئەو بەڵگانەی دراونەتە پۆگی ڕاست دەرچوون. هەرچەندە کاردانەوەیەکی ڕاستەوخۆ وەک بانگهێشتکردنی مۆساد تا زانیارییەکانی خۆی لەسەر جیهان پێشکەش پاپا بکا، ڕوینەدا. پاپا بڕوای بەبایەخی پەیوەندییەکانی پۆگی لەگەڵ ئالیدا هێنابوو. لە تەلئەبیبەوە ئادمۆنی داوایکرد پەیوەندییەکان لەگەڵ پۆگیدا بەردەوامبن. ئەوان لە زۆر شاری ئاوروپایی تەنانەت لە باڵوێزخانەی ئیسڕائیلی و هەروەها نوێنەرایەتیی پاپاش یەکدیان دەدی. باسوخواسەکانیان زۆر بابەتیان دەگرتەوە، بەڵام زیاتر لەسەر دو مژار پێیاندادەگرت کە بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و مرازی پاپا بۆ سەردانی وڵاتی پیرۆز بوون. ئەوەش هەموی هاوکار بوو لەگەڵ هەوڵەکانی پاپا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بۆ فەلەستینییەکان.

پۆگی بە پاپای ڕاگەیاند کە هەوادارێتی یاسر عەرەفات دەکا و پێیەوە کارانگازە. پاپا لەگەڵ ڕامانی ڕافی ئیتان، داڤید کیمخ و ئوری ساگویدا نەبوو بەوەی 'سەرکردەی PLO بکوژێکی دڵڕەقانە و بکوژی ژن و زارۆکانە، کەسێکە کە دەمەوێ بە دەستە ڕوتەکانی خۆم ملی بابدەم و بشکێنم' ئیتان گوتەنی.

لەچاوی پاپادا – کە لە ڕۆژانی بەرەنگاری پۆلۆنییەکان دژی نازییەکاندا گەورە بووە– عەرەفات پیاوێکە شایستەی ڕێزلێنانە، بیچمێکی کاریزماییە و بەردەوام لە چەندان هەوڵی مۆساد بۆ لەناوبردنی ڕزگار بووە. پۆگی بە ئالی گوت کە چۆن عەرەفات بۆ پاپای درکاندووە لە کاتی مەترسیدا هەستی شەشەمی پەرەپێداوە' بە پلەیەکی بەرزی دڵنیایشەوە هەستی حەوتەم'. پۆگی بە ئالی گوت' پیاوێکی وەک ئەو شایستەی ژیانە' .

بەهۆی تروسکایی ئەو درکاندنانەوە بە هێواشی ئالی ڕامانێکی ڕونتری لەسەر لایەنی دەرونی پاپاوە پەیداکرد. پاپا یۆهان پاولی دوهەم زێدەتر لە

وێردی سەر لێوان پشکی لە ڕاستی دیرۆکی ڕەگوڕیشەی جو لە نێو کۆمەڵگەی کریستیانیدا کە نابێ فەرامۆش بکرێ و مەیلی دژە سامی و تۆڵەش کە لە کۆمەلگای پۆلۆنیدا ئازاد بوو بە تەواوی دەبێ لەبەین ببرێ ، هەبووە.

لەئایاری1984دا پۆگی بانگهێشتی ئالی بۆ ڤاتیکان کرد. هەردو پیاوەکان بە دورودرێژی بە سعاتان لەگەڵ یەک لە نوسینگەی بیسکۆپ لە کۆشکی پاپایەتیدا قسەیان کرد. تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ نەزانرا باسی چیان کردووە.

لەو ڕۆژگارەدا لە ئیسرائیل شەرمەزاری دەزگا زانیارییەکان پەیدابوون. مانگێک پێشتر لە 12ی نیساندا چوار تیرۆرستی فەلەستینی پاسێکیان بە سی و پێنج سەرنشینەوە کە لە ڕێی شاری ئاشەلۆنAshelon ی باشورەوە بوو، رفاند .خوێندنەوەی فەرمییانە بۆ ڕوداوەکە ئەوەبوو کە ئۆتۆمبێلەکە لە لایەن شین بێت Shin Bet ەوە چارەسەرکرا و لە ئەنجامدا دو تیرۆرست کوژران و دوی دیکەش بریندااربوون، لە کاتی گەیاندنیان بە نەخۆشخانە ئەوانیش تەواوبوون.

لە وێنەکانی سەر ڕۆژنامەکانیشدا بینرا کەوا ئەوان بە زیندوی و بە پێی خۆیان سواری ئۆتۆمبێلەکان کراون، کەواتە بە سەختی بریندار نەکرابوون. دواتر دەرکەوت کە لە ئۆتۆمبێلی فریادڕەسەکەدا پیاوانی شین بێت بەدڕەفتاریان لەگەڵدا کردبوون هەرلەوێش ساردیانکردبوونەوە. هەرچەندە مۆساد پەیوەندی بەو ڕوداوەوە نەبوو، بەڵام لەبەر ناڕەزایی نێودەوڵەتی بۆ کردەوەکە ناو و ڕومەتی مۆسادیشی پێ دابەزی.

بەرامبەر ئەو پاشخانە وەک پۆگی بۆ ئالی ڕونکردەوە، پاپا یۆهان پاولی دوهەم جارێ ڕێی بە کردنەوەی دەرگای دیپلۆماتی لە نێوان هەردولادا نەدا. تا ئەوە ڕونەدا ئالی قسەکەی گەیاند ئەوا باوکی پیرۆز سەردانی وڵاتی پیرۆز ناکا.

لەگەڵ ئەوەشدا هەردو پیاوەکان ئاماژەیان بەوەدا کە بڕیارەکە بە یەکلاکەرەوەیی نەهاتۆتە سەر مێز.

لە 13ی نیسانی 1986دا پاپا یۆهان پاولی دوهەم کارێکی کرد کە هیچ لە پاپاکانی پێش خۆی نەیانکردووە، ئەویش سەردانی سیناگۆگی جوان بوو لە Lungotevere dei Cenciی ڕۆما، لەوێ سەرۆکی ڕابییەکانی ڕۆمای لەباوەش گرت. هەردو پریستەرەکان ڕێرەوە نەخشەدارەکەی سیناگۆکیان بەرەو Teva ئەو سەکۆیەی تەوراتی لێدەخوێندرێتەوە بڕی.

ئالی کە ڕۆڵێکی گرنگی سازدانی ئەو بۆنە دیرۆکییە بینی لە هەرە دواوە ڕاوەستابوو. ئەوەش هێشتا ئەوە نەبوو کە ئیسرائیل بە تەمای بوو: ددانناني دیپلۆماتیانەی کورسی پیرۆز بە ئیسرائیل.

ئەو دوا ئامانجە لە دیسێمبەری 1993 لەگەڵ نارەزایی هەڵۆئاساکانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیلدا، بە ناساندنی فەرمی پەیوەندییەکانی هەردولا ڕویدا.

ئەوکات ئادمۆنی بەڕێوەبەری گشتیی مۆساد نەبوو. بە دوای ئەودا شاباتی ساڤیت Shabati Shavit بە هێوری و بە وردی هەوڵی ئەوەی دەدا پەیوەندییەکانی مۆساد و ڤاتیکان بە یەکەوە گرێبدا. ئەو هەوڵە ئامانجی وابوو کە بۆ پاپا ڕونبەکەنەوە ئیسرائیلیش وەک PLO مافی ئەوەی هەیە جۆرە ڕێکخستێنێک هەبێ، هەردولاشیان ددانیان بە مەترسی ئسولگەرا ئیسلامییەکان نابوو. پاپا خودی خۆی هێشتا ئازاری جەستەی ئەوانی پێوە مابوو.

لەمیانی ئەودا مۆساد بە دەستی پڕەوە ڕویکردبووە کیشوەرێک کە ڤاتیکان زۆر هیوای پێ بوو، ئەویش ئافریکا بوو. کورسی پیرۆز هیوای وابوو لە ئافریقادا یەکەمین پاپای ڕەشپێست دەربچێ. لەوێ مۆساد سەلماندی کە وەستایانە هونەرە ڕەشەکەی بەکارهێنا بۆ بەیەکدادانی دەزگا زانیارییەکان تا پێگەی خۆی بەهێزبکا.

# 13

## پەیوەندییە ئافریكاییەكان

{میوانخانـــەی نۆرفیـــك لـــە نـــایرۆبی پایەتـــەختی كینیا..یانەی ئۆسیس.. نایرۆبی شوێنی بە یەكگەیشتنی ســـەرەداوەكانی دەزگـــا جاسوســـییەكان.. ئافریكـــا گۆرەپانی شەڕی دەزگا جاسوسییەكان.. ڤیدل كاسترۆ و خـەونی هـەناردنی شـۆرش.. مۆسـاد لـە ئافریكا لـە دەزگـا جاسوســیەكانی دیكــە دەباتــەوە.. ئافریكــای باشورو ئەپارتایدو سیخوڕێتی.. }

لە دوری یەک کیلۆمەتر لە میوانخانەی بەناوبانگی کینیایی Norfolk hotel لە نایرۆبی، یانەی ئۆسیس Oasis Club هەبوو، کە هەر لە کۆنەوە جێگەی بە یەککەیشتنی بزنسمانەکانی کینیا بوو. پیاوەکان لە قوژبنە تاریکەکانی بارەکەیدا تا بەلادا دەهاتن دەیانخواردەوە پاشان دوای ئەوەی گەواهییەکی لەشساخی ژنێکیان لە نەخۆشییەکانی زایندە دەدی، لەگەڵ خۆیان دەیانبردە ژورێک.

لە 1964ەوە یانەکە خەڵکی دیکەی بۆ دەهات لەوانەش: چینی بە بەرگی گەشتی جەنگەڵ سافار(Safari ) ، ڕوسییە دەموچاو کەوتووەکان و خەڵکانێک کە سەر بە ڕەگەزنامەی جۆربەجۆری وڵاتانی زەریای ناوەڕاست بوون. ئەوان بۆ بیرەیەکی سارد یان وەک کارمەندانی یانەکە گوتەنی ' بۆ گەرمترین کچی ئافریکایی' نەهاتوون، بەڵکو ئەو پیاوانە کاریان بۆ دەزگا زانیارییەکان دەکرد، کە هەر یەکەیان دەیویست جێپێی خۆی لە ناوەڕاستی ئافریکادا بگرێ، لە بەراییدا هەمیشە MI6 ی بەریتانی تیادا کارابوو. نوێیەکان لە دوای یەکەوە نوێنەرایەتی دەزگای نهێنی چینی و KGBی و

مۆسادیان دەکرد. هەر دەزگایەکیش ئەجێندای خۆی هەبوو دەیویست دو دەزگای دیکە لەگەڵ یەکدا بەشەڕ بێنێ. کەسیش لەو هونەرەدا لە مۆسادی باشتر نەدەزانی.

هەموی بەسەر یەکەوە مۆساد دە کاتسای لەسەر هێڵی ئیستیوادا دامەزراندن. ئەوان لە نێوان دارولسەلام لە سەر زەریالوشی هیندی و Freetownی سەر ئەتلەنتی دەستبەکاربوون. ئەوان چەندان پاسپۆرتی ساختەیان پێبوو، کەسانیک بوون گەنج و لیاقەدار، لە پاش لێهاتوییان کارامەییشیان لە داوودەرمان و نەشتەرگەری دەستبەجێی سەر گۆڕەپان هەبوو، چونکە لە جەنگەڵدا دەبوایە بە تەنها هەڵبکەن و ڕوبەڕوی مەترسییەکانی وەک شێرو پڵنگ و هۆزە دوژمنەکان دەبوونەوە.

سەرکێشی مۆساد لە ئافریکادا بە ماوەیەکی کەم دوای هاتنە سەرکاری فیدل کاسترۆ لە 1959 لە کوبادا هات، ئەوەش دوای ئەوی کە کاسترۆ دەستی بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش کرد. یەکەمین سەرکەوتنی کاستڕۆش ناردنی جێگرەکەی یۆهن ئۆکێلۆ John Okello بوو، کە خۆی کردبووە فێلد مارشال لەگەڵ چەند کەسانێکی بانگکراوو مەشق پێدراو لە کوبا ناردرانە زانزیبار Zanzibar کە دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژهەلاتی ئافریکا، تا شەڕی پارتیزانی تێدا بکەن و دورگەکە بگرن. تەنها بە قەبەیی جەستەی خۆی کە سەدو پەنجا کیلۆ گرام قورس دەبوو، کاتێ لە دورگەکە دابەزی ئەو ژمارە پۆلیسە کەمەی ئەوێی تۆقاندن، خۆیان دایە دەست. دواتر تاقمە ڕوتێنەرەکەی ئۆکیلۆ تیرۆری ڕاستیان دژی خەڵکی هەژارو بەلەنگازی دورگەکە بەرزکردەوە، کە بۆ بەرەنگاری خۆیان تەنها ئامێرە سەرەتاییەکانی کشتوکاڵ کە بۆ دروێنەی گژوگیای دەرماناوی کە زانزیباری پێ لە دنیادا بەناوبانگ بوو بەکاردەهێنا. کاسترۆ دورگەکەی وەک خاڵێکی وەرچەرخان بۆ خاکی ئافریکا بەکارهێنا. لە دارولسەلامی پایەتەختدا خەڵکێکی زۆری چینی دەژیان، ژیان و هەواڵی بوونیان بووە جێی تێبینی حکومەتەکەیان. دەزگای نهێنی چینی بە کردار سەلماندی کە چی لەبار شۆڕشە تازەکە دایە، گەر هاتو

حکومـەتی چینـی بیـەوێ پـردی پەیوەسـتی لەگـەڵ ئافریکـادا ببەسـتێ. حکومەتەکەیان بڕیاریدا لـەو ناوچانـەدا جێی خۆیـان بکەنـەوە و هـەرچی لـە دەستیشیان دێ پشتی شۆڕشەکەی پێبگرن.

لـەو نێوەدا کاسترۆ هەڵمـەتێکی گـەورەی دەسـتپێکردبوو، تـا بزوتنـەوەی ئازادیخوازانەی پێستڕەشەکان 'بکوبێنێ'. ئەو پێی لەسـەر خاڵی دەسـتپێکی چالاکییەکانی لە کازابلانکاCasablanca ی سەر کەناری ڕۆژئاوای ئافریکا دادەگرت. لـەوێ کەشتییە بارهـەڵگرەکانی کوبا چـەکی کوبییـان دەهێنـا و لەگەڕانەوەشدا ئەندامی نوێی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەیان دەبردە کوبـا تـا مەشقی پارتزانیان فێربکەن. هەر زو دەزگای نهێنی چینی لە دەستنیشانکردنی بەربژارەکان بۆ مەشق و ڕاهێنان یارمەتیدان.

ناردنی هەزاران کەس بۆ مەشق و ڕاهێنـان و گەڕانـەوەیان کـە هـەر چەند سعات فڕینێک لە ئیسڕائیلەوە دور بوو، بووە مایەی نائـارامی بۆ مۆسـاد و پۆلیسـی ئیسـڕائیلی. تەنینـەوەی بـەرەنگاری بـەو سـوپایەی پارتیزانـەکان هەرچەندە ڕاسـتەوخۆش هەڕەشـە نـەبوو بۆ سـەر ئیسـڕائیل، بـەڵام دەکـرا ڕوبەڕوبووەنەوەکـە لەدەسـت دەربچـی، ئیسـڕائیلیش ئـەوەی نەدەویسـت. ئیسڕائیل دەستی بە بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریستە عەڕەبەکان بەسترا بوو، بۆیە خۆی لە بەرەنگاری چەکدارانەی شۆڕشی ڕەشپێستەکان بـە دورگرت. مایرئامیت فەرمانی بەکاتساکانی خـۆی لـە ئافریکـادا کـە بـە وردی شـوێنپێی پێشهاتەکان هەڵبگرن، بەڵام خۆیان لەدەستتێوەردان بپارێزن.

کاتێکیش KGB هاتە سەر سەکۆی ئافریکا، گۆڕانکاری پەیدابوو. ڕوسەکان بە خستنەڕوی دەستکەوتی وا هاتنە سەر گۆڕەپانەکە، تیرۆرستەکان نەیان دەتوانی بڵێن نەخێر بۆنمونە: دەرفەت هەبوون بۆ پەرودەکردن و ڕاهێنان لە زانکۆی پاتریک لۆمۆمبـا لـە مۆسـکۆ. لـەوێ فێـرە نـوێترین تـاکتیکی شـەڕی پارتیزانی دەکرێن کە ڕوسیا بەخۆی پەرەی پێداوە، ئـەوەش هـەموی لـەژێر دەمـامکی کۆمـەککردنی نـەدارەکان و بێدەسـتەڵاتەکان و ئەوانـەی لـە وڵاتـە دێموکراسیەکان هـەڵنابژێردرێن. تـاکو ئـەو یارمەتیانـەیان باشـتر بـە خـەڵک

بفرۆشن، KGB داوای یارمەتی لە خوێندکارە هەرەباشەکانی زانکۆی لۆمۆمبا کرد کە تیرۆرستە عەرەبەکان بوون.

مایر ئامات بۆ پشتگرتنی کاتساکانی، کیدۆنیشی بۆ ناردن. ڕێنمایی نوێی بریتی بوو لە: هەمو تواناکان بۆ لەباربردنی پەیوەندی سۆڤیەت و وڵاتە خانەخوێ ئافریکاییەکان بەکاربهێنن، نێوانیKGB و دەزگای نهێنی چینی تێکبدەن، چالاکانە عەرەبەکان لە هەر کوێیەک بلوێ بکوژن ، تا بکرێ پەیوەندی باش لەگەڵ شۆڕشگێڕە ڕەشپێستە ئافریکییەکان پەیدا بکەن و بەڵێنی ئەوەیان بدەنێ کە ئیسرائیل کۆمەکی بزوتنەوەکەیان دەکا و وایان لێدەکا باری پارتیزانانەیان پەرەپێبدا و ناسنامەی سیاسیانەیان بۆ وەربگرێ. تاکە شت ئیسرائیل لەوانی دەویستەوە ئەوە بوو، بزوتنەوەکان لولەی تفەنگەکانیان وەرنەگێڕنەوە ئیسرائیل.

یانەی ئۆسیس Oasis Club ڕۆڵێکی کارای لەسەر سەرو دڵی شۆڕشگێڕە ڕەشپێستە ئافریکاییەکان گێڕا. شەوەکان پڕبوون لە گفتوگۆی دورو درێژ دەربارەی تیرۆریزم کە تیایدا تا ئەوکاتەی ڕاگەیاندنی لێبێدەنگ بوو تفەگەکان لە گوللە خاڵی بوون، هەروەها دەربارەی ئەو ئامانجەی کە هەرگیز لەبەر چاوان ون نەدەبوو، ئەویش: ئازادی و سەربەخۆیی بوو. پیلانەکان لەو کەشوهەوا بۆگەنەی یانەکەدا دادەنران و ڕێککەوتن سازدەدران و ناوی ئەوکەسانە دەنوسرا کە لەسێدارە دەدران و ئامانجیش بۆ تێکدان دادەنرا. هەندێ لە قوربانییەکان لەسەر زەوی دەکەوتنە کەمینەوە، هەندێکی دیکە لەناو جێگەی خۆیان دەکوژران. ڕۆژێکیان پیاوێکی KGB بوو، ڕۆژی دواتر سیخوڕێکی دەزگای نهێنی چینی بوو. هەردولاشیان تۆمەتیان دەخستە پاڵ یەکدی کەچی مۆسادیش لە پشت پیلانەکانەوە بوو .

لەونێوەشدا ئێوارەکانی یانەی ئۆوسیش بەهەمان ڕەوت دەڕۆیشتن: لەسەر مێزە دارینەکانیدا لەو کاتەدا ئاوی بارانی گردەکان دەهاتە خوار و ڕێژنە بارانە هەڕەشە ژێرئاوکەوتنی دەکرد، پلانی نوێ دادەڕێژران. پستەپست پێویست نەبوو، بەڵام دابونەریتی کۆن زەحمەت بوو فێرببن.

مایر ئامیت هەر زانیارییەکی لەسەر دەزگای نهێنی چینی پێگەیشت دەیدایە پیاوەکانی. ئەو دەزگایە مێژویەکی 2500 ساڵەی لە کاروباری سیخوڕێتیدا هەبوو. بە سەدان ساڵ دەزگاکەیان داردەستێک بووە بە دەستی قەڕاڵە فەرمانڕەواکان تاکو جاسوسی بەسەر حوکمبەسەرداکراوەکانیان بکەن. دوای هاتنی ماوتسی تۆنگ و پاشانیش دینگ کساوپینگ Deng Xiaopingدەزگای زانیاریی چینی ڕەوشێکی دیکەی هەروەک گەورەیی وڵاتەکە وەرگرت. دەزگای نهێنی چینی دەستی بە ڕایەڵڕاچاندن بۆ دەرەوە، بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و ئاورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دواتریش ئافریکا کرد.

تەونی ڕایەڵەکان زیاتر لە ئامانجی جاسوسێتی بەکارهێنران: ئەوان ڕێگایەکی سەرەکی ئاودیوکردنی ماددە بێهۆشکەرەکان و سپیکردنەوەی پارە بوون، چونکە گەر ڕاستبێ نیوەی بەرهەمی ماددە بێهۆشکەرەکانی ئۆپیوم لە پشت باخی کۆماری دیموکراتی چینەوە بەرهەمدەهێنران- لە سێگۆشە زێڕینەکەی تایلەند و لاگۆس و کامبۆدیا(میانمار) دا- دەزگای نهێنی چینی هاوکاری سێقۆڵیانە لەگەڵ ( باندە مافیاکانی چینی ) دەکرد بۆ ئەوەی ماددە بێهۆشکەرەکان بۆ ڕۆژئاوا بنێرن. هەرچەندە هۆنگکۆنگ مەڵبەندێکی گرنگی سپیکردنەوەی پارەکان بوو، دەزگای نهێنیی چینی دەمامکێکی گەورەی شاردنەوەی دەستکەوتەکانی چینی لە بازرگانیکردن بە ماددە ناوبراوەکان لەبەر دەستدابوو. پارەکەش بۆ خەرجکردن لە چالاکیەکانیان لە ئافریکادا بەکاردەهێنا. لە ساڵی 1964یشەوە کاروبارەکە ڕاستەوخۆ کەوتە ژێردەستی بەڕێوبەری گشتیی دەزگای زانیاریی چینی کیۆ شیQiao Shai . ئەو پیاوە درێژە کە حەزی لە کۆنیاکی فەڕەنسی و جگەرەی کوبی دەکرد، سەرە جاسوسێک بوو سەدان سیخوڕو بودجەیەکی باشی بۆ کڕین و دەمارگرتن لەبەردەستدا بوون، کە تەنها KGB هاوتای بوو. کامپەکانی کاری نێوەڕاستی چین پڕ بوون لەو کەسانەی کیۆ شییان هاندەدا. دەروونناسەکانی مۆساد

دەربارەیان نوسی كە پیاوێكە هەمو كارنامەكەی بۆ خۆپارێزیَ و دیارنەكەوتن دەگەڕێتەوە.

چالاكیەكانی ئافریكایان ڕاستەوخۆ لە لایەن كۆلۆنێل كاو لینگ Kao Lingای بیچمی ئەفسانەئاسای دەزگای نهێنی چینییەوە رابەرایەتی دەكرا، كە ناوبانگی لە سەرپەرشتی و تاكتیكەكانی نیپال و هیند پێبڕابوو. بارەگای خۆی لە زانزیبار دانا و چەندان ژنی گەنجی ڕەشپێستی لە دەورەی خۆدا كۆكردنەوە. ئەو هەندیَ جاران بەمانگان لەبەر چاوان وندەبوو وەك بەورێك لەنێو ناوەڕاستی ئافریكادا دەهات و دەچوو. سەردانەكانی بۆ نایرۆبی دەبووە مایەی ئاهەنگی دڕندانە لە یانەی ئۆوسیس، لەویَ دوكەڵی بخوری شیرین دەسوتێنرا و شیرینەمەنی تازەی چینی دەخورا. سۆزانییە ئافریكاییەكان بەرگی ژنانەی چینیان (Cheongsams) لەبەر دەكرد و گەمە ئاگرین و تیمە كاباریكانی هۆنكۆنگیان نمایشدەكرد.

پارتیزانە مەشقدراوەكان لە كوبا گەڕانەوە و كارامەیی خۆیان نواند، پێش ئەوەی لە لێڕەواری ئافریكا بۆ شەڕكردن بزر ببن. یەكێك لەوان دابێكی پەرەپێدا تا لەو ئاهەنگەدا پەرداخێك لە خوێنی دوژمنەكانیان كە تازە لەناوبراوە بخورێتەوە.

لەو نێوەدا كاو لینگ تەكانی جموجۆڵەكانی تەنها لە پانتایی ڕوبەری ئافریكادا نەبوو، بەڵكو گەیاندییە لای باكور لە ئاسوییا و خواروی یەمەن و میسریش. لەویَ برە پارەیەكی زۆری دایە تیرۆرستان تا پەلاماری ئیسڕائیل بدەن. دەزگای نهێنیی چین ئیسڕائیلی بە داشی دامەی واشنتۆن دەزانی و كاو لینگیش ئامانجی ڕەوا بوو، خۆی گوتەنی ' پیاوە ڕزگاریخوازەكانم' ناودەبرد.

مایر ئامیت فەرمانیدایە پیاوەكانی بە توندی بەرپەرچی دەزگای نهێنی چینی بدەنەوە. سەرەتا مۆساد پیلانێكی چینی بۆ ڕوخانی ڕژێمی Hastings Banda هەواداری ڕۆژئاوا لە مالاوی Malawi پوچەڵكردەوە. دواتر حكومەتی كینی بە دورودرێژی لە ڕایەڵی بەربڵاوی چینی

لەنێوداموادەزگاکانیدا ئاگادارکرایەوە. پاشان حکومەتی کینیا پێزانینی خۆی بەرامبەر ئیسرائیل بەوە نیشاندا کە ڕێگای بە فڕۆکەی سەربازی ئیسرائیلی دا لەسەر ئاسمانی ئەو هێرش ببەنە سەر فڕۆکەخانەی ئەنتەبە Entebe. یانەی ئۆوسیس داخراو خاوەنە چینییەکانیش سواری فڕۆکە کران و بەرەو وڵاتەکەیان نێردرانەوە، هەرا نانەوەکەیان کە ئەوان تەنها پیاوی کارو بازرگانین دادی نەدان. ئەوان بەختیان یار بوو، ئەگینا هەندێکی دیکە لە پیاوە جاسوسەکانی دەزگای نهێنی چینی کە لە ئافریکادا مانەوە لە لایەن کیدۆنەکانی مۆسادەوە کوژران و گۆشتەکەشیان فڕێدرایە بەردەم شێران.

هەرچەندە چینییەکان لە هەندێ وڵاتی دیکەی ئافریکاوە کاردانەوەیان دەبوو، مۆساد بێ دڵڕەقانەتر دەبوو. کیدۆنەکان لەهەر شوێنێک بوایە جاسوسێکی چینیان بدیبایە بۆی دەچوون. لە گانا پیاوێکی دەزگای چینی لەکاتێکدا لەگەڵ دۆستەکەی لە دیسکۆ دەردەچوون درایە بەر گوللە. لە مالیش یەکێکی دیکە بە بۆمبی تەقیندراوە لەنێو ئۆتۆمبێلەکەیدا مرد، لە زانزیباریش کە هێشتا ملوانکەی ئاڵتونی بەرۆکی دەزگای نهێنی چینی بوو، سەرلەبەری باڵەخانەیەک کە پیاوانی دەزگای نهێنی چینی تیایدا ئاکنجی بوون، تەقێنرایەوە و خاپورکرا. لەکاتی گەشتێکی ئافریکایدا خودی کاو لینگ لە دوا چرکەساتدا لە مردن قوتاربوو. هەستی شەشەمی فریای کەوت بەوەی لە برازاڤیلا Brazzavila دا ئۆتۆمبێلەکەی بگۆڕێ. ئۆتۆمبێلەکەی یەکەمی پێش تەنها خولەکێک تەقێندرایەوە و لێخوڕەکەش سەری تێدا چوو. لە زامبیا پیاوێکی دەزگای نهێنی چینی لە ژینگەیەکی پڕ لە شێر لە دارێک توند بەسترایەوە.

لەوکاتەش کە نکروما Nkruma دیکتاتۆری گانای هەواداری چین سەردانێکی بێژینگBeijin ی کرد، مۆساد هەڵمەتێکی کێومالکردنی لە وڵاتەکەدا بۆ لەناوبردنی ڕژێمەکە ڕێکخست و بووە مایەی لەبەینچوونی تەواوی ژێرخانی چینی لە گانادا.

سێ ساڵی درێژ مۆساد دژایەتییەکی دڵڕەقانەی دژی دەزگای نهێنیی چینی لە سەرلەبەری ئافریکادا نواند. لەهەر دوو لاوە بێویژدانی نمایشکرا. کاتێ کۆماندۆیەکی مەرگچێنی چینی هێرشیان بردە سەر کاتسایەکی مۆساد لە کۆنگۆ، کاتساکەیان فڕێدایە بەردەم تیمساح و دوا دیمەنیش بە فیلم وێنەی گیراو بۆ بارەگای خۆجێی مۆساد نێردرا. وەڵامی ئەوەش بە ڕۆکێتێک بۆ سەر خانویەکی چینییەکان درایەوە، کە جموجۆڵیان تیایدا دەکرد، لەئەنجامدا سێ چینی کوژران.

لەکۆتایدا دەزگای نهێنیی چینی لە ڕێی کەسی سێهەمەوە کە سەرۆکی زائیر مۆبوتو Mobutu بوو، ڕایانگەیاند ئامادەن ڕکابەرایەتییەکەیان بوەستێنن، چونکە هەردولا بەرژەوەندییان لەوە دایە دەستڕۆیشتنی شۆرەوی لە کیشوەرەکەدا بوەستێنن. ئەو داوایە ڕێک بە بەرگی مۆساددا هاتەوە کە دەیەویست سیاسەتی بەرامبەر باڵادەستەکان بەشێوەیەک پیادەبکا وەک ئامیر گوتەنی" هەرچەند ئەوان لەگەڵ یەک ناکۆک بن، بۆمانەوەی ئیسرائیل باشە".

لەوکاتەی کە مۆساد و دەزگای نهێنی چینی لە ململانێی توندا بوون، KGB هەنگاوی وای هەڵێنان تا پلانی کاسترۆ بۆ بە کوباییکردنی ئافریکا بگرێتە خۆی. سەرانیKGB و مەکتەبی سیاسیی پارتی کۆمۆنیستی شۆرەوی لە کرەملین دانیشتن و لەسەر ئەوە یەکبوون کە دەبێ یەکێتیی شۆرەوی بە تەواوی پشتگیری ئابوری کوبا بکا. ئەوەش بەڕێژەیەکی گەورە کرا، بە شێوەیەک کە گەلە حەوت ملیۆنییەکەی کوبا بە دەست و ددانیان لە پەیوەندیدا لەگەڵ شۆرەویدا گیربین. لە بەرامبەردا کاسترۆ ئامادەبوو لە ئافریکادا نمونەی شۆرەوی لە جیاتی بێژینگی چینی بگرێتە خۆ. هەروەها ڕێگایدا کە پێنج هەزار کەسی وەک ڕاوێژکار لە قەڵەمیان بدا و تا ڕێنمایی دەزگای نهێنی کوبا بکەن بۆ ئەوەی 'بە ڕاستترین شێوە' لەگەڵ ئافریکادا هەڵسوکەوت بکەن.

بەو شێوەیە لە هەمولایەکی ئافریکادا KGB شانبەشانی کوبیەکان کەوتە گەڕ. لە ماوەی شەش مانگدا هەمو کردەیەکی تیرۆرستی لە ئافریکادا لە ژێر کۆنترۆڵی ڕوسەکاندا بوو. لە ئۆردوگای مەشقی تیرۆرستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە KGB داینا بوو، باشترین شاگردیان دەناردنە ئافریکا تا لەوێ لە دژی ڕژێمی ئەپارتایدی سپی پێست لە باشوری ئافریکادا بجەنگن. ئیدی هەر زو تیرۆرستەکانی ئاوڕوپا و ئامریکای لاتین و ئاسیا ڕێگایان بە شۆڕشگێڕەکانی ئانگۆلا و مۆزەنبیق و وڵاتەکانی سەر سنوری باشوری ئافریقادا تا لە پسپۆڕێتییەکەیاندا سود وەربگرن .

مایر ئامیت گوتی: ئاگری باشوری هێڵی ئیستیوا خۆش بووە . وای هەستکرد کە تەنها پرسی کاتە بۆ ئەوەی ئەو ڕکابەریە توندەی کرێگرتەکان ڕوی خۆی بەرەو ئیسرائیل وەربگێڕێ. ئەو خستنەڕوەی دەزگای نهێنی چین بۆ هاوکاری لەگەڵ مۆساد، تا بەیەکەوە بەرامبەر نەیارە هاوبەشەکەیان KGBتیرۆرستەکانیان بوەستنەوە، بە پێزانینی بەڕێوبەری گشتیان پەسەند کرا. چینییەکان زانیارییان لەسەر بزوتنەوە عەرەبییەکان لە ناوەو دەرەوەی ئافریکادا دایە مۆساد. هەندێکیان بە ڕێگا کارپێکراوەکەی مۆساد وەک ئۆتۆمبێلی مینرێژکراو و بۆمبفرێدانە ژوری نوستن کوژران. جارێکیان کاتسایەک بەخۆی بۆمبێکی لە ناو ئاودەستێکی بەکرێگیراوێکدا چاند کە توشی نەخۆشی Congo Stomach نەخۆشییەکی تایبەتمەندی نەخوازرای دیزنتری ببوو. کاتێ کابرا لە یەکێ لە میوانخانەکانی خەرتوم چووە سەر ئاودەست، ئەندامەکانی خوارەوەی لەشی پارچەپارچە بوون.

مۆساد دەستی بەجێبەجێکردنی بەشی خۆی لە ڕێکەوتنەکە کرد و پلانی مۆسکۆی بۆ چینییەکان بە دەستگیرۆیی دارایی بۆ سۆمالی هەژارترین وڵاتی ئافریکا ئاشکراکرد. ڕاستەوخۆ بێژینگ هاتە وەڵام و خستنەڕوی قەبارەی دەستگرتنەکەی بۆ دوو هێندەی ڕوسەکان زێدەکرد. دواتر مۆساد یارمەتی چینییەکانی دا لە سودان. لەوێ مۆسکۆ لە ڕێی ڕژێمی سەربازی جەعفەر نومەیری پردی پەیوەندیەکانی دانابوو. کاتێک دکتاتۆری ناوبراو ئەوەی

ڕەتکردەوە کە بە تەواوی پابەندبوونی خۆی بەرامبەر یەکێتیی شۆرەوی ڕابگەیەنێ، KGB پلانی کودەتایەکی لە دژدا ڕێکخست. مۆساد بە چینییەکانی ڕاگەیاند و چینییەکانیش نومەیریان لێئاگادارکردەوە. ئەنجا ڕژێمی سودان هەمو دیپلۆماتەکانی ڕوسی لە وڵات دەرکردن و هەمو بەرنامەکانی کۆمەکی ڕوسیشی هەڵپەساردن.

دوای ئەوەی هەردو وڵاتە باڵادەستە کۆمۆنیستەکەی دژی یەکدی بەکارهێنا و لەهەمان کاتیشدا وەک مایر ئامیت ناویبرد ' خۆیان لە تەونی ئافریکادا بکێشنەوە' ، مۆساد چاوی خۆی بڕیە سەر تەنها یەک دەزگای نهێنی ئافریکایی کە بە دەزگایەکی دۆستی دادەنا، ئەویش نوسینگەی ئاسایشی دەوڵەت (Bureau of State Security(BOSS باسکی هەرە سامناکی دەزگای ئاسایشپارێزی باشوری ئافریکا بوو. ئەوەی پابەند بوو بە کارامەیی و دەمارگرتن و تۆقاندن و ڕوتکردنەوە و ساختەکردن و ڕفاندن و لیکۆڵینەوە لەگەڵ گیراوەکان و شەڕی دەرونی و کردەی کوشتن BOSS هیچی لە مۆساد کەمتر نەبوو. هەروەک مۆساد، Boss یش دەستی لە ڕاوەدونانی نەیارانیدا کراوە بوو. زۆرجاران بە یەکەوە لە سەرانسەری ئافریکادا لەسەر بنەمای 'گفتی' نهێنیی نێوان سەرەک وەزیران گۆلدا میر و هاوتایەکەی لە ڕژێمی بریتۆریا کاریانکردووە.

یەکەمین دەرهاوێشتەی هاوکاری نێوان هەردو دەزگاکە ناردنی یۆرانیۆم بوو بۆ مەڵبەندی دیمۆنا Dimona. ناردنەکە لە ڕێی فڕۆکەی بارهەڵگری ئەلعالەوە بوو لە جیهانسبورگەوە بۆ تەلئەبیب. بارەکەش بە کەلوپەلی کەرستەی کشتوکاڵی لەقەڵەمدرابوو. زاناکانی باشوری ئافریکا لەگەڵ بارەکەدا هاتنە دیمۆنا ، کە تاکە بێگانە بوون توانای ناوەکیی دیمۆنایان ناسیبێ. کاتێکیش ڕژێمی باشوری ئافریکا لە دورگەیەکی دوری زەریالوشی هیندی بۆمبی ئەتۆمی خۆیان تاقیکردەوە، پسپۆڕی ئیسرائیلیشی بەدیارەوە بوو. لە 1972دا ئایزەر وایزمان وەزیری بەرگری ئەوکاتی ئیسرائیل لەگەڵ وەزیری بەرگری باشوری ئافریکا بۆتا P.W Bota لە پریتۆریا

Pretoriaدا دانیشتنێکیان بۆ 'زیاتر لەیەکتێگەیشتن' ساز دا: گەربێت و هەر وڵاتێک هێرشی کرایە سەرو پێویستی بە پشتگیری سەربازیانە بێ، ئەوا وڵاتەکەی دیکە دەبێ بەهاوارییەوە بچێ. ئیسرائیل ژمارەیەکی بەرچاوی چەکی ئامریکایی دایە باشوری ئافریکا لەبەرامبەردا ئەویش ڕێگەی بە ئیسرائیل دا بۆمبی ناوەکییەکەی خۆی کە لە دیمۆنا بەرهەمهێنرا، لە دورگەیەکی زەریالوشی هیندیدا تاقیبکاتەوە. لەو کاتەدا مۆساد پەیوەندی خۆی بە توندی لەگەڵBOSS دا گرێدابوو. هەرچەندە ڕێنماییدەران ئەو دەرفەتەیان نەبوو پیاوانی BOSS فێرە شێوازە دڕندانەکەی لێکۆڵینەوە بکەن، بەڵام متمانەیان لەسەر کۆمەڵێک ڕێگە و شێوازی تاقیکراوەی لوبنان و شوێنانی دیکە بۆ پەیداکردن وەک بوارنەدان بە گیراو تاکو بخەوێ، چاو بەستن، ناچارکردن بۆ ماوەیەکی درێژ بەرامبەر دیوار ڕابوەستێ، نوقورچکگرتن لە ئەندامی زایندەیان و زنجیرەیەک کردەی ئازاری دەرونی لە گەفەوە بگرە تا لە سێدارەدانی هەڵبەستراو. کاتساکانی مۆساد لەگەڵ دەستەی BOSS سەری وڵاتە دراوسێ ئافریکییەکانیان دەدا تا کردەی چەپەڵ ئەنجامبدەن. کیدۆنەکانی مۆساد کۆماندۆی مەرگچێنی باشوری ئافریکاییان فێر دەکردن چۆن قوربانییەکانیان بێ پەرێز بە جێهێشتن، بکوژن. کاتێکیش مۆساد ئەوەی خستەڕو چۆن شوێنپێی سەرکردەکانی کۆنگرەی نیشتمانی باشوری ئافریکا (Afrikaans National Congress(ANC کە لە شانشینی یەکگرتو و وڵاتە ئاوروپییەکانی دیکەدا لە تاراوگەدادەژین، هەڵبگرن، BOSSبیرۆکەکەی زۆر پێباش بوو، بەڵام لە دواییدا بیرۆکەکە لە لایەن ڕژێمی پریتۆریا لە ترسی لەدەستدانی پشتگیری کۆنە پارێزە ئینگلیزەکان، ڕەتکرایەوە.

چ مۆساد و چ BOSS پێیانوابو ئافریکا خەریکی وەرگەڕانە بەرەو چەپ، کاتێکیش ئەوە ڕوبدا ئەوا هەردو ڕژێمەکە دەخنکێن. بۆئەوی ڕێبپێبگرن بەکارهێنانی هەمو ئامرەزاکان ڕەوا بوون. هەردولا ترسیان دەدایە یەکدی و خۆیان لەسەر بارێکدا ڕادەگرت کە هەرخۆیان دەیانزانی چۆن سەری

دوژمنەکانیان پانبکەنەوە. هەردوکیان بەیەکەوە مۆساد و BOSS بوونە دەزگای زانیاری هەرە بەسامی دەرەکی لە ئافریکادا.
ئەو هاوپەیمانییەتیە بە دڵی واشنتۆن نەبوو. CIA لەوە دەترسا کە هەوڵەکانی ئامریکا بۆ بە دیموکراسیکردنی کیشوەری ڕەش لەبار ببرێن. هەڵوەشاندنەوەی کۆلۆنیالیزم لە شەستەکاندا سەرنجی بەرژەوەندییەکانی CIA بۆ لای خۆ ڕاکێشا و بووە مایەی چالاکی نهێنیی ڕو لە زێدەبوون لە کیشوەرەکەدا. CIA هۆبەیەکی ئافریکی کردەوە و لە 1963شدا نوسینگەی لە هەمو وڵاتە ئافریکاییەکان کردەوە.
یەکێک لە پیاوە سەرەتاکانی CIA لە ئافریکادا بیل بوکلی Bill Buckly کە دواتر بەدەستی تیرۆرستەکانی حیزبوڵڵا لە لوبناندا ڕفێندرا و کوژرا. کەمێک پێش ڕفاندنەکەی ڕایگەیاند: ' لەوکات لە ئافریکادا هەلومەرجێکی شێتانە هەبوو، چونکە هەمویان دەیانویست جێپیی خۆیان لەسەر زگی ئەوی دیکە بکەنەوە. ئێمە لەوێ دواکەوتین، مۆسادیش بە چاوی ئاهەنگێڕێکی نەخوازراو سەیریدەکردین' .
لە واشنتۆن وەزارەتی دەرەوە بەجیا، بەڵام بەپێداگیری هەوڵیدا ئیسرائیل لە ئافریکا بکێشێتەوە. وردەکاری ئەو زانیارییانە دزەیانکرد کە چۆن بەسەدان جولەکەی باشوری ئافریقا بەرەو باکور هەڵکشان تا لە شەڕی نۆکەندی سوێس یارمەتی ئیسرائیل بدەن. بیست نەتەوەی ڕەشپێست پەیوەندی دیپلۆماتیانەیان بە هۆی شەڕەکە لەگەڵ ئیسرائیلدا پچڕاند. لەنێویشیاندا دەوڵەتی نێجیریا خۆی دیتەوە. ئەوەش بۆ ئیسرائیل قورس بوو، چونکە نێجیریا ساڵانە لە 60%ی نەوتی خاوی دەفرۆشتە ئیسرائیل، ئەو نەوتەی کە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەچوو. هەرچەندە پەیوەندییەکانیش پچڕابوون، بەڵام ئیسحاق شامیری سەرەک وەزیران بڕیاریدا بە نهێنیی لەسەر چەکپێدانی نێجیریا بە چەکی ئامریکی بەردەوام بێ، لە بەرامبەریشدا نەوتەکەی لێنەبڕدرێ. بە گوێرەی بوکلی ئەوە ' نمونەی فێرگەی ڕیال پۆلیتیک بوو'، نمونەیەکی دیکەش شێوازی بەردەوامی پشتگرتنی مۆساد بوو

بۆ کۆنە هاوتایانBOSS . لە دەرەنجامی هێرشی ئیسرائیل بۆ لوبنان لە 1982دا مۆساد کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکی زۆری لەسەر پەیوەندی گەرمی نێوان PLOو ANC بۆ دەرکەوتن کە هەمیشە بۆ BOSS نەخوازراو بوو. ئەو بەڵگانە درانەBOSS ، دەرهاوێشتەکەشی بەوە کەوتەوە کە سەدان ئەندامی ANCگیران و ئازاردران.

ساڵەکانی هەشتا گەورەترین گەشتی جەنگەڵەکانی ئافریکا بوو بۆ مۆساد. نەوەک تەنها گەمەی لەیەکدانی چینییەکان لەگەڵ شۆڕەوییەکانی وازی کرد بەڵکو بۆCIA و بۆ دەزگای نهێنی بەریتانیMI6 و دەزگای زانیاریی دیکەی وڵاتە ئاورِوپییەکان کە لە کیشوەرەکە کاریاندەکرد تەڵەزگە بوو. هەرکاتێک مۆساد ئۆپەراسیۆنی دەزگایەکی دیکەی بە مەترسی بۆسەر پێگەی خۆی زانیبا ئەوا ئاشکرایدەکرد. لە کینیا دەمامکی یەکێک لە پیاوانی MI6 هەڵدرایەوە. لە زائیر تۆڕی پەیوەندییەکی فەرەنسی هەڵوەشێنرایەوە. لە تەنزانیاش دوای ئەوەی مۆساد ڕۆژنامەنوسێکی خۆجێی لە ئۆپەراسیۆنێکی دەزگای نهێنی ئاڵمانی ئاگادارکردەوە، لە هەمو لایەکەوە تێکشکێنرا.

کاتێکیش ئەبو نیزال(ابو نضال) کە ئاوەزی پشت کردەی کوشتنی شلۆمۆ ئارگۆڤShlomo Argov ی باڵوێزی ئیسرائیل بوو لە لوبنان لە 3ی حوزەیرانی 1982دا لەبەردەمDorchester Hotel ، هەوڵیدا لە سودان مافی پەنابەری سیاسی وەربگرێ، حکومەتی ئیسرائیل پاداشتی یەک ملیۆن دۆلاری ئامریکی دا بۆ گرتنی یان گەر نەکرا کوشتنیدا، کەچی لەدواییدا توانی دەرباز بێ و بەرەو شوێنێکی ئارام بۆ بەغدا ڕابکا.

لە دە وڵاتی ئافریکایی مۆساد توانی کەڵک لە ناسیۆنالیزمی ئافریکایی وەربگرێ. یەکێ لە پیاوە کاراکانی ئەو وڵاتانە یاکۆڤ کۆهن Yaakov cohn بوو کە گوتی:' ئێمە بۆ ئەوان مشوری کەرەستەی هەواڵگریمان دەخوارد ئەوانیش سۆراخی نەیارەکانیان پێدەکرد. لە وڵاتێکی وەک نێجیریا ڕکابەری نێوان هۆزەکان بووە مایەی نانەوەی شەڕی ناوەخۆ. ئێمە هەوڵماندا لەگەڵ هەر لایەک کە ئێمەی بوێ لەسەر هێڵی هاوکاری بین.

ئەوەش وای لە ئێمە کرد کە هەمو شتێک لە بارەی وڵاتەکەوە بزانین. کەمترین کۆبوونەوە کە بۆ ئیسرائیل گرنگ با هەواڵەکەی دەگەیەنرایە تەلئەبیب' .

پێش دەرچوونی کۆهن بۆ ئافریکا کاری دیکەی نهێنی لە میسرو وڵاتانی دیکە کردبوو. بۆ ئەوەی دەمامکەی بەباشی دەربچێ مۆساد کۆهنی بردە لای نەشتەرگەر تا دەموچاوی وا بگۆڕێ شوێنەواری ڕەگەزی و نەتەوەیی لەسەر هەڵبگرێ. کاتێکیش لە لای نەشتەرگەرەکە دەرچوو، بە ئاستەم خێزانەکەی بە هۆی گۆڕانی کەپوی ناسییەوە.

لە سەرە سالّی نوێی 1984دا ناحوم ئادمۆنی ڕۆژانە لە پوختەی ڕاپۆرتەکانی دەزگای زانیاریی دەڕوانی لەوانەش هەواڵی کودەتای نێجیریا. حکومەتێکی لەشکری لەژێر فەرماندەیی ژەنەڕال موحەمەد بوهاری Muhammad Buhari لەوێ دەستەڵاتی گرتە دەست. پرسی سەرەکی سەرەک وەزیران شامیر ئەوەبوو ئایا ئەو کودەتایە چ کار لە گەیاندنی نەوتی خامی وڵاتەکە بۆ ئیسرائیل دەکا. کەس نەیدەتوانی هیچ بڵێ. هەمو ڕۆژەکە هەوڵی بێوچان دران بێئەوەی بتوانرێ پەیوەندی لەگەڵ دەستەڵاتدارە نوێکە بکرێ.

ڕۆژی دوهەمی لەسەر تەخت دانیشتنی بوهاری لیستێکی بە ناوی کاربەدەستە باڵاکانی ڕژێمی پێشو کە بە تاوانی جیاجیا تۆمەتبارکردبوون، دروستکرد. لە سەروی هەمویانەوە ناوی ئومرو دیکۆ Umaru Dikko وەزیری گواستنەوەی پێشو هەبوو، کە بە ملیۆنان دۆلاری لە دەستکەوتی نەوت لەجیاتی بیخاتە گەنجینەی دەوڵەت شاردبووەوە. دیکۆ هەڵات و هەمو هەوڵێکیش بۆ گێڕانەوەی بەکارهێنرا، نەدۆزرایەوە.

ئادۆمنی لەوەیاندا دەرفەتی خۆی دی. دەستی بردە بەر پاسپۆرتە کەنەدییەکەی- خۆشەویسترین پاسپۆرت بوو لای مۆساد بۆ کاری نهێنییان- بەرەو لاگۆس Lagos فڕی. بە ئێوارە درەنگ لە لایەن بوهارییەوە پێشوازی لێکرا. ژەنەڕال بە ئاسپایی گوێی لە ئادمۆنی گرت کە باسی پەسندنامەی

تـەواوی ڕابینـی بۆ دەکرد لـە بەرامبـەر مسـۆگەربوونی ڕۆیشـتنی نـەوتی لولـەکان بـۆ ئیسـرائیل، مۆسـاد سـۆراخی دیکـۆ هـەڵبگرێ و بیدۆزێتـەوە و بیهێنێتەوە نێجیریا. بوهاری تەنها یەک پرسی هەبوو: ئایا مۆساد دەزانێ کە دیکۆ ئەو هەمو پارەیەی لە کوێ شاردۆتەوە؟ ئادمۆنی بە دڵنیاییەوە گوتی کـە لـە حسـابێکی نهێنـی بـانکێکی سویسـرِی داینـاوە، ئـەوەش ئەسـتەمە بگەڕێندرێتـەوە مەگـەر زانیـاری لـە دیکـۆ وەرنـەگیرێ. لەسـەر دەموچـاوی ژەنـەڕال خەندەیـەک بەدیارکـەوت. گـەر دیکـۆ گەڕاندرایـەوە وڵات ئەوسـا زەحمەت نابێ زانیاری لێدەربهێنرێ. هێشتا دوا پرسـی بوهـاری مـابوو: ئایـا مۆساد ئامادەیە هاوکاری دەزگای نهێنیی نێجیرا بکا؟ ئادمۆنی سەری بەڵێی هەژاند. بۆ مۆساد ئەو ئۆپەراسیۆنە ڕەنگبێ بچوک بێ.

جاسوسە لە ژیان ماوەکانی ڕافی ئیتان لە سەرانسەری ئاوروپا جۆشدران. کاتساکان نێردرانە ئاوروپا هەر لە سویسراوە تا ئیسپانیا شانەئاسا ڕایماڵن و بـەدوای دیکۆدا بگـەڕێن. سـایانمەکانی دەیـان دەوڵـەت ئاگادارکرانـەوە، پزیشکەکان لەوە ئاگادارکرانەوە لەوانەیە دیکۆ پێویستی بە دکتۆر بێ یـان ڕەنگبـێ ویسـتبێتی شـێوەی دەموچـاوی خـۆی بگـۆڕێ تـا نەناسـرێتەوە، پرسگاکانی میوانخانەکان وشیارکرانەوە لە هاتنی دیکۆ بـۆ میوانخانـەکانیان. کارمەنـدانی بەکرێـدانی ئۆتۆمۆبێـل لەهـەمو ئاوروپـا، نوسـینگەکانی گەشتوگوزارو بلیتفرۆشتن وشیارکرانەوە گەر دیکـۆ هاتـە لایـان ئـەوا زەنـگ لێبدەن. ئەو سایانمانەی لە بانکەکان کاریاندەکرد ئاگادارکرانەوە لەوبارە گەر دیکـۆ کـارتێکی بـانکی بـەکارهێنا تـا شـوێنەکەی بدۆزرێتـەوە. بەردەسـتانی میوانخانەکان وردەکـاری ئادگـاری ناسـینەوەی دیکۆیـان پێدرا، جلدروەکان قـەبارەی جلـەکانی و پێڵاودروەکـان هـەر لـە ڕۆمـا تـا پـاریس وردەکـاری قـەبارەی پێـی دیکۆیـان پێـدرا، کـە چـل و شـەش و هـەروەها شـێوەی پێڵاوەکانیشی. ڕۆبەرت ماکسـوێلیش لـە لەنـدەن سـەردانێکی کـرا تـا ئـەویش پەیوەندییەکانی لەنێو دیپلۆماتکارانی ئافریکی بۆ سۆراخی دیکۆ بەکاربێنێ.

لەگەڵ ئەو هەمو هەولانە ئادمۆنی هاتە سەر ئەو بڕوایە کە دیکۆ لە شوێنێک لە لەندەن خۆی شاردۆتەوە- لەندەن ئەوشارەیە کە نەیارانی ڕژێمی پێشوی نێجیریا لێیدادەنیشن- لەبەر ئەوە کارامەترین کاتسای ناردنە لەندەن. کاتساکانیش پۆلیسی نهێنی نێجیری کە لە لایەن مێجەر موحەمەد یوسفو Muhammad Yusufuسەرپەرشتی دەکران، لەگەڵدا بوون. ئەوان باڵەخانەیەکیان لە Cromwell Road بەکرێگرت و کاتساکانیش لە میوانخانەکان دابەزین کە بەزۆری ئافریکاییەکانی لێدەبوون.

هەردو دەستەکە بەجیا کاریاندەکرد بە تایبەتیش کە سەروسۆراخیان لەنێو کۆمەڵگەی نێجیریدا هەڵدەگرت. پیاوەکانی یوسفو وا خۆیانمایشدەکرد کە لەبەر ڕژێمی نوێ هەلاتون، کاتساکانیش هەواداری ڕەشپێستەکان بوون بۆ ڕوخانی ڕژێمی باشوری ئافریکا. بەهێواشی بازنەی لێگەڕانەکەیان تەسکدەکردەوە تا هاتە سەر ڕۆژئاوای لەندەن، ئەو گەڕەکەی Hyde Park زۆر لە دەوڵەمەندە نێجیرییەکانی تاراوگەی لێ ئاکنجی ببوون. لەوێ سەیری لیستی دەنگدەرانیان کرد کە شار بۆ هەموانی دروستکردبوو. لەهەمولایەکەوە هەر نەخێر وەلام بوو.

تا ڕۆژێکیان دوای حەوت مانگ لە جێهێشتنی لاگۆس لەهیکەوە دەرکەوت. لە30 ی حوزەیرانی 1984دا کاتسایەک کە بە ئۆتۆمبێلەکەی لە Queenswayدەگەڕا بە ڕێگا باریکەیBayswater دا ڕۆیشت و کەسێکی دی هەمان ئاماژەی دیکۆی هەبوون. کابرا پیرتر و لاوازتر بوو لە جاران، بەلام دەموچاوپان و چاوە ڕەشەکانی لەبەر چاوی کاتسا دەقاودەق هەر خۆی بوون.

کاتساکە ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت و بەپێیان بە دوای دیکۆ کەوت تا بەردەرکی ماڵێک لە Dorchester Terrace . دەستبەجێ ئادمۆنی لێئاگادارکرایەوە. ئەویش فەرمانیدا کە نابێ لە چاوەدێری شەو و ڕۆژی خانوەکە هیچی دیکە بکرێ. سێ ڕۆژی یەکەمی تەموزی 1984 دو کەس بەردەوام چاویان لەسەر ماڵی دیکۆ بوو. لەونێوەدا نێجیرییەکان باڵویزخانەکەیان وەک خاڵی

خۆئامادەکردنی ئۆپەراسیۆنی ڕفاندن لەسەر شێوەی کاتی خۆی چۆن ڕافی ئیتان ئادۆلف ئایخمانی نازی ڕفاندبوو، بەکارهێنا.

مایەی تێبینییە کە ڕۆڵی کلیلی سەرەکی درابووە لایدەیەک ئەویش لێڤی ئاری شاپیرۆ Levi Ari Shapiro بوو. شاپیرۆ دکتۆرێکی ڕێزلیگیراو بوو وەک دکتۆری سڕکردن و بەڕێوبەری بەشی چاودێڕی چڕی نەخۆشخانەی هاشارۆن Hasharon بوو لە تەلئەبیب. ئەو لە لایەن ئەلێکساندەر باراک Alexander Barakهێنرابووە ڕیز. شاپیرۆ ئامادە بوو سەردانی لەندەن بکا و ئەو هەزار دۆلارەی باراکیش دابویێ هەندێ کەلوپەلی داودەرمانی وەک مادده سڕکەرەکان و دەرزی پێبکڕێ. لە لەندەنیش ڕێنمایی دیکە وەردەگرێ. شاپیرۆ ئەوەی ڕەتکردەوە لە جیاتی خزمەتەکانی پارە وەربگرێ، بەڵکو شانازی بە خزمەتکردنی وڵاتەکەی دەکرد. کاتسایەکی دیکە فلیکس ئابیتۆل Felix abithol لە 2ی حوزەیراندا لە ئەمستەردامەوە بەرەو لەندەن فڕی. ناوبراو لە میوانخانەی Russel Square Hotel دابەزی. یەکەمین ڕێنمایی بۆ یوسفو ڕابەری دەستەی نێجیری ئەوەبوو کە پاسێکی بچوک بەکرێبگرێ. ئەوانیش پاسیکیان بەکرێگرت. ڕەنگبێ لەسەروبەندی ئەو ساتەدا بێ کە پلانەکە چاوی بەسەرەوە بووبێ.

ئێوارە درەنگی 3ی تەموز بۆینگی 707بارهەڵگری نێجیری لە فڕۆکەخانەی Stansted Airportکە پەنجا و پێنج کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژهەڵاتی لەندەنەوە نیشتەوە. بۆینگەکە بە بەتاڵی لە لاگۆسەوە هاتبوو. فڕۆکەوانەکە بە دامودەزگای گومرگی فڕۆکەخانەکەی گوتبوو کە هاتووە کەلوپەلە دیپلۆماتیانەکەی باڵویزخانەکەیان بۆ وڵات باربکا. لەگەڵ فڕۆکەکە چەندان ئەندامی دەزگای نهێنیی نێجیری لەگەڵدا بوون گوایە دەستەی پارێزەری کەلوپەلەکانن. هاتنی ئەوان یەکسەر بە دەستەی تایبەتی Scotland Yard ڕاگەیەنرا، چونکە مانگی پێشتر چەندان سکاڵا لەسەر ڕژێمی سەربازی نوێی نێجیری بەرزکرانەوە کە گەف لە خەڵکی تاراوگە دەکەن. پۆلیسەکان

پێیانگوترا کە نابێ فڕۆکەخانەکە چۆڵبکەن. تاقمی فڕۆکەکە بۆیان نەبوو بچنە دەرەوە تەنها دەیانتوانی بچنە کافتریا بۆ قاوە کڕین.

ڕۆژی پاشتر سەرلەبەیانییەکەی، پاسە شینە بە کرێگیراوەکە لە گەراجەکەی خۆی لە Notting Hill Gate دەرچوو. لە پشت ستێرنەکە یوسفو خۆی دانیشتبوو و دەیهاژۆت. لە پشتەوەش دکتۆر شاپیرۆ لەناو باولێک دانیشتبوو باراک و ئابیتۆلیش لەدەورەی. لە سعات دوانزەدا کاپتنی فڕۆکەی بۆینگ نەخشەی فڕینەکەی ئاشکراکرد کە سعات 15:00 ڕوەو لاگۆس دەفڕێ. لە مانیفێستەکەی باریش نوسرابوو کە دو باولی گەورە لە' بەڵگەنامە'ی وەزارەتی دەرەوەی نێجیریا هەڵدەگرێ. بە گوێرەی نوسراو پۆستی دیپلۆماسی لە هەردوو باولەکاندا هەبوو.

کەمێک پێش دوای نیوەڕۆ پاسە شینەکە لەبەردەم دەرگەی ماڵی دیکۆ لە Dorchester Terrace ڕاوەستا. کەمێک دوای ئەوە ئومورو دیکۆ لەماڵ هاتە دەرەوە بەنیازبوو بچێتە لای برادەرێکی تا بەیەکەوە لە چێشتخانەیەک نانی نێوەڕۆ بخۆن. سکرتێرە تایبەتییەکەی لەو ساتەدا لە جامی پەنجەرەکەی سەیریدەکرد. کاتێک ئاوڕیدایەوە دەرگای پاسەکە کرایەوە و 'دو پیاوی پیست تاریک دیکۆیان گرت و خستیانە نێو پاسەکە. دێکۆ دەرفەتی ئەوەی نەبوو هاواربکا کە دەرگەی پاسەکەیان داخست و بەخێراییەوە بۆی دەرچوون' .

سکرتێرەکەی زو بەئاگاهاتەوە و زەنگی بۆ ژمارەی پۆلیسی باری ناکاو 999لێدا. دوای خولەکیک پۆلیس گەیشتە شوێنی ڕوداوەکە. بەدوایدا فەرماندەی هۆبەی دژە تیرۆر Scotland yard ویلیوم هوکلێسبی William Hucklesbyیش بەسەر ڕاگەیشت. ئەو یەکسەر گومانی بۆ پرسکە چوو. هەمو بەندەرو فڕۆکەخانەکان وشیارکرانەوە. بارەکە بۆ هوکلسبی زۆر کێشەداربوو. گەر هاتو دیکۆ لە لایەن حکومەتی نێجیریاوە ڕفاندرابێ ئەوا پرسی سیاسی دزە دەکەن. ئەو وەزارەتی دەرەوەی Downing Srteetی لێئاگادارکردەوە. فەرمان بە هوکلسبی درا کە چی پێباشە وا بکا.

کەمێک پێش سعات سێی دوای نیوەڕۆ پاسەکە بەرەو باڵەخانەی بار لە Stansted لێیخوڕی. یوسفو نوسراوێکی دیپلۆماتیانەی نیشانی پۆلیسی گومرگدا. ئەوانیش تەماشای ئەو دو باولە گەورانەیان کرد. پۆلیسێکیان چارلس مۆرۆCharles Moroww ئاوای بیردێتەوە:' لەیەکی لە باولەکان شتێکی نامۆ هەبوو. من گوێم لە دەنگێک بوو لەناوی دەهات، بیرمکردەوە لەو حەسانەی دیپلۆماتی هەڵدەن دەبێ سەیرێکی ناوەوەی بکەم '.

باولەکان لەگەڵ نارەزایی و بۆڵە بۆڵی یوسفو کە شتەکان حەسانەی دیپلۆماسیانەیان هەیە، هێنرانە خوارەوە. لە باولی یەکەم ئومرو دیکۆ کۆتکراو بوو کە لە ژێر ماددە سڕکەرەکان بێهۆشکرا بوو. لە تەنیشت ئەویش دکتۆر شاپیرۆ بوو کە دەرزی لەدەستدا بوو تاکو دەرزییەکی دیکەشی گەر پێویست بوو لێیبدا. ئەو دەرزییەکی لە ملی دیکۆ دابوو تاکو بەسەریدا نەڕشێتەوە. لە باولەکەی دیکەدا باراک و ئابیتۆلی تێدابوون.

لە کاتی دادگاییکردنەکەدا هەردو کاتساکە دەستیان بەو بەهانەوە گرت کە گوایە ئەوان بەکرێگیراوی هەندێ پیاوی بزنسمانی نێجیرین و ویستویانە دیکۆ لەبەر پارەی لە نێجیر دادگایی بکرێ. یەکێک لە باشترین و گرانترین پارێزەری شانشینی یەکگرتو جۆرج کارمن Gorg Carmen بۆ پارێزگاری لێکردنیان کەوتە کار. لە گوتارەکەیدا بەرامبەر دادگا گوتی: ' ڕەنگبێ بۆ ڕاستگۆیەتی ئەو دۆزە دەزگای نهێنیی ئیسرائیلی هەرگیز لە دەرەوەی ئۆپەراسیۆنەکە نەبێ' .

داواکاری گشتی هیچ بەڵگەیەکی نەخستەڕو کە سکاڵابێ لەسەر مۆساد. دەبوایە دادوەر خودی خۆی لە بڕیارەکەیدا ڕاستی بەدەرخستبایە- ئەویش ئاوای بە jury گوت: پەنجەی پەیوەستبوون بەو کارە بێگومان بۆ مۆساد ڕادەکێشرێ' .

باراک بە چواردە ساڵ حوکمدرا، دکتۆر شاپیرۆ و ئابیتۆل هەریەکەو دە ساڵیان بەتەنگە دادرا. یوسفوش دوازە ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە، بەڵام هەرچواریان لەبەر ڕەفتار باشیان لە زیندان ئازادکران و بە پەلە ڕەوانەی

ئیسرائیل کرانەوە. هەروەک مۆساد کاری باشی کەسی دیکەی پاداش دایەوە، ئاواش مشوری ئەوەی خوارد کە پەیوەندیدارەکان نەکەونە بەر تانەو تەشەرو پرسیاری هەراسانکار، وەک ئەوەی ' دکتۆر شیپارۆ هەرچەندە پێچەوانەی سوێندخواردنەکەی ڕەفتاری کردبوو، کەچی هێشتا هەر لەسەر پیشەی خۆی ما بووەوە، ئایا ئەو بۆکێ کاریدەکرد؟

ناحوم ئادمۆنی پەیامێکی لە MI5 ەوە بۆهات گەربێتو مۆساد یەک ڕوداوی دیکەی وا بکاتەوە ئەوا بە چاوی دوژمنانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ.

لەسەروبەری ئەوکاتەدا سەرانی مۆساد سەرقاڵی ئۆپەراسیۆنێکی دیکە بوون، مەبەست لێیەوە ئەوە بوو بەبیر شانشینی یەکگرتو بهێنرێتەوە کە لە ڕاستیدا کێیان دوژمنە و لەهەمان کاتیشدا هەواداریێتی نوێ بۆ ئیسرائیل بوروژێنن.

# 14

## بۆمبی کیژە بەردەستەکە

{فڕۆکەیەک لەسەر ئاسمانی لیبیا بەرەو ئیسڕائیل بەهەڵە دەرفڕێندرێ.. چەتەگەری ئاسمانیی.. ئەبو شەرع لەسەر بەلەم دەکوژرێ..کچی نیوەڕوت.. کیژە ئێرلەندییەکە.. ناپاکیی.. چارەنوسی هینداوی.. باڵویزخانەی سوریا لە لەندەن توش دەبێ.. کەشتی دەتەقێندرێتەوە.. ئەبو نیزال ئۆقرەی لەبەر بڕابوو..}

لە بەیانیەکی سامالّی فێبرایری 1986دا دو فڕۆکەی تێژڕەوی جەنگی سەر بە هێزی بەرگری ئیسرائیلی لە فڕۆکەیەکی سەرنشینهەڵگری سەر ئاسمانی لیبیایی بەناوی Learjet تۆمارکراو دەرکەوتن، کە لە تەرابلوسەوە Tripoli بە ئاراستەی دیمەشقەوە دەڕۆیشت. فڕۆکە سیڤیلەکە گەیشتبووە بۆشایی نێودەوڵەتی ، نۆ کیلۆمەتر لەسەر زەریای سپی ناوەڕاست، لەو خالّەدا بوو کە بۆ سەر ئاسمانی سوریا شۆڕبێتەوە. سەرنشینانی فڕۆکەکە لەو فەلەستینییانە بوون کە لە لیبیا کۆنفڕانسێکی فەلەستینی و گروپە ڕادیکالییەکانی دیکەیان بە ئامادەبوونی موعەممەر قەززافی بەستبوو. لەوێدا قسەی نوێ سەبارەت بە سەلماندنی کەڵکەلەی مێشکی سەرکردەی لیبی بەوەی : ئیسرائیل لەسەر گۆی زەوی ڕابماڵدرێ، بیسترا.

نیگا و ڕەوتی هەردو فڕۆکە جەنگییەکە کە ئەم لاو ئەو لای فڕۆکە سڤیلەکەیان دەورەدابوو، بووە مایەی تۆقانی سەرنشینەکانی، لەمەشیاندا ناحەقیان نەبوو، چونکە چوار مانگ پێش ئەو ڕوداوە لە سێشەممەی 1ی ئۆکتۆبەری1985 دا، فڕۆکە بۆمبهاوێژەکانی ئیسرائیلی لە جۆری F15 بارەگای سەرەکیPLO یان لە خوارووی ڕۆژهەلاتی تونس لە ئۆپەراسیۆنێکدا

بۆمباران کرد، کە پێنج هەزار کیلۆمەتیان بڕی بوو لە ئاسمانیش تانکی سوتەمەنیان پڕکردەوە. ئەمەیان هێرشێکی ئیسرائیلیانە بوو لەسەر بنەمای زانیاری هەراسانکاری دروست کە هەمیشە لە جیهانی عەرەبی دەبووە مایەی تەزاندن.

پەلامارەکە تۆڵەکردنەوەیەک بوو بۆ کوشتنی سێ گەشتیاری ئیسرائیلی ڕۆژێکی پێشتر، کە لە تەمەنێکی مامناوەندی دابوون و لەسەر پشتی بەلەمەکەیان لە بەندەری لارناکای قوبرس خۆیان لەبەرخۆر ڕاخستبوو، بە گوللەی نیشانئەنگێوەکانی PLO کوژران. کوشتنەکە لە سەروبەری یادکردنەوەی ئاهەنگی یۆم کیپور Jom Kippoer بوو، زۆرلە ئیسرائیلییەکان بەتوندی یادی ڕۆژی ئاشتەوایی گەورەی پێشتریان دەکردەوە کەچی هەمو نەتەوەکە وەک سێ گەشتیارەکە کەوتنە بەر پەلامار.

هەرچەندە نزیکەی چوار دەیە دەبێ ئیسرائیل لەژێر کردەی تیرۆرستانەدا دەناڵێنێ و بۆتە مایەی ئاستێکی بەرز لە ترس‌وبیم: گەشتیارەکانیان ماوەیەک لەسەر بەلەمەکە بەندکردن تا دەرفەتی ئەوەیان هەبێ دواشتیان کە بەبیر دادێ بیخەنە سەر کاغەز پێش ئەوەی بکوژرێن. یەکەم کوژراویان ژنێک بوو کە زگیان دڕی، پاشان هەردوو پیاوەکانیان ناچار کرد ژنەکە فڕێدەنە ناو ئاوەوە. پاشان هەردوکیان بە گوللە لە ملدان تەواوکردن.

لە پڕوپاگەندی ڕەش کە لەمێژ بوو بایەکەی لەنێوPLO و مۆساددا هەڵیکردبوو، PLO بڵاویکردەوە کە سێ قوربانییەکە ئاژانی مۆساد بوون و خەریکی ئەرکی خۆیان بوون. PLO وای پڕوپاگەندەکە هۆنیبووەوە بڕوای بە خەڵک هێنابوو، بۆیە ڕۆژنامە جۆربەجۆرەکانی ئاوڕوپا ژنە قوربانییەکەیان وا 'ناسیەوە' کە هەر ئەو پۆلیسەی مۆساد بووە لە گۆبەندەهەرای لیلەهامەر Lillehammer لە 1973دا بە کردەکەوە گیرا، بەڵام ژنی گۆبەندی ناوبراو لە ژیاندا ماوە و کاری مۆسادییانەی لەمێژە وەستاندووە.

لەو کاتەوە ڕۆژنامە عەرەبییەکان پڕ بوون لە هۆشداریینامەی تۆڵەکردنەوە لە ئیسرائیلییەکان. زۆر لەو چیرۆکانە دەستکردی خودی مۆساد بوون بۆ درێژەدان بە شەڕی دەرونی تا دەماری هەژێنەری ملیۆنان لە عەرەبانی پێ قورستر بکا.

سەرنشینەکانی فڕۆکەی Learjet کە پێش چەند سعاتێک لە کۆنگرەی قەززافیدا دروشمیان بە ڕامالینی ئیسرائیل دەکێشا، هەنوکە ڕوی گرژ و تورەی دوژمنەکانیان دەبینن کە مۆرەیان لێدەکەن. یەکێک لە فڕۆکە جەنگییەکان بە باڵەکانی ئاماژەیەکی کرد، کە لە هەمو دنیا واتای بەدوامکەوە دەگەیەنێ. بۆ زیاتر دڵنیا بوون فڕۆکەوانەکە دەستی پەنجەوانەداری ڕێک بەرەو پێشەوە بۆ گالیلیا Galila درێژکرد. ژنە سەرنشینەکانی نێو فڕۆکەی Learjetکڕوزانەوە و یەک دو پیاویش دەستتیان بە نوێژکردن کرد. ئەوانی دیکەش دژوارییی چارەنوسیان بۆ دەرکەوت. ئەوان هەمویان دەیانزانی کە چ ئەگەرێک چاوەڕوانیان دەکا: ئەو بێدینانە ئەو توانایەیان هەیە تا لە ئاسمانیشدا بن لەدەستیان دەرنەچن.

یەکێ لە فڕۆکەکان بۆ ئاگادارکردنەوە بە ڕشاندنی شێلکەیەک لە دۆشکاکەی، دەسەڵاتدارانی فڕۆکە سڤیلەکەی ئاگادارکردەوە کە نابێ هێزی ئاسمانی سوری بە ڕادیۆ بۆ فریادڕەسی بانگبکا، کە تەنها چەند خولەکێکی فڕین لێیانەوە دور بوو. ترسی سەرنشینەکان تادەهات زێدەتر دەبوو، بەڵام ئایا هەمان بەختی پاڵەوانانی جیهانی عەرەب چاوەڕوانی دەکردن؟

مانگێک بەر لە پەلامارەکەی سەر بارەگای PLO لە تونس، بەلەمێکی گەڕۆک کە پیاوی مۆسادی لەسەر پشت بوون، بەلەمێکی بچوکیان بە ناوی Opportunityکە لە بەیروتەوە بەرەو لارناکا دەچوو، ڕاگرت. لەسەر بەلەمەکە فەیسەل ئەبو شەرع Faisal Abu Sharah یان کە تیرۆرستێکی دەست بە خوێن ئالودە بوو، دۆزیەوە. فەیسەلیان لەگەڵ خۆدا هێنایە ئیسرائیل. لەوێ لێکۆڵینەوەیەکی بێبەزەییانەیان لەگەڵدا کرد و پاشان بە پێواژۆیەکی کورتی دادگایی حوکمی تا لەژیاندا مانەوەیان لەبۆبڕیەوە.

خێرایی و بزۆزی ئۆپەراسیۆنەکە خەیاڵی لە دۆڕاننەهاتوی ئیسرائیلیان لای جیهانی عەرەب باشتر چەسپاند.

ئەو جۆرە ڕوداوانە ئاسایی نەبوون. لەو کاتەوە بە هاوکاری دەستەیەکی بچوک، بەڵام باش ڕاهێنراوی مارینزی ئیسرائیلی، مۆساد توانی چەندان بەلەمی دیکە ڕابگرێ و تیرۆرستیان لەناو دەربهێنێ. نەوەک تەنها کەنارە دورودرێژەکەی زەریای ناوەڕاست پێویستی بە ئێشکگرتن هەبوو، بەڵکو کەناری سەر زەریای سوریش پێویستی پێ هەبوو. چاوێکی مۆساد لە یەمەن بووە مایەی هەڵوەشاندنەوەی پیلانێکی PLO کە بەلەمێکی ماسیگری تەژی لە تەقەمەنی دەیەویست لە ڕێگای زەریای سورەوە بۆ بەندەری ئیلات Elatبڕوا، لەوێ لە کەنار لەنێو میوانخانە ئیسرائیلییەکان بتەقێنرێتەوە، لەدوا چرکەساتدا بەوە پوچەڵکرایەوە، کە بەلەمێکی تۆپهەڵگری ئیسرائیلی ڕێیپێگرت پێش ئەوەی دو خۆکوژەکان بتوانن بەلەمەکە بتەقێننەوە، لەناویانبردن و دەستیان بە سەر بەلەمەکەدا گرت.

کاتێک فڕۆکەی Learjet ناچار کرا لە بەشی باکوری ئیسرائیل بنیشێتەوە، سەرنشینەکانی ترسی ئەوەیان لێنیشت کە ئەمەش کاردانەوەی تۆڵەی ئەو ڕوداوەیە کە پێش مانگێک پاڵەوانێکی دیکەی عەرەبان ئەبو ئەلعەباس Abu Al-abbasلە 2ی ئۆکتۆبەری 1985دا بەلەمێکی سەرنشینانی ئیتاڵیایی Achillo Lauro ڕفاند. کردەوەکە وا وروژێنەرانە بوو چەتەگەری زەریایی بەبیر جیهان دەهێنایەوە. ئەلعەباس گەشتیار Leon Klinghoffer ی جوی ئامریکی بەر گولله دا و بە کورسیە کەمئەندامییەکەشی فڕێیدایە خوارەوە.

تاوانەکە بووە مایەی ڕوداوێکی سەرئاوکەوتووی دیپلۆماسیانەی نێوان ئیسرائیل، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و میسر و سوریا و قوبرس و تونس وPLO ی بێ دەوڵەت. بە ڕۆژان تەنگژەکە بەسەر زەریای ناوەڕاست دەهات و دەچوو، بە هۆیەوە ڕفێنەرەکان تیشکی زۆری ڕاگەیاندنیان کەوتە سەرو زۆر لەو دەوڵەتانەش ڕەفتاری تیرۆرزمیان بەدڵ بوو هەناسەی ئۆخەیان هەڵکێشا. ڕفاندنی بەلەمی هێڵی گواستنەوەی سەرنشینان بووە مایەی هاتنی

گەشتیار و پارەی زۆر پێویست بۆ ئیسرائیل و کوشتنی سەرنشینێکیش هەرای بێ بڕیاری نایەوە. لە ڕوی دادوەرییەوە کوشتنەکە لە هەرێمی ئیتاڵیاوە ڕویدا، چونکە بەلەمەکە Achille Lauro لە Genua وە تۆمارکراوە، بەڵام ئیتاڵیا لە ڕادەبەدەر بەرامبەر تیرۆریزم هەستیار بوو دەیەویست بە بێدەنگی کۆتایی بە ڕوداوەکە بێ. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش داوای چەسپاندنی دادی بۆ کوژراوەکە دەکرد، کە هاووڵاتی خۆی بوو. لە هەمو لایەکی وڵاتەکە دروشم بەرزکرانەوە ئەو دەقەی لەسەر نوسرابوو:Don`t get mad, get even . لە دوایدا پاش ئەوەی چەندان ڕۆژ هەواڵنێرانی جیهانی پێوەی سەرقاڵ بوون، ڕفێنەرەکان خۆیان دایە دەست دەسەڵاتدارانی میسری، ئەوانیش هەرچەندە ئیسرائیلییەکان زۆریش تورە بوون، یارمەتیان دان وڵاتەکە بەجێبهێڵن.

زۆر لە سەرنشینانی فڕۆکەکەی Learjet لەخۆیان دەپرسی ئاخۆ لە تۆڵەی ئیسرائیلییەکاندا لە زیندان دەئاخنرێن. هەردو فڕۆکە جەنگییەکە کە خەریک بوو باڵیان بە باڵی فڕۆکە سڤیلەکە دەکەوت لێیجیانەبوونەوە تا ناچاریانکرد لە فڕۆکەخانەیەکی سەربازیدا لە گالیلیا Galilea بنیشێتەوە. ئامان Aman پەیامی لە مۆساد پێگەیشتبوو گوایە دو لە گەورە تیرۆرستە زۆربەدوا گەڕاوەکانیان: ئەبو نیزالAbu Nidal و ئەحمەد جبریلAhmed Jibril ی سامناکیان لە نێودان، بەڵام کاتێ ئامان لەگەڵ سەرنشینەکانی لێکۆڵینەوەیکرد، لە چەند عەرەبێکی تۆقاوەوە زیاتر نەبوون. هیچ لە سەرنشینەکان ناویان لە داتابانکی ئیسرائیلیدا نەبوو. مۆڵەتیان بە فڕۆکەی Learjet دا بە هەمو سەرنشینیەکانیەوە بفڕێ و بۆ شوێنی خۆی بڕوا.

پاشان ئیسرائیلییەکان ڕایانگەیاند بەنیازی دەستگیرکردنی تیرۆرستان فڕۆکەکەیان ڕفاندووە. لای مۆساد ئەو ڕایە باڵکێش بوو کە نابێ هیچ دەرفەتێک بۆ ترس و بیم خستنە نێو عەرەبان لەدەستبدرێ. ئەفسەرێکی ئامان کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ سەرنشینەکاندا کردبوو گوتی سەرنشینەکان خەیاڵی باڵادەستێتی ئیسرائیلیان لەگەڵ خۆیان بە فراوانترین بارەوە بردەوە.

فەرماندەی ئامان یەهود باراک Ehud Barak بێ ئەوەی بیرۆکەکەی لە ناحوم ئادمۆنی بشارێتەوە ڕایگەیاند کە ئۆپەراسیۆنەکە نمونەیەکی شێوازی 'بەخت هەبوون" بوو کە مۆساد پشتیپێبەست.

بەڕێوەبەری گشتیی مۆساد، پیاوێک بوو لۆمەو هەڵەی بەسوکی وەرنەدەگرت دەستی بە جیبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنێک کرد، کە کۆتایی نەوەک هەر بە گاڵتەپێکردنی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عەڕەبەکان بە مۆساد هێنا کە 'هەنوکە دابەزیوەتە سەر ئاستی بەناچار دابەزاندنی فرۆکەیەکی بێچەک' بەڵکو بە تانەو تەشەری دەزگا زانیاریەکانی دیکەی نێو ئیسرائیلیش بێنێ. ئەوان دەیانگوت : ئەم جارەیان ئادمۆنی دەبێ تەواو لە کردەی داهاتوی دڵنیابێ پێش ئەوەی ببێتە گاڵتەجاڕ.

ئۆپەراسیۆنێکی مۆساد بە شیوەیەک دەستیپێکرد کە ژیانی کچێکی ئیرلەندی بەردەست لە میوانخانەیەک لەناو بباو دۆستە عەڕەبەکەشی بخاتە نێو زیندانەوە، کە درێژترین بڕیاری حوکمی زیندانە تائێستا دادگای باڵای بەریتانی دەریکردبێ. هەروەها ڕاوێژکاری ئاڵمان هێلمۆت کۆل Helmut Kohl و سەرەک وەزیرانی فەڕەنسیش ژاک شیراک Jacques Chirac شەرمندە بکا؛ تیشکیش بخاتە سەر ڕاوەڕیویەکەی ڕۆبەرت ماکسوێل، سوریاش لەسەر مێزی دانوستانی هەمو جیهاندا دەربکا و دەزگا ڕاگەیاندنە عەڕەبییەکانیش کە بە خۆشحاڵیەوە بە مۆسادیان ڕادەبوارد ناچارکران دۆڵەکەیان نەرمتر بکوتن.

هەروەک هەمو ئۆپەراسیۆنێک چرکەساتی وروژێنەر و چاوەڕوانکردن هەبوون. توخمەکانی بێئومێدی مرۆ، توڕەیی و ناپاکیی لە بازنەکە بەدەرنەبوون، چونکە بۆ پیاوێکی وەک ناحوم ئادمۆنی ئەوانە سەرەداوی دەستکردنەوە بوون. لەو نێوەدا ئەو سەر لەنوێ دەستی بە هەمان پرس کردەوە، تۆبڵێی سەربگرێ؟ تۆبڵێی کەسانی دیکە بڕوا بەوە بکەن کە پێشهاتەکە وابوو کە ڕویدا؟ ئایا لە کۆتاییشدا بۆ هەتا هەتایە ڕاستییەکە گۆڕەوشار دەکرێ؟

هەرچۆنێک بێ مۆساد لەو ئۆپەراسیۆنەیدا لەوە ئەرخایەن بوو کە سەرەداوی بەهرەی دو پیاو چارەنوسساز بوون. یەکێکیان کاتسایەک بوو لەژێر نازناوی تۆڤ لیڤی Tov Levy بوو کە لە شانشینی یەکگرتوو کارا بوو، ئەوی دیکەشیان هەواڵدەرێکی فەلەستینی بوو بە نازناوی ئەبو Abu. ئەوفەلەستینییە لە لایەن مۆسادەوە لەوکاتەوە هێنرایە ڕیز کاتێک مۆساد بەوەی زانی ناوبراو بڕە پارەیەکی سندوقی PLO کە لەژێر دەستیدا بوو لەسەر گوندێکی سەر سنوری ئیسڕائیلدا شاردۆتەوە. مۆساد یاری ئەوەی لەگەڵدا کرد کە بیترسێنێ و کارەکەی لە ڕێی کەسێکی نەناسراوە بە سەرۆکی گوندەکە بگوترێ لە ئەنجامدا سەری تێدا دەچێ، بۆیە ناچارکرا بچێتە لەندەن. لەوێ ناسنامەی ساختەی وای بۆ دروستکران گوایە بزنسمانە و هاوکار لەگەڵ ئامرازەکانی بازنەی دارایی خۆی پەرەپێدەدا. سەرپەرشتیکارەکەشەی تۆڤ لیڤی بوو.

بەپێی هەمو شتێک ئەبو پڕبەپێستی پێناسە کۆنەکەی ئاژانی جاسوسی بوو، هەروەک چۆن ئوزی ماهنایمی Uzi Mahnaimi ئەندامی پێشوی دەزگای نهێنی ئیسڕائیلی دایڕشتبوو: 'تۆ بە سعاتان بەڵکو بە ڕۆژان لەگەڵ ئەودا دەبی، هەمو شتێکی دەزانی، لێی فێردەبی، وەک ئەو دەڕۆیی و لەگەڵیدا دەڕۆیی، تەماشای وێنەی خانەوادەکەی بکە هەوڵدە ناو و تەمەنی منداڵەکانی بزانی، بەڵام ئەو کەسە بوونێکی مرۆیی نییە، نابێ ئاوا بیری لێبکەیتەوە. ئاژانسێک بە سوک و ئاسانی ئامرازێکە هەروەک کەلاشینکۆف بۆ گەیشتن بە ئامانج، پێویستە لەگەڵیشیدا هەڵبکەی. گەر بتەوێ هەڵیبواسی نابێ بیری لێبکەیتەوە. ئاژانس هەمیشە نمرەیەک بووە، هەرگیز کەس نەبووە' .

ئەبو تا دوا خاڵ ڕۆڵەکەی بە باشی هێنا و بووە دیاردەیەکی باوەڕپێکراو لە دەوری مێزی گازینۆیMayfair . سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی چاو لە لایەنە مێبازییەکە و زۆر خواردنەوەکەی دەپۆشرا. ئەو سەردانی هەمان بۆنەی بازرگانانی چەک و دەوڵەمەندە لایەنگرەکانیPLO ی دەکرد. ئاوا زانیاریی دەستدەکەوتن و لەژێر تیشکیشیەوە مۆساد هەڵسوکەوتیدەکرد.

بەهۆی زانیارییەکانی ئەبو لەماوەی هەفتەیەکدا پانزە ئەندامی PLO لەناو بردران.

هەندێ لە دیدار و چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ تۆڤ لیڤیدا لە بارِ و چێشتخانەکانی میوانخانەی Hilton بوو لەPark Lane . لەوێ کچێکی ئیرلەندی لە دبلنەوە بە ناوی ئان ماری مورفی aan-Marie Murphy وەک بەردەست لە میوانخانەکە کاریدەکرد.

هەروەک زۆر لە هاووڵاتییەکانی بەرامبەر لەخشتەبردن نەرمیکردبوو تا بتوانی لە زەریای ئیرلەندی بپەڕێتەوە و لە لەندەن باشتر بژی. هەرگیز کارێکی لەبەردەستی میوانخانە زیاتر دەستنەکەوت. کرێکەی کەم و ڕۆژەکانیشی درێژ بوون. ئەو کاتە بەتاڵەی کەمیشی لە قاوەخانەکانی گەڕەکی Shepherds Bush کە لەمێژە جێی گردبوونەوەی ئیرلەندییەکان بوو لە لەندەن، بەسەر دەبرد. ئەویش گۆرانی لەگەڵ دەگوتن پێکی جنی Guinnessی هەڵدەدا. دواتر دەبوایە بگەڕێتەوە ژورە تەنهاییەکەی تا خۆی بۆ ڕۆژی درێژی نوێ ئامادە بکا کە کاری ئاودەست خاوێنکردنەوە و مشورخواردنی پاک و تەمیز ڕاگرتن و بریقەدانەوەی ژورەکانی میوانخانەی هیلتۆن بوو. کارنامەکەی لێرەدا گیرسایەوە.

پێش کێرمسی 1985 بە گریان و بە پێکەنین بیری لە بەسەربردنی ڕۆژەکانی جەژن دەکرد کە بەتەنها لە شارێک کە زۆر جیاوازە لە دبلنی بێ مشور، بەسەر ببا، پیاوێکی عەرەبی ئەسمەر پێستی ناسی لەچاوی ئەودا قۆز بو. سەرەڕای ئەوەش قاتە بریقەدارو بۆینباخە کەشخەکەی سیمای دەوڵەمەندی پێوە دیار بوو. کاتێ پیاوەکە خەندەیەکی بۆ ئان ماری دەکرد، ئەویش بە خەندە وەڵامی دەدایەوە. کابرا ناوی نزار هینداوی Nazar hindawiبوو پسمامی ئەبوش بوو. هنداوی تەمەنی سی و پێنج ساڵان بوو کەچی درۆی لەل کچەکە کردبوو گوتوبووی بەقەد ئەو سی و دوو ساڵە. کابرا لەسەر درۆکانی بەرامبەر کچەساویلکە گەنجەکە بەردەوام بوو، ئەویش باوەڕی پێدەکرد.

ئەوان یەکدیان لەقاوەخانەیەکی تیاترۆی BBC لە Shepherds Bush Green دیت. ئەو هەرگیز نەچووبووە ئەوێ و مایەی سەرسوڕمانی بوو کە هینداوی لە نێو ئەو هەمو دەموچاو سورە وەستا ( مەبەست لێرە وەستای خانو دروستکردنە- وەرگێڕ-)یانە کە بەزاراوەی جۆربەجۆری ئێرلەندی دەدوان بدۆزێتەوە. پێدەچوو هینداوی زۆر لە ئامادەبووە مەیخۆرەکان بناسێ و زەوقەکەی لەگەڵیاندا هەڵیدەکرد.

چەند هەفتەیەک بوو هینداوی هاموشۆی ئەو بارەی دەکرد، بەهیوای ئەوەی لەسەر قسەی ئەبوی پسمامی، بێ ئەوەی هۆیەکەشی بۆ شیبکاتەوە، پەیوەندی لەگەڵ ئەنداممان IRAوە بکا. هەوڵە کەمەکانی هیندوای بۆ هەلومەرجی سیاسی ئیرلەندی بە قسە بێنێ و بیانخاتە سەر نەخشە، ڕاستەوخۆ لە لایەن پیاوەکان ڕەتکرایەوە. بە گوێرەی هینداوی نەخشەی ئەبو دەبێ هەمیشە بە نهێنی بمێنێتەوە. ئامادەبوونی ئان ماری وایکرد بیری هینداوی بەرەو ئاراستەیەکی دیکە بگۆڕێ.

بە سەرسامی و خەندەوە ئان ماری سەرنجی گوێی لە شێوازی باش و کاریزمای هینداوی و چیرۆکەکانی لە بارەی ژیانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەگرت. بۆ ئافرەتێک کە لەندەن زیاتر تێنەپەڕیوە چیرۆکەکانی وەک ئەوانەی هەزارو یەکشەوە لە گوێدا دەزرنگایەوە. هەمان ئێوارە هینداوی کچەکەی بە ئۆتۆمۆبیل بردەوە ماڵ و هەردوو ڕومەتەکانی ماچکردن و ئەنجا بەجێیهێشت. ئان ماری لەخۆی دەپرسی ئاخۆ ئەو هەستە گێژبوونەی نیشانەی سەرەتای ئەڤینییەکەیەتی. ڕۆژی پاشتر هینداوی بۆ نانی نیوەڕۆی بردە چێشتخانەیەکی سوری، لەوێ بە هونەری چیشتلێنانی عەرەبی سەرسامکرد. بە کەمێک مەی لوبنانییەوە کچەکە شلی کرد و بردیەوە فلاتی کچەکە. ئان ماری هێشتا هەر کچ بوو. لەبەر ئەوەی ئان ماری بە دابونەریتی توندی کاسۆلیکی ئێرلەندیانە پەروەردەکرابوو، هیچ کەرەسەیەکی خۆپارێزی لە سکپڕی لە شەوەکەیدا بەکارنەهێنا.

لە فێبرایری 1986دا بۆی دەرکەوت کە دوو گیانە. دواتر هینداوی لە دووگیانییەکەی ئاگادارکردەوە. ئەویش بە پێکەنینەوە دڵی دایەوە پێیڕاگەیاند کەوا مشوری هەموشتێک دەخوا. بە شڵەژانەوە ئان ماری پێیگوت کەوا هەرگیز پەنا بۆ لەباربردن نابا. ئەویش گوتی کەوا بیری بۆ ئەو شتە نەچووە. لە ڕاستیدا ئەو لەو بیرۆکەیە تۆقی بوو، ژنێک بهێنێ کە لە خوار ئاستی خۆیەوە تەماشای دەکرد. لەوەش دەترسا ئان ماری سکاڵا بباتە لای دەسەڵاتداران. ئەو باکی بەوە نەبوو ئاخۆ دەسەڵاتداران چۆن چارەی پرسەکە دەکەن، بەڵام لەوە دەترسا نەبادا مافی نیشتەجێبوونەکەی لێبسەننەوە، ئەوکات وەک لایدەیەک لە وڵات دەردەکرێ. هینداوی پەنای بردە بەر ئەبوی پسمامی، کە تاکەکەس بوو یارمەتی بدا .

ئەویش توشی کێشەی خۆی ببوو، چونکە پارەی زۆری لە قومار دۆڕاندبوو. هینداوی بە ڕەقی وەڵامدرایەوە کە ئەبو ئەو پارەیەی نییە بیداتێ تاکو ئان ماری ڕەوانەی دبلن بکاتەوە بۆ منداڵبوون پاشان بیخاتە ژێر باڵیەوە. ژنەکە پێیگوت بوو کە ئەم جۆرە کارانە زۆر لە ئێرلەندادا ڕودەدەن.

ڕۆژی پاشتر ئەبو تۆڤ لیڤی سەرپەرشتکارەکەی خۆی دی. لەسەر مێزی نانخواردن لیڤی پێیگوت کە بە دوای شتێکدا دەگەڕی دەسەڵاتی ئینگلیزی دیپلۆماتە سورییەکان دەربکا و باڵویزخانەکەشیان دابخا، چونکە لەمێژە بۆنی تیرۆریان لێدێ. بۆ ئەوەش هێزێکی سەلمێنەری پێویستە. ئایا ئەبو دەربارەی کەس بۆ پرسەکە لەگەڵ لیڤی ئاخاوت؟ ئەبو پێیڕاگەیاند کە ئامۆزایەکی هەیە و سکی کچێکی ئێرلەندی لە لەندەن پڕکردووە.

پلانەکە خەریک بوو بە تەواوی لە دوای شڵەژانەکەی کۆمەڵگەی دەزگای زانیاری ئیسڕائیلییەوە بوو بەهۆی دەرهاویشتەی ئاشکراکردنەکانی واشنتن سەبارەت بە ڕینمایی چەکدانە ئێران بەرامبەر گۆڕینەوەیان بە بارمتەکراوەکان. چەکی ڕازاوە و بریقەداری بەرەنگاری ئیسڕائیل دژی تیرۆرزم لە سۆنگەی ئێرانگێتەوە زەبرێکی کوشندەی پێکەوت. مۆساد زۆر

لەوە تورە بوو کە حکومەتی ڕێگان وایکرد پەتی ئاشکرادکرنی گەمەکەی لەدەستدەربچێ و بەهۆیەوە ڕۆڵی ئیسرائیل لە ئێرانگیتدا دەربکەوێ.

ئاشکراکردنەکان کاری ئەوەندە گرانکرد تەنانەت پشتگیرییە هەرە کەمی خۆپارێزی وڵاتە دراوسێکانی وەک میسر و ئوردنیش وەک خۆی بهێڵێتەوە، لەو دەمەدا هەردو وڵاتەکە خەریک بوون لە PLO پڕدەبوون و سەریان لە گەمەکانی یاسر عەرەفات دەرنەدەچوو. سەرکردەی PLO تادەهات پابەندی توندڕەوەکانی خۆی دەبوو. هەرچەندە بەخۆی مارکسیست نەبوو، کەچی تادەهات زۆر جاران دروشمی مارکسیستیانەی دەگوتنەوە. هاواری ئەوەی دەکرد 'با بیرۆکە، سیاسەت، فەرهەنگ و لەشکری زایۆنیزم قڕبکرێ' .

ئەو ژاراویبوونە پێگەی خۆی لەنێو باڵە خۆویستەکانیPLO شدا باش نەکرد. لەچاو هەندێکیان عەرەفات ئەو پیاوە بوو کە ئیسرائیل ناچاریکرد سەر شۆڕبکا و لە بەیروت لەژێر چاوەدێری هێزە ئاشتی پارێزەکانی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بکشێتەوە. بەم جۆرە 15،000 فەلەستینی بە پاپۆڕ چوونە تونس. هەندێک لە ڕێکخراوەکەی عەرەفات دوای بەڵێنپێدانی سوریا بۆ کۆمەک، لێیهەڵگەڕانەوە. ئەوان درێژەیان بە ئاراستە سەربازییەکەی خۆیان دا لەسوریا، بەڵام نەک هەر دژی ئیسرائیل، بەڵکو دژی عەرەفات وPLO ش. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا عەرەفات هەر بەربەستی سەرەکی بەردەم ئاشتی بوو. لەناوبردنی هەمیشە هەر ئامانجێکی پێشنۆرە بوو. ( تەنانەت لە مەشق و ڕاهێنانی مۆسادیشدا بیچمی عەرەفات لەسەر دارەئامانجی تەقەلێکردن بوو ). تادوا هەناسەشی بە بەرپرسیار دەزانرێ بەرامبەر ئەوەی هەڵگەڕاوەکانی لە سوریادا لە کردەوەی دڕندانەدا ئەنجامیدەدەن.

لەپڕێکەوە دو ڕوداو وایانکرد سەرنجەکان – گەر بۆماوەیەکی کاتیش بێ – لەسەر عەرەفات لابدرێ و لە دوادوایدا ئەو پیلانە جێبەجێبکرێ کە ئەبو ڕۆڵی سەرەکی تیادا وازیکرد.

سوریا لەو کێشەیەدا چەقیبوو کە بەردەوام ڕوبەڕوی زێدە داوای تاقمە فەلەستینییەکانی ژێر باڵی خۆی دەبووەوە. وەک هاوشانێکی لەپێشی

تیرۆرزمی نێودەوڵەتی سوریا ئامادەبوو خەرجی ئۆپەراسیۆنەکانیان بکێشێ، بەڵام بەشێوەیەک زیان بە ئەندێشەی ئەو نەگەیەنێ. گەلێک لەو نەخشانەی کە باڵەکانی PLO لەگەڵ دەزگای نهێنی سوری تاوتوێیدەکردن بۆ سوریا زۆر سەرکێشانە بوون، بۆیە پەسەندی نەدەکردن. یەکێک لە نەخشەکان ژاراویکردنی ئاوی خواردنەوەی ئیسرائیل بوو. پلانێکی دڕندانەی دیکە ناردنی خۆکوژێک بوو بەخۆتەقاندنەوە لەژێر بەرگی جوێکی ئەرسەدۆکسی تا دیواری گرینۆک لە ئۆرشەلیم بڕوخێنێ. لە هەردو بارەکەدا تۆڵەی ئیسرائیل بەزەبرو جەرگبڕ دەبوو.

پلانەکان وا بوون تا یەکێکیان نەخشەیەکی بوێرانەی کێشا کە نەوەک هەر سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا وەک پۆلیسی نهێنیی سوریا داینا بوو، بەڵکو زەبرێکی کوشندەشی لە باڵادەستێتی هێزی سەربازی ئیسرائیل دەدا. هەنگاوی یەکەم کڕینی کەشتییەک بوو. دوای چەندان هەفتە لە گەڕان و پشکنین لە بەندەرەکانی زەریای ناوەڕاست، کەشتییەکی تۆمارکراو لە پاناما بەناوی ئاتاڤاریوس Atavarius کڕدرا و هێنرایە بەندەری ئەلجەزائیر.

دوای هەفتەیەک لە گەیشتنی کەشتیەکە دەستەیەکی بچوکی کۆماندۆی فەلەستینی بە فڕۆکەیەکی سەربازی سوری لە دیمەشقەوە گەیشت. ئەوان جبەخانەیەکی زۆر لە چەک و تەقەمەنییان بارکردبوو وەک: مەترالیۆز، ڕۆکێتی دژە تانک، باولی پڕ لە کلاشینکۆف کە تیرۆرستەکان حەزیان دەکرد بە شانیانەوە بکەن. هەمان شەو کۆماندۆکان و چەک و تەقەمەنییەکانیان لە ژێر باڵی تاریکییەوە لە کەشتیەکە بارکردن.

لە کازیوەی بەیانیدا کەشتییەکە دوای ئەوەی کاپتنەکە بە دەسەڵاتدارانی بەندەرەکەی گوت کەوا بەرەو یۆنان دەڕۆن بۆ ئەوەی ماشێنەکە نۆژەنبکەنەوە، کەوتە گەڕ. کۆماندۆکان لە ژێرەوە مانەوە، بەڵام ئامادەبوونیان هەر بەدزی نەمایەوە. یەکێ لە هەواڵدەرانی مۆساد لە بەندەرەکە گومانی لا پەیدا بوو، ئیدی کاتساى ئەلجەزائیری ئاگادارکردەوە. ئەویش کورتە ڕاپۆرتێکی بۆ تەلئەبیب نارد.

گەیشتنی ڕاپۆرتەکە بووە مایەی زەنگی 'قۆناخی زەرد' بۆ هەمو ڕایەڵی تەونی مۆساد لە دەوروبەری زەریای سپی ناوەڕاست. یادی هەوڵی سەرنەکەوتوان بۆ تەقاندنەوەی کەناری بەندەری ئیلات هێشتا هەر تازە بوو، ڕەنگبێ ئەوەشیان هەر تەقەلایەکی لەوجۆرە بێ بۆ بەندەری حەیفا. ئەو بەندەرە پڕ هاموشۆیەی سەر زەریای سپی ناوەڕاست ئارمانجێکی بەرچاوە. دوو بەلەمی تۆپلەسەری هێزی دەریایی ئیسرائیلی لە کەنارەکە دەهاتن و دەچوون، ئامادەبوون هەر هەوڵێکی ئاتاڤاریوس بۆ سنوربەزاندنی بەندەرەکە کە بەندەری هەرە گرنگ بوو بۆ بازرگانی دەوڵەتی ئیسرائیل پوچەڵبکەنەوە.

مەبەستی ئاتاڤاریۆس لێوارەکانی باکوری تەلئەبیب بوو. بە گوێرەی پلانەکە -کە لە فیلمکی ئەکشنی هۆلیۆد وەرگیرا بوو- دەبوایە کۆماندۆکان بە بەلەمی چوپدارەوە بەرەو کەنار سەوڵلێبدەن، لەوێشەوە بە تەقەکردن ڕێگای خۆیان بۆمەبەستەکەیان لە تەلئەبیب کە کریریا Kirya ی بەرەی پێشەوەی بارەگای سەرەکی هێزی بەرگری ئیسرائیل کە لەوێوە بورجەکانی Skyline ڕێنیشاندەری کۆماندۆکان دەبوون، بکەنەوە. پلانەکە هەموی بە توخمی لە پڕ بەسەرڕادان و ئازایەتییەکی بێبەزەییانە کە خودی ئیسرائیلییەکانی پێ دەناسرانەوە پابەند بوو.

ڕۆژی پەلامارە بوێرانەکە بە مەبەست بە ڕۆژی یادەوەری سەربەخۆیی ئیسرائیل دیارکرابوو. لە شارەکە کەرنەڤال ڕێکدەخراو بەهۆیەوە کیریا کەمتر لە ڕۆژانی ئاسایی ئێشکگری دەکرا. کۆماندۆکان چاوەڕوانی ئەوەنەبوون بە زیندویێتی لە ئۆپەراسیۆنەکە دەربچن، بەڵام ئەوان ئەوەیان بۆیە هەڵبژاردبوو کە هەمان نیگای خۆکوژیانەیان هەبوو بە بۆمبەکانیان کوشتن و تۆقاندنیان لە ئیسرائیل و بەیروت دەنایەوە.

لە ماوەی کورتە گەشتەکەیاندا کە بە تونسدا تێدەپەڕین و لە دورگەی سیسیلیSicilie بۆ پشودان لایاندەدا، هیچ کام لە تاقمی سەر کەشتی ئاتاڤاریوس سەرنجی گوماناوی لەسەر کەشتی ڕاکێشەری ماسیگری نەدا، کاتێک بە تەنیشتیان رەتبوو. کەشتییە ڕاکێشەرەکە ئامێرێکی ئەلەکترۆنی

هەستیاری تێدا بوو کە شەپۆلی پەیامەڕادیۆی هەناردەی وەردەگرتەوە. کورتە پەیامیک بە زمانی عەرەبی ئەوەی ڕاگەیاند کە کەشتییەکە لە کاتی خۆی دەگا. یەکێک لە دو پیاوەکەی تاقمی کەشتییە ڕاکیشەرەکە کە سایانم بوون، دەقی پەیامەکەیان ناردە تەلئەبیب. بیستوچوار سعاتی ئاینده ئاتاڤاریوس لە لایەن کەشتییەکانی مۆساد ئاگادارکرایەوە، هەروەها کاتێک ئاڤاتاریوس بە لێواری کریتا و قوبرسیشدا تێپەڕی هۆشداری درایێ.

بەلەمە ماتۆڕێکی تیژڕەویش بە تەنیشت کەشتییەکەدا گوزەریکرد. ئەویش ئامرازی پشکنین و کامیرایەکی بەهێزی هەڵگرتبوو. لەسەر بەلەمەکە دو ژن بەنیوە ڕوتی خۆیان لەبەر ڕۆژ هەڵخستبوو. ژنەکان دۆتمامی سایانمی خاوەنی بەلەمەماتۆڕەکە بوون، بۆ لەخشتەبردنی تاقمەکەی سەر کەشتی ئاڤاتاریوس وایاندەکرد. کاتێک بەلەمەکە بەلای کەشتییەکەدا تێپەڕی چەندین کۆماندۆی کەشتییەکە هاتنە سەر بانی کەشتییەکە و لەجەستەی نیوەڕوتی ژنەکانیان دەڕوانی. لە ژوری کاپتنی بەلەمەکەش سایانمەکە وێنەی دەموچاوی پێکەنیناوی کۆماندۆکانی دەگرت. دوای ئەوەی پشکی خۆیان لە ئۆپەراسیۆنەکەدا گوزەرکرد، بە تیژی گەڕایەوە قوبرس. لەماڵەوە فیلمەکانی شوشتنەوە و وێنەکانی بۆ تەلئەبیب ناردن. کۆمپیوتەری مۆساد سێ وێنەی لەوان ناسینەوە کە سێ تیرۆرستی عەرەبی ناسراو بوون. ئەوسا زەنگی هۆشداری قۆناخی زەرد کرایە سور.

شیمۆن پێرێزی سەرەک وەزیران فەرمانی هێرشکردنە سەر کەشتییەکەی دا. پلانی بۆمبارانکردنی کەشتییەکە هەڵسەنگێنراو بەلاوەنرا. هێرشیکی ئاسمانی بۆسەر کەشتییەکە بە چاوی میسرییەکان وادەخوێندرێتەوە کە دەستپێکی شەڕێکی چەکداریانەیە، هەرچەندە پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانیی ئیسرائیل لەگەڵ وڵاتە دراوسێکانی لەگەڵ چەند ڕوداوێکیشدا هەر ماوەتەوە، بەڵام لە قاهیرە هێشتا زۆر گومان لەسەر چالاکییەکانی ئیسرائیل هەبوون. شیمۆن پێرێس ئەوەی پەسەندکرد کە بە کەشتی پەلاماری ئاتاڤاریوس بدرێ.

شەش بەلەمی تۆپلەسەری ئیسرائیلیان پڕ لە سوتەمەنی کردن و ڕۆکێتیشیان لەسەر دانان. لەسەر بەلەمەکان یەکەیەکی تایبەتی هێزی ئیسرائیلی لەگەڵ ئەفسەرانی مۆساد هەبوون، چونکە دەیانویست کۆماندۆ فەلەستینییەکان بەزیندوێتی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن. بەلەمەکان لەبەیانییەکی زو لەحەیفاوە بەرەو ڕۆژئاوا لە قوڵایی دەریا سپی ناوەڕاست دەرچوون. ئەوان یەک بەدوای یەک ئاویان دەبڕی بەو هیوایەی ئەگەری دۆزینەوەیان لە لایەن ڕاداری کەشتی ئاڤاریوس کەمببێتەوە. ئیسرائیلییەکان کاتی پەلامارەکەیان وا دانابوو کە بەلەمە تۆپلەسەرەکان پشتیان بکەوێتە ڕۆژ.

لە سعات شەش و نیوی بەیانیدا ئاتاڤاریوس بەدیارکەوت. وەک لە کتێبەکانی فێربوون بەلەمەکان ڕاوەڕێویەکیان کرد ئەنجا شوێنی خۆیان وەرگرت و کەشتییەکەیان ڕۆکێتباران کرد. کۆماندۆکانی سەر کەشتییەکەش دەستیانکردەوە، بەڵام چەکی قورسیان هێشتا هەر لەنێو سندوقەکانیان لە بەشی خواروی کەشتییەکە دابوو، چەکی دەستیشیان بارتەقای چەکە قورسەکەی بەلەمەکانی نەدەکرد . لەماوەی خولەکێکدا ئاتاڤاریوس دوکەڵی لێهەڵسا و پیاوەکانیش کەشتییەکەیان بەجێهێشت. هەندێکیان لەکاتی خۆفڕێدانە نێو زەریا بەر گوللە دران و کوژران.

هەموی بەسەر یەکەوە بیست کەس لە تاقمی کەشتییەکە و کۆماندۆکان کۆژران. هەمو تەرمەکانیشیان ناشتن. هەشت لەوانەی دەرباز بوون گیران. پێش ئەوەی بەلەمەکان بگەڕێنەوە کەشتییەکەیان بە جۆرە ڕۆکێتێک کە سەرەکەی تەقینەوەی زێدەتری تێدا بوو، نقوم کرد. تەرمەکان بێ هیچ ڕیتوێلێک لە نەقەب نێژران. گیراوەکانیش بە نهێنی دادگاییکران و هەریەکەیان بۆماوەیەکی درێژ حوکمی زیندانی بۆ بڕایەوە. لە کاتی لێپرسینەوەدا ئەوان ناوی سوریایان وەک هێزێکی ڕاستەقینەی پشت کردەوەکە ناو دەبرد. لە جیاتی ئەوەی هێرشبکرێتە سەر ئەو دراوسێیە تورەیە، حکومەتی ئیسرائیل لەسەر ڕاوێژی مۆساد بۆنەکەی بەنهێنیی هێشتەوە. دەرونناسەکانی مۆساد

پێشبینی ئەوەیان کرد کە دیارنەمانی کەشتییەکە بەخۆی و پیاوەکانی سەری دەبێتە بابەتێکی ڕۆژەڤی چڕو پڕو ترس و تۆقان لە نێو باڵە فەلەستینییەکانی سوریا زێدەتردەکا. مۆساد هۆشداری دایە شیمۆن پیرێسی سەرەک وەزیران بەوەی گەر تیرۆرستان بە تەواوی بۆیان ڕونبووەوە کە ئۆپەراسیۆنەکەیان پوچەڵکراوەتەوە، ئەوا لە لایەن سوریە پارێزەرەکانیان زیاتر ڕێزیان دەگیرێ.

لەو نێوەدا فەلەستینییەکانی سوریا بەردەوامبوون لەسەر نەیارێتیان دەربارەی عەرەفات و دروشمیان بۆ ئەبو نیزال لێدەدا، چونکە دەستی بە شەڕێکی کوشندانە کردبوو لە دژی هاوڕێ جەنگاوەرە کۆنەکەی. ئەبو نیزال کە ناوورومەتی بۆ 'سەرکردەی گەورەی چاوەڕواننەکراو' لە بواری تیرۆردا دەگەڕایەوە، لەبەر چاوی عەرەفات بەهۆی جیاوازی ستراتیژ و تاکتیکدا کەوتبوو.

عەرەفات بە هێوریی هاتە سەر ئەو بڕوایە کە بزوتنەوەیەک جگە لەکاری تیرۆرستی هیچی دیکەی بۆ نەمێنێتەوە ئەوا لەماوەیەکی دوردا دەکەوێتە بەر نەفرەتی شکستی، بۆیە PLO پێویستی بە ئەجندایەکی سیاسیانە و باڵێکی دیپلۆماتیانە هەبوو. عەرەفات هەوڵیدا ئەو پرسەیان لەبەردەم جەماوەرەکەیدا بهێنێتە گۆ، هەروەها لە لایەن واشنتنیشەوە هاندرا، ڕێگا نوێکە بگرێتە بەر. ئاخافتەنەکانی عەرەفات لە ئیسرائیل بەهەوڵی لەخشتەبردن لێکدرانەوە؛ بەڵام بۆ ئەبو نیزال ئاخافتنەکان لە ناپاکیی بەدەر هیچی دیکە نەبوون، بۆیە ئەو بە ڕوتی، بێ لەبۆ یەکدانواندنی تیرۆرزمیانە مایەوە.

لەمێژ بوو ئەبو نیزال ئۆقرەی لەبەر بڕابوو چاوەڕیی دەرفەتێکی گونجاوی دەکرد. کاتێکیش هەواڵی تەقەلا نشستخواردووەکەی کەشتی ئاتاڤاریوسی پێگەیشت و زانی کە چۆن کەشتییەکە لەزەریا نقومکراوە، بڕیاڕیدا کە کاتی هاتووە بە بیر ئیسرائیلی بهێنیتەوە کە ئەو هێشتا ماوە. بە پەسەندنامەی تەواو لە لایەن سوریە پارێزەرەکانی دەزگای نهێنی سوریا، ئەبو نیزال بە دەرەنجامی دڕندانە دەستیکردەوە. لە فڕۆکەخانەی ڕۆما و ڤیەننا پیاوە

نیشانئەنگێوەکانی لە دیسامبەری 1985دا تەقەیان لە کەسانێکی بێوەی، گەشتیارە گومانلێنەکراوەکان کرد ،کە بۆ پشوی کێرمس چووبوون. لە چەند چرکەیەکدا نۆزدە گەشتیار لەنێویاندا پێنج ئامریکایی هەبوون، لە پرسگەی ئەلعالدا لە هەر دو فرۆکەخانە ناوبراوەکاندا پێکران و کوژران، بەڵام ئایا چۆن تیرۆریستەکان توانیان لە پۆلیسی ئیتالی دەرباز ببن و بگەنە قوربانییەکان؟ ئایا پیاوە ئاسایشپارێزەکانی ئەلعال لە کوێ بوون؟

کاتێک بە تورەیی لە بەرسڤی پرسەکان دەگەڕان، ستراتیژداڕێژەرانی مۆساد سەرنجیان لەسەر لایەکی دیکە بوو. هەرچەندە شانشینی یەکگرتو بە کۆدەنگی پەلامارەکەی شەرمەزارکرد، بەڵام وڵاتەکە تەواوی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی لەگەڵ سوریادا نەپچراند و پاراست، لەگەڵ ئەوەش کە مۆساد تەواوی بەڵگەکانی ڕۆڵی دیمەشق و پشتگیری سوریای وەک دەوڵەت دایە دەزگای MI5 ی بەریتانی. بەگوێرەی مارگرێت تاتچەر بەڵگەکان ئەوەیان نەدەهێنا ببردرێنە پەرلەمان و قسەیان لەسەر بکرێ. دەبوایە شتەکان بەڵگەی بەهێزتریان هەبوایە. لە ڕابردوێکی نزیکدا MI5 بەبیر مۆسادی هێنایەوە کە ئیسرائیل بەرژەوەندییەکانی خۆی قورس ڕاگرتون بەوەی لە کاتی پێویستیدا بازرگانی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بکا (ئیرانگێت). هەروەها ئیسرائیل بڕیاریدا کە زیاتر لە هەزار گیراوی فەلەستینی لەنێویشیاندا هەندێ لەوانەی بەکاری تیرۆرستی حوکمدراون، ئازاد بکا، ئەوەش مانگێک بەر لە تەقەکانی ڕۆما و ئیتاڵیا لە بەرامبەر گۆڕینەوەیان بەسێ سەربازی دیلکراو لە لوبناندا. هەنوکە مۆساد لەسەر ئەوە مکوڕبوو کە زەبرێکی وا بوەشێنی شانشینی یەکگرتو ناچاربکا پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی بپچڕێنێ و باڵوێزخانەیان لە لەندەن کە دەمێکە لە لایەن مۆسادەوە بەلانەی کردەی تیرۆرستی دژی ئیسرائیل لە ئاورووپا داناوە، دابخا. بۆ ئەو دژە هێرشەش ئەبو لەگەڵ ئامۆزاکەی نزار هینداوی پەلاپیتکەکە دەبزێون.

دوای نانخواردنی لەگەڵ تۆڤ لیڤی، ئەبو سەردانێکی هینداوی کرد و داوای لێبوردنی سەبارەت بە دەمەتەقێی پیشتر دەربارەی ئان ماری لێکرد. هەڵبەتە

ئەو یارمەتیاندەدا، بەڵام لەپێشدا دەیەوێ بەرسڤی یەک دو پرسی وەربگرێتەوە. ئایا ئەوان زارۆکەکەیان دەوێ؟ ئایا هەر لەسەر ئەوە سورن کە بە فەرمی ببنە هاوسەری یەکدی؟ ئایا نزار کیژەکەی خۆشدەوێ؟ ئەوان لە دوو فەرهەنگی جیاوە هاتوون، بۆیە بەدەگمەن وایە هاوسەریی نێوانیان سەر بگرێ.

هینداوی وەڵامیدایەوە گەر ئەو ئان ماری خۆشویستبێ، ئەوا پێینەزانیوە. کچەکە دەگریا و دەیویست بزانێ چی بەسەردا دێ. هینداویش هیچ هەستێکی نەبوو کچەکە بکاتە هاوسەری خۆی.

ئەبو دەهەزار دۆلاری کە زیاد لە پێویست بوو دایە هینداوی، ئەوەش بۆ ئەوە بوو ئان ماری پێبکڕێ و خۆشی زگورتی لە لەندەندا بمێنێتەوە. (پارەکەش لە لایەن مۆسادەوە دابینکرابوو) لەبەرامبەردا دەبوایە هینداوی شتێک بکا کە هەردولا بڕوایان پێی هەبوو: لەناوبردنی ئیسرائیل.

لە ئێوارەی 12ی ئەپریلی 1986دا لە گەڕەکیKilburn ی لەندەندا هینداوی بە دوای ئان ماریدا گەڕا. دەسکە گوڵێک و بوتڵە شامپانیایەکی کە لەو پارەی ئەبو دابویێ کڕیبوو، لەگەڵ خۆیدا برد. بە ئان ماری گوت گوایە خۆشیدەوێ و حەزی لێیە زارۆکەکەیان ببێ. هەواڵەکە ئان ماری خستە گریانم لە پڕێکەوە دنیا لەبەرچاوی ڕۆشنتربوو.

پاشان هینداوی پێیگوت تەنها دوا کۆسپ لەبەردەمیاندا ماوە بۆ تەختکردن، ئان ماری دەبێ پرس بە دایک و باوکی هینداوی بکا بۆ هاوسەرگیرییەکە، بۆیە پێویستە ئان ماری بچێتە شوێنی عەڕەبنشین لە ئیسرائیل کە بنەماڵەی هینداوی لێدەژین. ئەوەش نەریتێکی عەڕەبییە و هیچ کوڕێک لێیلانادا. ئەو وێنای جۆری ژیانی خۆیانی لەوێ وا بۆکرد، کە لەسەردەمی عیساوە تا ئێستا گۆڕانێکی وای بەخۆیەوە نەبینیوە. بۆ کچێک کە پەروەردەی دەستی نۆنەکان بێ و ڕۆژانەش ڕیتوێلی دینی بەشێکی گرنگی ژیانی بێ، سەلماندی کە لەگەڵ یارەکەیدا ببێت هاوسەر. پێیگوت کە خۆی و دایک و باوکی کریستیانی نین، نابێتە گرفت، ئەوان لە وڵاتی پیرۆزەوە هاتون کەواتە

لەبەرچاوی ئەو، کەسوکاری هینداوی کەسانێکی لەخواوە ئاشتەوایيان بۆ بڕاوەتەوە، بەڵام هێشتا ئان ماری هەندێ دودڵ بوو. ناتوانێ بەئاسانی دەستبەرداری ئیشەکەی بێ. ئایا چۆن خەرجی گەشتەکەی پەیدا دەکا؟ بێجگە لەوەش بۆ ئەو سەردانە گرنگە پێویستی بە جلی نوێ هەیە. هینداوی خەمی مشورخواردنەکەی خواردبوو دەستی بۆ گیرفانی برد سەفتەپارەیەکی دەرهێنا. پارەکەی دەرهێنا و گوتی بایی کڕینی زیاترلە کۆگایەک جل و بەرگ دەبێ. بە دەستێکی دیکەش جادوبازئاسا بلیتێکی فڕینی لەبەرکە دەرهێنا. دەبوایە لە17 ی ئەپریلدا بەفڕۆکەی ئەلعال بڕوا کە هێشتا پێنج شەوی ماوە. ئەو بلیتەکەی هەمان ئێوارە کڕیبوو.

ئان ماری بە خەندەوە پرسی: ئایا تۆ لەوە دڵنیا بووی کە من گەشتەکە دەکەم؟

هینداوی بەرسڤی دایەوە: بەقەد خۆشەویستییەکەی خۆم بۆ تۆ ئەرخاینبووم .

هینداوی بەڵینیپێدا لەگەڵ گەڕانەوەیدا دەیهێنێ. ئەو چەند ڕۆژانەی دوایی بۆ کیژە بەردەستەکە بە خۆشی چوونەسەر. وازی لە کارەکەی هێنا و لە باڵوێزخانەی ئێرلەندی لە لەندەن داوای پاسپۆرتی نوێی کرد. چووە بازاڕ و جلی نوێی سکپڕی کڕی. هەمو شەوێکیش لەگەڵ هینداویدا دەچووە سەر جێگا. هەمو بەیانیەکیش بەخۆشی بەرچاییان دەخوارد و بەیەکەوە نەخشەی دواڕۆژیان دادەڕشت. وایان دادەنا کە دەچنە ئیرلەندا و لەوێ لە خانوێکی سەر لێواری زەریا بژین. زارۆکەکە گەر کوڕ بوو ناوی Sean دەبێ و گەر کچیش بوو ناوی دەنێن Sinead .

لە ڕۆژی گوزەرکردنەکەی ئان ماریدا هینداوی پێیگوت کەوا قسەی کردەوە دەبێ ' دیاریەک بۆ باوکی، لای برادەرێکی کە کاری بەردەستی دەکا لەو دیوی فڕۆکەخانە داناوە.

دواتر ئاری بن مێناشە ڕایگەیاند کە تا دوا خاڵ ئاگای لە پیلانەکە بووە دەیگێرێتەوە ' بۆ ئەوەی هیندوای ئەو سەرچڵییە نەکا هەگبە قورسەکە بە ئان

ماری هەڵبگرێ، بە برادەرەکەی گوتبوو کە هەگبەکە لەوکاتە دەداتە دەستی ئان ماری کە بگاتە هۆڵی دەرچوونی تایبەت بە ئەلعال.

کیژەکە ئەوندە گەوج بوو هیچ پرسیاری سەبارەت بە دیارییەکە نەکرد، چونکە دەربڕینە خۆشەویستییەکە نابینای کردبوو. بە ڕاستی دینگەی تەواوی پیلانەکە بوو.

لەنێو تاکسیدا بۆ فڕۆکەخانە هینداوی نمایشێکی ڕەفتار ئەڤیندارانەی باوکانەی دەکرد. پێیگوت کە نابێ مەشقی هەناسەقوڵخواردنەوە لەکاتی فڕینەکەدا لە یاد بکا. دەبێ زۆر ئاو بخواتەوە و هەوڵبدا کورسی نێوەڕاست وەربگرێ تاکو لەژانگرتن بەدوربکەوێ، کە لەو دوادواییانەدا لەبەری دەناڵاند. ئان ماریش بە خەندەوە دەیگوت' ئای خوای من، وا هەستدەکەم کە بەرەو مانگ دەفڕم' .

ئەو لەبەردم دەرگای هۆڵی لێوەدەرچوون دودڵ بوو، ئارەزوی بوو کە هێشتا خواحافیزی لێنەکا، بەڵێنیپێدا بوو لە تەلئەبیبەوە زەنگی بۆلێبدا دایک و باوکی ئەویشی وەک خۆی خۆشدەوێ. هینداوی بۆ دواجار ماچیکرد و بە نەرمی بۆ ناو ڕیزەکە پاڵی نا کە بەرەو خاڵی گومرگ دەچوو.

هینداوی وەستا تا لەچاو ونبوو، دواتر بە گوێرەی ڕێنماییەکانی ئەبو سواری پاسێکی هێڵی ئاسمانی سوری بوو بەرەو لەندەن گەڕایەوە. لەو نێوەدا بێگومانلێکردن ئان ماری گەیشتە لای کۆنترۆلی ئاسایشپارێزی. دواتر گەیشتە ئەو شوێنە ئاسایشچڕەی هۆڵی دەرچوون کە بۆ سەرنشینانی فڕۆکەی ئەلعال تەرخانکرابوو. لە لایەن ئێشکگرانی شین بێت Shin Betەوە بە وردی پرسیاری لێکرا و هەگبەکانی پشکنران. بۆردینگ پاس و ژمارەی کورسی درایە و ئاماژەیان بۆکرد کە لە هۆڵی چاوەڕوانی کە هەر 335 سەرنشینی ئەلعالی لێکۆببونەوە چاوەڕوان بێ.

بە گوێرەی ئاری بن مێناشە ' دیارییەکەی باوکی هینداوی' لە دەست پیاوێک وەرگیرا کە سەرتاپای شین پۆشی خاوێنکەرەوەی فڕۆکەخانە بوو. ئەو وەک چۆن ئەفسوناوی پەیدابوو ئاواش لەبەر چاوان ونبوو. بن مێناشە ئاوای

لەبارەی نوسی: له ماوەی چەند چرکەیەکدا داوا له ئان ماری کرا بۆ پشکنین لەگەڵیاندا بچێ. دەستەی ئاسایشپارێزی ئەلعال له پرێکەوه له بنی بنەوەی هەگبەکه تەقەمەنی دۆزییەوه' .

تەقەمەنییەکه بریتی بوو له سێ کیسی نیو کیلۆیی ماددەی سێمتیکس Semtex. ئان ماری به هەنسکەوه به ئامادەبوونی ئەفسەرانی دەستەی تایبەتی MI5 هەمو شتێکی خۆی گێڕایەوه. ئەوەش چیرۆکی ژنێکی بەدبەخت بوو که نەوەک هەر خۆشەویستییەکەی لەدەستدا، بەڵکو له لایەن یارەکەیەوه ناپاکیی لێکرا. دەسته تایبەتییەکەی MI5 به دوای پەیوەندییەکانی هینداوی لەگەڵ سوریەکاندا چوون و بۆیان دەرکەوت که ئان ماری قوربانییەکی بێ تاوانه.

کاتێ پاسەکه گەیشته لەندەن، هینداوی فەرمانی پێدا بەرەو لای باڵوێزخانەی سوریدا بیشکێنێتەوه. کاتێ شوفێرەکه ڕەتیکردەوه هینداوی پێیراگەیاند که دەستەڵاتی ئەوەی هەیه بچێته ئەوێ. له باڵوێزخانەکه داوای له کارمەندی کونسول بۆ مافی پەنابەری سیاسی کرد. پێیگوتن کەوا پۆلیسی بەریتانی به دوایدا دەگەڕێ، چونکه ' لەپێناو کارێکی باشدا' هەوڵی تەقاندنەوەی فڕۆکەی ئەلعالی داوه. کارمەنده سەرسام و پەشۆکاوەکان هینداویان لەژێر چاوەدێری دو کەسدا دانا. دوای ئەوەی قسەیان لێوەرگرت پێیانگوت له باڵەخانەیەکی کارمەندانی باڵوێزخانەکه چاوەڕێبکا. ڕەنگبێ ئەوەیان به مێشکدا هاتبێ که ئەمه تەڵەیەکه و دەیانەوێ ناوی سوریای پێ لەکەداربکەن. دواتر ترسەکه زیاتر بوو که بۆیان دەرکەوت هینداوی باڵەخانەکەی جێهێشتووه.

ئەو بەدوای ئەبودا دەگەڕا. کاتێ ئەبوی نەدۆزیەوه، چووه Visitor`s Hotel لەگەڕەکی Notting Hill ی لەندەنی، کەمێک دوای ئەوه، گیرا.

بی بی سی هەواڵەکەی به شیوەیەک بڵاوکردەوه که پۆلیس پیلانەکەی پوچەڵکردۆتەوه. وردەکاری ڕوداوەکه زۆر دەقاودەق بوو: ماددەی

سیمتێكس لە چیكسلۆڤاكیاوە خراوەتە بنەوەی هەگبەی ئان ماری. چەشنی بۆمبەكە وا دانرابوو كە لە بەرزایی 32،000پێ (11،9 كیلۆمەتر) بتەقێتەوە.

بە گوێرەی بن مێناشە ئۆپەراسیۆنەكە بە خێرایی ئامانجە ئاسودەییەكانی لێدەركەوتن. ' مارگرێت تاتچەر باڵویزخانەی سوریای داخست. هینداوی چل و پێنج ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە. ئان ماری ناردرایەوە ماڵەوە و تا كچەكەی چاوی بە دنیا هەڵبینێ'. ئەبوش گەڕایەوە ئیسرائیل و ڕۆڵەكەی تەواوبوو.

دوای دادگاییەكەی هینداوی، ڕۆبەرت ماكسوێل ئاگری پشت ڕۆژنامەی Daily Mirror نوسی ' بیژمۆتەكە ئەوەی وەرگرت كە شایانیەتی!'. سەروتارێك لە ڕۆژی داخستنی باڵویزخانەكە نوسرابوو ' باڵوێز با بەرەو مەرگ بڕوا'. ناونیشانێكی دیكە ئەوە بوو: ' دەبڕۆن سورییە بەرازەكان'. ئاری بن مێناشە لەیەكەمەكان بوو كە گوتی مۆساد ' زەبرێكی وا وەستایانەی وەشاند سوریای بەرەو سیاسەتی دڕندانە ڕاونا' .

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەندێ پرس ڕوبەڕوی سەركەوتنەكە دەبنەوە. ئایا ئان‌ماری بۆمبە قورسەكەی بەدەست هەڵگرتبوو یان ئەوەش بەشێكی گەمەی لەخشتە بردن بوو؟ ئایا ئەو پیاوە شین پۆشەی 'برادەری' هینداوی ئەفسەرێكی ئاسایشپارێز نەبووە؟ ئایا تاچەند پێشكات MI5 لە كردەكە ئاگادار بووە؟ ئایا ئەوە بڕوا دەكرێ كە چ مۆساد یان پۆلیسی نهێنیی بەریتانی لێبگەڕێن ئەو بڕە ماددەی سیمتێكس ببرێتە ناو فڕۆكە كە بڕێكی كەمی ماددەكە بەس بوو بۆ تەقینەوە لەسەر زەوی؟ ئەو جۆرە تەقینەوەش بێگومان بەشێكی گەورەی فڕۆكەخانەكە وێراندەكا لە كاتێكدا كە بەهەزاران كەس لەو نێوەدا بوون. لە ڕاستیدا ڕەنگبێ بۆ مۆساد ڕونبێ كەوا دیپلۆسییەتی سوری هەڵبوەشێنێتەوە بێ ئەوەی هیچ سەرچڵییەكیشی بۆ ئەلعال و فڕۆكەخانەی هیسرۆ تێدا بێ، بەوەی بۆیەیەكیان لەجیاتی ماددەی سیمتێكس دانابێ؟ بۆ وەڵامی هەمو پرسێكی لەو جۆرە، شیمۆن پێرێزی سەرەك وەزیران هێشتا یەک گوتەی هەبوو:' ئەوەی ڕویدا بۆ ئەو كەسانەی كە دەیزانن ناسراوە، بۆ ئەوانەش كە نایزانن با هەر ئاوا بمێنێتەوە' .

لە گرتوخانە پاسەوانچڕەکەی Whitmoor لە ئینگلستاندا، هینداوی نارەزایەتییەکەی بەوە دەردەبڕی کە بۆتە قوربانی لە خشتەبردنێکی کلاسیکیانەی دەستی مۆساد. هەنوکە پرچی سپی بووە. ئەو چیدی وەک پیاوە ڕەشیقەکە نەماوە، پێیوابوو هەر لە زینداندا دەمرێ. ناوی ئانماریش هەر بە 'ئەو ژنە' دەبا. ئەویش لە 1998 ەوە لە دبلن دەژی و لەوێ کیژۆڵەکەی بەخێو دەکا، نایەوێ هیچ لەبارەی کۆنە یارەکەی بزانێ. هەرگیزیش دەربارەی هینداوی نادوێ.

هێشتا مەتەڵێکی پەڕاوێزی چیرۆکەکە ماوە. دو هەفتە دوای حوکمدانی هینداوی بە زیندان کە دەبێ تا سەدەی بیست و یەکەمیش لە زینداندا بمێنێتەوە، ئارنۆد بۆرگیڤ Arnaud Borchgrave سەرنوسەری ڕێزلێگیراوی The Washington Post ئامێری تۆمارکەرەکەی لەسەر مێزی ژاک شیراکی سەرەک وەزیرانی فەڕەنسیدا دانا. بۆرگێڤ کە لە ئاورووپا بوو تا سەروبەری کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتە ئاورووپاییەکان بکا. هەر بۆیە دیدارێکی لەگەڵ شیراکدا سازدا تا هەڵوێستی فەڕەنسا لەو بارەیەوە بزانێ. دیدارەکە لەبەر بابەتەکان لە دەستدەرچوو، شیراک ڕونیکردەوە کە فەڕەنسا و ئاڵمان کەم تا زۆر ناچارکران لایەنگیری حکومەتی بەریتانیا بکەن کە تادەهات بەربەست بوو بەرامبەر سیاسەتی هاوبەشی ئاورووپایی. ئەوسا بۆرگێڤ بۆسەر بابەتی دیکەی پەیوەندی فەڕەنسا لەگەڵ وڵاتاندا ڕۆیشت. ناوبراو دەیەویست بزانێ ئاخۆ دانوستانەکانی شیراک و سوریا چ قۆناخێکیان بڕیوە سەبارەت بە دوا کاری تیرۆرستی لە پاریس و هەوڵی فەڕەنسا بۆ بەردانی هەشت بارمتەکەی لای حزبوڵڵای لوبنانی. سەرەک وەزیرانی فەڕەنسی کەمێک بێدەنگ بوو دوایئەوەی سەیری نوسینگەکەی کرد و وەک ئەوەی ئاگای لە ئامێرە بچوکە تۆمارکەرەکە نەبێ گوتی' کە هیلمۆت کۆلی ڕاوێژکاری ئاڵمان و هانس گینشەرHans-Dietrich Genscher ی وەزیری کاروباری دەرەوە دڵنیایان کردۆتەوە کەوا حکومەتی سوریا لە پیلانی هینداوی بۆ تەقاندنەوەی

فرۆکەی ئەلعالی ئیسرائیلیدا هیچ پشکی نەبووە، ئەوەیان پیلانێک بووە و لە لایەن مۆساد و دەزگای نهێنی ئیسرائیلیەوە ئامادەکراوە' .

لە دەرهاویشتەی ئەو گوتەیە زریانێکی دیپلۆماتیانە هەڵیکرد خەریک بوو کارنامە سیاسییەکەی شیراکیش هەڵلوشێ. شیراک لە ماڵی خۆی لە لایەن سەرۆکەکەی فرانسۆ میتەران Frncois Mitterrandهێرشیکرایەسەر. لە لایەکی دیکەشەوە دەبوایە وەڵامی تەلەفۆنە تورەییەکەی هێلمۆت کۆلیش بداتەوە کە داوای لێدەکرد قسەکەی خۆی بکێشێتەوە. شیراک ئەوەی کرد کە سیاسەتمەداران زۆرجاران دەیکەن: ڕایگەیاند کە وتەکانی ناڕاست لێکدراونەتەوە. لە لەندەن سەرلەبەری دۆزەکە لە لایەن دادگاوە تاوتوێکراوە بۆیە پێویستی بە کۆمێنتار نەدەکرد. لە 1997یشدا نوسینگەی سەرۆک ژاک شیراک بڵاویکردەوە کەوا سەرۆک دیدارەکەی لەگەڵ Washngton Post بەبیرنایەتەوە.

هەر زو کردەیەکی دیکەی کورتهێنەری دیکە ناو و ڕومەتی مۆسادی زڕاند.

# 15

## ئەو کاریکاتۆریستەی دەکرێ ونبکرێ

{کارنامەی ناحوم ئادمۆنی بەڕێوبەری مۆساد.. پاسپۆرتەکانی نێو کابینەی تەلەفون.. شەقامەکانی بۆن.. کارلۆس‌و پاریس.. عەرەفات‌و مارگرێت تاتچەر.. ئیسماعیل چۆن بووە سیخوڕ.. ئیسماعیل ومستەفاو یادەوەرییەکانی بەیروت.. ئۆپەراسیۆنی بەلەمەکان.. یەکەی کۆماندۆی لەشکری 17.. ناجی العلي دەپێکرێ..ئیسماعیل‌و سەرشۆڕی.. }

کۆتایی کارنامەی ناحوم ئادمونی وەک بەڕێوبەری گشتیی مۆساد لە دوای نیوەڕۆیەکی تەمموزی 1986 وەک دەرەنجامی ڕوداوەکەی شەقامێکی بۆن Bonnکە دوای جەنگی دوهەمی جیهانی لە هەمو ئاڵمانی ڕۆژئاوا دروستکراون، دەگەڕێتەوە. دوای چل ساڵ شەقامەکە پانوپۆڕکراوە و لە هەردو دیوەکەی دارڕێژکراوە و پڕ خانو و ئاوەدانییە. سیستمی ئاسایشپارێزی لە پشت دیواری کۆنکرێتی شورەکان و دەلاقەکانی نهۆمی سەر زەوی شاردرابوونەوە، بە شێیوەیەک لە دار و شوشەکان گیرابوون کە دەیڕازاندەوە.

کەسێک ئەو پیاوەی کە لە کۆتایی شەقامەکە لە نێو چاوەخانەی(کابینە) تەلەفۆنی سەر جادەکە هەگبەیەکی بازاڕئاسای لە دوای خۆی بەجێبێڵێ، بەدی نەکرد. ئۆتۆمبێلێکی پۆلیسی گەڕۆک بەوێدا تێدەپەڕێ و هەگبەکە دەبینێ و دەیپشکنێ. هەگبەکە هەشت پاسپۆرتی نوێی بەریتانیایی تێدابوو. یەکەمین کاردانەوەی نوسینگەی پۆلیسی تاوان Bundeskriminal Amt(BKA) ئەوە بوو کە پاسپۆرتەکان هی دەستە و تاقمە تیرۆریستەکان بوون، کە شەقامەکانی ئاوروپای پێدەگەڕان و کردەی تیرۆریستی و دڕندانەیان پێ ئەنجامدەدا.

ئەوان نوێنەرایەتی بەرژەوەندی گروپەکان و کەمینەکانی هەمو دنیایان دەکرد، پێشیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە ڕۆڵیان بۆ دیاریکردنی سیاسەتی نێودەوڵەتی وازیبکەن. ئەوان پشتگیریان لە خوێندکارە ڕادیکالەکان وەردەگرت، کە لە هەمو ئاوڕوپادا لە سیاسەتکردندا کارابوون. لە 1968ەوە کە لەیلا خالیدی کچە شۆڕشگێڕی فەلەستینی فڕۆکەیەکی بۆ لەندەن فڕاند، هەر زوش بەردرا، چونکە ئینگلیزەکان لە کردەی تەقاندنەوەی دیکە دەترسان، لەهەر لایەک وای لە خویندکارە ساویلکەکان کرد، کە دروشمەکانی PLO بڵێنەوە. ئەو لاوە ڕادیکالە پۆشتە و پەرداخانە وێنەیەکی ڕۆمانتیکیان بۆ POL کێشابوو، بەوەی جەنگاوەری 'ئازادیخوازن' نەوەک ئەوانەن ماددەی سڕکەر لەنێو خەڵکدا بڵاودەکەنەوە لەجیاتی ڕێکخستنی خۆپیشاندان خەڵک بەبارمتە دەگرن.

BKA لەو باوەڕەدابوو کە پاسپۆرتەکان لە لایەن خوێندکارێک کە تەتەری تاقمە تیرۆرستەکان بووە، بەجێماوە. لیستی ئەو تاقمانەش درێژ و تۆقێنەرانە بوو، هەر لە IRA، لەشکری سوری ئاڵمان خۆی Rote Armee Faktion Duitslandتا تاقمەکانی وەک بەرەی نیشتمانی ئیسلامی لە سودان INFS و سوپای ڕزگاری نیشتمانیی کۆلۆمبیا ELN و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی ئانگۆلی MDRA و پڵنگەکانی تامیلLTTE ی دەگرتەوە. هەمو ئەو تاقمە تیرۆرستیانە شانە و خەڵکیان لە ئاڵماندا هەبوون. هەموشیان دەکرا نەخشەیان هەبێ پاسپۆرتە نوێکان بۆ لێدانی بنکەی سەربازیی بەریتانیا لە ئاڵمانی ڕۆژئاوا بەکاربهێنن یان پێیبپەڕنەوە ئەوبەری زێ و لە ئینگلستان کوشتارگە بنێنەوە.

هەرچەندە ئینگلستان گەورەترین هێزی ئیمپریالیزمی ئاوڕوپای ڕۆژئاوا بوو، بەڵام تا ئێستا بە درێژی تەنها هەر لەگەڵ تیرۆرزمی IRA ڕووبەڕوبۆتەوە. دەزگای زانیاریی بەریتانی هۆشداری ئەوەی دا کە تەنها پرسی کاتە، تا تاقمە تیرۆریستەکانی دەرەوە لە لەندەن دەرفەتی ئەوە وەردەگرن لە دژی ڕژێمی وڵاتەکەی خۆیان بجوڵێنەوە و شانشینی

یەکگرتووشی پێ ئالودە بکەن. وەک نمونەیەکی پێش قەرەوڵیش دەستەیەکی دژی ڕژێمی نوێی تاران باڵویزخانەی ئێرانیان لە 1980 لە لەندەندا گرت. کاتێکیش دانوستانەکان بەهیچ دەرەنجامێک نەگەیشتن، حکومەتی تاتچەر SASی بۆ ناردن و لە ئەنجامدا سەرجەم تیرۆرستەکان کوژران. ئەو کردەیە تیشکی ڕاگەیاندنی زۆری کەوتە سەر، لە پڕێکەوە بووە مایەی کەمبوونەوەی ئەو پیلانانەی لە لەندەن سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگێڕدران. لەبریتی ئەوە پاریس بووە گۆڕەپانی نوێی بەیەکدادانی توندوتیژیانەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکان، بە تایبەتیشPLO ی یاسر عەرەفات و ڕێکخراوە مەرگچێنەکەی ئەبو نیزال. مۆسادیش بە خەستی دەستی لە کوشتنی دوژمنە عەرەبەکانی لەسەر شەقامەکانی پایەتەختی فەرەنسادا هەبوو.

پۆلیسی ئاڵمان (Bundeskriminal Amt(BKA لەو بڕوایەدا بوو کە پاسپۆرتەکانی کابینە(چاوەخانە)ی تەلەفۆنەکەی سەر جادە ئاماژەی خوێنڕێژییەکی نوێن. نوسینگەکەی پۆلیس زەنگی بۆ (Bundesnachrichtendienst(BND دەزگای ئاسایشپارێزی ناوەوەی وڵات لێدا، ئەوانیش ئەفسەری پەیوەندیMI6 یان لە بارەگای سەرەکی لە (Pullach(Beierenئاگادارکردەوە. لە لەندەن MI6 سەلماندی کە پاسپۆرتەکان زۆر لێزانانە ساختەکراون. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە IRA و تاقمە تیرۆرستەکانی دیکە لە دەرەوەی بازنەی تێوەگلان پاسپۆرتە ساختەکاندا بن. هیچیان ئەو کارامەییان نەبوو کە پاسپۆرتەکان بەو شێوەیە دروستبکەن. ئاراستەی تۆمەتبارکردنەکە ڕوەو KGB ڕۆیشت، چونکە ساختەکارانی شۆرەوی لە باشترین ساختەکارانی جیهان دەناسران. ئەوەش ئاشکرابوو کە شۆرەوی کۆگایەکی پڕ لە پاسپۆرتی ساختەی هەیە، بەڵام پاسپۆرت بەجێهێشتن و بەکارهێنانی چاوەیەکی تەلەفۆنی لەجیاتی پۆست، شێوازی ئەوان نەبوو. هەروەها دەستی دەزگای نهێنیی باشوری ئافریقاشی BOSSتێدا نەبوو، چونکە تاڕادەیەک دەستیان لە کردەوەکانیان لە ئاوروپا

هەڵگرتبوو، پاسپۆرتە ساختەکانیش بە دەگمەن لە وڵاتە دواکەوتووەکان کە BOSSی تێدا کارابوو، بەکاردەهات. MI6 سێرەی نیشانەی گومانی خستە سەر تاکە دەزگای زانیارییەک کە بەسەلمێنراویش ئەو جۆرە پاسپۆرتانەی پێدەویستن، ئەویش مۆساد بوو.

ئاری ڕێگێڤ Arie Regev کاتسای لە لەندەن ژیاو کە پاشکۆی باڵوێزخانەی ئیسرائیل بوو، بانگکراو دیدارێکی لەگەڵ گەورە ئەفسەرێکی MI6بۆ لێدوان لەسەر بابەتی پاسپۆرتەکان سازدا. ڕێگێڤ گوتی ئێمە هیچ لەو بابەتە نازانین، بەڵام بەڵێندەدەم تەلئەبیب لەو پرسە ئاگاداربکەمەوە. کاردانەوەی خێرای ناحوم ئادمونی ئەوە بوو کە پاسپۆرتەکان هیچ پەیوەندییان بە مۆسادەوە نییە. ئەو وای نیشاندا بەڵکو ئیشەکە هی ئاڵمانی ڕۆژهەڵات بێ. مۆساد کەمێک پێشتر ئاشکرایکردبوو کە Stasi دەزگای ئاسایشپارێزی ئاڵمانی ڕۆژهەڵات Staatssicheheitsdienst بێباکانە پاسپۆرتی ساختەی بە دراوی گرانبەها بە جولەکە کۆچکردووەکان بەرەو ئیسرائیل دەفرۆشت. ئادمۆنی ئەوەی باش دەزانی کە پاسپۆرتەکان دەستکردی ڕۆژانەی مۆساد بوون و مەبەستیش لێیان ئەوەبوو کاتساکان بەکاریبهێنن و ئاوڕوپای بۆ کاری تایبەتمەندیانەیان پێتەیبکەن. بەو جۆرە پاسپۆرتانە بە ئاسانی بۆ شانشینی یەکگرتوو دەهاتن و دەچوون.

لەگەڵ ئەو 'بەڵێنەی' بە MI6 دراو ئەو ڕێکەوتنەی ڕافی ئیتان کاتی خۆی لەگەڵی بەستبوون کە مۆساد لەهەمو ئۆپەراسیۆنەکانیدا لەسەر خاکی شانشینی یەکگرتودا MI6 ئاگاداربکاتەوە، کەچی مۆساد هەمیشە بە نهێنیی ئاژانسێکی کارا بوو، بەو هیوایەی سەرکەوتنی دوسەرە بەدەستبهێنێ: لەناوبردنی سەرکردەی هێزی گوڵبژێری(PLO (force17 و کۆتایهێنان بە هەوڵە سەرکەوتووەکانی یاسر عەرەفات بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ حکومەتی مارگرێت تاتچەردا.

لە لەندەن چیدیکە ناوی عەرەفات هاوواتای تیرۆریزم نەبوو. خانم تاتچەر بەرەبەرە هاتە سەر ئەو بڕوایە کە دەکرێ یارمەتی چەسپاندنی ڕەوایەتی و

ئاشتییەکی سەقامگیر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بدا، کە نەوەک هەر مافە ڕەواکانی گەلی فەلەستینی مسۆگەربکا، بەڵکو ئاسایشیش بۆ ئیسرائیل دابینبکا. سەرکردە جووەکان هەڵویستی گوماناویان وەرگرت. ئەوان ئەوەیان دەربڕی کە PLO تائێستا هەر کردەی تیرۆریستی ئەنجامداون و ڕێکخراوەکەیان گەفی ئەوە دەکا تا بەدیهێنانی تەواوی ئامانجەکانی لە سەرکردە تیرۆرستییەکان وازناهێنێ. یەکەم جاری نەبوو لەندەن بکەوێتە ژێر کاریگەری دژە ڕەوتی تەلئەبیب. مۆساد هەر لەسەر ئەو باوەڕەدا بوو کە شانشینی یەکگرتو هەرچەندە کۆتایش بە ڕوداوەکەی داگیرکردنی باڵویزخانەی ئێران هاتووە، هێشتا هەر ئامادەیە پشتی دۆزی فەلەستینییەکان بگرێ. هەروەها مۆساد خەمی ئەوەشی دەخوارد کە چۆن PLO لە CIA نزیک دەبێتەوە.

ڕۆژی پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و PLO دواتر لە لایەن وەزیری ئەوکاتی کاروباری دەرەوەی ئامریکا هنری کیسنجەر ئاشکرادەکرێ. کیسنجەر لە یاداشتەکانیدا years of Upheaval ( ساڵە پەشێوەکان )دا باسیکردووە، شەش هەفتە دوای بزوتنەوەی سێپتێمبەری ڕەش لە سودان تەقەیان لە باڵویزی ئامریکا کرد و کوشتیان، لە 3ی نۆڤێمبەری 1973دا چاوپێکەوتنە نهێنییەکانی نێوان ڤێرنۆن والتەرس Vernon Walters یاریدەدەری بەڕێوبەری CIA و یاسر عەرەفات دەستیانپێکرد. دەرهاوێشتەکەشی نەکردنی کردەی 'توندوتیژی 'نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان وPLO ی لێکەوتەوە. دواتر کیسنجەر نوسی: ' کردە تیرۆرستییەکانی PLOی سەر بە عەرەفات دژی ئامریکییەکان هەرهیچ نەبێ کەم بوونەوە' .

کاتێک گەورەی مۆساد ئیسحاق هۆفی Yitzhak Hofi گوێی لەو 'ڕێکەوتنی ئاشتیانە ' بوو، بە توڕەییەوە گوتی تائیستا لە مێژوی دووڕویدا نمونەکی خراپتر لەوە نەهاتۆتە پێش. لە ڕێی پەیوەندییەکانی نێوانCIA دا هەوڵیدا هۆفی والتەرس لە ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ عەرەفاتدا پاشگەزبکاتەوە، بەڵام

یاریدەردەری بەڕێوبەری CIA پێیراگەیاند کە ئەوە ناکرێ، هەروەها هۆفی هۆشداریدا، کە نابێ هەواڵی' نادۆستانە' سەبارەت بەو رێکەوتننامەیە بڵاو بکەنەوە. ئەوەش زەبرێک بوو لە هۆبەی جەنگی دەرونی مۆساد درا کە نەیاندەوێرا ڕۆژنامەنوسە دۆستەکانیان لە هەواڵە نهێنییەکەدا ئاگاداربکەنەوە.

ڕادەی توڕەیی هۆفی ئەو کاتە زێدەتر بوو کە بۆی دەرکەوت عەرەفات چاودێری جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ CIA بە عەلی حەسەن سەلامەی سورە ئەمیر، سەرکردەی بزوتنەوەی سێپتێمبەری ڕەش سپاردووە، کە کوشتارگەی یاریزانە ئۆلۆمپیەکانی موونشنی نایەوەو لە پشت کوشتنی باڵوێزی ئامریکاش بوو . عەلی سەلامە چۆن ژیانی لەگەڵ تەقینەوەدا بوو ئاواش بە تەقینەوەیەک کە بەدەستی ڕافی ئیتان ڕێکخرابوو، گیانی لەدەستدا، بەڵام هێشتا چەند ساڵێکی مابوو تەقاندنەوەی ئیتان لەناوی ببا. لە 1973دا سەلامە بیچمێکی زۆر ڕێزلێگیراوی نێو PLO بوو، عەرەفاتیش لەوە دوودڵ نەبوو بیکاتە پردی پەیوەندی نێوان خۆی و CIA . ئەوەی لای مۆساد نامۆ بوو ئەوبوو کە CIA سورە ئەمیری دوای ساڵێک لە خوێنرێژییەکەی مونشن و کەمێکیش پاش کوشتنی باڵوێزەکەیان لە خەرتوم لە ئامێزگرت.

ئیدی هەرز و سەلامە بە بەردەوامی میوانی CIAی لە بارەگای سەرەکی لە Langely دەبوو. بە پێی ڕێسا سەلامەی سورە ئەمیر بە یاوەری ڤیرنۆن والتەرس لەسەر زەوی مەڕمەر بەلای پاسەوانەکان تێدەپەڕێ و بە ئەسانسۆرەکە دەبردرایە نهۆمی حەفتەم، نوسینگە بەرینەکەی والتەرس. والتەرس هەمو شتێکی بۆ سەلامە بە خۆڕایی دەکرد: لە Langley ناخواردنی بەخۆڕایی دیاردەیەکی نامۆ بوو.

باس و خواسی نێوان سەلامە و والتەرس هەمیشە بە شاراوەیی مایەوە. ویلیەم بوکلی William buckly کە پاشان لە لوبنان بەدەستی تیرۆرستان کوژرا، سەرۆکی بنکەیCIA ی ئەوێ بوو، گوتی ' سەلامە ڕۆڵێکی بایەخداری لەسەرو دڵی سەرانی ئامریکایدا بۆ خۆشویستنیPLO دا گێڕا.

ئەو پیاوێکی کاریزمایی بوو. کابرایەکی متمانەبەخش بوو دەیزانی کەی بدوێ و کەیش گوێ بگرێ. لە بواری زانیاریشدا کەسێکی پلە یەکی هەواڵدەر بوو' .
بەری ڕەنجی پەیوەندییە دوقۆڵییەکان لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا سەریهەڵدا، کاتێ سەلامە ئامریکای لە هەوڵی ئێران بۆ خستنەخوارەوەی فڕۆکەی هینری کیسنجەر کە یەکەم گەشتی دیپلۆماسیانەی وەزیر بوو بۆ لوبنان، ئاگاداركردەوە. پاشان سەلامە بووە پێناو تا ئەو 263 ڕۆژئاواییەی لە بەیروتی ڕۆژئاوا بەدەستی گەرمە شەڕی ناوەخۆی لوبنان گیریان خواردبوو، بگەیەنێتە شوێنیکی ئارام. دوای ئەوەش بە ماوەیەکی کورت سورە ئەمیر، CIA ی لە نەخشەی کوشتنی باڵوێزیان لە لوبنان هۆشدارکردەوە. لە چاوپێکەوتنێکی دیکەیدا لەگەڵCIA دا سەلامەی سورە ئەمیر ئەوەی واژۆکرد' هەمو دیپلۆماتە ئامریکاییەکان لە لوبنان' لە بازنەی کردە کوشتنەکانی بخاتە دەرەوە. لە بەیروت ئەوە تێبینی کرا کە ' ئارامە و لە ژێر یەک هەنواندا لەگەڵ ئامریکاییەکاندا هەڵدەکەن، چونکە ئاسایشپارێزانی PLOلێنەدەگەڕان پێچەوانەکەی بقەومێ' .
ئیسحاق هۆفی داوای لە CIAی کرد تەواوی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەلامەی ئەمیرە سۆر بپچڕن. 'داوایەکە' پشتگوێخرا. لە بارەگای سەرەکی CIAدا ناوی' ئەو پیاوە خراپەی بۆ ئێمە باشی' لێنرا. بە گشتی ئەو چالاک و هەواڵدەرێکی گرنگ و کارابوو، CIAی بەوردی لە پێشهاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئاگاداردەکردەوە. کاتێکیش سەلامەی سورە ئەمیر کوژرا، CIA تورە بوو پەیوەندیەکانی تاماوەیەکی درێژ لەگەڵ مۆساددا ساردکردن.
باڵوێزی ئامریکا لە لوبنان هێرمان ئێلیتز Hermann Eilts دەربارەی کوشتنی سەلامە گوتی: ' ئەز دەزانم ئەو بە شێوازی خاکیانەی خۆی یارمەتیدەرمان بووە و ئاسایشی کارمەند و هاوولاتییە ئامریکاییەکانی مسۆگەر دەکرد. من کوشتنەکەی ئەو بەکەس لەدەستدان دەزانم' .
هەنوکە - شەش ساڵ دواتر PLO - لەوکاتەی فەرماندەی نوێی یەکەی کۆماندۆی هێزی17 بەردەوامە لە ئیسرائیلی کوشتن، بە چڕی خەریکی

کێشکردنی حکومەتەکەی تاتچەرن بۆخۆیان. ناحوم ئادمۆنی بریاریداوە ئەوەی ئەوانەی پێشخۆی نوشوستیان تێداهێناوە تەواویان بکا. ئەو دەبێ پەیوەندی نێوان حکومەتی تاتچەر و PLO تێکبدا و فەرماندەی لەشکری17شیان لەناوبەرێ. سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکەش بەندە بە گەنجێکی عەرەبی فەلەستینی کە زۆر جار لە مزگەوتی گوندەکەیان لەخوا دەپاڕایەوە هێزی بداتێ تا بۆی بکرێ جووەکان بکوژێ .

توانستی ئیسماعیل سۆوان(صوان) Ismail Sowan دەساڵ پێشتر بەدەرکەوتبوو. لە 1977دا کاتێ ئیسماعیل مێرمنداڵیک بوو لە گوندێکی کەرتی ڕۆژئاوا دەژیا، ئەوکات ئەفسەرێکی ئامان دەزگای هەواڵگری سەربازی ئیسرائیلی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردبوو، لێکۆڵینەوەکەش لە میانەی تازەکردنەوەی زانیارییەکانی بوو تا بۆچوونی تەواویان لەسەر ناوچە داگیرکراوەکاندا هەبێ.

باب و باپیری ئیسماعیل لە سییەکاندا لەوێ جێگیر ببوون، لەسەردەمێک کە ڕاپەڕین دژی ڕاسپاردەییتی(مانداتی) بەریتانی و بەرەنگاربوونەوەی کۆلۆنیستە جووەکان خوێنی دەماری عەرەبەکانی دەکولاند. لە هەمو لایەک و ڕۆژانە توندوتیژی و خوێنڕشتن باڵی بەسەر بارودۆخەکەدا کێشابوو. باوکی ئیسماعیل چووبووە ڕیزی پارتی عەرەبی فەلەستینی خۆنیشاندانی لە گوندەکە ڕێکدەخست و هەستی نەتەوەپەروەرانەی جۆشدەدا. لە ڕاستیدا ڕقەبەرایەتییەکەی دژی بەریتانییەکان بوو، بەلام کاتێ لە 1948دا لە فەلەستین دەرچوو، ئامانجی سەرەکی بووە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتی تازەی جووان. پەیڤەکانی سەرەتا کە ئیسماعیل بە بیری ماون دوبارە جوینەوەی قیننامە بوو دژی جولەکەکان.

لە ماوەی ژیانی لاوێتیدا وشەیەکی زیاتر لەوانی دیکە گوێی لێدەبوو ئەویش، ناڕەوایەتی بوو. پەیڤی ناوبراوی لەگەڵ کەوچکی پەپۆلکە (لۆلک)ی منداڵان دەرخوارد دەدرا، لە قوتابخانەدا وشەکەیان لە مێشکدا چەسپاند و لە

ماڵیشەوە لەسەر نانخواردن زۆرجاران لە بارەی ناڕەوایەتی تۆقێنەر کە لەهەمو شتێک زیاتر دەرهەقیان کراوە، دەدوان.

کەمێک دوای ئەوەی تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ، ئیسماعیل گەواهیدەرێک بوو لەسەر پەلامارێکی دڕندانە بۆ سەر پاسێکی پڕ لە حاجیانی جو کە بەرەو ئۆرشەلیم دەچوون. عەرەبەکان خۆیان، هەمو ژن و منداڵەکانیان کوشتن. ئەو شەوە ئیسماعیل پرسێکی کرد کە هەمو بیرکرنەوەی بۆ هەتا هەتایە گۆڕی. پرسەکەش ئەوە بوو: وادابنێ کە جووەکان مافی بەرگریان لەوەی هەیە هەبوو، چی دەقەوما؟ کاردانەوەکە بووە مایەی بەردەوام خۆ بەنامۆ زانین بەرامبەر گەورەکانی. بڕوای بەوەهێنا کە جو و عەرەب دەتوانن بە باشی لەگەڵ یەکدا بژین. باوەڕی بەوەهێنا گەر شتێکی پێبکرێ و بێ منگەمنگ کار بۆ ئەو ئامانجە دەکا.

دو ساڵ دواتر – لەسەروبەندی حەڤدە ساڵیدا- بیرۆکەکەی بە ئەفسەری دەزگای ئامان ڕاگەیاند. پیاوەکەش بە وریاییەوە گوێی بۆ ڕاگرت و پاشان هەندێ شتی لێپرسی. ئایا ئەو چۆن لەگەڵ ئەوە ڕادێ کە گەلەکەی باوەڕی پێیەتی، بەوەی هەمو شتەکەش لەسەر سەری یەک مژار دەسوڕێ ئەویش ئەوەیە، عەرەبەکان ئەوانەن ناڕەوایەتیان دەرهەق دەکرێ، بۆیە دەبێ تا دوا هەناسە بۆ باوەڕە ڕەواکەیان بجەنگن. ئەفسەرەکە پرسگەلێکی کردن و ئیسماعیلی لاویش بەرسڤی درێژی دانەوە.

ئەفسەرەکە تێبینی ئەوەیکرد کە ئێسماعیل لەچاو گەنجە هاوتەمەنە عەرەبەکانی لەژێر دەسەڵاتی ئیسرائیلیدا کەمتر سکاڵای لە دەست ڕێکارە توندەکەی ئاسایشپارێزانەی لەشکر هەیە. ئەوەش زۆر تازەیە کە لە دوایدا عەرەبێکی لاو ببینی، لەوە تێبگا کە بۆچی ئیسرائیل وادەکا. ئەوەی گەنجە درێژە ڕەقەڵەکەی هەراساندەکرد ئەوەبوو کە ئەو ڕێکارە توندە ئاسایشپارێزیەی سوپا، چوونە ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیمی بۆ خوێندن ئەستەم دەکا. ئەو دەیەویست فیزیا بخوێنێ.

فایلی ئیسماعیل ڕێگا کارپێکراوەکەی لای ئامان بڕی، بەوەی تێبینی ئەوەی لەسەر درا کە خاوەنی دۆسیەکە کەسێکە دەهێنێ بە دوادایدا بچن. لە دوایشدا دۆسیەکە چووە سەرمێزی ئەفسەرێکی مۆساد. ئەویش دۆسیەکەی نارده بەشی هێنانەڕیز.

بە ئیسماعیل سۆوان گوترا بۆ قسەکردن لەسەر خوێندنەکەی تا تەلئەبیب بچێ. پێش ماوەیەک ئەو داوایەکی بەرزکردبووە بۆ ڕێگەپێدان تا لە ئۆرشەلیم بخوێنێ. دوای نیوەڕۆیەکی تەواو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا. سەرەتا لێکۆڵەرەوەکە لەسەر زانستی سروشتزانی زۆر پرسیاری لێکردن. وەڵامەکانی دڵخۆشکەرە بوون. ئەنجا لە هەمو دیرۆکی خانەوادەکەی کۆڵرایەوە و وەڵامەکانیشی لەگەڵ قسەکانی کۆنتری لەگەڵ ئەفسەری ئامان بەراوردکران، ئەنجا لە کۆتاییدا پێیگوترا کەوا مۆساد ئامادەیە خەرجی خوێندنەکەی بکێشی، بەڵام دەبێ مەشقی ئەوان تەواوبکا. هەروەها دەبوو تێبگا کە ژیانی لە مەترسیدا دەبێ گەر هاتو وشەیەک، جا بۆ هەر کەسێ بێ بدرکێنێ.

ئەوەش هۆشدارینامەیەکی ستانداردی مۆساد بوو بۆ هەر کەسێک کە بهێنرێتەڕیز. بۆ ئیسماعیلێکی ئایدیالیست ئەوە دەرفەتێک بوو کە جو و عەرەبەکان لەگەڵ یەکدا کۆبکاتەوە.

ئیسماعیل لە خانووە ئارامەکانی مۆساد بە تەواوی خرایە ژێر پرسیارو لیکۆڵینەوە پێش ئەوەی بۆ مەشقەکەی لە گەڕەکێکی دەرەوەی تەلئەبیب بنێردرێ. ئەو لەگەڵ دیسپلینەکان بە باشی ڕۆیشت و بە پەرۆشەوەش کاری لەگەڵ کۆمپیوتەر کرد و بە پێش هاوخولەکانی کەوتەوە. مایەی سەرسوڕمان نەبوو کە نمرەی باڵا لەو بابەتانە بێنێتەوە کە پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەبوو، هەروەها پەخشانەکەشی دەربارەی ڕۆڵیPLO لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوەندە سەرنجڕاکێش بوو، بخرێتە بەردەم بەڕێوبەری گشتیی مۆساد ئیسحاق هۆفی.

دوای مەشقەخولەکە ئیسماعیل کرایە ئەوەی پێی دەگوترێ بۆدەل Bodel واتە تەتەر لە نێوان بارەگای سەرەکی باڵوێزخانەکانی ئیسرائیل کە کاتساکان تیایاندا لەژێر دەمامکی دیپلۆماتییەوە دەستبەکارن. کارەکەی بە هاتن و چوون لە نێو وڵاتەکانی زەریای ناوەڕاستدا دەستپێکرد و بەردەوام سەردانی ئەسینا و مەدرید و ڕۆمای دەکرد تا پۆستی دیپلۆماتی ببات و بهێنێتەوە. جاربەجاریش دەنێردرایە بۆن و پاریس و لەندەن. ئەو گەشتانەی تاکو جیهانبینی قەرەبودەکرانەوە مانگانەشی پێنجسەد دۆلار بوو، بۆ گەنجێکی تەمەنی ئەو سەروزیاد بوو.

ئەوەی ئیسماعیل نەیدەزانی ئەوە بوو، ئەو بەڵگەنامانەی دەیهێنان و دەیبردن هیچ بایەخێکیان نەبوو. ئەوەش خۆی لەخۆیدا تاقیکردنەوەیەک بوو تاکو بزانرێ ئاخۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان هەوڵدەدا نیشانی کەسێکی عەرەبیان بدا لەو وڵاتەنەی بۆیان دەچێ. لەهەر گەشتێکیشیدا لە لایەن پیاوێکی تازە ڕاهاتوی مۆساد چاوەدێری دەکرا، تا پرۆڤە لەسەر شوێنپێ هەڵگرتن فێر ببێ و بزانێ چۆن وەکو سایە بەدوای خەڵکدا بخشێ. ئەو کەسەش کە ئیسماعیل لە شوێنی مەبەست لە قاوەخانەیەک یان لە هۆڵی میوانخانەیەک پۆستەکەی دەدایە دەست وەک ئیسماعیل بۆی دەچوو کەسێکی دیپلۆمات نەبوو، بەڵکو ئەفسەرێکی مۆساد بوو.

دوای ئەوەی بە چەندان هەفتە کاتی پشوی لە هەندەران بە سەرسام بوون بە شتە جوانەکانی وەک Pantheon, Sistine Chapel و شەقامی Oxford Street لە لەندەن بەسەربرد، داوای لێکرا بگەڕێتەوە لوبنان و دزە بکاتە نێوPLO .

ئەوکارەش گران نەبوو. ئەو بە ئاسانی چووە نوسینگەی هێنانەڕیزی PLO لە ڕۆژئاوای بەیروت. کابرای نوسینگەکە پیاوێکی زیرەک بوو زۆر باش سەری لە ڕەفتارە سیاسییەکان دەردەچوو. ئەو ئاشنایەتی لەگەڵ بیروڕای ئیسماعیل سەبارەت بە بەکارهێنانی توندوتیژی پەیداکرد و هەوڵیدا لەوە بگا ئایا ئیسماعیل ئامادەیە پەیوەندییەکانی لەگەڵ خانەوادەکە و برادەرەکانی

بپچڕێنێ، تا بەتەواوی لەبارەی سۆزو جۆشدانەوە بە PLO پەیوەستبێ. گەر بێت و وەربگیرێ وەک پێیڕاگەیەندرا ئەوا گۆڕانێکی تەواو دەبێ لە ژیانی ئەو، چونکە PLO ئەوکات تاکە پارێزەری دەبێ لە جیهانی دوژمنکارانەدا. لە بەرامبەردا ئەویش دەبێ متمانەیەکی کوێرانەی به PLO ببێ.

سەرپەرشتیارەکانی مۆساد فێریانکردبوو چۆن وەڵامی ڕاست بداتەوە. ئیسماعیل وەرگیرا و ڕەوانەی ئۆردوگایەکی ڕاهێنان لە لیبیا کرا. لەوێ خرایە ژێر مەشقێکی چڕەوە. بە دە شێوەی جیاواز فێرکرا کە ئیسرائیل دەیەوێ PLOلەناو ببا، بۆیە دەبێ سەرەتا ئیسرائیل لەناوبچێ. مامۆستاکان بێ بڕینەوە دوژمنایەتی خۆیان بەرامبەر هەمو کەسێکی دەرەوەی یانەی PLO نیشاندەدا. ئەو وانانەی ئیسماعیل لە فێرگەی مۆساد دەربارەی ڕۆڵوازیکردن فێر ببوو، لێرە زۆر بەکەڵکیهاتن. ئەو وانەکانی دەربارەی شێواز و دینامیکیەتی تاقمە تیرۆرستییەکان دەبوایە وەک ئەسفنج هەڵبمژێ. لە لیبیا بەردەوام پێیدەگوترا کە کوشتن لە شێوازێکی ئازادی بە دەستهێنان شتێکی دیکە نییە، دانانەوەی بۆمبێک لەژێر ئۆتۆمبیلێک هەنگاوێکە بەرەو ئازادی، ڕفاندن تەنها شێوازێکە بۆ سەندنەوەی ماف. ئیسماعیل کەڵکی لە مەشقەکانی مۆساد وەرگرتبوو، ئەوەیPLO شی هاتە سەر، بەڵام کارێکی وای نەکرد بکەوێتە ژێر کاریگەری دیسپلینە بڕواداریەکەیان. سەرباری ئەوە ئیسماعیل لایەنی خۆگرتن و زیرەکی و توندوبەندی جەستەیی وا نیشاندان کە وەک کەسێکی ئاسایی تەماشا نەکرێ. دوای مەشقەکە خرایە سەر هێزێکی کارای PLO. هەنگاو بەهەنگاو لە پلیکانەی بەرەوپێشوەچوون دەچووە سەرێ.

ئەو چاوی بە سەرانی ڕێکخراوەکە کەوت، لەنێویشیاندا خودی یاسر عەرەفات، هەروەها سەری لە ئۆردوگا مەشقەکانی هەمولایەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا. گەڕایەوە بەیروت تا لە ژێر هێرشە ئاسمانییەکانی ئیسرائیلدا ڕابێ، بەڵام ئەو ڕەتیکردەوە بچێتە شوێنە ئامادەکراوەکانی ژێر زەمین بۆ خۆحەشاردان، هەچەندە سەرکێشی ئەوە هەبوو هەمو باڵەخانەکە بەسەر یەکدیدا بتەپێ. بەهەر شێوەیەک بێ، توانی هیچ دیدار وادەیەکی لەگەڵ

سەرپەرشتیارە مۆسادەکەی لەدەستنەدا، کە بەردەوام دەهاتە لوبنان تا تازەترین هەواڵ لە ئیسماعیل وەربگرێ.

هەمیشە ئەو دەیزانی دەمامکەکەی بەدروستی بپارێزێ. کاتێک عەلی حەسەن سەلامە کوژرا، ئەو بوو ڕێنمایی کۆڕی دروشمدانی دژی ئیسرائیل دەکرد. هەر جارێکیش نیشانئەنگێویکی PLO سەربازێکی ئیسرائیلی دەپێکا هەرای خۆشی ئەو لە هاوڕێکانی بەرزتردەبوو. بە کورتی لە هەمو ڕەفتارەکانیدا جەنگاوەرێکی باوەڕپێکراو بوو.

کاتێکیش عەرەفات لە لوبنان دەرکرا و لە تونس جێگیر بوو، PLOئیسماعیلی ناردە پاریس تا زمانی فەرەنساوی بەتەواوی فێر ببێ. ناحوم ئادمۆنی کە ئەوکات جێگەی هۆفی گرتبووەوە، لە شوێنگواستنەوەی ئیسماعیلدا دەرفەتێکی زێڕینی لە چاندنی کەسێکی لە ناوجەرگەی چالاکییەکانی PLO لە ئاورووپادا دی.

جڤاکی عەرەبی لە کەرتی هەژدەهەم و بیستەمی پاریسدا ببوونە گەڕەکە بەندەرەکانی دەرەوە بۆ تیرۆرستان. لەو شەقامە بەرتەسکانەی ئەوێدا خەڵکانێک دەژیان لەسەر لێواری قاچاخ بوون، بۆمبدروستکەرو نیشانئەنگێوەکان لەوێدا بە ئارامی ژیانیان بەسەر دەبرد. لەوێوە هێرش دەبردرایە سەر بازاڕو چێشتخانە و سیناگۆکی جووەکان. سەرەباری ئەوەش لە پاریسدا کۆمەڵەیەکی هاوبەش کە هەمو ڕێکخراوێکی تیرۆرستیانەی لەخۆگرتبوو، ڕایانگەیاند کە بەیەکەوە پەلاماری ئامانجە ئیسرائیلییەکان لە هەمو ئاورووپادا دەدەن.

مۆسادیش بە بێبەزەییە سامناکەکەی دەستیکردنەوە. کیدۆنەکان چوونە نێو گەڕەکە عەرەبنشینەکان و لەناو جێگادا تیرۆرستە گومانلیکراوەکانیان دەکوشتن. یەکێکیان بە ملبڕاوی دۆزیەوە و ئەوی دیکەش هەروەک سەرلێکردنەوەی مریشکێک ملی بادرابوو. ئەوانە سەرکەوتنی بچوک بوون. مۆساد دەیزانی تیرۆرستەکان دەستی بردنەوەیان زۆرە چونکە لە

لایەنPLO وە باش مەشقدراون. لە دوایدا دەرکەوت کە پیاوێکیان لە بارەگای سەرەکی PLO لە پاریس هەیە و بۆ ئادمۆنی زۆر مەبەستدارە.
لە ماوەی هەفتەی دوای گەیشتنی بۆ پاریس. ئیسماعیل پەیوەندی بە ڕێنماییدەرەکەی کرد، کە لە باڵویزخانەی ئیسرائیلی لە ناونیشانی Rue 3 Rabelaisەوە دەستبەکار بوو. ئیسماعیل کابرای هەر بە ناوی ئادەم ناسی. ئەوان بەردەوام یەکدیان لە قاوەخانە و وێستگەی میترۆوە دەدی. وەک ڕێسایەک ئیسماعیل ڕۆژنامەیەکی ئەو ڕۆژی دەکڕی و زانیارییەکانی تێدا حەشاردەدا. ئادەمیش هەمان جۆر ڕۆژنامەی دەکڕی و ڕێنمایی و مانگانەکەی کە بۆ هەزار دۆلار بەرز کرابووەوە، تێدا بوو. بەو شێوازەی لە مەشقەخولی فێرگەی مۆساد فیرکرابوون بەرامبەر یەکدی دەڕۆیشتن و خۆیان لەیەکدەدا، ئەنجا منگەمنگێکیان دەکرد و داوای لێبوردنیان لەیەکدی دەکرد و هەریەکێک دوای ئەوەی بێ هەستپێکردن ڕۆژنامەکانیان بەیەکدی دەگۆڕیەوە، ڕێی خۆیان دەبڕی و دەڕۆیشتن.
بەو کەرەستە سادەیە مۆساد هەوڵیدەدا باری خۆی لە شارێکدا وا ڕابگرێ کە لەمێژە گەڕەکە بەندەری دەرەوە ناوێکی گەورەی بۆ سیاسەتوانە توندڕەوەکان هەیە، کە لە فەڕانسەدا بە ئارامی پاڵی لێبدەنەوە. تەنها مۆساد بوو بە مەبەست پیشێلکردنی قانونی نەنوسراوی هەڵبژاردبوو. دەزگا دەستی بە ئۆپەراسیۆنێک کرد کە بەخۆنازینی فەڕەنسییەکانی وا هەستیارکرد، کە هەنوکە دوای بیست ساڵ فەڕەنسییەکان لە ئیسرائیلییەکان خۆش نەبوون. ئەو سەردەمەش بە پێنجهەزار کیلۆمەتر دور لە پاریس، بە دەروازەی نەخشەی ئەندازیاری فەڕەنسی Ferdinand de Lessepe بۆ پڕۆژەی نۆکەندی سوێس دەستپێکرد.
لەو چەند خولەکە ڕاهەژێنەرانەی دوای نیوەڕۆی 21ی ئۆکتۆبەری 1967دا ئیسرائیل بۆی دەرکەوت کە چەند بەرامبەر چەکی نوێ هەستیارە. یەکێک لە گرنگترین کەشتییەکانی هێزی دەریایی، کەشتییەکی کۆنی ژێر زەریایی سەردەمی جەنگی دوهەمی جیهانی بەریتانی بەناوی ئیلات، ئەویش لەکاتی

گەڕانی بە کەنارەکانی میسریدا لە لایەن سێ ڕۆکێتی ڕوسی جۆری Styx پێکرا، کە لە پۆرسەعیدی میسریەوە تێگیران و چل و حەفت پیاوی هێزی زەریایی ئیسرائیلی تێدا کوژران و چل و یەکی دیکەشیان لە کۆی گشتی 197 ئەفسەرو سەربازدا بە سەختی برینداربوون. ئیلاتیش نقوم بوو. ئەوە نەوەک هەر تەنها کارەساتێکی کەشتیانە کە ئیسڕائیل بەخۆیەوەی نەدیبوو، بەڵکو ئەوە یەکەم جارە لە دیرۆکی جەنگی زەریایدا کەشتییەکی مارینز بە ڕۆکێتان نقومی ژێرئاو بکرێ.

کاتێ قەبارەی کارەساتەکە دەرکەوت، حکومەتی سەرەک وەزیران لیڤی ئەشکۆل Levi Eshkol بڕیاری دەرکرد بەرنامەیەکی خێرا بۆ جێگرتنەوەی کەشتییە کۆنەکەی ئیلات دابنێن. لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا نەخشەداڕێژەرانی کەشتی ،نەخشەی بەلەمێکی تۆپلەسەریان دانا کە تیژڕەو و توانادار بێ و بەئاسانیش بابداتەوە، هەروەها سیستمێکتی ئەلەکترۆنی بۆ کەشوهەواو چەک لەسەر بێ کە هەر تەنها چەند چرکەیەکی پێ بچی کە لە هێرشی دوهەمی ڕۆکێتان خۆی دەربازبکا. بڕیاری دروستکردنی حەوت لەو جۆرە کەشتیانە دراو ئەرکی دروستکردنیش بە کۆمپانیای فەڕەنسی بۆ دروستکرنی کەشتی Chantiers de Construction Mecanique de Normandie(CCM) لە بەندەری Cherbourg سپێردرا.

لە کاتی دروستکردنی کەشتییەکاندا، زانایانی دیمۆناش خەریکی دروستکردنی جۆرە ڕۆکێتێک بوون لەگەڵ سیستمی چەندان ئامێری هەستیار کە هەرکاتێ کەشتییەکان گەیشتنە ئیسڕائیل پێی چەکداربکەن. هەمو شتێک تا ئەوکاتەی سەرۆک شاڕل دیگۆل دوای هێرشی کۆماندۆی ئیسڕائیلی بۆ سەر فڕۆکەخانەی بەیروت لە 26ی سیپتامبەری 1968 کە شانزە فڕۆکەی لوبنانی لەجێدا لە تۆڵەی پەلاماردانی بۆینگی 707ی ئەلعال لە لایەن فەلەستینییەکان لە ئەسینا تێکوپێک شکێنرا،باشدەڕۆیشت، کەچی دوو ڕۆژ پاشتر ئابڵوقەی تەواوی خستە سەر بازرگانیکردنی چەک لەگەڵ ئیسڕائیل. ئابڵوقەکە ئەوەی دەگەیاند کە بەلەمە تۆپهەڵگرەکان نەدرێنە ئیسڕائیل.

ئەو کاردانەوەی فەڕانسە کۆتایی بە هاوپەیمانی دە ساڵەی لەگەڵ ئیسڕائیلدا هێنا. هاوپەیمانییەکە بۆ کاتی شۆڕشی جەزائیر کە دواتر لە 1962دا بووە مایەی سەربەخۆیی بەدەستهێنا، دەگەڕایەوە. بەشێکی هاوپەیمانییەکە ڕەگوڕیشەی خۆی لە دژایەتییە هاوبەشەکەیان هەمبەر میسری جەمال عەبدولناسر داکوتا بوو. لەو سەردەمەدا مۆساد زۆر جاران زانیاری لەسەر FLN دژە فەڕەنسای دەدایە پاریس و ئەوانیش چەکیان دەدایە تەلئەبیب و لەنێویشیاندا فڕۆکەی جەنگی مۆدێرنی ئەوکات، میراج بوو.

دوای نوشستیەکەیان لە جەزائیر شارل دیگۆل بە پەلە پەیوەندییە نەریتییەکانی لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکان گرێدانەوە و ڕێگەی بەPLO ش دا بارەگایەک لە پاریسدا بکەنەوە. هێرشەکەی سەر فڕۆکەخانەی بەیروت، دیگول بە شەقێکی بە ئازاری لە ڕومەتی خۆی لە قەڵەمدا، ئەوەش دوای ئەوەی بۆ ئیسڕائیلی دوپاتکردەوە کە واز لە کردە تۆڵەسێنەکانی لە دژی وڵاتە دراوسێ عەرەبەکانی بهێنێ.

ئابڵۆقەی سەربازی فەرەنسا بۆ سەر ئیسڕائیل واتای ئەوەشی دەگەیاند کە چیدیکە تەلئەبیب نابێ پشت بە پێویستی جێگرتنەوەی دەستەی میراجەکانی ببەستێ، ئەوەش لە ماوەیەکی دوردا دەبووە مایەی لەدەستدانی باڵادەستێتی ئیسرائیل لە بواری هێزی ئاسمانیدا، بەم جۆرە ئیسڕائیل نەیدەتوانی بەرەنگاری هێرشە دەریاییەکانی پێ بداتەوە. ئەوەی لە هەموی ناخۆشتربوو ئەو بوو، ئابڵۆقەکە لەسەردەمێکدا هات، کە ئیسڕائیل بەدەست دەرهاوێشتەی سەرکەوتنی شەڕی شەش ڕۆژەی دەناڵاند. لەو جوتە ڕۆژەی ساڵی 1967دا ئیسڕائیل توانی دەست بەسەر کەرتی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیم و غەززەدا بگرێ. لەو ناوچانەدا نزیکەی ملیۆنێک عەرەب دەژیان، بۆ زۆرینەیان جۆش و خرۆشی ڕکابەریان بەرامبەر داگیرکەرەکانیان لەوپەڕیدا بوو.

بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی مایر ئامیت گرفتەکەی ئیسڕائیل ' نەدەبوا بە سوک تەماشا بکرێ. لەنێو سنورەکەدا هەزاران مەهابەلیم (وشەیەکی عبریە بۆ تیرۆرستان) دەژین کە پشت بە گەلی عەرەب دەبەستن. بەلای هەرەکەمی

لە ڕوی خۆراک و نیشتاکدا لای خەڵک داڵدە دەدران. یەکەمین ئەرکی من بەرفراوانکردنی لیستی ئامانجەکان و دزەکردنی مۆساد بوو بۆ نێو هەمو ڕێکخراوە فەلەستینییەکان' .

گۆلدا مایریش کە بووە سەرەک وەزیران ئەرکی ئەوەی بە مایر ئامیت سپارد کە نەخشەیەک بۆ هێنانەوەی ئەو حەفت بەلەمە چەکدارییە دروستکراوانەیان بکێشێ لە بەندەری Cherbourg ی فەڕەنسی بۆ ئیسرائیل دەربازبکەن. ئامیت باسیکرد: ' سەرەتا بیرمان بۆ ئەوەچوو لەگەڵ ژمارەیەکی باشی پیاوانی زەریای پڕ چەک بچینە بەندەرەکە و کەشتییەکان بەرەو ئیسرائیل بێنین. مۆشی دایان Moshe Dayan کەئەوکات وەزیری بەرگری بوو، بە پێداگیرییەوە نەیدەویست گوێی لە پلانێکی وا بێ. مۆشی دایان ئاماژەی بەوەکرد کە کاردانەوەیەکی نێودەوڵەتی وای لێدەکەوێتەوە دەبێتە مایەی شکاندنی حەسانەی دەوڵەتی و ئیسرائیلیش بە دز دەردێ و بە گرانی لەسەر دەکەوێ. ئەوەی ئێمە پێویستە بیکەن، دەبێ بە ڕێگەی قانونیدا بڕوا. ئێمە دەبێ ڕەوایەتییەکی ناسراوی بێ لەکەمان هەبێ، تا کەشتییەکان لە هەرێمە ئاوی فەڕەنسییەوە دەربکەین. گەر کەشتییەکانیش گەیشتنە نێو قوڵایی زێ ئەوکات باسوخواسەکە بەتەواوی دەگۆڕێ'، بەڵام ئایا لە ڕاستیدا تاچەند کردەکە قانونیانە بوو، ئەوە دەمێنێتەوە سەر ڕاڤەکردنەکەی. هەرچەندە مۆشی دایان داوای پابەندبوونی بەقانونی نێودەوڵەتی دەکرد، بەڵام نەخشە داڕێژراوەکە لە تەڵەیەکی جادوگەریانە زیاتر نەبوو.

لە نۆڤێمبەری 1969دا ئامادەکارییەکانی قۆناخی یەکەمی ئۆپەراسیۆنی کەشتییەکەی نوحی تەواو کرد. فێرمایەکی پارێزەرانی لە لەندەن دامەزراو ڕێنماییەکی لە دامەزراوی کەشتیەوانی ئیسرائیلی Maritime Fruit کە بەرهەمەکانی ئیسرائیلی بۆ جیهان دەگواستەوە وەرگرت بۆ تۆمارکردنی ناوی دامەزراوێکی کەشتیەوانی نوێ بۆ کڕین و فرۆشتن. دامەزراوەکە لە ژێر تیشکی ئەستێرەی داود، ناوی Starboat یان لێنا. پشکی هەرە زۆری دامەزراوە نوێیەکە هی میلا برێنەر Mila Brenner ی بەڕێوبەری

Maritime Fruitبوو. پشکهەبووەکانی دیکە پیاوە دەستکردەکانی مایر ئامیت بوون. بەشی دوهەمی ئۆپەراسیۆنەکە بێ گرفت بەڕێوەچوو. ئەدمیرال مۆردەخای لیمۆن Mordechai Limon کەسی پەیوەندی نێوان ئیسرائیل و کەشتی دروستکەرانی Cherbourg ، کە بەمانگان بە لێوکرۆشتنەوە لەسەر زیانی دواکەوتنی وەرگرتنەوەی کەشتییەکان لە دانوستاندا بوو، هەرکاتێکیش فەرەنسییەکان لە داخوازییەکانی ئیسرائیل دەهاتنە پێش لیمۆن خاڵێکی دیکەی دەخستە سەرمێز بۆ لەسەر کۆک بوون. لە 10ی نۆڤێمبەردا بە کەشتیدروستکەرانی ڕاگەیاند کە ئیسرائیل ئامادەی قسەکردنە لەسەر دۆزەکە.

لە تەلئەبیب میلا برێنەر پەیوەندی بە ڕێزلێگیراوترین بەڕێوبەری کەشتیەوانی جهانیی Noor Ole Martin Siem لە ئۆسلۆوە بەست. ئەویش ئامادە بوو لە دەستەی بەڕێوەبردنی Starboat بە مەبەستی تایبەتی کڕینی کەشتییە تۆپهەڵگرەکان، جێبگرێ.

بە فیڵێک کە لە لایەن هەر دەستە پیشەییەکەوە ئێرەییان پێدەبرد، لیمۆن دەست و باسکی لێهەڵکردن. لە 11ی نۆڤێمبەردا قسەی لەگەڵ بەڕێوبەرایەتیی دامەزراوی دروستکەری کەشتی کرد. ئەو گوێی لە خستنەڕوی ئەوان گرت کە ڕوی لە باشی بوو، بەڵام هێشتا هەر بە دڵی نەبوو. بەڕێوبەرایەتییەکە بە سەرسوڕمانەوە تێیڕوانی و گوتی خستنەڕوە نوێییەکە ماڵکاولکارانە نییە. لەو کاتەی ئەوان لەگەڵ یەک قسەیان لەسەر ئەوە دەکرد کە ئێستا چی بکەن، لیمۆن بە خێرایی چووە پاریس کە ئۆلەسیم چاوەڕێی دەکرد. دوای دیدارەکەیان لیمۆن زەنگی بۆ بەڕێوبەرایەتی کەشتیرانییەکە لێدا و تا پێیان بڵێ' دوای یەک دو ڕۆژی دیکە' گوێتان لێدەبمەوە. لە ماوەی سعاتێکدا ئۆلەسیم خۆی گەیاندە نوسینگەی ژەنەراڵ لویس بۆنتە Louisv Bon کە سەرۆکی کەشتیفرۆشتن بوو لە حکومەتی فەرەنسادا. ئۆلەسیم پێیگوت کەوا ' گوێی لێ بووە کەوا چەند

بەلـەمێکی تۆپهـەڵگریان هـەن و دەیانـەوێ بیفرۆشـن، بەلەمـەکانیش بـۆ ئێشکگرتنی کەشتییە نەوت هەڵکەنەکانی زەریا دەستدەدەن' .

بـە هەسـتێکی تـەواو لـە کـات و سـاتی دروسـتی خۆیـدا لیمـۆن زەنگـی بـۆ ژەنەڕال بۆنتە لێدا تا پێیڕابگەیەنێ کەوا ئەو لە پاریسە و بەدوا خستنەڕوش ڕازییە. ئـەو بڕە پـارە عمولەیـەش کـە داوایکـرد لەگـەڵ ئـەو بـڕە پارەیـەی دامەزراوە کەشتیوانییەکە هاوچەشن بوو. بۆنتە وەڵامی دایەوە کە ئێسـتا لـە سەر مێزی دانوستاندنە دوایی وەڵامیدەداتەوە. ئەنجا ژەنەڕال بۆنتە ڕویکردە سـیم و پێیگـوت کـە لیمـۆن داوای چەنـدی کـردووە و ئـەوەش بـۆ حکومـەتی فەڕەنسا زۆرە. لە پڕەوە سیم داخوازییەکەی لیمۆنی بە ڕێژەی پێنج لەسـەد زیاد کرد. لـە ڕاسـتیدا بۆنتـە خرایـە هەڵوێسـتێکی شـڵەژاویەوە، چونکـە بـەم شێوەیە ڕێکەوتنێکی باشی بۆ فەڕەنسا ئەنجامدەدا و لەو گرفتە سـەرئێشـەیەی ئیسرائیلیش ڕزگاریان دەبوو. ئیسرائیل قەرەبووەکەی خۆی وەردەگرێتەوە و فەڕانسەش ڕێژەی پێنج لەسەد قازانج دەکا، بەڵام ئەو دو پرسی لە ئۆلە سیم هەبوون: ئایا کەشتییەکان بۆ نـەرویج دەبـا؟ ئایـا ئـەوە مسـۆگەر دەکـا دوای کـاری نەوتـدەرهێنان نایانداتـە دەوڵـەتێکی دیکـە؟ سـیم لـە وەڵامـی هـەردو پرسەکانی دڵنیا کردەوە. بۆنتە لەگەڵ ئەوە کۆک بوو کە پرسـی دەرهێنـانی کەشتییەکان لەو بەندەرە نەریت ئاسا بە نهێنیی بێ باشترە، چونکە ئـەوکات لە چاوی بازرگانییەوە هەسـتیارو وروژێنـەرە و سـەرنجی میدیاکانیشـی لـێ دور بێ بە تایبەتی کە کەشتییەکان بۆ شـوینی نەوتـدەرهێنان دەچـن. ڕۆژی دەرچوواندنی کەشـتییەکان بـە 24ی دیسـێمبەری1969 دانـرا، چونکـە لـەو ڕۆژەدا هەمو بەندەری Cherbourg سەرقاڵی ئاهەنگی کێرمس دەبێ.

هێشتا بۆ ڕۆژی دەرچوونەکە مانگێکی مابوو، مایر ئامیت لەوماوەیـەدا بـە ئاسانی دەتوانێ ئامادەکارییەکانی دیکە تەواوبکا. بۆ دەستپێکردن دەبێ ئـەو مشـوری نـاردنی سـەد و بیسـت کـەس لـە پیـاوانی دەریـایی بـۆ هێنـانی کەشتییەکان و پێبڕینی هەزاران مـایلی زەریـایی تـا دەگەنـە بەنـدەری حـەیفا بخـوا. گـەر بێتـو ئـەو هـەمو پیـاوە بەیەکـەوە بنێـرێ ئـەوا دەبێتـە مایـەی

هۆشداری بۆ دەزگای نهێنی فەڕەنسی، بەڵام مایر ئامیت چارەسەری گونجاوی بۆ دۆزیەوە.

بڕیار درا پیاوە زەریاوانەکان دوو دوو بۆ شارەکانی ئاوروپا بنێری، لەوێیەوە لە کاتی پێویستدا بەرەو بەندەرەکە بەڕێبکەون. پیاوەکان ڕێنمایی ئەوەیان وەرگرت کە لە شەوێک زیاتر لە میوانخانەیەک نەمێننەوە، واتە هەرشەوێ لە میوانخانەیەک. هەموشیان بە پاسپۆرتی ئیسرائیلی گوزەریان کرد، تاکو بە تۆمەتی بەکارهێنانی پاسپۆرتی ساختە ڕێیان پێنەگیرێ. لەگەڵ ئەوەشدا مایر ئامیت دەیزانی کە هێشتا کردەکە سەرچڵییەکی مەزنە. وەک خۆی گوتەنی ' تەنها یەک پۆلیسی فەڕانسی گومانکار بەس بوو کە بپرسێ ئایا ئەو هەمو جووە بەیەکەوە لە ئێوارەی کێرسمسدا لە بەندەرەکەدا چی دەکەن. ئەوکات هەمو ڕیسی ئۆپەراسیۆنەکە دەبووەوە خوری' .

لە 23ی دیسامبەردا هەمو پیاوە زەریاییەکان گەیشتنە بەندەری Cherbourg. ئەوان بە شارەکەدا بڵاوبوونەوە و گوێیان لە گۆرانیەکانی کێرست دەگرت کە لە هەمو لایەکەوە دەبیستران. هەندێکیان لە ئۆرشەلیم لە دایکببوون و گەورە ببوون، بۆیە دەیانتوانی گۆرانیەکانیان لەگەڵدا بلێنەوە.

لە تەلئەبیب مایر ئەمیت چاوی بێدار بوو، ئامادەبوو هەر کێشەیەک بێتە پێش چارەی بکا. کێشەی پەیداکردنی خۆراکی هەشت ڕۆژە بۆ زەریاوانەکان بەوە چارەسەرکرا کە ئەفسەرێکی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکە دانا. ئەویش بە ئاسانی سەری لە هەمو دوکانەکانی بازاڕی Cherboug دا و هەر دوکانداڕێکیش کە وەسڵی کڕینی شوشە مرەباکەی دەدایەوە، بە تۆخی سوپاسی دەکرد. یەک چارەک ملیۆن لیتر دیزل لە بۆشکەکان ئاودیوکرا و لە ژێرەوەی کەشتییەکان شاردرایەوە. دەبوایە کەشتییەکان لەژێر هەلومەرجی ئاوهەوای نالەباری زستاندا بە دەربەندی Biskaje دا بەناو بەلەمە زۆرەکانی ئەوێدا تێبپەڕن. مایر ئامیت ئەوەی باسکرد کە لە تەلئەبیب کردویەتی: ' ئێمە نوێژمان بۆ کەشوهەوای داونکەرکەن Duinkerken (کەشی داونکەرکەن: ئەو کەشە لەبارەیە کەلە زستانی1939 دا هەزاران

سەربازی بەریتانی سەرسوڕهێنەرانە و پەڕجوئاسا لە داونکەرکەن بۆ ئینگلستان لەبەر هۆی نادیار هیتلەر دودڵ بوو هێرشیانبکاتەسەر، پەڕینەوە و دەباز بوون.- وەرگێڕی هۆڵەندی-) دەکرد. ئێمە کەشناسێکمان بۆ بەندەری Cherbourgنارد، لەوێ ئەو هەمو پێشبینییەکانی سەقای ئینگلستان، وفەڕەنسا و سپانیای خستە ژێر چاوەوە' .

میلی کاتژمێر تا ئێوارەکە داهات بە هێواشی دەڕۆیشت. پێشبینی ڕێژنە بارانێکی زۆر لە کەش دەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرمان درا لەهەمان بارودۆخدا دەربچن. لە سەروبەری سعات حەفت و نیودا هەمو زەریاوانەکان لەسەر کەشتییەکاندا جێی خۆیان گرت، بەڵام ئاو و هەواکە خراپتر بوو. وادەیەکی دیکەی دەرچوون بە سعات هەشت و نیو دانرا. ئەو وادەیەش ڕۆیشت بێ ئەوەی کەشتییەکان لەبەر کەشی نالەبار بتوانن لەجێی خۆیان بجولێن. لە تەلئەبیبەوە پەیامێکی کۆدەدار هات: ' بەبێگوێدانە نالەباری ئاو و هەوا پێویستە دەرچن' .

ئەفسەری پلە باڵای زەریاوانی ئیسرائیلی لە بەندەرەکە گوشاری دەرچوونی ڕەتکردەوە، گوتی ' ژیانی زەریاوانەکانم لا گرنگترە لە دەرچوون'. ئەو بە بێدەنگی سێرەی لە کەشناسەکەی گرتبوکە لە ژوری فەرماندەکە بوو خەریکی نەخشەکانی کەشناسی بوو و. لە ناوەڕاستی شەودا، کەشناسەکە گوتی : دوای دو سعات باوبۆران کەمدەبێتەوە و بەرەو باکور دەڕوا. ئەوکات بای سارد لە پشتمان نادا و دەکرێ دەربچین' .

کە میلی کاتژمێر گەیشتە سەر دو و نیو، لە شەوی کێرسمسەکەدا ماشێنی کەشتییەکان کەوتنە گەڕ و بەهێواشی ڕۆیشتن. حەفت ڕۆژ دواتر لە ڕۆژی سەری ساڵدا گەیشتنە بەندەری حەیفا.

لەو کەسانەی کە لە چاوەڕوانیاندا بوون خودی مایر ئامیتیشیان لەنێودا بەدیدەکرا. بۆ ئەو سەری ساڵ لەوەی باشتر دەست پێنەدەکرد. ئەو دەیزانی کە شارل دیگۆل ئەو لەکەدارکردنەی لە یاد ناچێ.

لــە ڕاستیشــدا هــەروا کەوتــەوە. کاتێــک مۆســاد لــە پــاریس و شــارە فەڕەنســییەکانی دیکــەدا ڕاوی تیرۆرســتەکانی ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاســتی دەستپێکرد، دەزگای نهێنی فەڕەنسی بە وردی چاوی لەسەر کاتساکان بوو و وەک تیرۆریست سەیری دەکردن. لەوەش خراپتر ئەفسەرە هەوادارە عەرەبەکانی دەزگای Service de Documentation Exterieure et de Contre-Espionage(SDECE) ئاماژەیان لەسەر دژە پەلامارەکانی مۆساد دەدایە PLO . زۆر جار وا ڕویداوە کە تیرۆرستێک لەو ڕێگایەدا دەرباز بووە.

ســامناکترینیان لەنێویانــدا Ilich Ramirez Sanchez، پیاوێــک چالاکییەکانی لەژێر نازناوی'Carlos de Jakhals' دا ئەنجامدەدان. لە پاریسدا ناوبراو بکوژێکی کرێگرتە بوو زۆر جاران لە لایەن باڵەکانی PLO کە لە سوریادا بارگەو بنەیان هەبوو، لە باوەش دەگیرا. کردەکانی کارلۆس لە بەر چاو ڕۆژنامە نهێنییەکانی مارکسیستی لە هەمو ئاوڕوپادا ببووە بیچمێکی سەرسوڕهێنەر. هەندێ لە ژنان شێوازەگەمەی ئەویان خۆشدەویست، چونکە چەند جاران لە داوی مۆساد دەرباز ببوو. ڕۆژێکیان لەگەڵ کچێک لە Rivieraلەبەر هەتاو دەدیترا، رۆژی پاشتر نیشانەی بوونی لەنێو تاقمە تیرۆرستەکانی ڕۆژهەڵات لە لەندەن کە خەریکی پلانی دژی هەندێ تاقمی دیکەی عەرەبی و دژی ئیسرائیلی بوون، دیار دەکرا. کارلۆس و تاقمە تیرۆرستییەکان بە مەرجی دەستنەوەشاندن لە هاووڵاتییە بەریتانییەکان لە لایەن پۆلیسی نهێنی بەریتانییەوە چاوپۆشیان لێدەکرا. لەوکاتەی مۆساد ئامادە بوو دەست لە کارلۆس بوەشێنێ، ئەو لە سەر زەوی ئاوڕوپا یان لە بەغدا و دیمەشق یاخود لە وڵاتێکی دیکەی عەرەبی خەریکی نەخشە ئەهریمەنەکانی دەبوو.

مۆساد ماوەیەکی درێژ چاوەدێری کارلۆسی دەکرد تا بۆی هەڵبکەوێ لەناویببا، ئەوەش ئەرکێکی ئیسماعیل سۆوان بوو کە تەواوی کاتەکەی لە پاریس بۆ تەرخانکرد.

تەواوی پشکهەبوونی ئیسماعیل لەو شەڕەی مۆساد لە پاریسدا کردی کەم نەبوو، چونکە لە سۆنگەی ئەو کاتسا و کیدۆنەکان سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێنا وەک: نوسینگەیەکی ساختەکردنیPLO یان بە بۆمبێکی سوتێنەر گڕ تێبەردا، کۆگای چەکدارکردن بە تەواوی تێکدران، تەتەرەکانیان سایە دەکرا و دەکوژران، تەقەمەنی کە لە ڕۆژهەلاتی ئاوڕوپاوە دەیانهێنا دەیانتەقاندەوە، دەیان شێوازی دیکە کە مۆساد ئاگری بە ئاگر لەسەر بنەمای زانیارییەکانی ئیسماعیل وەڵام دەدایەوە.

لە یانیوەری 1984دا ئیسماعیل پەیامی لە ڕێنماییدەرەکەی ئادەم پێگەیشت کە بگوازێتەوە ئینگلستان. لەوێ پێویستە خەریکی خوێندنەکەی فیزیای بێ کە دوا ساڵیەتی. ئەرکی نوێی بریتییە لە دزەکردن بۆ نێو PLO لە لەندەن بە تایبەتیش کە زانراوە فەرمانده‌ی یەکەی کۆماندۆی لەشکری 17یان لەوێیە. تاقمەکە ڕاستەوخۆ لە لایەن عەبدولڕەعد موستەفا Abdul Rahid Mustapha ڕابەرایەتی دەکرا، کە شانشینی یەکگرتوی وەک بنکە بەکاردەهێنا. موستەفا ناوی لە لیستی ڕەشی مۆسادا هەبوو.

ئیسماعیل بە بنکەیPLOی لە پاریس گوت کەوا خوێندنی فەڕەنسی تەواوکردووە، سایانێکیش بڕوانامەیەکی ساختەی بۆ هێنا، کە چیرۆکی تەواوکردنی زمانی فەڕەنسی پشتڕاستبکاتەوە. بۆیە دەیەوێ بچێتە بەریتانیا تا خوێندنی فیزیا تەواوبکا. ئەوەشی بەبیرهێنانەوە کە خوێندنەکەی وایلێدەکا بتوانێ پسپۆڕێتی لە تەقەمەنی و بۆمبدروستکردندا پەیدابکا.

بۆمبدروستکارێکی نوێ لە دەستەی پسپۆڕانی PLO لەو بوارەدا بەتایبەتیش لە1984 دا جێی بەخێرهێنانە. سەرکردە فەلەستینییەکان بە پەرۆشبوون بۆ فەلەستینییەکانی غەززە و کەرتی خۆرئاوای بسەلمێنن کە لەبیریان نەکردون. دەیان هەزار خەڵک کە لە ژێر داگیرکاری ئیسرائیلییەوە دەیانناڵاند، لەوە تێنەدەگەیشتن کە بۆچی عەرەفات کاری زیاتر ناکا تا یارمەتییانبدا. لە ئەدەبیاتیاندا تاقە شتێک هەبوو: دەستبەکاربوون.

مۆساد دەیزانی کە عەرەفات ئێستا لە ژێر گوشاری دەستپێشخەرییەکانی سەرۆکی میسر حوسنی موبارەک دایە بۆ پشتگیری ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیلدا. ڕژێمی گاڵتەپێنەکراوی سوریا بڕیاریدابوو پەیوەندییەکانی لەگەڵ باڵە جیاجیاکانی فەلەستینی ئارامبکاتەوە و هەرچەندە سەدان ئەندامی خستنە پشت دیوارەکانی زیندانەوە. سەرۆک حافز ئەسەد دەیەویست بۆ ئامریکاییەکانی بسەلمێنی کە ئەو ئەو هەراسناکارە نییە، کە جیهان وای دەبینی. ئەمەش بووە هۆی سەلمێنەری بیرۆکەی نەرمڕەوانی PLO بۆ خەباتی تۆڵەکردنەوە لەجیهانی عەرەبدا. لە نێویاندا قسە لەسەر خیانەتی سەرکردەکەیان کرا. ئیسرائیلییەکانیش لەسەر گەمەی خۆیان و پروپاگەندەکانیان لە سەر PLO لە ناوچە داگیرکراوەکان بەردەوامبوون بەوەی PLO کە بڕی زیاتر لە پینج ملیار دۆلاری بۆ چالاکییەکانی لەبەردەستە لە هەمو لایەکی جیهان وەبەریدەهێنێ. سەرەڕای ئەوەش خودی عەرەفات کەوتە بەر تانە و تەشەر، تاکو لەبەر چاوی خەڵکدا ڕەشبکرێ. هۆبەی شەڕی دەرونیی مۆساد دەنگۆی ئەوەیان بڵاوکردەوە کە گوایە بەشێکی پارەکەی بۆ خەرجکردن لە نێربازی بەکاردێنێ. دەنگۆکە لە ئۆردوگای پەنابەران بڵاوکرایەوە. هەرچەندە لە بازنەیەکی بەرفراواندا پەسەندنەکرا، بەڵام بێ کاریگەریش نەبوو. عەرەفات بە تیژی کاردانەوەی هەبوو: فەرمانی بە حەڤدە بنکەیPLO دا کە ئەو هەواڵە شۆڕبکەنەوە نێو خەڵکی کە عەرەفات مەیلی ژنانی هەیە، لەمەشیاندا درۆیان نەکرد.

بۆ بەرپرسی بنکەی PLO لە پاریس بیرۆکەی گواستنەوەی ئیسماعیل بۆ لەندەن تا خوێندنی خۆی لەبواری فیزیادا تەواوبکا، هەواڵێکی دڵخۆشکەرانە بوو. لەهەر بارێکدا هەواڵەکە هۆی خۆی هەبوو کە بلیتی شەمەندەفەری بۆ لەندەن بۆ ببڕن و پارەی هەفتەیەکیشی بدەنێ. ئادەمیش پێنجسەد پاوەنی ئینگلیزی دایێ لەگەڵ ئامۆژگاری کە لەوێ بە دوای کارێکدا بگەڕێ تا گومانی نەکەوێتە سەر.

لە ڕۆژێکی باوبۆرانی فیبرایری 1984دا بە پاسپۆرتێکی ئوردنی گەیشتە، لەندەن کە مۆساد بۆی دابینکردبوو. لە بنی هەگبەکەشیدا پاسپۆرتێکی دیکەی ساختەی کەنەدایی بۆ کاتی ناچاری تێدا بوو، گەر ئینگلستان بەجێبێڵێ. لە نێو پاسپۆرتەکەشدا ڕاپۆرتێکی مۆسادی لەسەر عەبدولڕائید موستەفا فەرماندەی کۆماندۆی لەشکری 17 تێدا بوو.

لە ڕاستیدا هێزەکە وەک یەکەیەکی ئاسایسپارێزی خودی عەرەفات دامەزرا. ناوی یەکەکەش لە ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە بارەگا کۆنەکەیPLO ی بەیروت وەرگیرابوو. لە ڕۆژگارێکدا ئەو یەکە بچوکە بە ناوی سوپای 17 لە بەیروتدا گەورەبوو، ژمارەی جەنگاوەرانی خۆیان لە هەزار کەس دا. یەکێک لە هۆبەکانی بزوتنەوەی سێپتێمبەری ڕەشی سامناک بوو کە بەرپرسیاربوون لە خوێنڕشتنەکەی مونشن. کەمێک پێش ئەوەی PLO لە لوبنان دەربکرێ، یەکەمین فەرماندەی لەشکری 17دا عەلی حەسەن سەلامە بوو کە بەپلانی ڕافی ئیتان بە بۆمبێکی چێنراو لە نێو ئۆتۆمبێلێکدا کوژرا. لە تونس عەرەفات ڕاستییە تاڵەکانی واقیعی بە چاوی خۆی بینین. مۆساد نەوەک هەر بەدوای ڕاوکردنیەوە بوو، بەڵکو تا دەهات لە لایەن توندڕەوە عەرەبییەکان مەترسی لێدەکرا. ئەبو نیزال کە خۆی بە دەنگی ڕەسەنی خەباتی چەکدارانە دەزانی، دەیگوت عەرەفات کۆسپی سەر ڕێگای سەرکەوتنە. لەو کاردانەوەشدا عەرەفات لەشکری 17ی ڕێکخستەوە تا ببێتە هێزێکی وا دو ئامانج بەیەکەوە بشکێنێ: لە سەرێکەوە کەسی خۆی بپارێزێ لە سەرێکی دیکەشەوە پەلاماری دوژمنەکانیشیان بدا و بە ئیسرائیل دەستپێبکا. سەرکردایەتیی کۆماندۆیەکە درایە دەست موستەفا، کە پیاوەکانی ئەو لە تونس لە لایەن چینییەکان و یەکەی تایبەتی ڕوسی- شۆرەوی مەشقی شەڕی گەریلایی پێدران. لە 1983دا موستەفا گەشتێکی شانشینی یەکگرتوی بۆ هێنانەڕیزی کرێگرتە ئەزموندارەکان کرد.

لەندەن لە جەنگاوەرەکانی پێشوویSAS و سەربازە دێرینەکانی سوپا پر بوو، ئەوانەی لە باکوری ئێرلەندا ڕاژەی خۆیان تەواوکردبوو ئێستاش بە

دوای کاری نوێ لەگەڵ کارامەییاندا بگونجێ دەگەڕان. وەک ڕێنماییدەری PLOئەوان پارەی باشیان وەردەگرت و زۆریشیان لە دروشمی دژە سامیان دەگوتەوە. چەندانێکیان گرێبەستیان لەگەڵPLO دا واژۆکرد و بەرەو تونس کەوتنە ڕێ. هەندێ ڕێنماییدەری دیکەشیان لە لایەن ئەندامە دێرینەکانی بەتالیۆنی بێگانەی فەڕانسییەوە هێنرانەڕیز. دەبوایە PLO لە ڕاژەکانی کۆنە ئەفسەرێکی CIA بەناوی فرانک تێرپل Frank Terpl دڵنیا بووبا، کە دواتر دەستی لەگەڵ محەمەد عەلی ئاگجا ئەو فاناتیزمەی تەقەی لە پاپا یۆهان پاولی دوهەم کرد، هەبوو.

ساڵێکی ڕەبەق موستەفا لە شانشینی یەکگرتو دەهات و دەچوو بێ ئەوەی دەستەی پۆلیسی تایبەتی Scotland Yard و MI5 هیچ بیرۆکەیەکیان لەسەر ناوبراو هەبێ. کاتێکیش مۆساد زانیاریی لەسەر ئەو پێدان، تاکە شت کە MI5 کردی، ناردنی ئەفسەرێکیان بوو بۆ نوسینگەی PLO تا پێیانڕابگەیەنێ گەر هاتو هەر کردەیەکی تیرۆرستی دژی ئامانجێکی بەریتانی بکەن ئەوا نوسینگەکەیان لێدادەخەن و ستافەکەشی دەردەکەن. ئەوان دەیانتوانی لەسەر نائارامی بۆ ئیسرائیل نانەوە بێتەگەرە هاتنە پێش بەردەوامبن.

سەردەمی پیلانگێڕی شەڕی پڕوپاگەندەکردن لەوکاتەوە کە بەسام ئەبو شەریف قسەکەری ئەوکاتی عەرەفات بانگهێشتنێکی بۆ دانیشتن لەگەڵ ڕۆماننوس جێفری ئارچەر Jeffrey Archer پێگەیشت. کاربەدەستەکەی PLOپاشان وای بەبیرهاتەوە کە جێفری ئارچەر بۆی ڕونکردەوە کە چۆن ' ئێمە بەهاوبەشی پەیوەندیمان لەگەڵ میدیاکاندا بگرین بیچەسپێنین، چۆن ئێمە چالاکییە سیاسییەکانمان ڕێکبخەین، هەروەها چۆن کارێکی وا بکەین کە باشترین پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتوانە بەریتانییەکان بگرین و ڕای گشتی بۆ جۆشبدەین. من زۆر لە ژێر کاریگەری گوتەکاندا بووم'. ئەو چاوپێکەوتنە بەس بوو تا ناوی جێفری ئارچەری ڕۆماننوس بچێتە نێو کۆمپیوتەری مۆساد.

بۆ ئیسرائیلی تورە ئەوە دیار بوو کە موستەفا لە ژێر پارێزگاری دەسەڵاتی بەریتانیا دایە و هەر هەوڵێکیش لەسەر خاکی شانشینی یەکگرتو بۆ زەبر لێوەشاندنی، دەرەنجامی نەخوازراوی دەبێ.

ئەرکی ئەوە بە ئیسماعیل سۆوان سپێردرا کە هەوڵی ئەوە بدا موستەفا بە فێڵ لە شانشینی یەگرتو بهێنێتە دەرەوە، باشتر وایە بیباتە وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چونکە لەوێ کیدۆنەکانی مۆساد دەرفەتی باشتریان بۆ کوشتنی دەبێ. ئادەم لە پاریس بە ئیسماعیلی ڕاگەیاندبوو کە لە لەندەن ڕێنمای لە پیاوانی مۆسادی سەر بە باڵوێزخانەی ئیسرائیل وەردەگرێ. یەکەمینیان ئاری ڕیگێڤ و دوهەمیشیان یاکوب باراد Jacob Barad بوو، کە بەرژەوەندی بازرگانییەکانی ئیسرائیلیان لەبندەستبوو. سێهەمیشیان کاتسای جێگیری لەندەن بەشار سامارا basher Samara کە لە ژێر دەمامکی دیپلۆماتیدا نەبوو ،لە پێشترین پەیوەندکاری ئیسماعیل بوو. سامارا داوای لە سایانمێکی کارمەند لە دامەزراوەی خانو بەکرێدان لە لەندەن کرد، کە لەبەکرێگرتنی فلاتێکی گەڕەکی Maida Vale یارمەتی ئیسماعیل بدا.

ڕۆژێک دوای گەیشتنە لەندنی، ئیسماعیل پەیوەندی لەگەڵ ساماڕادا گرت. ئەوان لەبەرپێی کۆتەڵی Eros لە Piccadilly Circus یەکدیان دی. ئەوان سەرو دانەی ڕۆژنامەی Daily Mirror ی ڕۆبەرت ماکسوێلیان کڕی و لەبن هەنگڵیان نا. لە ڕێی ڕۆژنامە گۆڕینەوە هەروەک لە پاریسدا کردبووی، ئیسماعیل مانگانەکەی شەشسەد پاوەنی ئیستەرلینی و ڕێنمایی ئەوەشی تێدابوو کە چۆن بتوانێ دزە بکاتە نێو نوسینگەی PLO لە لەندەن وەرگرت.

زۆر لەو خەڵکانەی لەوێ کاریاندەکرد دەیانەویست ڕاستەوخۆ لە ئۆپەراسیۆنەکانیPLO دا وەک پەیامناردن بۆ شانە بەربڵاوەکانیPLO لە ئاوروپا و بردنی هەواڵی گرنگ بۆ بنکەی سەرەکیان لە تونس ( لەوێدا بەسعاتان دەوەستان تادەرفەتی دیتنی عەرەفاتیان هەبێ) کارا بن. ئەو لاوە شۆڕشگێرانە حەزیان لە کاری نوسینگەیی وەک ئەرشیفکردنی بەڵگەنامەکان و خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان و بەرسڤدانەوەی تەلەفۆنەکان نەبوو. کاتێکیش

ئیسماعیل خۆبەخشانە بۆ کارەکە خۆی ناونوسکرد، یەکسەر وەرگیرا و بردرایە بنکەیPLO .

لە ماوەی یەک دو ڕۆژدا چاوی بە موستەفا کەوت. لەبەر نۆشکردنی چای گەرمی زێدە شیریندا هەرزو لەیەکڕاهاتن. هەردوکیان خاڵی هاوبەشیان لە ژیانی ژێر بۆردومانی بەیروت لە لایەن ئیسرائیلییەکاندا هەبوو. هەردوکیان بیریان لەو هەنگاوانەیان لەنێو شەقامەکان و باڵەخانە ڕوخاوەکان دەکردەوە. هەردوکیان لەوێ لە بەیروت هەر شەوێک لە جێگایەک دەخەوتن و چاوەڕوانی بەرەبەیانیان بوون، لەگەڵ مەلابانگداندا کە موسڵمانانی بۆ نوێژی بەیانی بانگدەکرد . هەردوکیشیان لە کاری ئێشکگری بازگە فەلەستینییەکان کاریانکردووە تا ڕێگا بە ئۆتۆمبێلە فریادڕەسە فەلەستینییەکان بدەن و ئەوانی دیکەش بگێڕنەوە، ئەوان دەبوایە لەتاو ژیانی خۆیان لەبەر دەنگی فڕۆکە جەنگییەکانی ئیسرائیلدا ڕابکەن، کە گوێی کەڕ دەکردن. ئەوان لەبەر گێڕانەوەی بیرەوەریەکانیان لە بەیروت پێدەکەنین، چونکە بە خێرایی کاتێک بۆمبێک دەتەقی بەیەکدیان دەگوت ' ئەگەر گوێت لە بۆمبێک بوو بتەقێ کەواتە هێشتا ماوی'. زۆر یادەوەری مینای نوزەی مردوان و گریان و هەنسکی ژنان و نیگای ڕقی بێدەسەڵاتیان بەرامبەر ئاسمان خاڵی هاوبەشیان هەبوون.

ئیسماعیل و موستەفا هەمو ڕۆژەکەیان پێویست بوو تا یادەوەرییە کۆنەکانیان لەگەڵ یەک ئاڵوگۆڕبکەن. لە دواییدا موستەفا ویستی بزانێ ئاخۆ ئیسماعیل بۆچی هاتۆتە لەندەن. لەوەڵامدا ئیسماعیل گوتی بۆ ئەوەی خوێندنەکەم تەواوبکەم و باشتر ڕاژەیPLOی پێبکەم. لە بەرامبەریشدا پرسیار لە موستەفا کرا کە ئەو لە لەندەدا چی دەکا. وەڵامەکە کۆمەڵێک ڕاستی ئاشکراکردن. موستەفا وێنای کارێکی پاڵەوانانەی لەشکری17 کرد کە ئەم جارە کۆماندۆکانی لەسەر ئەو خاڵە بوون کە فڕۆکەیەکی سەرنشینهەڵگری ئیسرائیلی پڕ گەشتیاری ئاڵمانی بڕفێنێ، کەچی عەرەفات نەخشەکەی لەترسی ڕای گشتیی ئاڵمان پوچەڵکردەوە، بەڵام موستەفا هەر

بەوە لێنەگەڕاوە شەڕەکەی لە دژی ئیسرائیلییەکان لە قوبرس و سپانیا درێژە پێداوە. ئیسماعیل زانی کە هەر شتێکی لە موستەفا دەزانی، مۆسادی لەسەر هەوڵی کوشتنی شیلگیرانەتر دەکرد.

ئەوان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دو ڕۆژێکی دیکە لە لای دواندەرانی هاید پارک Hyde Park یەکدی ببیننەوە، کە بڵندگۆی نەریتیانەی هەمو کەسێکە بەهەر بیروباوەڕێکەوە قسەی خۆی تێدابکا. ئیسماعیل زەنگی بۆ ژمارە تەلەفۆنی تایبەت لێدا کە هەواڵێکی گرنگی پێیە. بەشار سامارها تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. ئەوان لەسەر شەقامی Regent steet ڕێککەوتن. لە کاتی پیاسەکەیان بە بەردەم نوسینگەکانی فەرمانبەران کە کاتی بەرچاییانە بوو هەمو ئەوەی موستەفا بۆی باسکردبوو گێڕاییەوە. سامارا گوتی مشوری ئەوە دەخۆم لە کاتی ئامادەبوونتان لای دەواندەرانی هاید پارک وێنەی بگرم و سایەی بکەم ئاخۆ بۆ کوێ دەڕوا.

موستەفا بۆ شوێنە قسە لەسەر کراوەکە نەچوو. چەند هەفتەیەکی پێچوو تا ئیسماعیل موستەفای دیتەوە. لەو ماوەیەدا ئیسماعیل ناوی خۆی وەک خوێندکارێک لە کۆلیژی Bath نوسی. هەفتەی دوو جاران دەچووە لەندەن بارەگای PLO تا کارە کارگێڕییەکانی بکا. لە یەکێ لە جادەکان موستەفای لێبوو. ئەم جارەشیان هەردو زەلامەکە بە خواردنەوەی چای گەرم و شیرین قسەیان لەگەڵ یەکدا کرد. لەبنی هەگبەیدا، موستەفا کتێبیکی وێنەداری لەسەر لەشکری 17دا دەرهێنا. بە شانازیەوە ڕایگەیاند کە بە سەد هەزار دانەی لەنێو فەلەستینییەکاندا بڵاوکردۆتەوە. کاتێک ئیسماعیل ڕوپەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە وێنەیەکی موستەفا کە لە بەیروت گرتبووی تێدا دی. بە گەورەیی لەسەر وێنەکە واژۆی کرد و کتێبەکەی پێشکەش بە ئیسماعیل کرد. جارێکی دیکەش قسەیان لەسەر وادەی یەکدی دیتن کردەوە، بەڵام ئەم جارەشیان موستەفا هەر ئامادەنەبوو.

لەو نێوەدا ئیسماعیل کتێبەکەی لە وێستگەی شەمەندەفەری Bath کە شوێنی جێگری بەیەکگەیشتنیان بوو، دایە سامارا. کاتساکە بە

شـەمەندەفەڕێک ڕۆیشـت و  بە یەکێکی دیکە گەڕایەوە لەندەن. ئـەو هـەمو شتێکی لەسەر نوسینگەیPLO  لە ئیسماعیل وەرگرت و مانگانەکەشـی کـە بریتی بوو لە شەشسـەد پاوەن دایە دەست.

نزیکەی ساڵێک رەوتی یەکدی دیتنەکەیان وا ڕۆیشت. لەو ماوەدا ئیسماعیل کیژێکی ئینگلیزی بە ناوی کامێل گرینسمیس Caermel greensmith ناسی. کاتێکی ئـەو بۆ  هاوسـەرگیری داوایلێکرد، کچەکە بە بەڵێ وەڵامـی دایـەوە، بـەڵام ئێوارەی پـێش  ژنهێنانەکـەی هێشـتا کەسـێکی وەک شـاهید نەدۆزیبووەوە.

لە سـەردانی داهـاتوی نوسـینگەیPLO دا موسـتەفای دیتـەوە، وەک هـەمو جارێک شوێنی مانەوەی ڕابردوی بۆ ڕوننەکردەوە. موستەفا کۆمەڵێک پارچە ڕۆژنامـەی  ئەلقەبەسـی عـەڕەبی پێبـوو، کـە لـە لەنـدەن دەردەچـوو. هـەر پارچەیەک کاریکارتۆنێکی تێکدەرانەی بۆ سەر بیچمـی یاسـر عـەڕەفات تێدا بـوو. ڕۆژنامەکـە   لـە لایـەن شـێخی فـەرمانڕەوای کوێـت، کـە لـەمێژبوو دوژمنایەتی عەڕەفاتی دەکرد، خەرجی تێچوونەکەی دەکێشرا .

کاریکاتێرەکان کاری دەستی کارتۆریستی سیاسی بەناوبانگی عەڕەب ناجی ئەلعەلی Naji Al-Ali بوون. لە لەندەنەوە شەڕی یەکتای بەرامبەر عەڕەفات ڕاگەیانـدبوو. بـەردەوام ئـەو لـە کاریکارتۆنـەکانی سـەرکردەیPLO  ی بـە وڵاخئاسا و خۆویست و سیاسییەکی ناکارامەی لەقەڵەمدەدا . کاریکاتێرەکان یارمەتی ڕۆژنامەی ئەلقەبەسیان دا کە دەنگی نـاڕەزایی لـە دژی عەڕەفاتـدا بەرزبکاتەوە. موستەفا بە تورەییەوە پارچە ڕۆژنامەکانی بەسەر مێزد دادان و   گـوتی نـاجی ئەلعـەلی شـایانی کوشـتنە و زۆر پێویسـتە کوێتییـە پارێزەرەکانیشی بەپەندببرێن.

ئیسماعیل بێلایەنانە خەندەیەکی کرد. مۆساد پێشوازی لەهەر شتێک دەکرد کە پێگەی عـەڕەفات لاوازبکا. ئیسـماعیل باسـی زۆرشـتی تایبەتمەندییانـەی خـۆی کـرد، لەوانـە کـە شـاهیدێکی گونجـاوی بـۆ هاوسـەرگیرییەکەی نەدۆزیوەتـەوە. هـەر  یەکسـەر موسـتەفا خـۆی هێنایـەپێش کـە ببێتـە شـاهید.

ڕەنگبێ ئەو ساتە ئیسماعیل چاوی لەسەر ئەوە بووبێ کە لە چنگی مۆساد دەرباز ببێ.

لە تەلئەبیب ناحوم ئادمۆنی لە خۆی دەپرسی ئاخۆ چەندی دیکە بخایەنێ تا ڕاستی هەشت پاسپۆرت بەریتانییە ساختەکانی کە لە تەموزی 1986دا لە بۆن دەست پۆلیسی ئاڵمان کەوتن، بۆ MI5 ئاشکرادەبێ. گەورەی ئەو شیمۆن پێریز کە هیچ بە مۆساد کارانگازنەبوو، لە دوا مانگەکانی حکومەتە ئیئتیلافیەکەیدا پرسی وروژێنەرانەی لێدەکردن. سەرەک وەزیران لەو بڕوایەدا بوو کە نوشستییەکە پەیوەندییان لەگەڵ حکومەتی تاتچەردا تێکدەدا، بۆیە وا باشترە پاشەڵیان لەو دۆزەدا پاکبکەنەوە، ئەوەش تەواو لەگەڵ پەندێکی پێریز یەکیدەگرتەوە" هەر چەند زو بگوترێ، ئاوا زو لەبیردەکرێ لێیدەبوردرێ".

ئادمۆنی بە توندی دژی ئەو بیرۆکەیە بوو کە MI5 و پۆلیس بهێنرێتە سەر ئەو ڕایە بەدواداچوونی خۆیان بەرامبەر هەرچی مۆساد لە شانشینی یەکگرتودا دەرخستووە، بکەن. لەو بارەدا دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی ئیسماعیل کە گەنجینەیەکی زێڕینی زانیارییە، سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە ڕاستییەکانی پاسپۆرتە ساختەکانی بۆن دەربکەون و مۆساد دان بە هەڵە گەورەکەیدا بنێ.

پاسپۆرتەکان بۆ باڵوێزخانەی ئیسرائیل بوون لە بۆن. ئەرکی گەیاندنیان لە تەلئەبیبەوە بە تەتەرێکی نوێ سپاردبوو، کە هەرگیز ئەو جۆرە ئیشانەی نەکردبوون و بۆنیشی نەدیتبوو. تەتەرەکە ماوەیەکی زۆر بە شەقامەکانی بۆندا دەهات و دەچوو، نەیدەویست پرسبکا، چونکە دەترسا ببێتە مایەی تێبینی. لە دواییدا چاوە تەلەفۆنێکی سەر جادەی بەکارهێنا تا زەنگ بۆ باڵویزخانەکەی لێبدا. کارمەندێکی باڵوێزخانەکە گلەیی لێکرد کە چۆن ئاوا دواکەوتووە. لە ئەنجامی شڵەژان یان لەبەر کەمتەرخەمی خۆی جانتا پلاستیکیەکەی لە ژوری چاوە تەلەفۆنەکە دانا. کاتێک گەیشتە باڵوێزخانەکە، ئەوسا شتەکانی بەبیرهاتنەوە، لەبەر ئەوەی ترس و بیمەکەی لە چاودا

گەورەتر ببوون، لە یادی نەمابوو لە کامە شەقام تەلەفۆنەکەی کردووە. ئەنجا لەگەڵ سەرۆکی دەستەی ئاسایشپارێزانی باڵوێزخانەکە گەڕان تا شەقامەکەیان دۆزییەوە، بەڵام جانتاکە نەمابوو. تەتەرەکە بۆ نەقەب گوێزرایەوە. کێشەی پاسپۆرتەکان وەک سایە لە دوای ئادمۆنیەوە دەخشا. لە ڕێی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تەلئەبیب حکومەتی ئینگلیزی داوای ڕونکردنەوەی لە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل کرد.

یەکێک لە پاسپۆرتەکان بۆ ئیسماعیل سۆوان بوو. بە پەساپۆرتەکە ئیسماعیل دەیتوانیٚ بە ئاسانی لە نێوان لەندەن و تەلئەبیب هاتوچۆبکا. بە پاسپۆرتی بەریتانی کەمتر لە پاسپۆرتی کەنەدی لە فڕۆکەخانەی هیسرۆ Heathro دەکەوتە بەرچاوی کۆنترۆل.

لەو ماوەی کە ئیسماعیل لە لەندەن بوو، جارێکیان وەک بەشێکی ئەرکی دەمامکداری سەردانی دایک و باوکی کرد. لە چاوی ئەوان ئەو هەمیشە چالاکوانێکی PLO بوو. ئەو ڕۆڵەی وا وەستایانە وازیکرد کە برا گەورەکەی لە ترسی گرتنی ئیسرائیلییەکان ئاگاداربکاتەوە. گاڵتەجاڕیانە پێیڕاگەیاند بۆ ئەوەی خۆی لە گرتن بپارێزیٚ وا باشە سەردانی مۆساد بکا و کاریان لەگەڵدا بکا. ئیسماعیل لێڕاهاتبوو بیرۆکەکەی بە قێزەون لە قەڵەمدا پاشان گەڕایەوە لەندەن تا لەسەر ئیشەکانی خۆی بەردەوامبیٚ.

هەر زو کارەکان ئاراستەیەکی دیکەیان وەرگرت. دەزگیرانی ئیسماعیل وایلێکرد کە کاری تۆژەرەوە لە کۆلیژی Humberside لە Hull وەربگریٚ. بۆ ژنەکە واتای ئەوە بوو کە پارەکەی زیاتر دەبیٚ، چونکە دەبێتە بڕە پارەیەک لە سەروی ئەوەی لە نوسینگەیPLO ی دەستدەکەوت. لە بارەی پەیوەندی مێردەکەی بە مۆساد هیچی نەدەزانی، چ جای مانگانە شەشسەد پاوەنیەکە. بۆ ئیسماعیل گواستنەوەی بۆ Hull باش کەوتەوە، چونکە هەرهیچ نەبیٚ لە داخوازییە گەورەکانی سەرپەرشتیارە مۆسادەکەی دەربازدەبوو.

وەک هەمو بەکرێگیراوێکی لە خشتەبراوی شێکیلی(پارەی ئیسرائیلی) مۆساد، ئیسماعیلیش لە سەرکێشیەکەی دەترسا. دوای ئەوەی موستەفا بووە

گەواهیدەر بەسەر هاوسەرگیریەکەیەوە، ئەو تا دەهات دۆستانەتر ڕەفتاری دەنواند. موستەفا سەردانی ژن و مێردە تازەکەی دەکرد و دیاری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ دەهێنان. لەسەر مێز موستەفا بۆی ڕونکردەوە کە چۆن لەگەڵ دوا دوژمنی PLO جوڵاوەتەوە. ئەوەی درکاند لە ماوەی مانگێکدا چەندان ناپاکی کوشتون. ئیسماعیل بە سەرسامیەوە بەدیاری دادەنیشت و' هیوام وایە دڵم بەرزتر لێنەدا. ترسی لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ سامارا تا دەهات زیاتر دەبوو، کاتساکە داوای لێکرد دزە بکاتە نێوکۆمپیوتەری نوسینگەی PLO و بەڵگەنامە نهێنییەکانی لێیدەربهێنێ. هەروەها پێویستە لەگەڵ موستەفا پشوێک وەربگرن و بچنە قوبرس، کە لەوێ دەستە مەرگچێنەکانی مۆساد بۆی لەسەرپێدەبن. ئیسماعیل تا پێیکرا بەهانەی دەهێنانەوە: سەبارەت بە بەڵگەنامەکان گوتی کەوا هەرگیز بە تەنها لای کۆمپیوتەرەکەیان بەجێنەهێشتووە، هەرچی دەربارەی چوونیشیان بۆ قوبرس بەهانەکەی وابوو کە خوێندنەکەی زۆر قورسە و بواری پشو وەرگرتنی نییە. لە ڕاستیدا هەڕەشەی پشت داخوازییەکانی سامارای بە سەلمێنراوی وەرگرت. لە Hull هیوای وابوو کەمتر هاموشۆی لەگەڵ سامارا و موستەفادا هەبێ، بەڵکو لەوێ وازی لێبهێنن و چیدیکە نەیخەنە ژێر گوشار تا خوێندنەکەی وەک ئەکادیمییەک تەواوبکا، بەڵام لەمەیاندا بەهەڵەدا چووبوو: مۆساد پلانێکی تەواو جیاوازی بۆ دانابوو.

لە ڕۆژی هەینی 13ی مارتی 1987دا دەنگۆیەک لەبارەگای سەرەکی مۆساد لە شەقامی King Saul Boulevard بڵاوبووەوە گوایە ئادمۆنی چاوەڕوانی میوانێکی گرنگ دەکا. کەمێک پێش سعات دوانزە ئەفسەری پەیوەستی MI6 چووە ژوری بەڕێوبەری گشتی لە نهۆمی نۆهەمی بارەگاکە. دیدارەکەیان کەمی خایاند. بە ئادمۆنی گوترا کەوا MI6 لەوە دڵنیایە پاسپۆرتە ساختەکانی چاوە تەلەفۆنی بۆن دەستکردی مۆسادن. ئەفسەرێکی پۆلیسی تایبەتی ئاگادار لە پرسەکە' ڕایگەیاند کە چۆن پیاوەکە بە ئاسانی چووە لای ئادمۆنی و بەیانی باشی لێکرد و سوپاسی کوپە چا یان قاوەکەی

کـرد. پاشـان هەنـدێ نوشـتایەوە و هاتـە دەرەوە. ڕەنگبـێ خولـەکێکی پێنەچووبی بۆ گەیاندنی پەیامەکەی' .

وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانی بـانگی باڵویزخانـەی ئیسـرائیلی کـرد و بـە توندی ناڕەزایی خۆی بۆ حکومەتی ئیسرائیلی نیشاندا. ئەوەشیان گوت کە نابێ جارێکی دیکە شتێکی وا ڕوبداتەوە. تاکە شتێکی دڵنیاکەرەوە بۆ مۆساد ئەوەبوو کە کەس هیچ قسەی لەسەر ئیسماعیل نەکرد.

لە ئێوارەیەکی زوی 22ی تەموزی 1987دا ئیسماعیل لە فلاتەکەی لە Hull بەدیار بەرنامەهەواڵی تەلەفزیۆنی BBC دانیشتبوو. ئەو لـە ئەپریلـەوە کـە باشار سامارای لە وێستگەی شـەمەندەفەر دیتبو گوشارێکی زۆری خستە سـەر و پێیگـوت کـە جـارێ پەیوەنـدی پێـوە نەکاتـەوە مەگـەر موستەفا هاموشۆی کرد، هیچی لە مۆساد نەبیستبوو.

هەنوکە دەموچاوی ئەو پیاوەی کە بـە گوێرەی موستـەفا شـایانی کوشـتن بوو، کارکارتێریست ناجی ئەلعەلی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرکـەوتووە، کە لەو کاتـەی لـە نوسـینگەی ڕۆژنامـەی ئەلقەبـەس دەرچـووە دراوەتـە بـەر گوللە. تەقەکارەکە یەک گوللەی لێداوە و ڕۆیشـتووە. گوللـە لـە ڕومەتیـەوە ڕۆیشتووە و لەمێشکی چەسپیوە. یەکەمین کاردانەوەی ئیسماعیل ئەوە بـوو کـە بکوژەکـە نـە مۆسـاد و نـە هێـزی 17 یـە. هـەردو ڕێکخراوەکـە هـەمان تاکتیکی پیشەییانەیان بەکاردەهێنن کە چەندان گوللـە بسـرەوێننە کەللەسـەر. ئەو کوشتنە جێپەنجەی ئارەزومەندانە نەوەک پیشەییانەی پێوەیە. بە گوێری هەواڵی تەلەفزیۆنەکە پۆلیس بـە بـەربڵاوی دەسـتی بـە لێکۆڵینـەوەی خـۆی کردووە و هاوڕێیانی قوربانیەکەش دەڵێن کە کردەکە دەسـتی ' دوژمنێکی باڵادەست'ە کە ناجی ئەلعەلی بەو دەردە بردووە.

ئیسماعیل گفتوگۆیەکی لەگەڵ موستەفا بەبیردێتەوە. ئەو تا دەهات لەسـەر ئەوە سورتر دەبوو کە کارەکە دەستی عەرەفاتی تێدایە. لەپڕێکـەوە ئـەوەی لـەخۆ پرسـی ئـاخۆ ئـەو تـەنها کەسـێک بـوو کـە موسـتەفا پێیگوتبوو نـاجی ئەلعەلی شایانی کوشتنە. ئیسماعیل هاتە سەر ئەو دەرەنجامە کە واباشترە

لەگەڵ هاوسەرەکەی بەرەو تەلئەبیب بفڕن، بەڵام کاتێ خەریکی تێکنانی هەگبەکانیان بوون لەدەرگایان درا. ئیسماعیل ئاوای بەبیردا دێتەوە:

'پیاوەکە دو هەگبەی پێبوو. گوتی کە موستەفا گوتویەتی جارێ هەگبەکان بشارێتەوە. کاتێ ویستم بزانم چی لەنێو هەگبەکاندا هەیە، کابرا مۆڕەیەکی کرد و گوتی پێویست ناکا مشوری ئەوە بخوا. " ئەوەی هیچ پرسیار نەکا هیچ وەڵامی درۆی گوێ لێنابێ" تاکە شتێک بوو کە کابرا درکاندی. دوای ڕۆیشتنی کابرا سەیرێکی ناو هەگبەکانم کرد. هەگبەگان پڕی چەک و تەقەمەنی ماددەی سیمتێکسی وا بوون کە تەواوی تاوەری لەندەنی پێ بتەقێنرێتەوە. چەکەکانAK-47 ، تفەنگ و ئەوانی دیکەش بوون' .

ئیسماعیل زەنگی بۆ ژمارە تایبەتییەکەی مۆساد لە لەندەن لێدا. ژمارەکە داخرابوو. تەلەفۆنی بۆ باڵویزخانەی ئیسرائیلی کرد. ئاری ڕێگێڤ و یاکۆب باراد لەوێ نەبوون وەڵامیبدەنەوە. ئەنجا پەیوەندی بە ساماراوە کرد. دەنگی ئەودیوی تەلەفۆنەکە داوای لێکرد کەمێ بوەستێ. ئەنجا دەنگێکی دیکە هاتە سەر تەلەفۆنەکە. کاتێ ئیسماعیل ناوەکەی خۆی برد، دەنگەکە پێیگوت: ' ئێستا باشترین کاتی پشودانی بەرهەتاوە'. ئەو پەیڤانە بۆ لیتێگەیشتنی ئیسماعیل بەس بوون. بڕیاریدا هەر بۆ تەلئەبیب بفڕێ'

لەوێ لە میوانخانەی شیراتۆن چاوی بە یاکۆب باراد و باشار سامارا کەوت. پێیڕاگەیاندن کە هەگبەکانی کردنەوە چی کردووە. پێیانگوت دەبێ تا ڕاپۆرتی خۆیان بۆ کاربەدەستە باڵاکانیان بەرزدەکەنەوە، بوەستێ. دواتر لە ئێوارەکەیدا سامارا بە پەیامێک گەڕایەوە کە دەبێ ئیسماعیل بگەڕێتەوە لەندەن. پێیانڕاگەیاند هەر گەیشتەوە ئەوێ هەستدەکا هەموشتێک بە باشی تاوتوێکراوە.

ئیسماعیل هیچ گومانێکی نەبوو لەوەی کە چاوەڕوانی دەکرێ. کاتێک لە 4ی ئابی1987 دا گەڕایەوە لەندەن، لە فڕۆکەخانەی هیسرۆ بەشی تایبەتیی لە لایەن پۆلیسەوە گیرا و تۆمەتی کوشتنی ناجی ئەلعەلیان دایە پاڵ. کاتێکیش پێیگوتن کە بەکرێگیراوێکی مۆسادە، پێیپێکەنین. ئیسماعیل بزربوو هەروەک

چۆن کاریکارتۆنیستەکە دوای تەقە لێکردنی دو هەفتە لە نەخۆشخانە لەگیانەڵادا بوو کۆچی دوایی کرد. مۆساد ئیسماعیلی بۆ هەوڵێکی خۆچاککردن لای حکومەتی تاتچەردا کردە قۆچی قوربانی. بوونی چەک و تەقەمەنی لە ماڵەکەیدا هەر گوتنێکی ئیسماعیل بەوەی سەر بەمۆساد بووە بێهودە دەهێڵێتەوە. چەکەکانیش لە لایەن سایانمێکی تایبەتەوە گەیەنرانە ماڵی ئیسماعیل.

لە لەندەن ئاری ڕێگێڤ هەمو نیشانەکانی ئیسماعیل کە پەیوەندیان بە تیرۆررزمەوە هەبو دایە دەستی پۆلیسی Scotland . لە درێژەی فایلەکەیدا مۆساد ڕونیکردبووە کە چۆن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاورۆپا و ئینگلستاندا بە دوای ئیسماعیل گەڕاون، بەڵام تا ئێستا بەڵگەیەکی وایان دەستگیرنەبووە. کاتێکیش هەگبەی چەک و تەقەمەنی دۆزرانەوە، مۆساد بڕیاریدا ئیسماعیل لەبەر' خواستی هاوبەش بۆ ئاسایشپارێزی' بەدەستەوەبدا .

بڕیاردان لەسەر ئەوەش بۆ قانونە نەنوسراوەکەی مۆساد دەگەڕێتەوە کە بەرژەوەندی مۆساد هەمو کاتێک لەسەرەوەیە. پارە و کاتێکی زۆر لە مەشق و پێگەیاندنی ئیسماعیل خەرجکرابوو، بەڵام گەر کار هاتە سەر پاراستنی مۆساد ئەوا هەموی بەسەر یەکەوە پارە و کاتە خەرجکراوەکە هیچ ناگەیەنێ. ئیسماعیل بووە قۆچی قوربانی، ئەو پێشکەش ئینگلیزییەکان کرا کە بەردەوام مۆساد هۆشداری بۆ دەدان. مایەی نیگەرانیشە کە ئیسماعیل ئەو هەمو ئەرکەی بەجێهێناون، بەڵام هێشتا کارەکانی تەواونەکردبوون. بۆنەی هەگبە پڕ چەک و تەقەمەنییەکە کارێکی جوان بوو کردیان. بەو شێوەیە پەیوەندی نێوانPLO و حکومەتی تاتچەر تا سەرئێسقان زەرەرمەند دەکا و عەرەفاتیش بە تیرۆرستێکی دو ڕو وەک مۆساد هەمیشە بۆی دەچوو نیشان دەدا. هەمیشەش ئیسماعیلێکی دیکەی لەخشتەبراو بۆ پیاوە ئیسرائیلییەکان پەیدادەبێ.

هەفتەیک بە درێژی مۆساد هەناسی ئۆخەی بەو بڕوایەی هەڵکێشا، کە هەرچی ئیسماعیل بە لیکۆڵەرەوە بەریتانییەکان بڵێ بەلاوە بنرێ، بەڵام وەک ئادمۆنی داینابوو وا نەهاتەوە. ئیسماعیل لە زیندان هاتنە دەرەوە بێ هیوا بوو، بۆیە هەمو شتیکی بە وردی لەسەر مۆساد و ڕێنماییدەرەکان و ئاماژەکان گێڕایەوە. بەرە بەرە پۆلیسی بەریتانی باوەڕی بەوە دەکرد کە ئیسماعیل لە درکاندنەکانیدا ڕاستدەکا. ئەفسەری پەیوەندی MI6 لە تەلئەبیب بانگی وڵات کرایەوە. ئەو بەخۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئیسماعیلدا کرد. ئەوەی ئەو دەربارەی بارەگای سەرەکی مۆساد و شێوازەکانیان گوتی، لەگەڵ ئەوەی ئەفسەرەکە تەواو ڕێک بوو. بە هێواشی گەمەی مۆساد ئاشکرابوو. ڕێگێڤ و باراد و سامارا لە بەریتانیا دەرکران. باڵویزخانەی ئیسرائیلی ڕایگەیاند: ' ئێمە نیگەرانین لەوەی حکومەتی شکۆداری شاژن ئەو ڕێکارانەی گرتونەتەبەر. ئیسرائیل دژی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا نەجوڵاوەتەوە. بەرەنگاربوونەوەی تیرۆرزمان تاکە مەبەستی ئێمە بووە' .

درکاندنی راستییەکان یارمەتی ئیسماعیلیان نەدا. لە حوزەیرانی 1988دا بە تاوانی چەکهەڵگرتن لەخزمەتی تیرۆرستاندا، بە یانزە ساڵ زیندانی حوکمدرا.

پێنج ساڵ دوای دەرکردنی سێ کاتسا – کە لە ڕاستیدا هۆبەی بەریتانی مۆساد داخرا - دەزگا گەڕایەوە. لە 1998دا پێنج کاتسا لە باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە Kensigton لەگەڵ MI5 و بەشی تایبەتی پۆلیس هاوکاربوون. دوژمنی هاوبەشیان : گروپە ئێرانییەکانی شانشینی یەکگرتو بوون.

سێ ساڵ پێشتر لە دیسامبەری 1994دا ئیسماعیل لە گرتوخانەی Sutton ئازاد کرا. پاسپۆرتە ئوردنیەکەی درایەوە و بە فڕۆکەیەک بۆ عەمان فڕی. دوا شت کە لەسەر ئەو زانرابێ، ئەو فڕۆکەخانەی عەممانی بە هەگبەی مۆساد کە چەند ساڵ بۆ گەشتی لەندەنی پێدرا بوو، بەجێهێشت، بەڵام بنە دوبەرەکەی پێوە نەمابوو.

لە شانشینی هاشمی حسێندا لە شوێنێک مایەوە تا دەرفەتی تەوژمی چوونە وڵاتانی کەنداوی عەرەبی قۆزتەوە. پێش هەڵکردنی زریانی بیابانیش بەلەمی

فەرماندەیی مۆسادیش خاوێنکرایەوە: ناحوم ئادمۆنی کە هەشت ساڵ بڕیاردەربوو لە ئێوارەی ڕۆش هاشانا Rosh Hashannah سەری ساڵی نوێی جولەکەکان، لەسەر کار نەما. شاباتی شاڤیت Shabati Shavit کۆمەڵێ هەڵەی گەورەی وەک گۆبەندی پلارد و ئێرانگێت و پاسپۆرتە ساختەکان بەریتانییەکانی لە چاوەتەلەفۆنی بۆن بە میرات بۆ مانەوە. دوا هەڵەکە بۆ ئادمۆنی زۆر کوشندە بوو. بۆ جیگرەوەکەی ئوردن لە ڕەشەبای لماوی بیابان گرنگتربوو. سەددام حوسێن گەیشتبووە ئەو دەرەنجامە کە کاتی ئەوە هاتووە لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی ڕۆڵی سەرەکی بگێڕێ.

# 16
## جاسوسەکانی ناو لم

{جویێک خۆی دەکاتە بیابانشینیکی عەڕەبی عێڕاقی.. سەددام راناوەستێ، سکۆد دەهاوێژێ.. سیخوڕ سکۆدەکان دەدۆزێتەوە.. ئامریکا گوشار دەخاتە سەر ئیسڕائیل تا وەڵامی سکۆدەکان نەداتەوە.. چەند قاتی زیانی سکودەکانو پاتریۆت.. ئیسحاق شامیر هەددادانی نامێنێ.. بوش تەنگەتاو دەکرێ.. پاشان هەناسەی ئۆخەی هەڵدەکیشێ.. ئەلکەسار.. ئەبو نیزال..شتی دیکەش.. }

لە دیسێمبەری 1992دا لە بەشی هەرە خواروی بەغدا، کابرایەک جلێکی چڵکنی تۆزاوی بیابانشینەکانی لەبەربوو، بێ هەست و خوست لەبن لێواریکی وادی wadi ( نوسەر لە چاپە ئینگلیزی و هۆڵەندیەکەش هەر بەوادی نوسیوە، بۆیەمنیش هەروام نوسیوە دەنا مەبەست دۆڵە. وەرگێڕی کوردی) خۆی مات دابوو. ڕۆژ تازە هەڵاتبوو، لمی بیابابەنەکە وەک بەفر تەزی بوو وابوو، شەوی ڕابردوو پلەی گەرما بۆ دەوروبەری پلەی بەستن دابەزیبوو. سەری کابرا بە تۆپەڵە خوریەکی هوپتا hupta بەسترا بوو کە کڵاوێک بوو کابرای وەک ئەندامێکی تیرەی سارامی sarami پێدەناسرایەوە، ئەوانیش کۆنترین دەستەی سۆفیزمی بوون لە نێو ئیسلامدا، کە ژیانێکی ڕەوەندانەیان لە بیابانی عێڕاقدا بەسەردەبرد و لە هەمو دەستەکانی دیکەدا ئۆلدارتر بوون، بەڵام هۆزی کابرای ڕوخسار بیابانی ڕەوەند بدون ( bedoeien) نزیکەی هەزار کیلۆمەتر بە ئاراستەی خۆرئاواوە دوور بوو، ئەویش ئیسرائیل بوو.

پۆشاکی کاتساکە لە کۆگای مۆسادەوە هاتبوو کە جلوبەرگی هەمو دەستە و تیرەکانی جیهانی تێدا کۆ کرابووەوە. بەردوام کۆگاکە بەسەردەکرایەوە و کەلێنەکانی پڕدەکرانەوە. بە زۆری جلەکان لە لایەن سایانمەکان کۆدەکرانەوە

و دەدرانە باڵوێزخانەی ئیسرائیل و ئەویش بە پۆستی دیپلۆماسیانە ڕەوانەی تەلئەبیبی دەکردن. ئەوانی دیکەش لە لایەن هەوادارانی ئیسرائیلەوە کە سەردانی وڵاتانی دوژمنەکانیان دەکردن بە دیاری بۆ ئیسرائیل دەهێندران. هەندێکیشیان هەر لەوێ لە ڕێی بەرگدروە تایبەتمەندەکان دەدروان. بەپێی تێپەڕینی ساڵان ئەو دەستە بچوکەی بەرگدروان شارەزایی و ناو و ڕومەتێکی زۆر باشی پەیدا کرد، کە لە پسپۆڕێتییەکەیان وا وردبووبوون دەیانزانی چ جۆرە قوماش و ڕەنگێک بۆ دروستکردنی جل و بەرگەکان دیاریبکەن.

نازناوی کاتساکە شالۆم Shalom بوو، ئەویش بەشێک بوو لە زنجیرە نازناوی بەشی ئۆپەراسیۆنەکان کە بۆ چالاکیەکانیان بەکاردەهێنان. ڕافی ئیتان ئەو بیرۆکەیەی دوای ڕفاندنی ئایخمان ڕۆنا. شالۆم وایس Shalom weiss یەکێ بوو لە باشترین ساختەکارەکانی مۆساد، پێش ئەوەی بچێتە نێوڕیزی دەستەی ڕفێنەرانی ئایخمان. ئەو لە ساڵی1963دا بە نەخۆشی سندان کۆچی دوایی کرد، بەڵام ناوی هەر مایەوە و چەندان جار ناوی لە لایەن کاتساکانەوە وەک نازناو بەکاردەهات. تەنها گەورە ئەفسەرەکان، شاباتی شاڤیت و هۆبەی شالۆم خۆی دەیانزانی ئاخۆ ئەو بۆچی ئێستا لە نێو لمی بیابانەکەدایە.

لە ئابی 1990دا سەدام حوسێن کوێتی داگیرکرد، دەستدرێژییەکە بووە مایەی شەڕی کەنداو. ئەو پەلاماردانەی عێراق بۆ هەمو دەزگا زانیارییەکانی ڕۆژئاوا مایەی سەرسوڕمان بوو، چونکە هیچیان چاوەڕوانیان نەدەکرد ئاخۆ لە ئایندەدا چی ڕودەدا. مۆساد لە تەقەللای ئەوەدا بوو کە ئەو ڕاپۆرتانە پشتڕاستبکاتەوە، گوایە سەددام چەکی کیمیایی و باکتریایی لە خواروی بەغدا حەشارداوە، ئەوەش نەوەک هەر بایی هێرشکردنە سەر کوێت، بەڵکو بەشی بۆمبارانکردنی شارەکانی ئیسرائیلیش دەکا.

لە نێو مۆساد دا ئەو پرسە گومانی لەسەر بوو، ئایا عێراق بە ڕاستی ئەو ڕۆکێتانەی هەن و دەتوانێ کڵاوە ڕۆکێتە ترسناکەکانی لەسەر دابنێ و

بیهاوێژێ. جیرالد بول Gerald Bull داهێنەری تۆپە زەبەللاحەکە لە نێوبردراوە و تۆپەکەشی دوای تاقیکردنەوە هەپرون بە هەپرون بوو، بێگومان ئەوەش بە گوێرەی وێنەی سەتەلایتەکانی ئامریکا. توێژەرەوەکانی شاڤیت لەسەر ئەو ڕایە بوون، گەر بێتو سەددامیش کڵاوەڕۆکێتەکانی هەبێ، بەڵام دڵنیا نەبوون لەوەی ئاخۆ لە کۆگاکەیاندا بایی ئەوەندە چەکی بایەلۆژی و کیمیاویان هەبێ. زەلامەکە(مەبەست سەددامە- وەرگێڕی کوردی) زۆر جاران فشەی دەکرد.

شاڤاتی شاڤیت مەیلی بەلای لێوردبوونەوەچوو، بەرپرسانە دەریبڕی کەوا بەدواداچوون لەو بوارەدا گرنگە نەوەک هۆشدارییەکی پێشکات کە دەبێتە مایەی زێدە تۆقین. ڕێگە بە شالۆم درا بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێ. ئەو چەند جارێک ئۆپەراسیۆنی لە عێراقدا بە سەرکەوتوویی ئەنجامداون. بەو شێوەیە جارێکیان وەک بزنسمانێکی ئوردنی ڕویکردە بەغدا، بەڵام لەوێ پشتی بە کۆمەکی سایانمەکان قایم بوو، بەڵام ئەم جارەیان و لێرە لەو دەشتە بیابانە کاکی بە کاکییە ساردوسڕەدا، تەنهایە و دەبێ بە تەواوی پشت بەخۆی ببەستێ، بەڵام دەکرێ ڕێنمایی ڕێنماییدەرەکانی لەبەرچاو بگرێ، لەسەر ڕێنماییەکانیش جار لەسەر جار تاقیکراوەتەوە.

بەم جۆرە شالۆم لە بیابانی نەقەبدا مەشقەخولێکی گرانی دەربازبوونانەی دیت، لەوێ خولی 'وەرزشی مێشکی' بە شێوەیەک دی، تەنانەت لە نێو گەردەلولی لماویشدا بتوانێت ئامانج بناسێتەوە. هەروەها مەشقی خۆپارێزی وا درا کە بتوانێ لەگەڵ ژینگەی دەوروبەریدا هەڵبکا. هەر بۆ تێرکردنی مەبەستی خۆڕاهێنانەکەی شەو و ڕۆژ بەرگی ڕەوەندێتی لەبەردا بوو، تاکو تەواو خویان پێوەبگرێ. هەمو ڕۆژەکە بە مەشقی تەقەکردنی بەسەربرد تا بتوانێ هەمو لایەنەکانی گڕدان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و لە شەڕی دەستەویەخەشدا لە ڕوبەرێکی نزیکدا دەستی خۆی بوەشێنێ و نیشانەکانی بپێکێ و دەربازیش ببێ. سعاتێکیش وانەی لای دەرمانسازێک خوێند تاکو لە کاتی پێویست و ناچاریدا لە بیابان، دەرمانی گونجاو بەکاربهێنێ. بەیانییەکی

ڕەبەقیش بەوانە وەرگرتنی چۆنیەتی فێربوون و لەبەرکردنی نەخشەی تەرخانکرد، تا بتوانێ ڕێگای خۆی لە بیاباندا بدۆزێتەوە.

هەمو ڕێنماییدەرەکان ئەویان لەژێر یەک نمرەدا دەناسی. هیچ کامیان بە وشەیەکیش نەیان پەسنی، نەدەبوایە بەهیچ شێوەیەک وا لە شالۆم بکەن کە چۆن بۆ ئەو ئەرکە ئامادەکراوە، ئەوان ڕۆبۆتئاسا ڕەفتاریان دەنواند. دانەیەکی هەمو ڕۆژێک بۆ تاقیکردنەوەی توانستی ڕەفتارکردنی تەرخاندەکرا وەک ڕێڕۆیشتنێکی دور بەخۆی کۆڵەپشتێکی پڕ لە بەرد لە چرقەی نیوەڕۆیەکی پڕهەتاودا. هەرچەندە لە کاتەکانی خۆیدا دەگەیشت، بەڵام هەرگیز وای پێنەدەگوترا. تاقیکردنەوەیەکی دیکەی بریتی بوو لە تاکتیکێک بەوەی لە مەشقەکەی دەریبهێنن چەند پرسێکی لێبکەن: " گەر هاتو لە بیاباندا منداڵیکی ڕەوەند تۆی بەدیکرد، چی دەکەی، ئایا دەیکوژی تاکو ئەرکەکەت دەگەیەنێتەسەر؟ یاخود تۆ لەسەر خاڵی وەرچەرخانی ئەوەی کە بگیرێ. ئایا چی دەکەی خۆت بەدەستەوە دەدەی یان ژار دەخۆیتەوە؟ یان : " تۆ لەسەر ڕێی جێبەجێکردنی ئەرکەکەت دای، توشی سەربازێکی بریندای ئیسرائیلی دەبی کە بۆ ئەرکێکی دیکە ڕاسپێردراوە، ئایا لەو هەلومەرجەدا یارمەتیدەدەی یان بەجێیدیڵی، ئەوەش دەزانی گەر بەجێیبهێڵی لەوانەیە بمرێ. بەرسڤەکانی شالۆم وەک بڕیاری کۆتایی وەرنەدەگیران، پرسەکان بۆ ئەوەبوون کە توانستی بڕیاردان لەژێر گوشاری سەختەوە تاقیبکەنەوە. ئایا چەندی دەخایاند تا کاردانەوەی دەبوو؟ ئایا ئەو لە وەڵامدا لە شەرم دەچووەوە، یان لەهەمو بڕیارەکانیدا دڵنیا بوو؟

شالۆم تەنها ئەو خواردنانەی دەخواردن کە کەسێکی بیاباننشین پێیاندەژیا : خواردەمەنیەکی چڕکراو تێکەڵ لەگەڵ ئاوی شیرین ئەوەی لە هەندێ شوێنی بیابان بەکاردەهێنرا. دەروونناسێکی مۆساد ڕۆژێکی ڕەبەق شالۆمی فێری ئەوەکرد، چۆن لە باری ناهەمواردا ڕکێفی خۆی لەدەستنەدا و نەپەشۆکێ.

دەروونناسەکە دەبوایە لەوە دڵنیا بوایە ئاخۆ شالۆم دەتوانێ لەو ژینگەیەدا تەواو لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێ و بڕیاری ئازادانەی تێکەڵ لە بێبەزەیی و

چاوەڕواننەکراودا بدا. تاقیکردنەوەی دیکە سەبارەت بە جێگیری و سۆزو بڕوا بەخۆکردن بوون. هەموی بەسەریەکەوە تەواوی لایەنەکانی هەڵسەنگێنران تاکو بزانرێ ئاخۆ ئەو ئادگارە خۆییانەی ئەرک بەجێهینانی تێدا هەن.

دوای ئەوە بە چەندان سعات لەگەڵ زمانزانێک خەریکی خۆڕاهێنان بوو لەسەر مەشقی زمان و چۆنیەتی گۆکردن تا وەک سۆفیەک بپەیڤێ. لەبەر ئەوەی شالۆم زمانی عەرەبی و فارسی بە تەواوی دەزانی، هەر زوش شێوەزاری هۆزەکەی بیابانی خستەژێر ڕکێفەوە. هەمو ئێوارەیەک دەیانبردە بەشێکی بیابانی نەقەب تاکو شەوی تێدابکاتەوە. بەشێکی زۆری شەوی لە نێو لمدا بەسەردەبرد، تەنها کورتەماوەیەکی پشوی هەبوو، ئەویش بێ ئەوەی قوڵی خەوی لێبکەوێ هەڵدەستا نەوەک مەشقپێدەران بیگەنەسەر و ڕەوانەی شوێنیکی دیکەی بکەن، ئەوان بەردەوام وەک ڕاوکەر ڕاویاندەنا و ئەویش لە دەستیان دەرباز دەبوو. دۆزینەوەی لە کاتی ڕاوکردنەکەدا واتای دواخستنی ئەرکەکەیان دەگەیاند و مەشقی درێژخایەنتری یاخود ئەرکەکەیان بە کاتسایەکی دیکە دەسپارد.

شالۆم لە ڕاوەدونانەکاندا دەربازدەبوو. لە شەوی 25ی نۆڤێمبەری 1990دا سواری هێلیکۆپتەری سیکۆرسکی Sikorsky جۆری CH-536 مەڵبەندی سەرکردایەتیی هێزی بەرگری ئیسرائیلی کرا. هەروەها دەستەی کۆپتەرەکەش بۆ هەمان ئەرک مەشق درابوون. لە بەشێکی دیکەی بیابانی نەقەب بە شەوی نوتەک مەشقیان لەسەر فڕینی نزم بەسەر کۆسپەکاندا دەکرد. بە یارمەتی دوو تۆربینی با کۆپتەرەکە دەیتوانی لە نێو لم و باوبۆراندا لە بیابانی ڕۆژئاوای عێراقدا بفڕێ و کاری خۆی بکا. لە کاتی فڕینەکەیاندا دەبوایە ئەوەندە نزم بفڕن هەر ئەوەتە خۆیان بە زەویدا نەدەن. لە مەشقی دیکەدا ڕێنماییدەرەکان خۆیان لە شوێنی فڕینەکەدا جێگیرکردبوو لولەی تفەنگەکانیشیان بەرەو ڕوی ئامانج کردبوو، ئەوەش لەو کاتەدا کە فڕۆکەوانەکە هەوڵبدا تا بۆی بکرێ خۆی و فڕۆکەکەی لە ئاسمان بە بێدەنگی

هەڵبواسێ. لە هەمو لایەکەوە دەستەی کۆپتەرەکە بە دورودرێژی لە نەخشەی فڕینەکەیان کۆڵیەوە.
تەنها ئەفسەرە فەرماندەکەیان ژەنەڕاڵی یاریدەدەر دانی یاتوم danny Yatom بەو ڕێگەیەی دەزانی کە دەبوایە کۆپتەرەکە پیایدا بەرەو سنوری عێراق بفڕیبایە. یاتوم لەو یەکە کۆماندۆیەی سەیارەت ماکتال seyaeret Maktalی خاوەن کڵاو کەسکەکانی ئیسرائیلی بوو کە لە1972دا بە سەرکەوتویی پەلاماری فڕۆکەیەکی سەرنشینهەڵگری ڕفێنراوی بەلژیکیان لە فڕۆکەخانەی تەلئەبیب دا. لەو یەکە کۆماندۆیەدا بنیامین ناتانیاهۆش پشکی هەبوو. دۆستایەتیی یاتۆم لەگەڵ سەرەک وەزیرانی ئایندە بووە مایەی ئەوەی کە سەرکردایەتیی مۆسادی بکەوێتە دەست، پێگەیەکیش بوو کە کۆتایی بە دۆستایەتیەکەیان هێنا. ئەوەش هەموی لە ژێر باڵی ئایندەدا شاردرا بووەوە.
ئەو سپێدەیەی دیسێمبەرەی 1990 لەو کاتەی شالۆم لە لێوارەکانی وادیدا شۆڕدەبووە و ئاگای لەوە نەبوو گەشتە ترسناکە دورودرێژەکەی بە هەرێمی دوژمندا لەسەر بڕیاڕی ژوری کۆبوونەوەکانی کیریاKiryaی بارەگای سەرەکی هێزی بەرگری ئیسرائیلی لەتەلئەبیبەوە بوو. لەپاڵ ژەنەڕاڵی یاریدەدەر یاتۆم لە گفتوگۆکاندا هەریەک لە ئامۆن شاهاک Amon Shahak فەرماندەی ئامان و شاڤاتی شاڤیت بەشداربوون. ئەوەش لە دەرەنجامی زانیارییەکی تازە کە لە نێو هەواڵدەرێک هات،کە دزەی کردبووە ناو تۆڕە تیرۆرستەکانی ئێران لە ئاوروپادا. ئەو کەسەش تەنها شاڤیتی شاڤات دەیزانی پیاوە یان ژن، هەربە پیتی (ی 'I' )ش ئاماژەیان بۆ دەکرد. تاکە شتێک کە شاهاک و یاتۆم لە زانیارییەکەیان هەڵکڕاند ئەوەبوو کە هەواڵدەرەکە دەبێ منداڵێک بێ و لە باڵەخانە پڕ ئاسایشەکەی سێهەمین نهۆمی باڵوێزخانەی ئیران لە بۆنی ئاڵمانی ڕۆژئاوادا بێ. باڵەخانەکە لە شەش نوسینگە و ژورێکی پەیوەستی پێکهاتبوو. باڵەخانەکە وا تەیارکرابوو کە دژەپەلاماری بۆمب تەقاندنەوە بوو. باڵەخانەکە بە بەردەوامی لە لایەن بیست

کەس لە پاسدارانی شۆڕشی ئێران پاسەوانی دەکرا. سەرەڕای کاری پاسەوانێتیان ئەرکی ڕێکخستنی کردەی تیرۆرستی ئێرانیان لە ئاوروپای ڕۆژئاوا لە ئەستۆدا بوو. ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا هەوڵیاندا یەک تەن لە ماددەی سێمتێکس Semtex لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە چەشن لە لوبنانەوە بۆ ئیسپانیا ئاودیو بکەن. بارەکە بۆ هەندێ تاقمی تیرۆرستی هەواداری ئێران لە ئاوڕوپادا بوو. بەپێی هەواڵپێدانیکی مۆساد کاتێ بەلەمەکە گەیشتە هەرێمی ئاوی سپانیا گومرگی سپانیا دەستی بەسەرداگرت.

لە هاوینی 1990دا لە ڕێگەی باڵوێزخانەی ئێران لە بۆن کۆمەکێکی زۆری دارایی بە مەبەستی باسک ئەستوربوونی تیرۆرستانی ئێرانی و فەندەمەنتالیزمی ئیسلامی ڕەوانەی ئاوڕوپا کرا. ئەو پشتگیریە داراییە لەچاو ساڵی 1988و ئاگربەستی نێوان عێراق و ئێراندا کە بەهۆیەوە ئێران دادۆشرا بوو، مایەی تێبینی و لەبەرچاو بوو.

ئەوەی لەو ڕۆژەی نۆڤێمبەردا لە ژوری کۆبونەوە پاسەوان چڕەکەدا قسەی لەسەردا کرا، مەترسی نوێی لایەنی ئێرانی نەبوو کە هەواڵەکە پەردەی لەسەر هەڵماڵیبوو. ئەم جارەیان هەڕەشەکە لە عێڕاقەوە بوو. (ی) هەواڵدەر دەستی بەسەر دانەیەک لە ڕاپۆرتێکی پڕ وردەکاری سەبارەت بە نەخشەی جەنگی ڕاگەیشتبوو کە دەزگای نهێنیی ئێرانی توانیبوویان لە بارەگای سەرەکی هێزە چەکدارەکانی عێڕاق لە بەغداوە بیدزن. لە نەخشەکەدا هاتبوو کە ڕۆکێتەکانی سکود Scud بۆ هەڵدانی چەکی کیمیاوی و بایەلۆژی دژی ئێران و کوێت و ئیسرائیل بەکاردەهێنرێن.

ئەوەی کەڵکەڵەی سەری سێ کەسەکەی نێو ژوری کۆبوونەوەکانی دنەدەدا، پرسێک بوو تۆ بڵێی زانیارییەکە جێی باوەڕ بێ؟ تائێستا (ی) هەر هەواڵ و زانیاری باوەڕپێکراوی داوەتەدەست، بەڵام هەرچەندە زانیارییەکان گرنگ بووبن، بەرامبەر زانیاری ئەم جارەی (ی) پڕ هەژمون نەبووە. تۆ بڵێی ئەو 'نەخشەی جەنگە' هەوڵێکی فێڵبازانەی ئێران نەبێ، بەڵکو ئیسرائیل زەبرێکی

گورچکبڕی ئەتۆمی لە عێراق بدا؟ ئایا دەمامک لەسەر (ی) هەڵدراوەتەوە و ئیدی ئەو لە لایەن ئێرانەوە بەکاردەهێندرێ؟

هەر هەوڵێک بۆ بەرسڤدانەوەی پرسەکە مەترسی خۆی تێدایە. کاتیشی دەوێ تا کاتسا پەیوەندی بە(ی)ەوە بکا. تا ئەو پەیوەندییە دروستدەبێ رەنگبێ چەندان هەفتەی پێ بچێ، ڕاستەوخۆش پەیوەندیکردن بە هەواڵدەرێکی دەمامکداری وا کات و دەرفەتی خۆی دەوێ. گەر هاتو دەرکەوت هێشتا (ی) هەر دڵسۆزە ئەوا ئاسایشپارێزیەکەی دەکەوێتەبەر مەترسی. لەسەرێکی دیکەشەوە بڕیارێکی ئیسرائیلی لەسەر بەڵگەنامەیەکی وا بێ دڵنیا بوون لێی دژی عێڕاق کارەسات ئامێز دەبێ. یەکەمین پەلاماری تێکدەرانە بۆسەر عێراق بێگومان تۆڵەی بەدوادائ. ئەوەش دەبێتە هەرەسپێهێنانی ئەو هاوپەیمانییەی کە ئامریکا بە ئاستەم دژی عێڕاقی پێکەوەناوە، تاکو لە کوێتی دەرپەڕێنێ. زۆر لەو ئەندامە عەرەبیانەی هاوپەیمانێتییە لایەنی عێڕاق دژی ئیسرائیل دەگرن.

تاکە ڕێگای بەدوا ڕاستیگەڕانی نەخشەی جەنگە دزراوەکە ئەوە بوو، شالۆم بنێردرێتە عێڕاق. ئیدی کۆپتەرەکە لە تاریکی نوتەکەچاوی شەودا بەسەر هەرێمی ئوردن بەرەو بیابانی عێڕاق فڕی. بەهۆی بۆیەی تایبەتی stealth و ماتۆڕێکی زێدەی بێدەنگ، کۆپتەری سیکۆرسکی بێئەوەی نوێترین ئامێری ڕاداری ئوردنی بیدۆزێتەوە، فڕی. کۆپتەرەکە بە کەمدەنگی خۆی و باڵەکانی گەیشتە شوێنی نیشتنەوەی لەسەر سنوری عێراق.

لە تاریکەشەودا شالۆم لە فڕۆکەکە دابەزی و لەبەرچاوان ونبوو. لەگەڵ ئەو هەمو مەشقەی پێیدرابوو، هێشتا بۆ ئەو ساتەی تەواو تەیارنەکرابوو: لێرە دەبوایە تەنها و تەنها هەر بەخۆی بوایە. گەر بیەوێ لە ژیاندا بمێنێتەوە دەبێ ڕێز لە ژینگەی دەوروبەری بگرێ. لە هیچ شوێنێک وەک بیابان زیاتر توشی شتی کتوپڕ و چاوەڕواننەکراو نابێ. ڕەنگبێ لەپڕێکەوە گەردەلولێکی لماوی هەڵبکا و دیمەنەکان بە تەواوی بگۆڕێن و بشبێتە گۆڕێک بۆی. بایەکی سنوردار لەسەر بیابان واتایەکی دەقاودەقی خۆی دەگەیەنێ، بای دیکە واتای

شتی دیكە دەگەیەنێ. ئەو دەبێ بەخۆی ڕۆڵی پیاوێكی كەشناس ببینێ. لە ڕاستیدا دەبێ هەموشتێك هەر بەخۆی بكا. دەبێ گوێیەكانی لە بێدەنگی بیابان ڕابینێ، لە ڕاستیشدا بێدەنگی بیابان لەگەڵ هیچ شتێكی دیكە بەراورد ناكرێ. هەروەها دەبووایە ئەوەی لەبەرچاو بووایە كە یەكەمین هەڵەی دەبووە دوا هەڵەی ژیانیە وسەری تێدادەچوو.

ئەوە سێ ڕۆژە كۆپتەرەكە شالۆمی لە بیابان فڕێداوە. هەنوكە شالۆم لەسەر لێوارەی وادیە ساردوسڕەكەی عێراقە. لەبن كڵاوە هوپتاكەی دوربینێكی هەڵگرتبوو بەهۆیەوە ڕوبەرە تاریكییە دورەكەی بیابانی وەك تارمایی دەدی. تاكە چەكێكی بریتی بوو لە كێردێكی ڕاو، كە خەڵكانی سارامی بە هێواشی دەیانخستە بەر كەمەریان. فێری ئەوە ببوو كە چۆن چەقۆكەی كارایانە بەكاربهێنێ، بەڵام ئایا ئەوەی دێتەپێش كە كێردەكەی دژی یەكێكی لە خۆی باڵادەستر بەكاربهێنی، یاخود ئاراستەی خۆی دەكاتەوە. هەروەها دەكرا حەبە ژاراویەكەش بەكاربهێنی كە بۆیان دانابوو. لەو كاتەی كە ئالی كۆهن Eli Kohn ئەشكەنجەدرا و كوژرا، لە هەریەكێك ئێران و عێراق و یەمەن یان سوریادا وەك كاتسا كاری كردبا، مافی ئەوەی هەبوو پێش ئەوەی بگیرێ و بكەوێتە دەست دوژمنەكانی بۆ ئەوەی لەژێر ئەشكەنجەدا نەكوژرێ خۆی كۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێ. شالۆم دەیزانی كە جارێ لە چاوەڕوانكردن زیاتر هیچی دیكەی لە مستنایەت.

ڕەوەندەكان لەخێوەتگای خۆیاندا بە دورایی یەك كیلۆمەتر لەوبەری وادیەكە، تازەبەیانی ڕۆژێكی نوێیان دەستپێكردبوو. هەنوكە سەگەكانیان دەستیان بەوەڕین كرد و بایەكەش دەنگیدەهێنا، بەڵام سەگەكان پێش ئەوەی ڕۆژ نەگاتە تاقی ئاسمان ناوێرن لە خێوەتگاكەیان دوربكەونەوە، شالۆمیش ئەوە یەكەمین وانەی بوو تاكو لە بیاباندا بتوانێ هەڵبكا.

بەپێی زانیارییەكان دەبوایە كاروانی ئۆتۆمبێلەكان لە نێوان خێوەتگای ڕەوەندەكان و گردەكانی لای چەپیان بەدەربكەون. بۆ كەسێك كە مەشقی لەسەر نەكردبێ سۆراخی ئەوانی بۆ بەدیارنەدەكەوت. بۆ شالۆم ئەوە ڕون و

ئاشکرا بوو کە وەک ڕێگایەکی خێرای ئۆتۆمۆبێلی تابلۆدار بە تابلۆی ئاماژەدار بە ئاراستە دیار بوون: ئەو دۆمەڵانەی سەر لمەکە نیشانەی کاری هەڵکەندن بوو لەبیاباندا.

لمەکە بەرز دیار بوو کاتێ لە کۆتاییدا کاروانەکە کەوتە بەرچاوان: " ماشێنی گەڕۆکی سکودهەڵدان، لەگەڵ ماشێنێکی دیکەی هاوکار، ئۆتۆمبێلەکان لە ڕووبەری یەک کیلۆمەتر لە شالۆمەوە دور بوون. شالۆم وێنەی هەرچییەکی دیت، بەدەستنیشانکردنی کاتەکانیشەوە گرت .

هەڵدانی ڕۆکێتی سکود تەنها چارەکێکی خایاند. ڕۆکێتەکە وەک کەوانەیەک چووەئاسمان و ئەنجا لەئاسۆدا ونبوو. دوای یەک دو خولەکێک کاروانەکە بە خێراییەکی زۆرەوە بەرەو گردەکان ڕۆیشتەوە. گەر ئەو ڕۆکیت هەڵدانە بۆ مەشق نەبێ ئەوا لە ماوەی چەند خولەکێکدا لە تەلئەبیب یان لە شارێکی دیکەی ئیسرائیلیدا دەکەوێتەخوارەوە. شالۆم دەستی بە گەشتە دورو درێژەکەی گەڕانەوەی بۆ تەلئەبیب کرد.

شەش هەفتە دواتر لە یانیوەری 1991دا شالۆم لەگەڵ تیمی زانیاری مۆساد و ئامان لەسەر مێزی کۆبوونەوەی فەرماندەیی هاوبەشی ئۆپەراسیۆنی تایبەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا United States Joint Special Operation Command(JSOC) لە بنکەی فڕۆکەخانەی Pope لە جۆرجیا دانیشتبوو. JSOC فەرماندەیی کلاو کەسک وSeals ی دەکرد و پەیوەندی هاوکاری توندوتۆڵیشی لەگەڵ مۆساد دا هەبوو.

دوای گەڕانەوەی شالۆم لەعێراق ساڤیت بە ژەنەڕاڵ ئێرل ستینەر Earl Stinerی فەرماندەی JSOC ڕاگەیاند کە سەدام زیاتری لە باردایە لەوەی هەر تەنها فشەفش بێ. ژەنەڕاڵی کەڵەگەت و چوارشانە شێوازێکی بوێرانە و زمانێکی گرژی هەبوو کە بە دڵی ئیسرائیلییەکان بوو، بەڵام لە مەڵبەندی ئۆپەراسیۆنەکەدا زاراوە تەکساسیە نافەرمییەکەی بە زمانێکی لیتێگەیشتوانەی سەلمێینراو گۆڕی. وەک ئەفسەرێکی بەرزی کۆماندۆی ولاتە

یەککگرتووەکانی ئامریکا  بەهای زانیاریی باش دەزانی، ئەزمونی تایبەتی خۆشی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هێنابوویە سەر ئەو بڕوایە کە مۆساد باشترین زانیاریی لە لایە.

دوای ئەوەی سەددام کوێتی داگیرکرد، ستینەر بەردوام پەیوەندی بە ئیسرائیلییەکانەوە هەبوو. هەندێک لەو پەیوەندییانە دەگەڕانەوە بۆ 1983، کاتێ وەک ژەنەڕاڵی یاریدەدەر لە لایەن پنتاگۆنەوە بەنهێنی نێردرابووە بەیروت تا ڕاستەوخۆ ڕاپۆرت بۆ سەرکردایەتیی هاوبەشی هێزی ئامریکا لەسەر ئەوە بنێرێ، ئاخۆ تا چەند دەکرێ ئامریکا خۆی لە شەڕی نێوەخۆی لوبناندا هەڵبقورتێنێ.

دواتر لەکاتی رفاندنی Achille lauro هاوکاری توندوتۆڵی لەگەڵ مۆساد کرد.  بە فەرماندەیی هێزی دەلتا Delta Force لە بنکەیەکی هێزی ئاسمانیی ئیتالی لە سیسیلیە cicillie دابەزی، لەوێ ڕفێنەرەکان لە میسرەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەیانگواستەوە. ئیتالییەکان بوونە کۆسپ لەوەی ستینەر ڕفێنەرەکان بگرێ.  ئەوەش لای ستینەر قەیدی نەبوو کە لە ئۆپەراسیۆنەکەدا تەقە بکرێ.  ستینەری بێئۆمێدکراو لە فڕۆکە بارهەڵگرە سەربازییەکەی خۆی فڕۆکەی  سەرنشینە ڕفێنراوەکە ڕاونابوو، ئەو لەو کاتەدا دەستی لە ڕاوەدونان هەڵگرت کە هەر دو فڕۆکەکە کەوتنەسەر ئاسمانی ڕۆما و هێزی ئاسمانیی ئیتاڵیایش هۆشداریاندایە فڕۆکەی ستێنەر، بەوەی گەربێتو لە ڕاوەدونانەکەی وازنەهێنێ ئەوا  دەیخەنە خوارەوە، چونکە ئەوەی دەیکا لەچاو ئیتاڵییەکان چەتەگەرییەکی ئاسمانییە. لەو کاتەدا ستێنەر فەرماندەی هێزەکانی زەمینی بوو، بۆیە بەرپرسیاربوو لە هەرچی زو گرتنی مانویل نۆریگاManuel Noriega .

بێ دودڵی سەرۆکی گشتیی هێزە چەکدارەکان ژەنەڕال کۆلین پاول و سەرکردەی  هێزە هاوپەیمانەکان ژەنەرال شوارتزکۆف لە پەیوەندی ستینەر بە مۆسادەوە ئاگاداربوون. لەو کاتەی شوارتزکۆف لەسەر سنوری عێراق – عەرەبستانی سعودی سەرگەرمی دانانی هێڵێکی بەرگری بوو، تاکو هەر

هێرشێکی عێراق لە کوێتەوە بەرپەچبدرێتەوە، هەواڵگری ستینەر بە چڕی لەگەڵ مۆساد خەریکی پێکهێنانی دەستەی بەرگری دژی سەددام بوون بۆ ڕوخاندنی.

کاتێک ژەنەڕاڵی یاریدەدەر Wayne Downing فەرماندەی JSOC لە دوانزەی یانیوەری 1991دا کۆبوونەوەی دەکرد، هەمو دەیانزانی کە تەنها سێ ڕۆژ ماوە وادەی هۆشدارینامەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ سەددام تا لە کوێت بکشێتەوە کۆتاییبێ. دەبووایە عێراق پێش 15ی یانیوەری بکشابایەوە. ئاگادارینامەی جیهان لە بەغدا بەر گوێی کەڕکەوت. سەددام لەسەر بانگەوازەکەی بەردەوامبوو کە شادمانە بەشەڕی چەکداری ئایندە و ناویشی لێنابوو' دایکی هەمو شەڕان'.

ژەنەڕال Downing بەبیر ئامادەبووانی هێنایەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا هێشتا لە ئیسرائیلی دەوێ خۆی لەوشەڕە بەدوربگرێ. ئەو خۆبەدورگرتنەی بەپشتگیری درێژخایەنی سیاسی و ئابوری پاداشت دەدرێتەوە.

یەکەمین کاردانەوەی ئیسرائیل، وێنە گەورە کراوەکانی شالۆمی خستنە سەرمێز بوو. دواتر پرسی خۆیان کردن. وادابنێ کە سکۆدەکان کڵاوەی ناوەکییان هەڵگرتبوو، ئایا چی دەبێ؟ مۆساد لەوە ئارخاین بوو کە عێراق هەمو ئەو توانایەی هەیە کە چەکێکی بەرایی ناوەکیی دروستبکا، بێجگە لەوەش ئەو توانایەی هەبوو کە سکۆدەکانی بەسەری چەکی بایەلۆژی و کیمیاییەوە هەڵبدا. ئایا دەبێ ئیسرائیل تا ئەوە ڕودەدا، دەستەوەستان دابنیشێ؟ ئایا ئامریکییەکان بیرۆکەیەکی تایبەتی خۆیان سەبارەت بە ژمارەی سکۆدەکان هەیە؟

یەکێ لە ئەفسەرە هەواڵگرەکانی Downing گوتی کەوا بە گوێرەی مەزندەکانی ئەو، سکۆدەکانی عێراق ژمارەیان لە پەنجا دانە تێناپەڕێ. شاباتی شاڤیتیش گوتی ' بە گوێرەی ئێمە سەددام پێنج ئەوەندە، ڕەنگبێ سەرجەم پێنجسەد دانەی هەبێ'.

بێدەنگییە سەرسوڕهێنەرەکەی هۆڵە بچوکەکە بە پرسێکی دۆونینگ شکا: ئایا ئەو دەتوانی شوێنەکان دەستنیشانبکا؟ ساڤاتی لەوە زیاتر نەیتوانی وەڵامبداتەوە، پێدەچێ سکودەکان لە ڕۆژئاوای عێراق لە بیابان و لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکە دانرابن. ئامریکاییەکان لەگەڵ دۆونینگ کۆکبوون کە عێراقییەکان ' بیابانیکی زۆریان هەیە تا ئەو جۆرە شتانەی لێ حەشاربدەن'. ئەنجا شاڤیت کە نەیویست بیئومێدییەکەی بشارێتەوە گوتی ' هەرچەند زوتر ئێوە تێکوپێکیانبشکێنن، باشترە' .

داونینگ بەڵێنیدا زۆر بە قوڵی لێیبکۆڵێتەوە، کۆبوونەوەکە بەوە کۆتاییهات کە هۆشدارینامەکەیان بەبیربهێنێتەوە، نابێ ئیسرائیل خۆی لە شەڕەکە هەڵقورتێنێ، بەڵام هەمو زانیارییەکی مۆساد و ئامان زۆر بە گرنگی وەردەگیرێن. لەو نێوەدا ئیسرائیلییەکان دڵنیاکرانەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و هاوپەیمانەکانی کێشەی سکۆدەکان چارەسەردەکەن. کاتێک نێردەی ئیسرائیل گەڕایەوە ماڵ، هەستێکی وایان لاپەیدا بوو کە لە ماوەیەکی کورتدا بکەونە ژێر هەڕەشەوە.

لە بەرەبەیانیەکی زوی 17ی یانیوەری 191دا، کەمێک دوای سعات سێ و سعاتێک دوای دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابان، تەلئەبیب و حەیفا کەوتنەبەر هێرشی حەوت سکۆدەوە. بە هۆیەوە خانو وێرانبوون و زیانی زۆریان پێیگەیشت و 47 ئاکنجیش برینداربوون.

دواتر هەمان بەیانی سەرەک وەزیران ئیسحاق شامێر لە ڕێگەی هێڵی پەیوەستی تەلەفۆنی گەرمەوە بە دەنگێکی ساردەوە بە واشنتۆنی ڕاگەیاند ئاخۆ دەبێ چەند ئیسرائیلی دیکە بمرن تا سەرۆک بوش شتێک بکا. کورتە تەلەفۆنەکە لەگەڵ بوشدا کرا، جارێکی دیکەش ئامریکا داوای پێویستی خۆبەدورگرتنی ئیسرائیلی لەشەڕەکەدا کرد، هەرچەندە شامێر هۆشداری ئەوەیدا کە ئیسرائیل چیدیکە ناتوانێ دەستەوەستان بمێنێ.

شامێر فەرمانی بە فڕۆکە جەنگییەکانی دا بەسەر ئاسمانی باکور یان لەسەر سنوری عێراقدا بسوڕێنەوە. بوش پەیمانیدا 'بروسکەئاسا' دو پاتریۆتی دژە

ڕۆکیتییان بۆ بنێرێ تا شارەکانی ئیسرائیلیان پێ لە هێرشەکان بپارێزێ، بەڵام بە مەرجێ ئیسرائیل فڕۆکەکانی خۆی بگەڕێنێتەوە. فڕۆکە جەنگییەکانی هاوپەیمانان لە ماوەی ڕۆژێکدا چاری سکۆدەکان دەکەن.

لەو نێوەدا سکوۆدەکان ناوەبەناوە بۆ سەر ئیسرائیل هەر دەهاتن. لە مانگی یانیوەریدا ڕامات گان Ramat gan گەڕەکێکی دەرەوەی تەلئەبیب بەسکود پێکرا. لەو پەلامارەدا 96 هاوولاتی بریندار بوون، لە نێویاندا هەندێکیان برینەکانیان سەخت بوو و سیانیشان لە تاوان بەلێدانی دڵ مردن. دەنگی تەقینەوە بەهێزەکەش لە بنکەی سەرەکی مۆسادەوە دەبیسترا. لە کیریا Kiryaەوە ئامۆن شاهاک ڕاستەوخۆ لەگەڵ بارەگای سەرەکی هێزی سەربازیی نیشتمانی لە نهۆمی دوهەمی پنتاگۆنەوە قسەی کردن. تەلەفۆنکردنەکەی ئەو لە هی ئیسحاق شامێر کورتریش بوو، گوتی: شتێک بکەن، دەنا خۆمان دەیکەین.

چەند سعاتێک دوای ئەوە داونینگ و کۆماندۆکانی بەرەو عەرەبستانی سعودی فڕین. لە گوندێکی بچوکی سەرسنور لە عەرعەر شالۆم کە بەرگێکی سەربازی بەریتانیایی SAS ی پۆشیبوو چاوەڕێی دەکردن، بەڵام ئەو چۆن گەیشتە ئەوێ، بە کەسی نەگوت و کەسیش پرسیارەکەی لێنەکرد. ئەو بە سەلمێنراوی گوتی کەمتر لە نیو سعات فڕین لە سنورەوە چوار بنکەی هەڵدانی ڕۆکێتی سکودی لێ دەدۆزرێنەوە. داونینگ گوتی ' دەی با بەسەر میوانەکانمان ڕابگەین! ' .

کۆپتەرەکانی شینۆک Chinook تاقمەکەی لەگەڵ لاندرۆڤەرێکی تایبەت بە ڕۆیشتنی بیابان هەڵگرت و ڕوەو ئامانجەکەیان فڕین. لە ماوەی سعاتێکدا شوێنی بنکەی هەڵدانی ڕۆکیتەکەیان دەستنیشانکرد. لە ڕێگەی دەزگای ڕادیۆی بەیەکبەستنەوەی کۆدەداردا سەرکردە ئامریکاییەکە داوای لە هێزی ئاسمانی کرد، لە ئاسمانە پشتگیریان بکەن بە تەواوی تەقەمەنی و بەردانەوەی بۆمبی 500 کیلۆگرامی. لە لایەن کامێرای کۆپتەری Black-Hawk وێنەی تێکوپێکدانی سکودەکان گیرا.

سعاتێک دواتر فلیمەکە نیشانی ئیسحاق شامێر درا لە نوسینگەکەی خۆی لە تەل‌ئەبیب.

لە زەنگی داهاتوی سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل لەگەڵ بوشدا، ددانی بەوە دانا کە بایی ئەوەندی دیوە هێزی سەربازی ئیسرائیلی نەگلێنیتەنێو شەڕەکە. هیچ کامێک لە هەردو پیاوەکان ئاماژەیان بە ڕۆڵی مۆساد لە کردەکەدا نەدا. لە ڕۆژە باقیەکانی شەڕی کەنداودا زیاتر لە 500 کەس بە رۆکیتی سکود کوژران، لەنێویاندا ئەو 128 کوژراو و برینداره ئامریکیانەی لە عەرەبستانی سعودی بوون. زیاتر لە چوارهەزار ئیسرائیلیش بەهۆیەوە بێ ڕێوجێ بوون.

لە دەرهاوێشتەی جەنگی کەنداودا هەردو دەزگای مۆساد و ئامان لە کاتی دانیشتنی لیژنەکانی پەرلەمان (کەنیست) بۆ کاروباری دەرەوە و بەرگری و زانیاریی بە توندی کەوتنە بەر شاڵاوی ڕەخنە. لۆمەی ئەوە لە هەر دو دەزگاکە کرا، کە نەیانتوانیبوو پێشبینی داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە بکەن، هەروەها بە باشیش هۆشداریان لەمەڕ هەڕەشەکانی عێراق نەداوەتە ئیسرائیل. هەواڵە دزەکراوەکانی ئەو دانیشتنانەیان دەگەیاند کە قسەی توندو تورە لە نێوان ئامۆن شاهاک فەرماندەی ئامان و شاباتی شاڤیت بەڕێوبەری گشتیی مۆساد لەگەڵ ئەندامانی لیژنەکانی پەرلەماندا ڕویدا. لە یەکێک لەو ڕوبەڕوبوونەوانەدا خەریک بوو سەری بەڕێوبەری گشتیی مۆسادی تێدابچێ و ناچاربکرێ وازنامەی کاری پێشکەشبکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شاڤاتی پڕئەزمون هەمو شتێکی لەدەستنەدا.

هۆبەی شەڕی دەرونیی مۆساد کە ئەرکی وەڵامدانەوەی زانیاری دوژمن بە دژەزانیاری و ڕەشکردنی دوژمنەکان لەبەرچاوی ڕۆژنامەوانە بیانییەکاندا بوو، ئێستا ئاراستەی خۆی خستۆتەسەر میدیای ناوەوە. ڕۆژنامەنووسە دۆستەکانیان بەسەرکردنەوە تا ئەو چیرۆکە بڵاوبکەنەوە کە هیچ کەمتەرخەمی لە زانیارییەکانی دەزگاوە نەبووە، پێشتریش هەر وابوو، جەماوەری ئیسرائیلی لەسەر ڕاهاتبوو.

دەرونزانەکانی مۆساد زیاتر پێیان لەسەر چەند ڕاستییەکی بڕواپێکراو دادەگرت، کەوا دەزگای هیچ وڵاتێکی وا ژمارە کەم بە قەد ئیسرائیل زانیاریی و لێکدانەوەو پێشبینی کۆنەکردۆتەوە، هیچ دەزگایەکی دیکە نەدەگەیشتە سێبەری مۆسادیش بۆ خوێندنەوەی کەڵکەڵەی سەری دوژمنەکانی ئیسرائیل، یان هیچیان نابنە هاوپێوەر لەگەڵ مۆساد کە پەنجا ساڵە لە ڕاژەی دەوڵەتەکەیدا پیلان و نەخشەی تێکدەرانەی دوژمنان پوچەڵدەکاتەوە. ئەوەش زیاتر پفدانی پڕوپاگەندەکان بوو کە لە میدیاکاندا ڕووبەری بەرفراوانیان بۆ ئەوجۆرە زانیارییە' باوەڕپێکراوانە' تەرخانکردبوو.

شەپۆلێک لە وتار بە بیری خوێنەرانی ڕۆژنامەکانیان خستەوە، هەرچەندە مۆساد لە سەروبەندی جەنگی کەنداودا تا ڕادەیەک چالاکیەکانی سنوردارکرابوون، بەڵام پیاوەکانی ئازایانە لە لوبنان و ئوردن و سوریا و عێراق دەجەنگان. دەبووایە خوێنەران واتای نێو دێڕەکانیان هەڵهێنابا: مۆساد سەرزەنشتکرابوو، چونکە سیاسەتوانەکان بە شێوەیەکی نابەرپرسیارانە بودجەکەیان کەمکردبووەوە. ئەوەش بابەتێکی باوەڕپێکراوبوو، کاریگەری خۆی بەردەوام هەبوو. ئەوەش گوترا گوایە سیاسەتی سکهەڵگوشین بە خراپی لێکدراوەتەوە، چاوی ڕەخنەی لەسەر مۆساد لادا و ڕاستەوخۆ سیاسەتوانەکان بوونە نیشانە. لە هیکەوەش پارەکە ئازادکرا. ئیسرائیل کە تائێستا پشتی بە زانیاریی سەتەلایتەکانی ئامریکا دەبەست، خۆی بەلەزکرد لەوەی بەرنامەی تایبەتی خۆی هەبێ و سەتەلایتی تایبەتی خۆی بۆ ئاسمان هەڵبدا. مەبەستی یەکەم لە هەڵدانی ئەو سەتەلایتە سەربازیانە بوو، تایبەت بوو بۆ سەر عێراق تاکو بیخاتە ژێر چاودێرییەوە. ڕۆکێتی نوێی دژە ڕاکیت هێتز Hetz بە ژمارەیەکی زۆر بەرهەمهێنران. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش چەندان جۆری ڕۆکێتی پاتریۆت داواکران.

لیژنە لاوەکییەکانی کەنیستیش(پەرلەمان) دوای وتارە پڕ پەسنەکانی مۆساد، لە ڕەخنە و لۆمەکانی کەمکردەوە. شاڤیت وەک سەرکەوتوێک لەو شەڕە دندوکەی ناوەخۆ دەرچوو، دەستبەجێ هەوڵی بەهێزترکردنی پێگەی

مۆسادی دا. هەندێ کاتسای ناردنە عێراق بە مەرامی ئەوەی ئاخۆ جبەخانەی سەددام چەندی لە چەکی کیمیاوی و بایەلۆژی تێداماوە.

ئەوان بۆیان دەرکەوت کە هێشتا عێراق قەبارەیەکی زۆری لە چەکی کوشندەی anthrax,smallpox و ڤایرۆسی ئیبۆلاEbola و گازی ژاراوی ماوە کە نەوەک بەشی کوشتنی هەمو پیاو ژن و منداڵێکی ئیسرائیلی دەکا، بەڵکو بایی لەناوبردنی بەشێکی بەرچاوی دانیشتوانی سەر گۆی زەویش دەکا.

کێشەیەک کە توشی شابات و سەرانی دیکەی دەزگا زانیارییەکان هات، پرسێک بوو ئایا ئەو زانیارییانە بۆ کۆمەڵانی خەڵک ئاشکرابکەن یان نا. گەرهاتو ئاشکرایبکەن ئەوا دەبێتە مایەی تۆقانێکی زۆر لە نێو خەڵکدا و دەرهاوێشتەی نەرێیانەی لێدەکەوێتەوە. کەرتی گەشتیاریی ئابوریی ئیسرائیلی بەهۆی جەنگی کەنداوەوە ڕما. هەمو ئابوریی ئیسرائیل بەبارێکی خراپدا تێپەڕی، هێزی ڕاکیشانی وەبەرهێنە بیانییەکان کەمبوەوە. درکاندنی زانیارییەکانیش بەوەی هێشتا ئیسرائیل لەژێر مەترسی ئەو جۆرە چەکە کوشندانە دایە بێگومان گەشتیاری لە وڵات دەتۆراند وەبەرهێنانیش هەر هیچ.

بێجگە لەوەش بارەکە شتێکی دیکەی هاتەسەر، ئەویش دوای لەباریەکهەڵوەشانەوەی هاوپەیمانێتی جەنگی کەنداو بوو، وڵاتە عەرەبییەکانی ئەندام لە هاوپەیمانێتییەکە هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبوون بکەونە داوی شەڕکردن دژی وڵاتێکی دیکەی عەرەب، ئەوەش وای کرد پەرۆشی و خەمخۆری جەماوەر بۆ باری نالەباری عێراق زیادبێ. سەلماندنی ئەو کاولکاریەی هێرشەکانی هاوپەیمانان لە عێراق نایانەوە و خەڵکانێکی بێ گوناح بوونە سوتەمەنی، بووە مایەی ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دوژمنکارییەکی نوێی عەرەبان بەرامبەر ئیسرائیل بەتوندی سەرهەڵبداتەوە. گەر هاتو ئیسرائیل ئەو زانیارییانەی چەکی کۆمەڵکوژی لەسەر عێراق بڵاوبکاتەوە، لە لای وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەوادارانی عەرەب

لەجیهان وا لێکدەدرێتەوە، کە ئیسرائیل هانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەدا تاکو جارێکی دیکە پەلاماری عێراق بداتەوە.

کێشەی پرسی ئاشکراکردنی جبەخانەی چەکی کۆمەڵکوژی سەددام کاریگەری لەسەر دانوستانە نهێنییەکانی کۆتاییهێنانی دوژمنکاری نێوانPLO و ئیسرائیل هەبوو. لە سەروبەندی 1992دا دانوستانەکان لە نەرویج بەرەوپێشەوە دەچوون، هەرچەندیش هێشتا ساڵێکی ڕەبەقی مابوو تا ڕێکەوتننامەی لەسەربکرێ. ڕێککەوتننامەکە لە ئۆکتۆبەری 1993 لەوکاتەدا ئاشکراکرا کە یاسر عەرەفات لە کۆتاییدا لە باخی کۆشکی سپی ئامریکا دا و لەبەرچاو سەرۆکی ئامریکا بیل کلنتندا دەستی ئیسحاق ڕابینی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیلی گوشی. بۆ کەسایەتی هەر سێ پیاوەکان ڕێکەوتننامەکە سەرکەوتنێکی دیپلۆماتیانە بوو.

هەمو ئەوانەی لە مۆساددا کاریاندەکرد باوەڕیان بەو داڕشتنەی- دەوڵەتی فەلەستین لەبەرامبەر ئاشتیدا- نەبوو، کە بە کردەوە سەربگرێ. فەندەمەنتالیزمی ئیسلامی لەسەر ڕێڕەوی شەڕ بوو، هەروەها وڵاتە دراوسێکانی ئیسرائیلیش ئوردن و میسر و سوریا بەخەستی کەوتبوونە بەر پەلاری ئاگراوی هێزی توندڕەوی ئێران. لە چاوی مەلاکانی تاراندا ئیسرائیل زۆڵ و تەرەکراوە. بۆ زۆر لە پیاوانی مۆساد و باقی جڤاکی ئیسرائیلی ئاشتی لەگەڵ PLO دا خەونێکی بەدینەهاتوو بوو. ئیسرائیلی زایۆنیست هەستێکی وای نەبوو کە عەرەبەکان بە ڕوانینە دیین و کلتورو مێژو و هەنگاوهەڵێننەوە. ئەوان نەیاندەتوانی بڕوا بەوە بکەن ڕێکەوتننامەی ئۆسلۆ ئایندەی وڵاتی بەڵینپێدراویان بۆ دابینبکا، هەروەها هەر دو گەلەکان ئەوەندە بەختیارنەبوون تا ڕێز لە بەیەکەوە ژیانیان بگرن.

ئەو لایەنانە هەموی لە لایەن شاباتی شاڤیت هەڵدەسەنگێندران، بەقوڵی لە پرسی سەبارەت بە ئاگادارکردنەوەی دنیا لە جبەخانە چەکە کوشندەکەی عێراقی کۆڵیەوە. لە دواییدا بڕیاریدا زانیارییەکان بەنهێنی بهێڵێتەوە تا ئەو گەشبینییەی لە دەرەوەی ئیسرائیل سەبارەت بە ڕێکەوتننامەی ئیسرائیل

پەیدا بووە دانەمرکێنێتەوە. هەرکاتێک بارەکە بە شێوەیەکی دیکە گۆڕا ئەوا هەمیشە دەتوانێ زانیارییەکان لەسەر چەکە کوشندەکانی ڤایرۆس و کیمیاوی جبەخانەی سەددام ئاشکرابکا. هەرکاتێکیش پێویستبوو عێراق بخەنە ژێر ئاگری پەلارەکانیان، ئەو بیرۆکەیە بۆ هۆبەی شەڕی دەرونزانیی مۆساد بەس بوو کە بڵاوبیکاتەوە بەوەی بۆمبێکی بچوکی ئانتراکس لە میترۆی نیۆیۆرک یان لولەیەکی بچوکی پڕ بەکتریای ئیبۆلای دەستی تیرۆرستێکی بەکرێگیراوی عێراق بۆناو بۆینگێکی 747 بەس بوو تا سەرجەم سەرنشینانی فڕۆکەکە کە دادەبەزن ببنە بۆمبی دانراو و نەخۆشییە کوشندەکان بڵاوبکەنەوە.

لەونێوەدا دو ڕوداو قەومان کە مۆساد ڕاستییەکانی شاردنەوە، چونکە بە ئاشکراکردنی زیانی گەورە بەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەکەوت و شەرمەزاریدەکرد.

لە ئێوارەیەکی دەسێمبەری 1988دا فڕینی ژمارەی هێڵی ئاسمانی پان ئامێریکان Pan American Airways لە کاتی فڕینەکەیدا لە لەندەنەوە بۆ نیۆیۆرک لەسەر ئاسمانی ناوچەی لۆکەربی Lockerbie لە سکۆتلانددا تەقیەوە. لە ماوەی سعاتێکدا کارمەندانی هۆبەی جەنگی دەرونیی مۆساد زەنگیان بۆ ڕۆژنامە دۆستەکانیان لێدا تا پێیانڕابگەیەنن و وایانلێبکەن هەواڵەکە وا بڵاوبکەنەوە کە بەڵگەی 'حاشا هەڵنەگر' لەسەر ئەوە هەیە دەستی دەزگای زانیاریی لیبیای ئەلجەماهیریە لەو کردەوە دڕندانەیەدا هەیە. (نوسەری ئەو کتێبە لە ماوەی سعاتێک لە ڕودانی کارەساتەکە تەلەفۆنێکی لە هۆبەی شەڕی دەرونیی مۆسادەوە لەوبارەیەوە لەگەڵدا کرا.) ڕۆژئاوا هەر زو کەوتەخۆ بۆ سەپاندنی ئابلۆقە بەسەر ڕژێمی قەززافیدا. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و شانشینی یەکگرتو بە پێی سۆراخەکانیان دو لیبیاییان بە تاوانی تێکشکاندنی بۆینگەکە تۆمەتبارکردن. قەززافیش هەر دو تۆمەتبارەکانی بۆ دادگاکردن نەدانەدەست. بە گوێرەی تۆمەتبارکردنەکانی هۆبەی شەڕی دەرونیی مۆساد سوریا و ئێرانیش پشکیان لەو تاوانەدا

هـەبووە. بەڵگـەی دژی سـوریا لـەوە زیـاتر تێپەڕینـەدەکرد کـە دیمەشـق پشتگیری تیرۆرزمی نێودەوڵەتی دەکا. ئەوەی دەربارەی ئێرانیش بوو زیاتر وردەکاری تێدابوو: تەقاندنـەوەی فڕینـی ژمـارەی پـان ئامێریکـان لـە تۆڵـەی خستنەخوارەوەی فڕۆکەی سەرنشینهەڵگری ئێرانی لـە تـەممووزی 1988ەوە لەسەر کەنداوی عەرەبییەوە لە لایەن هێزە جەنگییەکانی ئامریکا USS vincennes وە خرایەخوارەوە. لەو خستنەخوارەوەیەدا 290 کەس گیانیان لەدەسـتدا. ئـەوەش هەڵـەیـەکی تراژیـدی بـوو کـە ئامریکـا بـە دورودرێـژی لێبوردننامەی خۆی ڕاگەیاند.

بێجگـە لـەوەش هۆبـەی شـەڕی دەرونیـی مۆسـاد بـەرەی گـەلی ڕزگـاری فەلەستینیشی بەدەستهەبوون لە پیلانی تەقینـەوەی فڕۆکـەی پـان ئامیریکـان تۆمەتبارکرد. هیچ کامێک لەو ڕۆژنامەنوسانەی کە هەواڵەکەیان بە خوێوبۆوە بڵاودەکـــردەوە ئـــەوەیان نەپرســـی باشـــە بـــۆچی کـــە لیبیایـــان بـــەو کارەتۆمەتبارکرد، چ پێویستی بەوە هەبوو داوای کۆمەک لە ئێران و سـوریا و باسکێکی فەلەستینییەکانی PLO بکا؟

به گوێرەی سەرچاوە زانیارییەکانی نێو دەزگای زانیاری بەریتانی، هۆبەی شـەڕی دەرونیـی مۆسـاد هـەر لەبـەر هەرزانفرۆشـی بڵاوکراوەکـان ئـەو تۆمەتبارانکردنانەیان پەخشدەکردن. لۆکەربی ئەو دەرفەتەبوو کە هەمیشـە مۆساد جاڕی بۆدەدا تا بەبیر جیهاندا بهێنرێتـەوە کـەوا تـۆڕی تیرۆرسـتیانە ئەو جۆرە کارانەیان لە دەستدێ. ئێمە بەهۆی هەواڵەکان واماندەزانی کە لیبیا کردەوەکەی ئەنجامداوە. کەچی ڕاستی دیکە هەبوون ئەوەیان نیشاندەدا کە ئەوەی بەسەر پان ئامێریکاندا هات کارێکی ئەوەندە ئاسان و سادە نەبوو.

کارەساتی لۆکەربی لە کاتێکدا قەوما کە تازە جۆرج بوش وەک سـەرۆک هـەڵبژێردرابوو، تیمـی ڕێکخسـتنی گواسـتنەوەی دەسـتەڵات لـە واشـنتن سـەرگەرمی هەڵسـەنگاندنی بـارودۆخی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـوو تـا بەهۆیەوە بوش کارەکانی لە کاتی چوونە هۆڵی Oval office دەستپێبکا.

بوش لە ساڵەکانی 1976-1977دا بەڕێوبەری CIA ی بوو، ئەو سەردەمەی هنری کیسنجەر وەزیری کاروباری دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان بەشێکی گەورەی سیاسەتی واشنتۆنی دەربارەی ئیسرائیل دادەڕشت. هەرچەندە بە ئاشکرایی بوش درێژەدەری سیاسەتی ڕێگان بوو بۆ پاراستنی ئیسرائیل، بەلام ئەو لە ساڵەکانی ڕکێفبەدەستبوونی CIA دا باوەڕی بەوە هێنا کە ڕێگان 'دەربارەی ئیسرائیل زۆر نەرمکێش' بووە. لەو کاتەی بوش چاوەڕوانی کورسی سەرۆکایەتی دەکرد، پێویستنەبوو کەس بەیادی بهێنێتەوە کە ولاتە یەکگرتووەکان لەبەر خاتری لۆبی جولەکە کۆنگرێس ناچارکرا ڕێکەوتنێکی چەکفرۆشتن بە بەهای 1،9 ملیار دۆلار بە ئوردن پوچەڵبکرێتەوە. بوش بە دەستەی دەسەلاتگواستنەوەکەی گوت وەک سەرۆک بە هیچ شێوەیەک ڕێگانادا کەس خۆی لە کاروباری ئامریکادا هەڵبقورتێنێ. ئەم ڕەفتارە ڕۆڵی خۆی لە تێکشکاندنی فڕینی ژمارەی هێڵی ئاسمانی پان ئامیریکان وازیکرد.

لەو کاتەی فڕۆکەکە لە دیسێمبەری 1988دا لە لەندەن فڕی، هەشت ئەندامی دەزگای زانیاریی ئامریکا کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەگەڕانەوە، لەسەر پشت بوون. چواریان پیاوی CIA بوون فەرماندەکەشیان Mathew Gannonبوو. هەروەهارائید ( مێجەر)Charles Mckee و دەستە بچوکە پسپۆڕەکەی لەمەڕ ئازادکردنی بارمتەکانیشی لەنێو فڕۆکەکەدا بوون. ئەوان بۆئەوە لە بەیروت بوون تا هەوڵی بەدواداگەرانی ئەوەبدەن ئایا هێشتا لە لوبنان بارمتە ماون. هەرچەندە پشکنینی بەشە سوتاوەکانی فڕۆکەکە بە فەرمی کەوتە ژێر دەستەلاتی قانونی هێزی ئاسمانیی سکۆتلەندی، چەندان پیاوی CIA گەیشتنە شوێنی ڕوداوەکە و جانتا داخراو و هیچ لێنەهاتووەکەی McKee یان بە سەرسوڕمانەوە بەساخی هەڵگرتەوە و لەگەڵ خۆیان برد. جانتاکە لە لایەن کەسێکەوە برداو لەسەر گۆڕەپانی کارەساتەکە نەما، گومان دەکرا پیاوێکی CIA بووبێ، بەلام هەرگیز ناسنامەکەی ئاشکرانەکرا. دواتر جانتاکە گەڕاندرایەوە دەستی دەستەلاتی

سکۆتلاندی، ئەوەش وەک دەگوترێ دوای ئەوەی' ناوەڕۆکەکەی' لە لیستی فۆڕمی تۆمارکردنەکانەوە بە' بەتاڵی' لەقەڵەمدرا.

هیچ کەس سۆراخی کەلوپەلەکانی MCkee ی نەکرد، ئەوەش هەر لێگەڕێ بپرسن ئاخۆ بۆچی ناوبراو بە جانتای بەتاڵەوە لە گەشت گەڕابووەوە. ئەوکات کەس گومانی لەوە پەیدا نەکردبوو کە' ئەفسەری CIA ' زانیاری لەنێو جانتاکە دەرینابێ، کە دەرەقەتی وەڵامی ئەو پرسە دەهات بۆچی فڕۆکەکە تەقیەوە. هەگبەی Mathew Gannon یش هەرگیز نەدۆزرایەوە، ئەوەش سەرەداوی ئەو گریمانەیەی دەدایەدەست کە بۆمبە ڕاستەقینەکە لەنێو هەگبەکەدا بووبێ، بەڵام کەسیش لەوە نزیکنەکەوتەوە ئاخۆ بۆچی ئەفسەرێکی CIA بۆمبی لەنێو هەگبەکەیدا هەڵگرتبوو.

پاشان تیمیکی لێکۆڵەرەوەی تەلەفزیۆنی PSB لە بەرنامەیFrontline دا ڕایگەیاند کە مەتەڵی کارەساتی لۆکەربی هەڵهێناوە. فڕینی ژمارەی پان ئامێریکان لە فڕانکفۆرتەوە دەستیپێکردبوو، لەوێ سەرنشینە ئامیریکاییەکانی هەڵگرتبوون، کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە گەڕابوونەوە. هەگبەکانی ئەوان لەگەڵ هەگبەی هەزاران سەرنشینی فڕۆکەکان ڕۆژانە لەچاو کارمەندانی بارکردنی فڕۆکەکە جیاوازی نەبوو. یەکێک لە کرێکارانی بارکردنەکە لە لایەن تیرۆرستانەوە کڕدرا بوو. لە یەکێک لە هەگبەکاندا کرێکارە بەکرێگیراوەکە بۆمبەکەی شاردۆتەوە. داوای لێکرابوو لەنێو یەکێ لە هەگبەکان کە ڕاستەوخۆ گەشتەکە تەواودەکا بدۆزێتەوە و بە هەگبەی بۆمبڕێژەکە بگۆڕێتەوە و لە گەشتی ژمارەدا باریبکا. ئەوەش گریمانەیەکی لێوەشاوەبوو، بەڵام تەنها یەکێ لەو بیردۆزانەبوو کە لێکدانەوەی تەقینەوەکەی پێدەکرا.

بەرژەوەندی هێڵی ئاسمانی پان ئامێریکان لەوەدا بوو کە بسەلمیندرێ تەقینەوەی فڕۆکەکەیان بەدەستی تیرۆرستانەوە ئەنجامدرابێ، چونکە ئەوکات کۆمپانیاکە لێی بەرپرسیارنەدەبوو. لەبەر ئەو هۆیە کۆمپانیای زامنکاری پان ئامێریکان پەنای بردە بەر دەستەیەکی لیکۆڵینەوەی نیۆیۆرک بەناوی Interfor. فیرما ناوبراوەکەش لە لایەن ئیسرائیلیYuval Aviv ەوەدامەزرا

بوو. ئاڤیڤ خۆی بە کۆنە ئەفسەرێکی بەڕێوبەرایەتیی مۆساد دەزانی، بەڵام مۆساد ئەوەی ڕەتدەکردەوە. هەروەها ئاڤیڤ بە زامنکارەکانی دەگوت کەوا لە ڕێی پەیوەندییەکانی زانیاری دروستی لەسەر ڕوداوەکە پەیداکردووە.

دوای وەرگرتنەوەی ڕاپۆرتەکەیان فەرمانپێدەرانی زیاتر سەرسوڕمان مانەوە. یاڤیڤ گەیشتە ئەو دەرەنجامە کە تەقینەوەکە لە لایەن تاقمێکی جێگیربووی ئاڵمانی سەربە گروپێکی دەستبەکاری CIA نەخشەی بۆداڕێژراوە و جێبەجێکراوە، کە کاریان پاراستنی ئۆپەراسیۆنی ئاودیوکردنی مادده سڕکەرەکانەبووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕێی فرانکفۆرتەوە بەرەو وڵاتەیەکگرتووەکانی ئامریکا . CIA هیچ هەنگاوێکی وای نەهاوێشت تاقمەکە ئاشکرابکا، چونکە ئەو بازرگانانەی مادده سڕکەرەکان لە سۆنگەی 'چەک گۆڕینەوە بە بارمتەکان' چەکیان بۆ ئێران دەگواستەوە. شێوازی ئاودیوکردنی مادده بێهۆشکەرەکان زۆر سادەبوو: کەسێک دەستی دەدایە هەگبەیەک و بەهۆی هاوکارێکی دیکەی بارکردنی هەگبەکان لە فڕۆکەخانە بە هەگبەیەکی پڕ لە ماددەکان دەیگۆڕیەوە. ئەو ئێوارە نەگبەتییە تیرۆرستێکی سوریایی زانیبووی کە چۆن مادده بێهۆشکەرەکان ئاودیودەکرێن، بۆیە هەگبەی ماددەکانی بە هەگبەیەکی پڕ لەمادەی تەقینەوەگۆڕی. ئەو دەیەویست پیاوەئامریکاییەکانی CIA کە بەو گەشتە فڕینە دەگەڕانەوە ماڵ بکوژێ ، وەک بۆ سوریا دەرکەوت.

بە گوێرەی ڕاپۆرتی ئاڤیڤ McKee زانیاری دەربارەی دەستە جیابووەوەکەی CIA ی کە لەژێر نازناوی COREA دەخەبتین، دەزانی. هەروەها بۆ ناوبراو دەرکەوتبوو کە تاقمەکە پەیوەندییەکی تۆندوتۆڵی گرێدراوی بە یەکێ لە کەسایەتییە ڕازدارەکان هەبوو، کە لە پەراوێزی تۆڕی کاری زانیارییانەی نیودەوڵەتی مونزیر ئەلکەسارMonzer Al-Kassar دەجوڵانەوە. پیاوەکە لە ئاوڕوپادا ناوبانگێکی زۆری وەک بازرگانی چەک پەیداکردبوو. ئەلکەسار لە 1986چەکی بەئۆلیڤەر نۆرس oliver North فرۆشت و ئەویش گەیاندییە کۆنترای نیکاراگوا. هەروەها ئەلکەسار

پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ڕێکخراوەکەی ئەبو نیزالدا هەبوو، لە کاتێکدا تێکەڵییە خیزانداریییەکەی گوماناوی بوو. عەلی عیسا دوبا Ali Issa Duba سەرۆکی دەزگای نهێنیی سوریی کە هاوسەرەکەی لە بنەماڵەی سەرۆکی سوریا بوو، خەزوری بوو. بەپێی ڕاپۆرتی ئاڤیڤ ئەلکەسار لە تاقمی COREAدەرفەتی لە باری هاوبەشی بۆ ئاودیوکردنی مادده سڕکەرەکان دەبینی. ئەو هاوکارییەشیان کە ڕوداوی لۆکەربی بەسەردا هات چەندان مانگ بوو لە گۆڕێدابوو. لەوە زیاتر ڕاپۆرتەکە ئەوەشی تێدا بوو کە McKee شەرمەزارییەکەی لە ڕێگەی هەوڵی نهێنی بۆ ڕزگارکردنی بارمتە ڕفێنراوەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆ دەرکەوت. لە ڕاپۆرتەکەدا هاتبوو McKeeبەنیاز بوو بەڵگەی پەیوەندی ئەو تاقمەی CIA ئەلکەسار لەگەڵ خۆی بباتەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا.

لەJoel bainermanدا پەخشکەری ڕاپۆرت دەربارەی کاری زانیارییانەی ئیسرائیل لە جیهاندا کە لێکۆڵینەوەکە لە ڕۆژنامە گەورەکانی The Wall street Journal, Christian science Monitorو Financial Timesی لەندەنی بڵاوکرایەوە، ئەمەی خوارەوەی نوسی: 'بیست وهەشت سعات بەر لە فڕین مۆساد تێبینی ئەوەی دایە دەزگای قەڵاچۆکردنی تاوانی ئاڵمان Bundskriminialamt کە ڕەنگبێ بۆمبێک بۆسەر پشتی گەشتی ژمارەی پان ئامیریکان ئاودیوبکرێ. دەزگای پۆلیسی ئاڵمانیش تێبینیەکەیان دایە تیمی CIA COREA کە لە فڕانکفۆرت کاریاندەکرد. ئەوانیش گوتیان کەوا مشوری هەمو شتێک دەخۆن' .

پارێزەری پان ئامێریکان Gregory Buhler داوای لە FBI, CIA, FAA, DEA, NSCو NSA (بۆ ڕونکردنەوکان سەیری لیستی لێکدانەوەی کورتکراوەکان بکە) کرد کە چی دەربارەی پرسەکە دەزانن بۆ دادگای باسبکەن، بەڵام حکومەت پاشان ڕایگەیاند لەبەر ' هۆی ئاسایشی نەتەوەیی' داخوازییەکەی کێشایەوە.

چ داڕێژەڕانی پرۆگرامی تەلەفزیۆنیFrontline، چ یوڤال ئاڤیڤ و یول بێنەرمانJoel bainerman یش وەڵامی تێروتەسەلی پرسە دژوارەکەیان نەدایەوە. ئاخر گەر هەوڵی خەفەکردنی چالاکییەکانی COREA درابێ، ئایا لە ڕوی هەرەمی ڕێنماییدانەوە تا چەند ڕێکخراوەکە پەلوپۆی لێبۆتەوە؟ ئایا کێ فەرمانی پێداون؟ ئەو کەسە (ئەو گروپە)ش فەرمانی بە شوێنبزرکردنی زانیاری نێو هەگبەی McKee داوە، کێیە؟ ئایا بۆچی پۆلیسی نەهێشتنی تاوانی ئاڵمانی ڕۆژئاوا تێبینییەکەی مۆسادی لەمەڕ ئەگەری تەقینەوە داوەتە تیمیCOREA ؟ ئایا ئەوە هەموی هەر بە ڕێکەوت بوو؟ یاخود لەسەر ئەوە بڕیاردراوە و پوختەی چالاکییەکانی COREA بۆ کەسانی دیکە لەنێو CIAدا بە پلەیەکی باڵای پەسەندنەکردن مایەی دژواری بووە؟ ئایا بە ڕاستی ئەو 'هۆیانەی ئاسایشپارێزی نەتەوەیی' چیبوون کە وایان لە پارێزەری پان ئامێریکان بکا داواکارییەکەی لە دادگادا بکێشێتەوە؟

بەپێی تێپەڕبونی ڕۆژگار بەردەوام ئەم جۆرە پرسانە لە دوتوێی ڕێڕەوەکانی دەزاگا زانیارییەکان باسدەکران، بەڵام هەرگیز وەڵامەکانیان ئاشکرانەدەکردن. هەمان ڕێساش سەبارەت بە دوا مەتەڵی پڕ وردەکاری لە ئارادابوو. ئایا بۆچی مۆساد کاتسا ئاکنجیبووەکەی لەندەنی لە ماوەی سعاتێکی تەقینەوەی فڕۆکەکەی پان ئامێریکانی ژمارە ناردە شوێنی ڕوداوەکە لە لۆکەربی؟

تا ئێستاشی لەگەڵدابێ ئەوەی مۆساد لەسەر تێکشکاندنی فڕینی پان ئامێریکانی دەزانی هەر بۆ خۆی گلداوەتەوە. هەندێک ژێدەر هەن ( نایانەوێ ناویان ئاشکرا بێ، چونکە ژیانیان دەکەوێتە بەر مەترسی) دەڵێن بۆیە مۆساد ئەو زانیارییانەی لای خۆی هێشتۆتەوە، وەک کارتێکی گوشار بۆ ڕۆژێکی هەڵگرتووە، نەبادا ئامریکا گوشار بخاتەسەر مۆساد بۆ کۆتاییهێنان بە کاری سیخوڕیانەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا.

بێ لەوە قۆناخێکی دیکە بە سەلمێنراوی هاتەپێشەوە کە بۆ دەزگای زانیاریی ئامریکایی پڕکول و ژان بوو، دەبوایە چارەی بکا. ئەویش پەیوەندی

بە کوشتنی ئامیرام نیرAmiram Nir هەبوو ، ئەو پیاوەی جێمس بۆند ئاسایانە بەرگریدەکرد و جێگەی داڤید کیمخی لە ئەڵقەی پەیوەستی ئێرانگێتدا گرتبووەوە.

بە ڕاستی ئامیرام نیر بۆ پۆستی ڕاوێژکاری تایبەتی سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل شیمۆن پیرێز بۆ کاروباری دژەتیرۆریزم لێوەشاوەبوو. بەهۆی شێوازە بەدواداچوونەکەی و ڕاوەڕێوی و بێبەزەییانەکەی و چاو لەسەر بەرژەوەندی تایبەت و کورتهێنان لە خۆسنوردارکردن و گەر پێویستبووایە ڕێسای پێشێلدەکرد بۆ کۆکردنەوەی ئەو ڕاستیانەی کە سەلمێنەری فانتازیاکانی بوون. نیر ڕۆژنامەنوس بوو.

ئاشنایەتی بەرایی لەگەڵ جیهانی کاری زانیاریی بەرهەمی پەیامنێرییەکەی بوو لە تەلەفزیۆنی ئیسرائیلی و پاشانیش هی گەورەترین ڕۆژنامەی وڵات یادوت ئاحرانۆت Yadiot Ahranot . ڕۆژنامەکەش هی خانەوادە زۆر دەوڵەمەندەکەی Moses بوو، ئەویش زاوایان بوو. دامەزراوە قەبە و بەرفراوانەکە وەک هی ڕۆبەرت ماکسوێل نەبوو: ئەمەیان ڕێکوپێک و باری دارایی لەجێی هەبوو. دامەزراوەکە کرێی کارمەندەکانی بە گوێرەی بنەمای ئینجیل ' کرێکار شایستەی مزەکەیەتی ' دەدا. نیر بەهۆی هاوسەرگیرییەکەی نەوەک هەر هاوسەری دەوڵەمەندترین ژنی ئیسرائیل بوو، بەڵکو لەو سۆنگەیەوە دەروازەی گەورەترین هەرەمی سیاسی وڵاتەکەشی لەسەرکرایەوە.

نیر سی و چوار ساڵانە بوو، تاکە ئەزمونی لەگەڵ کاری هەواڵگرییدا بریتی بوو لە مەشقەخولێکی سەربازییانە. تەنانەت برادەرەکانیشی پێیانوابوو نیر هێشتا زۆری بۆ کارە تازەکەی لەوەی بەختی یاری بوو، ماوە .

ناحوم ئادمۆنی بەڕێوبەری گشتیی مۆساد یەکەمین کەس بوو کاردانەوەی لەمەڕ بەناوکردنی نیر بۆ پۆستەکەی هەبوو: ئەو پێکهاتەی کۆمسیۆنی سەرانی دەزگاکانی وا گۆڕی کە نیر نەتوانێ بەشداری کۆبوونەوەکان بکا. نیریش دەستەوەستان نەوەستا تاکو لەسەر گۆڕەپان رایبماڵن ، بۆیە لە

هەفتەکانی بەرایی کارە نوێکەیدا تەواو سەرقاڵی خوێندنەوەی هەمو شتێکی پێویست بە ئەرکەکانی بوو، تا بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. هەر زو زانیاری لەسەر کردەوەی گواستنەوەی چەک بۆ ئێران پەیداکرد کە ڕۆڵی ئیسرائیل تیایدا ئەوە بوو چەکە ئامریکاییەکان بە ئێران بفرۆشی، لە بەرامبەردا ئێرانیش بارمتەکانی لوبنان بەربدا. نیر بۆنی ئەوەی کرد کە دەرفەتی باشی بۆ هاتوتەپێش بۆ خۆسەلماندن، بۆیە داوای لە شیمۆن پیریز کرد بۆ ئەوێی دابنێ و داڤید کیمیخیش سوپاسگوزاری بوو. لە ژێر سەرپەرشتی بن مێناشەی ماندونەناس نیر دەستیبەکارکرد و بەهۆی ئیشەکەشەوە دەبووایە کار لەگەڵ ئۆلیڤەر نۆرسدا بکا.

هەر زو ئەو دوانە بەیەکەوە گونجان و بە ڕاست و چەپ گرێبەستی چەککڕین و چەکڕەوانەکردنیان مۆردەکردن. وەک پێویست نەخشەیەکی وایان دانا کە کردەی گواستنەوەکە بە سەرکەوتویی ئەنجامبدەن. دەبووایە هەردوکیان بەیەکەوە بەرەو تاران بفڕن تا لەگەڵ سەرکردە ئێرانییەکان ڕاستەوخۆ لەمەڕ ئازادکردنی بارمتەکان دانوستان بکەن.

لە ئایاری 1986دا نیرو نۆرس بەجوتە گوایە دو تەکنیکاری کارمەندی هێڵی ئاسمانی ئیرلەندین Air Lingus و لە تەلئەبیبەوە بەرەو تاران فڕین. ئەوان وایان لە فڕۆکەیەکی ئیسرائیلی کرد و دروشمی Air Lingusی ئیرلەندیان لێدا تاوا وا دیاربێ کە فڕۆکەیەکی ئێرلەندییە. لەسەر پشتی فڕۆکەکە ڕۆکێتی TOW کەلوپەلی یەدەگی تەواویان بارکردبوو. نیر پاسپۆرتێکی ساختەی ئامریکی هەڵگرتبوو کە نۆرس بۆی ئامادەکردبوو.

نۆرس کە کریستیانێکی دیندار بوو، بە شێوەیەک لە شێوەکان سەرۆک ڕێگانی ڕازیکردبوو کە ئیمزایەکی خۆی لەسەر ئینجیل بدا و بە دیاری بۆ ئایەتوڵلا ڕەفسەنجانی ببا. هەروەها کێک و چەند دەمانچەیەکی کۆلت Coltی بەدیاری بۆ خانەخوێکانی تاران بردبوون. ئەوەش تەواو وەک ئەو ڕۆژانە وابوو کە بازرگانانی مانهاتن Manhattan لەگەڵ هیندییەکان بازرگانی ئاڵوگۆڕیان دەکرد.

مۆساد دوایی ئەوەی فڕۆکەکە گەیشتەسەر ئاسمانی ئێرانی، بە ئیشەکەی زانی. کاردانەوەی ناحوم ئادمونی دواتر وا کەوتەوە کە' لە توڕەییان هاروهاج ' بووە.

ئێرانییەکان میوانەکانیان ڕاستەوڕاست لە ڕێگەی خۆیاندا گێڕابوونەوە و ئەو سەردەمەشیان بە پڕوپاگەندی چروپڕ دژی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بەکارهێنا. ڕۆنالد ڕیگان توڕەبوو. لە تەلئەبیبیش ئادمۆنی گاڵتەی بە نیر کرد و بە' کاوبۆی cowboy لە قەڵەمدا. لەگەڵ ئەوەشدا نیر لەوەدا سەرکەوت کە هێشتا دەمانگی ڕەبەقی دیکە لەسەر کارەکەی بمێنیتەوە، تا ئەوکاتەی ڕەخنەی توند گیران و دەزگا زانیارییەکانیش ناچاریانکرد کە وازنامەکەی لە ئیشەکەدا پێشکەشبکا. لەو مانگەدا کاروباری پرسەکانی هینداوی و ڤانونو و ئیسماعیل سۆوان هاتنەسەر مێزی نوسینگەکەی، بەڵام هەمو ئەو پێشنیازانەی کە بۆ چارەسەرکردن کردنی، لە لایەن مۆسادەوە بەلاوەنران.

هەنوکە ئەو کەسێکی بەخێرهێنراو نییە لە واشنتن و لە تەلئەبیبیشدا تەنها ماوەتەوە. لە ئازاری 1987یشدا وازنامەی خۆی وەک ڕاوێژکاری تایبەتی سەرەک وەزیران شیمۆن پێرز بۆ کاروباری دژەتیرۆر پێشکەشکرد. لەو ساتەدا باری خێزانداریشی شلۆق بوو، بازنەی برادەرەکانی زۆر بچووک بووەوە. ئاری بن مێناشە یەکێک بوو لەو کەسە کەمانەی کە ئەڵقەی بەستنەوەی بە ڕابردووە هەبوو. لەسەرەتای 1988دا نیر ئیسرائیلی بەجێهێشت، تا لە لەندەن بژی. لەوێ لەگەڵ ژنێکی قەشەنگی پرچڕەشی کەنەدی بەناوی Adriana Stanton کە دەیگوت سکرتێرەیەک بووە لە تۆرۆنتۆ لە ئەنجامی گەشتەکانی ناسیویەتی، دەژیا. ئەفسەرە جۆراوجۆرەکانی مۆساد لەو باوەڕەدا بوون کە ژنەکە بۆ CIA ئیشدەکا و لەو ژنانەیە کە دەزگای ناوبراو بۆ تەڵەی پێوەبوونی پیاوان بەکاریدەهێنان. لە لەندەن نیر وەک نوێنەری ئاوڕوپایی بازرگانی ماکسیکی Nucal de

Mexicoبـە بەرهـەمی ئاڤۆکـادۆ Avocado دەسـتبەکاربوو. کۆمپانیاکـە کۆنترۆلی ئاڤۆکادۆی دەکرد و دەیناردە وڵاتی سێهەم.

ئـەوەیان ئاڤۆکـادۆ نـەبوو کـە لـە ڕێـی بـن مێناشـە لـە شـەوێکی بارانـاوی 1988دا لە زەنگی ماڵی نیرلە لەندەن بدرێ. ئەو دەیەویست بزانێ ئاخۆ بە دەقاودەقی نیر چی لـە هەگبەدایـە تـا ئاشـکرایبکا لەمـەڕ پڕۆسـەی ئایندەی دادگایی دژی نۆرس لەسەر شەرمەزارییەکەی ئێرانگێت کە نیر وەک شاهید دەبووایە قسەی خۆی بکا. نیر بە ڕاشکاوانە گـوتی کـەوا گوتـەکانی نـەوەک هـەر بـۆ حکومـەتی ڕێگـان، بـەڵکو بـۆ ئیسـرائیلیش گـورچکبڕدەبن. ئـەو لـە نەخشەیدا بوو ڕابگەیەنێ کە چەند ئاسان بووە ڕێسا ئاساییەکان بشـکێنرێن تاکو باری چـەکی قاچـاخ بـۆ ئێران بگوازرێتـەوە کـە هێشـتا دەسـتی هەنـدێ دەوڵـەتی وەک خـواروی ئافریقـا و چیلـی دەسـتیان پـی ئالودەیـە. هـەروەها ئەوەشی بۆ زێدەکرد کە بـەنیازە کتێبێک لەسـەر ئـەوە بنوسـێ و پێـی ببێتـە ناودارترین کەسی مێژویی ئیسرائیل. ئاری بن مێناشە قسەی لەگەڵ نیر کرد کەوا دوای سەردانی داهاتوی بۆ Nucal لە مەکسیکۆ دەیبینێتەوە. کاتێکیش ئادریانا ستانتۆن هەردوکیانی بە تەنها جێهێشت بن میناشە بـە نیری گـوت' ئاگات لەو ژنەبێ'، بەڵام بن مێناشە ئەوی ڕەتکردەوە کە بۆچی ئەو لەوکاتەدا ئەو بەئاگاهێنانەوەی دایە نیر. تاکە شتێک کە لەوبارەیەوە درکاندی: ' من لە مێژە ئەو ژنە دەناسم و نیر نایزانێ، ئەو ژنە ناوەکەی نـاوی ڕاسـتی خـۆی نییە' .

لە نۆڤێمبەری 1988دا نیر و دۆستەکەی ستانتۆن لەژێر ناوی خوازراوەوە بەیەکەوە چوونە مەدرید. ئەو ناسنامەی پاتریک ویبەرPatrick weber ی کە دواجار گەشتەنەهاتیەکەی بۆ تاران پێکردبوو، هەڵگرتبوو، ستانتۆنیش لە لیسـتی سـەرنشـینەکانی Iberia نـاوی ئێسـتەر ئاریـا Esther Arriya ی هەڵگرتبوو. باشە بۆچی ئەوان لە ژێر ناوی ساختە بلیتی فڕۆکەیان بریبـوو، لەو کاتەی هەریەکەیان پاسپۆرتی ڕەسەنی خۆی (ئیسرائیلی و کەنەدی)یـان لەنێو گیرفاندا بوو، هەرگیز تارماییەکە ڕوننەکرایەوە. مەتەڵێکی هەڵنەهێنراوی

دیکەوە ئەوەبوو، ئەوان بۆچی یەکەم جار چوونە مەدرید تا لەوێوە بەرەو مەکسیکۆ سیتی بفڕن، کەچی گەشتی ڕاستەوخۆیان بۆ مەکسیکۆ دەستپێنەکرد. ئایا نیر بەوکارەی ویستویەتی سەرنجی دۆستەکەی بۆ ئەوە ڕابکێشێ کە چەند ئاسانە خەڵکی دیکە لە خشتەببا؟ یان ئایا دوای سەردانەکەی بن مێناشە مۆتەکی ترسی بەدواوە بوو؟ ئەو پرسانە پێناچێ هەرگیز وەڵامبدرێنەوە، هەروەک چۆن زۆر لە پێشهاتەکانی بەدواداهاتووی بە نارۆشنی مانەوە.

جوتەکە لە28ی نۆڤێمبەر گەیشتنە مەکسیکۆ سیتی. لە فڕۆکەخانە پیاوێک چاوەڕوانیدەکردن کە ناسنامەکەی ئاشکرانەکرا. ئەنجا هەرسێکیان بەرەو Urupan ڕۆیشتن و دوای نیوەڕۆ گەیشتنە ئەوێ. لەوێ نیر فڕۆکەیەکی Cessna T210ی لە کۆمپانیایەکی بچوک بە ناوی Aerotaxis Uruapanبەکرێگرت.

لێرەش نیر بە شێوەیەکی نارۆشن هەڵسوکەتی کرد. ئەو فڕۆکەکەی بەناوی پاتریک وێبەر بەکرێگرت و کارتی بانکی بەوناوە بەکاهێنا و بە فڕۆکەوانەکەشی گوت کەوا دوای دو ڕۆژ بەرەو کارگەی خواردەمەنی Nucal بفڕن. لە میوانخانەیەکی خۆجێی ئەوێ، ناوی ڕەسەنی خۆی بەکارهێنا. ئەو پیاوەی لە مەکسیکۆسیتی یاوەریان بوو چۆن بەنهێنی دەرکەوت هەر ئاواش لەبەرچاوان ونبوو.

لە نۆڤێمبەردا نیر و ستانتۆن جارێکی دیکە چوونەوە فڕۆکەخانە بچکۆڵەکە، بەڵام ئەم جارەیان بە یاوەری کەسێکی دیکە. لە لیستە کورتەکەی سەرنشینیان کابرا خۆی بە Pedro Espionoza Huntado ناونوسکردبوو. ئایا بۆ کێ کاریدەکرد، ئەوەش هەر مەتەڵ بوو. مەتەڵێکی دیکە نیر و ستانتۆن ئەم جارەیان ناوی ڕەسەنی خۆیان بەکارهێنابوو. کە فڕۆکەوانەکەش ئەوەی تێبینی کرد کەوا نیر پێشتر بە ناوێکی دیکە cessana ی بەکرێگرتبوو، هیچ تێبینییەکی دەرنەبڕی.

فڕۆکەکە لە کەش و هەوایەکی لەبار بەخۆی و فڕۆکەوانەکە و یاریدەرەکە و سێ سەرنشین فڕی. دوای ئەوەی نزیکەی 160 کیلۆمەتر فڕین، فڕۆکەکە لە پڕ ماشینەکەی کێشەی تێکەوت. کەمێک دواتر بەربووەوە و نیر و فڕۆکەوانەکە گیانیان لەدەستدا. ستانتۆن بەخەستی یاریدەری فڕۆکەوانەکەش بەسوکی بریندار‌بوون. لە سەروبەندی گەیشتنی یەکەمین Huntado فریادڕەس Pedro Cruchet بۆ شوێنی ڕوداوەکە، هونتادۆ Huntado ونبوو، جارێکی دیکە بیچمێک کە هەرگیز نەگەڕایەوە. ئایا چۆن بوو کە Cruchet یەکەمین کەس بوو گەیشتە سەریان، ئەوەش پرسێکی تیبینیهەڵگربوو. ئەو ڕایگەیاند گوایە کارمەندێکی Nucal ە، بەڵام کارگەکە لە ڕوپێوێکی بەرچاو دور بوو لە شوێنی ڕوداوی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەکە. ئەو ڕونی نەکردەوە کە چۆن بوو ئاوا لە شوێنەکە نزیک بوو. کاتێکیش پۆلیس گەیشت و داوای ناسنامەی لێکرد، گوتی گوایە لە گۆڕەپانی گەمەی شەڕی گایەکاندا بزریکردووە. لە شوێنی ڕوداوەکەدا crochet تەرمی نیری شاردەوە و ستانتۆنیشی گەیاندە تیمارخانە. ئەو هەر لای مایەوە تا ڕۆژنامەنوسێکی خۆجێی بە هیوای پەیداکردنی هەواڵی تایبەتمەند پەیدابوو.

Joel bainerman لە چاپەری ڕاپۆرت دەربارەی دەزگا زانیارییەکانی ئیسڕائیل دەڵێ: ' ژنێکی گەنج گوتی کەوا Cruchet لەوێ بووە. کاتێک ژنەکە ڕۆیشت پیاوەکە بهێنێتەوە، ژنێکی دیکە لە دەرگا ڕاوەستا بوو، گوتی کەوا هەرگیز ناوی پیاوێکی وەهای نەبیستووە. دوهەم ژن گوتی کەوا ئامادەبوونی ستانتۆن لەسەر پشتی Cessna بە ڕێکەوت بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە کابرای ئیسڕائیلییەوە نەبووە. ڕازیش نەبوو خۆی بناسێنێ ، تاقە شتێک کە درکاندی :" ئەو وەک گەشتیارێکی ئەرجەنتینی لە مەکسیکۆیە".

ستانتۆنیش پرسەکەی زیاتر ڕازدار(مەتەڵاوی) کرد. بە گوێرەی ڕان ئیدێلست( Ran edelist ) لە ژنەکە بە دەستەی لێکۆڵەرەوەکانی ڕوداوەکەی ڕاگەیاندبوو: هەرچەندە کە برینداربووە و تەواو پەشۆکاوە، ئەو ئامیرام نیری لەیەک دومەتر دوری خۆی دیوە و دەستی بۆ ڕاوەشاندووە بە

دەنگێکی ئارامبەخشەوە پێیگوتووە کەوا هەمو شتێک باشدەبێ و ئێشتاش کۆمەک بەڕێوەیە. ڕۆژەکانی داهاتوو دوو جاران بەدڵنیاییەوە دوپاتیکردەوە کەوا نیر لە ژیاندا مابوو.

تەرمی نیر بۆ بنخاککردن هێنرایەوە ئیسرائیل. هەزاران کەس لە ناشتنەکەی ئامادەبوون. لە وتارەکانی ناشتنیدا وەزیری بەرگری ئیسحاق ڕابین گوتی:' پەیامێک بۆ مەبەستێکی ئاشکرانەکراو بۆ ئەرکێکی نهێنی' و ' بەشاراوەیش لەنێو دڵی خۆیدا هێشتەوە' .

ئایا ئامیرام نیر لەبەر ئەوە کوژرا تا ئەو نهێنیانە ئاشکرا نەبن؟ ئایا بە ڕاستی دارەبازەکە تەرمی ڕاستەقینەی نیری تێدا بوو؟ یان پێش ڕوداوەکەی Cessna کوژرا بوو. گەر واش بووبێ، ئایا لە لایەن کێ کوژراوە؟ لە تەلئەبیب و واشنتۆندا ئەو جۆرە پرسانە ڕوبەڕوی دیواری بێدەنگی دەبوونەوە. دو ڕۆژ دوای ڕوداوەکە ئاری بن مێناشە لە نوسینگەیەکی پۆستناردنی سەنتەری سانتیاگۆی پایەتەختی چیلییەوە دەرچوو. دو کەس پاسەوانیان دەکرد، چونکە لە پڕێکەوە پاسەوانکردنی بەشتێکی زێدەگرنگ زانی. لە هیکەوە' ئەو پەنجەرەیەی کە منی بەتەنیشتدا تێپەڕدەبووم کرایەوە. لە چاوتروکانێکدا هەستم بە قرەقرِی ئاسنێک کرد و پەشۆکام. ئەز و هەردو پاسەوانەکە خۆمان بە زەویدا دا، وامانزانی کەسێک تەقەمان لێدەکا' .

ستانتۆنیش بڕوای وابوو کە ژیانی لە مەترسیدایە. بە گوێرەی ئێدیلیست ژێدەرەکانی لە دەزگا زانیارییەکان پێیانڕاگەیاند گوایە' ژنەکە خۆی شاردۆتەوە و لە ڕێی نەشتەرگەری خۆجوانکردن ڕوخساری خۆی گۆڕیوە' .

بە ڕادەیەکی زۆر مۆساد بڕوای بەوە کردبوو کە CIA نیری کوشتووە. بە قسەی ئاری بن مێناشە' دەزگای زانیاریی ئیسرائیل هەمیشە بڕوای وا بووە کە ئۆپەراسیۆنێکی CIA تەواوعەیار بووە. کوشتنی نیر بووە مایەی ئەوەی کەوا ڕێگان و بوش لە کاتی پێواژۆی دادگاییکردنی ئۆلیڤەر نۆرس شەرمەزارنەکرێن' .

پشتگرتنی ئەم دیمانەیە لە لایەن گەورە ئەفسەرێکی مارینزی ئامریکاییەوە هات کە یاوەری نیر بووە لە هەوڵی گۆڕینەوەی بارمتەکان بۆ تاران. بە پێی چیرۆکی ئەفسەرەکە نیر لە29ی تەموزی 1986دا جۆرج بۆشی جێگری سەرۆکی لە میوانخانەی شا داود King David Hotel لە ئۆرشەلیم دیوە و ڕونکردنەوەی سەبارەت بە ڕەوشی بەرەوپێشەوەچووی چەکناردن لە ڕێی ئیسرائیلەوە بۆ ئێران پێداوە. بە قسەی یول بینەرمانیش ' نیر دیدارەکەی لەگەڵ بوشدا بە دزی تۆمارکردبوو. بۆیە بەڵگەی پێبوو کەوا بوش لە کردەی گواستنەوەی چەکەکان بۆ ئێران ئاگاداربووە. هەروەها لە کاتی دیدارەکەیاندا McKee وGannon یش ئامادەبوون، کە هەردوکیان لە ڕوداوەکەدا سەریان تێداچووبوو' .

بینەرمان وێنای ئەوە دەکا کە ئەفسەری مارینز سەری لە بنکەی CIA لە Langly دابوو لەوێ چاوی بەئۆلیڤەر نۆرس کەوتبوو، ئەوەش مانگێک پێش دەستپێکردنی پیواژۆیە قانونییەکەی دژی. بە گوێرەی باینەرمان ئەفسەری مارینزەکە لە نۆرسی پرسی بوو ئایا چی بەسەر نیردا هات. نۆرس بەدڵنیاییەوە پێیگوتبوو کەوا نیر لەناوبراوە، چونکە گەفی ئەوەی کردبوو کە کاسێتە تۆمارکراوەکەی ئۆرشەلیم ئاشکرادەکا' .

ئەو ڕۆژنامەنوسانەی هەوڵیاندەدا پرسی لەو جۆرە لە نۆرس بکەن، پشتگوێدەخران. ڕەفتاری بوشیش لە سەروبەندی ئەو ساڵانەدا پێشبینی بەخشبوو: هەرچی سەرۆکی پێشوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا دەربارەی ئێرانگێت گوتبووی چاپکرا.

لە کۆتایی تەمموزی 1991دا دزی لە ماڵی بێوەژنەکەی نیر جودی Judy کرا. تاکە شتێک کە دزرابێ کاسێتەکانی دەنگ و بەڵگەنامەکان بوو. بە گوێرەی پۆلیس دزیەکە' زۆر پیشەییانە' کراوە. جودی نیر لەو باوەڕەدا بوو کە کەلوپەلە دزراوەکان ' زانیاری وای لەسەر کەسانێک تێدا هەبوو کە قورس بوون'. لەوە زیاتر هیچ شتی دیکەی لەسەر دزیەکە نەدرکاند.

کەلوپەلەکان هەرگیز نەدۆزرانەوە، پرس لێرەدا ئەوەیە ئایا لە لایەن کێوە دزیەکە کراوە؟ وەڵام هەر نییە.

چوار ساڵی داهاتو مۆساد لە لایەن شاباتی شاڤیت ڕابەرایەتی دەکرا. ئەوەی لە مستی هات بۆ ئەوەی دەزگا لە کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕۆژنامەکان زیاتر بەرەو سەرنج دانەسەر داڕشتنی ئەفسانە بڕوا،کردی.

لە دەرەوەی نیگای خەڵک گەمە کۆنەکەی دەستەڵات لەنێو دەزگا زانیارییەکانی ئیسرائیلدا لە گەرم و گوڕی نەکەوتبوو. ئەو سیاسەتوانانەی تازەجێی خۆیان لە لیژنە لاوەکیەکانی زانیاری لە کەنیست (پەرلەمان) گرتبوو، بەبیریان دێتەوە چۆن شاڤیت لە دوای جەنگی کەنداو وازیدەکرد. یادەوەری خەڵکی ئیسرائیل هەروەک هی جیهان پڕە لەو هەڵمەتە هەراسانکەرەی دژی شاڤیت: بەربینگی تەنگ ببوو، پەیوەندی لەگەڵCIA دا دابەزیبووە ئاستێکی نزم، دەستەڵاتی کزببوو، ئەو زۆر خۆی لە پیاوە ئاساییەکانی مۆساد بەدوردەگرت و ورەی مۆساد بەگشتی هاتبووە خوارێ.

شاباتی شاڤیت گوێی بە ئاماژە هۆشدارکەرەکان نەدەدا. تا ئەو کاتەی لەپڕێکەوە لە بەیانیەکی بەهاری 1996دا بانگکرایە نوسینگەی سەرەک وەزیران بنیامین ناتانیاهو، لەوێ پێیگوترا کەوا دەگۆڕدرێ. شاڤیت هیچ هەوڵێکی بۆ بەرپەرچدانەوە نەدا، ئەوەندەی لە ناتانیاهو بینیبوو کە هەوڵی بەرپەرچدانەوە بێهودە بوو. تەنها یەک پرسی هەبوو: ئایا کێ جێگای دەگرێتەوە؟

ناتانیاهوش وەڵامیدایەوە: ' دانی یاتوم 'Danny Yatom . ئیدی بۆ مۆساد سەردەمی پروسییانە( Prussian توندوتیژیانەی سەربازی) دەستیپێکرد.

# 17

## هەڵە و کەتنی گەورە

{ دوا ساتەکانی دانی یاتوم.. ناتانیاهو دۆستو برادەر ناناسێ.. مۆسادیش گەندەڵی تێدەکەوێ.. گەندەڵی سەری بەرپرسەکەی دەخوا.. عبدالله زێنو پیرەژنی ئاڵمانزمان.. ئەجەوید زەنگ بۆ ناتانیاهو لێدەدا.. مۆساد بەهانای تورک دێ.. رۆتەردام لێناگەڕێ ئۆجەلان دابەزێ.. وڵاتان داڵدەی ئۆجالان نادەن.. گرتنی ئۆجالان.. لە سخیپۆل فڕۆکەیەکی بارکراو بەماددەی کیمیاوی دەکەوێ.. ناتانیاهو و کەتنو هەڵەی گەورە..}

تـازە ڕۆژ ببـووەوە، ئـەو بەیانیـەی پێنجشـەممەی 15ی یـانیوەری سـاڵی 1988کە لیمۆزینێکی میریی لە خانوە سپییەکەی گەڕەکە شـیکەکە تێپـەڕی، گەڕەکەکە زۆر لە تەلبەندی سنوری نێوان ئیسرائیل و ئوردنەوە دور نەبوو. سەرنشـینەکە  دانـی یـاتومی بەڕێوبـەری گشـتیی مۆسـاد بـوو، لـەو شـوێنە وەستابوو کە چەنـدان سـەدەیە هـەمان شـوێن ئۆردوگـا ئیسـرائیلییەکانی لـێ بڵاوبوونەوەتـەوە. گـەورە بەرپرسـی جـوو، ئامادەکـاری ئـەوەی کردبـوو کـە بەرپێی خۆی باش بناسێ و بەهۆیەوە ئیسرائیل هەردەم بەسەرکەوتویی لـە بەرامبەر دوژمنە زۆر و قەبەکانی بهێڵێتەوە. دانی یاتوم لەو بەیانییەدا بۆیـە ڕۆیشت کە دوا سەرەداوی ئۆپەراسیۆنێک دابنێ، کارنامەکەی پێ ڕزگاربکا.

هـەر لـە نوشسـتییەکەی تـەممززی 1997ی شـەقامەکانی عەممانـدا هـیچ دەستەیەکی کیدۆن نەیانتوانی خالد مەشـعەلی سـەرکردەی حـەماس بکوژن. یاتۆم وەک بۆ برادەرەکانی درکانـد هەسـتێکی وای لا پەیـدا بـووە ' لـە مێژە سـەری لەسـەر بلـۆک  دانـراوە، تـەنها چـاوەڕێی ئـەوە دەکـا کـە جەلادەکـە بیپەڕێنێ' .

لەسەردەرە(جەللاد) دوودڵەکەش بنیامێن ناتانیاهوی سەرەک وەزیران بوو. دۆستایەتیە کۆنەکەیان لەبەیەنچووە و هەنوکە ڕۆژێکی نوێ هـەڵناکا تـا لـە

نوسینگەی ناتانیاهووە پستەپستی ئەوە بڵاونەبیتەوە کە تەنها پرسی کاتە، کە تا ئێستا یاتومی گەورە بەرپرسی مۆساد لەسەر کارەکەی لانەدراوە. هەندێ کەسی دیکە بووایە شەڕەفەکەی بۆ خۆی دەهێشتەوە، بەڵام یاتوم ڕەتیکردەوە بەخۆی واز لە پایەکەی بهێنێ. ئەو پیاوە شانازیکارە و ورەبەرزە پشتی بە تۆماری ڕاژەکانیەوە قایم بوو. کۆمەڵێ ئۆپەراسیۆنی سەرکەوتو بەس بوون بۆ ئەوەی بە بیر ئەوەی نەیدەزانی بهێنێتەوە کە ئەوچی کردووە. تێبینی بە هەڤاڵەکانی دەدا کە ' تەنها کردە پوچەڵبووەکانم ئاشکرادەکەن و بەوەوە لە دەرگام دەدەن' .

هەروەکماڵباتەکەی، مرۆ بەڵگەی پەستی وەک بێخەوی شەوانە، لەهیکەوە تورە بوون کە چۆن خێرا دەهات ئاواش خێرا دەڕەویەوە ، هاتنوچوونی بێ ئۆقرەیی، بە کرپیمانەوە، کەم کەمە نیشانەی کەسێک کە تەنها ڕوبەڕوی هەراسانی و دردۆنگی لێوەدەرکەوتن.

ئەو دوو ساڵ بوو بەڕێوبەری گشتیی مۆساد بوو، بەڵام هەمیشە لە هەمو ئەوانەی پێشخۆی زیاتر لەژێر گوشاردا بوو. دەرهاوێشتەکەشی بێ ورە مانەوەی کارمەندە نزیکەکانی بوو کە نەیدەتوانی زیاتر حیساب لەسەر دڵسۆزێتیان بکا. میدیاکان وەک داڵی کەلاکخۆر بەدەوری سەری دەهاتن و دەچوون. ئەوان دەیانزانی کە برینداره، بەڵام لە دەورەوەش چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە ئاخۆ جەللادەکە کێ دەبێ وکەی کۆتای پێدێنێ. تائێستاشی لەگەڵدا بێ بنبیامێن ناتانیاهۆ خۆی لێ بە دور دەگرت.

ئەو پێنجشەممە ساردەی یانیوەری، یاتۆم بۆی دەرکەوتبوو کە کەمی لەبەردەمدا ماوە، بۆیە بەلایەوە زۆر گرنگ بوو، ئەو ئۆپەراسیۆنەی کە زۆر بە مشورخوراوییەوە لە هەفتەی ڕابردووەوە دەستپێکردبووە، مەبەستی خوازراو بەدەستەوە بدا. ئەوەش بۆ سەرەک وەزیران دەسەلمێنێ کە سەری دەزگای جاسوسیان هێشتا کارامەیی خۆی لەدەستنەداوە. دەموچاوی یاتوم هەرچەندە توشی ئەو هەمو گوشارانەش ببووەوە ڕازەکانی نەدەدرکاند، هێشتا لەبەردەم هەڵچووندا دەیتوانی پش وهەناسەی ساردی خۆی بخواتەوە

و بیانشارێتەوە. لە پشتەوەی بیجۆ، یاتۆمی هەراسانکراو لەبن چاکەتێکی پێستڕەشی پۆلیسی و بە تیشێرتێکی یەخەکراوەوە و پانتۆلێکەوە لەسەر کورسیەکە لێی پاڵدابووەوە. ئاوا بەو شێوە جلوبەرگی دەپۆشی، پرسی پۆشاک لای ئەو شتێکی وای نەدەگەیاند.

خەتی سەری جیاکردنەوەی هەردولای پرچی، چاویلکە چوارچێوە پۆڵایین و لێو تەنکی، نیشانەی پڕ بەپێستی نازناوی پروسیانە Prussian ی بوو. دەیزانی بۆ هەندێ کەس مایەی ترسێکی زۆر بوو. لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکەی ڕۆژنامەکانی ئەو سپێدەیە دانرابوون. ئەم بەیانییەیان وەک ڕیزپەڕییەک هیچی لەسەر ئاییندەی ئەودا تێدانەبوو.

بیجۆیەکە بەخێرایی لەبەرزاییەکان بەرەو تەلئەبیب شۆڕبووەوە. تیشکی ڕۆژ لە جامەکاندا بریسکەی دەدایەوە. هەمو بەیانی و ئێوارەیەک شوفێرەکەی ئۆتۆمێبێلەکەی سەرلەبەر پاکدەکردەوە و دەیبریقاندەوە. بیجۆیەکە جامەکانی گوللەبەند بوون، ئۆتۆمبیلێکی زرێپۆشیانە و بنەکەشی دژەمین بوو. تەنها لیمۆزینەکەی سەرەک وەزیران هاوچەشنی ئەو پارێزراوبوو.

یەک دو خولەکێک دوای ڕۆیشتنی ساباتی شاڤیت وەک بەڕێوبەری گشتیی مۆساد، بنیامین ناتانیاهوی سەرەک وەزیران، برادەرەکەی خۆی یاتۆمی لەجێدا نا. لە دەستپێکی هەفتەکانی سەرەتای دەستبەکاربوونی لە پایە نوێیەکەیدا، یاتۆم بەلای کەم ئێوارەیەکی لە هەفتەیەکدا لەگەڵ ناتانیاهو بەسەردەبرد. ئەوسا بەنۆشکردنی بیرەی سارد و زەیتونی وزەداردا بارودۆخی جیهانیان تاوتوێدەکرد و بیرەوەری ئەوکاتەی کە یاتۆم فەرماندەی ناتانیاهۆ بوو لەیەکەی کۆماندۆدا بەسەردەکردنەوە. دواتر ناتانیاهۆ بووە باڵوێزی ئیسڕائیل لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە سەردەمی شەڕی کەنداویشدا خۆی وەک پسپۆڕێک لە بواری تیرۆرزمی نێودەوڵەتی نیشاندەدا، لە یەکێ لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆنیدا دەمامکێکی دژی گازی ژاراوی پۆشیبوو بۆ خۆڕاهێنان لە کاتی کەوتنەخوارەوەی موشەکێکی سەر

بەکڵاوەی کیمیاوی. یاتوم بەخۆی دەیگوت کە چۆن پیشەی سەربازی کە تیایدا بووە ڕاوێژکاری سەربازی سەرەک وەزیران ئیسحاق ڕابین چ ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە وەرگرتنی پایەی لە نێو دەزگای زانیاری ئیسرائیلیدا وەربگرێ.

یاتۆم و ناتانیاهۆ دوو برادەری لەیەکجیانەبووەوە بوون تا دوو ڕوداوی پڕلەژان لەیەکیکردن و پردەکەی نێوانیان روخاو هەڵنەبەسترایەوە. یەکەمیان هەڵە قەبەکەی عەممان، ئۆپەراسیۆنێک کە ناتانیاهو خۆی فەرمانی پێدابوو. کاتێک کردەکە نوشستی هێنا و مۆساد کەوتە بەردەم کامیراگەلی میدیای جیهان، ناتانیاهۆ بەرپرسیارێتی شکستییەکەی لەئەستۆگرت. یاتۆم ڕەخنەکانی وەرگرتن بێ ئەوەی دەمارێک لە دەموچاوی بجوڵێ، بەڵام لەگەڵ برادەرەکانیدا گوتی کەوا ناتانیاهو 'هانی داوە و بڕوای پێهێناوە بۆ ئۆپەراسیۆنەکە' .

کەچی کردەی دوهەم لەچاو هی یەکەمدا زیاتر مایەی شەرمەزاری بوو. لە ئۆکتۆبەری 1997دا دەرکەوت کە گەورە ئەفسەری مۆساد یاهودا گیل yahuda Gil لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردودا ڕاپۆرت لە سەر ڕاپۆرتی زۆر نهێنیی لە کەسێکی نادیاری دیمەشقەوەی هەڵدەبەست. گیل چاوی لەو بڕە پارە زۆرانە بوو کە مۆساد بۆ بەرتیل دەیدانە پیاوەکانی. لە ڕاستیدا ئەفسەری ناوبراو پارەکانی بۆ گیرفانی خۆی بوون. ئەوەش لەوکاتەدا دەرکەوت کە لێکۆڵەرەوەیەکی مۆساد بەدور و درێژی لە دوا ڕاپۆرتەکانی پیاوە نەناسراوەکەی گیلی کۆڵیەوە، کەوای دانابوو سوریا لەسەر خاڵی وەرچەرخانی هێرشکردنە سەر ئیسرائیلە. لێکۆڵەرەوەکە لەوەوە گومانی پەیداکرد. یاتوم بانگی گیلی کرد و بەدروردودرێژی ڕازەکانی لێدەرهێنان.

ناتانیاهو کوتکی خۆی وەشاندەوە. لە یەکێ لە دیدارە پڕ هەراکانی سەرەک وەزیران لە نوسینگەکەی خۆی لەگەڵ یاتومدا لەسەر یەک، پرسی گران گرانی سەبارەت بە شێوازی ڕابەرایەتیکردنی مۆسادی لێدەکردن و دەبووایە یاتومیش بەرسڤیان بداتەوە. ناتانیاهو بەڵگە وبەندی ئەوەی پێبوو کە گیل

توانیویەتی هەر چوار بەڕێوبەرە گشتییەکەی مۆساد لەخشتە بەرێ، دەبووایە یاتوم وەک سەرەک وەزیران باسیکرد، بیزانیبایە. ئەوەش دوهەمین هەڵەی گەورە بوو. کارمەندانی نوسینگەکە دەیانگوت بەبیرمان نایە کە کەس تا ئێستا وا سەرزەنشت کرابێ. وردەکارییەکەش بۆ میدیاکان دزەیان کرد و یاتۆمیان زیاتر خەجاڵەتبارکرد.

جیاوازییەکە لەوەدا بوو کاتێ ئەو هاتە سەرمێزی پایە نوێیەکەی، ناوی بەجیهاندا بڵاوببووەوە، ڕۆژنامەنوسان گوتیان کەوا مۆساد ئیدی کەوتە دەستێکی ئاسایش و چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێ بچێتە ڕیزی سەرانی گەورە جاسوسانی وەک ئامیت، هۆفی و ئادمۆنی. بەڵێ ئەو ئاگرەی شاباتی ساڤیت بەئەنقەست خەفەی کردبوو، ئەو گەشیدەکاتەوە.

زۆری نەبرد بەڵگەش دەرکەوت. هەرچەندە ڕێکەوتننامەی ئۆسلۆ – کەرتی ڕۆژئاوا و غەززە- ی دەدایە PLO بەڵام یاتوم چەندان پیاوی عەرەبی بۆ جاسوسیکردن بەسەر یاسر عەرەفاتەوە دانا. فەرمانی بەسەر هۆبەی بەرنامەداڕێژەراندا کرد کە بەرنامەیەکی وا دروستبکەن بەهۆیەوە بتوانن بچنە نێو سیستمی کۆمپیوتەریPLO، هەروەها بەرنامەی ڤایرۆسی واش ئامادەبکەن، هەرکات پێویستبوو ئەوا سیستمی بەیەکبەستنەوەی کۆمپیوتەرییان تێکبدەن. ئەو لە بواری زانیاریداندا زۆر فێرببوو، پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە توند دەست بەچەکی زانیارییەوە بگرن و پڕوپاگەندەی ڕەشی دوژمنانی پێ پوچەڵبکەنەوە. ئەو دەیەویست مۆساد پشکی لە جیهانی نوێی بوێریدا هەبێ کە لەئاییندەدا زیاتر بە کیبۆردی کۆمپیوتەرەوە بەنددەبێ و بەهۆیەوە توانستی جۆشدانی هێزە جەنگییەکانی دوژمنی پێلەکاردەخرێ.

یاتوم گەڕایەوە سەر گۆڕەپانە ڕاوەدونانە کۆنەکە: واتە ئافریقا. لە ئایاری 1997دا دەزگا زانیاری گرنگی دایەدەست کە پشکی لە ڕوخاندنی سەرەک مۆبوتو Mobutu لە زائیر Zair هەبوو، کە ماوەیەکی درێژ بوو ناوەڕاستی ئافریقای پاوانکردبوو. مۆساد پەیوەندی باشی لەگەڵ دەزگای نهێنی نیلسۆن ماندێلا پەیداکرد و کۆمەکیکردن بۆ سۆراخکردنی توندڕەوە سپی پێستەکان

که لەپێشدا مۆساد هاوکاریان بوو. هەروەها یاتوم بودجە و هێزی کارای ئۆپەراسیۆنە تایبەتمەندەکانی مۆساد، ئەو هۆبەیەی بەرپرسیاربوو لە دزینی بەرهەمە تەکنەلۆژیا ئامریکییەکان زۆر بەرزکردەوە.

یاتوم بەتەمەنی پەنجاویەک ساڵەیدا لە نوچدان نەدەهات. ئەو ماندونەناس و بێبەزەییانە و ئامادەیی چەقاوەسویی شەڕە شەقامیشی تێدا هەبوو. ئەوەش بۆنمونە لە کاتی دەمامکهەڵدانەوە لەسەر مێگا Mega پیاوی پایە بەرزی مۆساد لەنێو حکومەتی کلنتندا دەرکەوت. ئەو کۆمیتەی سەرانی دەزگا – کە ئەرکیان خۆئامادەکردن بوو بۆ باری نوشستهێنانی ئۆپەراسیۆنەکە و کاردانەوەیان- بۆئەوە پێکهێنا کە مشوری لۆبی بەهێزی جولەکە بخۆن، چۆن قورسایی خۆیان بەرامبەر داخوازی عەرەبەکان لە حکومەت بخەنەکار؛ گەر هاتوش مێگا هەر ڕاونرا ئەوا دەبێ FBI جاسوسانی وڵاتی دیکەش ڕاوبنێ. میوانە جووەکان کە پێکهاتبوون لە ئەستێرەکانی هۆلیود و پارێزەرەکان و سەرنوسەرەکان لەسەر مێزی میواندارێتی کلینتن هیچ بۆنەیەکیان لەدەستنەدا تا بەسەرۆکی ڕابگەیەنن کەوا ئەو جۆرە ڕاوەدونانەی مێگا زیانی بۆ سەر کەسایەتی کلنتن دەبێ بەتایبەتیش گەر کەسێک لە ستافەکەیان بگیرێ. بۆ کلنتنیش کە قورس کەوتۆتە ژێر باری گۆبەندی شەرمەزاری، هێندەی دیکە کوشندە دەبێ. شەش مانگان دواتر لە 4ی تەمموزی1997 دا کاتێ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئامریکا جەژنی ڕۆژی سەربەخۆیی خۆی دەگێڕا ، یاتوم زانی کەوا FBI لە کۆتاییدا لە ڕاوەدونانی مێگادا شلیکردووە.

تەنها دو مانگ پاش ئەوە، نسکۆیەکەی عەممانی بەسەردا هات، دوای ئەویش بەماوەیەکی کەم شەرمەزارییەکەی ئەو جاسوسەی کەهەر بوونی نەبو قەوما. دانی یاتوم بەدوای ئۆپەراسیۆنێکدا دەگەڕا کە دەستڕۆیشتنی خۆی پێبگێڕێتەوە. ئەمڕۆ، بەیانی پینجشەممەی یانیوەری 1998، لەسەر ئەو هێڵە وەستا بوو کە دوا داشی دامەی شەترەنجی ئۆپەراسیۆنەکەی بجوڵێنی.

خۆئامادەکردن بۆ ئۆپەراسیۆنەکە دوومانگ پێشتر دەستپێکردبوو، ئەوەش لەوکاتەدا هات کە هەواڵدەرێکی عەرەب لە خواروی لوبنان دیدارێکی بەپەلەی

لەگەڵ پیاوێکی مۆساد سازدا بوو، پێیڕاگەیاندبوو کەوا عەبدوڵڵا زێن Abdullah Zein بە کورتە گەشتێک بۆ قسەکردن لەگەڵ سەرکردەکانی حزبوڵڵا هاتۆتە بەیروت. پاشان زێن بەرەو باشور بەڕێکەوت تا سەردانێکی دایک و باوکی لە شارۆچکەی ڕومان Ruman دا بکا. سەردانەکە سیمایەکی ئاهەنگیانەی هەبوو، چونکە زێن ساڵێک دەبێ سەری لەماڵەوە نەداوە. ئەو وێنەی هاوسەرە ئیتاڵییە گەنجەکەی و ماڵەکەی لە ئاوروپا نیشانی خانەوادەکەی دان.

کابرای مۆساد خۆی گرت تا پەلە لەناردنی زانیارییەکاندا نەکا. دابونەریتێکی عەڕەبان بوو کە زانیارییەکان بەیەک جار بەوردەکارییەوە ئاشکرابکرێن. بەم جۆرە کابرای مۆساد گوێی هەڵخست کە چۆن زێن ڕۆژی دواتر ماڵەکەی بەجێهیشت و لەگەڵ خۆیدا شیرنەمەنی عەڕەبی و دیاری بۆژنەکەی پێبوو. حیزبوڵلاش مشوری ئەوەی بۆ دەخوارد کە بیگەیەنێتە فڕۆکەخانەی بەیروت بۆ گەڕانەوە بۆ سویسڕا.

ئایا ئەوە دوا ڕوگەی زێن بوو؟ مۆسادەکە پرسی، بەڵێ دوا ڕوگەی شاری بێرن بوو لە سویسڕا. زێن لەوشارەدا دەژیا. ئاژانەکە پێیوابوو زانیارییەکانی ڕاستن، بەڵام هێشتا تەواو دڵنیا نەبوو.

لە ڕاستیدا ئەو زانیاریانە بۆ مۆساد ئەرێییانە و نوێ بوون دوای ئەوەی زێن لە لوبنان دەرچووە و لە ئاوروپا بۆ جۆشدانی لایەنی دارایی لە شیعە دەوڵەمەندەکانی ئاوروپا کەوتۆتە گەڕ. پارەی ئەوان و هی ئێران کە لە ڕێگەی باڵوێزخانەکەیان لە بۆن لە وڵات دەردەچوو بۆ تیرۆرستەکانی حزبوڵلا زۆر پێویست بوو تا شەڕی دژی ئیسڕائیل پێبکەن. ساڵی پار ڕاپۆرت لەسەر ئەوە هەبوون کە زێن لە پاریس و مەدرید و بۆنەوە دەستبەکارە. هەرجارێک یاتۆم کەسێکی بەدوادا دەنارد، سۆراخی ئەو پیاوە لاوازە سی ودو ساڵە ئیسلامییەی پۆشاک ئیتاڵییە نەدەما.

یاتوم بنکەی نوێی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆسادی ئاوروپای کە پێشتر لە پاریس بوو لە بڕوکسلدا دانا. لەوێوە کاتسایەکی ناردە بێرنی سویسڕا. دوو

ڕۆژان بێهودە بە دوای سۆراخی عەبدوڵلادا گەڕا، دواتر بڕیاریدا وازبێنی. ئەو بەرەو لیفەبێلد Liebefeld کە دەکەوێتە خوارووی بێرن ڕۆیشت. کاتساکە پێنج ساڵ بەر لەئێستا بۆ دواجار لەوێ بووە، کاری ئەوکاتی وەک ئەندامێکی تیمێکی مۆساد بۆ تەقاندنەوەی بۆشکە کانزاییەکان چووبوو. بۆشکەکان بۆ پیتاندنی باکتریا ئامادەکرابوون بنێردرێنە ئێران. تیمی مۆساد بۆشکەکانی بەتەقەمەنی تەقاندنەوە. پاشان کۆمپانیاکە هەمو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێراندا پچڕاند.

لە لیفەبێلدیش کاتساکە سەلماندی کە زۆر جاران سەرکەوتن یان شکستی کاری هەواڵگری پابەندە بە پشودرێژی گەڕان و پشکنین. ئەو بەشەقامەکاندا دەگەڕا، دەیڕوانییە دەموچاوی هەمو ئەوانەی سەربە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووان. هەروەها دەستیدایە تەلەفۆننامە و بەدوای ناوی عەبدوڵلا زێندا گەڕا. چەندان کۆمپانیای بەکرێدان و دەلالی فرۆشتنی خانوان گەڕا ئاخۆ کەسیان خانوێکیان چ بە فرۆشتن یان بەکرێدان داوەتە عەبدوڵلا. هەروەها پەیوەندی بە نەخۆشخانەکانیشەوە کرد ئاخۆ هیچ کامیان سەروکاریان لەگەڵ نەخۆشێک بەناوی زێندا پەیداکردووە. هەمو جارێکیش خۆی بە یەکێ لە ئەندامانی مالباتی زێن نیشان دەدا. کە شەویش دادەهات و سۆراخی بۆ پەیدا نەدەکرا، بڕیاریدا جارێکی دیکە لە شارەکەدا، بەلام ئەم جارەیان بە ئۆتۆمۆبێلی خۆی بخولێتەوە.

دوای ئەوەی ماوەیەک بە شەقامەکاندا گوزەری کرد، پیاوێکی ڕەنگ زەیتونی کە شاڵێکی ئەستوری لەسەرما بەسەر خۆیدا دادابوو، لەپشت ستێرنی ڤۆلڤۆیەکەوە بەدیکرد. ڤۆلڤۆکە ڕێک پێچەوانەی ئەو دەڕۆیشت، بۆیە دیتنەکەی کورتخایەن بوو، بەڵام کاتسایەکە دڵنیابوو کە کابرا خۆیەتی. لەو ماوەیەی کاتسایەکە هەوڵیدا شوێنێک بدۆزێتەوە سەیارەی لێبابداتەوە، ڤۆلڤۆیەکە لەبەرچاوان ونبوو. ڕۆژی پاشتر کاتساکە ئۆتۆمبێلەکەی لەبەری دیکەی جادەکەدا ڕاگرت، ئامادە بوو کە ڤۆلڤۆیەکە دەربکەوێ بیبینێ و شوێنی کەوێ. کەمێک مایەوە ئۆتۆمبێلەکە دەرکەوت. کاتساکە کەوتە دوای.

دوو کیلۆمەتر دور، شوفێرەکە ڤۆلڤۆکەی لەبەردەم باڵەخانەیەک لە شەقامی Wabersackersrtasse ژمارە 27دا وەستاند و خۆشی چووە ژور. ئیدی کاتساکە گومانی نەما کە شوفێرەکەی ڤۆلڤۆ عەبدوڵلا زێن بوو.

کاتساکە بە دوای عەبدوڵلا دا چووە ژورەوە. لە پشت دەرگا شوشەییەکەی دەروازەکەدا هۆڵێکی بچوکی سندوقی پۆستی دی. تابلۆی ناوەکانی سەر سندوقەکە لە نهۆمی سێهەمدا ناوی عەبدوڵلای لەسەر بوو. دەرگایەکی هۆڵەکە دەکەوتە سەر نهۆمی ژێرزەمینی باڵەخانەکە. کاتسایەکە دابەزییە خوارەوە. لەسەر دیوارەکە سندوقێکی لێبوو کە هەموو هێڵی تەلەفۆنی شوقەکانی پێدا تێپەڕدەبوون. کەمێک دوای ئەوە گەڕایەوە نێو ئۆتۆمبێلەکەی خۆی.

ڕۆژی پاشتر خانوێکی لە دوری سەد مەتریک لە شەقامی Wabersackersrtasseەوە بەکرێگرت، بە دەلالەکەشی گوت لە ماوەیەکی کەمدا چاوەڕوانی چەند برادەرێکی دیکە دەکا، کە بەیەکەوە پشوی خلیسکان لەسەر بەفر بەسەردەبەن.

دانی یاتوم پلانی دیکەی بۆ مەبەستەکە ئامادەکردبوو. سەرەتا پسپۆڕێکی پەیوەندی بۆ لیفەبێلد نارد تا سندوقی هێڵی تەلەفۆنەکان بپشکنێ. پسپۆڕەکە لەگەڵ کۆمەڵێ وێنە گەڕایەوە تەلئەبیب. وێنەکان بەوردی لە لایەن هۆبەی لێکۆڵینەوە و پەرەپێدان خسترانە بەرچاو و تەلی ئەلەکترۆنی گونجاویان دروستکردن. یەکێکیان جۆرە سەتەلیتێک بوو کە تەلەفۆنە وەرگیراو و ڕەوانەکراوەکان ژوری زێنی دەگواستەوە. ئامێرە وردەکە وادانرا بوو کە بە ڕۆژ و شەو بتوانێ تەلەفۆنەکانی زێن بۆ ژوری کاتساکەی دراوسێی بگوازێتەوە. ئەویش بە فاکس ڕەوانەی تەلئەبیبی دەکردن.

لە هەفتەی یەکەمی فێبرایری 1998دا هەمو پێداویستییە تەکنیکییەکان ئامادەکران. هەنوکە یاتوم سەرقاڵی گرنگترین قۆناخی ئۆپەراسیۆنەکەی بوو، ئەویش لێبژاردنی دەستەیەکی جێبەجێکار. ئۆپەراسیۆنەکە بە دوو قۆناخدا تێدەپەڕی: یەکەمیان دەبووایە بەڵگەی تەواو لەسەر ئەوە کۆبکەنەوە کە

عەبدوڵلا لە ڕاستیدا کلیلی چالاکییەکانی حزبوڵلایە، ئەنجا بکوژرێ و لەناوببرێ.

لە نیوەی فێبرایری 1998دا هەمو شتێک ساز و ئامادەکرا بوو.

بەیانی دوشەممەی 16ی فێبرایر کەمێک بەر لە سعات حەوت و نیو، بیجۆکەی یاتۆم لە گەراجی ژێر زەمینی بارەگای سەرەکی مۆساد لە تەلئەبیب ڕاگیرا. بە ئەسانسێر بۆ ژوری کۆبوونەوە لە نهۆمی چوارەمدا سەرکەوت. لەوێ دوو پیاو و دوو ژن چاوەڕێیاندەکرد. هەر جوتەیان لە لایەکی مێزەکە دانیشتبوون، چونکە هەر ئەوەش لە سویسڕا ڕۆڵیان بوو. هەرچواریان لە سەروبەندی 30سی ساڵەدابوون، پێستیان لەبەر هەتاودا بۆرببووەوە و تەندروستیان باش بوو. چەند ڕۆژی پێشتر نێردرابوونە باکوری ئیسڕائیل تا توانستی خلیسکان لەسەر بەفریان تاقی و بەرزبکەنەوە.

ئێوارەی پێشتر بە دورودرێژی لە ئەرکە نوێکەیان ئاگادارکرابوونەوە، ناسنامەی ساختەشیان بۆخۆیان هەڵبژارد. پیاوەکان خۆیان بە بازرگانی سەرکەوتو دانابوو کە لەگەڵ دۆستەکانیان کورتە پشوێکی ڕابواردن لە سویسڕا بەسەردەبەن، یەکێکیان لاپتۆپێکی مۆدەمداری پێبوو تا بتوانێ پەیوەندی نێوان ئامێرە تۆمارکراوەکەی هێڵی تەلەفۆنی زێن بگەیەنێتە ژوری کاتساکان کەهەر سەد مەترێک دور بوو. دەبووایە ئەرکی ئێشکگرتنیان لە کۆمپیوتەرەکە بیست و چوار سعاتی بووایە بەتایبەتیش کە دەستیان بەکارەکەیان کردبا. جوتەکەی دی کە لە هۆبەی کیدۆنەکانەوە هاتبوون، دەبووایە ڕێگایەک بۆ لەناوبردنی عەبدوڵلا زین بدۆزنەوە. ئەوانیش بێچەک نێردرانە سویسڕا، لەوێ لە ڕێگەی بنکەی برۆکسلەوە مشوری چەکیان بۆ دەخورا.

لەسەر مێزی کۆبوونەوەکە ئامێری تۆمارکەر و گوێلێڕاگرتن دانرا بوون. یاتوم بە پەرۆشەوە سەیرێکی کردن و پێیگوتن دەبێ زۆر ورد بن، زیاتر لە هەمو جاران. دوا ڕێنماییەکانی کورت بوون. پرسی نازناوەکانی لێکردن کە لە هۆبەی ئۆپەراسیۆنەکان هەڵیانبژاردبوو. پیاوەکان نازناوی سۆللی

گۆلدبێرگSolly Goldberg و ماتی فینکەلستاین Matti finkelstein ژنەکانیش لیا کۆهنLeah Kohn و ڕاشێل یاکۆبسۆن Rashel Lacobsonیان لێهەڵگرتبوو. لەبەرئەوەی ڕاستەوخۆ لە تەلئەبیبەوە بەرەو سویسرا فڕین بۆیە پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکانیان بەکارهێنان. کاتێ گەیشتنە سویسرا دەیانتوانی نازناو و پاسپۆرتی ساختە هەڵبگرن.

هەر چواریان وەک ژێدەرێک لە دەزگای زانیاریی ئیسرائیلی دەریبڕی، شایستەی ڕێوشوێنەکە بوون، بەڵام لە ڕاستیدا دوای نوشستییەکەی عەممان کەم کەسی وا هەبوو بتوانن ئەرکێکی لەم چەشنە بگەیەننەسەر. دەستەکەی عەممان لە باشترین کەسانی سەر گۆڕەپانی مۆساد پێکهاتبوون. ئەندامانی دەستەکە وەک کەنەدی خۆیان ناساند و ئەزمونیشیان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا هەبوو، بەڵام ئەو چوارکەسەی بۆ ئەرکی ئۆپەراسیۆنەکەی سویسرا دانراون تەنها لە قاهیرە کاریانکربووە. قاهیرەش لەچاو شوێنەکانی دیکدا تا ڕاددەیەک بۆ مۆساد شوێنێکی ئارام بوو. ئەوان هیچ کامیان ئەزمونێکی ئیشکردنیان لە سویسرا نەبوو.

ڕەنگبێ هەر ئەوەش ببێتە مایەی ڕونکردنەوەی ئەو نامەیەی یاتۆم بە گوێرەی Sunday Times ی لەندەی کە کەسەکانی لەوە ئاگادارکردۆتەوە کە لیبەفێلد لە کانتۆنە ئاڵمان زمانەکانی سویسرایە، بۆیە خەڵکەکەی حەزیان لێیە گەر هەر شتێکی نامۆ ببینن زەنگ بۆ پۆلیس لێبدەن.

پاشان یاتوم دەستی هەرچواریانی گوشی وەک کلێشەیەکی ستاندارد داوای سەرکەوتنی لە ئەرکەکەدا بۆ کردن. دەستەکە بلیتەکانیان هەڵگرت و ئەو بیست و چوار سعاتەی داهاتویان لە خانوێکی ئارامی مۆساد لە شارەکەدا بەسەربرد.

سپێدەی پاشتر سێشەممەی 17ی فێبرایر بە سواری فڕۆکەی ئەلعال فڕینی ژمارە 347 بەرەو زوریخ Zurich دوای پابەند بوون بە ڕێنماییەکان بەوەی دوو سعاتان پێشکات لە فڕۆکەخانەی بنگۆریۆن ئامادە بوون، فڕین. ئەوان لە ڕیزی سەرنشینەکان کە هاووڵاتی ئیسرائیلی و سویسرایی بوون

جێیـانگرت. دوای دەرچـوون لـە کـۆنترۆڵی ئاسایشـپارێزی جێگـەیان لـە بزنسکلاس گرت و بە نۆشینی پێکی شامپانیا باسی پشوی داهاتویان دەکرد. کەلوپەلی لەسەر بەفر خلیسکانیشیان لە شوێنی هەگبەکاندا بوو.

لە فڕۆکەخانەی کلۆتن Klotnی زیورخ کاتسـایەکی بنکـەی بڕۆکسـل وەک شـوفێری مینیبوس چاوەڕێیدەکردن. ئـەو بـووە چاوسـاخیان و نازنـاوی Ephrahim Rubenstein هەڵگرتبوو.

لە دوای نیوەڕۆ گەیشـتنە خـانووە ئارامەکـەی لیفەبێلد. ژنـەکان دەسـتیان بەچێشتلێنان کرد و ئەنجا لەسەر قەنەفەکان سەیری تەلـەفزیۆنیان کـرد. لـە ئێوارەشدا دو ئۆتۆمبێلی بـەکرێگیراو کەسـایانم لێیدەخوڕین لـە زوریخـەوە گەیشتن. ئەوان بە مینوبوسەکە گەڕانەوە و ڕۆڵیان تەواوبوو. لە سەروبەندی سعات یەکی شەودا هەر پێنجیـان، هـەر جوتـە و بـە ئۆتۆمبیلێک ماڵەکـەیان بەجێهێشت. ڕوبەنستاین لە ئۆتۆمۆبێلی پێشەوە دابوو ڕێگای بەرەو شەقامی Wabersackerstrasse نیشـاندان. لـەوێ ئۆتۆمبێلـەکانیان بەرامبـەر باڵەخانەی ژمارە 27دا ڕاگرت، لە پشت پەنجەرەی ژوری عەبدوڵلا زێندا هیچ چرایەک دانەدەگیرسا. سۆللی و ڕاشێل و ئەفراهیم بەخێرایی بـەرەو دەرگـا شوشـەییەکەی دەروازەی باڵەخانەکـە ڕۆیشـتن. ڕوبنسـتاین تۆپـە لەزگـە وسریشـێک و گۆلـدبێرخ لاپتـۆپ و یاکۆبسـنیش کیسـەیەک کـە ئـامێرە گوێهەڵخەرەکـەی تێـدا بـوو، پێبـوو. لەونێوەشـدا لێیـا کـۆهن و ماتتی فینکلستاین کە ڕۆڵی دوو دەستگیرانیان دەبینی، چاودێریاندەکرد.

لەو بەرەوە پیرەژنێک کە خەوی لێزڕابوو دواتر پۆلیس بە 'خانمی X ' ناوی دەبرد، لەپشت پەنجەرەی ژوری نوستنەکەیدا شتێکی نائاسایی دی. پیاوێک کە ڕەبنستاین بوو خەریکی لەزگەدانە لـە جـامی دەرگـای چوونـەژوور تـاکو کەس نەیبینێ. لەپشت لەزگەکانیشەوە دیسـان دو کەسـی دیکـە وەسـتابوون. هــەروەها ئۆتـۆمبیلێکی دیکـەش تارمـایی دو کەسـی دیکـەی لـێ بـەدی دەکرا. ئیدی ئەو 'شتێکی نامۆی' دی. بڕیاریدا هەروەک یاتۆم هۆشداری بۆدا بوو زەنگ بۆ پۆلیس لێبدا.

کەمێک پێش سعات دوی نیوەشەو ئۆتۆمبێلی BMW پۆلیسی گەڕۆک لە شەقامەکە دەرکەوت، بەسەر ئەو ئۆتۆمبێلەدا هات کە کۆهن و فینکلستاین یەکدیان لەباوەش گرتبوو. فەرمانیان بەسەرداکردن لە ئۆتۆمبێلەکەیاندا بمێننەوە. شتێکی وای پێنەچوو ئۆتۆمبێلی پۆلیسی دیکەش گەیشتنە سەرو داوایان لەوسێ کەسەی هۆڵی دەروازەی باڵەخانەکە کرد بۆیان ڕونبکەنەوە کە بۆچی لەوکاتە درەنگەدا لەوێن. گۆلدەبیرخ و یاکۆسبن گوتیان پێیانوابو کە باڵەخانەکە هەمان ئەوباڵەخانەیە کە برادەرەکانیانی تێدایە، ڕوبەستاینیش گوتی خەریکی لێکردنەوەی لەزگەکان بووە نەوەک دانانەوەی.

لەوساتەدا تەواوی پرسەکە بووە گاڵتەجاڕی. گۆلبێرخ و یاکۆسبن داوایان کرد ڕێگەیان بدەن بچنەوە لای ئۆتۆمبێلەکەیان تا بچن ناونیشانە ڕاستەکەی برادەرەکانیان بێنن، ڕێگەیان پێدان و پۆلیس لەگەڵیاندا نەچوو. هەر لەوساتەدا ڕوبنستاین خۆی بەزەویدادا گوایە دڵ فشاری بۆهێناوە. هەر زو پۆلیسەکان لە دەوری کۆبوونەوە داوای کۆمەکی فریادڕەس و دەرمانیان کرد. هیچ کەس ڕێی بە هەردوو ئۆتۆمبێلەکان نەگرت کە بەخێراییەوە شەقامیWabersackerstrasse یان بڕی و لەبەرچاوان ونبوون. لە بەرەبەیان هەر چواریان گەیشتنە سەر سنوری فەڕانسە.

لەونێوەشدا ڕوبەنستاینیان گەیاندە نەخۆشخانە. بەپێی قسەی پزیشکەکان هیچ هێرشی لێدانی دڵی نەبوو. ئیدی دەستبەسەرکراو خرایە بن چاوان.

لە سعات چوار و نیوی بەیانیدا یاتۆم لە لایەن ئەفسەری مۆسادی ئێشکگر لە بارەگای سەرەکییەوە بێدارکرایەوە و لە سەرەنجامی کردەکەدا ئاگادارکرایەوە. بێ ئەوەی بانگی شوفێرەکەی بکا، یەکسەر خۆی ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو شەقامی King Saul Boulevard کەبارەگا سەرەکییەکەی لێ بوو لێیخوڕی.

دوای نوشستییەکەی عەممان پلانێکی داڕشتبوو کە چۆن ئەو جۆرە کارەساتانە لە ئاییندەدا لە خۆبگرێ. یەکەمین هەنگاوی زەنگلێدانێک بوو بۆ ئەفسەرێکی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ئەویش پەیوەندی لەگەڵ

بەڕێوبەری گشتیی نوسینگەی سەرەک وەزیراندا کرد تا بنیامین ناتانیاهۆی لێ ئاگاداربکەنەوە. ناتانیاهۆ زەنگی بۆ باڵیۆزی ئیسرائیل لە یەکێتیی ئاوروپا لە برۆکسل ئەفرایم هالڤیEfraim Halevy لێدا. دیپلۆماتی ناوبراو لە ئینگلستان لەدایکببوو، نزیکەی 30 ساڵ ئەزمونی وەک گەورە ئەفسەرێکی مۆساد هەبوو، ئەرکی ڕاگرتنی پەیوەندییەکان بوو لەگەڵ دەزگای زانیاریی ئەو وڵاتانەی پەیوەندی دیپلۆماتیانەیان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەبوو. هەروەها ڕۆڵێکی گرنگیشی لەچاککردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئوردن دوای ئۆپەراسیۆنە شکستخواردووەکەدا گێڕا.

بەگوێرەی سەرچاوەیەکی ئاگادار ناتانیاهۆ بە ئەفرایمی گوت 'چارەی ئەو کێشەیە بکە و تۆ تاهەتایە دۆستمی' .

باڵویزەکە پرسێکی بە فیلۆفاکس Filofax ەوە کرد کە بەردەوام و لەهەر شوێنێکدا بڕیاری ئەوەی دەدا کە پەیوەندی بە کێ بکا. ئەویش یاکوب کێلەربێرگەرJacob Kellerbergerی گەورە کاربەدەستی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سوێسڕای دەستنیشانکرد. هالڤی پێیگوت کەوا مۆساد ڕوداوێکی ناخۆشی لێقەوماوە و داوای لێبوردن دەکا. کاربەدەستەکە پرسی تاچەند مایەی لێبوردنە؟ باڵوێزەکە لە وەڵامدا گوتی زۆر. وەڵامەکە بە تۆنە دەنگێکی وا کە هەر دوو دۆستە کۆنەکە لەیەک تێککەیشتن. هەرواش هاڵڤی لەو بڕوایەدا بوو تا کێللەبێرگەر تەلەفۆنێکی لەگەڵ گەورە ئەفسەری فیدڕالی وەزارەتی دادی سویسڕا کارلا دەل پۆنتەCarla del Ponte دا کرد.

کارلا بەخۆی و بەبنلێوە ناوازەکەی و چاویلکە چوارچێوە پۆلاییینەکەی دانەیەکی کۆپیکراوی یاتۆم بوو، کارلاخان کەسێکی سەرنجڕاکیش بوو لە نێو دەزگای دادوەری سویسڕا، هەروەک چۆن پێشتر یاتۆم لەنێو دەزگای زانیاریی ئیسرائیلدا بوو. یەکەمین پرسی خانمەکە ئەوەبوو، ئایا بۆچی پۆلیس تەواوی دەستەی مۆسادی نەگرتووە؟ کێللەبێرگ وەڵامی نەدایەوە. پرسی دوهەمی بە بڕوابوونەوە کرد، ئایا ئۆپەراسیۆنەکەی مۆساد پەیوەندی بەئێرانەوە هەبوو؟ لەوەتەی شەڕی کەنداوەوە زۆر جاران ئیسرائیل

ڕایگەیاندووە کە کۆمپانیا سویسڕاییەکان تەکنەلۆژیای ڕۆکێت دەفرۆشنە ئێران. یاخود ئۆپەراسیۆنەکە پەیوەندی بەلایەنێکی دیکەی چالاکی ئیسڕائیلەوە هەبووە کە لە ڕاگەیاندراوەکانیان ئەوەی پێیدەگوترێ' شەرمەزارییەکەی زێڕی جولەکان؟ بانکەکانی سویسڕایی بڕێکی زۆر لە پارەو ئاڵتونی جولەکانیان خستبووە نێو قاسەکانیانەوە، پێش شەڕی دوهەمی جیهانییەوە لە لایەن جووەکان تێی ئاخنرابوو، بەڵام دواتر نازییەکانی ئاڵمان دەستیان بەسەر هەموییاندا گرت.

ڕۆژانی 21و22ی فێبرایری 1998 بەردەوام خانمەکە پرسی ئاگراوی دەوروژاندن، لەوکاتەی هالڤی هەمو هەوڵی بۆ ئەوە بوو دۆزەکە بێدەنگ ڕابگرێ.

هالڤی حیسابی ئەو دەسەڵاتەی نەکرد کە لە ئیسڕائیل دژی دانی یاتوم خۆی مەڵاسداوە. کاتێ هەواڵەکە لەنێو دەزگا بڵاوبووەوە، وره زیاتر دابەزی. ئەم جارەیان ناتوانێ ئۆباڵی نوشستییەکەی لیفەبێلد بخاتە ئەستۆی ناتانیاهۆ. خودی سەرەک وەزیران هیچی لەسەر ئۆپەراسیۆنەکە نەدەزانی. لە نوسینگەی سەرەک وەزیرانەوە پەیامی وا بۆ میدیاکان چوون کە ئیدی کاری یاتۆم تەواوبووە. هێشتا سێ ڕۆژی دیکە هالڤی لای کێللەربێرخ بوو تا وای لێبکا بێدەنگی لە دۆزەکە بکا، بەڵام کارلا پۆنتە ڕازینەبوو. لە چوارشەممەی 25ی فیبرایردا خانمەکەی دەزگای دادوەری سویسڕایی کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەگەری بەرۆکگرتنی مۆساد سازدا وگوتی ' شتێکی ناپەسەند و بێزارکەر لەنێوان دوو نەتەوەی دۆستدا قەوما' .

لە ماوەی هەفتەیەکدا دانی یاتۆم وازهێناننامەکەی لە پایەی بەڕێوبەری گشتیی مۆساد پێشکەشکرد. بە ڕاستی کارنامەکەی تەواوبوو، ناوناوبانگی مۆسادیش زیانی پێکەوت. لە دوا ساتەکانی وەک بەڕێوبەری گشتی بۆ کارمەندەکان لە کافتریای بارەگاکەیدا مایەی سەرسوڕمان بوو. کابرای پروسیانی سارددەمار و بە هەیبەت ببووە کابرایەکی سۆزدار، پەشیمانە لەوەی کە ڕویداوە، بەڵام هەوڵیشیداوە کە بەباشی ڕێبەرایەتیان بکا. دەبووایە

ئەوان هەمو کات ئەوەیان لەبەرچاو بووایە کە مۆساد لە هەمو کەس گەورەترە، سا هەر کێ بێ .کۆتایی وتەکەی داوای سەرکەوتن بوو بۆ جێگرەوەکەی. زیاتر لەوە نەیوێرا هیچ شتێک سەبارەت بە کەڵکەڵەی سەری بڵێ کە سەرەک وەزیرانێک بڕوای وابوو لە دوادویدا مۆساد لە نوسینگەیەکی خۆیەوە ڕێنمایی دەکا. یاتوم کافتێریا بێ نقەکەی بەجێهێشت. ئەو هێشتا هەر لە ڕێڕەوەکان بوو کە چەپڵەڕێزان دەستیپێکرد، بەڵام زوش دامرکایەوە.

یەک هەفتە دواتر ئەفرایم هالڤی ڕازی بوو جڵەوی دەزگای مۆساد وەربگرێ. ئەوەش دوای ئەوەی بنیامێن ناتانیاهۆی سەرەک وەزیران کە یەکەم جار بوو بە ڕاشکاوانە ئەوەی دەربڕی کە' ناوبانگی مۆساد دوای چەند هەوڵێکی شکستخواردوانە زیانی پێکەوتووە' .

وەک سیاسەتوانێکی بە ئەزمون ناتانیاهۆ بوێرانە ڕۆڵی خۆی لەشکستپێهێنانی مۆساددا باسنەکرد.

***<u>تێبینی: لێرەوە تا دوا برگەی کۆتایی ئەم بەشە، لە چاپە هۆڵەندییەکەدا نەبوو، بۆیە ڕاستەوخۆ لە چاپە ئینگلیزییەکەوە وەرگێڕدراوە، بەسوپاسەوە مامۆستا حەسەنی قازی کۆمەکی کردم و ئەو چەند لاپەڕانەی وەرگێڕان. جێگەی سەرنجە گەر بگوترێ کەوا وەرگێڕە هۆڵەندییەکە لەبەر ئەوەی ئەم چەند لاپەڕانە باسی دوو پێشهات دەکەن کە بەرۆکی دەسەڵاتدارانی هۆڵەندی دەگرێتەوە بۆیە وەری نەگێڕاون. – وەرگێڕی کوردی-</u>***

ئەفرایم هالێڤی بوو بە نۆیەم بەڕێوەبەری گشتیی مۆساد. لە ڕۆژی پێنجشەممە 5ی مارسی 1998دا نەریتی پێشووی تێکشکاند و هاوکارە پایە بەرزەکانی خۆی بانگ نەکرد کە ئاگاداریان بکا سەبارەت بە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ڕێکخراوەکە لە ماوەی دووساڵی دابێ . بە لەبەکارنانی هالێڤی، نەتەنیاهۆ لە 3ی مارسی ساڵی 2000، ڕایگەیاند، کە جێگری نوێی بەڕێوەبەری دەزگاکە، ئامیرام لیڤین، کاروباری بەڕێوەبەری کاروبارەکان بە ئەستۆوە دەگرێ. ئەو هەواڵە بە هێندێک واق وڕمانەوە وەرگیرا. هیچ

بەڕێوەبەرێکی گشتی پێشتر کارێکی بۆ داندراوی نەدرابووێ، هیچ جێگرێکی بەڕێوەبەری پێشوش دەستەبەری نەدرابووێ کە پا بنێتە کاری هەرە سەرەوە.

تا ساڵی 1999، یاتۆم شوێنپێیەکی بۆخۆی لە بواری پیشەسازی چەکی ئیسرائیلیدا کردبووەوە. ئەو بوو بە بەرپرسی فرۆشی یەک لە کۆمپانیا شیرکەتە هەرە گەورەکانی بەرهەمهێنانی چەکی ئیسرائیل؛ ئەو شیرکەتە نەتەنیا زنجیرەیەک چەکی جۆر بە جۆر بۆ بەکارهێنانی نێوخۆیی بەرهەم دەهێنێ بەڵکو بەرهەمی پیشەسازیانەی بە ڕمێنیشی لە گەڵ وڵاتانی جیهانی سێیەم دا هەیە.

یاتۆم بە شێوەی بەردەوام سەری لە وڵاتانی ئەفریقایی و نەتەوەکانی باشووری ئەمریکا دەدا. جار جار لە واشنگتنیش سەردەردەهێنێ.

وەکوو میر ئامیت، لیڤینیش هیچ ئەزموونی پێشووی لەمەڕ کاری هەواڵگرییدا نەبوو، بەڵام ئەو بە سەرکەوتووییەوە فەرماندەیی لەشکری ئیسرائیلی لە باکووری ئیسراییل و لە باشووری لوبنان کردبوو.

یەکەم ئەرکی هالیڤی ئەوە بوو کە ئەو گرژی و بێزارییە زۆرەی لە نێو خۆی مۆساددا هەبوو کەم کاتەوە کە بە شێوەیەکی جیدی سەدەمە(زیان)ی لە نێوونێوبانگی مۆساد دەدا چ لە نێوخۆی ئیسراییل و چ لە دەرەوەی.

لە ئاخاوتنی تێلیفۆنی پیرۆزبایی لێکردنی ئاسایی لە لایەن سی ئای ئەی و ئێم 16 وە بە بەڕێوەبەی نوێ گوترا ئەو دەزگایانە لایان پەسندە چاوڕێ بن، بزانن ئەو چۆن بە قەیرانییەکانی نێو مۆسادەوە دەچارێ بەر لەوەی لە قووڵایی دڵەوە و هەموو لایەنە ڕێکخراوەکانی خۆیان بەرعۆدە بکەن بۆ هاوکاریکردن لە سەر بنەمایی کراوەیی و نا نهێنی. هۆکارێک ئەوە بووە کە هالیڤی چۆن لە گەڵ توندڕەوەکانی نێو حکوومەتی ئیسرائیل ، بە تایبەتی سەرۆکوەزیرەکەی دەجووڵێتەوە.

گەلۆ هالیڤی شارستانی، کە تەنێ ساڵێکی مابوو بۆ خانەنشینی، بە ساڵانی زۆر، کەسی هەرە پیری کە کارێکی ئاوای بدرێتێ، دەیتوانێ نەتەنیاهوو

قەمتەر بکا و لە مەودایەکی لەبار دا ڕایبگرێ؟ ئەوەگشت لە بەر کارامەیی بێ ئەملا و ئەولای دیپلۆماتیکی هالێڤی _ ئەو دەورێکی سەرەکی گێڕا لەو وتوویژانەدا کە گەیشتە پەیمانی ئاشتی لە گەڵ ئۆردۆن لە ساڵی 1994 _ ئەو بۆ چەندین ساڵ لە کاری ڕەشی هەواڵگری دوور کەوتبووەوە. لەوەتی ئەو لە گەڵ مۆساد کەوت ، ئەو دەزگایە بە شێوەی لە زێدە نیشانەی ئەوەی پێوە دیاری دەدا کە لە ژێر کۆنترۆڵ دەرکەوتبێ چونکە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی هەوڵیان دەدا بەشی خۆیان لە پلە چوونەژوورەوە بەدەست بهێنن. زۆربەی لە تەمەنی ساڵەکانی نێوەی ژیانیان دا بوون. گەلۆ هالێڤی دەیتوانی بەدڵقایمی لە گەڵیان بجووڵێتەوە؟ گەلۆ بەڕێوەبەری نوێ ئەوەندە کارامەییەی هەبوو کە ورەی هاوکارانی بەرزکاتەوە؟ ناردنی ئەوان بۆ بەشداری لە ڕابواردنەکانی بروکسێل دا بە ئەستەم دەکرێ بە ئامادەیی هەرە باش دابندرێ بۆ ڕێبەری کردنی مەئموووران و پێشگرتن بە دەست لە کارکێشانەوەیان. لایەنی ڕەخنەگرانە ئەوەبوو، هالێڤی هیچ ئەزموونێکی شەخسی نەبوو لە مەیدانی کردەوە دا. ئەو هەمیشە لە کارەکەی پێشووی لە مۆساد دا پیاوی پشتی مێز بوو .و بە ڕاستیش لە ماوەی دوو ساڵ دا چ دەکرا بە دەست بخرێ؟ یان بە ڕاستی ئەو تەنێ لەوێ بوو بۆ ئەوەی ئەوەی نەتەنیاهوو دەیەوێ جێ بە جێی بکا، یان، ئەوەی ژنی نەتەنیاهوو، سارا، دەیەوێ؟ لە نێو کۆمەڵگەی هەواڵگری ئیسرائیل دا گومان و دڕدۆنگی بەردەوام بوو سەبارەت بەو دەورەی سارا گێڕاویە لە لابردنی یاتۆم دا، پیاوێکی کە ئەو هەرگیز نێوانێکی گەرمی لە گەڵدا نەبوو.

هالێڤی ڕێگەیەکی دیتەوە بۆ ئەوەی دڵی وەدەست بهێنێ. ئەو دەزگایەکی ئێلێکترۆنی زۆر چکۆڵەی پێشکێش کرد کە زانایانی لێکۆڵینەوەی مۆساد سازیان کرد بوو. دەکرا ئەو دەزگایە لە ژێرەوە بشارێتەوە و دەرفەتی ڕزگار کرانی دەرەخساند بێتوو لە ڕووداوێکی نەلواو دا بکەوێتە دەست تێرۆریستان. بە بەکار هێنانی گەرمایی خۆزایی بەدەن، ئەو دەزگایە گرێ درابوو بە یەک لە ساتێلیتە فەزاییەکانی ئیسرایل و دەرفەتی دەدا بەو

کەسەی ئەو دەزگایەی لە بەدەنی دا شاردبووەوە گورج ئەوان لە شوێنی شاردنەوەی خۆی ئاگادار کا .کەس نازانێ گەلۆ سارا ئەو دەزگایەی لە بەدەنی خۆی ڕۆ کردبوو یان نا.

بەڵام زۆر زوو کێشەی زۆر بەگوشارتر لە ڕازیکردنی ژنی سەرۆکوەزیر هاتنە گۆڕێ. یەکەم ئۆپەراسیۆنی سەرەکی کە هالێڤی بە دڵگەرمییەوە پەسندی کردبوو، هەوڵدان بوو بۆ دامەزراندنی پێگەیەکی سیخوڕی لە قوبرس، کە بە شێوەیەکی کارەساتاوی هەڵوەشایەوە. دوو مەئمووری مۆساد، لە دێوجامەی مامۆستای کە هاتوون بۆ پشوودان، زۆر زوو لە لایەن دەزگای هەواڵگری پچووک بەڵام بەکاری قوبرس ئاشکرا کران. ئەوان هەڵیان کوتایە سەر ئەو ئاپارتمانەی ئەو دوو مەئموورە بە کرێیان گرتبوو و زۆر ئامرازی تێکنیکی بەرزیان دیتەوە، کە دەیانتوانی کاری سیخوڕی بکەن لە سەر دامەزراوەکانی قوبرسی بۆ کاری بەرگری بە دژی وڵاتی دراوسێی تورکیا.

هالێڤی جێگرەکەی خۆی نارد بۆ قوبرس بۆ ئەوەی وتووێژ بۆ بەردانی دوو پیاوەکە بکا. لەوانەیە ئەو پێی خۆش بووبێ بۆ خۆی بچێ. ئازەر وایزمان،سەرۆککۆماری ئیسرائیل، دۆستێکی شەخسی نزیکی سەرۆککۆماری قوبرس، بیافکۆس کلێریدێس بوو.( لە تافی لاوەتی دا هەر دووکیان بە یەکەوە لە هێزی هەوایی بریتانیا دا خزمەتیان کردبوو). وایزمان سەرۆکی ستادی خۆی نارد بۆ قیبرس " بۆ خواردنێکی دۆستانە لەوێ" و دوایە هێرشێکی زۆر توندی کردە سەر هالێڤی بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە تەنانەت نەتەنیاهووش دەستی لەوە دەگێڕاوە کە هێرشی ئەوتۆ بکاتە سەر یاتۆم.

بە دوای ئەوەدا، دیسان شەرمەزارییەکی ئاشکرای دیکە قەوما، دوای ئەوەی کە نەخشەی کوژرانی سەدام حوسێن لە کاتی سەردانی حەزەکەی دا پەسند کرابوو، بەڵام هەڵوەشایەوە لە بەر ئەوەی ڕۆژنامەنووسێکی ئیسرائیلی پێی زانیبوو و ئاشکرای کرد. نەتەنیاهوو ئەو کاتە پێی زانی کە هەواڵنووسەکە

تەلەفۆنی بۆ دایرەكەی كرد بۆ ئەوەی بزانێ لە سەر ئەوە دەڵێ چی. جارێكی دیكە هاڵێڤی بەلەنگاز تووشی بە تووشی دۆخێكی نالەبارەوە هات.

بەحەوتووان سەرۆكوەزیری ڕكهەستاو، جگە لە سەر بابەتی زۆر گرنگ نەبێ دەستی لە هەموو جۆرە پێوەندی كردنێك لە گەڵ سەرۆكی مۆساد گێڕایەوە، تا كۆتاییەكانی مانگی نۆڤامبری ساڵی 1998. ئەو دەمی سەرۆكوەزیری توركیا، بولەند ئێجێویت، تەلەفۆنی بۆ نەتەنیاهوو كرد و داوای لێكرد مۆساد یارمەتییان بدا بۆ گرتنی عەبدوڵا ئۆجالان، ڕێبەری كورد، كە لەمێژ بوو لە لایەن وڵاتانی دیكەوە مۆركی تێڕۆریستی لێدرابوو. توركیا ئەوی بە بەرپرسی كوژرانی 30000 كەس لە خاكی خۆیدا دەزانی. بۆ زیاتر لە بیست ساڵان پارتیی كرێكارانی كوردستانی ئۆجالان، پ.ك.ك. شەڕێكی پارتیزانی بەرپاكردبوو بۆ ئەستاندنی ئۆتۆنۆمی بۆ12 میلیۆن كوردی تركییە كە هیچ مافی كەمایەتییان نییە وەكوو مافی پەروەردە یان مۆڵەتی بڵاوكردنەوە بە زمانی خۆیان.

ئۆجالان بە بەردەوامی و بەهاسانی و هەوڵێكی كەم توانیبووی خۆی لە دەست دەزگا سیخوڕییەكانی توركیا خۆی،بپارێزێ. ئەو ڕێبەرێكی ئەوتۆ بوو كە هەست و خۆشەویستییەكی پێغەمبەرانەی لە نێو خەڵكی خۆی دا دەبزواند. چ پیاو، چ ژن، یان منداڵ ئامادەبوون لە پێناوی دا گیانی خۆیان بەختبكەن. بۆ زۆر كەسان ئەو ببووە هێمای ئەفسانەیی قارەمانی ڕۆمانی بارۆنێس ئۆرچزی "پیمپێرنێلی لەچەك سپی" كە لێقەوماوان لە مەترسی مردن ڕزگار دەكا، لە هەر جێیەك دوو یان زیاتر كورد لە دەوری یەكتر كۆببانەوە باس باسی كارەكانی وی بوو. خەڵك بە پەرۆشەوە گوێیان دەدا قسە و وتارەكانی، نوێنەری سەروەبەرنەهێنان و تەحەدا كردن بوو لە توركیا.

مانگی نۆڤامبری ئەو ساڵە – ئۆجالان دوای دزە كردن بە مۆسكۆ دا – سەری لە ڕۆما دەرهێنا. حكوومەتی ئیتالیا دەستی لەوە گێڕاوە كە ڕادەستی توركیای بكاتەوە – بەڵام دەستی لەوەش گێڕاوە مافی پەنابەری سیاسی

بداتێ. پێشتر لەوێ بە پێی داوای ئاڵمان و گرتنامەیەک کە بە تاوانی سەفەر کردن بە پاسپۆرتێکی ساختە بۆی دەری کردبوو گیرا بوو، بەڵام کاتێک بۆن لە ترسی ورووژانی کۆمەڵگەی گەورەی کوردی دانیشتووی ئاڵمان داخوازی ڕادەست کرانەوەی ئۆجالانی وەرگرتەوە،ئەو ئازاد کرا. ئەوە ئەو دەمەی بوو کە سەرۆکوەزیری تورکیا بولەند ئێجێوید تەلەفۆنی بۆ نەتەنیاهوو کرد.

بۆ ئیسرائیل، پێوەندییەکی نزیکی هاوکاری لەگەڵ تورکیا تۆوێکی گرینگە لە ستراتێژییەکەیدا و بۆ مانەوەی دیپلۆماتیکی خۆی لە هەرێم دا. نەتەنیاهوو بەڵێنی بە ئێجێوید دا و فەرمانی بە هالێڤی دا کە ئۆجالان ببینێتەوە. ئەوە دەبوو " ئۆپێراسیۆنێکی ڕەش" بێ – واتە تێوەگلان و بەشداری مۆساد لەو کەتنەدا قەت نابێ بدرکێ. ئەگەر کارەکە بە سەرکەوتووییەوە بکرێ هەموو شانازییەکی بۆ دەزگای سیخوڕی تورکیا دەبێ.

ئەو پلانە نێوی کۆدی "چاوکراوە"ی لێنرا. ئەوەش نیگەرانی ئاڵێڤی دەدرکاند کە تا ئەو جێیەی دەلوێ ئەو کردەوەیە نابێ چەت لەو ئۆپێراسیۆنانە بخا کە ئەو لەنێو خۆی عێراق دا بەڕێوەی دەبرد.لەوێ، کاتساێ مۆساد شانبەشانی سەرهەڵداوە کوردەکان کاریان دەکرد بۆ پشێوی سازکردن بۆ ڕێژیمی سەدام.

شەش ئاژانی مۆساد ناردرانە ڕۆما. ئەوان بریتی بوون لە "بات لەڤەیها" یەک ، ژنێک، و دوو تێکنیسییەنی سەر بە یاهالۆمین، واتە یەکەی پێوەندی تێکنیکی مۆساد.

ئەوان لە خانوویەکی نهێنی مۆساد لە نزیک پانتیون بوون و لەوێوە کارەکانیان دەکرد، تیمەکە چاوەدێری بە سەر ئاپارتمانەکەی ئۆجالاندا کە لە نزیک ڤاتیکان بوو، دامەزراند. ئاژانە ژنەکە ئامۆژگاری کرا هەوڵ بدا پێوەندی بە ئۆجالانەوە ببەستێ. ئەو ئاژانە ئەو ڕێنوێنییە چاک دامەزراوانەی ڕەچاو دەکرد کە پێشتر لە لایەن ئاژانێکی مێینەی دیکەی مۆساد ڕا دەکار کرابوون بۆ دەردەست کردنی مۆردێخای ڤانوونو وپێوە بوونی هەر لە هەمان شاردا زیاتر لە دە ساڵ لەمەوبەر. بەڵام پلانی ئەوەی کە هەر هەمان شت لەگەڵ

ئۆجالان بکەن لە بەر ئەوەی کە ڕێبەری کورد لەپڕ ڕۆمای بەجێهێشت سەرنەکەوت.

تیمی مۆساد دەستی کرد بە شوێنگێڕی ئۆجالان لە هەموو بەستێنی مێدیتێرانە دا: سپانیا،پورتوگاڵ،تونس، مەراکش ، و سووریە. ئۆجالان لەو هەموو وڵاتانە ببوو – بەڵام هەر کە داڵدەیان نەدابوو بەجێی هێشتبوون.

لە 2ی فێڤرییەی ساڵی 1999 دا، ڕێبەری کورد دەرکەوت کە خەریک بووە بێتە نێو هۆڵەند. حکومەتی هوڵەند ڕێگەی پێنەدا. ئەفسەرێکی ئەمنییەتی هوڵەند لە فڕگەی سخیپۆل Schipolی ئامستردام سەرۆکی وێستگەی خۆجێی مۆسادی لە هوڵەند ئاگادار کرد کە ئۆجالان سواری فڕۆکەیەکی کۆمپانیای کەی ئێل ئێم KLM بووە و بەرەو نایڕووبی چووە. مۆسادییەکانی شوێنپێگێڕی ئوێجالان دەستبەجێ بەرەو پێتەختی کێنیا وەڕێکەوتن، و سەرلەبەیانی پێنجشەمۆ، 5ی فێڤرییە گەیشتنە ئەوێ.

کێنیا و ئیسرائیل بە ساڵان هاوکارێیەکی نزیکی "لەیەک تێگەیشتنیان " سەبارەت بە کارو باری هەواڵگری پێش خستبوو. بەشێک لە کریاری " سافاری" مۆساد لە ئەفریقای نێوەندی ئەوە بوو کێنیاییەکانی لە چالاکی تۆڕە سیخوڕییەکانی بێگانە لەم وڵاتە ئاگادار کردبوو. لە بری ئەوە، کێنیاش بەردەوام بوو لە سەر ئەوەی کە " پلەیەکی تایبەت" بدا بە مۆساد و ڕێگەی بدا لە نێوشار دا خانووی شاراوە و هێمنی هەبێ و دەستبەجێ دەستی بگاتە دەزگای پچووک بەڵام کارامەی سیخوڕی کێنیا.

تیمی مۆساد زوو ئۆجالانیان هەڵنا و زانیان لە خانووبەری باڵوێزخانەی یۆنانە لە نایڕووبی. جار و بار کوردان – کە مۆسادییەکان پێیان وابوو پاسەوانی ئۆجالانن – لە خانووبەرەکە ڕا دەهاتنە دەرێ و دەیچوونەوە.

هەموو شەوێ سەرۆکی تیمی مۆساد گوزارشتی دەدا بە تەل ئەبیب.

فەرمانی تەل ئەبیب وەک هەمیشە بوو: چاوتان بە سەرییەوە بێ بەڵام هیچ مەکەن. لە پڕ فەرمانەکە بە تەواوی گۆڕا. بە " هەموو شێوەکان لە بەردەست

دان" ئۆجالان دەبوو لە خانووی باڵوێزخانەی یۆنـان بهێندرێتـە دەرێ و بۆ تورکیا هەڵبفڕێندرێ.

فەرمانەکە هی هالیڤی بوو.

بەخت و ئیقباڵ ڕووی لە تیمی مۆساد کرد. یەک لە کوردەکان لە باڵوێزخانە هاتە دەرێ و بە ماشێنەکەی بەرەو بارێک چوو لە نزیک هۆتیلی نۆرفۆڵک کە جێیەکی تەواو بە دەرەوەیە. لە ئاکارێک دا، کە تاکتیکێکی کلاسیکی مۆسادە، یەک ئەندامانی تیمەکە " هاتە نزیک کوردەکە". بە پێستی ئەسمەر و بە کوردییەکی ڕەوان،ئاژانەکە خۆی وەکوو کوردێک ناساند کە لە نایرووبی کار دەکا. ئەولە قسەکانی کوردەڕا هەستی پێکرد کە ئۆجالان بێ ئۆقرەیە. دوایین داوخـوازی بـۆ وەرگرتنـی پەنابـەری لـە ئـەفریقای باشـوور هـیچ وڵام نەدراوەتەوە.

وڵاتەکانی دیکەی ئەفریقاش هەر ئاوا بێمەیل بوون کە ڤیزای هاتنە ناوەوەی وڵات بدەنە ڕێبەری کورد.

تیمی گوێقوڵاغی مۆساد کەرەستە تێکنیکییەکانی خۆیان بەکار هێنا بۆ گوێ هەڵخستن لە هەموو جۆرە پێوەندی و قسەیەکی کە لەنێو خۆی خانووبەرەکە و لە دەرەوە ڕا دەکرا. ئەوە ئاشکرا بوو کە یۆنانیش دەست لەوە دەگێڕێتەوە کە داڵدەی ئۆجالان بدا.

ئەو ئاژانەی مۆساد کە لە بارە کە چاوی بە کوردەکە کەوتبوو دەست بـە کار بوو.

ئەو تەلەفونی کرد بۆ کوردەکە لە خانووبەرەی باڵوێزخانەی یۆنان و داوای لێکرد" دەستبەجێ چاوی پێی بکەوێ". ئـەوان جارێکی دیکـەش لـە بارەکـە یەکتریان دی. ئاژانەکە بە کوردەکەی گوت ئەگەر ئۆجالان لە خانووبـەرەی باڵوێزخانەی یۆنان دا بمێنێتەوە ژیانی لە مەترسی دایە. تەنیا هیوا ئەوەیە کە بچێتـەوە لای هاوکووفـە کوردەکـانی، نـەک لـە تورکیـا، بـەڵکوو لـە بـاکووری عێراق، لەو چیا بەربڵاوانە دا، دەتوانێ خۆی بپارێزی و خۆی بۆ ڕۆژێکـی دیکـە کۆ کاتـەوە. ئـەو پلانـە لـە ڕاسـتیدا شـتێک بـوو کـە ئۆجـالان دەسـتی

پێکردبوو کە بیری لێ بکاتەوە و تیمی گوێهەڵخەری مۆساد لە قسەکانی دا ئەوەیان گوێ لێ ببوو. ئاژانەکە کوردەکەی پێمل کرد کە بچێتەوە باڵوێزخانەی یۆنان و هەوڵ بدا قەناعەت بە ئۆجالان بهێنێ بۆ ئەوەی خۆی بێتە دەرێ و لە سەر پێشنیارەکە بدوێن.

داوەکە بە هاسانی _ و کوژەرانە _ نرایەوە. ئێستا تەنێ دەبوو چاوەڕێ بکرێ کە چەندەی پێدەچێ تا ئۆجالان بە قولاپەوە بێ.

لە سەر بنەمای ئەو پەیامە ڕادیۆییانەی لە نێوان وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یۆنان و باڵوێزخانەکەیان ئاڵوگۆڕدەکران تیمی مۆساد دەیزانی کە هەر چەند ڕۆژێکی ماوە خانەخوێیەکانی ئۆجالان کە هەتا دەهات بێمەیلیان بۆ حاواندنەوەی زیاتر دەبوو، ڕێگەی لە دەرگە دەرکەوتنی پێ نیشان بدەن. لە پەیامێک دا کە تەنێ"تایبەتی بوو بۆ سەفیری یۆنان لە کێنیا"، سەرۆکوەزیری یۆنان کۆستاس سیمیتیس گوتبووی بەردەوامبوونی مانەوەی ئۆجالان لە خانووی سەفارەتخانە دا دەبێتە هۆی "تووش بوون وڕووبەڕووبوونەوەی سیاسی و تەنانەت سەربازیانەش" لە یۆنان.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر دا فڕۆکەیەکی جێتی Falcon-900بەڕێوەبەری ئەرکەکە لە فڕگەی ویلسۆن لە نایرۆبی نیشتەوە. فڕۆکەوانەکە گوتی بە دوای گرووپێک بازرگاندا هاتووە کە دەبێ بیانبا بۆ کۆنفڕانسێک لە ئاتێن.

ئەوەی کە دوای ئەمە قەوما هێشتا بە گەرمە قسەی لێوە دەکرێ .پارێزەری ئاڵمانی ئۆجالان دواتر ئیدیعای کرد" لە بەر خراپ جووڵانەوەی کاربەدەستانی کێنیایی" ئۆجالان " کاریگەرانە ڕاکێشی دەرەوەی خانووی سەفارەتخانە کرا". بەڵام حکوومەتی کێنیا و باڵوێزخانەی یۆنان لە نایرۆبی بە توندی ئەو تاوانەیان وەدوایە داوە.یۆنانییەکان پێکێشیان کرد کە ڕێبەری کورد بە پێچەوانەی ڕاوێژ و بە مەسڵەحەت نەزانینی خانەخوێیەکانی سەفارەتخانەکەی بەجێهێشتووە.

شتێک بێ ئەملا و ئەولا ڕاستە و قسەی لە سەر نییە.

جێتی بەڕێوەبەری کە ئۆجالانی دەنێو دابوو لە نایرۆبییەوە هەڵفڕی .

هــەر کــە فڕۆکەکــە فــەزای هــەوایی کێنیــای بەجێهێشــت پرســیارەکان دەستیانپێکرد:

گــەلۆ تیمــی مۆســاد کــردەوەی ئاســایی خۆیــان کردبــوو و دەرزییــەکی بێهۆشکەریان لـە ئۆجـالان دابـوو هـەر کـە ئـەو لـە حەوشـەی باڵوێزخانـە دەرکەوتبوو؟ گەلۆ ئەوان لە سەر جادە ڕفاندبوویان _ هەر بەو شێوەیەی کە تیمێکی دیکەی مۆسـاد بـە سـاڵان پێشـتر ئـادۆڵف ئایخمـەنیان لـە بیۆنێس ئـایرێس ڕفانـدبوو؟ گـەلۆ کێنیـا چـاوی قووچانـد لـە کردەوەیـەک کـە گشـت قانوونە نێونەتەوەییەکانی پێشێل دەکرد؟

چەنـد سـەعات دواتـر ئۆجـالان لـە زینـدانێکی تورکیـدا دەردەسـت کـرا، سەرۆکوەزیری شادمان بولەند ئێجێڤیت لە پەردەی تێلێڤیزیۆنەوە دەرکەوت و باسـی "سـەرکەوتنی هـەواڵگری ... و ئـەو عەمەلییاتـە چاوەدێریانـە باشـەی کـرد لـە نـایرۆبی لـە مـاوەی دوازدە ڕۆژان دا بـەڕێوە چووبـوو". ئـەو هـیچ ئاماژەیەکی بە دەوری مۆساد نەکرد.ئێجێویت بـە ڕێسـاکانەوە نووسـابوو و لێی لانەدەدان.

بۆ ئەفرایم هـالێڤی سـەرکەوتنی ئـەو ئۆپەڕاسـیۆنە بـە واتـای لـە کیسـدانی تۆڕێک لە مەئموورەکانی لە عێراق بوو کە پشتیان بە پشتیوانی کوردی زۆر گەرم بوو .ئەو یەکەم سەرۆکی مۆساد نەبوو ئەو بیرە ختۆکـەی بـدا ئەگـەر سـەرۆکوەزیر بێنیـامین نەتـەنیاهوو دەوری " تفـەنگچی بـەکرێگیراو" بـدا بـە مۆساد لە درێژ خایەندا ئاکامی چ دەبێ لە سەر هەوڵ و تێکۆشانی بەربڵاوتر بۆ کۆکردنەوەی زانیاری.

دەنگی سـەرکەوتنی ئـەو ئۆپێڕاسـیۆنە بێ ئـەملاو ئـەولا کـپ کـرا لـە بـەر تێشکانێکی دیکەی هالێڤی تووشی هات. لـە 5ی ئۆکتـۆبری سـاڵی 1992 دا، جێتێکی بارهـەڵگری کۆمپانیـای هـەوایی ئـەلعالی ئیسـراییلی بـە سـەر ریـزە ئاپارتومانێـک لـە نزیـک فڕگـەی سـخیپۆلی ئامسـتردامدا کـەوتـە خـوارەوە. چلوسێ کەسی کوشـت و بـە دەرزەنـان خـەڵکی بریندار کـرد. لەودەمییـەوە بەسەدان کەسی کە لـەو ناوچەیـە دا دەژین نـەخۆش کـەوتوون. سـەرەڕای

هەڵمەتێکی بەربڵاو بۆ شاردنەوەی باری فڕۆکەکە، ئاشکرابوو کە مادەی شیمیایی بکوژ بوون .لەوانە ئەو وردیلانەی سارینی لێ ساز دەکرێ، گازێکی عەسەبی کوژەر. و سەرنج ڕاکێشرایە سەر هەبوونی نێوەندێکی توێژینەوە لە دەور و بەری تێل ئاڤیڤ، کە لەوێ زانایان، لە ناو دا زۆر شتی دیکەش، کۆمەڵێک چەکی شیمیایی و بیۆلۆژییان بۆ یەکەی کیدۆنی مۆساد بەرهەم هێناوە .

ئەنیستیتووی لێکۆڵینەوەی بیۆلۆژی لە دوازدە میلی خوارووی ڕۆژهەڵاتی تەل ئەبیب هەڵکەوتووە. ئەو دامەزراوە لە سیستمی بەرگری چەند توێژاڵکی ئیسراییل دا دەورێکی گرینگ دەگێڕێ.لە تاقیگە و کارگەکانیدا زنجیرەیەکی بەرفرەوان لە چەکی شیمیایی و بیۆلۆژی بەرهەم دەهێندرێن. شیمی زانانەکانی ئەنیستیتووەکە – کە هێندێکیان لە سەروبەندێک دا کاریان بۆ کەی جی بی KGBشووروەوی و دەزگای ستازی Stasiئاڵمانی ڕۆژهەڵات کردووە – ئەو ژارەیان بەرهەمهێنا کە بۆ هەوڵی کوشتنی خالید مەشعەل، سەرۆکی گرووپی بنچینەگری(ئسولی) ئیسلامی حەماس دەکارهێندرا.

بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەی هەنووکەی ئەنیستیتووەکە ڕیزێک مادەی نەخۆشخەر وەبەر دەگرن، کە بە پێی ڕاپۆرتێکی نهێنی سی ئای ئەیCIA بۆ ویلیام کۆهن،وەزیری کاروباری بەرگری ئەمریکا،" تایبەتن بە ئێتنیکەکان".ئەو ڕاپۆرتەی سی ئای ئەی ئیدیعا دەکا زانایانی ئیسرائیلی" هەوڵدەدەن بۆ کەڵکوەرگرتن لە پێشکەوتنە پزیشکییەکان بە ڕێگەی ناسینەوەی هێندێک ژێنی تایبەتی کە لە لەشی عەڕەبەکاندایە بۆ سازکردنی باکتریایەکی کە دەتوانێ ژێن(جین) یان ڤیروس بگۆڕێ".

ڕاپۆرتەکە بەو ئاکامە دەگا کە،" ئەو کارە هێشتا لە قۆناخی بەرایی دایە، مەبەست ئەوەیە کەڵک لەو شێوەیەی وەربگیرێ ڤیرووس و هێندێک چەشنی باکتریا بتوانن دی ئێن ئەی لە سیلوولە زیندووکانی لەشی زۆران دا بگۆڕێ." ئەو ئینستیتوویە لاسایی ئەو کارانە دەکاتەوە کە لە لایەن زانایانی ئەفریقای

باشوور ڕاکرا لە سەر وبەندی ئاپارتاید دا بۆ سازکردنی " چەکی پێستی کە ئامانجی تەنێ خەڵکی ڕەش بوو".

کاتێک نێلسۆن ماندێلا هاتە سەر کار دەست لەو لێکۆڵینەوەیە هەڵگیرا بەڵام بەلانی کەمەوە دوو لەو زانایانەی کە لە ئەفریقای باشوور لە سەر ئەو بەرنامەیە کاریان دەکرد دواتر باریان کرد بۆ ئیسرائیل.

بیرۆکەی ئەوەی کە دەوڵەتی جوولەکە لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ بە دەستەوە بگرێ بووە هۆی بەرزبوونەی دەنگی زەنگی مەترسی – نەک هەر لە بەر وەیەکچوونی جاڕزکەر لەگەڵ ئەو ئەو تاقیکردنەوەی سەباڕەت بە ژێن لە لایەن نازییەکانەوە کران. قسەیەکی دەدی زووکرDedi Zucker، ئەندامێکی پارڵمانی ئیسرائیل، کێنێست لەو بارەیەوە ئاستە کراوە کە گوتوویە" ناکرێ ڕێگەمان پێ بدرێ کە چەکی ئەوتۆ ساز بکەین".

ئەوە مادە و کەرەستەی ئەوتۆ بوون کە فڕۆکە جێتەکەی شیرکەتی هەوایی ئەلعال لە 114 تۆنە بارەکەی دا دەی گواستەوە لە شەوی ئۆکتۆبری ساڵی 1992 دا کە هەروەها مووشەک و کەرەستەی ئێلێکترۆنیکی سایدویندریشی لەگەڵدا بوو .لە هەموویان کوژەرتر دوازدە بەرمیل دی ئێم ئێم پیDMMP، وردیلەی گازی سارین بوون. ئەو مادە شیمیاییانە لە سۆڵکاترۆنیک Solkatronicکڕدرابوون، بەرهەمهێنەرێکی مادەی شیمیایی کە نێوەندەکەی لە نیوجێرسی New Jerseyیە .ئەو کۆمپانییە پێکێشی دەکا ئیسرائیل پێی گوتووە ئەو مادە شیمیاییانە بۆ"تاقیکردنەوەی ماسکی گاز بەکار دەهێندرێن." لە ئەنیستیتووی لێکۆڵینەوەی بیۆلۆژی دا هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆ ناکرێ.

ئەو ئەنیستیتوویەکە لە ساڵی 1952 دا ، لە پەناگەیەکی کۆنکرێت دا دامەزرا، ئێستا گەورە بووەتەوە و شوێنێکی دە هێکتاری وەبەر دەگرێ. ئەو دار میوەیانەی لەوێ بوون نەماون ، جێیان بە دیواری بەرزی کۆنکرێت گیراوەتەوە و لە سەردیوارەکان دەزگای هەستگر دامەزراندراوە. پاسەوانی چەکدار ئاگاداری لە شوێنەکە دەکەن. ماوەیەکی درێژە ئەو ئەنێستیتوویە لە

هێمنــی گشــتی بــزر بــووە. نێونیشــانە تەواوەکــەی لــە دەوروبــەری نــێس زیۆنـا Nes Ziona لـە دەفتـەری تەلـەفۆنی تێلاڤیێڤ دا لابـراوە و نـەماوە. شوێنی لە سەر هەموو نەخشەکانی سەبارەت بە ناوچەکە سڕاوەتەوە. ڕێگە بە هیچ فڕۆکەیەک نادرێ بە سەر ناوچەکەدا هەڵفڕێ.

تەنێ دیمۆنا لە بیابانی نەقەب بە نهێنیکارییەکی زۆرترەوە دەورە دراوە. لە دەفتەری ڕێنوێنی نهێنی هێزی بەرگری ئیسرائیل دا، نێوی ئەنیستیتوو تەنێ وەکوو دەزگایـەکی " کە خزمـەت بە وەزارەتـی کاروبـاری بـەرگری "دەکـا نووسراوە. وەکوو دیمۆنا، زۆربەی تاقیگاکانی لێکۆڵینەوە و بەرەوپێشبردنی ئەنیسـتیتوو لــە بــن زەویــدا شــاردراونەتەوە و داپۆشــراون. دەوانــدا ئــەو بیوشیمیست و زانایانەی ژێنێتیک بە بوتلییەکانی مەرگەوە دەژین : وەکـوو تۆکسینس کە دەتوانێ خۆراک ژاراوی کا و خواردنی خۆراکی ئـەوتۆ بگاتـە مردن، تەنانەت مادەی زۆر کوژەرتری دی وەکوو ژاری ئەسپی ڤێنێزولایی و ئانتراکس.

لە تاقیگەکانی دیکە دا، کە بە لوولەی هەوابەند دەکرێنەوە، زانایان لە سـەر ژمارەیەکی زۆر لە مادەی گازی دەمار کار دەکەن،مادەی خنکێنەر، مـادەی خوێن، مادەی زیپکەچێکەر. ئەو مادانە بریتین لە تاتوم، کە هیچ بۆنی نییە و نابینـدرێ کاتێک بـە هـەوا دا بڵاودەبێتـەوە یـان وەکـوو هـەڵم دەردەکـەوێ. سۆمان یش، کە یەکێک لە دوایین گازە عەسـەبییەکانی نازییـەکان بـوو وەک هـەڵم دەردەکـەوێ بـەڵام بەرامـەی میوەی لێوە دێ. زنجیرەی گـازە زیپکـە چێکەرەکان بریتین لە کلۆرین، فۆسژێن و دیفۆژێن کە بۆنی گیا دەدەن.

ماددەی وا کار لە خوێن دەکەن بـریتین لەوانـەی وا لـە گـازی سـیناییدەوە بەرهەم دێن. مادده زیپکە چێکەرەکان بە پێی ئەو توخمانەی ساز کراون کە یەکەم جار لە شەڕی یەکەمی جیهانی دا دەکار کران.

ئەو ئەنیستیتوویە کـە لـەدەرەوە، هەرچـەند پەنجـەرە و دیـواری بـە ڕەنـگ سـواخ دراوی دەبینـدرێ، لــە نێوخــۆ دا بــە شــێوەیەکی ئەوپــەڕی ئاسـایی پاسەوانی لێدەکرێ. بۆ ئەوەی کەسێک بتوانێ بچێتە هەر بەشێکی پێویسـتی

بە هەبوونی ناوی کۆد و پێناسە هەیە. گارد کێشکی کۆریدۆر و داڵانەکانی دەکێشن. دەرگە و دەروازە دژە بۆمبەکانی تەنێ بە کارتی ئەلەکتریکی دەکرێنەوە و هەموو ڕۆژێ کۆدی ئەو کارتانە دەگۆڕدرێ.

گشت ئەو کەسانەی لەو ئەنیستیتووە کار دەکەن مانگێ جارێک لەشساخییان کۆنترۆڵ دەکرێ، هەموویان زۆر بە چڕی تاقی کراونەتەوە. کەسوکار و ئەندامانی بنەماڵەکانیشیان هەر ئاوا بە تاقی کراونەوەتەوە و کۆنترۆڵ کراون.

لە ئەنیستیتوەکەدا بەشێکی تایبەتی هەیە کە ئەرکی سازکردنی چەکی کوژەری تۆکسینە بۆ ئەوەی مۆساد دەکاری بکا بۆ ئەو کردەوانەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە پەسند کراون، بۆ کوشتنی دوژمنانی ئیسراییل بە بێ هیچ لێپرسینەوە و محاکەمەیەک. بە ماوەی ساڵان هەرنەبێ 6 لە کارکەرانی ئەو دامەزراوەیە مردوون و نەدرکاندنی هۆی مردنیان بە سانسۆری عەسکەری توندی ئیسراییل پاساو دەدرێ و قسەی لێوە ناکرێ.

یەکەم درزی کە لە پەردەی داپۆشەری هێمنی ئەو دامەزراوەیە کەوت بە هۆی ئەفسەرێکی پێشووی مۆساد ، ڤیکتۆر ئۆستروڤسکی بوو. ئەو ئیدیعا دەکا کە " ئێمە هەمووومان دەمانزانی ئەگەر زیندانییەک بهێندرێ بۆ ئەنیستیتووەکە قەت لەوێ بە زیندووی ڕزگاری نابێ. ئەندامانی ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستین (پی ئێل ئۆ (PLOوەکوو کەروێشکی تاقیگە دەکار دەکران، بۆ ئەوەی دڵنیایی دەستەبەر بێ، گەلۆ ئەوچەکانەی زانستکاران بەرهەمیان دەهێنن باش کار دەکەن و بۆ ئەوەی کە زۆر کاریگەرتر بکرێن".

ئیسراییل تا ئێستا هیچکام لەو ئیدیعایانەی بەرپەرچ نەداوەتەوە.

دەستپێکردنی هێرشی وەرزی بەهارێ لە لایەن ناتۆوە بە دژی سربستان لە ساڵی 1999 دا دەرفەتی ئەوەی بۆ هالیڤی ڕەخساند لە لایەن مۆسادەوە زانیاری کۆ بکاتەوە بۆ ئەو نۆزدە وڵاتەی کە لەو شەڕە دا هاوبەندییان پێک هێنابوو .مۆساد لە کۆنەوە – لە هەرێمەکە دا پێوەندی دامەزراندبوو – لە بەر نیگەرانییەکی ڕاستەقینەی کە باڵکان دواجار دەتوانێ ببێ بە دورگەیەکی

موسڵمان ، و ببێتە پێگەیەک بۆ هێرشی تیرۆریستی بە دژی ئیسراییل. ئەوە دەرفەتێکی زۆر باش بوو بۆ هالێڤی کە سەردانی بنکەی سەرکردایەتی ناتۆ بکا لە بروکسل ولەوێ چاوی بە هاوتاکانی بکەوێ. ئەو هەر وەها چووە واشنگتن بۆدیتنی سی ئای ئێی. کە گەڕاوە ماڵێ شەو و ڕۆژ کاری دەکرد و لەحەوتوویەک تا حەوتوویەکی دی چبڕ پشووی نەدەدا. لەو ڕووەوە ئەو خەڵکی وەبیر مایر ئامیت دەخستەوە.

لە بەهاری ساڵی 1999 دا، بێت نۆر ( کۆنە هەڵسووڕاوی)ی مۆساد، ڤیکتۆر ئۆسترۆڤسکی ، سەری هەڵێنا بۆ وروژاندنی ئەو دەزگایە. ڕاپۆرتی زۆر بە دانستە(تایبەت) لە لایەن ئەو تیمەوە کە سەبارەت بە ئەو دوولیبییاییانەی کە دواجار بەوە تاوانبار کران دەستیان لە بۆمبدانانەوەی لۆکربیت دا هەبووە لە بنەوە دران بە چاپەمەنی و تێیاندا هاتبوو کە ئۆسترۆڤسکی لە دادگەدا ئامادە دەبێ و لەسەر تاونبارکراوەکان دەکاتەوە. بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە ئەو کۆنە کارەی (کاتسا) مۆساد زۆر بەر لەو ڕووداوە، لەو دەزگایەدا نەمابوو، ئاستەم بوو ببیندرێ ئەو بتوانێ لەوبارەیەوە یارمەتییەکی لە دەست بێ. لەگەڵ ئەوەشدا،دەرکەوتنی ئۆسترۆڤسکی لە خانوچکەی شاییدیدەران، لە مەحکەمەیەک لە لاهای کە بەتایبەتی بۆ ئەو کەیسە ڕێکخرابووە، بە پێی سەرچاوەیەکی پایەبەرز لە مۆساد دا، بە قووڵی بووە هۆی بێزاری هالێڤی و تووڕەی کرد. هالێڤی پێی وابوو"لێکتێگەیشتنێک "لە نێوان ئۆسترۆڤسکی و خاوەنکارانی پێشوویدا هەبووە کە ئەو هیچ ناکا بۆ تەنگەتاوکردنی زیاتری مۆساد و لەبری ئەوە ڕێگەی پێدەدرێ ژیانی ئاسایی خۆی بکا و چ قۆرتی بۆ ساز ناکەن. بۆ ماوەیەک هالێڤی بیری لێکردەوە بەڵکوو بکرێ بە ڕێگەی قانوونیدا پێش بە ئۆسترۆڤسکی بگرێ؛ بەڵام بۆی دەرکەوت ئەوە سەر ناگرێ.

هەرچۆنێک بێ، ئەو کاتەی ئۆسترۆڤسکی لە دادگە شاییدی دەدا، ئەگەر بیدا، ئیدی هالێڤی لە سەرکار نەماوە و خانەنشین بووە.

بۆ بەدەست هێنانی گشت ئەو شتانەی کە هالێڤی دەیەوێ بەر لەوەی مۆساد بەجێ بهێڵێ بە بەردەوامی تاقیکردنەوەیەکی گەورە دەبێ بۆ تابشتی جەستەیی و ڕوحی وی.

ئامان و شین بێت گێرەو کێشەی نێوخۆیی مۆسادیان قۆستەوە بۆ ئەوەی پلەی خۆیان بەرزبکەنەوە بۆ یەکەم لەناو هاوشانان دا. بەڵام هیچ کەس باسی ئەوەی نەدەکرد کە مۆساد هەڵکەوتی خۆی وەکوو چاوی نهێنی بەسەر جیهانەوە نەپارێزێ. بەبێ کارامەییەکانی مۆساد لەوانەیە ئیسراییل لە سەدەی داهاتوو دا بە دەست دوژمنەکانی تێک بشکێ. ئێران، عێراق و سووریا گشتیان خەریکی پێشخستنی تێکنۆکۆژی ئەتۆن کە دەبێ لە نزیکەوە لە ژێر چاوەدێری دابێ.

لە سەرەتاوە، شێوەی کردەوەیی مۆساد ئاوا بووە کە ئەوەی دەبێ بکرێ، بەڵام بە خێشکەیی و بە نهێنی. هالێڤی لە چاوپێکەوتنێکی دوو بە دوو لە گەڵ یەک لەبەردەستانی، گوتبووی ئەو پێی خۆشە کۆمەڵگەی هەواڵگری ئیسراییل دیسان ببێتەوە بە بنەماڵەیەکی یەککگرتوو،" بە بێ مامە مۆساد کەس وزەی نایە."

تەنێ زەمان دەیسەلمێنێ گەلۆ ئەوە خەونێکی پێ پشتیوانە یە یان، هەروەک زۆر لە چاوەدێران لێی دەترسن، هەر چەندی کە مۆساد لە ئابڕووتکانەکانی پێشووی دوور دەکەوێتەوە، ئەوەندەش لە ئابڕووتکانێکی دی نزیک دەبێتەوە.

ئەوە هەنگاوێک نزیک کەوتەوە کاتێک لە مانگی ژووەنی ساڵی 1999 دا . مۆساد پێی زانی دەکرێ داوای لێبکرێ بنکەی سەرەکی ئورووپایی خۆی لە هوڵەند بگوێزێتەوە دوای ئەو ئیدیعا هەتا بڵێی ئابڕووبەرانەیەی کرا کە مۆساد بەدزی خەریکی کڕینی پلۆتۆنیۆم و کەرەستەی دیکەی ئەتۆمی لە مافیای ڕووسی بووە. ئەو ئیدیعایە لەلایەن ئینتێل، کەرتێکی بچووک بەڵام بەهەیبەتی دەزگای هەواڵگری هوڵەندەوە هاتە گۆڕێ.

لێکۆڵینەوەکانی ئیسراییل لە حەشارگە و مەخزەنێکی قووڵ دا بەڕێوە چووە –سەیر ئەوەیە ئەوە بۆیە ساز کراوە کە لە ئەگەری هێرشێکی ئەتۆمی

سۆڤییەت بۆ سەر ئامستردام ببێتە داڵدەی بنەماڵەی پاشایەتی هوڵەند. ئەو حەشارگەیە لە نزیک ئیستگەی نێوەندی ڕێگەی ئاسنی ئەو شارە هەڵکەوتووە .ئینتێل ئەوەی بۆ ڕوون ببووەوە کە ئەم شوێنە جێگەی تاقەت کردنی کەرەستەی ئەتۆمییە کە لە تاقیگەکانی چەکی ئەتۆمی ڕووسیا وەکوو چێلیابینسکی – 70 لە چیاکانی ئۆراڵ و ئارزاماس – 16 لە نیژنی نۆڤگۆرۆد، گۆرکی پێشوو دزراون.

ئەفسەرانی پایە بەرزی مۆساد پێکێشیان لە گەڵ ئینتێل کردبوو پێملیان بکەن بە وردی لە بەرئەوەی ئەو کەرەستە کوژەرانە ماڵی دزراون، مەئموورەکانی ئەوان لە مافیای ڕووسییان کڕیونەوە. و ئەوە تەنیا ڕێگەیەک بووە بۆ ئەوەی پێش لەوە بگیرێ کە ئەو جۆرە کەرەستانە بە گرووپە ئیسلامییەکان و گرووپە تێرۆریستییەکانی دی بفرۆشرێن.

لێکۆڵەرەوەکانی ئینتێل لە کاتێکدا پەژراندیان کە ئیدیعای مۆساد مەعقوولە، دڵنیاش بوون کە ئەو کەرەستە ئەتۆمییانە بە نهێنی لە فڕگەی سخیپۆل لە ئامستردامەوە ڕاگوێزراون بۆ ئیسراییل بە مەبەستی ڕاهێزاندنی کارگەی چەکی ئەتۆمی ئەو وڵاتە لە دیمۆنا. لەوێ، تا ساڵی 1999، بە تەخمین 200 چەکی ئەتۆمی لە ئەنبار نرا بوو.

تێکەڵاوی مۆساد لەگەڵ مافیای ڕووسی بۆ ڕاگوێستنی کەرەستەی ئەتۆمی دیسان ترسی تارمایی مۆتەی ئەتۆمی زیندوو کردووتەوە کە قەت بە تەواوی نەڕەواوەتەوە. لە کاتێکدا کە دوکتورینی ترسێنەری سەردەمی شەڕی سارد _تێکتەپێنی دوولایەنەی دەستەبەر _ ئیدی نەماوە، سێناریۆیەکی زۆر مەترسیدارتر جێگەی گرتووەتەوە ئەویش سات و سەودا و فرۆش و کڕینی زانست و کەرەستەی ئەتۆمی یە. ئەوە سەرمایەدارییە، هەر لە شێوەی ڕۆژهەڵاتی دڕ (وایلد ئیست)، کە تێیدا دەستەودایرە تاوانکاریی ڕێک خراو و کاربەدەستانی گەندەڵی حکوومەتان کلکیان لێک بەستووە بۆ ساز دانی بازاری تازە لە بۆ کەرەستەی ئەتۆمی _ بازارێک کە تێیدا هێندێک لە چەکە هەرە مەترسیدارەکانی دنیا بۆ فرۆش داندراوە.

زۆربەی کار و تێکۆشان بۆ شوێنگێڕی کەرەستەی دزراوی ئەتۆمی لە ئەنیستیتووی ترانسیۆرانیومی ئورووپا (ETUI)دەکرێ کە لە کارلسرووهەKarlsruhe، لە ئاڵمان هەڵکەوتووە. لەوێ، زانستکاران ئامرازی زۆر پێشکەتوو بەکار دەهێنن بۆ دیاری کردنی ئەوەی گەلۆ ئەو مادە و کەرەستە دزراوانە لە سەرچاوەی سەربازیی یان سیڤیلەوە دەست کەوتوون . بەڵام ئەوان پێی لێدەنێن کارەکەیان " وەک ئەوە وایە مرۆ بییەوێ دزێک بgرێ کە قەت پەنجە مۆری لێ وەرنەگیراوە."

هالێڤی بۆ نەهێشتنی ئەوەی نەکا مۆساد تەنگەتاو بێ بێتوو پەنجەمۆری لەو کارە دا بدۆزرێتەوەلە بەرایی مانگی ژووەن دا بە نهێنی سەردانێکی هۆڵەندی کرد بۆ ئەوەی دەوری مۆساد بۆ ئینتێل ڕوون بکاتەوە، بەڵام دەزگای هەواڵگری هوڵەند بە قسەکانی پێمل نەبوو.

هالێڤی گەڕاوە بۆ ئیسراییل بۆ ئەوەی بە سەرۆکوەزیری نوێ، ئێهوود باراک، بڵێ کە مۆساد دەبێ ئامادە بێ بۆ ڕاگوێستنی پێگەی سەرەکی خۆی لە ئووڕووپا لە خانووی ئەلعال لە فڕگەی سخیپۆل.

مۆساد لە ماوەی شەش ساڵی ڕابردوو دا لەوێ بە جێ ببوو. لە نهۆمی دووەمی ئۆفیسەکانی ئەو خانووەوە کە لە شخیپۆل بە " ئیسراییلی پچووک" نێوزەد دەکرێ – هەژدە ئەفسەر و کاربەدەستی مۆساد ئۆپێراسیۆنەکانی ئورووپاییان بەڕیوە بردووە. بە پێی قسە ی سەرچاوەیەکی نێو مۆساد، هەڵوێستی هالێڤی ئاشکرا بوو :باشترە مۆساد بۆخۆی بگوێزێتەوە تا ئەوەی بەشەق دەربکرێ، چارەنووسێک وا لە سەردەمی حکوومەتی تاتچەر لە بریتانیا تووشی هات.

لە بەر ئەوەی مۆساد بە سەری خۆی و بە بێ ئەوەی بە بریتانیا بڵێ بڕیاری دابوو ئۆپێراسیۆنەکانی خۆی لە چوارچێوەی وڵاتێکی خانەخوێ دا بەڕێوەبەرێ ، ئەوە گەیشتە گرژی و نێواناخۆشی لەگەڵ لەندەن. سەیر ئەوەیە ئەگەر مۆساد سخیپۆلی بەجێهێشتبا، لەوانە بوو بگەڕێتەوە بریتانیا. قسە هەیە کە هالێڤی بە باراکی گوتبێ لە بەر پەسندی ناڕەخنەگرانەی

سەركوەزیر تۆنی بلێر _ مۆساد بە باوەشی ئاواڵەوە پێشوازی لێدەكرێ. بلیر لەو باوەڕە دایە كە بوونێكی بە هێزی مۆساد [ لە بریتانیا ] لە بەرژەوەندی تێكۆشانەكانی ئێم _ 15 دایە بۆ چاو بەسەرەوە بوونی زۆر گرووپی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست كە ئێستا لە لەندەن جێیان داكوتاوە و دامەزراون.

هۆكارێكی بڕیاردەر بۆ گوێستنەوە بۆ لەندەن ئەوە دەبێ گەلۆ ئەلعال، بنكەی كۆمپانیای هاتووچووی هەوایی ئیسرائیلیش لە سخیپۆلەوە بگوێزێتەوە هیسرۆ . بە لە بەر چاو گرتنی بازرگانی بەڕمێنی بارهەڵگری ئەلعال، بوونی لە فڕگەی هێسرۆ، بووژانەوەیەكی بەرچاو دەبێ بۆ هیسرۆ.

ئینتێل بە تەواوی بۆی ڕوون ببووەوە كە پێوەندی نێوان مۆساد و شیركەتی هەوایی ئەلعال بەشێكی جیانەكراوەیە لە تڕافیكی مادده و كەرەستەی ئەتۆمی.

ئەو دەزگا هوڵەندییە پێكێشی دەكا مۆساد قەتی شان نەدەدا بەر بازرگانی مەترسیداری كڕینی مادە و كەرەستەی ئەتۆمی بێتوو ئەو كەرەستانە بە سلامەت و بە نهێنی نەگوێزرێنەوە بۆ ئیسرائیل.

جێگری پێشووی وەزیری بەرگری وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا گراهام ئالیسۆن، كە ئێستا بەڕێوەبەری نێوندی زانست و كاروبارە نێودەوڵەتییەكانی زانكۆی هارڤاردە گوتوویە: "گرووپێكی تاوانكاری تێرۆریست تەنانەت دەتوانێ دە شتی پچووک و سووک بە ڕێگە پۆست دا چەک بنێرێ بۆ نێو دەوڵەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا.

شتی ئاشكراو ڕەپ و ڕوو لەو قسانە دا ئەو ڕاستییەیە كە ڕێكخراوەیەكی گاریگەری وەكوو مۆساد، كە بەو سەرچاوە زۆر و زەوەندانەی ئیسرائیل لە بەر دەستی دەنێ، دژوارییەكی كەم یان هیچ بەرهەڵستی نابێ بۆ دەركردن و گواستنەوەی مادە و كەرەستەی ئەتۆمی لە سخیپۆلەوە.

شک و گومانی ئینتێل سەبارەت بە کارێکی قاچاغی ئەوتۆ یەکەم جار بەوە درووژا لە ئۆکتۆبری ساڵی 1992 دا ئاگادار کرا فڕۆکەیەکی بارهەڵگری شیرکەتی ئەلعال کە لە سخیپۆلەوە هەستاوە بارەکەی مادەی شیمیایی بووە.

لەودەمییەوە ئەوەی کە سەرچاوەیەکی ئینتێل وەکوو " کۆ کردنەوەی لانی کەمی بەڵگەی بە هێزی سەلمێنەر" نێو دەنێ دایدەگرێتەوە کە مۆساد بە ڕێگەی سخیپۆل دا بە بەردەوامی مادە و کەرەستەی ئەتۆمی ڕاگوێستووە.

"چەپەرێکی" ژن بە مەرجی ڕاوەدوو نەنران لە بری هاوکاریکردن لای ئینتێل درکاندی ئەو لە ئوکڕاینەوە بە نێو ئاڵمان دا بە قاچاغ مادە و کەرەستەی ئەتۆمی هێناوە و دوا جار گەیاندوویەتە هوڵەند.

ئەو چەپەرە (تەتەر) بە ئینتێلی گوت لە وێستگەی نێوەندی ڕێگەی ئاسن کەسێک هاتووە بە پیلییەوە. کاتێک وێنەیان نیشان دا، چەپەرەکە کابرای ناسیاوە .ئەو کابرایە ئەفسەرێکی مۆساد بوو ئینتێل دەیناسی و دەیزانی لەوانەیە کە لە شیپۆل دامەزراون.

لە " ڕۆژگاری کۆن " دا، ئەوە قسەی مایر ئامیت ە – مەئموورێکی مۆساد قەت ڕێگەی بە خۆی نەدەدا ئاوا بە هاسانی بناسرێتەوە. زۆر خەڵکی دیکە دە نێو کۆمەڵگەی هەواڵگری ئیسراییلدا لەو بڕوایەدان ئەو کەمتەرخەمییە سەڕەتاییانە لە هەڵسوکەوتدا لە مۆساد ناوەشێنەوە لە کاتێکدا پێ دەنێتە نێو هەزارەیەکی نوێ.

لە نێوخۆی ئیسراییلدا بۆچوون گۆڕاوە و گەیشتوەتە تووڕەیی و ناهومێدی لە ئاست ژێرکەوتنەکانی مۆساد. لە " ڕۆژگاری کۆن" دا دە ڕاستیدا ئیسراییلییەکی زۆر کەم گوێیان پێی دەبزووت ئەگەر مۆساد کاری تێکدرانە، درۆ و مرۆ کوشتنی کردبا .ئەوەی بۆ خەڵک گرنگ بوو ئەوە بوو ئیسراییل بمێنێتەوە.

بەڵام لە دۆخی جۆرەیەک ئاشتیدا، کە لێوارەی سنوورەکانی ئیسراییل لە دراوسێ عەڕەبەکانی نزیکتر دەبێتەوە، خەڵک هەتا دێ زیاتر پرسیار دەکەن

سەبارەت بەو میتۆدانەی مۆساد دەکاریان دەکا لە درێژەدان بە دەوری خۆی وەکوو قەڵغان و شیر.

دە نێوخۆی مۆساد دا هەستێکی کەللەڕقانە لە ئارادایە کە داو ودەزگایەکی گەورەی ئەوتۆ تەنێ دەتوانێ خۆی ڕابگرێ و بمێنێتەوە، بەقسەی رافی ئەیتان ، "ئەگەر لە بەر هەموو غەڵبەغەڵبی باوەڕێکی نوێ سەردانەنوێنێ و چۆک دانەدا." هەر ئاوا هەستێکی دیکەش هەیە کە لە لایەن ئاری بن – مێناشێ وە دەربڕاوە، ئەویش ئەوەیە، ئەگەر مۆساد خۆی هەر بکاتە زیندانی ئامانجەکانی دوێنێ، " لەو مەترسییە دا دەبێ کە بخنکێ، وەکوو شوالییەیەکی سەدەکانی نێوەڕاست کە بە جلکی نەبەردەوە ئەسپی لە بن دەرکێشرابێ و لە مەیدانی شەڕ و پێکدادان دا جێیان هێشتبێ و لە بیرکرابێ.

لە پشت ئەو جۆرە قسە بە بیرخەرەوانە دا هێندێک ڕاستی زۆر سەخت هەن .دوای پەنجا ساڵ. ئیدی چبڕ مۆساد بە داو ودەزگایەکی پاڵەوان نابیندرێ، کە کارەکانی ویژدانی ئیسراییل ڕووناک داگیرێ. مۆساد کە لە سەردەمی ئەو ساڵە لە بیرنەکراوانە دا لە دایک بوو کە ئیسراییل دنیایەکی نوێی بۆ خۆی ساز کرد، ئەودەمی یەک لە دەستەبەرانی مانەوەی ئەو دنیایە بوو. ئێستا چیدیکە ئەو دەستەبەرییە پێویست ناکا.

ئاری بن – مێناشێ وەکوو هەر کەسی دیکە ئاوا دەڵێ : " ئیسراییل، و دنیا ،دەبێ وەک دۆسێک دەرمانی پێشگێرەوە بۆ خۆ پاراستن لە بەرانبەر نەخۆشییەکی کوژەر دا چاو لە مۆساد بکەن. مرۆ تەنێ ئەو کاتە دەرمانەکە دەخوا کە نەخۆشییەکە هەڕەشاوی بێ. مرۆ هەمیشە دەرمانێکی ئاوا ناخوا ".

پرسیارێکی کە هێشتا وڵام نەدراوەتەوە ئەوەیە گەلۆ مۆساد ڕازی دەبێ دەورێکی ئاوا بگێڕێ کە پێگەیشتوویی و لە سەرەخۆیی جێگەی سیاسەتی کاری توندکردن لە بەر هۆی توند بگرێتەوە.

## دەربارەی سەرچاوەکان

پەیوەندیەکانم لەگەڵ دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلی لە ئاستێکی بەرز دابوو، بەشێوەیەک کە زانیاریەکانم بە پوختی بۆ کتێبەکە لەبەدەستدا بێ. ئەوەش هەروەک کتێبەکانی سەرەتای دیکەم وابوو کە بەبێ 'هەگبە'بەرەو بابەتی مۆساد چووم. ئەو زانیاریانەی کەلەسەرچاوەکانی مۆسادم پەیداکردن، بەشێوەی نوسەرێکی هۆشمەندانەم بەکارهێنان بەوەی: کۆنترۆلکردن، کۆنترۆلکردن هێشتاش هەر کۆنترۆلکردنم رێسا بێ.

هەموی بەسەر یەکەوە 80 سعاتی کاسێت(نەوار)ی تۆمارکراوم لەبەردەستدا بوو. لەو نەوارانە زیاترین چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەوکەسانەدا بوون کە راستەخۆ یان ناراستەوخۆ پەیوەندییان بە مۆسادەوە هەبووە. سەرچاوەکانی دیکەشم ئەوکەسانە بون کە مۆساد بێهودە هەوڵی

لەناوبردنیداون. لەوکەسانە بۆ نمونە لەیلا خالد بوو، کەلە سەردەمی فڕۆکەڕفاندا لەلایەن PLOەوە لە حەفتاکان ناوی دەرکردبوو، هەروەها مەحمود عەبباس ئەو مێشکەی لەپشت رفاندنی ئاخیلە لاورۆ Achille Lauroەوە بوو کە تیایدا جوێکی ئامریکایی پەککەوتەی سەر کورسییان بەخۆیو کورسیەکەوە فڕێدایە خوارەوە. من لە ئایاری 1996دا لە شاری غەززە چاوم بەوانکەوت؛ ئەوان مۆڵەتی سەردانی ئیسرائیلیان بەنیازی لەیەکنزیکبوونەوەی PLOو ئیسرائیل وەرگرتبوو. هەروەها قسەشم لەگەڵ یاسر عەرەفاتدا کردووە، کەماوەیەکی درێژ لەسەر لیستی بەربژارەکانی مۆساد بوو بۆ لەناوبردن.

لە 1960دا کاتێ لەگەڵ چامپن پینچەر Champan Pincherدا کە ئەوکات نوسەرێکی هەرە ناوداری ئەوبوارە بوو لە شاشینی یەکگرتوودا، کارم دەکرد، ئەزمونم لەبارەی نوسین لەسەر دەزگا نهێنییەکانو ئۆپەراسیۆنەکانیان پەیداکرد. ئێمە هەردووکمان لە لەندەن ئیشمان بۆ The Daily Express دەکرد. هەندێ لە وتارەکانمان بەتایبەتیش ئەوانەی دەربارەی کەتنەکەی جاسوسان بورگێسو ماکلین ی سەربە دەزگای نهێنی بەریتانیایی پشکی هەبووە، شێوازی روانینی ئەو جۆرە کارانەو چۆنیەتی لەبارەوە نوسینیان. ئەوە ئەو ئەندێشەیە بوو کە هەوڵمدا لە کتێبەکانم Journey into Madnes, Pontiff, The year of Armageddonدا بەهاوکاری ماکس وارگن ویتس بەرجەستە بکەم.

پێشتر راپۆرتم لەسەر شەڕی دەزگا نهێنیەکان دژی ئێران، عێراق، سوریاو ئەفغانستان ، ئەو بوارەی کە مۆساد راستەوخۆ تیایدا بەکارایی ماوەتەوە، نوسیوە. هەروەها بەدرێژیشم دەربارەی پەیوەندی نێوان مۆساد و ڤاتیکان نوسیوە. پەیوەندیە تایبەتیەکانم لەگەڵ بارەگای کورسی پیرۆز زێدە بەکەڵک بوون بۆ پاشخانی دیدارەکانم بۆ ئەم کتێبەم.

لە 1989دا لەکاتی هەرای خوێندکاراندا ئەز لە چین بووم. لەوێش گەواهیدەر بووم بەسەر کاری نهێنی سەرکوتکەرانی دەزگا نهێنیەکانو

سەرنجم لەسەر کردەی دەستی مۆساد لا پەیدا بوون: مۆساد لەخەمی ئەوەدا بوو کە نەوەک ئەگەری ئەوە هەبێ پسپۆڕانی چەک یارمەتی ئیران‌و عێراق بدەن، بەمە مەترسی بۆسەر ئیسرائیل پەیدا ببێ. پاشان لەسەر رۆڵی مۆساد لەشەڕی کەنداو و دەرهاویشتەی کۆمۆنیزمی شۆرەوی نوسی.

لە ئۆگستی 1994دا زەنگی تەلەفونێکم لە زڤی سپیلمان Zvi Spielmannەوە بۆهات. ئەو لەئیسرائیل پاڵەوانێکی لەژیاندا مابوو، بوو. ئەو لە شەڕی سەربەخۆییخوازانەی 1948دا خەڵاتکرابوو، دواتر ستۆدیۆی یەکێتی فیلمی لە ئیسرائیل دامەزراند. ئەو کۆمەڵە فیلمێکی گەورەی بەرهەمهێنان کە لەنێویاندا هەندێکی لەگەڵ هۆلیودا بوون. ئەو منی دڵنیا کردەوە کە رێگام دەدرێ بەڵام یەک سنورم لەو پرسانەدا هەیە دەبینێتەوە کە بەتەمام بیکەم. چەند زیاد پرس بکەم ئەوەندە زیاتر شارەزا دەبم.

من بۆم دەرکەوت کە بێجگە لە کتێبەکانی ڤیکتۆر ئۆستروڤسکی و ئاری بن‌مێناشە، مایەی نیگەرانیە کە ژێدەری کەم سەبارەت بە زانیاری تێروتەسەل لەمەڕ مۆساد تێدایە. ئەوەش جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ زانیاریی بەردەستی سەبارەت بە سیا هەیە، چونکە لەوبارەیەوە زیاتر لە 200 کتێب دەرچوونە. دەربارەی دەزگای هەواڵگری نهێنی بەرتانیایش نزیکەی 50 کتێب لەبەردەستدان، هەروەها سەبارەت بە هاوپیشەکانیان لە دەزگا نهێنییەکانی کەی گی بی، ئاڵمانیای‌و فەڕانسەی بەهەمان ئەندازە کتێب چاپ و پەخش بوون. بە کۆنترۆلکردنی ناواخنەکانیان ئەوە دەردەکەوێ کە بۆشاییەک لەنیوان ئەو شەڕە نهێنیانەی ئەنجامی دەدەن، هەیە. ئاشکراشە دەکرێ دیرۆکی مۆساد زۆر لەو بۆشایانە پڕ دەکاتەوە.

ئەو شێوازەی کە سەردانی ئیسرائیلم پێکردوەو –هەندێ جاران بەئەرکی کەنالی چواری بەریتانی- دیداری خەڵکم پیکردووە، جیاوازی لەگەڵ شێوە کاری ئاسایانەی من نەبووە. ئەو ماوەیەی کە چیرۆکی دیدارەکانم تیایدا ئەنجام داوە، سەردەمێکی سەرنجراکێشبوو؛ لەوێ لەنێوان مێژوی هاوچەرخو یادەوەریەکی کاڵ بووەوە هەبوو. بەڵام بەگوێرەی لەیەکنزیکبوونەی زیاترم

لەگەڵیانداوو زیاتر ناسینیان، سەربردەكانیان باشتر بەبیر دەهاتەوەو زانیاریەكان وردترو دەقاودەق تر دەبوو. وایان لێهات لەبارێكدا بن وردەكاریەكانیان بەبیر بێتەوەو وەك ئەوەی كە كێ وای گوتبێو لەكوێش شتەكە رویدابێ.

ئەوە زیاتر رون بووەو كە ئەوكسانەی پشكیان لە بیناكردنی مۆساددا هەبوە، یادەوەری زیندوانەیان سەبارەت بە سەردەمێك هەبوو كە بۆیان بوە بەشێكی مێژویی، بەوەی كە تا ئەوكات كەس بەو روانینەی ئەوان چیرۆكەكەی نەبیستبوو. گرنگیش لەودا بوو كە ئەوان بەپرسێك خاڵی دەستپێكی سەربردەكەیان بە رۆژی ئەمڕ دەبەستەوە. هەر بۆ نمونە كاتێ پەردەلەسەر رۆڵی مۆساد لەسەر دوا سەردەمی دەسەڵاتدارانی ئێران هەڵدرایەوە ئەوان وا وێنەیان دەكێشا هەروەك بنەگەیەك بۆ كشانی ئسولگەرای ئیسلامی. كاتێكیش پەیوەندكاری مۆسادیان دەربارەی باشوری ئافریكا باس دەكرد، دەیانتوانی باردۆدخەكە لەگەڵ ئێستای وڵاتەكە گرێبدەن. جار لەسەرجار بۆ منیان دوپات دەكردەوە كە رابردو چ پشكێكی لە ئیسرائیلی ئەو رۆژگارەدا هەبووە، هەروەها كە چۆن مۆساد بەردەبازی كەلێنی دوێنێو ئەمڕۆ بووە.

ئەوان ئەوەیان رونكردەوە كە راستیە چەكە ئەفسوناویەكان كەبە بەر مۆسادیان بڕیبو، لەروی ناواخنەوە لەڕاستیدا كاتی بەرجەستەبوونی ئەوە وا دەرنەدەچوون. بەبیرمدێ كەچۆن رافی ئیتان بە مكورڕبونێكەوە ئەو تێبینیەی دەربڕی: ' لەراستیدا هەمو پەخشكراوێك لەسەر رفاندنی ئەدۆلف ئایخمان درۆیەكی زەقو زۆپ بوو. من دەمزانی، چونكە من ئەو پیاوەبووم كە رفاندم'.

له زۆر گۆشەنیگایانەوە رافیو هاورێكانی بەناچاری بەرگی راستیان بەبەر ئەفسانەدا دەكرد. ئەوانیش منیان ناچار دەكرد كە كەمتر لەوان نەكەم.

كاتێ گوێم بۆ ئیتان شلكردبا، وەك ئەوە وابوو كە راستی چەكەكانی وەك وزەی پیاوەكە لەبن نەهاتو بوو. ئەو شەڕی گەورەی نهێنی كردوون. ئەو

خۆی وا پیشان دەدا کە پیاوێکی خاوەن ئەندێشـەیەکی پاشـەرۆژ مـەزن: تاکە شــتێکی مــراز بــوو، ئــەویش لەژیانــدا مانــەوە بــوو تــا بــەچاوی خــۆی سەقامگیربونی ئاشتیەکی راستەقینەی لە ئیسرائیل بدیتبایە.

هــەرزو ئــەوەم بــۆ دەرکــەوت کــە دیدارلەگەڵـداکردووەکانم بەســەر چەنـد دەستەیەک دابـەش دەبـن، کـە یەکانگیریەکـەی تـاڵ بەسـەریاندا زاڵـە. ئاوەهـا بـوون لایـەنگرانی ئیسـەر هـارلو مـایر ئامیـت. ئـەو بەقێزەونیـەوە تەماشـای یەکدیکردنەیان بەلای کەمیەوە بەتێپەڕبونی رۆژگاریش کـەم نـەبووەوە. من سەرنجی ئەوەم لاپەیدا بو کە هیچ کامیان رەفتاری بەرامبەر ئەوی دیکە نەرم نەبوو.

ئـەوەش بەتـەواوی بـووە مایـەی کێشـە، سـەبارەت بـە ددانـنـان بـەو سـەنگە راســتیەی زانیارییــەکانیان. ســەرباری ئــەوەش وەک ئــەوە وابــو کەئــەوان سەرقاڵی کێبەرکێ بن لەگەڵ کاتدا. کەسـانێکی وەک مـایر ئامیت ژیـانی خـۆی بـۆ سەرمەشـقی پیشـەنگەکان تـەرخان کردبـوو. مایـەی قـەدرگرانی بـوو کـە جاوپێکــەوتنی دورودرێــژ ئــەنجام بــداو زۆرجــارانیش هــەمان پرســە دووبارەبووەکـان وەڵام بداتـەوە. لـەدوا چاوپێکەوتنمـدا ئـەو تـازە لـە ڤێتنـام گـەڕابووەوە، بـۆ ئـەوە چووبـووە ئـەوێ تـا راسـتەوخۆ لەدەسـتی یەکەمـەوە ئەوە لە ڤیکتۆنگ Victong وەربگری کە چۆن زۆرجاران لەوە سـەردەکەوتن کە خۆیان لە دەزگای هەواڵگری ئامریکایی لە ڤێتنام گەورەتر نیشان بدەن.

یـەکێک لـە دیدارە سەرسامەکانم لەگـەڵ ئـوری سـاگووی بـوو. ئـەو هاتۆتـە نوسینگەی زڤی سپیلمانسو لەناخـەوە دەربـارەی بابەتگـەلێکی لەدەسـتدەرچوو قسەی کـردووە؛ وەک ئـەوبارە دژوارەی ئیسـرائیل لەگـەڵ سـوریادا، هـەروەها سـەبارەت بـەو کێشـانەی کـە روبـەروی دەبـووە، کـاتێ فەرمانـدەی کـاری سیخوڕێتی بوو لەوێ.

داڤیـد کیمیخـیش ددانبـەخۆداگر بـوو، دەیویسـت هـەمو پرسـەکان لەپێشـدان بزانێ. ئەوە رێی لەوە نەدەگرت کە بەسـەر رامانە بایەخدارەکانی سەبارەت بە رەفتـارە کەسـیەکانی بەرامبـەر کـەسو روداوەکـان بـاز بـدا. ئـەوەی لای من

جێگای بەجێهێشتوە شێوازی خواردن پێدانە کسۆکەکەی بوو، لەونێوەشدا هیچ بواری بۆ راستگۆیەتی ئەوکەسانە نەدەهێشتەوە کەلەگەڵ پێوەرەکانی ئەو نەدەهاتنەوە.

یاکۆڤ کۆهنیش نەوەک هەر دەرگای ماڵەوەی بۆم دەخستە سەر گازەرای پشت، بەڵکو گیانو ناخیشی بۆ دەکردمەوە. بەیەکەوە بە سعاتان لە کیبوت(ئۆروگا)کەی دووبەدوو دادەنیشتین و هەمو شتێکی دەکرد تا بەباشترین شێوە بیرەوەریەکانی بهێنێتە گۆ. بەوجۆرە و بۆنمونە ئەو تاکە کەسێک بوو کە ترسو پەشیمانی بەبیردابێ کاتێ یەکەمین کەسی کوشت. پەرچەکردارەکەی بەردەوام لەگەڵ شێوازی رافی ئیتان دەربارەی کوشتنی خەڵک هاوشێوە بوو.

یول بنپۆراتیش مەیلیکی پارێزەرانەی لە بریتی قانونزانەکانەوە هەبوو: ئەو توند دەستی بەراستیەکانەوە دەگرتو بەدەگمەنیش شاشی لێدەردەکەوت. لەزۆر باردا ئامادەبوو کەلێنەکانی مێژوو پڕ بکاتەوە. رێوڤن مێرحاف بۆ زانیاریی لەسەر پێگەی سیاسیانەی مۆساد لە ئیسرائیلدا کانی زێڕ بوو.

لەو رۆژنامەوانە ئیسرائیلیانەش کە دیدارم لەگەڵیاندا سازداوە، دوو کەسی تایبەتمەند هەبوون. ئالێکس دۆرۆن بەشێوازێکت لەناخەوە کراوەو تازەبەخش ئامادەبوو نامیلکەیەک لەسەر دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلیم بۆ بکاتەوە. کۆمەکی ئەو گرانبەها بوو. بەپێچەوانەشەوە باوەشی گەرمی کەنالی 4 بۆ ران ئێدیلیست ran Edelist وەک لێکۆڵەرەوەیەک بۆ زنجیرە بەرنامەیەکی دۆکیومێنتاری کە من دەبوایە پێشکەشم کردبایە، کرایەوە؛ لەوێدا ئەوەی دەربڕی کە گوایە لەزۆر باردا نابەجێیەکە هەمو کونوکەلەبەرەکانی بابەتەکە ئاشکرا بکرێ. هەندێ جار زیاتر بە هەندێ شتی دیکەی لاوەکی کەنەدەبووایە لەناو بەرنامە دیکیۆمەنتاریەکە بوایە خەریک دەبوو، خۆی لەکرۆکی باسەکە دەبوارد. لەهەندێ دیدارمدا کە ئەوم لەگەڵدا بوایە، زۆر جاران قسەی بە بەرامبەرەکەم دەبڕی تاکو ئەوەی بەبیر بهێنێتەوە کەدەبێ بەو یارییەوەوە قسان بکا. بەبێ ران ئێدیلست چەندان

دیداری دیکەم لەگەڵ ئەندامانی دیکەی دەزگای نهێنی ئیسرائیلیدا سازداون، کە لەمیانەی جاوپێکەوتنەکانمادا ئەوان ئامادەبوون سەرپۆشی بابەتەکان هەڵدەنەوەو بەکراوەیی بدوێن بەلام بەمەرجێک کەنابێ راستەوخۆ رستەکانیان دووبارە بنوسرێنەوە. ئەوان بانگهێشتی منیان بۆ ماڵەوەیان دەکرد، تاکو دەرفەتی ناسینی ئەندامی مالباتەکەیانم ببێو ئاگاشم لەژیانی تایبەتمەندانەیان هەبێ تا والێک نەدرێتەوە کە سیخوڕەکان هەر یەک رەهەند دەژین. بەمشێوە دیداریکم بەیاددا دێ کەلەگەڵ کۆنە کاتسایەکم سازدا بوو کەراپۆرتێکی لەسەر باری کوشتنی کەسێک دامێ. لەپڕێکەوە سەیرێکی ژورە خۆشەکەی کردو نیگای خستە سەر دیمەنێکی ئینجیلیانە ئەنجا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکیشاو گوتی: ' ئەم جیهانە ئەوجیهان نییە'. ئەو پەیڤانە باندۆریان لەسەر من پەیداکردنو لام مانەوە. ئەزلەو بڕوایەدابووم کە ئەو مەبەستی بوو بڵێ کەوا بەقوڵی ئەو لە ژیانی هەنوکەیدا لەبەر لایەنە نادیارە ترسناکەکانی رابردودا دەناڵێنێ. هەمان سەرنجم لەسەر زۆر کەسی دیکە بۆ دەرکەوتن کە دواندبوونم.

ئەو یادەوەریە پڕ گۆرانکاریانە لەسەر راستیدا بەوەی دنیای دەزگا نهێنییەکان زۆرجران تەنها لە چاویلکەی تاریکەوە دەبینرێ هەروەک حەواری(ئەپۆستێڵ شاگردی مەسیح) کەلێنێکی بچوکی ئاسمانی 'بەهۆی چاویلکەیەکی تاریک' بینی.

ئەوانەی دیدارم لەگەڵدا کردوون:
مایر ئامیت، حایم کۆهن، نادیا کۆهن، یاکۆڤ کۆهن، ویلیام کێیسی، ویلیام کۆلبی، رافێل ئیتان، زڤی فریدمان، ئیسەر هارل، ئێمری کابۆنگۆ، ئێدوارد کیمبل، دایڤد کیمخ، ئۆتتۆ کۆرماک، هێنری ماککۆناشی، ئارییل مێراری، ریوڤن مێرهاڤ، دانی ناگیر، پۆل بنپۆرات، ئوری ساگووی، سیمۆن ویستنهال.
رۆژنامەکان:
Daily Express, London. Daily mail, London. Daily Telegraph, London. The New York Times. Los Angeles Times. Jerusalem post. Sunday Times, London.
رێکخراوەکان:
Palmach Archive, Israel.
Public Record office, London
National Archive, washngton
The New York public Library
The press Association Library, London
The Library, Trinity college, Dublin
Geheim Archieve, Vatican
The Archieve, Glilot, Israel.

## ژێدەرەکان

Agee, Philip: Inside the Company: CIA Diary, Penguin Books, Harmoundsworth(England)1975.

Allon, Yigal: Shield of David Weidenfeld & Nicolson, London 1970.

Bainerman, Joel: Inside the Covert Operations of CIA and Israel's Mossad, SPI Books, New York 1991.

Bamford, James: The Puzzle Palace: a report on america's most secret Agency, Houghton Mifflin, Boston 1982.

Bar-Zohar, Michel: Ben-Gorion, A Biography, Weidenfeld & Nicolson, London 1077.

Bar-Zohar, Michel: Spies in the Promised land, Davis-Poynter, London 1972.

Ben-Porat, yeshayahu et al: Entebbe Rescue, Delacorte Press, New York 1977.

Ben-Shaul, Moshe(ed): Generals of Israel, Hadar, Tel Aviv 1968.

Black, Ian, en Benny Morris: Israel's Secret Wars, Hamish Hamilton, London 1991.

Blumenthal, Sid, en Harvey Yazijian,eds: Government by Gunplay: Assassination Conspiracy theories from Dallas to Today, Signet, New York 1976.

Bregman, Ahron, en Jihan el-Tahiri: Israel en Arabieren: De vijftigjarige oorlog, Het Spectrum, Utrecht 1998.

Brzezinski, Zbigniew: power and Principle: Memoris of the national Security Adviser, 1977-1981, Farrar, Straus & Giroux, New York 1983.

CIA:The CIA's Nicaragua manual: Psychological Operations in Guerrilla Warfare, Vintage Books, New York 1985.

Cline, Ray S: The CIA under Regan, Bush and Casy, Acropolis Books, Washington (D.C)1981.

Cline, Ray S: Secret, Spies and Scholars: Blueprint of the Essential CIA, Acropolis Books, Washington (D.C) 1976.

Cline, Ray S and Yonah Alexander: Terrorism: The Soviet Connection, Crane Russak, New York 1984.

Constantinides, George C: Intellegence and Espionage: An Analytical bibliography. Westview Press, Boulder (Colorado)1983.

Copeland, Miles: The Game of Nations, Simon & Schuster, New York 1969.

Copeland, Miles: The Real Spy World, Sphere Books, London 1978.

Deacon, Richard: C – A Biography of Sir Maurice Oldfield, Macdonald, London 1985.

Dekel, Efraim: Shai: The Exploits of Hagana Intelligence, Yoseleff, Tel Aviv 1959.

Dekel, Efraim: a History of British Secret service, Granada, London 1980.

De Silva, Peer: Sub Rosa: The CIA and the Uses of Intelligence, Times Books, New York 1978.

Dobson, Christopher, And Ronald Payne: The Dictionary of Espionage, Harrap, London 1984.

Dulles, Alan: The Craft of Intelligence, Greenwood Press, Westport(Connecticut) 1977.

Eisenberg, Dennis, Uri Dan and Eli landau: Meyer Lansky: Mogul of the Mob, Corgi Books, London 1980.

Eisenberg, Dennis, Uri Dan and Eli landau: The Mossad: Israel's Intelligence Service Inside Stories, Signet, New York 1979.

Elon, Amos: The Israelis: Founders and Sons, Weifdenfield & Nicolson, London 1971.

Farago, Ladisalas: Burn after Reading, Macfadden, New York 1963.

Gilbert, Martin: The Arab-Israeli Conflict, Weidenfeld & Nicolson, London 1974.

Golan, Aviezer, and danny Pinkas: Shula, Code name the Pearl, Delacorte Press, New York 1980.

Groussard, Serge: The Blood of Israel, William morrow, New York 1973.

Gulley, Bill and Mary Ellen Reese: Breaking Cover, Warner Books, New York 1981.

Haig jr, Alexander m: caveat: Realism, Regan, and foreign policy, Weidenfeld & Nicolson, London 1984.

Harel, Isser: The House on garibaldi Street, andre Deutsch, London 1975.

Harris, Robert and Jeremy Paxman: A Higher form of Kiling, Triad/Granada, London 1983.

Haswel,Jock: spies and Spymaster: A Concise history of Intelligence. Thames & Hudson, London 1977.

Henze, Paul B: The Plot to kill the Pop, A Croom Helm, London 1984.

Hersh, Seymour M: Het Samsonscenario, Bosch & Keuning , Braam 1991.

Laqueur, walter: the Israel-Arab Reader, Bantam, New York 1969.

Laqueur, walter: The Struggele for the Middle east: the Soviet Union & the Middle East 1948-1968, Routledge & Kegan Paul, London 1969.

Lotz, wolfgang: The Champagne Spy, Vallentine Mitchell, London 1972.

McGehee, Ralph W: deadly Deceits: My 25 Years in the CIA, Sherdian Square Publications, NewYork 1983.

McGehee, George: Envoy in the middle World: Adventures in Diplomacy, Harper & Row, New York 1983.

Meir, Golda: My Life, Weidenfeld & Nicolson, London 1975.

Moses, Hans: The Clandestine Service of the Central Intelligence Agency, Association of Former Intelligence Officers, Mclean (Virginia) 1983.

Neff, Donald: Warriors at Suez: Eisenhower Takes America in to theMiddleEast, Linden Press, New York 1981.

North, Oliver L: In de vuurlinie, Het Spectrum, Utrecht 1991.

Offer, Yehuda: Operation Thunder: The Entebbe Raid, the Israeli's Own Story: Penguin Books, Harmondsworth (England) 1976.

Ostrovsky, Victor: By Way of Deception, St. Martin's Press, NewYork 1990.

Ostrovsky, Victor: The Other Side of Deception, HarperCollins, new York 1994.

Powers, Thomas: The Man Who Kept the Secret: Richard Helms and the CIA, Knopf, New York 1979.

Rabin, Yitzhak: The rabin Memoris, Weidenfeld & Nicolson, London 1979.

Richelson, Jeffrey T: the U.S Intelligence Community, Ballinger, Cambridge (Massachusetts) 1985.

Schwarzkopf, Norman h:Er is geen held voor nodig, De Kern, barn 1992.

Seth Ronald: The Executioners: The Story of Smersh, Tempo Bookks, New York 1970.

Smith, Colin: portrait of a Terrorist, Holt, Rinehart and Winston, NewYork 1976.

Spence, Cameron: Achter de linies, Unieboek, Houten 1998.

Sterling, Claire: The Terror Network: The Secret War of International Terrorism, Weidenfeld & Nicolson, London 1981.

Stevens, Stewart: The Spymasters of Israel, Holder & Stoughton, London 1981.

Stevenson, William: 90 Minutes at Entebbe, bantam Books, London 1976.

Stockwell, John: In Search of Enemies: A CIA Story, W.W. Norton, New York 1978.

Thomas, Gordon en max Morgan-Witts: De paus en het geweld, A.W. Bruna & Zoon, Utrecht 1985.

Tinnin, david B: The Hit Team, Little, Brown and Company, Boston 1976.

Tully, Andrew: CIA: The Inside Story, William Morrow, NewYork 1961.

Tully, Andrew: The Super Spies: More Secret, More Powerful than the CIA, William Morrow, New York 1969.

West, Nigal: MI5: British Security Operations 1909-1945. Triad/Granada, London 1983.West, West, Nigal: MI6: British Secret Intelligence Service Operations 1909-1945, Weidenfeld & Nicolson, London 1983.

Wiesenthal, Simon: the Murderers among Us: William Heinemann, London 1967.

Wiley, David: Politicus van God-de paus en het Vaticaan, Bosch & Keuning, Baarn 1992.

سوپاس‌و پێزانینی وەرگێڕ

هاوسەری خۆشەویستم کنێر جەمیل خەیلانی کە لەماوەی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا (زستانی 2008) نەک هەر ڕۆڵی دایکانەی خۆی، بەڵکو ڕۆڵی باوکانەی منیشی بەرامبەر بە جگەرگۆشەکەمان کاکە-ڕا-دیت و دەرفەتی تەواوی بۆ ڕەخساندم، بگرە گوشاری ئەوەشی دەخستمە سەر کە تەواو سەرقاڵی وەرگێڕانەکە ببم و هەرچی زووە تەواوی بکەم.
مامۆستا حەسەنی قازی کە نیوەی دووهەمی بەشی حەڤدەهەم کە لە چاپە هۆڵەندییەکەدا نەبوو، لە ئینگلیزییەوە بۆی وەرگێڕام. مایەی تێبینییە هەندێ دەسکاری شێوە نوسینی ئەوم کردووە تا لەگەڵ وەرگێڕانەکەی مندا بگونجێ.
شێخ شەماڵ گەزنەیی بەهاندان و پەرۆشی زۆری بۆ خۆخەریککردنم بە وەرگێڕانەکە، لەخوێندنەوەی ڕەشنوسی یەکەمی وەرگێڕانەکەشدا لە کۆمەڵێ هەڵەی تایپکردنەکەدا ئاگاداریکردمەوە.
هیوا سەرهەنگ کە بەدەستنوسی یەکەمی وەرگێڕانەکەدا چۆتەوە و هەڵەی تایپی بۆ ڕاستکردووەمەتەوە.
حەیدەری حاجی خدری برام کە بە زمان و ڕێنوسی وەرگێڕانەکەدا چۆتەوە.
فەرهاد جەمیل و کرێکارانی چاپخانەی هێڤی کە لەگەڵمدا زۆر بەحەوسەڵە بوون.

سوپاس‌و پێزانین

لەئیسرائیل بۆ:

مـایر ئامیـت، یـاکۆڤ کـۆهن، ئـالێکس دارۆن، ران ئێدەلیسـت، رافێـل ئیتـان، ئیسەر هارل، داڤید کیمخ، ئارییێل مێراری، رێوڤن مێرحاڤ، دانی ناگیر، یول بن پۆرات، ئوری ساگویی، زڤی سپیلمان، باری چامیش.

هەروەها بۆ ئەوانەی کە هێشتا لەژێر راژەدان‌و ناکرێ ناویان بهێنم.

لە شوینەکانی دیکەش:

محەممـەد ئەلفائیـد، سـین کـاربێری، سەباسـتیان کـۆدی، کـارۆیلن دێمپسـی، ئـاری دووۆرکـن، هیسـەر فلـۆرەنس، پێـر ئێریـک هاوسـۆرن، دیانـا جۆنسـۆن، ئاماندا هـاریس، ئێمـەری کـابۆنگۆ، ئۆتتـۆ کۆرمـەک، زاهیـر کزەیبـاتی، مـارتن لێتەمایەر، جۆن ماگێی، جۆن ماکنامارا، لاوری مایـەر، مـادلین مۆرێل، سـەمیر سادووی، سوزانا تابرەش، میشێل تـاوک، ریچـارد تۆملحنسـن، روسـل وارن- هو، ستوارت وینتەر، کاترینا وایتەکەر.

ئەوانە هەمویان، هەر یەکەو بە شێوازی خۆی رۆڵی پێشچاوی لەو کتێبەدا گێراوە.

ئەو سێ کسەش دنەی بیرۆکەکەیاندا، هەر یەک لە : ویلیەم بوکلی، ویلیەم کێیسی، یۆهام کرانەر.

بێگومان سوپاسیش بۆ ئێدیس... و تۆم بروک.

هەر نوسەرێک پێویستی بە هاوکاری بەبڕشت‌و بەحەوسەڵەو تیژبین هەیە؛ تا کتێبەکە لە ناخەوە هەڵبقوڵێ. تۆم لەهەمو روێکەوە لەو جۆرە کەسانە بوو کە بگوترێ کاڵا بەقەد باڵایە. لەوەی زیاتر ناتوانم هیچی دیکە بڵێم‌و لەوەش

کەمترم هەرگیز بەدەست نەهاتووە. ئەز دەبێ زۆر سوپاسی ئەوانە هـەمویان بکەم.